# تەفسیری ڕەوان

## (بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی :

مەلا مەحموودی گەلالەیی

بەرگی (حەوتەم)

جزمی (١٩، ٢٠، ٢١)

# تەفسیری ڕەوان

( بۆ تێگەیشتنی قورئان )

نوسینی :

**مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی**

بەرگی ﴿حەوتەم﴾

جزمی ﴿١٩، ٢٠، ٢١﴾

بسم الله الرحمن الرحیم

*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*.*


- **ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان**
- **نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی**
- **تیراژ: ٢٠٠٠ دانە**
- **ژمارەی سپاردن: (٢١٤٠)ی ٢٠١٣ز پێدراوە.**
- **چاپ و دیزاین: (سامان محمد أمین).**

بسم الله الرحمن الرحيم

## موشریکەکان بۆ چەسپاندنی راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد داوای نازڵبوونی فریشتە دەکەن بۆ سەریان، یان خودا ببینن

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴿٢٤﴾ ﴾

ئەمەش شوبهەو گومانی موشریکەکانە دەربارەی ئینکاریکردنیان بۆ پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو رەتکردنەوەی پەیامی قورئان، پوختەی رەخنەکەشیان ئەوەبوو دەیانگوت: بۆچی فریشتە نایەتە خوارێ، شایەتی بدەن: کە موحەممەد راست دەکا پێغەمبەرە، یان خودامان چاو پێبکەوێ‌و دڵنیامان بکا: کە ئەو موحەممەدی بۆ سەر ئێمە رەوانە کردوە!!

بێگومان موشریکەکان بەتەما زیندوبوونەوە نین، چاوەڕوانی لیقای خودانین، حیساب بۆ رۆژی قیامەت ناکەن، هەڵسوکەوتیان لەسەر ئەوبنەمایە بنیات نانێن، بۆیە هەست بەگەورەیی‌و شکۆمەندیی خودا ناکەن، بۆیە زوبانیان هەڵدەسوڕێنن

بەوشەو رستەی وەها کە عادەتەن لەکەسێکەوە نابیسترێن بڕوای بە خودا هەبێو بەتەمای گەیشتن بەخودا بێ لەقیامەت دا..

بەراستی ئەوە هەڵوێستێکی سەرسوڕهێنەرە لەهەڵوێستەکانی سەرڕەقی موشریکەکان، وێنەی سەرڕەقیو قوڵبوونەوەیانە لەکوفرو بێدینی دا قورئان وێنەی کێشاوەو دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ الَّذِينَ لا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلائِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا﴾ ئەوانەی موشریكو بێبڕوان ئینكاری زیندوبوونەوەو سزاو پاداشتی قیامەت دەکەنو بەتەما ئەوەنین بەئێمە بگەن، وتیان: ئەوە بۆ فریشتە نایەتە سەرمانو بەچاو بیبینین، وەکوو لەوەپێش نازڵ دەبوونە سەر پێغەمبەران! با فریشتە بێنو هەواڵمان بدەنێ: کەموحەممەد راست دەکا، لەوەدا کە دەڵێ من پێغەمبەرم! یان با بەرۆژی روناك بەئاشکراو بێ پەردە خودامان چاو پێبکەوێو پێمان بڵێ : ئەوە من ئەو پێغەمبەرەم بۆ سەر ناردون! فەرمانمان پێ بکا بەشوێن کەوتنیو بڕوا پێهێنانی.

بێگومان کافرەکان بەدوریان دەزانی پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ ، دەیانگوت: ناگونجێ ئادەمیزادێکی وەکوو خۆمان ببێتە پێغەمبەر، ئەگەر راست دەکا بافریشتە بێتە خوارێ شایەتی بۆ بدا: کە پێغەمبەرە یان با خودا بۆ خۆی خۆیمان نیشان بداو پێمان بڵێ: ئەوە پێغەمبەری منەو بڕوای پێبکەن!

بەڕاستی ئەمە دەستدرێژیکردنە بۆسەر مەقامی خودا، دەستدرێژیکردنی ئادەمیزادی نەفامە بۆسەر جەلالو شەوکەتو شکۆمەندی پەروەردگار، دەستدرێژیکردنی کەسانێکە قەدرو رێزی خودا نازانن!! دەبێ ئەوانە خۆیان پێ چی بێ: کەئەم دەستدرێژیە دەکەنە سەر بەدیهێنەری بونەوەر؟ ئەوان چین؟ خۆ ئەوان لەموڵکی خودادا وەکوو گەردیلەیەکی سەر لێشێواو وان ، ئەوانە چین پەڵپی ئاوەها دەگرن!

لەراستی دا ئەوانە بەم پەڵپو بیانو گرتنەیان جگە لەئینکاریو سەرکەشیو مل نەدان بۆ حەق هیچی تریان مەبەست نەبووە، بۆیە پەروەردگار لەهەمان

ئایەتداو پێش ئەوەی کۆتایی بێ ڕەددی دانەوەو فەرمووی: ﴿لَقَدْ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْا عُتُوّاً كَبِيراً﴾ بێگومان ئەوان تەکەببوریان کردو لەناخی دڵیان دا بڕیاریان داوە: کە ئیمان نەهێنن، مل بۆ حەق نەدەن، خۆ بەزلزانیو مل نەدان بۆحەق بوەتە بیروباوەڕو لەدڵو دەرونیان دا جێگیربووە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ﴾ (غافر /٥٦) ئەوان لەسەرڕەقیو یاخی بووندا گەیشتونەتە چڵەپۆپە، بۆیە جەسارەت دەکەن پەڵپی ئاوا بگرنو بیانوی ئاوا بخەنە ڕوو! ئەوان لەحەقیقەتدا ئەگەر فریشتەش بێتە خوارێ شایەدی بدا لەسەر ڕاستی پێغەمبەر، ئەوان هەر ئیمان ناهێنن!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلآئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلاً مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللّهُ﴾ (الأنعام /١١١) بێگومان ئەوان خۆیان لەخۆ گۆڕاوە، بەتەواوی لەخۆیان بایی بوون، هێندە خۆیان لا گەورەبووە بێئاگابوون لەتەقدیرکردنی قیمەی حەقیقیو پێوەرەکانیان لێشێواون، لەبەر خۆبەزلزانی تەنیا هەست بەخۆیان دەکەن، هێندە خۆیان لەخۆ گۆڕاوە وادەزانن شیاوی ئەوەن خودای گەورەو مەزن خۆیان بۆ دەرخا تائیمان بهێنن!!

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەرییان پێ دەکا: کە ئاگاداریان دەکا بەسەر ئەو هەوڵو تەنگانەی کەچاوەڕوانیانە لەوڕۆژەدا کەفریشتە دەبینن، هەڵبەتە بینینی فریشتە کەمترین داواکارییانەو بەلای خۆیانەوە شتێکی ئاساییە، بێگومان ئەوان فریشتەیان چاو پێناکەوێ مەگەر لەڕۆژێکی سامناك دا کەلەو ڕۆژەدا سزایەك چاوەڕوانیانە خۆی بۆناگرنو قوتار بوونیان لەدەستی نیە، ئەویش ڕۆژی حیسابو عیقابە.

دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلائِكَةَ لا بُشْرَى يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْراً مَّحْجُوراً﴾ واتە ئەوان لەحاڵی ئاساییو خۆشی دا فریشتە نابینن، بەڵکوو لەحاڵەتی

شەڕو تەنگانەدا چاویان بەفریشتە دەکەوێ، ئەوان بێشك لەکاتی مردن دا یان لەرۆژی قیامەت دا فریشتە دەبینن، پێیان دەڵێن: مزگێنی خێرتان لێنەبێ، خۆشیو ئارامیتان نەیەتەڕێ، فریشتەکان مزگێنی دۆزەخیان دەدەنێ، هەواڵی قارو غەزەبی خودایان پێ ڕادەگەیەنن.

ئەو رۆژەی پێشنیارەکەیان دێتەجێو فریشتەیان چاو پێدەکەوێ، رۆژێکە مزگێنی تێدا نادرێ بەتاوانباران، بەڵکوو سزا دەدرێن، عەزابی بەئێش‌و سامناکیان توش دێ، فریشتە پێیان دەڵێن: ﴿أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ (الأنعام/٩٣).

ئالەو رۆژەدا هەردەڵێن: ﴿حِجْراً مَحْجُوراً﴾ پەنا دەگرین بەخوداو داوای لێدەکەین: کە ئەم عەزابو خەتەرەمان لێدووربخاتەوە، واتە : داوا دەکەن: کە عەزابو خەتەری فریشتەیان لێدوور بخرێتەوە، ئەمە ئەگەر ئەم رستەیە وتەی کافرەکان بێ.

ئەگەر وتەی فریشتەکان بێ ئاڕاستەی تاوانبارەکانی بکەن. ئەوکاتە ماناکە بەم جۆرە دەبێ: ﴿حِجْراً مَحْجُوراً﴾ یاساغ و قەدەغەیە لەئێوە مزگینیو بەهەشت، یاساغو قەدەغەیە رزگاربونتانو هەرگیزاو هەرگیز لەچنگ سزاو تۆڵە قوتاربونتان نیە، مزگێنیتان لێنەبێو بەفتارە چن.

ئەمەش بەپێچەوانەی حاڵو وەزعی موسوڵمانانە لەکاتی سەرەمەرگدا لەوکاتەدا ئەوان مزگێنی خێرو خۆشیان پێ دەدری؛؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ، نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ، نُزُلاً مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾ (فصلت /٣٠ــــ٣٢).

لەفەرموودەی صەحیحو راستدا هاتووە (البراء)ی كوڕی عازیب ریوایەتی كردووە دەفەرموێ: فریشتە بەگیانی موسوڵمان دەڵێ: وەرە دەرەوە ئەی گیانی پاكو خاوێن؛ لەجەستەی خاوێن.. ئەگەر تۆ تائێستا ئەم جەستەیەت ئاوەدانكردبووەوە ئێستا وەرە دەرەوە بچۆ ناو رۆحو رێحانەوە، بچۆرە خزمەت خودایەكی خۆشی دەوێ‌و رقی لێت نیە!!

ئەمجار پەروەردگار هەواڵ لەپوچانەوەی كردەوە باشەكانی كافرەكان دەدا، كاتێك بەخۆیان دەزانن ئەو كردەوە باشانەی لەدونیا خۆیان پێ هەڵدەنانەوەو بەتەمابوون سودیان لێوەربگرن بوونەتە تۆزو باو كەڵكی هیچیان نیە. دەفەرموێ:

﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُوراً﴾ رۆژی قیامەت سەیری كردەوە باشەكانی كافرەكان دەكەین لەكاتی حیسابو لێكۆڵینەوەدا تەماشای كاروكردەوەی خێروشەڕیان دەكەین، : كەپێیان وابوو سودیان لێدەبینن، هەموو كردەوەكانیانمان كردونە تۆزو باو هیچ سودیان پێناگەیەنن، چونكە مەرجی كردەوەی باشو پەسەندیان كە (ئیمانە) تێدا نەهاتۆتە دی، لەبەرخاتری رەزامەندیی خوداو بەمەبەستی پەیڕەوكردنی شەریعەتی خودا ئەنجام نەدراون.

هەركردەوەیەكیش بەدڵسۆزی بۆ خودا ئەنجام نەدری‌و بەگوێرەی شەریعەتی خودا جێبەجێ نەكرێ بەتاڵو بێسودە. چونكە كردەوەكانیان لەسەربنەمای ئیمان ئەنجام نەداوە، ئیمانێكی‌وا پاڵی پێوەنەناون بۆ كردنی كردەوەكانیان كەدڵو دەرون بەخوداوە پەیوەست بكا، پەیوەست بونێكی‌وا كرداری باش بكاتە مەنهەج و پەیڕەوو پرۆگرامو نەخشە بۆ كێشراوو بنەمایەكی مەبەست.

بێگومان وجودی ئادەمیزادو ژیانی، كردەوەو بیروبۆچونی لەروانگەی ئیسلامەوە پەیوەستە بەبنەمای بونەوەرەوەو بەو قانونو یاسایانەی بونەوەری پێهەڵدەسورێ‌و بەخوداوە دەیلكێنێ.

جاهەر کاتێ ئادەمیزاد ژیانی خۆی لەو جەمسەرو میحوەرە جیا کردەوە: کە پەیوەستی دەکا لەگەڵ بونەوەردا بەخودای بونەوەرەوە، دەبێتە شتێکی فرێدراوو بێنرخ و کێش هیچ نرخێك بۆ کردەوەکانی دانادرێ!!

ئیمان و بیروباوەڕە کە ئینسان بە خوداوە پەیوەست دەکاو کردەوەکانی بەنرخ دەکاو وەزنیان بۆ دادەنێ، نەبوونی ئیمانە کەکردەوەی باشی موشریکەکان پوچ دەکاتەوەو قورئان بەو دیمەنە حیسسی و خەیاڵیە تەعبیر لەپوچ کردنەوەکە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُوراً﴾.

ئەمجار پەروەردگار هاو تەرازویەك لەنێوان حاڵ و وەزعی کافرەکان و حاڵی موسوڵمانەکان دا ئەنجام دەدا وەکوو ئوسلوب و مەنهەجی خۆی پاش باسی کافرەکان باسی موسوڵمانەکانیش دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَصْحَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُسْتَقَرّاً وَأَحْسَنُ مَقِيلاً﴾ بێگومان حاڵ و وەزعی بەهەشتیەکان زۆر لەهی دۆزەخیەکان باشترە لەبارەی شوێن و نشینگەی تیدا حەوانەوەو ئارامی و خۆشی رابواردن.

مەبەست ئەوەیە موسوڵمانەکان لەخۆشترین و باشترین کات و شوێندا ژیان بەسەردەبەن و هیچ کەم و کوڕیەکیان نیە، هەموو هۆکارێکی خۆش رابواردنیان بۆ دابین دەکرێ، هەڵبەتە لەدۆزەخ دا هیچ خۆشی و خێرو بێرێك نیە.

کەوابوو لەرستەی ﴿خَيْرٌ مُسْتَقَرّاً وَأَحْسَنُ مَقِيلاً﴾ مانای (اسم تفضيل) مەبەست نیە، واتە مەبەست ئەوەنیە لەدۆزەخدا شوێنی خۆش هەیە بەلاّم هی بەهەشت خۆشترو جوانترە! ئەو مانایە مەبەست نیە بەڵکوو مەبەست لۆمە کردن و سەرکوتانەوەو تەقریع کردنیانە، وەکوو ئەوە کابرایەك ماڵ و سامانێك بدا بەژێر دەستەکەی خۆی، ئەویش لەجیاتی سوپاس کردنی لێی یاخی بێ و سەرپێچی بکا. ئەمجار کابرا بیگرێ و بیداتە بەردارو فەلاقەو کۆت و زنجیرو لەروی سەرزەنشت کردنەوە پێی بڵێ : دەبخۆ ئەمەت باشترە یان ئەوە!!

## ترس و خۆفی رۆژی قیامەت و تەنگ و چەڵەمەکانی

﴿ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ....الآية﴾ ریوایەت کراوە: کە عوقبەی کوڕی (أبي معيط) زۆر لەگەڵ پێغەمبەردا دادەنیشت، رۆژێك پێغەمبەری داوەت کرد بۆ ماڵەوە، پێغەمبەر ﷺ وتی : شایەتومان نەهێنی نان لەماڵت ناخۆم، ئەویش شایەتومانی هێنا، ئوبەی کوڕی خەلەف برادەری عوقبە بوو، کە بیستیەوە عوقبە ئیمانی هێناوە سەرزەنشتی کردو وتی: وادیارە خەڵەفاوی، عوقبە وتی: نەخێر بەڵام موحەممەد میوانم بووەو سوێندی خوارد: کە تا شایەتومان نەهێنم هیچ لەماڵم نەخوا، منیش شەرمم بەخۆم دا هاتو شایەتومانم هێنا.

ئوبەی وتی: من لەگەڵت ئاشت نابمەوە مەگەر بێی قاچت بخەیە سەرپشت ملی پێغەمبەرو تفیش بکەیە دەموچاوی. عوقبە هات پێغەمبەری لە(دار الندوة)دا

بینی چووبوە سوژدە: داخوازییەکەی ئوبەی جێبەجێکرد پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لاالقاك خارجاً من مكة الا علوت رأسك بالسيف).

ئەم هەڕەشەیەی پێغەمبەرﷺ هاتەدی لەغەزای بەدردا ئەسیرکرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب کرد کوشتی، ئوبەی کوڕی خەلەفیش لەغەزای ئوحوددا پێکراو گەڕایەوە بۆ مەککەو مرد، جا: کە زانی دەمرێ وتی: (یالیتنی إتخذت مع الرسول سبیلا).

**موناسەبەی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەیە:**

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی بەیانکرد: کە موشریکەکان پەلپی هاتنە خوارەوەی فریشتەیان لەپێغەمبەر گرت، پەروەردگار باسی دیمەنە سامناکەکانی ڕۆژی قیامەت دەکاو هەواڵی هاتنەخوارەوەی فریشتەکان لەو ڕۆژەدا رادەگەیەنیو وێنەی دەورەدانیان بۆ ئادەمیزادو کۆکردنەوەیان لەسارای مەحشەردا دەکێشێ.

جالەو ڕۆژەدا ستەمکاران دەستی خۆیان دەگەزنو پەشیمانیو نارەحەتی خۆیان لەسەر هەلی لەدەست چویان ئاشکرا دەکەن، ئاواتەخوازی: ئەوەدەبن کەبەگوێی پێغەمبەریان بکردایەو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بوونایەو کاریان بەو حاڵە نەگەیشتایە!

بەم جۆرە دیمەنێکی تری ڕۆژی قیامەت رادەنوێنیو وێنەی پەشیمانیو پەنجەگەستنی ستەمکارە گومڕاکان دەکێشیو بەدورو درێژی دیمەنەکە نمایش دەکا، بیسەر وادەزانیو واهەست دەکا: کە ئەو دیمەنە کۆتایی نایەو بەردەوامە!

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ﴾ ئەی پێغەمبەر! بیر لەوڕۆژە بکەرەوە: کە ئاسمان شەق دەبێو هەورێکی سپی لێدەردەچێ! وێدەچێ ئەو هەورە سپییە لەهەڵمو بوخاری ئەو تەقینەوەو شەق بردنەوە پەیدابێ!

لەو ڕۆژەدا یاسای بوونەوەر دەگۆڕێ خۆرو مانگو ئەستێرەکان دەبنە نیمچە هەورێك بەهۆی پەرتەوازە بوونو بەربوونەوەو گۆڕانکاری لەپێکهاتەکانیان دا، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِذَا السَّمَاء انفَطَرَتْ، وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾

(الانفطار /١-٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَفُتِحَتِ السَّمَاء فَكَانَتْ أَبْوَاباً، وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَاباً﴾ (النبأ/١٩ــــ٢٠) .

ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی تریش ئەوە دەچەسپێنن: کە روداوی فەلەکی گرنگ‌و ترسناك لەکاتی رابوونی قیامەتدا روودەدەن‌و هەموو ئایەتەکان ئاماژە بەوەدەکەن، کە سەرلەبەر ئەم بوونەوەرە تێك دەچێ، هیچ کامێ لەبەشەکانی بوونەوەر پەیوەندیان بەیەکەوە نامێنێ! ئەستێرەو خۆرو مانگ‌و شارە ئەستێرەکان‌و جەمسەرەکانیان یاسایان تێك دەچێ، ئینقیلابێکی گشتی یەکانگیر بەسەر بوونەوەردا دێ‌و کۆتایی بەم جیهانە دێ.

قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەت‌و سورەتی دا دیمەنی ئەو وێرانبونە رادەنوێنی‌و ئەوە دەچەسپێنێ کەوێرانبونەکە تایبەت نابێ بەزەویەوە، بەڵکوو ئاسمان‌و ئەستێرەکانیش دەگرێتەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ، وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ، وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ، وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ یان ﴿إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ، وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ، وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ، وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ، وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ﴾ یان ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ، وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً، فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ، وَانشَقَّتِ السَّمَاء فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ﴾ یان ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ یان ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفاً، فَيَذَرُهَا قَاعاً صَفْصَفاً، لَا تَرَى فِيهَا عِوَجاً وَلَا أَمْتاً﴾ یان ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾.

ئەم ئایەتانەو زۆری تریش لەم بارەوە هەموویان ئەوە دەچەسپێنن کەکۆتایی هاتنی ئەم جیهانەی ئێمە کۆتایی هاتنێکی سامناك‌و سەرسوڕهێنەرە! چەندێك لێی وردبینەوە کەمەندکێشی خەیاڵ نابێ‌و زەین ناتوانێ کۆنترۆڵی بکا.

قورئان دیمەنەکانی رادەنوێنێ بەڵام روداوەکان هێندە سامناك‌و گەورەن خەیاڵ دەرەقەتیان نایە، زەوی رادەتلەقێ و پێکدا دەدرێ، کێوەکان دەتەقێندرێنەوەو

دەبنە تۆزوبا یان دەبنە لۆکەی کراوە. دەریاکان دەتەقنەوەو دەبنە بورکان‌و گڕکان، ئەستێرەو مانگ‌و خۆر روناکیان نامێنی‌و لێڵ دەبن، ئاسمان شەق دەبێ‌و قەڵشت قەڵشت دەکەوێ، هەموو شارە ئەستێرەو فەلەك‌و جەمسەرەکانیان وێران دەکرێن‌و هەڵدەوەرن، نێوانی قەبارەکان ئاسایی نامێنی‌و تێك دەچێ. مانگ‌و خۆر دەکەونە نزیك یەکەوە، ئاسمان چەلێك وەکوو دوکەڵ دێتە بەرچاوو دەمێکیش وەکوو ئاگری سوری هەڵگیرساو....هتد.

ئا ئەو رۆژە کە لەئێمە نادیارەو ناتوانین بەخەیاڵ وێنەی بکێشین روداوی گرنگ رودەدەن، یەکێك لەو روداوانە ئەوەیە: کە ﴿وَنُزِّلَ الْمَلائِكَةُ تَنزِيلاً﴾ فریشتە دادەبەزن بۆ سەر ئەو خەڵکە نامەی عەمەلی بەندەکانیان بەدەستەوەیە، شایەدی لەئەو خەڵکە دەدەن بەبەڵگە بۆڕیان دەدەن. وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ أَن يَأْتِيَهُمُ اللّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلآئِكَةُ﴾ (البقرة /٢١٠).

﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ لِلرَّحْمَنِ وَكَانَ يَوْماً عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيراً﴾ بێگومان رۆژی قیامەت لەسەر کافرەکان رۆژێکی ناخۆش‌و سامناکە، رۆژێکی قورس‌و پڕ تەنگانەیە. چونکە رۆژی عەدالەت‌و بڕیاردانە، ئەوان تاوانکارو ستەمکارن، سزای تاوانبارو ستەمکاران ئاگری دۆزەخە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ، عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾ (المدثر /٩-١٠)

دەی بۆچی موشریکەکان داوای نازڵبوونی فریشتە دەکەن، بۆچی نازانن؟ کەفریشتە لەرۆژی ئاوەها تەنگانەدا نەبێ دانابەزن؟!

بەڵام ئەو رۆژە سامناك‌و پرمەینەتیە بۆ موسوڵمانەکان رۆژێکی خۆش‌و بێمەترسییە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الأَكْبَرُ﴾ (الأنبياء/١٠٣) ئیمامی ئەحمەد لەئەبوسەعیدی( الخدري ) یەوە ریوایەت دەکا : دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرکرا، وتیان: ئەو رۆژەی خودا بە ﴿يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ

أَلْفَ سَنَةٍ﴾ وەصفی کردوە چەند دوورودرێژە؟ چۆن بەسەر دەچێ! پـێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( والذي نفسي بيده، انه ليخفف على المؤمن حتـى يكون أخـفَ عليـه مـن صلاة مكتوبة يصليها في الدنيا) .

ئەمجار دیمەنێکی تری رۆژی قیامەت نمایش دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَيَـوْمَ يَعَـضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَـذْتُ مَـعَ الرَّسُـولِ سَـبِيلاً﴾ ئـەی موحەممـەد! بـیر لەرۆژی قیامـەت بکـەرەوە، بـیر لـەو رۆژەبکـەرەوە: کـە موشـریکەکانو سـتەمکاران دەستی خۆیان دەگەزن؛ نەك دەستێکی بەڵکوو هـەردوو دەسـتی خـۆی دەگـەزێ، جا یان بەنۆرە هەرجارە قەپاڵ بەدەستێکیدا دەکا، یان بەیەکەوە گاز لەهەردوو دەستی دەگرێ، ئەمەش لەبەر ئەو تەنگانەو ناخۆشییەی تێی کەوتووە. بـەهۆی پەشـیمانی لەئەنـدازە بـەدەری هـەلی لەدەستـچووی: بـەهۆی ئـەوەی کـە لـەدونیادا فرسـەتی لەدەست داوە، پشتی لەحەق کردوەو شوێن پەیامی پێغەمبەر نەکەوتووە، پەنجەی خۆی دەگەزێ: کە بۆچی لەتـەك پێغەمبـەردا رێگـای سـەرفرازی نەگرتەبـەر! هـاوار دەکاو دەڵێ:

﴿يَا وَيْلَتِي لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلاناً خَلِيلاً﴾ ئـەی هـاوار بۆخـۆم! ئـەی مـردن لـەکوێی وەرەبۆم رۆژتەو فریام بکەوە، ئای چم بەخۆم کرد! خۆزگە فلانکەس: کە رێگای لێ گوم کردم نەمکردایە بەدۆسـتی گیـانی بـەگیانی خـۆم! شـوێنی نەکەوتمایـەو خـۆم بەم مەرەدە نەبردایەو رۆژم بەم رۆژە رەشە نەگەیشتایە!!

﴿لَقَدْ أَضَلَّنِي عَنْ الذِّكْرِ بَعْـدَ إِذْ جَـاءَنِي﴾ بێگومـان ئـەو هاوەڵـە خراپـەم رێگـەی لێتێکـدام، گـومرای کـردم، لـەیادی خـوداو قورئـان لای دام، پـاش ئـەوەی قورئـانم پێگـەیشت ویستم شوێنی بکەوم سەری لێتێکدامو نەیهێشت ئیمانی پێبهێنم، لـێم بوو بەشەیتانو لەخشتەی بردم! ئەمجا پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَكَـانَ الـشَّيْطَانُ لِلإِنسَانِ خَذُولاً﴾ بێگومان شەیتان بۆ ئادەمیزاد ریسواکەرە، هەر دەیەوێ ئـادەمیزاد

لەخشتەبەرێو ریسوای بکا، لەحەقو راستی لایبدا بیخاتە زەلکاوی گومڕاییـیەوەو دوایی خۆی لێ بەری بکاو لەکاتی تەنگانەدا هیچ دادی نەدا!!

دەگونجێ مەبەست بە( شەیتان ) لەئایەتەکەدا برادەری ستەمکارە دەست گەزیوە کەبێ. بە شەیتان ناوی هێناوە، چونکە ئەویش وەکوو شەیتان رێگای حەقی لەئادەمیزاد گوم کردوە، دەشگونجێ مەبەست خودی شەیتان بێ لەم روەوە کە هەلێناوە بۆ ئەوەی ئاشنایەتی دۆستە گومڕاکەی بکا. یان مەبەستی جینسی شەیتانە، هەرکەسێ گومڕاکەربێ پێی دەگوترێ شەیتان.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ (الحشر/١٦).

لەصەحیحی موسلیمو بوخاری دا لەفەرموودەیەك دا: کە ئەبوموسا لەپێغەمبەرەوەﷺ گێڕاویەتیەوە دەفەرموێ: (انما مثل الجليس الصالح و الجليس السوء كحامل المسك، نافخ الكير، فحامل المسك إما أن يحذيك، إما أن تبتاع منه و إما أن تجد ريحا طيبا، و نافخ الكير اما أن يحرق ثيابك، إما أن تجد ريحا خبيثة).

نمونەی برادەری باشو برادەری خراپ وەکوو عەتر فرۆشو ئاسنگەر وەهایە، نزیکبوونەوە لەعەتر فرۆش یان بەشت دەدا یان لێی دەکڕی یان هیچکەنەبێ بۆنێکی خۆشت بەلوتدا دەچێ. نزیکبوونەوە لەئاسنگەر یان پریشکی ئاگری کورەکەی پۆشاکەکەت دەسوتێنێ یان هیچکەنەبێ بۆنێکی ناخۆشت بەلوت دا دەچێ.

ئەبوبەکری (البزار) لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ بە پێغەمبەر ﷺ گوترا : ئەی پێغەمبەری خودا! چ هاونشینێك باشە لەگەڵی دابنیشین؟ فەرموی : (کەسێك باشە برادەری لەگەڵدا بکەنو ئامادەی کۆڕومەجلیس بن: کە بینینی خوداتان بیربخاتەوە، قسەو گفتوگۆی زانیاریتان زیاد بکا، کردەوەکانی قیامەتتان بیربێنێتەوە.

زانایانی ئیسلام فەرمویانە: ئینسان تابۆی بکرێ رەفاقەتی ئینسانی بێدینو دووڕوو ترسنۆكو ئەحمەقو رژد نەكا، نزیكبوونەوەو دانیشتن لەگەڵ ئەم جۆرە كەسانەدا پەسەندنیەو تابتوانی پێویستە خۆتی لێدوور بخەیەوە مەگەر دڵنیابێ كە دەتوانێ تۆ كار لەئەوان دەكەیو لەم رەوشتە ناشیرینانەیان ژێوان دەكەیەوە یان لێیان كەم دەكەیەوە.

## كافرەكان قورئان پاشگوێ دەخەنو دەڵێن: بۆچی هەمووی بەیەكجار نازڵ نابێ

﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٣٤﴾ ﴾

ئیبنو ئەبی حاتەمو حاكمو هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەكەن، دەفەرموێ: (موشریكەكانوتیان: ئەگەر موحەممەد وەكوو بۆ خۆی دەڵێ:

پێغەمبەرم، راست بکا بۆچی خوداکەی دیقە دیقەی پێدەکاو هەرڕۆژە ئایەتێکی بۆ دەنێری‌و بەیناو بەینیش بۆی نانێرێ. بۆچی هەمموو قورئانی بەجارێك بۆ نانێرێ.

ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً﴾ی نارده خوارێ.

**پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم ڕووەوەیە :**

لەوەپێش پەروەردگار پەڵپو بیانووی موشریکەکانی باس کرد، قسەو بیروبۆچونی پوچیانی رانواند: ئەمجار لێرەدا ئەوە رون دەکاتەوە کەوێڕای ئەو هەمموو بەڵگەو نیشانانە کافرەکان تەمبێ خواردو نەبوون، بەگوێی پێغەمبەریان نەکردو پشتیان لەقورئان هەڵکرد!

دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الرَّسُولُ﴾ پێغەمبەر هانای بۆ خودای خۆی برد: نارەحەتی خۆی لەچنگ موشریکەکان راگەیاندو وتی: ﴿يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً﴾ ئەی پەروەردگارم! ئەوەتا گەلەکەم بەئاشکرا پشت لەقورئان هەڵدەکەن‌و گوێ بۆ ئایەتەکانی ناگرن، ئیمانی پێ ناهێنن، تەنانەت کار گەیشتۆتە ئەوە لەکاتێك دا من ئایەتی قورئانیان بۆ دەخوێنمەوە ئەوان دەیکەنە گاڵو بوغڵو ژاوەژاو بۆ ئەوەی گوێیان لێنەبێ.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ (فصلت /٢٦ ) ئەوان لەهەمموو ڕویەکەوە قورئانیان تەرك کردبوو، گوێیان بۆ کلۆر نەدەکرد نەیاندەویست گوێیان لێبێ، دەترسان کاریان تێبکاو دوایی نەتوانن دڵیان لەسەری لابەرن، تەرکیان کردبوو لێی ورد نەدەبوونەوە، بۆ ئەوەی حەقیقەتیان بۆ دەربکەوێ. پێی هیدایەت ئامێزبن‌و نوورو هیدایەتی لێوەربگرن، تەرکیان کردبوو نەیاندەکرد بەیاسای ژیانیان، رازی نەبوون قورئان دەستورو یاسای ژیانیان بێ.

بێگومـان پێغەمبـەر دەیزانـی کـە پـەروەردگار ئاگـای لێیـەتی: کـە گەلەکـەی قورئانیان تەرك کردوە، وەلێ ئەوە دوعاو پاڕانەوەیـە، هانـا بردنـە بـۆ خـودا، خـودا دەکا بەشایەد: کەهەرچی تواناو دەسەڵاتی هەیە خەرجی کردوە، هـەموو رێبـازێکی مەعقوول‌و رەوای گرتۆتەبەر بۆ بڵاوکردنـەوی ئـایین‌و چەسپاندنی قورئـان لـەدڵی قورەیشییەکاندا وەلێ گەلەکەی گوێیان بۆ نەگرت‌و رویان لێ وەرگێڕا.

ئەمجار پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّاً مِنَ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویسـت! بەهەڵوێسـتی ئـەو موشریکانە خەفەتبار مەبـە، ئـەوە سوننەتی خودایـە لەبوونـەوەردا، داب‌و نـەرێتی پـەروەردگارە لەمـەخلوقاتی دا، وەکـوو چـۆن ئـەو موشـریکانەمان مۆڵـەت داوە، بوختـان‌و قسەی ناشیرینت بـۆ هەڵبەسـتن، ئیختیارمـان پێداون بەویسـتی خۆیـان قورئـان پاشـگوێ بخـەن، هـەر بـەوجۆرە بـۆ هـەموو پێغەمبـەرێکی پـێش تـۆ لەپێغەمبـەری گەلـە پێـشینەکان بەرهەڵـستکارو دوژمـن‌و سـتەمکارمان دانـاون، بانگەوازی خەڵکەکەیان کردوە بۆ گومڕابوون‌و ستەمکاری.. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوّاً شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ﴾ (الأنعام/١١٢).

جـا ئـەو پێغەمبەرانـە صـەبریان گرتـووە، پـشوو درێـژبوون: تـۆیش ئـەی موحەممەد! وەکو ئەو پێغەمبەرانـە صـەبر بگـرەو بـەردەوام بـە لەسـەر گەیانـدنی پەیامی خۆت‌و ئەرکی سەرشانت ئـەنجام بـدە. ئیبنوعـەبباس دەفـەرموێ: دوژمنـی پێغەمبەر ئەبوجەهل بوو، دوژمنی حەزرەتی موسا قارونی ئامۆزای بـوو. هـەموو پێغەمبەرێك دوژمنی هەبووە پشتیان لەپەیامەکـەی کـردوە، خـەڵکیان هـەڵناوە بـۆ ئیمان نەهێنان‌و پشت هەڵکردن، بەڵام پەروەردگار رەهنومـایی پێغەمبـەرانی خـۆی کرد بۆ دۆزینەوەی رێبازی سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکانیاندا!

بێگومـان ئـەم دیـاردەی هـەبوونی بەرهەڵـستکار بـۆ هـەموو پێغەمبـەرێك حیکمەتێکی یەزدانییـە، چونکە پەیـدابوونی سـتەمکارو موشـریك بـۆ دوژمنایـەتی

پێغەمبەران بوەتە هۆی بەهێزبوونی ورەو عەزمو جەزمی پێغەمبەرەکان، لەبۆتەدانیانو قاڵبوونیانو سوربوونیان لەسەربەرنامەی خۆیان، تێکۆشانو جیهاد بۆ روبەڕوبوونەوەی تاوانباران ستەمکاران، هەرچەندە ئەرکێکی قورسو گران بووەو زۆری فیداکاریو ماندوبوون ویستووە، بەڵام ئەو تێکۆشانو جیهادە بووەتە نیشانەی بانگەوازی حەقو راستو جوداکردنەوەی لەبانگەوازی تەزویرو پڕوپوچ، هەرئەو تێکۆشانو فیداکاریو لەبۆتەدانە بووەتە ئامێری مشتو ماڵکردنی بانگەوازیکەرەکانو راستو ناڕاستی لێك جیاکردۆتەوە.

ئەگەر بانگەوازیکردنو جیهادو تێکۆشان کارێکی ئاسانو سادە بوایە، رێگا تەختو پانو پۆڕبوایە بەگوڵو گوڵزار برازێنرایەوە، بەرهەڵستکارو دوژمن لەرێگادا نەبوونایە، بەدرۆخەرەوەو ستەمکار نەبوونایە بەکۆسپو تەگەرە، هەموو ئادەمیزادێك دەبوو بەخاوەن دەعوەو هەرکەسە بۆخۆی لاف پێغەمبەرایەتی لێدەدا، بانگەوازی حەقو ناحەق تێکەڵاودەبوون، دەبووە پشێویو فیتنەو ئاشوب. وەلێ هەبوونی بەرهەڵستکارو دوژمنی دەعوەو پەیامەکان ئەوانە وادەکەن، تێکۆشانەکە بەجیدی بێو زامنی سەرکەوتنیش بێ. ئێشو ئازارو قوربانی دانیش دەبنە دەستە چیلەی خەباتەکە.

کەوابوو تێکۆشانو قوربانی دانو ئازارچەشتن کەسێك ئەنجامی دەدا : کەخاوەنی بانگەوازی حەق بێو هەڵگری پەیامی راستو دروست بێ، ئەوانە دەتوانن پەرە بەبانگەوازییەکەیان بدەنو سووربن لەسە رگەیشتن بەقۆناغ، ئەوانە دەتوانن بگەن بەئاکام: کەژیانی قیامەت بەسەر ژیانی دونیادا پاساو دەدەنەوە، ژیانی خۆیان لەپێناو پەیامەکەیاندا بەخت دەکەن، کەسێك ورەبەرزو دڵقایمو بەرچاوڕون نەبێ، چاوەڕوانی پاداشتی نەبڕاوەی بەهەشت نەبێ، ناتوانێ پەرە بەبانگەوازیو تێکۆشان لەپێناو پەیامەکەیدا بدا، خاوەن ئیمانی پتەوو دڵنیا لەراستی پەیامەکەی دەتوانێ بەرەو ئاسۆی رون هەنگاو هەڵێنیو تەنیا رەزامەندی خودای مەبەست بێو گوێ بەهیچیتر نەدا!

ئـەوەی کـەباوەو زۆر روودەدا ئەوەیـە: زۆربـەی جـەماوەر لـەکاتی گـوریس کێشەکێی نێـوان حـەق و بـەتاڵ دا خۆبەلایـەك دا سـاغ ناکاتـەوە، بـەڵکوو وەکـوو تەماشـاکەر دەڕوانێتـە صـیراعەکە، هـەتا وای لـێ دێ خـاوەنی بانگەوازییـە حـەق و راستەکە قوربـانی زۆر دەدا ئـێش و ئـازاری زۆری پـێ دەگا، کەچی هەربەردەوامـەو کـۆڵ نـاداو سـورە لەسـەر گەیانـدنی پـەیامی خـۆی و پابەنـدە بەبەرنامـەی خـۆی!!

ئالەوکاتەدا جەماوەری تەماشـاکەر زیـاتر وردەبنـەوەو پـتر بەخۆیانـدا دەچـنەوەو دەیانەوێ بزانن: ئەم خۆڕاگرانە کێن و چی‌وای لێکـردون سووربن لەسـەر پـەیامی خۆیان؛ پاش لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە راستیان بۆ دەردەکەوێ پۆل پۆل دەچـنەناو کەمپی هەڵگرانی پەیامی حەق و راستەوە.

بۆیە پـەروەردگار بۆهـەموو پێغەمبـەرێك کۆمـەڵێکی دوژمـن لەسـتەمکاران بـۆ دانـاوە، وای دانـاوە تاوانبـاران رێگـا بەبانگـەوازی حـەق بگـرن، هـەڵگرانی دەعـوە سووربن لەسەر گەیانـدنی بانگـەوازی خۆیـان و کۆسـپ و تەگـەرەکان قەڵاچۆ بکـەن، صـیراع بـەرپا دەبـێ تێکڕاچـوون سـەرهەڵدەدا، ئاکـامیش لـەوەپێش دیـاری کـراوە، خـاوەن بـاوەڕان بـەمراد دەگـەن و سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێـنن و حـەق بالأدەسـت دەبێ، هیدایەت بۆحەق و ئاکام سەرکەوتنە.

﴿وَكَفَـى بِرَبِّـكَ هَادِيـاً وَنَـصِيراً﴾ بەسـە کـە خـودای تـۆ هیدایـەت دەربـێ و یارمەتیدەربێ. هیدایەتی ئەوانـە بـدا کـەئیمانت پـێ‌دەهێنن و بەرژەوەنـدی دونیـاو قیامەت لەشوێنکەوتنی تۆدا دەبینن، یارمەتیت بدا بۆئـەوەی سـەرکەوتوبێ بەسـەر دوژمنەکانتدا لەدونیاو لەقیامەت دا.

پەروەردگار لەئایەتەکەدا هیدایەت و سەرکەوتنی خستۆتە پەنایەکەوە، چونکە هیدایـەت رێبـازو هۆکـاری سـەرکەوتنی موسـوڵمانانە بەسـەر موشـریکەکان دا، موشـریکەکانیش بۆیـە خـەڵکیان لەشـوێنکەوتنی قورئـان مـەنع دەکـرد چـونکە دەیانزانی ئەگەر ئەو خەڵکە شوێن پەیامی قورئان بکەون، ئـەوان باریـان لاردەبـێ و تەرازوی هێز و بەرژەوەندییان لاسەنگ دەبێ!

سەرهەڵدانی بەرهەڵستكارو تاوانباران لەسەر ڕێبازی پێغەمبەران شتێكی سروشتییە، بانگەوازی حەق بۆ چارسەری فەسادو نەخۆشییەكە، كەلەناو كۆمەڵگادا بنجی داكوتاوە، بۆ چارسەری فەسادی ئیداریو فەسادی كۆمەڵایەتیو فەسادی بیروبۆچونو بارودۆخە، تاوانباران لەپشت ئەم فەسادە جۆراو جۆرانە خۆیان مەڵاس داوە، حەزو ئارەزۆكانیان لەم جۆرە كەشو هەوایانەدا گەشە دەكەنو دەستەبەر دەبن، كورد وتەنی: (ماسی لەئاوی قوڕاودا دەگرن) وەكوو مێشە ڕەشەوان لەجەوی پیسو بۆگەندا دەژینو نەشو نما دەكەن، بەبۆنی گوڵو گوڵزار گیانیان دەردەچێ، وەكوو كرمە پیسەوان لەناو ئاوی پاكو ڕەوان دا ناژین حەزیان لەزەلكاوو ئاوە بۆگەنەیە.

ئەمجار سیاقەكە شوبهەو ڕەخنەیەكی تری موشریكەكان رادەنوێنیو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً﴾ كافرەكان وتیان: ئەوە: بۆچی قورئان بەیەكجارو بەكۆمەڵ بۆ موحەممەد نایەتە خوارێ؟ ئەم چكە چیە هەر ڕۆژە ئایەتێكی بۆ دێو هەر ڕۆژە سورەتێكی بۆ دێتە خوارێ؟ بۆچی وەكوو تەورات كەبەیەك جەل بۆ موسا(عليه السلام) هاتە خوارێ، یان ئینجیل بۆ عیساو زەبوور بۆ داود كە بەیەكجار نازڵ بوون، ئەمیش ئاوا نازڵ نابێ؟

بۆ وەڵامی ئەو ڕەخنەیە دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلاً﴾ ئێمە بۆیە بەو جۆرە قورئان بۆ تۆ ڕەوانە دەكەین، بەشبەشو پارچەپارچە دەینێرینە خوارێ بۆ ئەوەی دڵت بەو قورئانە پتەو بكەین، بتوانی لەبەری بكەیو فێری ببیو تەنفیذی بكەی، هەربەشێكی بۆت دێ بەتەواوی لەدڵت دا جێگیرببێو موسوڵمانەكان پێوەی ڕابێنو ئەحكامەكانی بەجوانی هەزم بكەن!

بێگومان قورئان بەرنامەی ژیانەو كەتەلۆكی بوونەوەرە، بۆیە نێردراوە گەلو نەتەوە دروست بكا، كۆمەڵگا پێكەوە بنێ، دەستور دابنێ!!

پەروەردەكردنی كۆمەڵو ڕام كردنیان لەسەر دەستورو یاسا پێویستی بەكات هەیە، پێویستی بەوە هەیە زەمینە خۆش بكرێ وشەو ڕستەكانی قورئان

کاریگەربن، بەگوێرەی پێویستی ئەو کۆمەڵەو بۆ وەڵامی روداوو پرسیارەکانی، بۆ چارەسەرکردنی دەردو نەخۆشیەکانی ئایەتەکان نازڵ بن.

دڵو دەرونی ئادەمیزاد واداڕێژراوە بەشەوو رۆژێك ناتوانێ سەر لەبەر گۆڕانی بەسەردابێ، بەماوەیەکی کورت ناتوانێ کیتابێکی‌وا هەزم بکا: کە هەموو دەستوری ژیانی تێدا کۆکرابێتەوە.. بەڵکوو دەبێ دڵەکان تینوویان بێ‌و روداو سەرهەڵبدەن‌و موشکیلە بەرپا ببن ئەمجار رۆژ بەرۆژ بەگوێرەی پێویستی‌و چارەسەرکردنی موشکیلەکان قورئان بێتە خوارێ‌و وردەوردە ئەوکۆمەڵگایە بەو نووره یەزدانییە ئاشنابکرێ‌و باربە هەڵگرتنی‌و کارپێکردنیەوە بگرن‌و لەسەری رابێن!

قورئان غیذایەو دەبێ بەگوێرەی پێویست پێشکەش بکرێ‌و هەر وەجبەی دەیدرێتێ لەوەجبەی پێشوو لای خۆشتر بێ‌و زیاتر ئامادەباشی تێدابێ بۆ وەرگرتنی. قورئان هاتووە بۆ ئەوەی بەرنامەی هەموو بوارێکی ژیان بێ، بەرنامەی پەروەردەیەك بێ لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاددا گونجاو بێ، بۆیە بەشبەش‌و پارچە پارچە بەگوێرەی پێویستی کۆمەڵگای موسوڵمانان نازڵ بووە، بۆیە بەو شێوە هاتووە پیت بەپیت‌و رستە بەرستەی هەزم بکرێ‌و تەنفیذ بکرێ‌و پەیڕەوی بکرێ، ئەمەش پێویستی بەکات‌و زەمینە بۆ خۆشکردن هەبوە.

**زانایانی تەفسیر زۆر حیکمەت‌و سوودیان بۆ بڕبڕبوونی قورئان‌و هاتنە خوارەوەی بەوشێوە بەشبەشییەی بەیانکردووە: هەرە گرنگەکانی ئەمانەن:**

١- ئارامگرتنی دڵی پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان‌و وەگری بوونیان بە شەریعەتی خوداوە.

٢- زەمینە خۆشکردن بۆ لەبەرکردنی قورئان‌و لێتێگەیشتنی‌و پەیڕەوکردنی حوکمەکانی بەشێوەیەکی وردو چڕوپڕ. چونکە پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی نەخوێندەواربوو، گەل‌و نەتەوەکەشی لەسەرەتادا نەخوێندەواربوون.. ئەگەر قورئان هەمووی بەیەکجار نازڵ ببوایە نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی بکەن‌و یەکسەر هەموویان بۆهەزم نەدەکرا.

٣- بینینی پێغەمبەر بۆ جوبرائیل لەکاتو شوێنی جیاجیادا وزەو ورەی زێدەی بە پێغەمبەر بەخشیوە، بۆتە هاندەری کەلەسەر گەیاندنی بانگەوازییەکەی بەردەوامو پشوو درێژبێ، لەبەرامبەر سەررەقی موشریکەکاندا خاوەن عەزمو حەزم بێ.

٤- لابردنی حەرەج لەسەر ئەوانەی موکولەفن؛ واتە نەهاتووە بەیەکجار ئەحکامی زۆرو جۆراوجۆر بخاتە سەرشانی موکەلەفەکان، ئەگەر داوا لەموسوڵمانان بکرایە کەبە یەکجار ئەحکامەکانی شەریعەت تەنفیز بکەن دیارە تووشی ئەرکو ئورکی قورس دەبوونو نەیاندەتوانی بەجێیان بهێنن.

٥- رەچاوکردنی یاسای تەدەروج و سەرکەوتنی پلەبەپلە لەیاسادانان دا. بێگومان دابو نەرێتی کۆنینەو عورفو عادەتی گشتی لەناو عەرەبەکانو غەیری عەرەبەکانیشدا کاریگەری خۆیان هەبوو، جا ئەگەر بهاتایەو بەیەکجار داوایان لێبکرایە واز لەو دابو نەرێتە میراتیەو عورفو عادەتە سەردەمە بهێنن ئەرکێکی قورسو گران دەبوو، وەکوو دەگوترێ: (ترك العادة مرض) پشتیان هەڵدەکردو نەدەهاتنە سەرخەتو یەکسەر بانگەوازییەکەیان رەت دەکردەوە.

کەوابوو لەروی حیکمەتو داناییەوەیەو بەرژەوەندی کۆمەڵگا داخوازی ئەوەبووە: کە گۆڕینی ئەو دابو نەرێتە وردە وردەو قۆناغ بەقۆناغ بێو بەگوێرەی پێویست بۆ ئەو گۆڕانکارییە قورئانی پیرۆز نێردراوەتە خوار.

٦- چارەسەرکردنی روداوە هەنوکەییەکانو وەڵامدانەوەی پرسیارە جیاجیاکان بەشێوەیەکی گونجاوو لەبار. ئەگەر بەیەکجار قورئان بهاتایەتە خوارێ پلانو نەخشەکانی شەرو ئاشتی پێش وەخت بۆ دوژمنان ئاشکرا دەبوون، دوژمنان دەیانتوانی فرتوفێڵ بدۆزنەوە بۆ سەرکەوتن بەسەر موسوڵمانان دا.

بێگومان قورئان بەو مەنهەج و پرۆگرامە ناوازەی خۆی شۆرشێکی بنەرەتی بەرپاکرد، دڵو دەروونەکانی واپەروەردەکردن لەواقیعی ژیاندا موعجیزە دروست بکەن، موسوڵمانان بەتەواوی ئەو مەنهەجەیان لەخۆیاندا بەرجەستە کرد ئاوێنەی

بالانما بوون بۆ ئەو مەبدەئو بنەمایانەی قورئان لەخۆی گرتوون، بەلام کاتێ موسوڵمانان لەم مەنهەجە بێئاگابوون، قورئانیان واخستە بەرچاو کە کتێبی رۆشنبیرییە یان کتێبی خوێندنەوەیە بە مەبەستی عیبادەتکردنو بەس! نەك مەنهەجی پەروەردەکردنو یاسای ژیانو دەستوری کار، ئیتر موسوڵمانان وەکوو پێویست سودیان لەقورئان وەرنەگرت، چونکە لەتەوەرەی ئەو مەنهەجە چوونەدەرەوە کە خودای زاناو دانا بۆی دانابوون!

بەراستی قورئان پێش ئەوەی کتێبی بەلاغەو ئەدەب بێ، یان نموونەی هەرەبەرزی چمکی ئەدەبی دەقی بەلاغە ئامێز بێ، یان بەمەبەستی عیبادەتو خوداپەرستی بخوێندرێتەوەو لەبەربکرێ، یان کتێبی رۆشنبیریو چیرۆكو مێژوو بێ، پێش ئەمانە هەموو یاسای ژیانە، قانونی کۆمەڵە، بەرنامەی پەروەردەکردنو رێکخستنە، کتێبی ئەخلاقو رەوشتە، نامەی پەندو ئامۆژگارییە، کەتەلۆکی بوونەوەرە..

ئەمجار پێوە دەچێو زیاتر متمانە دەخاتە دڵو دەروونی پێغەمبەرەوە، پتر دڵنیای دەکا لەسەر ئەوە کەبەبەلگەی بەهێزو دوژمن بۆردەر پشتگیری دەکا، هەتا موشریکەکان زیاتر کێشەو نیزاع بەرپا بکەنو پەلپو بیانووی جیاجیاو ناقۆلا بگرنو رەخنەی ناشیرینو بێبنەما ناراستە بکەن خودا زیاتر پشتگیری پێغەمبەر دەکاو بەلگەو ئایاتی زیاتری فێردەکا.

دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيراً﴾ ئەو موشریكو سەررەقو پەلپو بیانووگرانە گومانێك ناخەنەوەو بەلگەیەك ناهێننەوەو قسەیەك ئاراستە ناکەن بەمەبەستی دژایەتی کردنی حەقو گومان خستنە سەر پێغەمبەرێتی تۆ ئەی موحەممەد! ئیللا ئێمە وەلامیان دەدەینەوە بەبەلگەی بەهێزو چەسپاو بەجۆرێك کە: هەموو بەلگەکانی ئەوان دەپوچێنینەوەو رەخنەکانیان هەڵدەوەشێنینەوەو گومانەکانیان دەرەوێنینەوە؛ بەجۆرێك کە بەلگەو دەلیلەکانی ئێمە ئاوێنەی واقیعو نیشانەی راستی پەیامی ئیسلامو

شیکەرەوەو چەسپێنەری حەقو قەلاچۆکەری بەتاڵو گومڕایین، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ (الأنبياء /١٨).

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار سەرپێچیکارانی پێغەمبەری بە درۆزن لەقەڵەم دان، رەخنەو گومانو پەڵپو بیانوەکانی رەتدانەوە، حاڵو وەزعی قیامەتیان بەشێوەیەك رادەنوێنێ موچورکە بەجەستەی خوێنەرو بیسەردا دێنێ، ئەوە بەیان دەکا کە: وەزعو حاڵیان لەو رۆژەدا تابڵێی دژوارەو زیندوکردنەوەو حەشرو نەشریان بەناخۆشترین شێوە ئەنجام دەدرێو دەفەرموێ:

﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ شَرٌّ مَكَاناً وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ ئەو کافرو موشریکە بوختانکەرو رەخنەگرو سەرپێچیکارانەی بوختان بە پێغەمبەر دەکەن، پەڵپو بیانووی ناشیرینو نامەعقولی لێدەگرن، ئەوانە ئەو بەدبەختانەن: کە رۆژی قیامەت لەسەر رو بۆ لای دۆزەخ رادەکێشرێن. بە مەبەستی ریسواکردنو زەلیل کردن بە زنجیر لەسەر رو بەرەو دۆزەخ کێش دەکرێن، ئەوانە شوێنی حەوانەوەیان شوێنێکی شەڕو نەگبەتییە، رێبازیان گومڕاییە؛ کەس بە حاڵیان نەبێ.. ئەو ریسواییە هەر بۆ خۆیان بێ.

وشەی (شر)و وشەی (اضل) هەرچەندە لەسەر شێوەی (إسم تفضيل) هاتوون بەلام مانای (تفضيل)یان تێدانیە واتە: مانای وانیە شوێنی ئەوان لەشوێنی بەهەشتیەکان ناخۆشترە بەڵکوو شوێنی بەهەشتیەکان لەئەوپەڕی خۆشی دایەو شوێنی ئەوان لەئەوپەڕی ناخۆشی دایە..

مەبەست بەیانکردنی خراپی وەزعو حاڵی موشریکەکانە لەبەرامبەری خۆشیو کامەرانی موسوڵمانەکان دا.

لەصەحیحی بوخاریدا فەرموودەیەك هەیە لەئەنەسەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن رۆژی قیامەت کافرەکان

لەسەر رو دەرۆیەندرێن؟ لەوەڵام دا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الذي أمشاه على رجليه قادر على أن يمشيه على ءجهه يوم القيامة).

بێگومان ئەو کەسەی لەسەر دووقاچ لەدونیادا دەیرۆیێنێ دەتوانێ رۆژی قیامەت لەسەر رو بیرۆیەنێ. تیرمیزی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: رۆژی قیامەت بەسێ کۆمەڵ حەشر دەکرێن: کۆمەڵێکیان بە پیادە، کۆمەڵێکیان بەسواری، کۆمەڵێکیان لەسەر رو دەرۆیەندرێن. وترا: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن ئادەمیزادان لەسەر رو دەڕۆن؟ پێغەمبەر ﷺ لەوەڵام دا فەرمووی: (ان الذي أمشاهم على أقدامهم قادر على أن يمشيهم على وجههم إما أنهم يتقون بوجوههم كل حدبء شوك).

## چیرۆکی هەندێ لەپێغەمبەران و سزای بەدرۆ خەرەوەکانیان

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ

وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾

لەوەپێش شوبهەو گومانی موشریكەكانی دەربارەی قورئانو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدﷺ رابوونی قیامەت رانواند، ئەمجار بۆ دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ چیرۆكی برێ لەپێغەمبەران لەگەڵ گەلەكانیان دەگێڕێتەوە. وێڕای دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەو ترساندنی موشریكەكانیشی تێدایە. دەیانترسێنێ لەوەی ئەگەر بەردەوام بن لەسەر كوفرو بێدینی خۆیان، دوور نیە هەمان عەزابو عیقابی گەلە پێشینەكان ئەمانیش بگرێتەوەو بەدەردی ئەوان بچن.

ئێستا ئیتر جەولەیەك بەنێو باس‌وخواسی شێوەی لەناوچونی هەندێ لەو گەلە بەدبەختە چارە رەشانەی رابوردو دەكاو چوار چیرۆكمان بۆ دەگێڕێتەوە:

## چیرۆكی حەزرەتی موساو هارون (علیهما السلام):

یەكەمجار بە چیرۆكی حەزرەتی موساو هارون دەست پێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيراً﴾ سوێند بەخودا ئێمە موسامان كردە پێغەمبەر و نامەی ئاسمانیمان پێداو ناردمان بۆ سەر فیرعەون، هاڕونی برایشمان كردە یارمەتیدەرو وەزیری، ئەویش پلەوپایەی پێغەمبەریمان پێبەخشی، ﴿فَقُلْنَا اذْهَبَا إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ فەرمانمان پێكردن كەپەیامی ئێمە بە فیرعەونو دارودەستەكەی رابگەیەنن.

فیرعەونو دارودەستەكەی پێش رەوانە كردنی موساو هارون بۆ سەریان ئایاتی خودایان بەدرۆ خستبوونەوە، بەڵگەو نیشانەی هەبوونی خودایەكی تاكو

تەنهاو خاوەن دەسەلاتو زاناو دانا هەموو کاتێ هەنو لەگۆڕێن، پێغەمبەران تەنها ئایەتەکان وەبیری بێئاگایان دەهێننەوە!

حەزرەتی موساو هارون هاتنە سەر فیرعەونو داروودەستەکەی، پەیامی پەروەردگاریان پێ راگەیاند، نیشانەو موعجیزەی جۆراو جۆریان نیشان دا، فیرعەون بە درۆی خستنەوەو یاخی بوو.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى، فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَى أَن تَزَكَّى، وَأَهْدِيَكَ إِلَى رَبِّكَ فَتَخْشَى، فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَى، فَكَذَّبَ وَعَصَى﴾ (النازعات/١٧-٢١).

لەشوێنێکی تریش دا دەفەرموێ: ﴿اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي، اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى، فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَّيِّناً لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى، قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَى، قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ (طه/٤٢-٤٦).

جا کە فیرعەونو گەلەکەی پەیامی موساو هارونیان بەدرۆخستەوەو دانیان بەتاکو تەنهایی خودادا نەنا ﴿فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيراً﴾ بەتەواوی لەناومان بردنو ئاسەوارمان بڕینەوە، دەی ئێوەش ئەی موشریکەکانی مەککە، سەرنج لەسەرەنجامی کوفرو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران بدەن، بترسن ئێوەش بەو ئاکامە بگەن! چونکە دابو نەرێتی خودا لەبوونەوەردا یەك سیستەمەو گۆڕانی بەسەردانایە.

## چیرۆکی گەلی نوح (عليه السلام):

ئەمجار دێتە سەر نمایش کردنی چیرۆکی دووەمو دەفەرموێ: ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ﴾ ئەی موحەممەد باسی ئەو عەزابو لەناوبردنو قەلاچۆکردنە بکە: کە دەرحەق گەلی نوح ئەنجام درا لەکاتێك دا پێغەمبەری خۆیان ـ کە حەزرەتی نوح بوو ـ بەدرۆخستەوە، نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناویاندا بوو، بانگەوازی کردن بۆ

یەکتا پەرستیو شوێن کەوتنی پەیامەکەی، وێڕای مانەوەی ئەو هەموو ماوە درێژە لەناویاندا جگە لەکۆمەڵێکی کەم نەبێ کەسی تر ئیمانی پێنەهێنا.

کە دەفەرموێ: ﴿كَذَّبُوا الرُّسُلَ﴾ مەبەست بە درۆخستنەوەی حەزرەتی نوحە، بەڵام چونکە کەسێك پێغەمبەرێك بە درۆبخاتەوە وەکوو ئەوەوایە هەموو پێغەمبەرانی بە درۆخستبنەوە بۆیە لەجیاتی (رسول) (رسل)ی هێنا. چونکە هیچ جوداوازی لەنێوان ئەم پێغەمبەرەو ئەو پێغەمبەرانەدا نیە، هەموویان بنەماکانی بانگەوازییەکەیان یەکتاپەرستیو وازهێنان لەبتپەرستیو بڕوا بوون بە پێغەمبەرایەتیو رابوونی رۆژی قیامەتە. ئەو کەسەی پێغەمبەرێك بەدرۆبزانێ وەکوو ئەوەوایە هەموو پێغەمبەران بە درۆبزانێ..

جا کە نەتەوەی نووح حەزرەتی نووحیان بە درۆخستەوە ﴿أَغْرَقْنَاهُمْ﴾ بە تۆفان خنکاندمانن. ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً﴾ کردمانن بە پەندو عیبرەتو ئامۆژگاری بۆ ئادەمیزادانی دوا خۆیان، هەر کەسێ روداوەکە بخوێنێتەوەو بیری لێبکاتەوە پێی پەندئامێز دەبێ.

﴿وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَاباً أَلِيماً﴾ ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران عەزابی بەئێشو کوشندە، هەرکەسێ ستەمکار بێو بڕوا بەهەبوونی خودای تاكو تەنها نەکا، ئیمان بە پێغەمبەرەکانی نەهێنێ، رێبازی گەلی نووح بگرێتەبەر لەبەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران، ئەوە عەزابی سەختو بەئێشمان بۆ ستەمکاران ئامادەکردوە..

## چیرۆکی عادو ثەمودو (أصحاب الرس):

ئەمجار دێتە سەر گێڕانەوەی چیرۆکی عادو ثەمودو ( أصحاب الرس) دەفەرموێ: ﴿وَعَاداً وَثَمُودَ وَأَصْحَابَ الرَّسِّ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! چیرۆکی نەتەوەی (عاد)کە پێغەمبەری خۆیان (هودعليه السلام) بە درۆخستەوە، هەروا چیرۆکی نەتەوەی (ثمود) کە پێغەمبەری خۆیان (صالحعليه السلام) بەدرۆخستەوە،

هەروا چیرۆکی (أصحاب الرس) خاوەنانی بیرو ئاژەڵ: کە نەتەوەیەکی بتپەرست بوون خودا حەزرەتی شوعەیبی بۆ سەر رەوانەکردن، بانگەوازی کردن بۆ یەکتاپەرستیو بڕوا بە پێغەمبەرایەتی، ئەوانیش بەدرۆیان خستەوە، جا لەکاتێکدا ئەوان سەرگەرمی پەروەردەکردنی ئاژەڵەکانیان بوونو لەدەوری بیرەکانیان بوون خودا بە خۆیانوماڵو سامانیانەوە بە زەوی دا بردنیە خوارێ.

ئیبنو جەریر دەفەرموێ: مەبەست بە( أصحاب الرس) ( أصحاب الأخدود)ن.

﴿وَقُرُوناً بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيراً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! هەروا بۆ موشریکەکانی مەککە باسی زۆر گەلو نەتەوەی تریش بکە: کە لەنێوان سەردەمی گەلی نووحو گەلی عادو (أصحاب الرس)دا هاتوونەتە کۆڕی ژیانەوە، هەموویان کاتێ پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە لەناومان بردنو ئاسەوارمان بڕینەوە.

﴿وَكُلاً ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ وَكُلاً تَبَّرْنَا تَتْبِيراً﴾ بۆ هەریەکێ لەو گەلو نەتەوانە نموونەو پەندمان بۆ هێنانەوە، بەڵگەمان بۆ روون کردنەوە، پەڵپو بیانوومان بڕین، کەچی ئیمانیان نەهێناو پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، ئێمەیش بەتوندیو بەشێوەی ترسناك لەناومان بردن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ﴾ (الإسراء/١٧).

## چیرۆکی حەزرەتی لوط ﷺ:

ئەمجار دێتە سەر چیرۆکی حەزرەتی لوط ﷺ و دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ﴾ واتە: پەند ئامۆژگارییەکی تر بۆ موشریکەکانی مەککە بگێڕەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەو موشریکانە لەکاتی هاتووچۆیان بۆ شام لەوەرزی هاویندا بەلای شاری (سدوم )دا: کە گەورەترین شاری گەلی لوط بوو هاموشۆ دەکەن، بە چاوی خۆیان شوێنەواری ئەو شارەوێرانە دەبینن! پەروەردگار

ئەو شارەی هەڵگێڕایەوە، ژێرو زەبەری کرد، بەرد بارانی کردن بە بەردی سواڵەت: چونکە سەرپێچیان کردو پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوە!

﴿أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُوا لا يَرْجُونَ نُشُوراً﴾ ئایا ئەو قورەیشییانە لەکاتی هاموشۆ کردنیان بەو دەڤەرەدا شوێنەواری ئەو گوندەیان نەبینیوە؟ نازانن خودا چی بەسەرهێنان لەسەر ئەوەی پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوە، سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد؟ خۆ ئەوان بەچاوی خۆیان ئەو ئاسەوارە دەبینن، بەڵام پەند وەرناگرن!

بنەمای تەمبێ نەبوونەکەیان بەدرۆخستەوەی پێغەمبەرو ئیمان نەهێنانیان ئەوەیە: ئەوان گەلو نەتەوەیەکن بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە، پێیان وایە دوای مردن جارێکی تر ئادەمیزادەکان ڕۆژی قیامەت زیندووناکرێنەوە، ئەو حیسابو کیتابو سزاو پاداشو عیقابەی تێیدا ڕوودەدا درۆیە! هۆکاری بنەڕەتی پشت هەڵکردنیانە لەپەیامی ئیسلامو بانگەوازی پێغەمبەر بڕوا نەبوونیانە.

ئەوان ئەگەر بڕوایان بە قیامەت هەبوایەو چاوەڕوانی سزاو پاداشتی دوارۆژ بونایە ئاوا پشتیان هەڵنەدەکردو پشتیان. وەرنەدەگێڕا!! هۆی دڵڕەقیو دڵڕەشیان بڕوانەبوونیانە بەقیامەت هەموو هەڵسو کەوتێکی خراپو ناپەسەندیان لەم بێبڕواییەوە سەرچاوە دەگرێ!

## گاڵتەکردنی موشریکەکان بەپێغەمبەر ﷺ و دروشم دارکردنی بانگەوازییەکەی بەگومڕایی

﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ

أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَاۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾

ریوایەتکراوە کە ئەم ئایەتە واتە ئایەتی (٤١) دەرهەق بە ئەبوجەهل نازڵ بووە، چونکە دابو نەریتی وابوو: هەرکاتێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی بەشوێنێکدا بڕۆیشتایە ئەبوجەهل بەگاڵتە پێکردنەوە دەیگوت: ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِي بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا؟﴾.

دوای نواندنی هەڵوێستی موشریکەکان دەربارەی نازڵبوونی قورئان لەخوداوەو تانەدان لەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو ئیمان نەهێنانیان بە پەیامەکەی‌و گومان نانەوەو پەلپو بیانووگرتن، ڕەخنەگرتنیان لەشێوەی هاتنە خوارەوەی قورئان‌و لەوە پێشیش ڕانواندنی دیمەنە ترسناکەکانی ڕۆژی مەحشەریان‌و لەدونیاش دا شوێن تێشکاندنی بەدرۆخەرەوەکان‌و چۆنیەتی لەناوبردنیان.

ئەمجار دێتە سەر باسی ئەوە: کە ئەو نەفامانە بەهیچ شتێك پەند ئامێزنابن‌و عارنانێن. بەڵکوو پەرە بە قسەو قسە ناشیرینەکانی خۆیان دەدەن، گاڵتە بەخودی پێغەمبەر دەکەن‌و دەیانەوێ لەڕێزو نرخی دابشکێنن، لاقرتێ بەوە دەکەن کەچۆن ئەو بۆ ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبژێراوە. زێدەڕۆیی لەبیروبۆچونی گومڕا

ئامێزیاندا دەكەن.. بە جۆرێك پەیامەكەی بە گومڕا ناوزەد دەكەن‌و هەوا خواهانی خۆیان لەوە دەترسێنن: كە بانگەوازییەكەی كاریان تێ بكاو ئیمان بە پێغەمبەر بهێنن.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُواً﴾ ئەی پێغەمبەر! ئێمە ئاگامان لێیە ئەو موشریكە نەفام‌و گێل‌و كەذذابانە، ئەوانەی بڕوایان بە خوداو پێغەمبەری خودا نیە: هەر كە چاویان پێت دەكەوێ دەتكەنە شوێنی گاڵتەكردنی خۆیان‌و بەچاوی سوكەوە سەیرت دەكەن.

بێگومان لەوە پێش پێغەمبەر پڕ بەچاوانیان بوو، تا نەكرابووە پێغەمبەر خاوەن رێزو پلەوپایە بوو لەناویاندا، دەیانزانی: كە لەخانەوادەیەكی رەسەن‌و خێڵ‌و هۆزێكی رێزدارە، لەهەڵسوكەوت رەوشتی رازی بوون، تەنانەت بە نازناوی (الأمين = محمد الأمين) بانگیان دەكردو ناویان دەهێنا.

رۆژی كێشەی بەردە رەشەكەی كابەش كردیانە براگەورەو بەبڕیارەكەی رازی بوون، ئەو رۆژەی لەسەر كێوی صەفا كۆی كردنەوەو پرسیاری لێكردن‌و پێیانی فەرموو: ئەرێ ئەگەر بڵێم : ئێستا وا لەپشت ئەو كێوە سوپایەك هەیەو دەیەوێ لەبەرەبەیاندا پەلامارتان بدا، ئەرێ بڕوام پێ دەكەن؟ هەموویان وتیان: بەڵێ بڕوات پێدەكەین، تا ئێستا درۆمان لێنەدیوی. وەلێ كەكرا بە پێغەمبەرو بۆ سەریان رەوانەكرا، ئەو قورئانە گەورەو بەفەڕەی بۆ هێناون، دەستیان كردەوە بەگاڵتە پێكردنی‌و دەڵێن:

﴿أَهَذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولاً ؟﴾ ئەوە ئەمەیە خودا كردویەتی بە پێغەمبەرو رەوانەی كردوە؟! بەراستی قسەكەیان‌و بەم جۆرە تەعبیرە شتێكی ناشیرین‌و قێزەون بوو!

ئەمجار ئایا ئەوان ئەم قسەیان لەقەناعەتەوە بوو پێیان وابوو: كەسایەتی پێغەمبەر ﷺ شیاوی ئەم گاڵتە پێكردنەیە؟؟ بڕوایان وابوو ئەو پەیامەی ئەو

هێناویەتی شیاوی ئەم بێڕێزیکردنەیە؟؟ نەخێر ئەوە پلانێکی نەخشە بۆ کێشراو بوو لەلایەن گەورە گەورەکانی قورەیشەوە ئەنجام دەدرا، دەیانەویست لەکەسایەتی پێغەمبەر کەم بکەنەوە، کاریگەری قورئان بپوچێننەوە.

هۆکارێـک لـەهۆکارەکانی بەرەنگاربوونـەوەی بانگەوازییەکـەی پێغەمبـەر ئەوەبوو: کە دەترسان پلە کۆمەڵایەتیەکەیان لەدەست بچێ، بارە ئابوورییەکەیان لێبشێوی‌و بیروبۆچونە جۆراو جۆرو بێبناغەو خەیاڵپلاوەکانیان بێشوێنکەوتوو بمێنێتەوە! کۆڕو کۆمەڵیان دەبەستن بۆ داڕشتنی پیلان‌و نەخشەو بۆ بەرەنگاری کردنی پەیامی پێغەمبەر ﷺ و لەسەر ئەم جۆرە پیلانانە ڕێک دەکەوتن‌و دەشیانزانی کە لەواقیع دا درۆ دەکەن!

ئینو ئیسحاق لەسیرەکەیدا ریوایەتی کردوە دەڵێ: وەلیدی کوڕی موغەیرە پیاو ماقووڵی قورەیشییەکان بوو، کۆمەڵێك لەپیاوەکانی قورەیش لێی کۆبوونەوە، کاتەکەش کاتی حەجکردن بوو، پێی گوتن: ئەی کۆمەڵی قورەیش! ئەوا وەرزی حەجکردن نزیك بۆتەوە، لەهەموو لایەکەوە شاندەکانی عەرەب دێنە ئەم وڵاتەوە میوانی ئێوە دەبن، هەمووشیان هەواڵی ئەم کابرایەی ئێوەیان بیستوە ـ مەبەستی پێغەمبەرە ـ هەمووتان راوو بۆچۆنتان دەربارەی ئەو بکەن بەیەك، نەچن هەر یەکە لەلای خۆیەوە قسەیەك بکاو قسەکانتان دژایەتییان تێ بکەوی‌و قسەی ئەمتان قسەی ئەوتان بە درۆ بخاتەوە، قسەی هەندێکتان قسەی هەندێکی ترتان رەت بکاتەوە!!

هەموویان تێکڕا وتیان: دە بفەرموو: (ئەبو عبدشمس) تۆ پێمان بڵێ‌و فەرمانمان پێبکە تا ئەنجامی بدەین!

وەلید وتی: نەخێر ئێوە بڵێن من گوێ بیستم.

وتیان : هەموووومان دەڵێین: کولەوەنانییە.

وتی: نا وەڵڵا ئەو کاهین نیەو ئەوەمان بۆ ناچێتە سەر، چونکە ئێمە بۆخۆمان کولەوەنانیمان دیون، ئەم قورئانە لەپرتەپرتی کولەوەنانی ناچێ.

وتیان : دەڵێین: شێتە.

وتی: نەخێر شێت نیەو ناتوانین بەشێت لەقەڵەمی بدەین.

وتیان : دەڵێین: شاعیرە.

وتی: نەخێر شاعیر نیە ئێمە بۆ خۆمان شیعر دەناسینو ئاشنای هەموو جۆرەکانی شیعرین، ئەم کەلامە لەشیعر ناچێ.

وتیان : دەڵێین: ساحیرە.

وتی: نەخێر موحەممەد ساحیر نیەو هەڵسوکەوتی لەجادو باز ناچێو فرتو فێڵی ساحیرانی نیە.

ئەمجار ئەی (عبدشمس) تۆ فەرمانت بەچییە؟

وتی: بەخودا قسەکانی کاریگەریەکی تەواویان هەیە، ئەوەی دەیڵێ تابڵێی شیرینو تۆکمەو پڕماناو دڵو هەستو هۆشوە خورپە هێنەرن، ئێمە هەرچەندە بە نەتەوەیەکی زمانپاراوو رەوانبێژ ناسراوین ناتوانین کەلامی ئاوا جوانو پڕمانا دابڕێژین. باشترین قسە ئێمە دەرحەق بە موحەممەد بیکەینو بڵاوی بکەینەوەو هەمومان جەختی لەسەر بکەینەوە ئەوەیە بڵێین: ساحیرێکە سیحرێکی هێناوە کوڕو باوک لێک دەکا، براو برا لێک جیادەکاتەوە، ژنو مێرد لێک دڕدۆم دەکا. پیاو لەهۆزو عەشیرەتی دووردەخاتەوە.

لەسەر ئەم پلانە بڕیاریان دا و کۆتاییان بە کۆڕەکە هێنا. ئیتر لەوە دوا قورەیشییەکان لەسەرە ڕێگای خەڵك دادەنیشتن لەکاتی وەرزی حەجدا هەرکەسێکی غەریبە بەلایان دا تێپەڕبووایە پێیان دەگوت: دەخیل سەد دەخیل توخن موحەممەد نەکەویو وریابە نەکەوییە داوو تەڵەکەیەوە!!

ئەمە نموونەیەك بوو لەداوو پیلانو فرتو فێڵیان دژی پێغەمبەر بە مەبەستی کەمکردنەوەی ڕێزو نرخی لەدڵی ئادەمیزادان دا، بۆ خۆیان دەیانزانی: کە درۆ دەکەن بەڵام ترسی لەدەستدانی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی خۆیان هەبوو،

دەیانەویست بەوجۆرە درۆو فرتو فێڵانە لەپێش چاوی جەماوەر سووکی بکەن لەرێز و نرخی دابشکێنن.

جا لەکاتێکدا گاڵتەیان پێ دەکردو لەرێزو نرخیان دەشکاند لەقسەو گفتو گۆیان ئەوە دەردەکەوت: کە پێغەمبەر ﷺتەواو کاری تێکردونو قورئان سەرسامی کردون، هەرچی دەکەن دەرەقەتی نایەنو نازانن چی بکەن، لەناو خۆیان دا بە یەکتریان دەگوت:

﴿إِنْ كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلا أَنْ صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾ نزیك بوو موحەممەد لەبت پەرستی ژێوانمان بکاتەوەو وامان لێبکا واز لەئایینی باوكو باپیری خۆمان بهێنینو بمانخاتە سەر ئایینی ئیسلام، ئەگەر خۆمان نەگرتایەو ریخۆڵە بەکێش نەبووینایە دەمێك بوو هەڵی خەڵەتاند بووین!! ئەمە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوەی دەیڵێن: پێچەوانەی ئەوەیە لەناخیان دایە. چونکە ئەوان بۆ ماوەی چل ساڵ پێغەمبەریان ناسیوە رۆژێك لەرۆژان درۆیان لێنەبینیوە، تانەو تەشەرێکیان ئاراستە نەکردوە، هەمیشە لەبەرچاویان خاوەن رێزو حورمەتو تەقدیر بووە.

ئەمجار لەم قسەشیاندا کە دەڵێن: ﴿إِنْ كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلا أَنْ صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾ دانناننە بە کاریگەری بانگەوازی پێغەمبەر لەسەر دڵو دەروونیان، بەجۆرێك خەریکبوون واز لەئایینی خۆیان بێننو چیتر بتپەرستی نەکەنو موسوڵمان بنو دەست بکەن بە یەکتاپەرستی. ئەمجار لەبەر خۆبەزلزانیو سەر رەقیو عیناد بانگەوازییەکەی بەگومڕاکردنو رێ لێ ونبوون لەقەڵەم دەدەن!

بۆیە پەروەردگار بەشێوەیەکی کورت هەڕەشەیان ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ لەوە بەولاوە دەزانن : ئایا ئەوەی بۆیان هاتووە هیدایەتە یان گومڕاییە! بێگومان ئەو کاتەی عەزابیان بۆدێ دەزانن: کێ رێگای لێگوم بووەو سەرلێشێواوە؟ ئەوان یان موسوڵمانان: کە پێغەمبەر پێشەوایانە!

بێگومـان ئەمـە هەڕەشـەیەکی سـامناکە لەسـەر خۆگێل کـردن‌و ڕوو وەرگێـڕان لەبەڵگەو دەلیل‌و تێفکرین، لەسەر ئەوەی پێغەمبەر بەگومڕا نـاوزەد دەکـەن! وەلـێ ئەوکاتەی کـە حـەق‌و ناحـەقیان لـێ مـەعلووم دەبـێ، زانیارییەکـەیان سود بـەخش نابێ، کاتێ عەزاب دەبینن کاتی سەرە مـەرگ‌و غەرغەرەیە، یان لـەڕۆژی قیامـەت دایە، ئەو کاتانەش تێگەیشتن‌و ئیمانهێنان بێسوودە.

ئـــەمجار ڕوی خیطـاب دەکاتـــە پێغەمبـــەرﷺ و دڵخۆشـــی دەداتـــەوە لەســـەر ســـــەرڕەقی موشـــــریکەکان‌و گاڵتـــــەپێکردن‌و ئەزیەتـــــدانی، لەکاتێکـــــدا پێغەمبـەرﷺکەمتەرخـەمی نـەکردوەو بەدڵسۆزی پـەیامی خـــوای پێگەیانـدون‌و بەڵگەو نیشانەی پێویستی بۆ هێناونەوە. شیاوی ئەوە نیە ئاوا بەناپیاوی بەگژی دا بچن‌و هەڵوێستی ئاوا ناشیرینی بەرامبەر بنوێنن.

دەفەرموێ: ﴿أَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾ ئایا تـۆ پێت‌وایە ئەی موحەممـەد! کەسێك هـەواو ئارەزۆبـازی بە سـەریا زاڵبێ‌و ئـارەزو پەرست بێ، سەرپێچی‌و یاخیبوونی لێبووبێتە خویەکی سروشـتی، تـۆ کوا دەتـوانی هیدایەتی بدەی‌و لەگومڕایی دەری بهێنی ؟!

کەسـێك حـەزو ئـارەزۆ پەرسـت بـێ، ئارەزووەکـانی کـردبن بـە خـودای خـۆی فەرمانبـەرداریان بـێ‌و لاسـایی کردنـەوەی کوێرانـەی بەسـەردا زاڵ بـێ، گوێـچکەی خـۆی لەئاسـت حـەق‌و ڕاسـتی هـاخنیبن، بەڵگـەو دەلیلـی ڕون‌و ئاشـکرا نـەبیـسێ، هەرچی هەواو ئارەزۆی داخوازی بێ پابەنـدی بێ.

بێگومـان ئـەی موحەممـەد تـۆ نـاتوانی بیخەیـە سـەر هیدایـەت‌و بـەڕێبازی بەختەوەری ئاشنا بکەی. ئەو هەرچی هەواو هەوەسی بەجوانی بزانێ ئەو دەیکاتـە مەنهەج‌و ئایینی خۆی. دەی کەسـێك وابـێ زۆر زەحمەتـە لـەگومڕایی ڕزگـاری بـێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَناً فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ ..﴾ (فاطر/٨).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لەسەردەمی نەزانی دا پیاوی‌وا هەبوو ماوەیەك بتێكی داتاشراو لەبەردی سپی دەپەرست پاش ماوەیەك بتێكی جوانتری دەبینی وازی لەپەرستنی بتی پێشوو دەهێناو دەستی دەكرد بە پەرستنی بتی تازە.

كەوابێ موشریك‌و بتپەرستەكان هیچ بەڵگەو دەلیلیان بەدەستەوە نەبوون لەسەر بیرو بۆچوونەكانیان جگە لەلاسایی كردنەوەی كوێرانەو شوێنكەوتنی هەواو ئارەزۆ.

بەكورتی پێغەمبەر ﷺ تەنها راگەیاندن‌و ئامۆژگاری لەسەرە، ئەركی پێغەمبەر موژدەدانە بە تەقواكاران‌و ترساندنی سەرپێچیكارانە. خستنە سەر رێبازی حەق‌و تۆفیقدانیان بە دەست خودایەو بەس! وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية/٢٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ﴾ (ق/٤٥).

ئایەتەكە دەربڕینێكی سەرسوڕهێنەری تێدایە، وێنەی نموونەی حاڵەتێكی قوڵ دەكێشێ، حاڵ‌و وەزعی نەفسێك بەیان دەكا: كە هیچ كێشەرو پێوەرێكی راست‌و دروستی نیە. گەردنكەچی هەواو ئارەزۆی خۆیەتی‌و حەزو شەهوەت پەرستە، گەردنكەچی هیچ تەرازوویەكی عەداڵەتكاری نیە، مەنطیق‌و بەڵگەكاری تێناكەن، هەوای سەركەشی خۆی كردوە بە خودای خۆی‌و دەیپەرستێ.

جا لەم روانگەوە پەروەردگار خیطاب ئاراستەی پێغەمبەری خۆی دەكاو بەهێدی‌و هێمنی دەربارەی ئەو جۆرە كەسانە دەدوێ‌و بەوشەی ﴿أَرَأَيْتَ...﴾ دەست پێدەكاو وێنەی ئەم جۆرە كەسانە كە بەڵگەو دەلیل كاریان تێناكاو حەقیقەت لایان نرخی نیە، دەخاتەڕو، ئەمەش بۆ دڵدانەوەوی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی بە ئیمان نەهێنانی موشریكەكان دڵتەنگ نەبێ، پێی رادەگەیەنێ: كە ئەو جۆرە كەسانە ئەهلی هیدایەت نین، بە كەڵكی ئەوە نایەن پێغەمبەر ﷺ زۆرە ملێیان لێ بكا بۆ ئەوەی ئیمان بێنن.

ئەمجار هەنگاوێکی تر دەهاوێژێ بۆ تەحقیرکردنی ئەوانەی ئارەزۆ پەرستن‌و گوێچکە بۆ بەلگەو دەلیل ناگرن‌و خۆپەرست‌و هەواپەرستن. دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ وشەی (أم) بەمانا (بل)ەواتە: ئەتۆ واز لەوەی پێشووبێنە، پێت وایە: کەوا زۆربەی ئەوان شنەوان‌و بیستنەکەیان سودبەخشە؟ بە تێفکرین‌و لێوردبوونەوە گوێ رادەگرن؟ یان پێت وایە لەو پەیامەی بەسەریاندا دەخوێنیەوە جوان جوان حالی دەبن‌و ئەخلاق‌و رەوشتی جوانی لێوەردەگرن ؟!

پێت وایە ئەوانە شیاوی ئەوەن: کەوا خۆتیان لەگەڵ ماندوو بکەی‌و بانگەوازییان بکەی بۆ ئەوەی لەعەقیدەی بەتاڵەوە بیانگوێزیەوە بۆ بیرو باوەڕی راست‌و صەحیح؟

نەخێر وامەزانە پێت وانەبێ، چونکە ئەوان لەتایبەتمەندی ئادەمیزادی روت کراون، ئامادەباشی تێفکرین‌و دەرك کردنیان تێدا نیە ئەوان دەق وەکوو ئاژەڵ وەهان، بەڵکوو لەئاژەڵیش گومڕاترن‌و لەوانیش بێ عەقڵ ترن، چونکە ئەو ئاژەڵانە هەڵسوکەوتی وادەنوێنن سودو قازانجی خۆیان‌و خاوەنەکانیشیان تێدابێ، خۆدەپارێزن لەزۆر شت کەزیانی خۆیانی تێدایە.

بەڵام ئەو موشریکانە هەست بە بەرژەوەندی خۆیان ناکەن، ئەوەتا لەتاواندا رۆچوون‌و خۆیان فڕێ داوەتە ناو هیلاکەتەوە، سوپاسی نازو نیعمەتەکانی خودا ناکەن بەسەریانەوە، دان نانێن بە چاکەی خودا لەگەڵیانداو نازانن شەیتان چەند دوژمنیانە. شتێك ناکەن لەپاشەڕۆژدا پاداشتی لەسەر وەربگرنەوە، خۆیان ناپارێزن لەو شتانەی دەبنە هۆی سزاو عیقابی کوشندە بۆیان، بۆ خۆیان بە دەستی خۆیان عەقڵ‌و بیرو فکری خۆیان لەکار خستون تا حاڵیان بەو حاڵە گەیشتووە!!

**پێنج بەڵگە لەسەر هەبوونو تاکو تەنهایی خودا**

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ ٱلظِّلَّ وَلَوْ شَآءَ لَجَعَلَهُۥ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْـِۧىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار نەفامیو سەرڕەقی موشریکەکانی راگەیاند، پشت هەڵکردنو روو وەرگێڕانیان لەحەقو راستیو موناقەشەو دەمە دەمێیان لەو بارەوە روون کرایەوە، ئەمجار قسەو قسەڵۆکی موشریکەکان بەجێ دێڵێو بەشێوەیەکی ناسكو لەطیف ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەر دەست پێ دەکا.

ئاخاوتنەکە بریتیە لەجەولەیەکی کورت بەناو بوونەوەردا، دڵی پێغەمبەری بۆ لادەکێشێو پەیوەستی دەکا بە خودای بەدیهێنەر، هەر ئەم پەیوەندییە بەسە بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەموو غەمو نارەحەتی سەرپێچی موشریکەکانی لەدڵدا نەمێنێ، سەرنجی رادەکێشێ بۆلای دیاردەکانی بوونەوەر (بەشێك لەدیاردەکانی ) ئەو پەنجەرەی بۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی لێیەوە بڕوانێتە ئەو ئاسۆ بەر فراوانەو فرتو فێڵی موشریکەکان لەبەر چاوی ببنە تارماییەكو لەهیچ هیچ تربن.

هەمیشە قورئانی پیرۆز دڵەکانو عەقڵەکان تەوجیە دەکا بۆ ئەوەی سەرنج لەبوونەوەر بدەن، عەقڵو دڵەکان پێکەوە دەبەستێو ئاڕاستەی دیاردەکانی بوونەوەریان دەکا.

هەستەکان دەوروژێنێ بۆ ئەوەی بە هەستێکی تازەوە بە دڵێکی کراوەو عەقڵێکی وردبینەوە پێشوازی لەدەنگو رەنگی دیاردەکان بکاو بیانکاتە نیشانەی هەبوونی خودایەکی زاناو دانا. لەگەڵ بوونەوەردا تێکەڵ ببێو تێی رامێنێو نیشانەکانی سەر روبەری بوونەوەر ببینێو بزانێ ئەم کەونە دەستی قودرەتی بەدیهێنەرێکی زاناو داناو تاكو تەنها نەخشەی بۆ کێشاوەو بەدی هێناوە، لەهەموو کونو قوژبنێکیدا لەهەموو دیاردەو گۆڕانو تارماییو گەردیلەو قەبارەیەکی، لەهەر شتێکی حیسسی دەرکی دەکاو چاوی دەیبینێو گوێچکەی دەیبیسێ هەموو ئەمانە بەتاكو بەکۆ بکاتە شوێنی لێوردبوونەوەو فکرکردنەوەو پەیوەست بوون بە خوداوە، ئەو خودایەی ئەم بوونەوەرە سەرنج راکێشەی هێناوەتە وجود!

جا کاتێ ئادەمیزاد بەچاوی کراوەو دڵی کراوەوە لەم بوونەوەرەدا ژیان بەسەر بەرێ، هەستو گیانی بەئاگابن، فکرو بیری بە خوداوە پەیوەست بن، ئەوکاتە ژیانی

لەچلك و پۆخلاواتی زەوی پاك دەبێتەوەو هەموو كاتێ هەست دەكا: كە ئاسۆی بوونەوەر زۆر زۆر لەروبەری ئەم زەمینە بچكۆلە فراوانترە! هەست دەكا: كە هەموو بوونەوەر بەدیهێنەرێك بەدی هێناوە، هەموو بوونەوەر یاسایەكی هەیەو روو دەكاتە خودایەك: كە تاك و تەنهاو بێشەریك و هاوەڵ و خێزان و منالە. هەست دەكا كە ئەو بۆ خۆی تاكێكە لەو مەخلوقاتەو زۆرو هەمە جۆرانەی پەیوەستن بە خوداوە، دەستی قودرەتی خودا لەهەموانیاندا دەبینێ.

بێگومان هەستی تەقواو هەستی ئونس و هەستی متمانە بە خودا تێكەڵاو بەیەك دەبن و بەسەر گیانیدا دەرژێن، سروشتی تایبەتی پێ دەبەخشن، بەرچاوی روناك و خودا ویست و دڵئارام لەسەر زەوی ژیان بەسەر دەباو ژیانی بریتی دەبێ لەگەشت و گوزار بەناو دروستكراوانی خودادا.

دیمەنەكان جۆراو جۆرن سیاقەكە لەدیمەنێكەوە دەگوێزێتەوە بۆ دیمەنێكی تر، لەدیمەنی سێبەری هێدی و لەسەرە خۆوە دەگوێزێتەوە بۆ دیمەنی پڕ ئارام و بێهەست و خواستی شەو بۆ دیمەنی رۆژی پڕ جمو جوڵ و هاتوچۆ، بۆ دیمەنی (بـا)ی مزگێنی هاوەرو پێش باران، بەشوێن ئەودا دیمەنی ئاوی باران و زیندوكەرەوەی مردوو!

ئەمجار دەگوێزێتەوە بۆ دیمەنی دوو دەریای جیران و لێك دراوی تێكەڵ بە یەكتری نەبوو! ئەمجار لەناوی ئاسمانەوە بۆ ئاوی (نوطفە) كەبنەماو سەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزادە.

دەی باچەند ساتێك لەو فیستیفاڵە كەونییەی: كە پەروەردگار بانگەوازیمان دەكا بۆ تەماشاكردنی وچانێك بدەین و تێی رامێنین!

١- ﴿ أَلَمْ تَرَى إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِناً﴾ ئەتۆ ناڕوانی ئەی پێغەمبەر! هەروا هەموو كەسێك ئەم خیطابە دەبیسێ بابڕوانێ. بۆ بەدیهێنراوی خودای تۆ كە ئەو بەدیهێنراوانە نیشانەی بەتوانایی و تاك و تەنهایی خودان و

بەڵگەن لەسەر لوطفو رەحمەتی بۆ بەندەکانی، ئەوە تۆ ناڕوانیو نابینی خودای تۆ چۆن سێبەری درێژ کردۆتەوە؟ بەندەکانی چۆن لەسایەیدا دەحەسێنەوە، خۆیان لەگەرمای خۆر دەپارێزن، لەخۆرهەڵاتنەوە تا خۆرئاوابوون هەر کەویستیان لەگەرمای خۆر خۆیان بپارێزن پەنا بۆ سێبەری خوداکرد دەبەن!

خۆ ئەگەر خودا بیویستایە سێبەری وا دروست دەکرد گۆڕانی بەسەردا نەهاتایەو هەڵکشانو داکشانی نەبوایە، کورتو درێژی تێدا نەهاتایەتە دی. بەڵام خودا بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی لەساتەکانی رۆژدا بە گوێرەی وەرزو شوێن جواداوازی تێدا بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی سودبەخش بێ بۆ ئادەمیزادو ئاژەڵو گیانلەبەرانی ترو گژو گیاو درەخت، بۆ ئەوەی بیکەنە نیشانەی کاتو مەزەندەی کاتەکانی رۆژی پێ بکەن.

تەنانەت شەرعزانان سێبەریان کردوە بەنیشانەی کاتی هەندێ نوێژ بۆ نمونە دەڵێن: نوێژی نیوەرۆ لەکاتی لادانی خۆرە لەهێڵی (نصف النهار) واتە : کاتی گەڕانەوەی سێبەر بەرەو خۆرهەڵاتو مەیل کردنی خۆر بۆلای خۆرئاوا، هەروا کاتی عەصر ئەو کاتەیە: کە سێبەری هەموو شتێك بە ئەندازەی شتەکە بێ یان دوو هێندەی بێ.

بێگومان دیمەنی سێبەری نەرمو لەطیف ئارامییەك بە دڵی ماندوی پێغەمبەر دەدا، شنە بایەکی فێنکی نەسیمی بەسەر گیانو جەستەدا هەڵدەکا، ئێشو ئازارێك کە لەموشریکەکانەوە توشی بوبوو دەرمانی دەکا، ئەوەتا دوای ئەوەی ئەزیەتو ناڕەحەتی جۆراو جۆری لەکافرەکانەوە توش بوو، پەروەردگار تەوجیهی دڵی بەندەی خۆی حەزرەتی موحەممەدﷺ کرد بۆ وردبوونەوە لە دیمەنێکی سروشت، ئەو تەوجیهە شیفای دەردو گیانی زیندوکەرەوە بوو، روناکیو ئارامیو هیوا بەخش بوو لەبەرامبەر تاریکی کوفرو ئینکاریو یاخیبوونی موشریکەکانی مەککە.

﴿ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً﴾ پاشان ئێمە خۆرمان گێڕاوە بەنیشانەو بەڵگەی هەبوونی سێبەر! ئەگەر دەرکەوتنی خۆر نەبوایە، کەس هەستی بە سێبەر

نەدەکرد، چونکە هەموو شتێك بەدژەکەی دەناسرێ! سێبەر بریتییە لەتاریکاییەکی خەفیف، بەهۆی قەبارەیەکەوە تیشکی خۆر ناکەوێتە سەر شوێنێك چونکە ئەو قەبارەیە بوەتە ناوەند لەنێوان تیشکەکەو ئەو شوێنەدا. ئەمجار ئەو سێبەرە بەگوێرەی جوڵانی زەوی لەبەرامبەری خۆردا هەڵکشانو داکشانی بەسەردا دێ، کورتیو درێژی لێ پەیدا دەبێ، خۆر بەتیشكو گەرماییەکەی نیشانە دەبێ لەسەری!

﴿ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيراً﴾ پاشان سێبەرمان لاداو جێ گۆرکێی پێ دەکەین وردەوردەو بەکاڵەخۆ بەگوێرەی بەرزبوونەوەی خۆرو پێهەڵاچوونی بەرەو ناوەڕاستی ئاسمان، سێبەری هەموو شتێك هەڵدەکشێتەوە، جگە لەژێر درەختو بنهەڵاش سێبەر نامێنێو خۆر هەموو شوێنێك دەگرێتەوە.

لەپەیدابوونی سێبەرو گۆڕانکاری تێیدا دوای هەڵهاتنی خۆر تا ئاوابوونیو جێگۆرکێی لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکی ترو هەڵکشانەوەی سێبەرەکانو داکشانو شۆڕبوونەوەیان بە گوێرەی حیکمەتێکی یەزدانی، بەڵگەی بەهێزن لەسەر هەبوونی خودای بە تواناو زاناو داناو خاوەن رەحمەتو فەضلو بەخشش.

بێگومان دیمەنی سێبەرەکان لەودەمەدا: کەخۆر بەرەو ئاوابوون دەکشێو سێبەرەکان درێژدەبنەوەو شۆڕدەبنەوە، تاوای لێدێ خۆر لەئاسۆی ئاوابوون نزیك دەبێتەوە، ئەمجار لەپڕێکاو لەنکاوێك دەڕوانی قەبارەی خۆرو روناکی نەماونو سێبەرەکانیش هیچ تارماییەکیان نەماوە؟ بۆ کوێ چون؟ بێگومان ئەو دەستی قودرەتەی سەرەتا بەدیهێناوە هەر ئەو دەستە نهێنییە وەری گرتۆتەوە، هەموو سێبەرەکان چوونە ناو تاریکی شەوەوە.

٢- ﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاساً وَالنَّوْمَ سُبَاتاً﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە تاریکایی شەوی کردووە بە داپۆشەر بۆ ئێوەو هەموو زیندەوەرێك، بەڵکوو بۆ هەموو شتێکی سەرزەوی. کە شەو دادێ ئەم جیهانەی ئادەمیزادی تێدا دەژی دەڵێی پۆشاکی لەبەر کردوەو بە تاریکایی خۆی دایپۆشیوە. لەشەودا جمەوجوڵ

دەوەستێ، ئـادەمیزادو زۆربـەی گیانلەبـەران خـەو دایانـدەگرێ. وەکـوو لەئایـەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿والليل اذا يغشى﴾ (الليل/١).

خـەوتن نیمـچە مردنێکـە، خـەو وەکـوو مـردن جـمو جـولّ نـاهێڵێ، هـەموو گیانلەبەرەکان یان بڵێین زۆربـەیان لەشـەودا پـەنا بـۆ نووسـتن دەبـەن بەمەبەسـتی مانـدو حەسـانەوەی جەسـتەو هەسـتەکانو ئـامێری هەسـتەکان دوای جـمو جـولّو هەولّو تێکۆشانی رۆژو کارکردنو خوێنـدنو خوێندنـەوە، بـە نوسـتن جـمو جـولّی جەستە نامێنێ، ئەعصابو جەستەو گیان بەیەکەوە خەریکی پشوودانن.

﴿وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُوراً﴾ پـەروەردگار رۆژی کـردوە بـەکاتی بڵاوبوونـەوە بـەناو زەوی دا، زینـدەوەرانو ئادەمیزادیش لەگەڵیان بەناو دایە زەمین دا بڵاودەبنـەوە بـۆ بەدەستهێنانی بژێوو پێداویستی ژیـان، هـەر یەکـە بـەجۆرێك لەهـەولّو تێکۆشـانی ژیان دایەو دەیەوێ پێداویستی ژیان دابین بکا.

جـا وەکـوو چـۆن خـەو دەشـوبهێتە مـردنو نمونەیەکـە لـەو، هـەروەها بەخەبـەرهاتنو جـمو جـولّ دەسـت پـێ کـردنو بڵاوبوونـەوە بـەناو زەوی دا دەق دەشوبهێتە زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت.

نوستن دابڕانە لەجمو جولّو دیتنو بیستنو هەستکردن، نووستن خێ بوونـە، دوایـی کـە بەرەبـەیان هەناسـە هەڵـدەهێنێو جـمو جـولّ دەکەوێتـەوە نـاو زیندەوەرانەوە، ژیان دەگەڕێتەوە بۆ ناویان دەق دەشـوبهێتە زیندوبوونـەوەی رۆژی قیامەت، کەوابوو نوستن نیمچە مردنێکەو بەخەبـەرهاتن لەخـەو جـۆرە رابـونێکی رەسـتاخێزە. کـەوابێ لەهـەموو خـولێکی زەویو مـانگو خـۆردا مـردنو زیندوبوونەوەیەك بەسەر ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تردا رادەبرێ.

لـەوەتای ئـەم چـەرخو فەلەکـە لەگـەڕدانو ئـادەمیزاد لەسـەر زەوی پەیـدابووە جگە لەمردنـە راستییەکە، لەگـەلّ هـەموو خـولێکی دایـە زەمـین دا کـە بـەردەوامو بێمانـدبوونو راوەسـتانو سـوانو لەکارکـەوتن لەگەڕدایـەو دێو دەچـێ رۆژانـە دیاردەی ئەم نیمچە مردنە دووبارە دەبێتەوە بەسەر ئادەمیزادو گیانلەبەرانی تـردا

تێدەپەڕێ بەڵام ئادەمیزاد لێی بێئاگانو لێی وردنابنەوەو بەعەقڵو هۆشەوە سەرنجی نادەنێ. بیر لەوە ناکەنەوە: کە ئەمە نیشانەی هەبوونی خودایەکی زاناو دانایەو ئەو نەخشەی ئەم دیاردانەی کێشاوەو ساتەوەختێكو چرکەیەك بێ ئاگا نابێو نوستنی بەسەردا نایە.

٣-ئەمجار دێتە سەر دیاردەی (با)ی مزگێنی هاوەر بەبارانی ژیانبەخشو زیندوکەرەوەی سروشت دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە (با) هەڵدەکا بۆئەوەی مزگێنی بارینی ڕەحمەتی خودا بدا بە ئادەمیزادان، نیشانەی ئەوەبێ کە نزیکە هەور گەواڵ گەواڵ بوەستنو باران بباریێنن.

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً﴾ ئێمە لەبەرزاییەوە؛ لەهەورەوە ئاوێکی پاكو پاکەوەکەر دەنێرینە خوارێ، هۆی درێژە پێدانی ژیانو پاککەرەوەی جەستەو پۆشاكو شتی تریشە، بۆ هەموو بوارێکی ژیان سودی لێدەبینن. بێگومان ژیان لەسەر زەوی بەهەموو جۆرێکیەوە، لەسەر ئاوی باران دەژیا، جا یان ڕاستەوخۆ یان دەبێتە هۆی پەیدابوونی جۆگەو کانیاوو بیروچۆم. وەلێ ئەوانەی کە ژیانیان ڕاستەوخۆ لەسەر بارانە ئەوان زیاتر هەست بەم ڕەحمەتە دەکەن، ئەوان چاوەڕوانی بارانو هەست دەکەن کە ژیانیان پابەندە بەبارینی بارانەوە، ئەوان چاوەڕوانی هەڵکردنی بایوادەنو دەزانن: کە ئەو بایە هەورەکان کۆدەکاتەوەو نیشانەی بارینی بارانە.

بەکورتی ئاو سەرچاوەی ژیانە ﴿مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ (الأنبياء/٣٠) . ئەگەر ئاو نەبێ ژیان نابێ ژیانی گیانلەبەرانو ڕوەكو درەختو گژو گیا پەیوەستە بەبوونی ئاوەوە.

ئەمجار باسی باران بارینەکە دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً﴾ واتە باران لەهەورەوە دەبارێنین بۆ زیندوکردنەوەی زەوی تینوو، زەوییەك

گژو گیاکانی بوونـه پـوش‌و پـه‌لاش‌و نـه‌ش‌و نمایـان تێدانـه‌ماوه، دارو دره‌ختـه‌کانی پێویـستیان پێیـه‌تی، گیانلەبـه‌ره‌کانی ژیانیـان له‌سـه‌ر ئـه‌و بارانـه بەنـده، جـا کەبارانەکه ده‌بارێ‌و زه‌وی تێرئاو ده‌بێ‌و گژوگیای ناوسکی زه‌وی هـه‌مووی چه‌که‌ره ده‌کـاو سـه‌رده‌ردێنی‌و ده‌خـه‌ملێ‌و زه‌وی ده‌رازێنێتـه‌وه. وه‌کـوو له‌ئایـه‌تێکی تـردا ده‌فه‌رموێ: ﴿فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج/٥).

﴿وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَاماً وَأَنَاسِيَّ كَثِيراً﴾ بۆئـه‌وه‌ی گیانله‌بـه‌رو ئـاده‌میزاد به‌تایبـه‌تی لـه‌ئاوی ئـه‌و بارانـه بخواتـه‌وه: بێگومـان ئـاده‌میزاد زیـاتر پێویـستیان پێیه‌تی بۆ درێژه‌دان به ژیان‌و ئاودێرکردنی کشت‌و کاڵیان، وه‌کوو له‌ئایه‌تێکی تـردا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ﴾ (الشورى/٢٨).

به کورتی پـه‌روه‌ردگار له‌سودبه‌خـشی ئـاودا دووشـتی بـاس کـردوه، یه‌کـه‌میان: رسکان‌و شین بوونی گژو گیاو دره‌خت. دووه‌میان: بۆ درێـژه پێـدانی ژیـانی ئـاژه‌ڵ‌و ئاده‌میزاده. هه‌ر بۆیه‌ش به‌تایبه‌تی باسی ئـاده‌میزادو ئـاژه‌ڵی کـرد، چونکه باڵنـده‌و گیانله‌به‌ره‌کانی تر هه‌رچه‌نده ئـه‌وانیش بـه‌بێئاو ناژیـه‌ن‌و پێویـستیان بـه ئـاوه بـۆ درێژه‌پێـدانی ژیـان، بـه‌ڵام ئـه‌وان لـه‌ئاژه‌ڵ‌و ئـاده‌میزاد پـشوو درێـژترن‌و ده‌تـوانن ماوه‌یه‌کی زۆر بـه‌بێ ئاو بژین، ده‌توانن ڕێگایه‌کی دورو درێـژ بـبڕن بـۆ په‌یـداکردنی ئاو.له‌ئایه‌ته‌که‌دا ئاژه‌ڵی پێش ئاده‌میزاد خست، چونکه ئاژه‌ڵ زیاتر پێویستی بـه‌ئاو هه‌یـه‌و ناتوانـێ وه‌کـوو ئـاده‌میزاد تـه‌عبیر له‌پێویـستی خـۆی بـۆ ئـاو بکـا، بـه‌ڵام ئاده‌میزاد جۆره‌ها پیلان‌و نه‌خشه ده‌زانێ بۆ وه‌ده‌ستهێنانی، له‌لایه‌کی تره‌وه ئه‌گه‌ر ئـاده‌میزاد ئاویـان ده‌سـت کـه‌وت بـۆ کـشت‌وکاڵ‌و ئاژه‌ڵیـان دیـاره بـۆ خواردنـه‌وه‌ی خۆیشیان هه‌یه.

تـه‌عبیره قورئانیه‌کـه مانـای پـاکی‌و پاککردنـه‌وه بـۆ ئاوه‌کـه بـه‌زه‌قی ده‌رده‌خـا، تارماییـیه‌کی تایبـه‌تـی ده‌خاتـه سـه‌ر ژیـان، ئـه‌ویش دیـارده‌ی پـاك‌و خاوێنییـه،

چونکە یەزدان دەیەوێ ژیان پاكو خاوێن بێ، هەر بەو ئاوە پاكو پاكەوەكەرەوە روبەری زەوی دەشواو ژیان دەخاتە ناو رەگەگیاو دەنكەتۆمو دەیانهاوسێنێو چەكەرەیان پێدەكاو دەیانرەخسێنێ! ئادەمیزادو ئاژەڵیش تێر ئاو دەكا.

ئەمجار دوابەدوای رانواندنی ئەم دیمەنە كەونییانە: كە بەنازلكردنی ئاوی پاكو پاكەوەكەر كۆتاییان هات، لایەكیش لەقورئان دەكاتەوە: كە لەئاسمانەوە نازڵ كراوە بۆ پاككردنەوەی دڵو گیان، سەرزەنشی ئەوەیان دەكا: بۆچی بەبارانـدنی باران كەیفخۆشنو بەنازڵبوونی قورئان كەیفخۆش نابن؟

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا﴾ بێگومان بەڵگەو دەلیلەكانی قورئان لەحاڵێكەوە دەگۆڕێن بۆ حاڵێكی تر، جارێك بە شێوەی هەڕەشەو دەمێك بەشێوەی سەرگوزەشتەو چەڵێك بەشێوەی فەرمانو جڵەوگیریو كاتێكیش بەشێوەی رانواندنی دیمەنەكانی بوونەوەر، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەخۆیان دا بچنەوەو پەندو عیبرەت وەربگرن.

بە هەموو شێوەیەك قورئانیان بەسەردا رادەنوێنین، ئاراستەی دڵو دەروونو هەستو گیانیانی دەكەین، لەهەموو لایەكەوە بەڵگەیان بۆ دەهێنینەوە، هەموو هۆكارێكیان بۆ دەخەینە گەڕ بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان بیر بكەنەوە، هەركاتێ رێگەی بیركردنەوەو بەخۆدا چونەوەیان گرتەبەر رێگای حەقیقی دەدۆزنەوەو ئیمان دەهێنن. پەی بەو ئیمانە دەبەن: كە لەسروشتیاندا رسكاوەو هەواو ئارەزو بازیی لەبیری بردونەوە، بەڵام ﴿فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلاَّ كُفُوراً﴾ زۆربەی خەڵك پەند ئامێز نابن، ئیمان ناهێنن، لەجیاتی شوكرو ملكەچ كردن بۆ خودا كافردەبنو ئینكاری نیعمەتەكانی خودا دەكەن! ئەمە ئەگەر راناو لە ﴿صَرَّفْنَاهُ﴾ دا بگەڕێتەوە بۆ قورئان.

بەلاّم هەندێ لەموفەسسرین راناوەکە دەگێڕنەوە بۆ باران ئەو کاتە مانای ئایەتەکە بەم جۆرە دەبێ، بێگومان ئێمە باران بلاّودەکەینەوە، لەشوێنێکەوە دەیگوێزینەوە بۆ شوێنێکی ترو ئەم زەوی پێ ئاو دەدەین و لەو زەوی دەگرینەوە.

لەولاّتێك دەیبارێنین و لەولاّتێك نا، هەورەکان لەناوچەیەکەوە دەگوێزینەوە بۆ ناوچەیەکی تر بۆ ئەوەی ئادەمیزادان شوکرو سوپاسی خودا بکەن بەسەریانەوە. پەندو عیبرەت وەربگرن، بزانن: کە ئەو بارانە خودا دەیبارێنێ، خودا وەرزەکانی بۆ دەرەخسێنێ و هەورەکان تێك دەچرژێنی و لەکوێی بوێ لەوێ باران دەبارێنێ.

جا لەباتی ئەوەی ئادەمیزادان سوپاسی بکەن پێی کافر دەبن، باران بارینەکە پالّ غەیری خودا دەدەن، دەلّێن: وەرزو زینگە، یان فلاّن ئەستێرە بارانی بۆ باراندین. بە هەرحالّ ئەم مانایەش هەرچەندە وێ چووە بەلاّم مانای یەکەم جوانترەو باشتر دەچەسپێ.

﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيراً﴾ ئەگەر بمانویستایە لەهەموو شارو شارۆچکەیەك دا پێغەمبەرێکمان رەوانە دەکرد، خەلّکی لەسزای بەئێشی دۆزەخ بترساندایە، بەلاّم ویستمان وانەبووەو بڕیاری ئەوەمان داوە : کەتۆ رەوانە بکەین بۆ سەر عالەمی جندۆکەو ئادەمیزاد، بۆ سەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی و فەرمانمان پێ کردوی: کە ئەم قورئانە بەهەموو جیهان بگەیەنی و پێغەمبەری هەموو ئادەمیزادبی هەر لەئێستاوە تا دونیا کۆتایی دێ.

کەوابێ ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر قورس و گرانە؛ بەتاقی تەنیا بەرەو رووی ئادەمیزاد دەبێتەوە، زۆربەشی هەواو ئارەزۆ پەرستە، پەروەردگار تەنیا یەك لەبەندەکانی بۆ ئەم کارە هەلّبژاردووەو ئەو ئەرکەگران و پیرۆزەی خستۆتە سەرشانی ئەو. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ (الشورى/٧) یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً﴾ (الأعراف/١٥٨).

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمیش دا هاتووە دەفەرموێ: (بعثت الى الأحمر و الأسود) واتە: من نێردراوم بۆ لای ناعەرەبو عەرەب. هەروا لەفەرمودەیەکی تردا کە دووبارە بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: ( وكان النبي يبعث الى قومه خاصة وبعثت الى الناس عامة ) پێغەمبەرانی پێشوو دەنێردران بۆ سەر گەلەکەیان بە تایبەتی، بەڵام من رەوانەکرام بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی: ئەم یەکانگیرییەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ یەکدیگیربوونی پەیامی ئادەمیزادە، بۆ پەزمەندەکردنی پاداشی زۆرو گەورەیە، بۆ خودی پێغەمبەر ﷺ.

کەوابێ ئەرکی سەرشانت ئەوەیە: ئەی پێغەمبەر! کە جیهاد بکەی پشوو درێژبێ، گوێ بەپشت هەڵکردنی موشریکەکان نەدەی، لەسەر راگەیاندنو پەیامی خۆت بەردەوام بی.

﴿فَلا تُطِعْ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَاداً كَبِيراً﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! بەگوێی کافرەکان مەکە لەو شتانەی داوات لێدەکەن؛ کە دەڵێن: دژی خواکانی ئێمە مەدوێ، وەرە سەر بیرو باوەڕی ئێمەو ئەم جۆرە شتانە، بەڵکوو جیهادیان لەدژ بکە، بەهەموو چەکێك مادیو مەعنەوی لەگەڵیان بکەوە شەڕەوە، ئەوە قورئان بیکە چەکی کوشندەی خۆتو دژی موشریکەکان بوەستە. بێگومان ئەم قورئانە هێزو تواناو کاریگەرییەکی وای هەیە، ناتوانن بەرەنگارت ببنەوە، بەئاسانی دەتوانی بۆڕیان بدەیو بەسەریان دا زاڵ ببی، بەبیستنی ئایەتەکانی دڵیان وەلەرزە دێو هەناسە بڕکێیان پێ دەکەوێو چی بکەن دەرەقەتت نایەن.

بێگومان قورئان لەسەر دڵی گەورەو سەرانی قورەیش زۆر کاریگەر بوو، بەبیستنی ئایەتەکانی حەجمینیان لێ هەڵدەگیرا، نەیاندەزانی چی بکەنو چۆن بەرەنگاری بوەستن، هیچی تریان پێ نەدەکرا بەجەماوەرەکەیان دەگوت: ﴿لَا تَسْمَعُوا لِهَذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ (فصلت /٢٦ ) گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرنو لەکاتی خوێندنی دا بیکەنە ژاوە ژاوو گاڵو بوغڵ. بەڵکوو ئێمە

سەرکەوتـووبـیـن. ئەگەر قورئان کاریگەرییەکی توندی لەسەر موشریکەکان نەبوایە سەرانی قورەیش ئەم داوایانەیان لەشوێنکەوتوانی خۆیان نەدەکرد، ئەگەر لەقوڵایی ناخیانــەوە بەبیــستــنی ئایـەتـەکــانی نـەهــەژانایەو تــرس لــەقورئان وەلــەرزەی نـەهێـنانایە هەرگیز ئەم فرمانانەیـان بـەجـەمـاوەری خـۆیـان نەدەکردا!!

دوای ئـــەم ئاوڕدانـــەوە ســـەرپێیە لـــە قورئـــان دەچـــێتەوە ســـەر ڕانوانـــدنی دیمەنەکانی بوونەوەر، ئەوەتا دوای دیمەنی (بــا)ی خۆشوەزو بارانـدنی ئـاوی پـاك‌و پاکەوەکەر دیمەنی دەریا ڕادەنوێنی‌و دەفەرموێ:

٤- ﴿ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَـذَا مِلْـحٌ أُجَـاجٌ وَجَعَـلَ بَيْنَهُمَـا بَرْزَخاً وَحِجْراً مَحْجُوراً﴾ پـەروەردگار خودایـەکی وەهایـە دوو دەریـای ئـاوی سـوێرو شیرین لەپەنایەکەوەی خستوونە گۆڕێ، ناهێڵێ ئاوەکانیان تێکەڵ بەیـەك بـن، ئـەم ئاوەیان شیرین‌و گەوارایـە، ئـەوەیان تـاڵ‌و سـوێرە لەپەنایەکـەوەن هـەردوکیان ئـاون کەچـی تێکـەڵ بەیـەکتری نـابن دەڵێـی پـەردە لـەناویان دایـە دەڵێـی دووشـتی دژ بەیەکن‌و پێکەوە هەڵناکەن، ئەو دوو دەریایە لەپێش چاو هـەردوکیان ئـاون، بـەڵام لەراستی دا لەیەکتر جوداوازن.

وەکوو لەئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿مَـرَجَ الْبَحْـرَيْنِ يَلْتَقِيَـانِ، بَيْنَهُمَـا بَـرْزَخٌ لَّـا يَبْغِيَانِ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ (الـرحمن/١٩-٢١) یـان دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَـلَ بَـيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُـونَ﴾ (النمـل /٦١) بـەڵێ: لـەنێوان دوو دەریادا پەردەیەکی قودرەت هەیە، ناهێڵێ تێکەڵاوبن.

پـەروەردگار لـە سروشـتییان دا هێزێکـی مانیعـەو دافیعـەی وای دروسـتکردوە نــاهێڵێ بـچن بـەناو یەکـدا. سروشـتی وا داڕشـتوون لـەناو یـەکتردا حـەل نـەبن، مونافەرەیەکی وایان لەنێوان دایە: کە لەوانەنیـە ئـەو مونافەرەیـە تێـك بـچێ، ئـەم حاڵەتـەیان بەردەوامـەو گـۆڕانی بەسـەردا نایـە. خـودا وای دانـاوە مـەجاری جـۆم‌و

جۆگاو زێیەکان لەڕوبەری دەریاکان بەرزتر بێ، کەوابوو ئاوی شیرینو گەوارا دەڕژێتە ناو دەریای تاڵو سوێرەوە بەدەگمەن نەبێ پێچەوانە نابێ.

بەم تەقدیرو مەزەندە کردنە، بەپێی ئەم پلانو نەخشە یەزدانییە، دەریا طوغیان بەسەر ئەو چەمو زێیانەدا ناکا: کە سەرچاوەی ژیانی گیانلەبەرو شیناوردن ، دەی ئەم نەخشەو مەزەندەکردنە بەگۆترە نیەو صودفەو هەڵکەوت چ دەخڵێکیان تێیدا نیە، بەڵکوو بەویستو پلانو نەخشەی پەروەردگار هاتوونەتەدی.

خودا یاسای بوونەوەری واداناوە: کە ئاوی دەریا لووشە تاڵو سوێرەکان بەسەر ئاوی زێیەکاندا طوغیان نەکاو وشکانیش دانەپۆشێ، تەنانەت لەو حاڵەتانەش دا: کە لە دەریادا بەهۆی هێزی کێشندەی مانگەوە مەدو جەزر پەیدا دەبێو ئاو لەئاستی روبەری زەوی زۆر بەرز دەبێتەوە!! دەبێ چ بەڵگەیەك لەوە بەهێزتربێو نیشانەی قودرەتی پەروەردگار بێ؟

هەر دوو ئاوەکە شلەمەنین، کەچی ئاوی شیرین تێکەڵ ئاوی تاڵو سوێر نابێ، خودا بۆ خۆی هەردووك ئاوەکەی بەدی هێناون ئەمەیان شیرینەو ئەومیان تاڵو سوێرە، ئاوی چۆمو زێو بیرو سەرچاوە شیرینو گەوارایە، ئاوی دەریا لووشەکان لە خۆرهەڵاتو خۆرئاواو لەپێنج موحیطەکان دا سوێرە، بە هۆی ئەو سوێرییەوە بۆگەن ناکاو بەپاکی دەمێنێتەوە. بە هۆی مەدو جەزرەوە هەوای ناو دەریا تازە دەبێتەوەو ماسییەکان دەتوانن لە قوڵایی دەریاکاندا درێژە بەژیان بدەن.

٥- ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنْ الْمَاءِ بَشَراً فَجَعَلَهُ نَسَباً وَصِهْراً وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيراً﴾

پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئادەمیزادی لەدڵۆپە ئاوێکی زەعیف بەدیهێناوە، پەروەردەی کردوەو پێی گەیاندوە، رێکی خستووە ، کردویەتی بە ئادەمیزادێکی تەواو، بەویستی خۆی کردویەتی بە نێرینە یان مێینە، دابەشی کردون بەدوو بەش: نێرینە نزادیان وەپاڵ دەدرێ، مێینە دەکرێنە هۆکاری خزمایەتی ژنو ژن خوازییو خەزورو زاوایەتی.

ژیـانی ئـادەمیزاد کـە لەودڵۆپـە ئـاوە پەیـدا دەبـێ زۆر سەرسـوڕهێنەرترە لـە پەیدابوونی ژیان بەهۆی ئاوی ئاسمانەوە لە خانەیـەکی نـاو (هـەزاران خانـە کـە لـە دڵۆپـە ئـاوی پیـاودا هەیـە) لـە منداڵدان دا تێکـەڵ بـە هێلکـەی ئـافرەت دەبـێ ئـەو ئادەمیزادە سەرسوڕهێنەرە دەخولقێ: کە سەرسوڕهێنەرترین کائیناتی زیندوە.

لەنێو ئەو خانە وێکچوانەی ناو دڵۆپە مەنی پیاوو ئەو هێلکە وێکـچوانەی نـاو منداڵـدانی ئـافرەت کەبـە شـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەرخانەیەك لەگـەڵ هێلکۆکـەی ئافرەت تێکەڵاو دەبن، نێرو مێ دروست دەبێ. چۆنیەتی پەیدابوونی نێـر یـان مـێ، ئادەمیزاد نهێنییەکەی نازانێ، زانیـاری ئـادەمیزاد نـاتوانێ ئـەو زانیارییـە کۆنـترۆڵ بکاو بەدەستی بێنێ، یان عیللەتو بایسی بزانێ.

بەڵێ زانیاری (طب) گەییشتۆتە ئـەوە بزانـێ: کـە ئەگـەر فـلان جـۆری مـەنی پیاو تێکەڵ بە فلان هێلکۆکەی ئافرەت بـوو، منـداڵەکە کـوڕ یـان کـچ دەبـێ، بـەڵام نـهێنی ئەوە بۆچی جاری واهەیە ئەو فلان جۆرە خانە تۆماوە لەگـەڵ فـلان جـۆرە هێلکۆکە یەکدەگرن؟

ئەم سەرو سـیماو رەنـگو روخـسارە ، قـەدو بـاڵاو لـەشو لارە چـۆن لـەناو ئـەو خانە هەرە بچکـۆلەیەدا لەباوكو دایکەوە گواستراپەوە بۆ ئەو ئادەمـیزادە تـازە پەیدابووە. چی وای کرد ئەمە کوڕبێو ئەوە کچ بێ. هیچ وەڵام نین جگە لـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَكَـانَ رَبُّـكَ قَـدِيراً﴾ خـودای تـۆ ئـەی موحەممـەد! خـاوەن توانـاو دەسەڵاتە.

ئەگـەر ئـادەمیزاد وردەکـاری لـەو تۆمـاوە بکـا: کـە ئـادەمیزادی لێپەیـدا دەبـێ، سـەری گێـژ دەبـێو توشـیوڕبوونو سەرسـوڕمان دی لـەکاتێك دا: کـە لێکۆڵینـەوە ئـەنجام دەدا دەربـارەی هـەبوونی ئـەو هـەموو تایبەتمەندییـە مـادیو مەعنەوییانـەی ئـادەمیزاد کـە لـەوخانە بـچکۆلەدا حەشاردراون، چـۆن ئـەو

هەموو پێکهاتەگەرایی‌و رەچەڵکیيانەی باوك‌و دایك‌و خزم‌و کەس‌و کار لەناو ئەو خانە هەرە بچکۆلەیەدا گواستراوەتەوە بۆ ئەو کۆرپەلە نێرینە یان مێینەیەو هەریەکەیان بە گوێرەی خۆی!؟

هەموو خانە رەچەڵەك‌و گەرایەك نێر بێ یان مێ بێ، چەند کروموسوم‌و جینەی لە خۆگرتوون، کروموسوم مادەیەکی عوضوییە خاڵە گەردیلەیەکی زۆر بچوکە دەوری جینەکەی داوە، رۆڵی هەیە لەنەقڵ کردنی رەوشتە میراتییەکان دا. جین : هۆکارێکی سەرەکی‌و یەکلاکەرەوەیە بۆ ئەو شێوەو روخسارەی دوایی کائینە زیندوەکە لەسەری دەبێ.

هەر لەخانەکەی دا وێرای کروموسوم‌و جیناتەکان مادەیەکی تر هەیە پێی دەگوترێ: (السیتوبلازم) ئەمەش تەرکیباتێکی کیمیاوی سەیرو سەمەرەیە دەوری کروموسوم‌و جینەکانی داوە.

ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر بەتوانایی خودای مەزن، کە ئادەمیزادی لەجوانترین شێوەدا دروست کردوە، هێزو توانای حیسسی‌و عەقڵی داوەتێ، رێبازی زانین‌و بیرکردنەوەی نیشان داوە، بەسەر هەموو دروستکراوانی جیهاندا بالا دەستی کردوە، دەتوانێ بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بێنێ. پاك‌و مونەززەهە ئەو خودایەی کەوا دەست رەنگین‌و کار دروست‌و زیان بەخش‌و بەدیهێنەری بوونەوەرە.

## نەفامی موشریکەکان لەبارەی پەرستنی شتی نەشیاوەوە رێنمویی کردن بۆ بەندایەتی کردنی خودا

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا

﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾﴾

(٥٦) قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ ...

لەم کەش‌و هەوایەدا؛ کەش‌و هەوای دروست کردن‌و مەزەندە کردن، وێڕای ئەوەی کە خودا ژیانی زیندەوەرانی لە ئاوی ئاسمان‌و ئاوی تۆماو دروستکردوە، ئەو هەموو تایبەتمەندابیانەی تێدا بەدی هێناون، ئەو هەموو رەوشت‌و دیاردانەی لەناو ئەو خانە هەرە بچکۆلەیەدا لە باوك‌و دایکەوە گواستومتەوە بۆ ئەو ئادەمیزادە تازە رسکاوە، خانەیەکی بە نێر داناوەو هەموو دیاردەو رەوشتە میراتەکانی تێدا

حەشاردراون، خانەیەکی بە مێینە بڕیاردراوەو هەموو ڕەوشتە میراتەکانی تێدا حەشاردراون!

ئا لەنێو ئەم کەش‌و هەوایەدا عیبادەت کردن بۆ غەیری خودا بەشتێکی نەفامی‌و سەیر دادەنرێ. بۆیە لێرەدا سووربوونی موشریکەکان لەسەر پەرستنی بتەکانیان رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ:

﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنفَعُهُمْ وَلا يَضُرُّهُمْ﴾ ئەو موشریکە نەفامانە عیبادەت دەکەن جگە لەخودا بۆ شتێك: کە عیبادەتکردنەکەیان بۆی سودیان پێ ناگەیەنی‌و عیبادەت نەکردنیشیان بۆیان زیانیان بۆ کێش ناکا. هیچ بەڵگەیان بەدەستەوە نین لەسەر پەرستش بۆ کردنیان جگە لەشوێن کەوتنی هەواو هەوەسی خۆیان‌و لاسایی کردنەوەی کوێرانەیان بۆ باوك‌و باپیرانیان.

﴿وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَى رَبِّهِ ظَهِيراً﴾ کافرو موشریکەکان بە سەرپێچی کردنیان بۆ فەرمانی خوداو ئەنجامدانی تاوان یارمەتیدەری شەیتانن، هەمئاهەنگی ئەو دەکەن، دژی خودا دەجوڵێنەوە، دوژمنی ئایینی خودان، ئەوان کە دژی پێغەمبەرن، دژی خودان، جا ئەوان چین هەتا دژی خودا بجووڵێنەوەو بەربەرەکانی خودا بکەن!؟

ئەمجار دڵنەوایی پێغەمبەر دەکاو ئەرکی سەرشانی سووك دەکاو پێی رادەگەیەنێ: کە ئەوەی لەسەر پێغەمبەرە تەنیا موژدەپێدان‌و ترساندنە، جیهاد کردنە لەگەڵ کافرەکان‌و پەیام گەیاندنە، ئیتر لەوەدوا گوێی بەدژایەتی تاوانباران نەداو بە هیچیان نەزانێ، خودا بۆ خۆی دەرەقەتیان دێ‌و لە عۆدەیان دێ دەزانێ شیاوی چ عەزابێکن!

دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ مُبَشِّراً وَنَذِيراً﴾ بێگومان موشریکەکان ئەحمەق‌و نەفامن، چۆن دەبنە یارمەتیدەری شەیتان‌و سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن، پێغەمبەری رەوانەکردوە  بە موژدەدەرو ترسێنەر؛ موژدەی بەهەشت بدا بەوانەی پابەندی فەرمانی خودان، سەرپێچیکارانیش بترسێنێ لەئاگری دۆزەخ. ئەتۆش ئەی

پێغەمبەر! تەنها ترسێنەرو موژدەدەری، حیساب‌و لێکۆڵینەوەو عیقابیان بەدەست خودایە، بەوە خەفەتبار مەبە: کە ئیمان ناهێنن. ئایا کێ لەوە نەفامترە بیەوێ ئەزیەتی کەسێك بدا کە هەوڵی ئەوەیەتی لەدونیاو قیامەت دا تووشی بەختەوەری بکا ؟!

﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو کافرانە بڵێ: من لەپێناو ئەم بانگکردن‌و راگەیاندنە داوای کرێتان لێناکەم، من پاداشتی خۆم لەخودا داوادەکەم‌و مەبەستم دەستەبەرکردنی رەزامەندی خودایە!

﴿إِلَّا مَنْ شَاءَ أَنْ يَتَّخِذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً﴾ واتە: هەرگیز من داوای پاداشتان لێناکەم، بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێ لەخودا نزیك بێتەوە، لەرێگای خودا دا ماڵ‌و گیان ببەخشێ بۆئەوەی پاداشتی باشی دەست بکەوێ با دەست بەکاربێ‌و ساتەوەختێك رانەوەستێ. واتە: وامەزانن ئەو عیبادەتەی دەیکەن کرێیەو دەیدەن بەمن. بەڵکوو ئێوە داوای ئەجر بکەن بۆ خۆتان بەکردنی کاری باش‌و عیبادەتی خوداو سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی. پاداشی من لای خودایەو ئەوپاداشم دەداتەوە!

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێ: کە کاکڵەو پوختەی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ بریتی بووە لەموژدەدان‌و ترساندن، واتە: با وانەزانین: کە ئەم ئایەتە چونکە مەککییە بە ئایەتی(قتال) هەڵوەشاوەتەوە. بەڵکوو ئەم ئایەتە وەکوو چۆن لەمەککە کاری پێ کراوە، لەمەدینەش حوکمی هەرماوە، شەڕکردن‌و جەنگان دژی کافران تەنها کاتێ رەوایە: کە بۆ لابردنی کۆسپ و تەگەرەی سەر رێبازی بانگەوازی یەکە بێ. ئەگینا هەرگیز ئایین بەزۆرە ملێ نەچەسپاوەو ناچەسپێ، زەبرو زەنگ و شمشێر کاتێك بەکاردێ: کە بەربەست‌و تەگەرە بخرێتە بەردەم بانگخوازان‌و نەهێڵدرێ دەعوەی ئیسلامی رێبازی ئاسایی خۆی بگرێتەبەر.

لەلایەکی ترەوە وەکوو لەوەپێشەوە ئاماژەمان پێ کرد: پێغەمبەرﷺ ج تەماعێکی دونیای نەبوە لەپاساوی بانگخوازییەکەی دا، بەتەما کرێ‌و پاساودانەوەی ئەوانە نەبوە: کە هیدایەتی ئیسلامییان وەرگرتووە.

لەئایینی ئیسلام دا بەرتیل‌و باج‌و گومرگی بۆ چوونە ناو ئایین نیە، کابرا شایەت‌و ئیمان دێنێ‌و بەزمان ئیقرار دەکاو بەدڵ باوەڕی بەو شایەت‌و ئیمانە هەیەو بەکردەوەش تەصدیقی ئەو ئیمانە دەکا، ئەمەیە میزەی ئیسلام جیابوونەوەی لەئایینەکانی تر، لەئیسلام دا کوڵەوە نانی نیە کرێی کوڵەوەنانییەکەی وەربگرێ، واسیتەو ناوەند نیە کرێی ناوەندییەکەی وەربگرێ. رەسمی چوونە ناو ئایین نیە!

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ﴾ ئەی پێغەمبەر! گوێ بە هەڵسوکەوتی کافرەکان مەدە، بەردەوام بە لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆت، لەهەموو کاروبارێکتدا پشت بەو خودایە ببەستە: کە زیندوەو نامرێ، تەنها پشتیوانی ئەوت بەسە، هەرکەسێ خودای لەپشت بێ لەشەڕ پارێزراوەو کەس ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ، پشت بەغەیری خودا مەبەستە، هەموو شتێك جگە لەخودا بەرەو مردن‌و فەوتان دەچێ جگە لەخودا هیچ شتێك نامێنێتەوە زوو یان درەنگ دەچێتە دەریای عەدەمەوە.

پشت بەستن بەغەیری خودا پشت بەستنە بەشتێکی روخاوو بەرقەرار نەبوو، خۆ پەنادانە بۆ سێبەرێك کە زوو بەسەر دەچێ، کەوابێ پشت بەستن هەر دەبێ بە خودایەك بێ: کە زیندوەو نامرێ، بەرقەرارەو نافەوتێ، پشتی پێ ببەستەو حەمدو سوپاسیشی بکە، لەهەموو عەیب‌و خەوشێك لەهەموو کەم‌و کوڕییەك بەدووری بگرە، گوێ مەدە بەهەڵوێستی کافرەکان کاری ئەوان حەواڵەی خودای هەمیشە زیندو بکە، ئەو ئاگاداری تاوان‌و هەڵوێستیانەو هیچی لێگوم نابێ.

﴿وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيراً﴾ ئەتۆ بەستە ئەی موحەممەد! کە خودا ئاگادارییەکی تەواوی هەیە بە تاوانی بەندەکانی، نهێنی‌و ئاشکرای لاچون یەکەو هەموو کارو کردەوەکانیانی لەسەر تۆمارکردون‌و سزاو پاداشتیان لەسەر دەداتەوە چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

ئەمەش تەسەللادانەوەیە بۆ پێغەمبەرو هەڕەشەیە لەکافرەکان: کە ئەگەر ئیمان نەهێنن بابزانن خودا لێیان غافڵ نیەو ئاگاداری هەموو شتێکیانە!

ئەمجار هەر لەروانگەی نمایشکردنی زانیاری رەهاو توانای رەها لەسەر سزاو پاداشدانەوەی خودا بۆ بەندەکانی. باسی بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و کۆنترۆڵ کردنی گەورەترین مەخلوقات دەکا: کە عەرشی مەزنە.

دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ الرَّحْمَنُ فَاسْأَلْ بِهِ خَبِيراً﴾ خودای بەخەبەرو زانا بەهەموو شتێك، ئەو ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی تێیان دایە، لەماوەی شەش رۆژدا بەدی هێناون پاشان کۆنترۆڵی عەرشی کردو بەوشێوەی: کەشیاوی خودایە ئیستیوای لەسەر کرد. وێڕای بالادەستی‌و کۆنترۆڵکردنی عەرش، خاوەن رەحم‌و بەزەییە، لەگەڵ رەحمەتەکەشی دا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

شایانی باسە ئەو رۆژانەی بوونەوەریان تێدادروست کراوە جیاوازن لەم رۆژە ئاساییانەی ئێستای ئێمە لەسەر زەوی، چونکە رۆژی ئێمە دیاردەی یاساو نیظامی کۆمەڵەی خۆرین. پێوەرێکی هەڵخولانی فەلەکین، ئەم پێوەرە دوای بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی هاتۆتە کایەوە ، رۆژی ئێمە ئەندازە زەمەنییەکە بەهۆی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆی داو لەبەرامبەر خۆردا دێتە کایەوە. کەوابێ ئەم شەش رۆژەی بوونەوەری تێدا خراوەتە گەڕ لەورۆژانەن کە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ ئەندازەکەیان چەندبووەو چۆن بوون، لەوانەیە ئەو شەش رۆژە بریتی بن لە شەش قۆناغ‌و ئەطواری دورو درێژی ناو ئاسمانەکان‌و زەوی تا سەرەنجام ئەم بوونەوەرەیان لێپێك هات.

کەچی وێڕای ئەم هەموو شکۆمەندی‌و زانایی‌و دانایی‌و بەدەسەڵاتیەی خودا، ئەو موشریکە نەفامانە ئەگەر بانگیان لێبکرێ بۆ خوداپەرستی بە شێوەی گاڵتەپێکردن‌و مل نەدان بۆ بەندایەتی دەڵێن: عیبادەتی چی‌و بۆ کێی بکەین؟!

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَا الرَّحْمَنُ ؟﴾ ئەگەر پێیان بگوترێ: سوژدە بۆ ئەو خودایە بەرن ناوی ( الرحمن )ە وێڕای شکۆمەندیو خاوەن دەسەلاتیو بەتوانایی خۆی خاوەن رەحمو بەزەییشە، لەوەلامدا دەڵێن: (الرحمان) کێیە؟ ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا ؟﴾ ئایا سوژدە بۆ کەسێك بەرین فەرمانمان پێ دەکەی بە سوژدە بۆ بردنی؟ هەر بەوەندە کەتۆ فەرمانمان پێ دەکەی بەبێ ئەوەی ئێمە بیناسینو بزانین کییە سوژدەی بۆبەرین؟ بەم لەهجەو شێوە ئاخاوتنەوەلامی بانگەوازییەکە دەدەنەوە! دەڵێن: رەحمان کییە ئێمە سوژدەی بۆ بەرین؟ سەرڕەقیو خۆ بەزلزانینیان گەیشتبوە ئاستێك بڵێن: ئێمە جگە لەو رەحمانەی لەیەمامەیە رەحمانی تر ناناسین!! مەبەستیان (مسیلمە)ی درۆزن بوو.

﴿وَزَادَهُمْ نُفُوراً﴾ ئەم فەرمان پێکردنەیان بەسوژدە زیاتر شێلگیری کردنو پتر رویان وەرگێڕاو لەحەقو راستی دوور کەوتنەوە. ئەمجار خودا رەددی دەمدرێژیو خۆبەزلزانیو گاڵتە کردنیان بە خوداو بە پێغەمبەردانەوە بەوەی ئەو خودایەی ناوی (الرحمان)ە داوایان لێدەکرێ سوژدە بۆ بەرن خودایەکی خاوەن دەسەلاتو شکۆمەندە، ئەگەر تۆزێك بیر بکەنەوە خێرا دەیناسنو سوژدەی بۆ دەبەنو عیبادەتی بۆ دەکەن!

دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً﴾ پاكو مونەززەهە ئەو خودایەی یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی (الرحمان)ەو لەئاسمان دا ئەستێرەی گەورەو زەبەلاحی دروست کردون قۆناغو مەدارو جەمسەری بۆ ئەو ئەستێرانە داناوە: کە ژمارەو قەبارەیان هەر خودا بۆ خۆی دەیزانێ چەندەو چۆنن. ئەوەتا ئەو خودایەی ئێوە بڕوای پێ ناکەن بڕێك لەمەخلوقاتەکانی ئەو ئەبراجە گەورەو جۆراو جۆرانەن.

﴿وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً﴾ هەر لەچوارچێوەی ئەو بورجانەدا خۆری کردوە بەچرای پرشنگدارو روناکی بۆ گۆی زەویو وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجاً وَهَّاجاً﴾ (النبأ/١٣).

﴿وَقَمَراً مُنِيراً﴾ هەروەها مانگی نورانی داناوە کە لەشەودا روناکایی خۆی دەدا بە گۆی زەوی.

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً﴾ پەروەردگار خودایەکیوەهایە شەوو رۆژی بەدیهێناون یەك بەدوای یەك پەیدادەبن، رۆژ تەواو دەبێ شەو دێتە جێگای شەو دەڕواو رۆژ دێتە شوێنی، هەریەکەیان دەبێتە جێنشینی ئەویتریان، کەسێك بەرۆژ ئیشی رۆژی بۆ تەواو نەکرا دەتوانێ بەشەو ئەنجامی بدا، ئەگەر شەو ئیشی شەوی بۆ تەواو نەکرا دەتوانێ بەرۆژ قەرەبوی بکاتەوە.

لە حەدیثی بوخاریو موسلیم دا هاتووە دەفەرموێ: (ان الله عزو جل يبسط يده بالليل ليتوب مسيء النهار، و يبسط يده بالنهار ليتوب مسيء الليل).

ئەبوداودی (الطيالسي) لە(الحسن) ریوایەت دەکاو دەڵێ: عومەری کوڕی (الخطاب) رۆژێك نوێژی چەشتەنگاوی زۆری کرد (صلاة الضحى)ی زۆر درێژکردەوە، پێیان وت: ئەوە چی بوو ئەمڕۆ شتێکت کرد لەوەپێش نەتکردوە؟ لەوەڵامدا وتی: شتێکم مابوو لەویردی شەوم بیخوێنم ویستم ئێستا تەواوی بکەم.

شەوو رۆژ بۆخۆیان دوونیشانەی بە تواناییو گەورەیی پەروەردگارن بەڵام بەهۆی زۆر دووبارەبوونەوەیان سەرنجی ئادەمیزادان راناکێشن، ئائەم مەزندە کردنەو یەك بەدوایەکدا هاتنەیان بەسە بۆ کەسانێك بیانەوێ بیربکەنەوەو بزانن چیان لەسەر پێویستە بیکەن، شوکرو سوپاسی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا بکەن، بیر لەنیعمەتە زۆرو لەبن نەهاتوەکانی بکەنەوە.

خۆ ئەگەر خودا ئاوا بەو جۆرە بەدی نەهێنانایەو لەناو خۆیاندا نۆرەیان نەکردنایە ژیان لەسەرگۆی ئەم زەوییە بەردەوام نەدەبوو، نەئادەمیزادو نەگیانلەبەری ترو نەدرەختو رووەکی لەسەر نەدەژیا.

زانایان دەڵێن: ئێستا کورەی زەوی هەموو بیستو چوار کاتژمێرێك بەدەوری میحوەری خۆیدا خولێك تەواو دەکا. یان دەڵێن: لەهەموو کاتژمێرێکدا هەزار میل دەبڕێ، خۆ ئەگەر وابهاتایە لە کاتژمێرێك دا (١٠٠) میلی ببڕیایە ئەو کاتە شەوو رۆژمان دەهێندەی ئێستا درێژ دەبوون لەم حاڵەدا بەرۆژ خۆر هەموو شتێکی دەسوتاند، هەرچی گیاو گژو دارو درەخت هەیە، بەرۆژ گڕی دەگرت. بەشەویش هەموو شتێك دەیبەست ، کەوابوو پاكو مونەززەهە لەهەموو عەیبو نەنگییەك ئەو خودایەی ئاسمانەکانو زەوی. بەدیهێناون، هەموو شتێکی بەئەندازەو نەخشە دروست کردوە، هەموو دروستکراوێکی نیشانەی حیکمەتو داناییە!

## رەوشتی بەندەکانی خودا

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟

وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا

﴿تَحِيَّةً وَسَلَامًا ﴿٧٥﴾ خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾﴾

ئەم کۆمەڵە ئایـەتە لـەم سورەتە پێناسـەی بەنـدە راسـتاڵەکانی خـودا دەکـەن، رەوشتە تایبـەتـیـەکانیان و کەسایەتییان دیاری دەکەن، هەردەڵێی ئەوان پـاڵفـتـەی ئـادەمیزادن و لـەناکامی ئـەم جیهـادە دورو درێـژەی پێغەمبـەران سـەرەنجامی مەعرەکـەی نێـوان حـەق و بـەتاڵ هاتوونـە بەرهـەم و بـەروبوومی ئـەو هـەوڵ و تێکۆشانە دورو درێژەی پێغەمبەرانـن.

لـەوەپێش ئـەوەی راگەیانـد: کـە موشـریکەکان گاڵتـەیان بـەناوی (الرحمـان) دەکرد و دەیانگوت رەحمان کێیە تا ئێمە بەندایەتی بۆ بکەین ؟؟

ئیتر لەم کۆمەڵە ئایەتـەدا ئـەوە رادەگەیـەنێ: کـە(عبـاد الـرحمن) ئەوانـەن و ئەوانـە شـیاوی ئـەوەن: کـەوەپاڵ خـودا بـدرێن! پێیـان بگـوترێ بەنـدەی رەحمـانن! ئەوەتا ئەوانە بەرەوشت و هەڵسوکەوت و دڵ و دەروون و کارو کـردەوە شـیاوی ئـەوەن بەنـدەی رەحمـان بـن! ئەوانـە نموونەیـەکی زینـدوو واقـیعین بـۆ ئـەو کۆمەڵـەی: کەئیـسلام دەیـەوێ دروسـتی بکـاو ئـەرکی بڵاوکـردنـەوەی ئـایـیـن و پـاراسـتنی لەئەستۆبگرن، جیهاد بکەن لەپێناویا.

ئابەو شێوەیە رەوشـتی موسـوڵمانانی راسـتاڵ دەسـت نیـشان دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا﴾ بەنـدە راستاڵەکانی خودا ئەوانـەن: کە بەئەدەب و ویقارەوە بەسـەر زەویدا دەڕۆن! لـە رۆیـیـشتن و جـەم و جوڵیـاندا لارو لەنجەو دەعیەو تەکەببور ناکەن.

بەسەر زەوی دا دەڕۆن بەرۆیشتنێکی لەسەرەخۆو سادە، خۆیان بادەن، قونگرانی ناکەن، بەزۆر بارێکی رۆیشتنی نائاسایی بەسەر خۆیان دا ناهێنن، ئاوڕدانەوەو جرتو فرت لەرۆیشتنەکەیاندا ناکەن! رۆیشتن وەکوو هەموو جمو جوڵێکی تر رەنگدانەوەی کەسایەتییە، نیشانەی ئەو هەستو شعورانەیە: کە لەناخیاندا پەنگیان خواردۆتەوە، ئادەمیزادی لەسەرەخۆو خاوەن رەوشتی بەرزو دڵئارامو بەشەخصیەت رەوشتەکانی لەرۆیشتنیدا دەردەکەون، ویقارو لەسەرەخۆییو پشوو درێژیو کەسایەتی دیاردەکەوێ.

مانای ﴿يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْناً﴾ ئەوە نیە موسوڵمانان ملی خۆیان کوزو بکەنو سەری خۆیان دابخەنو شلو شێواو لەش داهێزراو شپرێو؛ گوایە ئەوە نیشانەی تەقواو خوداپەرستییە. نەخێر هەرگیز نابێ ئەم جۆرە مانایە بۆ ئەم ئایەتە بکەین.

ئەوەتا پێغەمبەرﷺ کە لەهەموو رەوشتێکی بەرزو جواندا مامۆستای مرۆڤایەتی بووە: کە بەرێگادا دەرۆیشت بەجوانترین شێوەو دامەزراویو لەسەرەخۆیی دەڕۆیشت ، لەهەمان کاتدا گورجو گۆڵو چاپوکو پتەو!

ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: کەسم نەدیوە بەئەندازەی پێغەمبەرﷺجوان بێ، دەتگوت خۆر لەدەموچاویدا شۆق دەداتەوە، کەسم نەبینیوە هێندەی پێغەمبەرﷺ خۆشرەوبێ، دەتگوت زەوی دەپێچێتەوە، ئێمە زۆر تینمان بۆ خۆمان دەهێنا هەتا پێی رابگەین، لەهەمان کاتدا پەلەپەلو هانکە هانکی لێ نەدەبینرا، کە دەرۆیی هێزو تواناو عەزمو حەزمی لێهەست دەکرا.

جا موسوڵمانان: کە شوێن کەوتووی ئەو رابەرە مەزنەن، هەموو شتێکیان بەجیدیو ویقارو شکۆمەندییە، دڵیان پڕە لەمەبەستی بەرزو گەورەو پیرۆز، گوێ بەنەفامی ئەحمەقو شەقاوەکان نادەن، کاتو جوهدی خۆیان بەوەلام دانەوەی موهاتەراتی نەفامان بەفیرۆ نادەن، خۆیان زۆر بە بەرزتر لەوە دەزانن دەم لەدەمی ئەوان بنێنو خۆیان بکەنە ئەولاشی خوێریو سەرسەری بازان..

تەنانەت ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمْ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاماً﴾ کە نەفامو سەرسەری پەخەیان پێ دەگرن، دەڵێن: سڵاوتان لێبێو وەڵام دانەوەی ئێوە کاری ئێمە نیە، ئێمە کاتو جوهدی خۆمان بە دەمە دەمێ لەگەڵ ئێوەدا بەفیڕۆ نادەین، ئەگەر سەرسەریو نەزانێك قسەیەکی ناشیرینیان پێ بڵێ: بەهەمان شێوە وەڵامی نادەنەوە، بەڵکوو لێبوردویی نیشان دەدەنو چاوپۆشی دەکەن، نەك لەبەر زەعیفیو بێهێزی بەڵکوو لەبەرئەوەی خۆیان زۆر لەوە بەبەرزتر دەزانن: کە خۆیان هەڵەوگیری وەڵامدانەوەی ئەوانە بکەن، نایانەوێ کاتی زێڕینی خۆیان بەو وشە بێسودانە بکوژن!

ئەمە هەڵسوکەوتیانە لەرۆژدا بەشەویش سەرگەرمی تەقواو خوداپەرستین، بیر لەبوونەوەر دەکەنەوە، لەترسی عەزابی خودا فرمێسك دەڕێژن، دەمێك سوژدەبردنو قورئان خوێندنە، تاوێکیش بیرکردنەوەو بەخۆدا چوونەوەو دادگایی کردنی نەفسو ویژدانە. رۆژیان لەشەویان باشترە شەویان لە رۆژیان بەفەڕتر.

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً﴾ ئەوانەی شەو بەرۆژ دەکەنەوە خەریکی نوێژ کردنن، تاوێك بەپێوەنو دەمێك لەسوژدەدان.

تەعبیرەکە لەناو کردارەکانی نوێژدا حاڵەتی سوژدەو حاڵەتی راوەستان زەق دەکاتەوە، بۆ وێنە کێشانی جەموجوڵی (عباد الرحمن) لەناو تاریکایی شەودا خەڵك نووستونو ئەوان بەخەبەرن.

ئادەمیزادانی تر لەپرخەی خەودانو ئەوان خەریکی نوێژن بەپێوە فاتیحا دەخوێنن یان چوونە سوژدەو سەریان لەسەرزەوی داناوە، بیروهۆشیان، چەپەو ئاخاوتنیان، راوەستانو روکوعو سوژدەیان تەنیا بۆ خودایەو بەوەوە مەشغوڵن، وازیان لەخەوی شیرین هێناوە، خەریکی شتێکی شیرینترن، گیانو هەستو شعووریان بەخوداوە پەیوەستە، لەخودا دەپاڕێنەوە، چاویان بڕیوەتە بارەگای پەروەردگار!

لـەم حالـەتو جـەو جـوڵو خوداپەرسـتییەیان دا دڵیـان پـڕە لەتـەقوا، پـڕە لەترس‌و خۆفی عەزابی دۆزەخ.. وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَـذَابَ جَهَـنَّمَ﴾ ئەوانـەی لـەخودا دەترسـن بـەترس‌و لـەرزەوە لێـی دەپاڕێنـەوە، بەحەزەرەوە هاواری لێدەکەن، دەڵێن: خودایـە ئـاگری دۆزەخمـان لێدووربخەیـەوە، هەڵەو گیری ئەو شوێنەمان نەکەی، چونکە ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَاماً﴾ بێگومان ئاگری دۆزەخ بەردەوامـەو لەیەخـەی ئـادەمیزادی تاوانبـار نابێتـەوە، وەکـوو خـاوەن قـەرز وایـە بـۆ قـەرزدارو بـەربینگی پـێ دەگـرێ تـا تۆڵـەی خـۆی لێنەسـتێنی وازی لێنـاهێنێ!

﴿إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَراً وَمُقَاماً﴾ بێگومـان دۆزەخ خـراپ جێگەیـەکی حەوانـەوەو تێـدا مانەوەیـە، ئەوانـە بەچـاوی خۆیـان دۆزەخیـان نـەبینیوە بـەڵام بڕوایـان بەهەبوونی هەیەو ئەو وێنەی قورئان کێشاویەتی بۆیان دەربـارەی دۆزەخ هەمیـشە لەبەرچاویانە، بۆیە بەوجۆرە ترسیان لێی هەیەو هەمیشە دەسـتی دوعـاو پاڕانـەوە بەرزدەکەنەوە، دەلاڵێنەوە دەپاڕێنەوە: کە خودا تووشی ئەو عەزابەیان نەکا، ئەوان بەشەو نوێژو راوەستان‌و سوژدەبردن بـۆ خـودا دڵنیـا نـابن‌و پـشتێنی لێناکەنـەوە، پێیان وایە چـەندێك تاعـەت بکـەن ئەگـەر فـەضل‌و ئیحسانی خـودا نـەبێ، ئەگـەر رەحمەت‌و عەفوی خودا نەیانگرێتـەوە لـەو عەزابـە رزگاریـان نـابێ بۆیـە سـەرباری ئەو شەو نوێژو خوداپەرستیەیان ئەو پاڕانەوەو لالانەوەیەش ئەنجام دەدەن.

تەعبیری قورئانەکە وادیمەنەکە دەکێشێ وەکـوو ئـەوە بڵێـی دۆزەخ بـەربینگی هـەموو کەسـێك دەگـرێ، دەسـتەو یەخـەی هـەموو کەسـێك ڕادەوەسـتێ، دەمـی کردۆتەوە خەریکە هەموو کەسێك هەڵلووشێ. چنگی کردونـەوەو ئامادەیـە هـەموو کەسێك لەدورونزیك تێکەوە پێچێ!

بەندەکانی خوداش شەو بەخەبەرو سەرگەرمی نوێژ کردن‌و پاڕانەوەن‌و ترسی ئەوەیان هەیە دۆزەخ بیانگرێتەوە بۆیە لەخودا دەپاڕێنەوە کە لەوعەزابە سامناکە

بیـان پـارێزیو شـالاوی بێئامـانی ترسـناکی دۆزەخ نەیانگرێتـەوە! ئـەو شـوێنە ناخۆشە: کە هەرناوەکەی ئادەمیزاد وەلەرز دێنێ نەبێتە شوێنو نیشتەمەنییان!

ئەوان واتـە: (عبـاد الـرحمن) وێـڕای ئـەو ڕەوشـتە بەرزانـەیانو سـەرباری ئـەو لەخودا ترسانو تـەقوا کارییـەیان، لـەژیانی ئابوریـشیان دا میانـەڕەوو موعتـەدیلن. دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَاماً﴾ ئەوانـە ئەگـەر بـۆ خۆیـانو مـاڵو منـداڵیان مـاڵ خـەرج بکـەن دەسـت بـڵاوی ناکـەن، زیـاد لەپێویست سەرف ناکەن، ئەوەندەیش ڕژدو چروك نـین پێداویـستی خۆیـانو مـاڵو منـداڵیان دابـین نەکـەن، بـەڵکوو بەئەنـدازەی پێویـست مـاڵو دارایـی خۆیـان دەبەخشنو خەرجی دەکەن، میانەڕەوو ناوەندکارن.

شـایانی باسـە لەئیـسلامدا هەرچـەند (ملکیـة فردیـة) لەچواچێوەو سـنورێکی تایبەتیدا ئیعتیرافی پێ دەکرێو هـەموو کەسـێك بـۆی هەیـە دارایـیو خاوەنیـەتی هەبێ بۆ ئەندازەیەك لەماڵ، وەلێ کـەس ئـازاد نیـە لـەوە مـاڵی خـۆی چـۆن خـەرج دەکـا بیکـا، بـەڵکوو مـاڵ خەرجکردنەکـەی سـنووردارە بـەوە دەبـێ میانـەڕەوبێ، (نەشیش بسوتێ نەکەباب) نابێ هێندە دەست بڵاوبێ زەرەر بەخۆیو ماڵو کۆمـەڵ بگەیـەنێ. نـابێ ئەوەنـدەش دەسـت قوچـاو بـێ دڵـی نەیـە مـاڵو سـامان لەشـتی پێویستدا خەرج بکا، نەخۆیو نەکۆمەڵ سودی لێنەبینن.

مـاڵو سـامان ئـامێرو ئـەداتی کۆمەڵایـەتین بـۆ دەسـتەبەرکردنی خزمـەت بـۆ کۆمـەڵ! دەی دەسـتبڵاویو دەسـت قوچـاوی ئـەو یاسـا کۆمەڵایەتیـە دەشـێوێننو حەبس کردنی مـاڵو سـامان ئەزمـەی ئـابوری لێدەکەوێتـەوە، بـەرەڵـڵا کـردنیـشی بـەبێحیسابو مەزەنـدەکردن ئەخلاقو ڕەوشت تێـك دەدا.

نەوەکوو مامە ئەحەی کڕنوو پارە لەهەمبانـەیدا بـشارێتەوەو نـەهێڵی ڕونـاکی ببینـێ، دڵـت بـڕوا نـەدا جـوتێ پـێڵاوی لـێ بکـڕی! نـەوەکوو (ئـەو کابرایـەی کـە لەبنەماڵەیەکی خانەدانی هەولێر بـووەو لەبـەر ڕێـزی بنەماڵەکـەی نـاوی نـاهێنم ) نرخی ماڵو سامان نەزانی. دەگێڕنەوە دەڵێن: شەوێك ئەوزاتە چووە دەست بـەئاو

بگەیـەنێ کـە چـووە لەسـەر پێـشاو دانیـشتووە چـرای لێکوژاوەتـەوە یـان رونـاکی پێویستو بەدڵی ئەو نەبوە، دەستی بە باخەڵیدا کردوەو پارەی دەرهێناوە وەکوو کەرەگەلاو شقارتەی لێ داوەو دینار بەدیناری سوتاندوە بۆ ئەوەی لەبەر روناکی کاری دەست بەئاو گەیاندنی ئەنجام بدا، هەتا لێبوەتـەوە چلو پێنج تاکە دیناری کردوە بەقوربانی میزکردنێك لەبەر روناکی، ئەمـە لەکاتێك دا کە (٤٥) دینار بژێوی مانگێکی (٢٠) خێزانی پێ دەستەبەر دەبوو!

بێگومـان میانـەرەوی‌و بەئەنـدازەی بـەرە قـاچ راکێـشان بناغـەی ئابوریيـەو کۆڵەکـەی پارێزگاری کردنـی مـاڵو سامانە ئیمام ئەحمەد لەعەبدوڵڵای کوری مەسعودەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (ما عال من اقتصد) کەسێك یاسای ئابوری بەرچاو بگری‌و بەئەندازەو پێوان ماڵو سامان خەرج بکا هەرگیز هەژار ناکەوێ.

ئەبوبەکری (البزار ) لەحوزەیفەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما احسن القصد في الغنى ، ما احسن القصد في الفقر، ما احسن القصد في العبادة ) زێدەرەوی لەهیچ شتێکدا پەسەندنیە تەنانەت لەعیبادەتو خودا پەرستیشدا پێغەمبەر ﷺ کە بیستی هەندێ لەهاوەڵان بریاریان داوە تەرکی دونیا بکەن بانگی کردنو ئامۆژگاری کردن، پاشان فەرمووی: چاو لەمن بکەن ئەوەتا من شەونوێژیش دەکەمو دەخەوم بەرۆژوش دەبمو پێش نابم، ژنیش مارە دەکەمو پێداویستی هاوسەرێتی دابین دەکەم، هەر کەسێك لەسوننەتی من لابدا ئەوە لەمن نیەو پەیرەوی پەیامی منی نەکردوە!

بەکورتی ئیسلام میانەرەوەو میانەرەوی خۆش دەوێ، دەستبلاوی هۆی فەوتانی ماڵو دارایی تاكو کۆمەڵە، دەستبڵاوان برای شەیتانن پەیرەوی فەرمانی ئەو دەکەن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾

(الإسراء/٢٧) ئەوەشمان لەبیر نەچێ هیچ کاتێ ئیسراف لەخێردا نیە، خێریش لەئیسراف دا نیە.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: کەسێك لەرێگای خودادا ماڵ ببەخشێ چەندێك ببەخشێ بەدەستبڵاو ناژمێردرێ. عومەری کوڕی خەتتاب دەفەرموێ: بەسە بۆ ئادەمیزاد دەستبڵاوی کە هەرشتێکی ئارەزۆی لێبوو بیکڕیّو بیخوا. ئیبنو ماجە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ( ان من السرف أن تأكل كل ما اشتهيت).

نیشانەو رەوشتی ( عباد الرحمن ) وێڕای ئەو رەوشتو صیفاتانەی باسکران دوورکەوتنەوەیانە لەهاوەڵدانان بۆ خوداو لەئادەمیزاد کوشتنو لەداوێن پیسی! دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ﴾ بەندە راستاڵەکانی خودا کەسانێکن: کە هاوەڵ بۆخودا دانانێن، کەس ناکەنە شەریکی خودا بەڵکوو بەخالیصیو دڵسۆزی عیبادەت تەنها بۆ خودا دەکەن.

﴿وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاّ بِالْحَقِّ﴾ بەناڕەواو بەئەنقەست کەس ناکوژن، مەگەر کوشتنەکە حەق بێ کابرا تاوانێکی کردبێ شیاوی کوشتن بێ؛ وەکوو ئەوە لەئایینی ئیسلام پاشگەز بێتەوە، یان دوای دەستەبەربوونی خێزانی حەڵاڵ بۆی داوێن پیسی بکا، یان بەناحەق ئادەمیزادێك بکوژێ ئالەم حاڵانەدا بەفەرمانی حاکمو قاضی ئەو تاوانبارانە بکوژێ کوشتنەکەی بەقەتڵ بۆ حیساب ناکرێ، چونکە بەحەقو بەپێی شەریعەتی خودا ئەنجامی داوە، ﴿وَلا يَزْنُونَ﴾ هەروەها داوێن پیسی ناکەن!

بێگومان هاوەڵدانان بۆ خوداو کوشتنی بەئەنقەستو زینا گەورەترین تاوانن، هاوەڵدانان بۆ خودا دەستدرێژیکرنە بۆ سەر خودا، کوشتنی بەئەنقەست

دەستدرێژیکرنە بۆ سەر مرۆڤایەتی، داوێن پیسی دەستدرێژیکرنە بۆ سەر ناموس‌و مافی خەڵك!.

﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً﴾ کەسێك تاوانێك لەو تاوانانە ئەنجام بدا لە قیامەتدا سزای کوشندەو بەئێشی توش دەبێ، تۆڵەی تاوانەکەی لێدەسەندرێ. نەك هەرعەزابی توش دەبێ‌و بەس بەڵکوو ﴿يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ عەزابی بۆ دووچەندانە دەکرێتەوە چونکەوێڕای تاوانکردن کافریش بووە ﴿وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً﴾ بۆ هەتاهەتایە لەناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە وێڕای عەزابی سوتاندن سوکایەتییان پێ دەکرێ‌و ریسوا دەبن.

ئەمجار پەروەردگار دەرگای تۆبە دەکاتەوە بۆ ئەو تاوانبارانەی لەتاوانەکانیان پەشیمان دەبنەوەو بەخۆیاندا دەچنەوە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً﴾ مەگەر کەسێك تۆبە بکاو واز لەتاوانەکانی بێنی‌و بەدڵ پەشیمان بێتەوە، بڕوای بەتاك‌و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرانی‌و زیندووبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت هەبێ.

﴿فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ ئائەوانە بەهۆی تۆبەکەیانەوە خراپەو تاوانەکانیان مەعف دەکاتەوە، لەشوێنی تاوانەکانیان چاکەیان بۆ دەچەسپێنێ، پاش تۆبە کردنیان لەشوێنی خراپەکاری کاری باش دەکەن‌و خوداش لەشوێنی ئەوەی تاوانیان بۆ تۆماربکا چاکەو طاعەتیان بۆ دەچەسپێنێ یان بەهۆی تۆبەکردنیانەوە خراپەو تاوانی لەوەپێشیان بۆ دەکاتە کردەوەی باش.

**بەکورتی راڤەکەران لەمانای** ﴿فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾ **دوو رایان هەیە:**

١- ئەوان لەجیاتی خراپەکاری‌و تاوان چاکەدەکەن.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: خودا کاری خراپەی بۆ گۆڕیون بەچاکە، لەجیاتی هاوەڵدانان بۆ خودا یەکتاپەرستی دەکەن،، لەجیاتی داوێن پیسیو فیسقو فجور خۆپاریزو تەقواکارن،، لەجیاتی کوفرو ئیلحاد موسوڵمان بوونو یەکتاپەرستن. واتە: ئەوان گۆڕانکاری لەهەڵسوکەوتی خۆیاندا دەکەن، خوداش لەقیامەت دا پاداشتیان دەداتەوە.

٢- رای دووەم ئەوەیە: دەڵێن: ئەو تاوانو خراپەکارییەیان بەهۆی تۆبەکردنەوە دەبنە کاری باشو پەسەندو تۆبەکار روپەڕێکی تازە لەژیانی خۆی دا دەکاتەوە، ئەمەش لەم روەوە دێتەجێ چونکە هەرکاتێ دوای تۆبەکردنەکەی بیر لەتاوانەکانی رابوردوی دەکاتەوە تۆبەو ئیستیغفاری زیاد دەکاو تاوانەکانی رابووردوی بۆ دەبێتە چاکەو.خێر.

بێگومان هەموو کاتێ دەرگای تۆبە کراوەیەو لەسەر پشتە، هەرکەسێ ویژدانی بەئاگابێو بیەوێ تۆبە بکاو بگەڕێتەوە بۆ لای بەدیهێنەری خۆی، کەس نیە بتوانێ بیگێرێتەوەو دەرگای تۆبەی لێ دابخا، هەرکەسێك بێو هەرتاوانێکی ئەنجام دابێ: کەویستی تۆبە بکا تۆبەی قبوڵە مەگەر لەحاڵەتی سەرەمەرگو گیانەڵاودا، یان لەکاتی هەڵاتنی خۆر لەلای خۆرئاواوە.

طەبەرانی لەحەدیثی ئەبولوغەیرەوە لەصەفوانی کوڕی عومەرەوە لەعەبدورڕەحمانی کوڕی جوبەیرەوە لەئەبو فەروەوە دەڵێ: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئەگەر پیاوێك هەرچی تاوان هەیە بیکاو هیچ نەمێنێ نەیکا، ئایا رێگای تۆبەی دەمێنێ ؟! پێغەمبەر ﷺفەرموی: موسوڵمان بووی؟ وتی: بەڵێ ئیمانم هێناوە. پێغەمبەر فەرمووی: (فافعل الخیراتواترك السیئات فیجعلها الله لك خیرات کلها) کاری چاکە بکەو واز لەخراپەکاری بهێنە، ئیتر خودا هەموو خراپەو تاوانەکانی پێشوت بۆ دەکاتە خێرو فەڕ وتی: تاوانە گەورەکانیشم؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: بەڵێ: ئیتر کابرا تاگوم بوو هەر (الله اکبر)ی دەکرد.

ئەمجار مەرج و یاسای تۆبە کردن دادەنیو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ تَابَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَاباً﴾ کەسێك لەتاوانی رابووردوی پەشیمان بێتەوە، کردەوەی باش ئەنجام بدا.

تەوبە بەپەشیمانبوونەوەو وازهێنان لەتاوان دەست پێ دەکاو ئاکامەکەشی ئەنجام دانی کاری باشو پەسندە بەجۆرێك بیسەلمێنێ: کە تۆبەکەی بەراست بووە. واتە: وازهێنان لەتاوانو ئەنجام دانی کردەوەی چاك چونکە تاوان کردەوەو جمو جوڵە، کەوازت لێهێنا دەبێ بەشتێکی دژ شوێنەکەی پربکەیەوە، بەکردەوەی دژو بەجمو جوڵی دژ ئەو فراغە پربکەیەوە. ئەگینا بەکاریگەری ئەو بۆشاییە نەفس دەگەرێتەوە بۆ سەر تاوانەکە.

هەڵبەتە لەقورئاندا نموونەی ئەم ئایەتە زۆرو زەبەندەن وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ﴾ (التوبة/١٠٤) یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (الزمر/٥٣).

ئەمجار دوای ئەم رونکردنەوە ناواخنە دەگەرێتەوە بۆ رانواندنی نیشانەو رەوشتی (عباد الرحمن)و دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً﴾ ئەوانەی: کە شایەدی درۆ نادەن، بەئەنقەست درۆ لەسەر کەسانی دی هەڵنابەستن، یان ئامادەی شوێنی درۆ نابن، هەر شوێنێك بزانن درۆو دەلەسەی تێدا دەکرێ ئەوان توخنی ناکەون، خۆیان بەرز دەگرنو دوور دەکەونەوە لەئامادەبوون لەو شوێنانە، ئەگەر واش رێکەوت بەلای کۆرو کۆمەڵێکی لەو جۆرەدا تێپەربوون خۆیانی تێوە ناگلێنن ، بەڵکوو بەشێوەیەکی خۆپارێزیو بەرز سروشتی بەلای دا تێپەر دەبن. ئەوەندە فیراغی نیە بەوشتە پروپوچانەوە خۆ خەریکبکا.

**ئایەتەکە بەزەقی دوو حوکمی لێوەردەگرین:**

١- شایەتیدانی بەدرۆ حەرامەو تاوانی گەورەیە.

٢- خۆپاراستن لەکۆڕو کۆمەڵی لەغوو لەهوو شوێنی درۆکردنو ئەو جۆرە شتانە پێویستە.

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا فەرمودەیەك هاتووە: ئەبوبەکرە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟) سێ جار فەرمووی: ئەرێ هەواڵتان نەدەمێ بەگەورەترینی تاوانە گەورەکان؟ عەرزمان کرد: بەڵێ قوربان بفەرموو؛ ئەویش فەرموی: (الشرك بالله و عقوق الوالدين) هاوەڵدانان بۆ خودا، ئەزیەتدانی باوكو دایك. جا لەو کاتەدا کەئەمانەی فەرموون پاڵی دابوەوە ئیتر هەستاو دانیشتو فەرمووی: (ألا وقول الزور) بشزانن شایەتی درۆش لەتاوانە گەورەکانە، ئیتر هەر دووبارەی دەکردەوەو دەیگوتەوە هەتا لەدڵی خۆماندا وتمان خۆزگە بێدەنگ بوایە.

عومەری کوڕی خەتتاب چل جەڵدەی لەشایەدی بەدرۆ دەداو دەمو چاوی رەش دەکردنو سەری دەتاشینو بەبازاڕدا دەیگێڕان!

یەکێکی تر لەنیشانەکانی (عباد الرحمن) ئەوەیە: کە شتیان بیر هێنرایەوە زوو بیریان دەکەوێتەوە، ئەگەر پەندو ئامۆژگاری کران زوو پەندئامێز دەبن، دڵو دەروونیان بۆ ئایەتی خودا کراوەیە دەفەرموێ:

﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمّاً وَعُمْيَاناً﴾ ئەوانەی کە ئایاتی خودایان یاد بخرێتەوە بەسەریادەکەونو جوان گوێی دەدەنێو سوورن لەسەر ئەوەی گوێیان لێبێو تێی بگەن، بەگوێچکەی کراوەو چاوی وردبینەوە، بەدڵی کراوەو بەئاگاوە ئایەتەکان دەبیسنو تێیان دەگەن!

نەك وەکوو کافرو مونافیقو موسوڵمانە تاوانبارەکان: کە قورئان دەبیسن هیچ کاریان تێ ناکاو واز لەو وەزع و حاڵەی خۆیان باریان پێوە گرتوە ناهێنن. بەڵکوو

بەردەوام دەبن لەسەر کوفرو تاوانباری خۆیانو سوردەبن لەسەر نەفامیو یاخی بوون! هەرچەندە قورئانیان بۆ بخوێندرێ کاریان تێ ناکا دەڵێی کەڕو کوێرنو هیچ نابیسنو هیچ نابینن!

یان دەتوانین ئایەتەکە بەو جۆرە مانا بکەین کە بەکینایە تانە لەپەرستشی بتپەرستەکان بکا. واتە: (عباد الرحمن) وەکوو ئەو بتپەرستانە نین کوێرانە باوەشیان بۆ بتپەرستی گرتبێتەوەو خۆیان بەسەردا دابێو حەق نەبیسنو راستی نەبینن و چاوەڕوانی هیدایەت وەرگرتن نەکەن. بەڵکوو (عباد الرحمن) حەق دەبیسنو راستی دەزانن و بەچاوی رونو دڵی کراوەو هەستو هۆشەوە بیرو باوەڕی خۆیان وەرگرتووە، دەزانن قورئان هەقەو ئایەتەکانی راستو پیرۆزن، ئیمانێکی راستاڵانەیان پێ هێناوەو لەناخەوە بڕوایان بەپەیامی پەروەردگارە، کوێرانە خۆیان بەسەردا نەداوەو سووربوونیان لەسەر خوداپەرستی لەزانیاریەوە سەرچاوەی گرتووە.

لەئاکامدا (عباد الرحمن) هەر بەوەندە وازناهێنن کەشاو بەخەبەرو سەرگەرمی خودا پەرستینو ئەو هەموو رەوشتە بەرزانەیان تێدا کۆبونەوە، بەڵکوو ئاواتە خوازی ئەوەن وەچەو نەوەیەکیان هەبێ شوێنی ئەوان بگرنەوەو لەسەر رێبازی ئەوان بڕۆن، ماڵو خێزانیان لەڕەگەزو جۆری خۆیان بێ، چاویان پێ فێنك ببنەوە، دڵیان پێیان ئارام بگریو ژمارەی (عباد الرحمن) زۆر ببن، هەروا ئاواتەخوازن خودا بیانکاتە (قدوة حسنة) و رابەری باش بۆ رێبازی حەق.

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً﴾ واتە: ئەوانەی لەخودا دەپاڕێنەوە: کە هاوسەری خوداناسو منداڵی صالح و بەئەمەكو پەیڕەوکاری ئایینو خێرخوازو لاشەڕیان بداتێ. وەچەو نەوەیوایان لێبکەوێتەوە چاوو دڵیان پێیان رون بێتەوە، ویژدانیان ئارام بگرێ: چونکە موسوڵمان: کەدەبینێ موسوڵمانانی تر کاری باشو پەسەند ئەنجام دەدەن

چاوو دڵیان رۆشن دەبنــەوە، هــەروا لــەخودا دەپاڕێنــەوە کــە ببنــە (قـدوة) ی بـاش و خەڵکی چاویان لێبکەن.

ئەمــەش نیـشانەی ئەوەیــە کــە (عبـاد الـرحمن) پێیــان خۆشــە خوداپەرسـتی خۆیان و هاوسەرو وەچەو نەوەیان پەیوەست بن و کوڕو کچ و نەوەیان تێکڕا ببنــە خودا پەرست و خێرو پاداشتی ئەوانیشیان دەست بکەوێ.

ئیمـامی موسـلیم فەرمودەیــەکی لەئــەبو هــورەیرەوە ریوایــەت کــردوە: دەڵــێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (اذا مات الأنسان أنقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جاريـة أو علـم ينتفـع بـه أو ولـد صـالح يـدعو لـه) هــەرکاتێك ئـادەمیزاد مـرد، لەهــەموو کردەوەیــەك دادەبــڕێ مەگــەر ســێ شــت نــەبێ: خێرێکـی هەمیـشەیی و نــەبڕاوەی کردبێ، وەکوو ئەوە کارێزێکی لێ دابێ بیرێکـی ئـاوی هەڵکەنـدبێ. یـان زانیارییـەکی بڵاو کردبێتەوەو خەڵکی سودی لێوەربگرن، یان منداڵێکی ساڵحی لـەدوا بـەجێمابێ دوعای خێری بۆ بکا.

ئەمجار پەروەردگار پاداشتی ئەوانـەی ئـەوە رەوشـت و صـیفاتیانە دیـاری دەکـاو دەفــەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَـا تَحِيَّـةً وَسَـلاماً﴾ ئەوانــەی ئــەو رەوشــتە بەرزانــەیان هــەن ئــەو کــردەوە پەســندانە ئــەنجام دەدەن قەصــرو باڵەخانەی بەرزو رازاوەی بەهەشـتیان بـەپاداش دەدەینــێ، چـونکە بـەردەوام بـوون لەســەر ئــەو کــردەوە پەســندانەیان، وێــڕای شــوێنی خــۆش و رازاوەو دڵگیر سـڵاویان لێدەکرێ و رێزیان لێدەگیرێ، لەئاشتـیدا ژیان بەسەردەبەن، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفــەرموێ: ﴿وَالمَلآئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَـلاَمٌ عَلَـيْكُم بِمَـا صَـبَرْتُمْ فَـنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ (الرعد/٢٣-٢٤).

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کە خودا پەرستان وێڕای لەززەت و خۆشی بەهەشت رێزو ئیحتیرامیشیان لێـدەگیرێ، بەپێـچەوانەی موشــریك و ستەمکاران: کـەوێڕای سزای دۆزەخ سوکایەتیشیان پێ دەکـرێ.. ﴿خَالِـدِينَ فِيهَـا حَـسُنَتْ مُـسْتَقَرّاً وَمُقَامـاً﴾

خوداپەرستان لەناو نازو نیعمەتی بەهەشتدا دەمێننەوە بۆ هەتا هەتایە نابڕێتەوە، لێی وەڕەزنابن لێی دەرناچن، دەریان ناکەن.

﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلا دُعَاؤُكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر بەوموشریکانە بڵێ: خودای مـن بێئاتاجـە لەبەنـدەکانیو چ پێویـستیەکی بـەئێوە نیـە، کـە ئـەرکی ئیمـانو عیبادەتیشی خستونە ئەستۆ بۆ سوودی خۆتانە، کە عەزابیشتان دەدا لەبەر یاخی بوونتانە، ئەگەر ئیمانی پێ نەهێنن‌و عیبادەتی بۆ نەکەن چ موبالاتێکتان پێ ناکاو هیچ رێزتان لای خودای من نابێ.

بێگومان پەروەردگار بەندەکانی بۆ ئەوە دروست کـردون عیبـادەتی بـۆ بکـەنو بەتاكو تەنها بیناسن! وەکوو لە شوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا خَلَقْـتُ الْجِـنَّ وَالْـإِنسَ إِلَّـا لِيَعْبُـدُونِ﴾ (الـذاریات/٥٦) ئـەو موشـریکانە بەچـی دەنـازن؟ چ سـەروەرێکیان هەیـە ؟! خـۆ ئـەو زەوییـەی هـەموو ئـادەمیزادی لەسـەرە لەئاسـت بوونەوەردا وەکوو گەردیلەیەك وایە لەبۆشاییەکی فراوان دا.

ئەمجار ئادەمیزاد هەموویان بەشێکن لـەو هـەموو گیانلەبەرانـەی لەسـەر زەوی دەژین، ئەو موشریکانە هەموویان گەلو نەتەوەیەکن لەوحەمکە گەلو نەتەوانـەی سـەرزەوی چـینو توێـژێکی ئـادەمیزادیش لەرۆژگارێکـدا بریتییـە لەروپـەڕێك لەکتێبێکی قەبارە گەورە کەهەر خودا بۆخۆی دەزانێ ژمارەی لاپەڕەکانی چەندە!!

﴿فَقَـدْ كَـذَّبْتُمْ فَـسَوْفَ يَكُـونُ لِزَامـاً﴾ ئێـوە ئـەی کـافرو موشـریکەکان! ئەگـەر پێغەمبـەرانی مـن بـەدرۆ بخەنـەوەو بڕواتـان بەزینـدوبوونەوە نـەبێ ئـەوە بـاش بزانـن: ئەو بەدرۆخسـتنـەوەو سەرپێچیکردنـەتـان دەبێتە هۆی لەناوچونو سـزا دانتان لەدونیاو قیامەت دا.

**بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (الفرقان) تەواو بوو خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی الشعراء

ئـەم سـورەتە نـاونراوە بەسـورەتی (الـشعراء) چـونکە لەکۆتاییەکـەی دا بەرامبەریەك لەنێوان شاعیرە گومڕاو سەرلێشێواوەکانو شاعیرە موسولّمانەکان دا دەکا بەسێ ئایەت رەددی موشریکەکان دەداتەوە: کەدەیانگوت موحەممەد شاعیرەو قورئان شیعرە.

پەیوەندیو موناسەبەی بەسورەتی (الفـرقان)ەوە لەڕووی ناوەڕۆكو سـەرەتاو کۆتاییدا لێك چوونو موناسەبەیان بەهێزە.

لـەرووی ناوەڕۆکـەوە ئـەم شـیکەرەوەو رونکـەرەوەی ئـەو ئایەتانەیـە: کـە لەسورەتی (الفرقـان) دا بـە مـوجمەلی هاتـوون، بـۆ نـموونە لـەوێدا لەباسـی چیرۆکی پێغەمبەرەکاندا فەرمووی: ﴿وَقُرُوناً بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيراً﴾ لـێرەدا چـیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمو قەومی شوعەیبو قەومی لوطی درێژە پێداو رونی کردەوە.

لەڕوی سەرەتاشەوە هەردوو سورەتەکە بەوەسـپو ثـەنای قـورئان دەستیـان پێ کراوە، لەوێ فەرمووی: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ﴾ لـێرەش دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾.

لەڕوی کۆتاییـشەوە هـەردوو سـورەتەکە دەشـوبهێنە یـەکتر سـورەتی (الفرقـان) بەهەڕەشە لەکافرەکانو وەسپ کردنی موسولّمانان بەوە: کەبارقوڵو پشوو درێژنو خـۆ بەلەهـوو لـەعب هەڵـەوگیر ناکـەن کـۆتایی هـات، لێـرەشدا سورەتەکـە بـەهـەڕەشـە لـەستـەمکارانو راگەیاندنی رەزامەندی خودا لە موسوڵمانەکان کۆتایی پێ دێ.

نـاوەڕۆکی سـورەتەکەش وەکـوو هەمـوو سورەتـە مەککـییەکان بـاسی عەقیـدەیەو جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر یەکتاپەرستیو راستی پێغەمبـەرایەتـیو زینـدوبـوونەوەو هاتـنی قیامەت.

سـەرەتا دەسـت دەکـا بەباسـی قورئـانی پـیرۆزو رونکردنـەوەی مەبەسـتە سەرەکییەکانی دەربارەی هیدایەت‌و مزگێنی دان بە موسوڵمانان‌و هەڕەشە کردن لەکافرەکان‌و چەسپاندنی هاتنە خوارەوەی قورئان بەشێوەی نیگاو سروش بۆ سەر پێغەمبەر، هەروەها دڵدانەوەی پێغەمبەرﷺ: کەبەپشت هەڵکردن‌و ڕو وەرگێڕانی گەلەکـەی خەفەتبار نـەبێ، ئەمجـار بەڵگە هێنانـەوە بەرسکاندن‌و دروستکردنی گژوگیا لەسەر هەبوون‌و تاک‌و تەنهایی خودا!

زۆربـەی سـورەتەکە لەچیرۆك پێك هـاتووە، لەمـەجموعی (٢٢٧) ئایـەت (١٨٠) ئایەتی چیرۆکە، هەموو چیرۆکێکی پێشەکی‌و کۆتـایی هەیـە، چیرۆکەکە بـەخۆی‌و پێشەکی‌و بـەدوادا چـونیەوە ( تعقیـب ) بابـەتێکی تـەواوو وێکـچوو دەخاتـە ڕو، تەعبیر لەباس‌و ناوەڕۆکی سورەتەکە دەدەنەوە.

چیرۆکەکانی ئەم سورەتە تارمایی سەرڕەقی‌و بەدرۆخستنەوەی گەل‌و نەتەوە کافرەکانی پێوە دیارە: کە پەیامی پێغەمبەرەکانیان رەتکردۆتـەوەو پـەروەردگاریش هەڕەشەی لەناوبردن‌و عەزابی دۆزەخی لێکردون، چونکە ئـەم سـورەتە لەناکـامی روبـەڕوبوونـەوەی کـافرەکـانی قـورەیـش لەگەڵ پێغەمـبەردا هـاتۆتە خوارێ.

چیرۆکی پێغەمبـەرانی پێشوو لەگـەڵ نەتەوەکانیانـدا نمایش دەکا، بـۆ ئـەوەی قورەیشییە بەدرۆخەرەوەکانی پێغەمبەر بترسن‌و بەخۆیاندا بچنەوە!

سـەرەتا چـیرۆکی حـەزرەتی موسـا‌عليه السلام‌و موعجیزەکـانی‌و گفتوگـۆی لەگـەڵ فیرعـەونی ملـهوڕدا دەربـارەی یەکتاپەرسـتی، ئـەمجار ئیمانهێنـانی سـاحیرەکان بەخودای موساو هارون رادەنوێنێ، بەشوێن ئەودا چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام لەگەڵ باوکی‌و گـەلە بتپەرستەکەیداو پوچکردنـەوەی بتپەرستـی‌و چەسپاندنی تاک‌و تـەنهایی پەروەردگـار تۆمار دەکا.

ئەمجار چیرۆکی پایە بـەرزانی وەکـوو حـەزرەتی نـوح‌و هـودو صـالح‌و لوطو شوعەیب (علیهم السلام) دەهـێـنی‌و جیهادو تێکۆشان‌و هـەوڵ‌و تـەقـەڵـلای ئـەو پێغەمـبـەرانە بۆ ئیمان هێنانی نەتەوەکانیان‌و رەخنەو هێرشی ئەو زاتانە بۆ سـەر

بیرو باوەڕی پوچی گەلەکانیان‌و سەرەنجامی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران‌و تێداچونی ملهوڕو سەر ڕەق‌و یاخی بووەکان بەعەزابی سەختی ریشەکێشکەرو بێئامانی خودا یەکەیەکە تۆمار دەکا.

ئەمجار پاشەکییەکی بۆ سورەتەکە هێناوە ئەوەی تێدا دەچەسپێنێ: کە قورئان نیگای خودایەو هەڵبەستراوی شەیاتینی نیەو موحەممەد رەوانەکراوی خودایە بۆ سەر هەموو گەل‌و نەتەوەکان، کۆڵەوەنانی‌و شایەر نیە، لەنەوەی یەکتاپەرستانەو دوورە لەکردەوەی موشریکەکان.

## رەتدانەوەی موشریکەکان‌و هەڕەشەلێکردن‌و چەسپاندنی تاک‌و تەنهایی خودا

﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدۡ كَذَّبُواْ فَسَيَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَمۡ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ ﴾

﴿طسم﴾ ئەموشەیە دەبێ ئاوا بخوێندرێتەوە، (طا ـ سین ـ میم) ئەم پیتە لێك دابڕاوانە ئاماژەی ئەوەیان تێدایە: کە ئایاتی قورئان بەگشتیو ئایاتی ئەم سورەتە بەتایبەتی لەم جۆرە پیتانە پێك هاتوون، دەئێوەش ئەی موشریکەکانی مەککە؛ ئازابن لەو پیتانە کەلامێکی ئاوەها پێك بێنن.

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ئەوە ئایەتو رستەی کتێبی ئاشکراو رونکەرەوەی حەقو بەتاڵە، رێگای هیدایەتو گومڕابوون لێك جیادەکاتەوە، راستو ناڕاست لێك هەڵدەهاوێرێ!

﴿لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ أَلاّ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ؟﴾ ئەوە چیە تۆ ئەی موحەممەد خەریکی خۆت بفەوتێنی چونکە ئەوانە ئیمان ناهێنن؟! نانا ئەوەندەت بەلاوە ناخۆش نەبێ کەبڕوات پێ ناکەن. ئەتۆ لەوە بەرپرسیار نیت، تۆ بەس گەیاندنی پەیامی خۆت لەسەرە، ترساندنو موژدەدانی خۆت لەئەستۆیەو بەس! ئەوە ئەنجام بدەو ئیتر بەئیمان نەهێنانیان خەفەتبار مەبە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ (فاطر/٨) یان دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ عَلَى آثَارِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا بِهَذَا الْحَدِيثِ أَسَفاً﴾ (الكهف/٦) ئەوان خۆیان لەئیمان نەهێنانی خۆیان بەرپرسیارن.

﴿إِنْ نَشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِمْ مِنْ السَّمَاءِ آيَةً فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ﴾ پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە، ئەگەر مەیلمان لێبێ لەئاسمانەوە نیشانەیەکی وایان بۆ نازڵ دەکەین ناچاریان دەکەین بۆ بڕواکردنو ملیان پێ شۆڕدەکەین بۆ ئیمان هێنان، بەزۆرە ملێ وادەکەین ملهوڕو گەورەکانیان ملکەچ بکەنو ئیمان بێنن، بەڵام خودا ئەو ویستو ئیرادەیەی نەبووەو وای بڕیار نەداوە: کە بەزۆرە ملێ خەڵك ئیمان بهێنێ، ئێمە نامانەوێ هیچ کەس بەزۆرە ملێو بەنابەدڵی موسوڵمان بێ.

دەمانەوێ ئادەمیزاد بەویستو رەزامەندیو ئیختیاری خۆیان بڕوا بکەنو ئایین قبوڵ بکەن نەك بەزەختو زۆرە ملێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ (یونس/٩٩).

سوننەتی خودا واجاری بووە، پێغەمبەران بنێرێ بۆ گەلو نەتەوەکان، نامەیان بۆ بنێرێ، بانگەوازی بکرێن مـوژدەو مزگێنییـان پـێ بـدرێ بـۆ ئـەوەی بەقەناعەتەوەو لەناخەوە موسوڵمان ببن.

بەڵام بێبڕوایـان بەگشتیو قورەیـشییەکان بەتایبەتی لـەکوفرو گـومڕایی دا رۆچون، سەررەقو ملنـەدەرن، ﴿وَمَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ الرَّحْمَنِ مُحْدَثٍ إِلاَّ كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾ نامەیەکی ئاسمانییان بۆ نایە، پەیامێکی خوداییان پێ راناگەیەندرێ ئیللا: کە بۆیان دێ زۆربەیان روی لێوەردەگێڕن، بەدرۆی دەخەنەوە، مەبەستو بایی تازەکردنەوەی نازڵکردنی نامە ئاسمانییەکان بۆ دوبارەکردنەوەو تەئکید کردنەوەی بیرخستنەوەو موژدەدانو ترساندنە، بۆ رونکردنەوەی جۆراو جۆرە، بۆ ئەوەی سەرنج بدەنو فیکری خۆیان بخەنەکار، هیدایەت وەربگرنو ئیصلاحی حاڵی خۆیان بکەن، وەلێ هەتا ئێمە پەیامیان بۆ تازە بکەینەوە، وەعظو ئامۆژگارییان بکەین ئەوان شێلگیرتردەبنو پتر سوردەبن لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانی ئێمە!

ئەوەتا رێزدارتر ئادەمیزادمان کردوە بە فروستادەو دوانامەی ئاسمانیمان پێدا ناردوە: کە قورئانە، نامەیەکی ناوازەو سەرئاسایە لەبارەی تەعبیرو تەنسیقی فەننییەوە موعجیزەیە، لەروی فکرو هزرەوە، لەروی پێکەوە جۆشخواردنی ئایەتو سورەتەکانییەوە موعجیزەیە.

لەهەموو بارێکەوە تۆکمەو تەواو سەرئاسایە، هەموو تەوجیهاتو تەشریعاتی پێکەوە گونجاوو لەبارن، هەموو بوارێکی ژیانی گرتۆتەوە، وەڵامی هەموو روداوێكو

پرسیارێکی تێدایە، تۆزقاڵێك دژایەتی تێدا بەدی ناکرێ، پەیڕەوو پرۆگرامێکی کامڵو تەواوی ژیانە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاد گونجاوەو لەبارە، هەموو هێڵەکانی دەچنەوە سەریەك جەمسەرو بەیەك قوڵفەوە پەیوەست دەبن، لەهەموو رویەکەوە موعجیزەیەو لەتوانای ئادەمیزادو جندۆکەدا نیە کەلامێکی ئاوا بخەنە رو..: کەچی ئادەمیزاد پشتی لێهەڵدەکەن‌و روی لێوەردەگێڕن!

بێگومان پەروەردگار ویستی وابوە قورئان موعجیزەی پەیامی ئیسلام بێ، نەیویستووە موعجیزەی پێغەمبەری ئیسلام موعجیزەیەکی مادی کاتی بێ، نەیویستوە موعجیزەیەکی زەخت ئاسایان بۆ بنێرێ‌و بەزۆرە ملێ ناچاریان بکا بڕوای پێ بکەن. چونکە پەیامی ئیسلام دواپەیامی ئاسمانە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی، پەیامێکە ئاڕاستەی هەموو گەل‌و نەتەوەکان کراوە بۆ هەموو سەردەم‌و رۆژگارێکە، پەیامێکی تایبەت‌و داخراو نیە بۆ گەلێك‌و سەردەمێکی تایبەتی.

کەوابوو واپێویست بوو موعجیزەی پێغەمبەری سەردارو خاتەم موعجیزەیەکی کراوەو بەردەوام بێ، بۆ نزیك‌و دوور، بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەکان، بۆ هەموو چین‌و توێژەکان، بۆ هەموو چەرخ‌و سەردەمێکی دوارۆژگاری هاتنی ئیسلام. ئاشکرایە موعجیزەی مادی لەعادەت بەدەر، تەنها کار لەوانە دەکا: کەچاویان پێی دەکەوێ‌و هاوچەرخی رودانی موعجیزەکەن، پاشان دەبێتە چیرۆك‌و دەگێڕدرێتەوەو کاریگەری لەواقیعدا نامێنێ، بەڵام ئەوەتا قورئانی پیرۆز (١٤) سەدەیە ئادەمیزاد پێی ئاشنابوون، نامەیەکی کراوەو نەخشە بۆ کێشراوە، ئادەمیزادی هەموو سەردەمێك یاسای ژیانی خۆیانی لێهەڵدەگوێزن‌و، هەتا زیاتر پێیەوە پابەندبن باشتر پێشیان دەخاو لەژیاندا سەرکەوتووتر دەبن‌و بەرزیان دەکاتەوە بۆ جیهانێکی باڵاترو ئاسۆیەکی بەرفراوانترو بەرزتر.

ئێستا ئێمە دەتوانین جوانترین یاسای ژیانی لێوەربگرین‌و ئەوانەی دوای ئێمەش دێن دەتوانن زیاتر لەئێمەی لێڕاگوێزن. چونکە بۆ هەموو داواکارییەك دەگونجی‌و بۆ هەموو کەس وەڵامی پێیەو سەرچاوەیەکی صاف‌و رونەو تاڵێی

هەڵێنجی بەکۆتاناوایەو بڕانەوەی نیە. کەچی وێڕای ئەو هەمووو خێرو فەڕو بەسەندییەی زۆربەی ئادەمیزاد پشتی لێهەڵدەکەن و گوێی پێ نادەن، نایکەنە بەرنامەی ژیانیان، لێی وردنابنەوەو نایخوێننەوەو بڕوایان پێی نیەو بەڕاستی نازانن:

﴿فَقَدْ كَذَّبُوا فَسَيَأْتِيهِمْ أَنْبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون﴾ بێگومان ئەو موشریکە قوڕەیشییە سەررەقانە قورئانیان بەدرۆخستەوە، بڕوایان بەو ذیکرە حەقە یەزدانییە نەکرد، نەك هەرئەوەندەو بەس! بەڵکوو گاڵتەشیان پێ کرد لەوە بەولاوە هەواڵی ئەم بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەرو پەیامەکەی دەزانن، بۆیان ئاشکرا دەبێ چەند هەڵەبوون و چۆن خۆیان تووشی چارەڕەشی و بەدبەختی کردوە!

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾ (ص/٨٨) یان دەفەرموێ: ﴿يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلاَّ كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون﴾ (یس/٣٠) با بەکەیفی خۆیان گاڵتە بەقورئان بکەن گاڵتە بەو هەڕەشانە بکەن: کە تێیدایەو ئاڕاستەی ئەوان کراوە لەوەبەولاوە هەواڵی ئەو عەزابەیان بۆدێ، نەك هەواڵی روت بەڵکوو خودی عەزابەکە دەچێژن و بۆ خۆیان دەبنە روداوو هەواڵی روداوەکەیان وەکوو چیرۆك دەکەوێتە سەردەم و زوبانی چینەکانی دوا خۆیان! سەیرە ئەو موشریکانە داوای ئایەتی خاریق و سەرنج راکێش لە پێغەمبەر دەکەن و بێناگان لەوهەموو نیشانەو بەڵگەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرانەی دەوروبەریان!

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الأَرْضِ كَمْ أَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ ئەوە بۆ بەدڵێکی کراوەو هەستێکی بینەرانەوە سەیری بوونەوەر ناکەن!! خۆهەمووو ڕووپەڕێکی بوونەوەر نیشانەیەکەو دڵ ئارایش دەداو ئیمانی تێدا دەڕسکێنێ!

ئایا ناڕوانن بۆ زەوی: کە ئێمە دروستمان کردوەو لەهەمووو دارو درەخت رەوەکێك جۆرەهامان تێدا رسکاندوە، بەروبوومو میوەی جۆراو جۆرمان لەو

درەخت‌و رووەکانە پەیداکردوە، بابەدڵ‌و چاوی وردبینیەوە بڕوانن بۆ ئەو دیاردانەو بیانکەنە بەڵگە لەسەر گەورەیی‌و بەدەسەڵاتی خوداو بزانن: کە بەدیهێنەری ئەوشتانەو هەموو بوونەوەر خودایەکی بالادەست‌و زاناو داناو کار دروستە!!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەم رسکاندن‌و رواندنەی درەخت‌و گژو گیایە لەزەویدا بەڵگەی بەهێز هەیە لەسەر بەدەسەڵاتی خودا لەدروستکردندا، لەهێنانی عەزاب‌و فەوتاندنیان‌و ئەمجار زیندوکردنەوەی رۆژی قیامەت‌و سزاو پاداشت دانەوەیان هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی، وێڕای هەبوونی ئەم هەموو بەڵگەو نیشانانە زۆربەی زۆری ئادەمیزاد ئیمان ناهێنن، بەڵکوو پێغەمبەرو پەیامەکەی بەدرۆ دەخەنەوە، سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن!!

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی پێغەمبەر! توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، دەتوانێ هەموو ملهوڕێك بپروێنی‌و هەرچی بیەوێ بیکا دەتوانێ ئەنجامی بدا، بەڕەحم‌و بەزەییە بۆ بەندەکانی، هەرکەسێك لێی یاخی بێ خێرا عەزابی بۆ نانێرێ، بەڵکوو مۆڵەتی دەدا ناردنی عەزابی بۆ سەر دوادەخا بۆ ئەوەی لەگومڕایی خۆی بگەڕێتەوە، ئەمجار کەهەر سووربوو لەسەر تاوان‌و یاخی بوون، بەتوندی دەیگری‌و ئیتر رزگاربوونی نیە.

بێگومان لەبوونەوەردا زۆر بەڵگەو نیشانە هەن بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەرێگەیانەوە ئیمان بهێنن، وەلێ سەرباری ئەوەش رەحمەتی خودا واداخوازبووە پێغەمبەرانیش بنێرێ بۆ رۆشن کردنەوەو رێگا نیشاندان بۆ موژدەدان‌و ترساندن، بۆیە دوابەدوای ئەو ئاماژەکردنە چیرۆکی پێغەمبەرەکان دەگێڕێتەوە.

**چیرۆکی یەکەم: چیرۆکی موساو هارون (علیهما السلام) لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەی دا**

**بەشی یەکەم: منەتکردنی فیرعەون بەسەر موسادا کە بەخێویکرد**

﴿ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾

چیرۆكی حەزرەتی موساو هارون لەگەڵ فیرعەونو دارو دەستەكەی داو لەگەڵ نەتەوەی ئیسرائیلدا زۆرجار لەقورئانـدا دووبـارە بووەتـەوە: لـە(سـورة البقـرة)و (الأعراف)و (یونس)و (هـود)و (طـه)و (الشعراء)و (النمل)و (القصص)و (المؤمن)و (فصلت)و (النازعـات)دا بەئووسلوبی جیاجیـاو بـەكورتیو بەدرێـژی نمایش كـراوە، دووبارەكردنەوەی چیرۆكی موسا بەو شێوازە جیاجیایانە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبـەرە تاخەفـەت بەسـەرەقیو نـەفامی قورەیـشییەكان نـەخوا، ئەزیەتـدانی كافرەكـانی مەككەی لەسەر شان سوك ببێ.

ئەم كۆمەڵە ئایەتـە زنجیرەیـەكن لـە چیرۆكی حـەزرەتی موسـاو لەسـورەتەكەدا جێگای گونجاویان وەرگرتووە؛ لەگەڵ ناوەڕۆكی سورەتەكەو مەبەستی سـورەتەكەدا وێـك دەكـەون، ئامـاژە دەكـا بەسـەرنجامی موشـریكەكانو ئاكـامی بەدرۆخـەرەوەكان دیـاری دەكـا، دڵنـەوایی پێغەمبـەر دەكـا لەسـەر ئـەو ئەزیـەتو ناڕەحەتیـەی لەگەلەكەیـەوە تووشـی دەبـێ. ئامـاژەی ئـەوەی تێدایـە: كـە پـەروەردگار چاودێری بانگخوازانی ئـایینی خـۆی دەكـاو هەرچـەندە بەڕواڵـەت بێدەسـەڵاتو كـەم دەسـتو زەعیفنو دوژمنانیان ملهوڕو خاوەن دەسەڵاتن، خاوەن دارو دەستەو یاساوڵو زەبرو زەنگن، سەرەنجام سەركەوتن هەر بۆ ڕێڕەوانی ئایینی خودایە.

بێگومـان ئـەو مەوقیفـەی چـیرۆكەكە نمایـشی دەكـا دەق دەشـوبهێتە ئـەو مەوقیفـەی پێغەمبـەرو موسـوڵمانانی تێـدابوون لەمەككەو لـەكاتی نـازڵبوونی ئـەم سورەتە.

ئەم ئەڵقەیەی چـیرۆكەكە ئەڵقـەی پێغەمبەرایـەتیو بەدرۆخـستنەوەیە، باسـی هەڵوێستی فیرعەونو دارو دەستەكەی دەكا: كە موسایان بەدرۆخستەوە، هەرچەندە حەزرەتی موسا ﷺ موعجیزەی جۆراو جۆری لەسەر راسـتی پێغەمبەرایـەتی خـۆی هێنایەوە، بڕوایان پێ نەكرد، موعجیزەو نیشانە كاری لەو ملهوڕەو دارو دەستەكەی نـەكرد تاسـەرەنجام پـەروەردگار بەعـەزابی ریشەكێـشكەری خـۆی لـەناوی بـردن

لەدەریادا خنکاندنی. تۆڵەی سەررەقیو مل نەدانی لێستاندن، عەزابی دۆزەخیشیان لەوێ بوەستێ!!

سەرەتای چیرۆکەکە بەنیگا کردنی پەروەردگار بۆ موسا ﷺ دەست پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى﴾ ئەی موحەممەد! ئەوە بۆ گەلەکەت باس بکەو بۆ پەندو ئامۆژگاری بۆیان بگێڕەوە کاتێك خودای تۆ نیگای بۆ موسا کردو لەتەنیشتی راستی کێوی طورەوە (الوادي المقدس)دا ئاخاوتنی لەگەڵ کردو کردی بە پێغەمبەرو فروستادەی خۆی، فەرمانی پێ کردو پێی فەرموو:

﴿أَنْ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بڕۆ بۆ سەرگەلی ستەمکارو لەخودا یاخی بوو (قوم فرعون) گەلی فیرعەونو دارو دەستەکەی. بانگەوازییان بکە بۆ خوداپەرستیو یەکتاپەرستی، پێیان بڵێ: وازبێنن لە فیرعەون پەرستیو ستەمکاری، لەهاوەڵدانانو خۆ بەزلزانی.

ئەمجار خیطاب ئاراستەی حەزرەتی موسا ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ﴾ ئەوە بۆ فیرعەونو دارو دەستەکەی لێم ناترسن؟ بۆ خۆیان لەعەزابی سەختی خودا ناپارێزن؟ بۆ ترسی سەرەنجامی ستەمکاری خۆیان نیە؟ بۆ لەملهوڕی خۆیان وازناهێنن؟ بەڕاستی کاری ئەو ستەمکارانە سەرسوڕهێنەرەو شیاوی ئەوەیە خەڵکی سەریان لێیان سوڕبمێنێ ، هەروا هەموو ستەمکارێکی وەکوو ئەوان جێگای سەرسام بونو سەرسوڕمانن!!

هەڵبەتە هەڵوێستی فیرعەون لەلای حەزرەتی موسا رونو ئاشکرابوو؛ دەیزانی چ ملهوڕو ستەمکارو خۆبەزلزانێکە، دەیزانی ئەو ئەرکەی خراوەتە ئەستۆی ئەرکێکی قورسو گرانە، بۆیە هانا بۆ خودا دەباو لێی دەپاڕێتەوە نەك بۆ ئەوەی خۆ لە هەڵگرتنی ئەرکەکە قوتاربکا، بەڵکوو بۆ ئەوەی پشتگیری لێبکاو یارمەتی بدا بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەرکە قورسە.

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ﴾ وتی خودایە دەترسم بەدرۆم بخەنەوە، ئیتر خەفەتباربم بەو هەڵوێستەیانو ئازار بەدڵو دەرونم بگا.

﴿وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلا يَنْطَلِقُ لِسَانِي﴾ تەنگەتاو ببم بەوەی: کە پێم دەڵێنو زوبانم وەکوو پێویست بۆ نەگەڕێو نەتوانم مەبەستی خۆمیان پێ رابگەیەنم.

﴿فَأَرْسِلْ إِلَى هَارُونَ﴾ هارونی برام لەمن دەمڕاست ترو قسەزانترە، ئەویش لەگەڵمدا بکەرە فروستادە، جوبرائیل بنێرە بۆلای ئەوو نیگای بۆ بنێرە بالەگەڵ مندا ئەویش ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگریو یارمەتیم بدا بۆ بانگەوازیی و ئاخاوتن لەگەڵ فیرعەوندا، بۆ ئەوەی بتوانین ئەرکی سەرشانمان بەرێکوپێکی ئەنجام بدەین.

لەلایەکی ترەوە ﴿وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ﴾ هۆزو نەتەوەی قیبطیەکان تاوانێکیان لەسەرمنە، کاتی خۆی بەهەڵە قیبطییەکم لەدەست کوژراو لەئاکامی ئەو روداوەدا لە میصر دەرچووم، دەترسم ئەگەر بەتەنیا بڕۆم بۆسەریان بمکوژنو ئەوکاتە لەرێوە پەیامەکەم پوچ بێتەوە، بەڵام هارون هیچ تۆمەتێکی لەم بارەوە لەسەر نیەو ئەگەر ئەو ببێتە هاوبەشم لەهەڵگرتنی پەیامەکەدا ئیتر مەبەستەکەمان دێتەجێو کارەکەمان مەیسەر دەبێ.

ئەم ئایەتەیە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە پێغەمبەرانیش ترسو خۆفیان بەسەردادێ وەکوو باقی ئادەمیزادی تر. پێغەمبەری ئیسلامیش لەپێش نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدة/٦٧)دا جۆرە ترسێکی هەبوو لەدوژمنەکانی، بەڵام بە نازڵبوونی ئایەتەکە دڵنیابوو ترسو خۆفی نەماو حەرەسو حیمایەکانیشی ئیزن دان.

بێگومان حەزرەتی موسا‍ عليه السلام خەمی بانگەوازییەکەی بوو، خەمی ئەوەی بوو لەیەکەم ئاخاوتنو دەست پێکردنی بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیدا زمانی بگیرێو

نـەتوانێ بەباشـی پـەیامی خـودا بگەیـەنیو بانگەوازییـەکـە بەکـزو لاوازی بکەوێتـە بەرگوێچکـەی فیرعـەونو نەتـەوەکەی.

ئەمجار ترسی ئەوەی لێنیشت بیکوژنو ئیتر بەتەواوی دەعوەکە پەکی بکەوێ. کەس نـەبێ بیگرێتـە ئەسـتۆی خـۆی! ئـیتر پـەروەردگار دڵنیـای کـردو ئـەو تـرسو خۆفەی لێرەوانـدەوە. ﴿قَالَ كَـلاّ فَاذْهَبَـا بِآيَاتِنَـا إِنَّـا مَعَكُـمْ مُـسْتَمِعُونَ﴾ پـەروەردگار فـەرمووی: ئـەی موسا ئـەو گومانـە لـەدەروونی، خـۆت دەرهاوێـژە، لـەهیچ شـتێك مەترسـە، چـونکە فیرعـەونو دارو دەسـتەکەی نـاتوانن بتکـوژن، ئەمـە دەربـارەی داخوازی یەکەم بوو، بەوشەی ﴿كَلاّ﴾ وەڵامی دایەوە.

دەربـارەی داخـوازی دووەم بەوشـەی ﴿فَاذْهَبَـا﴾ وەڵامـی دایـەوە، هەڵبەتـە تەعبیرەکە وەکوو دەڵێن: (تەی مەسافەی کردوە) قۆناغی قبوولبوونی داخوازیەکە، قۆنـاغی نـاردنی بـۆ لای هـارون، قۆنـاغی گەیيـشتنی موسـا عليه السلام بـۆ میـصرو چـاوپێکەوتنی لەگـەڵ حـەزرەتی هارونـدا، ئـەم قۆناغانـەی هـەموو پێـچاونەوەو یەکسەر دیمەنەکە حـەزرەتی موسـاو هـارون بەیەکـەوە نیـشان دەدا: کە فـەرمانی خودایان ئاراستە دەکرێ: کە بچن بانگەوازی خودا بەگوێچکەی فیرعەوندا بدەن.

دەفـەرموێ: ﴿فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَـا﴾ ئـەی موسا ئـەتۆو هارونی بـرات: کە داوات کـرد ببێتـە یارمەتیـدەرت بـڕۆن بـۆ لای فیرعـەون بەنیـشانەو مـوعجیزەی ئێمـە: کـە نیـشانەو بەڵگـەی راسـتی پێغەمبەرایـەتیو پەیامەکەتانـە، ئـەمن یارمەتیـدەرتانم کۆمەکیتان پێ دەکەم پشتیوانتانم، وەکوو لەشوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لَـا تَخَافَـا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْـمَعُ وَأَرَى﴾ (طـه/٤٦) ئێمـە شـنەواین بـەوەی پێیـان دەڵێنو بـەوەی وەڵامتان دەدەنەوە.

﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولا إِنَّـا رَسُـولُ رَبِّ الْعَـالَمِينَ﴾ بـچن بـۆ لای فیرعـەون بەنـەرمو نیانیو لەسەرەخۆ پێی بڵێن: ئێمە پێغەمبەری خوداین، خودا ئێمەی رەوانە کردوە بۆ سەر خۆتو نـەتەوەکەت، هاتووین بۆلاتو داوات لێدەکەین: کـە ﴿أَنْ أَرْسِـلْ مَعَنَـا

بَنِـي إِسْـرَائِيلَ﴾ نەتـەوەی ئیـسرائیل مەرەخـەس بکـەی، ئازادیـان بکـەی چـیتر نەیانچەوسێنیەوەو خۆتیان بەسەردا نەسەپێنی، وازیان لێبێنە با عیبادەتی خودای بوونەوەر بکەن و لەگەڵ خۆمان دەیانبەینەوە بۆ خـاکی پـیرۆز (الأرض المقدسـة)کـە فەلەستینە.

فیرعەون روی لێ وەرگێـڕان و بەچاوی سوك سـەیری کـردن، روی کـردە موسـاو ﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيداً وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ؟﴾ وتی: ئەوە تۆ دەڵێی چیو چ لافێـك لێـدەدەی؟ تـۆ هەرنـەوە نـەبووی بـە منـداڵی لـەماڵی خۆمانـدا بـەخێومان کـردی؟ چـەند سـاڵ لـەدەرباری کۆشـکی ئێمـەدا ژیانـت بەسـەربردو ئـەو مـاوە دورودرێژە لەماڵی ئێمە دابووی و نازو نیعمـەتمان بەسـەردا رشـتی! ئێـستا هـاتووی سپڵەیی خۆت دەردەخـەی و کوفرانی نیعـمتمان دەکـەی و بـەوجۆرە قـسەمان لەگـەڵ دەکەی. ئەوە لەکەیەوە بویتە پێغەمبەر!!

﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَـكَ الَّتِـي فَعَلْـتَ وَأَنْـتَ مِـنْ الْكَـافِرِينَ﴾ هـەروەها تـۆ ئـەو کـردەوە ناشیرینەت کرد، پیاوێکی قیبطیت کوشت کابرا ئاشپەزی مـن بـوو لـەدارو دەسـتەی خۆمـان بـوو، بـەو کردەوەیـەت دەرت خـست تـۆ سـپڵەیی و نـازو نیعمـەت و پیـاوەتی ئێمەت بەسەرەوە لەبەرچاو نیەو کوفرانی نیعمەت دەکەی! ئەمەش رەوشتی پیاوی بەوەفا نیە!

هەڵبەتـە فیرعـەون سـەری سـوڕماوە لەحـەزرەتی موسـا﷤: کـە ئـەم داوا گەورەیـەی ئاڕاسـتە کـردو وتـی: ﴿انـاّ رسـول ربّ العـالمين﴾ هـەروەها وتـی: واز لەنەتـەوەی ئیـسرائیل بهێنـەو لەگـەڵ خۆمـان دەیانبەینـەوە بـۆ خـاکی فەلەسـتین! چونکە فیرعەون دوادیداری لەگـەڵ موسـادا ئـەوە بـووە منـداڵێکی بێبـاوك و دایکـەو لەباڵەخانـەی پاشـایەتی دا گـەورەبووەو دوایـی کابرایـەکی قیبطـی کوشـتووەو هەڵاتووە.

ئێستا هاتۆتەوە لەجیاتی ئەوەی داوای عەفوو لێبوردن بکا هەوڵ بدا فەرمانی نیبوردنی بۆ دەرچێ‌و نەیکوژنەوە، ئەم داوا گەورەیە دەکاو بەم شێوەیە هاتۆتە پێشەوە، بۆیە فیرعەون بەو جۆرە ئیستیهزاو بەکەم زانینە وەڵامی حەزرەتی موسای دایەوە وتی: ئایا ئەمە پاداشتی ئەو پیاوەتییەمانە کە لەگەڵمان کردی، بەمنداڵی دەبوایە وەکوو منداڵەکانی تر بکوژرایەی نەمانکوشتی، ئەمجار نەباڵەخانەی کۆشکی پاشایەتی دا بەخێومان کردی ئێستا هاتووی داوامان لێدەکەی وازبێنین لەو ئایین‌و یاسایەی لەسەری راهاتووین‌و دەتەوێ دەسەڵاتمان لەچنگ دەربێنی، ئەو کۆشك‌و باڵەخانەی تێیدا گەورەبووی بیروخێنی؟؟ سەرباری ئەوەش پیاوێکی دەربارى ئێمەت کوشتووەو هەڵاتی، ئەو (رب العالمین)ەی ئەمڕۆ بانگەوازی بۆ دەکەی ئەو کاتە نەتدەناسی‌و هیچ باسی ئەوت نەدەکرد!!

ئابەم جۆرە فیرعەون هاتە ئاخاوتن‌و وەڵامی حەزرەتی موسای دایەوە، بەخەیاڵی خۆی موسا‌عليه السلام بۆردەداو دەمکوت دەبێ، بەتایبەتی روداوی کوشتنی کابرای قیبطی، حەزرەتی موسا‌عليه السلام دەربارەی پیاوەتی بەخێوکردنەکە وەڵامەکە دوادەخا، بۆ روداوی کوشتنەکە وەڵامی دایەوە..

﴿قَالَ فَعَلْتُهَا إِذاً وَأَنَا مِنْ الضَّالِّينَ﴾ حەزرەتی موسا بە فیرعەونی گوت ئەمن ئەو کارە ناشیرینەم کرد؛ ئەوکابرا قیبطییەم لەو کاتەدا کوشت بەهەڵە بوو بەئەنقەست نەمکوشت ئەوکارەم کاتێك ئەنجام دا نیگام بۆ نەکرابوو، ئەرکی پێغەمبەرایەتیم نەخرابوە سەرشان، یان نەمزانی ئەو مستەکۆڵەیەم دەبێتە هۆی گیان دەرچوونی بەمەبەستی کوشتن ئەم مستەکۆڵەیەم لێنەدا. بەڵکوو بەمەبەستی ناوبژیکردن‌و تەمبێکردن لێم دا، لێدانەکە سەری کێشا بۆ گیان دەرچوونی.

بەکورتی ئەو کوشتنەی منی پێ تاوانبار دەکەی بەئەنقەست نەمکردووەو بەهەڵە بووە. ئەو کارەم ئەنجام دا من لەو کاتەدا نەفام بووم، دەمارگیری نەتەوەیی پاڵی پێوەنام نەك دڵسۆزی بۆ بیرو باوەڕی راست.

﴿فَفَرَرْتُ مِنْكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ﴾ کە کارەکەشم لەدەست قەوماو کابرا کوژرا، هەڵاتم بۆ وڵاتی مەدیەن لەترسی سزای ئێوە، چونکە کابرایەکی دەرباری خۆتان هاتو هەواڵی دامێ: کە ئێوە خەریکن دەستگیرم بکەنو بمکوژنەوە، پێی گوتم : تازە خۆت دەرباز بکە ﴿إِنَّ الْمَلأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ﴾ (القصص/٢٠) ئەمنیش لەترسی گیانی خۆم قاچاندم! بەڵام خودا بۆی بەخێر گێرام ﴿فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْماً﴾ خودای خۆم تێگەیشتنو زانیاریو دانایی پێ بەخشیم.

﴿وَجَعَلَنِي مِنْ الْمُرْسَلِينَ﴾ کردوومی بەرەوانەکراوو پێغەمبەر! ئەگەر بەپیر بانگەوازییەکەمەوە بێی ئاسودە دەبی، ئەگەر سەرپێچی بکەی بەهیلاك دەچی، ئەمن نیگام بۆ هاتوەو کراوم بە پێغەمبەر، شتێکی تازە قەڵلا نیمو یەکێکم لەکۆمەڵی پێغەمبەران، زۆر خودا پێداوی تریش وەکوو من خودا نیعمەتی فروستادەیی پێ بەخشیونو ئەرکی پێغەمبەرایەتی خستونەتە ئەستۆ!

ئەمجار حەزرەتی موسا دەربارەی بەخێوکردنەکەشی وەڵامی دەداتەوە بەوە: کە هەرچەند ئەوی بەمنداڵی بەخێو کردوە بەڵام گەلو نەتەوەکەی چەوساندۆتەوە، چاکەی لەگەڵ یەکێك کردوە، نەتەوەیەکی ئازارداوە. دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەو چاکەیەی لەگەڵ منت کردو منەتم بەسەردادەکەی، هۆیەکەی ئەوەیە: کەنەتەوەکەم (نەتەوەی ئیسرائیل)ت چەوساندۆتەوە، بەخێوکردنی من لەماڵی تۆدا لەئاکامی بەکۆیلە کردنی نەتەوەی ئیسرائیل بووە، سەرەنجامی ئەوەبووە نێرینەکانت دەکوشتن، ئیتر دایکم ناچاربوو لەترسی تۆ بمخاتە ناو صندوقێکەوەو فڕێم بداتە ناوچۆمەوە دوایی بمگرنەوەو لەماڵی تۆدا بەخێو بکرێم، نەك لەماڵی باوكو دایکی خۆم دا، ئایا ئەمەیە فەزڵو پیاوەتیت بەسەرمەوە؟ ئەو چاکەیەم دەخەیتە بەرچاو؟!

ئـەمجار فیرعـەون بـاری گفتوگۆکـە دەگـۆڕێو لـەناوەڕۆکی بانگەوازییەکـەوە پرسـیاری لێـدەکا بـەڵام بەشـێوەی گاڵتـەو ئیـستیهزاوە وەکـوو لەمـەدواوە قورئـان ئاماژەی بۆ دەکا.

## چیرۆکی موساو هارون (علیهما السلام)

## بەشی دووەم: نیقاش و جیدالی نێوان حەزرەتی موسا ﷺ و فیرعەون دەربارەی چەسپاندنی هەبوونی خودا

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ ﴾

وەکـوو زانیمـان حـەزرەتی موسـا ﷺ بەڕاشـکاوی ڕەددی فیرعـەونی دایـەوە، پاساوی بۆ پیاو کوشتنەکە هێنایەوە، پیاوەتی بەخێوکردنەکەشی پووچ کردەوە.

جـا: کـە فیرعـەون ئـەو وەڵامـە ڕاشـکاوانەی لەموسـاوە بـەرگوێ کـەوت و بـۆی دەرکەوت موساو هارون سوورن لەسەر بانگـەوازی خۆیـان و دەیانـەوێ فیرعـەون واز

لەنەتــەوەی ئیــسرائیل بێنــیو بگەڕێنــەوە بــۆ خــاکی پــیرۆزو دەســـت بکــەن بـەخـوداپـەرستیو چیدی فیرعەون خۆیان بەسەردا نەکا بـەخـودا!

فیرعەون باری موناقەشەکەی گۆڕیو رەخنەی لەناوەڕۆکی بانگەوازییەکە گرت وەکوو دەفـەرموێ: ﴿قَـالَ فِرْعَـوْنُ وَمَـا رَبُّ الْعَـالَمِينَ ؟﴾ فیرعـەون پرمانـدی وتـی: خودای بوونەوەر چییە؟ ئەو خودایەی تۆ بە(رب العالمین) ناوی دەبەیو دەڵێی ئـەو کردوومی بەپێغەمبەر چیەو چ کەسە!؟

پرسیارەکەی بەئەوپەڕی ئینکاریو سەرسوڕمانەوە ئاڕاستەکرد، بەجۆرێك: کـە ئەو شتە نـاگونجیو عـەقڵ وەری نـاگریو بەکەڵکی ئەوەنایـە لەبارەیـەوە بـدوێین. هۆی ئـەم پرسـیارە ناشیرینەی ئـەوەبوو دەیگـوت: جگـە لـەمن خـودای ترتـان نیـە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْـرِي﴾ (القـصص/٣٨) بڕوای وانەبوو خودای بەدیهێنەر هەبێ، پێی وابوو بۆ خۆی خودایەو بەس!

حـەزرەتی موسـا ﷺ وەڵامـی دەداتـەوە بەسیفەتێك: کـە نیـشانەی خودایـەتی پەروەردگارە دەفـەرموێ: ﴿قَالَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنـتُمْ مُـوقِنِينَ﴾ حەزرەتی موسا ﷺ وتی: ئەو خودایەی منی کردوە بە پێغەمبەرو رەوانەی کـردوم بەدیهێنەرو خاوەنی ئاسمانەکانو زەوی ئەوەی تیایانـدایە لەئەستێرەو مانگـو خۆر، ئەو خودای ئەو بوونەوەرە بەرفراوانەیە: کە تۆ ئـەی فیرعـەون دەستت بـە دامـانی ناگـا، نەدەسـەڵاتت دەیگـاتێ نـەزانیاریت کەشـفی دەکـا، خـودای هـەموو بوونـەوەرە بــەئاسمانو زەویو هەرچــی تیایانـدایــە لەئەســتێرەو دەریــاو کێــوو چــۆمو دارو درەخــتو رووەكو ئـادەمیزادو هــەموو گیـانـلـەبــەرانی تــرو هەمــوو شـتـەکانــی تـریـش..

﴿إِنْ كُنـتُمْ مُـوقِنِينَ﴾ ئەگـەر ئێـوە بڕواتـان هەیـەو خـاوەنی ویـژدانو هەسـتو شعورن، هەموو ئەو شتانە خەلقندەو بەنـدەی پـەروەردگارن، گەردنکەچو ژێربـاری یەزدانن، بەویستی خۆی هـەڵیان دەسووڕێنیو گۆڕانکاریـان تێدا دەکـا. یـان ئەگـەر

ـێود بڕواتـان وایـە ئـەم مەخلووقاتـە جۆراو جۆرانـە دەبـێ خودایـەك بـەدیهێنابن ـەود بزانن ئەو بەدیهێنەرە (الله) یە ئەو خودایەیە شوێندەستی لەناو بوونـەوەردا ـیـارەو دروسـتکراوەکانی نیـشانەی هـەبوونی خـۆینی، وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا ـەفەرموێ: ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى؟ قَالَ رَبُّنَـا الَّـذِي أَعْطَـى كُـلَّ شَـيْءٍ خَلْقَـهُ ثُـمَّ هـدَى﴾ (طه/٤٩-٥٠).

فیرعـەون وەڵامەکـەی موسـای بـەدڵ نـەبوو، ترسـی ئەوەشـی هـەبوو قـسەکانی موسا ﷺ لەدڵی ئامادەبواندا کاریگەر بێ، بۆیە روی کردە دارو دەسـتەکەی، ویـستی ـەهێڵێ وتەکانی حەزرەتی موسا لەدڵیاندا کاریگـەربن ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلا تَـسْتَمِعُونَ ﴾ فیرعـەون بەدەوروبـەرو داروەسـتەکەی گـوت ئـەوە گوێتـان لێیـە چ قـسەیەکی ـەیرو سەمەرە دەکا؟! ئاگاتـان لێیـە دەڵێ چـی؟ ئاها چۆن لەبـەر پرسـیارەکان هەڵدێ؟ مـن دەڵێـم: (رب العـالمین) چیـە؟ ئـەو کـردارو رەوشـتەکانی بـاس دەکا ـۆمـان!

بەڵام حەزرەتی موسا ﷺ مۆڵەتی نەداو خێـرا صیفەتێکی تـری پـەروەردگاری ـەگوێـدادا ﴿قَـالَ رَبُّكُـمْ وَرَبُّ آبَـائِكُمُ الأَوَّلِـينَ﴾ حـەزرەتی موسـا ﷺ وتـی: ئـەو خودایەی منی رەوانەکردوە خودای ئێوەش و خـودای بـاوك و بـاپیرانی رابوردوتانـە، ـەو بەدیهێنـەری ئێـوەش و بـاوك و باپیرانیـشتانە، مەبەسـتی ئەوەیـە بڵـێ: ئێـوە ـەکەڵکی خودایـەتی نایـەن، بـاوك و باپیرانتـان هـەبون و ئێـستا نـەماون، کـاتێکیش هەبوە ئێوە نەبوون دوایی پەیـدا بـوون و ئێـوەش دەمـرن و کەسـانی دیکـە شـوێنتان ـەگرنەوە، کەوابێ ئێوە لەنەبوەوە هاتوونە گۆڕەپـانی بوونـەوە، دوایـیش دەچـنەوە ـەریای عەدەمەوە، دەی کەسێك ئەمە حاڵی بێ چۆن بەکەڵکی خودایەتی دێ؟!

خـودای مـن خودایـەکی (واجـب الوجـود)ە هـەر هـەبوەو هـەردەبێ، سـەرەتاو کۆتایی نیە، هەر ئەو خودایە هەر ئەو شیاوی خودایەتییە.

هەڵبەتە ئەمە زۆر لەسەر شانی فیرعەون قورس و کاریگەر بوو، چونکە موسا بەرەو ڕوی خۆی و لەبەردەم دەست و پێوەندو پیاو ماقوڵانی دەرباردا پێی ڕاگەیاند: کە (رب العالمین) خودای هەموو بوونەوەرە بەفیرعەونیشەوە، فیرعەون بەندەیەکە لەبەندەکانی و خودانیەو شیاوی خودایەتی نیە، بەڵکو زاتی (الله) خودای گەلەکەشی و خودای باوك و باپیرانیشیانە، کەوابوو فیرعەون بەمیرات خودایەتی بۆ نەماوەتەوەو لەوەپێش و لەوەدواش و لەهەموو سەردەم و ڕۆژگارێکدا تەنها یەك خودا هەیە جگە لە(رب العالمین) خودای ترنین!

ئیتر فیرعەون واقی وڕماو قسەی وێچوی دەست نەکەوت ڕەددی موسای پێبداتەوە، پەنای بۆ وەڵامی هەرزەگۆیانە بردو ویستی لەبناغەوە مەسەلەی فروستادەیی و پێغەمبەرایەتی ڕەت بکاتەوەو بەشتێکی بێبناغەی دابنێ و لەدڵ و سەرنجی بیسەرانی دوور بخاتەوە..

﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾ فیرعەون بەدارو دەستەکەی خۆی گوت: بێگومان پێغەمبەرەکەتان: کە گوایە ڕەوانەکراوە بۆ سەرتان پیاوێکی بێعەقڵ و فامە، شێت و وێتە، لەپرسیار تێناگا تاوەڵامی بداتەوە، قسە تێکەڵاو پێکەڵاو دەکاو لافی ئەوە لێدەدا: کە جگە لەمن خودای ترتان هەیە!! ئەرێ تائێستا ئێوە قسەی وا بێجێتان بیستووە؟!

بەڵام ئەم گاڵتەکردن و بوختانەی فیرعەون، ئەم بێئەدەبی و سەرڕەقی و ملهوڕییەی فیرعەون دەستی موسای نەبەست و نەیتوانی تۆزقاڵێك لەهەڵوێستی خۆی بیهێنێتە خوار، بەڵکو بەردەوام بوو لەحەق بێژی خۆی و سوورتربوو لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی.

﴿قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ حەزرەتی موسا عليه السلام وتی: خودای من خاوەن و بەدیهێنەری خۆرهەلات و خۆرئاوایە، خودای من خۆرهەڵدێنی و ڕۆژ بەدی دێنێ، خۆرئاوا دەکاو شەو دەهێنێ، خودایەکی وەهایە

لەخۆرهەڵاتـەوە هـەموو جـۆرە ئەسـتێرەو مـانگـو خـۆر هەڵـدێنێ، لـەوێوە دەیـان هێنیو لەخۆرئاواوە ئاودیویان دەکا.

ئەم هەموو بوونەوەرە هەڵدەسوڕێنیو گۆڕانکاریان تێدا بەدی دێنێ. یاسای بـۆ دانـاونو هەریەکـەیان کـاری خـۆی ئـەنجام دەدا، هیـچیان لەجەمـسەری خـۆی دەرناچێو بەتەوەرەی خۆیدا دێوو دەچێ، ئەوەی سەرپەرشتی ئەم بوونەوەرە دەکا هەڵیدەسوڕێنێ خودای منە (رب العالمین)ە ئێوە نـین، ئەگـەر عـەقڵو بەصیرەتتان هـەبێ، لـەدیاردەکانی بوونـەوەر ورد ببنـەوە، دەزانـن: کەسەرپەرشـتی کردنـی ئـەم بوونـەوەرە لـەتوانای ئێوەدا نیـە، جا ئەگـەر فیرعـەون راسـت دەکاو ئـەو خودایـە بایاسای بوونـەوەر پێچەوانە بکاتـەوە، بـاخۆرو مـانگـو ئەسـتێرەکان لـەخۆرئاواوە هەڵێنێ، باتاوێك لەهەڵسوڕان راگیریان بکا!

بێگومـان هـەڵهاتنی قـەبارە پرشـنگدارەکان لەخۆرهەڵاتـەوەو ئـاوا بوونیـان لـەخۆرئاواوە دیمـەنێکی گـەورەو سـەرنج راکێشن، بـەڵام بـەهۆی دووبارەبوونـەوەی بـەردەوامو رۆژانـەیان ئولفـەتیان پێـوە گـیراوەو کـەمتر سـەرنجیان دەدرێتـێ، دەی بەدیهێنـەری ئـەم دیاردانـە دەبـێ کـێ بـێ؟ خـۆ فیرعـەونو غـەیری فیرعـەونیش هەرچەندە ملهوڕو سەررەق بن جورئەتی ئەوەیان نیە پاڵ خۆیانی بدەن!!

جا: کە حـەزرەتی موسا ﷺلـەبواری بەڵگە هێنانـەوەدا بەسـەر فیرعـەون دا زاڵبـوو، فیرعـەون هیـچی بەدەسـتەوە نـەما بەربـەرەکانی حـەزرەتی موسای پێبکا، پـەنای بـۆ هەڕەشـەکردن بـرد، ئـەوە دابو نـەریتی ملـهوڕو طـاغوتەکانـە هـەر کـە لەبواری موناقەشەدا بۆڕیان خوارد خێـرا پـەنا بـۆ هەڕەشـەو زەبـرو زەنـگ دەبـەن، بەهێزو گورزو دەسەڵاتی خۆیان دەنازن!

لەلایەکی ترەوە ملهوڕو طاغـوت هەمیـشە لەهۆشـیار بوونـەوەی گـەلو نەتـەوە دەترسـن، لەبـەئاگا هاتنـەوەی گـەل زەنـدەقیان دەچـێ، رقیـان لـەهیچ کـەس نیـە هێنـدەی ئەوانـەی گـەلو نەتـەوە هۆشـیاردەکەنەوە، زۆر بـەداخن لەوانـەی کۆمـەڵ بـەئاگا دێننـەوە، هۆشـیاری دەکەنـەوە، بۆیـە دەبیـنین فیرعـەون کـە هەسـت دەکا

قسەکانی حەزرەتی موسا﵇ کاریگەرەو لەوەتەری حەساس دەدەن ، خێرا هەڵدەچێ و چاوی لێدەچنە پشتی سەری، بەهەڕەشەی توند کۆتایی بەحیوارەکە دەهێنێ، گۆڕەپانی دانوسان وەلادەنێو چەکی هەڕەشە دەخاتە کار!

﴿قَالَ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهاً غَيْرِي لَأَجْعَلَنَّكَ مِنْ الْمَسْجُونِينَ﴾ فیرعەون بەنەوپەڕی تووڕەییو بوغراییەوە وتی: ئەگەر جگە لەمن کەسێکی تر بەخودا بزانیو بانگەوازی بۆ پەرستنی بکەی لەبەندیخانەت دەپەستێوم، دەتخزێنمە ناو چوارچێوەی دیواری بەندیخانە لەژێر زەوی داو دەتخەمە ژێر ئازارو ئەشکەنجەوە تا گیانت دەرچێ!

بەڵام هەڕەشە کار لەحەزرەتی موسا﵇ ناکەنو پێیان چاوترسێن نابێ، لەچی بترسێ؟ ئەو خودای لەگەڵدایەو پێغەمبەری خودایە، ئەو رووبەڕەی فیرعەون دەیەوێ دایبخاو لێی بێدەنگ بن سەرلەنوێ هەڵیدەداتەوەو بەشێوەیەکی تر دەیخاتە سەر مێزی موناقەشەو جیدال، لەبەرامبەر هەڕەشەو گوڕەشەی فیرعەوندا موعجیزە دەخاتە کارو بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆی رادەنوێنێ.

﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَيْءٍ مُبِينٍ ؟﴾ حەزرەتی موسا﵇ فەرمووی: ئایا ئەگەر راستی پەیامی خۆمت بۆ بێنمو بەڵگەی حاشا هەڵنەگریشت بخەمە بەردەست هەر دەمخەیە بەندیخانە ؟؟ بەمەش حەزرەتی موسا﵇ فیرعەونی خستە ناو مەوقیفێکی حەریجەوە، لەبەرچاوی بینەرانو ئاگاداری دارو دەستەی بینەرانی دەربار: کەگوێیان لەقسەکانی موسا بوو فیرعەون کەوتە بەردەم دووڕیانێکی خەتەر، ئەگەر گوێ رانەگرێ بۆ بەڵگەی موساو داواکەی رەت دەکاتەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە فیرعەون لە بەڵگەکانی موسا دەترسێ. لەوەپێشیش گوتویەتی: موسا شێتە، دەی چۆن پیاو لەبەڵگەی ئادەمیزادی شێت دەترسێ. کەوابوو ناچارە دەبێ بڵێ: باشە بەڵگەکان نیشان بدەو بیانهێنە.

﴿قَالَ﴾ فیرعەون بەناچاری وتی: ﴿فَأْتِ بِهِ إِنْ كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ دەی ئەو شتەی بەلاتەوە بەلگەیەکی بەهێزە بیهێنە باببینین، کوا ئەو موعجیزە ئاشکرایەی لاتەو بەخەیاڵی خۆت پێغەمبەرایەتی خۆتی پێ دەچەسپێنی؟ ئەگەر راست دەکەی‌و درۆ ناکەی دەکوا نیشانمان بدە! بێگومان فیرعەون بەهەموو جۆرێك دەیەویست شك‌و گومان لەدەوری موساو پەیامەکەی دروست بکا بۆ ئەوەی بەلگەکانی لە دڵ‌و دەروونی بیسەراندا کاریگەر نەبن.

## موعجیزەی حەزرەتی موسا ﷺ و هەڵوێستی فیرعەون بەرامبەری

﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوا أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَابْعَثْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ ﴾

وەکوو لەوەپێش زانیمان، موناقەشەی فیرعەون‌و موسا ﷺ گەیشتە بنبەست‌و فیرعەون بەتەحەدداوە داوای لەموسا کرد: کەموعجیزەی خۆی بنوێنێ. جا کە تەحەدداکەی فیرعەون گەیشتە قۆناغی کۆتایی، ئیتر حەزرەتی موسا ﷺ دوو موعجیزەی ماددی خۆی نیشان دا.

﴿فَأَلْقَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُبِينٌ﴾ حەزرەتی موسا ﷺ عەصای دەستی هاوێشت، لەپڕێکا بوو بەمارێکی گەورەو بەرچاوو ئاشکرا، واتە بوو بەمارێکی

راستیو هیچ چاوبەستەکیو روکەش کردنی تێدا نەبوو، عەصایەکی بێگیان بەقودرەتی خودا گیانی تێچوو، بوو بەمارێکی ئاسایی.

دەڵێن: کەعەصاکە بوو بەمار بەئەندازەی میلێك بەرز بووەوە دوایی بەرەوڕوی فیرعەون هاتو دەیگوت: ئەی موسا فەرمانم پێ بکە چی بکەم ؟!

لێرەدا فەرمووی: (ثعبان مبين) لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى﴾ (طـه/٢٠) لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهَا جَانٌّ﴾ (القصص/٣١) هۆیەکەی ئەوەیە (حية) ناوە بۆ رەگەزی مار(ثعبان)یشی پێ دەگوترێ: چونکە نێرە مارێکی زۆر گەورە بوو وێڕای گەورەییو زەبەللاحی زۆر گورجو گۆڵ بووە، بۆیە بە جندۆکە شوبهێنراوە..

جا: کە فیرعەون ئەمەی بینی وتی: نیشانەی تریشت لایە حەزرەتی موسا﷩ فەرموی: بەڵێ ﴿وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ﴾ دەستی خستە ناو باخەڵیەوە دەری هێنایەوە لەپڕێکا سپی بوو دەدرەوشایەوە وەکوو خۆر پرشنگی دەداو چاوی لەبەر هەڵنەدەهاتن. کەچی وێڕای ئەمەش فیرعەون ویستی روداوەکە لەپێش چاوی بینەران چەواشە بکا، حەزرەتی موسای بە چەند شتێکی نەشیاو تاوانبار کرد:

١- ﴿ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُ إِنَّ هَذَا لَسَاحِرٌ عَلِيمٌ﴾ بەدارو دەستەی دەورو بەری خۆی گوت بەڕاستی ئەم پیاوە ساحیرێکی کارامەیە، لەبواری سیحرو جادوبازی دا زۆر پێشکەوتووە ویستی روداوەکە بەسیحر بدرێتە قەڵەم نەك بە موعجیزە. ئەمجار دەیەوێ دارو دەستەکەی هەڵنێ بۆ ئەوەی گیانی بەربەرەکانی موسایان تێدا بەهێز بکاو سووربن لەسەر سەرپێچی کردنی حەزرەتی موساو ئیمان پێنەهێنانی.

ئەمە دابو نەریتی طاغوتو ملهوڕەکانە، هەر کاتێ هەست بەخەتەر بکەن ژێر قاچیان وەلەرزە بکەوێ خۆیان دەکەنە نەرمو نیانو پەنا بۆ رای گەلو نەتەوەکان دەبەن... لەوەپێش تیریان لەسەر مل دادەنانو دەیانچەوساندنەوە، ئێستا کەتینی

ـەقبوونی کورسییەکەیان بۆ هاتووە دەبنـە دیموکراتیو دەگەڕێنـەوە بـۆ رای گـەل. ـەوەپێش بەملهوڕی خـۆی دەڕۆیـشتو کـەسـی بـەهـیـچ نەدەزانـیو حیسابی بـۆ کەس نـەدەکـرد!!

بۆیـە فیرعـەون لەپـەیامی موسا ترسـاو ناوقـەدی پـچڕاو دڵـی وەلـەرزە کـەوت، ـاچار پەنای بۆ گەل بردو ویـستی بیـان وروژێنـیو ئـەوان لـەدژی بجوڵێنیّ! وتـی: ـەم کابرا سیحربازە..

﴿يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ؟﴾ دەیـەوێ ئێـوە لـەخاکی ـاوكو باپیری خۆتان وەدەرنێو بەهۆی سیحرەکەیەوە بەسەرتاندا زاڵ بێ، دەیەوێ دووبەرەکی بخاتـە نێوانتانـەوەو کۆمـەڵتان بەشـبەش بکـاو دارو دەسـتـەی خـۆی زۆر بکـاو وردەوردە کێـشەوەتان لـێ بکـا تـا لاواز دەبـن ئـەمجار فرمانڕەواییەکـەتان لێ ـاگیربکـا، نەتـەوەی ئیـسرائیل لەگـەڵ خـۆی بـەرێ! ئەمـە پـلانو نەخـشەی ئـەم کابرایەیـەو دەیـەوێ ئـەو ئامانجـە بەدەسـت بێنـێ، راوو بۆچـونی خۆتـانم بـۆ رون بکەنەوە پێم بڵێن: چی بکەم باشەو چۆن بـەرەنگاری ئـەم خەتـەرە ببمـەوە، مـن ـەقسەی ئێوە دەرناچم، چیتان بڕیاردا من تەنفیذی دەکەم.

ئەمـە جـۆرە ئوسـلووبێکە دەیـەوێ بـەم جـۆرە راپـەڕینیان تێـدا دروسـت بکـاو هەڵیاننێ بۆ یەکیەتیو یەکڕیزی لەبەرامبەر حەزرەتی موسادا، بەڵکوو بەسـەریدا زاڵببنو دەری بکەن!

هەڵبەتە ئەمانیش هەموو پیاوی دەرباری کۆشکی فیرعەونو چڵکاو خۆر بوون، دەترسـان ئەگـەر موسـا﷤سـەربکەوێ بەرژەوەندییـەکانیان لـەکیس بـچن، پلـەو پایەیان نەمێنێ، بۆیە خێرا یەکیان گرتو بـەکۆڕای هـەموانیان چارەسـەریان ئـەوە دۆزیەوە: کەبەرەنگاری سیحر بەسیحر بکرێ!

﴿قَالُوا أَرْجِهِ وَأَخَاهُ﴾ وتیان: پاشا کاری موساو براکەی دوابخە، جارێ پەلە مەکە لەسزادانیان.

﴿وَابْعَثْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ، يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ﴾ وەلام بنێرە بۆ هەموو شارو ولاتی ژێر دەسەلات، با هەرچی ساحیرو جادوبازە کۆیان بکەنەوە، هەموانیان بێنن بۆ خزمەت پاشا، بەتەئکید لەئەنجامی ئەمەدا زۆر ساحیری کارامەو زانا کۆدەبنەوەو دێنە خزمەتت، ئەوکاتە ئەوانیش بەسیحری سەرسوڕهێنەری خۆیان بەرەنگاری سیحرەکەی موسا دەکەنو بەسەری دا زاڵ دەبنو دەبێتە سەرکەوتنی تۆ بەسەر موسادا.

مەشۆرەت بەجێ بوو، رای دارو دەستە لای فیرعەون پەسند بوو، فرمان دەرکرا بۆ شارو فرمانڕەواکان نێردرا، یاساوڵو کاربەدەستان کەوتنە جمو جوڵ ساحیر دیاری کرانو پێیان راگەیەندرا ، بەرەو میصر بکەونەڕێ، خۆیان ئامادە بکەن بۆ (مباریات) بۆ پێشبڕکێو بەرەنگاری بوونەوە، زەمینەی (مباریات) لەنێوان حەقو بەتاڵ دا خۆش کرا، کۆبوونەوەو نەخشەو پلان داڕێژرا، بۆ کۆبوونەوەو بەرامبەری کردنو چەمبەرە لێکدی بەستن.. کاتو شوێن دیاریکران! بابزانین چی رودەداو ئاکام بەچی دەگا؟!!

## ئیمانهێنانی ساحیرەکان بەخوداو سوژدە بردنیانو بەگژاچوونەوەیان بۆ فیرعەون

﴿ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ

لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلۡقَوۡاْ حِبَالَهُمۡ وَعِصِيَّهُمۡ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلۡقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَ فَلَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيۡرَۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥١﴾

فیرعـەون و یاسـاوڵەکانی ویـستیان بـە (فـوو) نـووری خـودا بکوژێننـەوە، هەرچەند کافرو بێبڕوایان پێیان ناخۆش بێ خودا نووری خۆی بڵاو دەکاتـەوە، تـەواوی دەکـا داب و نـەریتی خـودا وایـە لەبوونـەوەردا هـەرکاتێ ئیمـان و کـوفر بەرامبـەر یـەک بوەسـتن، لەهەرشـوێنێک حـەق و بـەتاڵ روبـەڕوی یـەک بوەسـتن، لەهەرشـوێنێک حـەق و بـەتاڵ روبەروییـەک بوونـەوە، هـەردەبێ ئیمـان و حـەق سەربکەوێ، ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا

تَصِفُونَ﴾ (الأنبياء/١٨) ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾ (الإسراء/٨١).

بەڵێ بڕیارەو فیرعەونی ملهوڕ دەری کردوە، بەتایبەتی کە لەسەر پێشنیاری پیاوماقوڵانو دارو دەستەی دەربار پەسند کراوە دەبێ جێبەجێ بکرێو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە.

﴿فَجُمِعَ السَّحَرَةُ لِمِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ﴾ ساحیرەکان کۆکرانەوەو لەهەر چواردەوری میصر ڕاهێندران لەرۆژی دیاری کراودا: کە دەڵێن: ڕۆژی نەورۆز بووە، لەکاتی چێشتەنگاودا لەشوێنی دیاری کراودا خڕکرانەوەو ئامادەکران!

وەکوو لەریوایەتی جۆراو جۆردا هاتووە ساحیرەکان زۆرزانو لێهاتوو کاراما بوون، لەفەننی سیحردا دەستیان زۆر باڵا بوو، کۆمەڵێکی ڕۆشنبیرو تێگەیشتوو بوون، ژمارەیان زۆرو هەمەجۆر بوون، هەندێك دەڵێن: دوانزە هەزارو هەندێك دەبێژن: زیاتر بوون.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: هەموویان لەژێر نەخشەو پلانی چواریاندا کاریان دەکردو ئەو چوار کەسە مامۆستاو ریش سپییان بوون ناویان (سابوور، عاذوور، حطحط، مصفی) بوو دیاریکردنی ڕۆژی بەرامبەریکردن لەلایەن حەزرەتی موساوە دیاری کرا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى﴾ (طه/٥٩).

حەزرەتی موسا﷤ ویستی ڕۆژەکە ڕۆژێکی قەرەباڵغ و ڕۆژێکی پشوودان بێ، بۆیە ڕۆژی جەژنی نەورۆزی هەڵبژاردو ئەوانیش بەلایانەوە پەسند بوو! حەزرەتی موسا﷤ویستی (مباریات)ەکە لەبەرچاوی زۆرترینی خەڵك دا ئەنجام بدرێ، زۆربەی جەماوەر ئاگایان لێبێ چۆن حەق بەسەر بەتاڵدا سەردەکەوێ!

﴿وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ﴾ داوا لەجەماوەر کرا ئامادەی ئەو(مباریات)ە بن، یاساوڵو دارو دەستەی فیرعەون خەڵکیان هەڵدەنا بۆ ئامادەبوونو بینینی ئەو

شتەی لەو رۆژەدا رودەدا. چونکە فیرعەون و پیاوەکانی دڵنیا بوون لەسەرکەوتن و باڵادەستی خۆیان و پێیان وابوو: هەر ئەوان سەردەکەون، بۆیە پێیان خۆش بوو زۆرترینی جەماوەر کۆببێتەوەو سەرکەوتنی خۆیان و تێشکانی حەزرەتی موسا ببینن و کەس لەوەدوا بڕوا بەموسا نەکا. لەلایەکی ترەوە حەزرەتی موسا ﷺ دەیەویست زۆرترینی جەماوەر ئاگاداری روداوەکە بن و بزانن چۆن پەیامی حەق بەسەر بەتاڵدا زاڵ دەبێ و چۆن موعجیزە سیحر دەپوچێنێتەوە!!

یاساوڵ و پیاوەکانی فیرعەون دەنەدەنەی خەڵکیان دەدا بۆ کۆبوونەوەو هاوبەشی کردن و دەیانگوت: ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ إِنْ كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾ هیوادارین ساحیرەکان سەربکەون و ئێمە لەسەر بیرو باوەڕی خۆمان بمێنینەوەو شوێن ئەم ئایینە نەکەوین: کە موسا بانگەوازی بۆ دەکا.

سەیرە وتیان: شوێن ساحیرەکان بکەوین، نەیانگوت: شوێن حەق دەکەوین چ لەساحیرەکانەوە بێ چ لەموساوە بێ. چونکە وەکوو گوتراوە: ( الناس على دين ملوكهم ) ئەوانیش چڵکاو خۆری فیرعەون بوون و حەزیان لێبوو ساحیرەکان سەربکەون.

ئەمجار دیمەنی ساحیرەکان رادەنوێنێ لەخزمەت فیرعەون داو پێش دەست پێکردنی بەرامبەریکردنەکە دڵنیا دەبن لەپاداش وەرگرتن و پلەو پایە پێدان! دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْراً إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ ؟﴾ : کە ساحیرەکان هاتنە لای فیرعەون و دەمڕاست و لێپرسراوو مامۆستاکانیان لەگەڵ فیرعەوندا گفتوگۆیان کرد وتیان: ئەگەر ئێمە سەرکەوتین و موسامان بۆڕدا، پاداش و پلەو پایەمان دەدرێتێ؟ جەنابی پاشا جائیزەو نەغدینەی بۆ دیاری کردوین ؟!

﴿قَالَ نَعَمْ﴾ فیرعەون وتی: بەڵێ پاداشی نەغدینەم بۆ دیاریکردون، ئەگەر سەربکەون ماڵ و سامانێکی زۆرتان بەسەردا دەڕێژم، وێڕای ئەوەش و زیاد لەوەش

﴿وَإِنَّكُمْ إِذاً لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ ئێوە لەمن نزیك دەبنەوەو دەتانكەمە هاونشینی خۆم، واتە: ساحیرەكان داوای پاداشی ماڵی یان پلەو پایەیان كرد فیرعەون وادەی هەردوك پاداشتەكەی پێدان!

بەڵێ ساحیرەكان هەڵوێستی خۆیان نواند، كۆمەڵێكی بەكرێگیراو، فیرعەون بەكاریان دێنێ بۆ مەبەستی خۆی بەهرەو زانیاری خۆیان دەفرۆشن بەبڕە پارەیەك، یان بەپلەو پایەو مەرحەباییەكی فیرعەون چ پەیوەندییەكیان بەبیرو باوەڕەوە نیە، هەر ئەم جۆرە چڵكاو خۆرانەن بەدرێژایی مێژوو طاغوتو ملهوڕەكان بەكاریان دێنن، خزمەتی خۆیانیان پێدەكەن، درۆو دەلەسەیان بۆ هەڵدەبەستن بەشیعرو پەخشان پێیاندا هەڵدەڵێن! شایەتی دڵسۆزیو پیاو چاكیان بۆ دەدەن!!

ئێستا ئەوا ساحیرەكان لەخزمەت فیرعەوندا وادەی پاداش دانەوەو بەخشینی پلەو پایەیان وەرگرت فیرعەون وادەی زیاد لەپێویستی پێدان، ئەمجار ساحیرەكان دەكەونە گفتوگۆ لەگەڵ حەزرەتی موسادا دەربارەی ئەوەی ئایا كێیان دەست پێشكەربن..

﴿قَالَ لَهُمْ مُوسَى أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ﴾ حەزرەتی موسا﷣ ڕێگایدا: كە ساحیرەكان لەپێشدا سیحری خۆیان بنوێنن، پێی وتن: ئێوە ئەوەی دەتانەوێ بیخەنە بەرچاوو بیهاوێژن بابزاندرێ چیە! گوریسو حەبلو پەتكی خۆتان بهاوێژن، حەزرەتی موسا﷣ دڵنیا بوو لەسەركەوتن، متمانەی بەخودای خۆی هەبوو.

﴿فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ﴾ ئیتر ساحیرەكان گوریسو گۆچانو عەصاكانی خۆیان هاوێشتن هەموو دەست ڕەنگینیو كارامایی خۆیان خستەكار، جیوەیان كردبوە ناو گوریسو عەصاكانیان، بەتەواوی كارامایی خۆیان بەكار هێنابوو،

تەنانەت سیحرەکەیان هێندە گەورەو سەرسوڕهێنەر بوو، ترسێکی خستە ناو دڵی حەزرەتی موساوە، حەبلو عەصای خۆیان هاوێشتن..

﴿وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾ وتیان: بەهیمەتی فیرعەونو هێزو توانای ئەو ئێمە سەرکەوتو دەبین. کاتەکە چێشتەنگاو بوو، گوریسو عەصاکانیان بەجیوە (زئبق) ناواخن کرابوون، خۆرەتاو گەرمای گەیاندە جیوەکەو گوریسو عەصا لەگۆڕەپانەکەدا کەوتنە جمو جوڵو گۆڕەپانەکەیان پڕکرد، تەنانەت حەزرەتی موسا‌ﷺ وای گومان برد: کە ئەوە جمو جوڵی سروشتییە.

چاو بەستەکێیان لەخەڵکەکە کرد، تەنانەت بینەران هەموویان بەحەزرەتی موساشەوە ترسان وایانزانی ماری راستین. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى، فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى، قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى﴾ (طه/٦٦-٦٨) یان دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَلْقُوْاْ فَلَمَّا أَلْقَوْاْ سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ (الأعراف/١١٦)

ئالەم کاتەدا فیرعەونو دارو دەستەکەی کەیفخۆش بوونو پێیان وابوو: ساحیرەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو ئیتر عەصای موسا تازە دەرەقەتی ئەو هەموو مارو ئەژدیهانایە نایە!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی موسا‌ﷺکرد: کە هیچ ترسی نەبێو عەصاکەی بهاوێژێ، ﴿فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾: کەحەزرەتی موسا‌ﷺ عەصاکەی هاوێشت، ئیتر لەپڕێکا هەرچی گوریسو عەصا هەبوون: کە بەهۆی جیوەوە وایان لێکردبوون، وەکوو ماری راستی بێنە بەرچاو، هەمووی قوت دانو هیچی لێنەهێشتنەوە، موفاجەئە روی دا بەخەیاڵی ساحیرەکان دا نەهاتبوو، ئەوان هەرچی کارامایيو دەستڕەنگینی خۆیان هەیە خستبویانە گەڕو لەهەموو لایەکەوە ساحیری ماهیرو لێزان کۆکرابوونەوە، موسا بەتاقی تەنێو کەسی لەگەڵ نیە جگە لەعەصاکەی کەچی لەماوەیەکی زۆر کەمدا هەموو ئەو مارە

سیحرکردانەی هەڵلوشین و ئاسەواریان نەما، ئەو هەموو مارە درۆزنانەی ساتێك لەوەپێش گۆڕەپانیان پڕکردبوو، دەهاتن و دەچوون هیچیان نەمان و عەصای موسا لولی کردن و قوتی دان! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ، فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ (الأعراف/١١٧-١١٨).

ئیتر عیلم و زانیاریی کاریگەریی خۆی دەرخست، ئەوان زانییان: کە ئەمەی موسا دەینوێنێ سیحر نیەو لەهی ئەوان ناچێ، جگە لەئیمان هێنان هیچی تریان بەدەستەوە نەما ﴿ فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ﴾ ساحیرەکان بەناچاری بەڕودا کەوتن و چوونە سوژدە، چونکە دڵنیا بوون ئەوەی حەزرەتی موسا کردی لەزوور توانای ئادەمیزادەوەیەو ئەوە کردەوەی خودای بوونەوەرە، بۆیە هیچیان بەدەستەوە نەما جگە لەوەی کەخرانە حاڵەتی سوژدەبردن بۆ ئەو خودایەی: کە بەدیهێنەری بوونەوەرو ئەوانەو موعجیزەی ئاوای بەخشیوە بەموسا.

﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ، رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾ واتە: ساحیرەکان بەیەکدەم وتیان: ئیمانمان هێنا بە(رب العالمین) بە خودای بوونەوەر، خودای موساو هارون. چیتر لەحاڵەتی گومڕاییدا نامێنینەوە، ئیمانمان هەڵبژارد بەسەر کوفردا، حەقمان وەرگرت و بەتاڵمان وەلانا، فیرعەون بەهیچ نازانین و لەزەبرو زەنگی ناترسین و بەتەما بەخشش و پاداشی نین.

پێش ساتێك بەتەما سەرکەوتن و پاداش وەرگرتن بوون لەفیرعەون، بەتەمابوون کیسە پارە وەربگرن و ببنە هاونشینی فیرعەون و لەمەجلیسی دا کاتی لەگەڵ بەسەربەرن، خاوەن عەقیدەو قەضیە نەبوون، بەڵام ئەو حەقەی چاویان پێ کەوت و کاری لەناخیان کرد، یەکسەر لەناخەوە هەموو بیرو بۆچوون و خەیاڵێکی هەڵوەشاندنەوە، سەرلەبەر گۆڕانکاری بەسەردا هێنان، هەژاندنی رایتلاقاندن و تێکی وەردان و ئیمانی گەیاندە ناوقوڵایی دڵیانەوەو پەردەی کوفرو گومڕایی لەسەر

لابردن، دڵو دەروونی صافو بێگەرد کردنو بەنووری ئیمان ئاوەدانی کردەوە، لەچەند ساتو کاتێکی زۆر کورتو قیاسیدا خۆیان بینیەوە کەوتونە سوژدەو بەناچاری زوبانیان بەوشەی ئیمانهێنان دەگەڕێو دەڵێن ئیمانمان بە خودای بوونەوەر هێنا، بڕوامان بەخودای موساو هارون کرد.

دڵی ئادەمیزاد تابڵێی عەجایبو سەرسوڕهێنەرە، هەر لەگەڵ شتێکی کاریگەری وێکەوت، خێرا دەگۆڕێ بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (مامن قلب الا بين أصبعين من أصابع الرحمن ان شاء أقامه وان شاء ازاغه) (بوخاریو موسلیم) ئەوەتا لەماوەی چەند ساتێکدا ساحیرە بەکرێ گیراوەکان ئەو گۆڕانکارییەیان بەسەردا هاتو بوونە ئەو خاوەن ئیمانە پتەوە، لەپێش چاوی ئەو جەماوەرەو فیرعەونو دارو دەستەکەی ئیمانهێنانی خۆیان رادەگەیەننو هیچ باکیان لەفیرعەونو زەبرو زەنگی نیەو گوێ بەهەڕەشەو دارو فەلاقەی نادەن. بەلایانەوە مەبەست نیە دوای ئیمانهێنانو روبەرو بوونەوەی فیرعەون چییان بەسەردێ چییان لێدەکرێ.!!

ئەوە هێزو قووەتی ئیمانەو بڕوا بەژیانی دواییە ئاوا چاو نەترسو بێباکی کردن. بێگومان ئەم روداوە؛ ئەم ئینقیلابە کتوپڕییە وەکوو تریشقە وابوو، بوومەلەرزەیەك بوو لەفیرعەونو دارو دەستەکەیدا، ئەو حەمکە جەماوەرە کۆکراوەتەوە، دارو دەستەو یاساوڵەکانی فیرعەون گۆشیان کردونو جۆرەها درۆو دەلەسەیان بەگوێدا داون، پێیان گوتوون: موسا ئیسرائیلییەکە ساحیرەو دەیەوێ بەسیحرو جادوبازی خۆی، ئێوە لەخاکی میصر دەربکاو بۆخۆی ببێتە حوکمڕان، وەرن بڕوانن چۆن ساحیرەکانی پاشا بۆڕی دەدەنو دەمکوتی دەکەن، ساحیرەکانیش خۆیان ئامادەکردوەو بەتەما وەرگرتنی جائیزەو پاداشن، تەنانەت: کە گوریسەکانیشیان هاوێشتن بەهیمەتو عیزەتی فیرعەون هاوێشتیان دەی ئەوەتا لەچەند ساتێکدا تێدەشکێنو دان بە تێشکانی خۆیاندا دەنێن!

شۆڕشێکی گەورەو مەزن بوو، کورسی فیرعەونی لەقاند، بەڵکوو ژێرو زەبەری کرد، ئەو خەیاڵو بیرو بۆچوونانەی پوچ کردەوە : کەگوایە فیرعەون خودایە یان لەنەوەی خوداکانە - وەکوو لەبیری سەردەمو رۆژگاردا واباوبوو-!

ئەوانەی لێی هەڵگەڕانەوە ساحیرەکان بوون، چینو توێژێکی کاریگەر لەژێر دەسەڵاتی چوونەدەرەوە، ساحیرو جادوگەر لەو رۆژگارەدا چینو توێژێکی خاوەن پلەو پایە بوون، سیحر کارێکی پیرۆزو رێزدار بوو، کاهینو بەرپرسەکانی پەرستگاکان ئەنجامیان دەدا، ئەمانیش چینو توێژێکی زۆرو قسە رۆیشتووبوون، دەی ئەوا ئەوانە تێکڕا ئیمانیان بەخودای موساو هارون هێنا، هەڵبەتە جەماوەریش ئەمڕۆ یا سبەی شوێنیان دەکەون، حەقیقەتیان بەچاوی خۆیان دیوە لەپێش چاوی ئەوان ساحیرەکان خودایەتی فیرعەونیان رەت کردەوەو کەوتنە سوژدەو ئیعلانی ئیمانهێنانی خۆیان کرد؛ دەی تازە جگە لەزەبرو زەنگ و قامچیو دارو فەلاقە هیچ شتێکی تر نەماوە پارێزگاری عەرشی فیرعەون بکا، زەبرو زەنگ و هێزو دەسەڵات بەبێ بیروباوەڕ کورسیو فەرمانڕەوایی پێ ناپارێزرێن.

بۆیە فیرعەون بەتەواویی ترساو تینی بۆ هاتو پەنای بردە بەر تەهدیدو هەڕەشەی توند، سەرەتا ویستی ساحیرەکان تۆمەتبار بکا بەوەی: کە لەگەڵ موسادا لەژێرەوە یەکیان گرتووەو موئامەرەیان کردوە.

﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ!﴾ وتی: ئەوە بەبێ ئەوەی من رێگاتان پێبدەمو رازی بم ئیمانتان هێنا؟ ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ﴾ بێگومان موسا مامۆستاو ساحیرە گەورەکەتانە، ئەو فێری سیحری کردونو لەوەپێش رێك کەوتوون، ئەگینا چۆن بەبێ ڕەزامەندی من ئیمان دەهێنن؟ وادیارە بەئەنقەست سیحرەکانتانوا ئەنجام دا ژێر بکەون!!

بێگومان ئەم تۆمەتبارکردنەی فیرعەون بۆ ساحیرەکان پەیوەندییەکی دووری هەیە، چونکە ئەوکاتەی حەزرەتی موسا﷣ لەماڵی فیرعەوندا پەروەردە دەکرا، هەندێ لەکاهینەکان سەرپەرشتی پەروەردەکردنەکەیان دەکردو حەزرەتی

موسا﷤ هاتوچۆی هەندێ لەکاهینەکانی کردوە، جا فیرعەون ئەم پەیوەندییە دێرینەی زیندوکردەوەو هێنایەوە گۆڕێ، بەڵام بەپێچەوانەوە چونکە دەبوایە بڵێ: موسا قوتابی ئێوە بووەو ئێوە فێری سیحرتان کردوە، بەڵام بۆ چەواشەکاریو زلکردنی مەوزوعەکە لەبەرچاوی جەماوەر ئاوا پاساوی دایەوە!

ئەمجار دەستی کرد بەهەڕەشەکردنو وتی: ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ لەوە بەولاوە دەزانن: تۆڵەی من چۆن دەبێو چیتان پێدەکەم. ﴿لأقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلافٍ وَلأصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ بەتەئکید دەستو قاچتان بەپێچەوانەوە دەبڕم؛ دەستی راستو قاچی چەپتان دەبڕمو ئەمجار بەدەستو قاچ بڕاوی هەموانتان هەڵدەهاوەسمو بەو تەعزیبە دەتانکوژم!

بەڵام هەڕەشە کواکار لەودڵە ئیمان دارە تازە موسوڵمانبوانە دەکا؟ هەرچەندە دەیانزانی: فیرعەون ملهوڕو طاغووتەو ئەوەی دەیڵێ: تەنفیذی دەکا، بەڵام ئەوان بڕواو ئیمانەکەیان زۆر لەزوڵمو ستەمی فیرعەون بەهێزتر بوو، بەهێواشیو بێئەوەی خۆیان تێك بدەن، یان بپاڕێنەوەو سکاڵابکەن.

وتیان: ﴿قَالُوا لا ضَيْرَ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنْقَلِبُونَ﴾ چ زەرەرو زیانێکمان پێ ناگا، چیت لەدەست دێ بیکە، چ باکمان لەهەڕەشەو عەزابی تۆ نیە، هەمووومان گیای مردنین، هەموو کەس دەبێ بمرێ، ئێمە بۆ لای خودای خۆمان دەگەڕێینەوە، پاداشتی خودامان دەوێ، خودا بۆخۆی دەزانێ چمان پێدەکەیو چۆن تەعزیبمان دەدەی، ئەو لەپاساوی ئەوەدا پاداشتمان دەداتەوە، ژیانی بەختەوەریمان دەداتێ: کەژیانی جاویدانی ناو بەهەشتی رازاوەیە.

﴿إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئێمە بەتەمای ئەوەین خودای خۆمان لەتاوانەکانمان ببوۆرێ، لەتاوانی ئەو سیحرو جادو بازییەی بەزۆر پێت ئەنجام داین چاو پۆشیمان لێبکا. لەبەر خاتری ئەوەی لەم فستیڤاڵەدا یەکەم دەستەو کۆمەڵ بووین ئیمانمان هێنا، یان لەبەرئەوەی یەکەم کۆمەڵین

لەقیبطیەکان: کە ئیمانمان هێنا، ئیتر فیرعەون هەموویانی شەهید کردن‌و هەڕەشەی خۆی بردە سەر، بەتەئکید خوداش وادەی خۆی بردۆتە سەرو بەبەهەشتی بەرینی شادمان کردون.

ئەڵلا لەکاریگەریی ئیمان کاتێك لەدڵ‌و دەروونـدا پەیدا دەبیّ‌و جێگیر دەبیّ، کاتێك گیان دادەپۆشی‌و ئارامی دەخاتە نێو نەفس‌و هێزو توانای دەداتیّ : دڵ‌و دەروون تێر دەکاو هەرچی لەجیهان دایە بەلایەوە پوشێکە.!!

وشەی (طمع) لەم شوێنانەدا بەمانا یەقین دێ. وەکوو حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: ﴿وَالَّذِي أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ﴾ (الشعراء/٨٢).

## رزگاربوونی موسا ﷺ و نەتەوەکەی، خنکاندنی فیرعەون‌و دارو دەستەکەی

﴿ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ

﴿كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾﴾

لەدوای ئەو رووداوانەی پێشوو، حەزرەتی موسا(عليه السلام) درێژەی بە بانگەوازی خوای داو لەوڵاتی میسردا مایەوە، بەڵگەو دەلیلی بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی هێنانەوە، بەهیچ جۆرێك نەهاتنە سەر رێگای راستو ملیان نەدا، زۆر بەتوندو تیژی بەرەنگاری موساو پەیامەکەی بوونەوە، عەزابو چەوسانەوەیان بۆ نەتەوەی ئیسرائیل رۆژ بەرۆژ زیادی دەکرد، پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی موسا(عليه السلام) کرد: کە رەو بەنەتەوەی ئیسرائیل بکا لەخاکی میسرەوە بەرەو فەلەستین بیانبا، بەشەو خۆیان ساز بدەن و لەشار دەرچن.

حەزرەتی موسا(عليه السلام) فەرمانی پەروەردگاری بەجێهێنا، لەپێشدا ئەندازەیەکی زۆر خشڵ و زێڕو زیویان لە قیبطیەکان وەرگرت بەناوی ئەوەوە جەژنیانەو خۆیانی پێدەرازێننەوە، شەو داهاتو مانگ لەکەلێن سەری دەرهێنا ئیتر ئەوان دەستیان بەرەو کردو کەوتنەرێ.

حەزرەتی موسا(عليه السلام) پرسیاری لەپیرەژنێکی کۆنە ساڵ کردبوو گۆڕی حەزرەتی یوسفی نیشاندا، ئیتر لەسەر وەصیەتی حەزرەتی یوسف خۆی: کە رایسپاردبوو هەرکاتێ نەتەوەی ئیسرائیل لەمیسر دەرچوون، ئەو تابوتەی جەستەی ئەوی تێدا

لـەگۆڕنراوە، لەگـەڵ خۆیـان بیبەنـەوە بـۆ خـاکی فەلەسـتینو لـەوێ بـەخاکی بسپێرنەوە، تابوتەکەی حەزرەتی یوسفیشیان لەگەڵ خۆیان برد!

هەڵبەتە لێرەدا قورئان چەند روداوو رۆژگاری پێچاوەتەوە، ئـەگینا دوابـەدوای ئـەو بەرامبـەریو موبارەیاتـەی نێـوان حـەزرەتی موسـاو سـاحیرەکانو ئیمـان هێنانیانو ئیعدام کردنیان لەلایەن فیرعەونەوە، حەزرەتی موسا عليه السلام زۆر ماوەتـەوە گـەلێك مـوعجیزەو روداوو بێنـەو بـەردە لـەنێوان حـەزرەتی موسـاو فیرعـەونو تاقمەکەیـدا رویـان داوە، لەسـورەتی (الأعـراف) (ئایـەتی ١٢٧-١٣٧)دا ئاماژەیـان بۆکراوە[1].

بـەڵام سیاقەکە هـەموو ئـەو روداوانـەی پێچاونەوەو هاتۆتـە سـەر رانوانـدنی کۆتایی چیرۆکەکەو ئەوە نمایش دەکا: کە لەگەڵ مـەوزوعی سورەتەکەدا دەگونجێ! دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُمْ مُتَّبَعُونَ﴾ واتـە: نیگامـان بـۆ موسا کرد کە شەوڕەو بەنەتەوەی ئیسرائیل بکا، بەشـەو لەگـەڵ قەومەکـەی بـەرەو دەریا بکەونەڕێ، (وادیارە فەرمانیان پێکراوە بەرەو خـاڵی بەیەکگەیـشتنی خلیجی سوێس بەرەو ناوچەی دەریاچەکان رەوبکەن).

حـەزرەتی موسـا عليه السلام چـۆنی فـەرمان پـێکرابوو ئـاوا هەڵـسوکەوتی کـرد، پەروەردگار هەواڵی ئەوەی دابوو بەموسا عليه السلام: کە فیرعەونو لەشکرەکەی شـوێنیان دەکـەون، بـەڵام پێیـان ناگـەنو خـۆیو بـەنی ئیـسرائیلییەکان رزگاریـان دەبـێو فیرعـەونو لەشـکرەکەی دەخنکێن! وەکـوو ریوایـەت کـراوە: نەتـەوەی ئیـسرائیل چوارسەدو سی ساڵ لەخاکی میصردا مانەوە.

ئەو شەوەی رەویان کرد جەژنی (فصح) بوو، ژمارەی رەوکەران وەکوو لـەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کراوە شەشصەد هەزار پیادە بوون لەپیاو، جگە لەژنو منداڵ.

[1] سەیری جزمی (٩) ی ئەم تەفسیرە لاپەڕە (٤٥-٦٣ ) بکە.

فیرعەون بەم کەین و بەینەی نەتەوەی ئیسرائیلییەکانی زانیبوو، فەرمانی کرد ئامادەباشییەکی تەواو (تعبئة عامة) یەك بکرێ بۆ بەرەنگاری بوونەوەی رەوکردنەکەو نەهێڵێ بەئاکام بگا.

بۆ ئەم مەبەستە ﴿فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ﴾ کە فیرعەون دڵنیابوو لەپیلانی بەنوئیسرائیلییەکان و زانی بڕیاریان داوە میصر بەجێ بێڵن رقی هەڵساو بەتەواوی فسقەڵ بوو، خێرا فەرمانی دا بنێرن بۆ شارو شارۆچکەکانی وڵاتی میصر سەربازو پیاوی سوپا کۆبکەنەوە، چڵکاوخۆرو یاساوڵەکانی فیرعەون بەوڵاتدا بڵاوبوونەوە، دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی سەربازو پۆلیس بەڵام وادیارە فیرعەون هەستی بەخەتەرو هێزو توانای حەزرەتی موسا﷣و شوێنکەوتوانی کردبوو، بۆیە هەوڵی دا ورەی لەشکرو دارو دەستەکەی بەرز بکاتەوە، هەڵینان بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بکەونەڕێ و دووی بەنوئیسرائیلییەکان بکەون نەهێڵن دەرچن، بۆ ئەم مەبەستەش سێ سیفەتی بۆ نەتەوەی ئیسرائیل دیاری کرد، بۆ ئەوەی لەشەئن و شکۆمەندی شوێنکەوتوانی موسا کەم بکاتەوەو جۆرە شەرعیەتێك بدا بە بەدودا چوون و گێڕانەوەی بەنوئیسرائیلییەکان بۆ ژێر رکێفی خۆی و دڵنیا کردنەوەی لەشکرەکەش لەسەرکەوتن.

دەڵێ: ﴿إِنَّ هَؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ﴾ نەتەوەی ئیسرائیل: کە شوێن موسا ﷺ کەوتوون کۆمەڵێکی کەم و بێهێزن، بەئاسانی دەتوانین دیلیان بکەین، یان بیانکوژین، یان بیانخەینەوە ژێر رکێفی خۆمان. دەی کە ئەوە حاڵیانە ئەدی ئەم هەموو لەشکر کۆکردنەوە لەچی و ئەم تەعبیئە گشتییە لەچی.

﴿وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ﴾ ئەوان سەرپێچی فەرمانی ئێمە دەکەن و هەرچی ئێمە پێمان ناخۆش بێ ئەوان ئەوە دەکەن، ئاشوب و فیتنەیی بەرپا دەکەن، خشڵ و زێرو زیوەکەشیان بردوین و رەویان کردوە ، لەژێر رکێفی ئێمە چوونەدەر. کەوابێ ئەوانە خەتەرن و ئێمە بەئاسانی نایانوێرینێ!!

﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ﴾ ئێمە هەموومان ورياو بەئاگاين دەزانين چی دەكەن‌و بەتەما چين، ناهێڵين بەمراز بگەن، جڵەوی فەرمانڕەوايی بەدەست ئێمەوەيە، چەك بەدەست‌و خاوەن هێزو توانايين، دەمەوێ قەڵاچۆيان بكەم‌و لەناويان بەرم. بەكورتی فيرعەون نەيدەزانی چۆن پاساو بۆ لەشكر كێشيەكەی بێنێتەوەو بەچ بيانويەك سوپاكەی هەڵنێ بۆ بەدوادا چوونی بەنوئيسرائيلييەكان.

﴿فَأَخْرَجْنَاهُمْ مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ دڵ‌و دەروونی تاقمی فيرعەونمان هێنايە سەر ئەوە بەدوای بەنوئيسرائيلييەكان بكەون، لەناو ئەو باخ‌و باخاتەی تێيدا دەژيان دەرچوون، سەرچاوەو كانياوی سازگارو باخی پڕ داری ميوەو سەوزو بەرەونەقيان بەجێهێشت، ماڵ‌و سامانی پەزمەندەكراوی ناو زەوی‌و خەزنەكانيان وازلێهێنا، خانوو كۆشك‌و باڵەخانەكانيان لەدوا خۆيان هێشتەوەو دوا نەتەوەی ئيسرائيل كەوتن‌و شوێن پێيان هەڵگرتن، ئەم چوونە دەرەوەيان دوا چوونە دەرەوەو دوا ديداريان بوو بەو ماڵ‌و سامان‌و باخ‌و كانياوەی هەيانبوو، بۆی نەگەڕانەوەو نەياندييەوە.

﴿كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ پەروەردگار دەفەرموێ: كار بەوجۆرە بوو: كە بڕيارمان دابوو، فيرعەون‌و دارو دەستەكەيمان لەميسر وەدەرناو شوێن گەنج‌و خەزێنەو باخ‌و كانياوو جۆگاو زەوی‌و زاری ئەوانمان بەميراتدا بەنەتەوەی ئيسرائيل، ئەو نەتەوە ژێردەستەو چەوسێنراوەمان رزگار كردو ئازادی‌و مڵك‌و سامانمان پێ دان. وەكوو لەئايەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ (الأعراف/١٣٧).

﴿فَأَتْبَعُوهُمْ مُشْرِقِينَ﴾ فيرعەون‌و لەشكرەكەی لەكاتی خۆرهەڵاتندا لەلای خليجی سوێس بەبەنو ئيسرائيلييەكان گەيشتن، ئيتر ترس‌و خۆفێكی زۆر كەوتە ناو نەتەوەی ئيسرائيلەو پێشيان دەرياو دواوەيان دوژمن!

دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ﴾ کە هەریەك لە لەشکری فیرعەون و نەتەوەی ئیسرائیل یەکتریان بینی ﴿قَالَ أَصْحَابُ مُوسَى إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ تاقم و پێڕی حەزرەتی موسا وتیان: ئەوا فیرعەون و لەشکرەکەی پێمان گەیشتن و بەتەئکید دەمانکوژن و تازە گیان دەرنابەین ئاها ئێستا نا ئێستا قەلاچۆمان دەکەن..

حەزرەتی موسا ﷺ دڵنەوایی کردن و دڵی دانەوە ﴿قَالَ﴾ پێیانی فەرموو: ﴿كَلَّا﴾ نەخێر ئەوان بەئێمە ناگەن، ناتوانن قەلاچۆمان بکەن، بەسەرماندا زاڵنابن ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ بێگومان من خودام لەگەڵە، شارەزاییم دەکا بۆ ڕێگەی ڕزگاربوون ئێمە سەردەکەوین، مەترسن و خەمتان نەبێ.

ئالەم کاتە ناسکەدا لەم وێستگە ترسناکەدا: کە نەتەوەی ئیسرائیل گیانیان گەیشتبوە سەری لوتیان و دەستیان لەخۆیان شوشتبوو، بەهیوای ژیان نەمابوون و حەزرەتی موسا ﷺ ورەی بەردەنان و ترس و لەرزی لێدەڕەواندنەوە ، فریادرەسیان پێگەیی و شەوەزەنگی نائومێدییان لێ بەرۆژ بووەوە ﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ﴾ سروشمان بۆ موسا ﷺ کرد: کە بەعەصاکەی لەدەریا بدا.

ئەویش عەصاکەی لەدەریادا ﴿فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾ دەریا لێك بڵاوبوو، دوانزە جادەڕێی تێکەوتن و ئاوەکە تەباری بەست، هەر تەبارە ئاوێك دەتگوت: کێوی بەرزو سەرکەشە، ڕێگاکان بەهەواو بەتیشکی خۆر وشك بوونەوەو تەڕاییان تێدا نەما، ڕێگاکان بەگوێرەی تایەفەو هۆزەکانی بەنوئیسرائیلی بوو، هەر هۆزەیان بەرێگایەك دا ڕۆیشتن، بەبێ ترس و بیم بەناو دەریادا و بەرێبازی وشك دا کەوتنە ڕێ!

وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقاً فِي الْبَحْرِ يَبَساً لَّا تَخَافُ دَرَكاً وَلَا تَخْشَى﴾ (طه/٧٧).

فیرعەون‌و لەشکرەکەی کە ئەمەیان بینی سەرسام بوون‌و حەپەسان، بەچاوی خۆیان بەروناکی چێشتەنگاو ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرەیان بینی‌و تێر تێر سەیریان کرد.

﴿وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الآخَرِينَ﴾ تاقم‌و پێرەکەی تر کە جەماعەتی فیرعەون بوون لەدەریا نزیکمان کردنەوەو شوێن جەماعەتی موسا کەوتن، پاشەتای بەنوئیسرائیلییەکان لەدەریا دەرچوون‌و پێشەتای جەماعەتی فیرعەون هاتنە ناو دەریاوە.

﴿وَأَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ﴾ موساو تاقم‌و کۆمەڵی لەگەڵی بوون هەموویانمان رزگارکردن ، کەسیان تێدا نەچوو.

﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا الآخَرِينَ﴾ پاشان دەریامان وێك هێنایەوە، فیرعەون‌و سوپایەکەیمان هەموو خنکاندن‌و کەسیان لێدەرنەچوو.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً﴾ بێگومان لەم چیرۆکەدا، لەرووداوە سەیرو سەرسوڕهێنەرەکانیدا پەندو ئامۆژگاری‌و نیشانەهەن لەسەر بەتوانایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی موسا ﷺ، لەسەر رزگارکردنی خوداپەرستان‌و لەناوبردنی ستەمکاران.

کەچی وێڕای ئەم بەڵگەو نیشانانە ﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی زۆری قیبطییەکان کە مابوونەوە لەناو میصردا هەروا زۆربەی زۆری بەنوئیسرائیلییەکانیش ئیمانیان نەهێنا.

کەوابێ ئەتۆش ئەی موحەممەد! دڵتەنگ مەبە بەوەی کە زۆربەی قورەیشیەکان بەدرۆت دەخەنەوەو ئیمانت پێناهێنن، ئەمە داب‌و نەریتی زۆربەی گەلە پێشینەکان بووە.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! بالادەستو خاوەن دەسەڵاتە، تۆڵە لەدوژمنەکانی دەسێنیو وازیان لێناهێنێ، خاوەن رەحمو بەزەییە بۆ بەندە موسوڵمانەکانیو چاودێرو پارێزگاریانە!!

## چیرۆکی دووەم: چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمە عليه السلام

ئەم چیرۆکە پێك دێ لەسێ بەش:

### ١- هەڕەشەکردن لەوانەی بتپەرستی دەکەنو بەیانکردنی صیفەتی ئەو خودایەی شیاوی پەرستنە

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَأَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٧٧﴾ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾

﴿وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ٨١ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ٨٢﴾

لەسەرەتای سورەتەکەدا باسی خەفەتباری حەزرەتی موحەممەدی کرد لەسەر ئەوەی کە ئیمانی پێناهێنن، ئەمجار بۆ دڵدانەوەی ئەو، چیرۆکی حەزرەتی موسای گێڕایەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەر بزانێ: کە ئەو خەمو خەفەتە تووشی حەزرەتی موساش هاتووە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم ﵇ دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر بزانێ کە خەمو نارەحەتی ئیبراهیم ﵇ لەهی موساش زیاتر بووە: چونکە دەیبینی باوكو خزمو کەسو کاری بەرەو دۆزەخ دەڕۆنو ناتوانێ رزگاریان بکاو لەو رێبازە چەوتە لایاندا.

هەموو ئەم چیرۆکانە ئاماژە بەوە دەکەن: کە سەرپێچی کردنی نەتەوەکان بۆ پێغەمبەرەکانیان دابو نەریتێکی کۆنەو بەردەوامە، پێویست بەغەمو نارەحەتی ناکا.

جائێستا دێینە سەر بەشی یەکەمی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم ﵇ لەگەڵ نەتەوەکەیدا: کە بریتییە لە دەربڕینی نارەزامەندیی حەزرەتی ئیبراهیم ﵇ دژی خزمو کەسوکاری کە بتپەرستیان دەکردو هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، هەروا ئەوەش رون دەکاتەوە کێ خودایەو کێ شیاوی عیبادەت بۆ کردنە.

دەفەرموێ: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَاهِيمَ﴾ ئەی موحەممەد! چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم ﵇ بۆ گەلو نەتەوەکەت بخوێنەوە بۆ ئەوەی ئیمان بهێننو چاو لە ئیبراهیم بکەن لەدڵسۆزیو پشت بەستن بەخوداو عیبادەت بۆ کردنیو یەکتاپەرستی دا، لەتەبەرڕا بوون لەموشریكو ستەمکاران. بێگومان پەروەردگار هیدایەتی ئیبراهیمی دابوو، هەر لەمنداڵییەوە بەخوداناسی گەورەبوبوو. جاکە

پێگەیی و دەست و دوی خۆی ناسی دژی نەتەوەکەی وەستاو نارەزامەندی خۆی دەربڕی دژی بتپەرستییەکەیان.

ئەی موحەممەد ئەومیان بۆ بخوێنەوە ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ ؟﴾ کاتێ بەباوکی و بەگەلەکەی خۆی گوت: ئەوە چییە ئێوە دەیانپەرستن؟ ئەم پەیکەرە بێگیانانە چین ئێوە بەسەریاندا کۆم بوونەوەو لەدەوریان خۆتان کۆشمەڵە کردوە، بۆیە بەم شێوە پرسیارە تەحقیر ئامێزە ئاماژەی بۆ کردن، بۆ ئەوەی سەرنجیان رابکێشێ کە ئەو شتانەی ئەوان عیبادەتیان بۆ دەکەن بەهیچ شێوەیەك شیاوی پەرستن نین، هیچ عەقڵ و یاسایەك پەسندی ناکا.

خزم و کەس و کارەکەی وەڵامیان دایەوە، بەشانازیەوە دانیان نا بە بتپەرستیەکەیاندا ﴿قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَاماً فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ﴾ وتیان: ئێمە بەشانازییەوە ئەم بتانە دەپەرستین و بەخودایان دەزانین و بەردەوامیش دەبین لەسەر پەرستنیان، شەوو رۆژ بەندایەتییان بۆ دەکەین!!

حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ ویستی بەئاگایان بێنێتەوە دڵی مردویان زیندو بکاتەوە، عەقڵی خەرەفاویان ئاگادار بکاتەوە، ﴿قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ، أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ؟﴾ پێی گوتن: ئەرێ کاتێك ئێوە لەو بتانە دەپاڕێنەوەو عیبادەتیان بۆ دەکەن گوێیان لێتانە؟ ئایا هیچ خێرو قازانجتان بۆ کێش دەکەن؟ یان زیانتان لێ دووردەخەنەوە؟ کەمترین شت بۆ خودایەك پەرستشی بۆ بکرێ ئەوەیە: کە نزاو پاڕانەوەی عابیدەکان ببیسێ؛ دەی کە ئەم بتانەی ئێوە بەخودایان دەزانن بێگیان و هیچ نەبیس بن! دەبێ سوود لەپەرستنەکەیاندا چی بێ؟ بۆ تۆزێ بیرناکەنەوە، بۆچی بەخۆتاندا ناچنەوە؟ چۆن رێگا بەخۆتان دەدەن عیبادەت بۆ ئەو پەیکەرە بێگیانانە بکەن؟!

هەڵبەتە ئەوان وەڵامێکیان پێ نەبوو بۆ ئەم پرسیارەو گومانیشیان نەبوو لەوەدا: کە ئیبراهیم ﷺ گاڵتەو قەشمەرییان پێدەکاو پرسیارەکەی بەتوانجەوەیە.

بۆیە وەڵامێکی سەخیفانەیان دایەوە ﴿قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ وتیان: بەڵکوو ئێمە باوكو باپیری خۆمانمان ئاوا دیوەو بەم شێوە ئەم پەیکەرانەیان پەرستووە! ئێمەش چاو لەئەوان دەکەین، ئەم پەیکەرانە بێهەستن‌و قازانج‌و زیانیان پێ دەستەبەر نابێ، بەڵام ئێمە پێشینانی خۆمان بینیوە عیبادەتیان بۆ کردون ئێمەش بۆیان دەکەین!

بەراستی وەڵامێکی خەجاڵەت ئامێزە، بەڵام ئەو پەیکەر پەرستانە شەرمیان نەکردو وتیان، وەکوو چۆن قورەیشییەکانیش بێشەرمانە هەمان هەڵسوکەوتیان نواندو پاساوی بتپەرستیەکەیان بەوە دێنایەوە: کە باوكو باپیرانیان کردویانەو ئەوانیش شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرتووە.

ئەمە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە لاسایی کردنەوە لەعەقیدەو بیرو باوەڕدا کارێکی ناپەسندەو پێویستە عەقیدەو باوەڕ پشت بەبەڵگەی عەقڵی‌و نەقڵی ببەستی‌و ئیمان لەسەر بنچ و بناغەی پتەو دابمەزرێ.

جا لەبەرامبەر ئەو مێشك وشکییەی موشریکەکان حەزرەتی ئیبراهیم‌ﷺ وێڕای بارقوڵی‌و پشوودرێژی کەموێنەی، ناچاربوو هێرشی توندیان بکاتە سەرو دوژمنایەتی خۆی دژیان رابگەیەنێ، بەتوندی رەخنە لەو بیروباوەڕە فاسیدە بگرێ: کە رێگادەدا عیبادەت بۆ ئەو جۆرە پەیکەرانە بکرێ، ﴿قَالَ أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ﴾ وتی: هەواڵم بدەنی‌و پێم بڵێن: ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن‌و بەخودایان دەزانن ﴿أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ الْأَقْدَمُونَ﴾ ئێوەو باوكو باپیرانی پێشینەتان، هەر لەکۆنەوە هەتا ئەمڕۆ ئایا ئەو عیبادەتکردنەی ئێوەو پێشینەکانتان چ سودێکی هەبووە؟ لەجێی خۆیدابووە؟

دەی ئەگەر ئەم پەیکەرانە کاریگەریەکیان هەیە، با من تووشی زیان بکەن! خراپەم پێبگەیەنن، چونکە ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلَّا رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەوانە دوژمنی منن، عیبادەتیان بۆ ناکەم، بەخودایان نازانم، هیچ گرنگێکیان پێنادەم ؛ بەڵام ﴿رَبَّ

﴿الْعَالَمِينَ﴾ کە خودایەکی حەق‌و راستەو بەدیهێنەرو رزق‌و رۆزی دەرمە، لە دونیاو لەقیامەت وەلی‌و سەرپەرشتیارمە، ئەمن هەر سەری بەندایەتی بۆ ئەو نەوی دەکەم، عیبادەت‌و پەرستشی خۆم هەر ئاراستەی زاتی پاکی ئەو دەکەم‌و کەسی تر بەخودا نازانم، کەوابوو عیبادەت کردنم بۆ ئەو بتانە عیبادەتکردنی دوژمنە، بۆیە خۆمی لێ دەپارێزم‌و عیبادەتی کەسێك دەکەم خێرو فەڕ هەمووی بەدەست ئەوە.

ئا بەوشێوە حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ لەپێناوی عەقیدەو بیرو باوەڕدا دەستبەرداری خزم‌و خوێشی بوو ، جاری جودابوونەوەو دوژمنایەتی خۆی بۆ خۆیان‌و خودا درۆزنەکانیان راگەیاند، ئەو زاتە پیرۆزە (قدوة حسنة)یە بۆ موسوڵمانان تا رۆژی قیامەت، بۆیە دەبێ بڕواداران بزانن کە لەعەقیدەدا موجامەلەو موساوەمە نیە، هیچ شتێك لەبەرامبەر عەقیدەدا کێشی نیە، نابێ بۆ خزم‌و باوك‌و گەل‌و نیشتیمان دەستبەرداری بیرو باوەڕبین، دەبێ لەپێناو عەقیدەدا دەستبەرداری هەموو شتێك بین، پەیوەندی پەیوەندی بیروباوەڕە، شتەکانی تر دوا عەقیدەن، عەقیدە بناغەیەو شتەکانی تر لەسەر ئەو دادەمەزرێن!

حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بۆیە (رب العالمین)ی چەرت کرد چونکە لەوانەیە برێك لەباوك‌و باپیرە پێشینەکانیان خودایان پەرست بێ، یان لەتەك خودادا شتی تریان پەرست بێ، کەوابوو ئەم چەرتکردنە بۆ ئیحتیاط پێویست بوو، چونکە باسەکە باسی عەقیدەیەو حەسساسە!

ئەم هەڵوێستە مەبدەئیە هەڵوێستی خاوەن باوەڕانی راستەقینەیە، هەڵوێستی ئەوانەیە: کە پشت بەخودا دەبەستن‌و ج باکیان لە غەیری خودا نیە، دڵیان لەراستی هەڵوێستی خۆیانەو موجامەلەو موساوەمە بەهیچ شێوەیەك ناکەن!

ئەوەتا حەزرەتی نوح ﷺ بەرامبەر کۆمەڵی کافرو موشریکەکان دەفەرموێ: ﴿فَأَجْمِعُواْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءكُمْ ثُمَّ لاَ يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ اقْضُواْ إِلَيَّ وَلاَ تُنظِرُونِ﴾ (یونس /٧١).

حەزرەتی هودیش بەرامبەر کافرەکان فەرموی: ﴿إِنِّي أُشْهِدُ اللّهِ وَاشْهَدُواْ أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ، مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعاً ثُمَّ لاَ تُنظِرُونِ، إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم .....الآية﴾ (هود/٥٤-٥٥-٥٦).

**ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ دەست دەکا بە بەیانکردنی وەصفی پەروەردگار، پێنج صیفەتی بۆ بەیان دەکا :**

١- ﴿ الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ﴾ (رب العالمين) خودایەکی ئەوتۆیە منی لەنەبووەوە بەدیهێناوە، هەروەکوو چۆن هەموو مەخلوقات ئەو بەدیهێناون ، هەر ئەو هیدایەتم دەدا بۆ بەختەوەریی دونیاو قیامەت، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى، وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾ (الأعلى/٢-٣). هەموو شتێك بەپێی نەخشەو پلانی پەروەردگار دێو دەڕوا، ئەو بەدی هێناوەو ئەو بەڕێوەی دەباو هیدایەتی دەدا، کەوابوو بە بەدیهێنانو هیدایەت هەموو سودێك دەستەبەر دەبێ بۆ ئەوانەی بیانەوێ سوودمەندبن.

حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ ئەوە رادەگەیەنێ: کە بەندەیەکی ملکەچی فەرمانبەردارەو ئەوە دەچەسپێنیو دەفەرموێ: خودا دەزانێ منی لەچی دروست کردوەو لەچی هێناومی من بۆ خۆم نازانم ، ئەو دەزانێ ماهیەتو پێکهاتەی من چییەو چی نیە، زانایە بەهەستو شعورم، بەحاڵو سەرەنجامم، ئەو هیدایەتم دەدا بۆ ئەو رێبازەی دەیگرمەبەر، بۆ ئەو پەیڕەوو پرۆگرامەی پابەندی دەبم، من بەتەواوی خۆم تەسلیمی خودای خۆم کردوە.

٢- ﴿ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ﴾ پەروەردگار ئەو خودایەیە: کە رزقو رۆزیم دەدا، هۆکاری بژێوم دابین دەکا، باران دەبارێنێ زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە، درەختو روەك وەبەر دێنێ، رزقی بەندەکانی دابین دەکا، خواردنو خواردنەوەی بۆ گیانلەبەران فەراهەم هێناوەو پێداویستی بۆ دابین کردوون.

٣- ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ هەرکاتێ توشی نەخۆشییەك بووم هەر ئەو شیفابەخشە، حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ پێغەمبەرەو دەزانێ نەخۆشی‌و هەموو کارێك بەویست‌و ئیرادەی خودا دێتەجێ، بەڵام پەیدابوونی نەخۆشیەکە وەپاڵ خودانادا، چونکە لێرەدا مەقامەکە مەقامی رانواندنی نیعمەتەکانەو لەبەر ئەدەب‌و شەرم نەخۆشیەکە پاڵ خۆی دەدا شیفاکە پاڵ خودا.

هەروەکوو چۆن لەزۆر شوێنی تری قورئاندا شتی شەڕو خراپ پاڵ غەیری خودا دراوە بۆ نموونە ﴿وما أنسانيه الا الشيطان﴾ لەبیرچونەوەکە پاڵ شەیتان دراوە یان لەئایەتی ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَداً﴾ (الجن/١٠) ئەوەتا (شر) پاڵ غەیر مەعلوم دراوە بەڵام (رشد) پاڵ خودا دراوە، لێرشدا حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ نەخۆشیەکەی پاڵ خۆی داوە.

٤- ﴿ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ﴾ پەروەردگار خودایەکی ئەوتۆیە لەژیانی دونیادا دەمرێنی‌و پاشان لە قیامەتدا زیندوم دەکاتەوە، کەسی تر توانای ئەوەی نیە.

٥- ﴿ وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە، بەتەمام رۆژی قیامەت تاوانەکانم داپۆشی‌و لێم خۆش ببێ، چونکە کەسی تر دارای ئەوەی نیە لەدونیاو لەقیامەتدا لەتاوان خۆش ببێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ ؟﴾ (آل عمران/١٣٥).

وشەی ﴿أَطْمَعُ﴾ی بەکارهێنا، وتی: بەتەمام‌و رەجام وەهایە خودا لێم خۆش بێ. تا ئاماژەبێ بەئەوە کەهیچ شتێك لەسەر خودا واجب نیە، پاداشدانەوەو هەڵگرتنی عەزاب‌و لێخۆشبونی تاوان فەزڵ‌و بەخششی خودایەو بەمەحضی خودایەتی خۆی ئەنجامی دەدا.

ئەمە نیشانەی بەندەی بەخۆچاراوو موخلیص و راستاڵە، ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیمی پێغەمبەرو خەلیل، وێڕای ئەو خۆتەسلیم کردنو بەندایەتی کردنەی بۆ خوداو هەست کردنی بەو نزیکیەی لەزاتی کردگار، کەچی ترسی ئەوەی هەیە تاوانی هەبن، پشت بەتاعەتو خوداپەرستی خۆی نابەستێ، کردەوە باشەکانی خۆی بەلاوە بێبایەخن لەئاستی نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی خودا، بۆیە لەناخەوە بەتەمای رەحمەتو فەزڵی خودایەو ئەو ئاسۆیە بەفریادرەسی خۆی دەزانی وێڕای لێبڕان بۆ خوداپەرستیو بەندایەتیکردن بەم هیوا گەشەوە بەرەو ژیانی جاویدانی هەنگاو دەنێ!!

بەڕاستی ئەمە هەستکردنە بەتەقواو لەخودا ترسان، هەستکردنە بەئەدەبو حیشمەت، هەستکردنە بەنرخو بەهاو نیعمەتە جۆراو جۆرە زۆرەکانی خودا کە لەژمارە نایەن، نرخاندنی کردەوەی ئادەمیزادە کە لەبەرامبەر نیعمەتی خودا: کە زۆر کەمو بێنمودن.

سەعدی شیرازی دەڵێ: هەموو هەناسەدانێك دوو نیعمەتە، یەکەمیان: درێژەپێدەری ژیانەوەو ئەوی تریان: راحەتی جانە، دەی ئادەمیزاد ئەگەر بەدرێژایی ژیانی خەریکی سوپاسو حەمدی خودابێ پاساوی هەناسە دانەکەی ناداتەوە!!

## ٢- دوعاو پاڕانەوەی بەسۆزی ئیبراهیم عليه السلام

﴿ رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ (٨٤) وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ (٨٦) وَلَا تُخْزِنِي

﴿يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾

دوای ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بەوشێوە دڵسۆزیە سوپاسی پەروەردگاری کردو نیعمەتەکانی ڕانواندن. ئەمجار دوعاو پاڕانەوەیەکی بەسۆزو دڵسۆزانە ئاڕاستەی خودا دەکاو دەفەرموێ:

﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْماً﴾ خودایە! حیکمەتو خاص ناسییەکی وەهام بدەرێ چاكو خراپ لێك جیابکەمەوە، حەقو بەتاڵ لێك هەڵاوێرم بۆئەوەی لەسەر ڕێبازی حەقو ڕاست بەردەوام بم تادەگەمە ئاکام.

﴿وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ خودایە! تۆفیقم بدە بۆ بەندایەتیکردنی خۆت، بۆ ئەوە بچمە پێڕو ڕیزی صاڵحانەوە، لەکۆمەڵی ئەوان کە دوورن لەتاوانی گەورەو بچوك، خودایە لەدونیاو لەقیامەت صاڵحم بکە.

پێغەمبەری ئیسلامیش لەکاتی سەرەمەرگا سێجار فەرموی: (اللهمّ في الرفيق الأعلى). لەکاتی دوعاکردنو پاڕانەوەشدا دەیفەرموو: (اللهم أحينا مسلمين، وأمتنا مسلمين، و ألحقنا بالصالحين، غير خزاياو لامبدلين). بێگومان پەروەردگار دوعاکەی حەزرەتی ئیبراهیمی وەرگرت وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (العنكبوت/٢٧).

﴿وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ﴾ خودایە تۆفیقم بدە کاری چاك بەئەنجام بگەیەنمو بمکەرە ڕەچەشکێنی کاری باشو خەڵك شوێنم بکەوێ دوای خۆم بەباش ناوم بهێنن، حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ دوعای ئەوەی کرد لەعەقیدەو بیرو باوەڕدا وەجاخ کوێر نەبێ، دوا خۆی کەسانێك هەبن شوێن ئەو بکەونو بەڕێبازی ئەودا

برۆن، خودا زمانی شیرین‌و پاراویان بداتێ بانگەوازی ئادەمیزادان بکەن بۆ ڕێبازی حەق‌و ڕاست.

وێدەچێ حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ هەمان دوعای کردبێ کاتێک لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕی دا دیواری کەعبەیان بەرزدەکردەوە؛ کە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ، رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ (البقرة/١٢٨-١٢٩).

پەروەردگار دوعاکەی ئیبراهیمی گیراکردو ئاواتەکانی هێنانەدی دەفەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ، سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ (الصافات/١٠٨-١١٠) یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (العنكبوت/٢٧).

هەندێ لەدوعاو ئاواتەکانی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ دوای هەزاران ساڵ گیرابوون، ئەمەش لەلای ئادەمیزاد ماوەیەکی زۆر دوورو درێژە، وەلێ لای پەروەردگار کاتێکی دیاری کراوە بۆ تێدا هاتنەجێی گیرابوونی دوعاو هاتنەدی ئاواتەکان!

﴿وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ﴾ خودایە! بمخەرە پێری ئەوانەوە: کە دەبنە میراتگری بەهەشت‌و لەناو نازو نیعمەتەکانی دا ژیان بەسەر دەبەن. لەوەپێش دوعای کرد خودا بیخاتە گەڵ پێری پیاوچاکان بەوە تۆفیقی بدا کردەوەی چاک ئەنجام بدا، بەهەشتیش بەمیرات دەدرێ بەپیاوچاکان.

ئەمجار دوعا بۆ باوکی دەکا، هەرچەندە باوکی‌و گەلەکەی قسەی ناخۆشیان پێ‌گوتن‌و بەربەرەکانێیان کرد، بەڵام لەوەپێش وادەی پێدابوو: کە دوعای بۆبکاو وادەی خۆی بردەسەرو فەرموی: ﴿وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنْ الضَّالِّينَ﴾ خودایە! لەتاوانی باوکم خۆش ببەو هیدایەتی بدە بۆ ئیمان هێنان، چونکە ئەو گومڕایەو

سـەری لێتێکـچووە، هەڵبەتــە وەکـوو ئاماژەمــان پــێکرد دوعــاکردنی حــەزرەتی ئیـبراهیم﷣ بـۆ بـاوکی پـێش ئـەوەبوو، دڵنیـابێ، کـە ئیمـان ناهێنـێو دوژمنـی خودایە، هەروا چونکە وەعـدی پـێ دابـوو، کـە دوعـای بـۆ بکا، وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلاَّ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَـرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لأَوَّاهٌ حَلِـيمٌ﴾ (التوبـة/١١٤) جا کـە بـۆی دەرکـەوت بـاوکی دوژمنـی خودایە، لێی تەبەڕڕا بوو، زانی: کە خزمایەتی خزمایەتی رەگەز نیـەو هۆزایـەتیو کەسایەتی: کە عەقیدە پێکیانەوە نەبەستێتەوە چ بایەخێکی نادرێتێ! دۆستایەتیو خزمایەتی دەبێ لەسەر بناغەی بیرو باوەڕ دابمەزرێ!

ئـەمجار داوا دەکـا: لەقیامەتـدا بەشـێوەیەکی گـشتی خـودا چاوپۆشـی لێبکـاو دەفـەرموێ: ﴿وَلا تُخْزِنِـي يَـوْمَ يُبْعَثُـونَ﴾ خودایـە رۆژی قیامـەت ریـسوام نەکـەی، لـەورۆژەدا مـەخلوقات زیندودەکەیتـەوە، لەسەرزەنـشتو لۆمـەی خـۆت بمپـارێزەو لەکەمو کوڕیەکانم ببورە، تاوانەکانم داپۆشەو ریسوام مەکە!

لەم دوعاو پاڕانەوەی ئیبراهیمەوە دەردەکەوێ: کە ئەو زاتە چەند ترسو بیمی رۆژی قیامەتی هـەبوە، چـەند شـەرمی لـەخودا کـردوەو چـەند ترسـاوە لـەوەی لـەو رۆژەدا لەبەردەم خودادا ریسوا ببێ!

بەتایبـەتی: کـە حەقیقـەتی ئـەو رۆژە دیـاری دەکـا، هیـەمـە راسـتیەکان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ لا يَنفَعُ مَالٌ وَلا بَنُونَ، إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَـلِيمٍ﴾ ئـەو رۆژەی: کە ماڵو منداڵ هیچ سودێکیان بۆ ئادەمیزاد نابێو چ کەڵکیان لێوەرناگیرێ، لەفەرزی مەحاڵ دا ئەگەر پڕبەزەوی زێڕو زیو بـە فیدیـە بـدات تۆزقاڵێـك عـەزابی خودای لێکەم نابێـتەوە، مــاڵو خێزانی ناتوانن یارمەتی بدەنو عەزابی لێ ســووك بکەن!

لەو ڕۆژەدا ئەوەی سودبەخش بێ تەنیا ئیمان بە خوداو کردەوەی چاکە فریای ئادەمیزاد دەکەون، دڵسۆزی لەئایینداو، دوورکەوتنەوە لە موشریکو بتپەرستان جودا بوونەوە لێیان سودی هەیە بۆ ئەو ڕۆژە.

مەبەست بە ﴿قلب سليم﴾ دڵێکە باوەڕی پڕوپوچی تێدا نەبێ، مەیلی تاوانو سەرپێچی کردنی تێدا نەبێ، پێش هەموو شتێك نەخۆشی کوفرو نیفاقی تێدا نەبێ.

سەعیدی کوڕی (المسیب) فەرمویەتی: (قلب سلیم) دڵی موسوڵمانە، چونکە دڵی کافر نەخۆشە، نەخۆشی کوفرو شیرکو نیفاقی تێدایە.

## وەصفو دیاردەی ڕۆژی قیامەتو ثەوابو سزای کافرەکانو ژێوان بوونەوەی بتپەرستەکان

﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ

﴿أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾﴾

پاش ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام بەوشێوە ئیخلاص و پڕسۆزەوە لەخودا پاڕایەوە، کۆتایی پاڕانەوەکەی بەوە هێنا: کە ڕۆژی قیامەت ڕیسوای نەکا، ئەمجار دیمەنێك لەدیمەنەکانی ڕۆژی قیامەت ڕادەنوێنێ، وێنەی ئەو ڕۆژەی ئیبراهیم لێی دەترسێ بەشێوەیەکی سامناك دەخاتە بەرچاو، هەردەڵێی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام ئامادەی ئەو ڕۆژەیەو چاوی لەدیمەنەکانیەتی و هانا بۆ پەروەردگار دەباو بەو نزاو پاڕانەوە پڕسۆزە ڕودەکاتە بارەگای خودا، بۆ ئەوەی لەو عەزاب و سزایە دووربێ!

﴿وَأُزْلِفَتْ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە بەهەشت بۆ خوداپەرستان نزیك دەکرێتەوە، سەیری دەکەن و پەلە دەکەن لەچوونە ناوی، دەرگایان بۆ دەکرێتەوە دەچنە ژوورەوەو بەمراز دەگەن!

﴿وَبُرِّزَتْ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە دۆزەخ دەردەخرێ بۆ گومڕایان بەجۆرێك بەئاشکرا چاویان پێی دەکەوێ و دەزانن ئەوە شوێن و جێگایانە، لەنزیکیەوە ڕادەگیرێن و گوێیان لەلۆمەو سەرزەنشت و تەقریعە، ئەمەش بۆ ئەوەی زووتر غەم و نارەحەتی دایانگرێ و سزای گومڕایی و ستەمکاریی دونیایان چاو پێ بکەوێ.

ئەمجار پێش ئەوەی فڕێ بدرێنە ناو دۆزەخەوە بۆ زێدە سزادان و ڕیسواکردن پرسیاری لۆمە ئامێزیان لێدەکرێ، ﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ، مِنْ دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنْصُرُونَكُمْ أَوْ يَنْتَصِرُونَ ؟﴾ پێیان دەگوترێ: لەکوێن ئەو خودایانەتان: کە پەرستشتان بۆ دەکردن و پێتان وابوو فریاتان دەکەون و عەزابتان لێ دووردەخەنەوە؟ ئایا بەهانای خۆیانەوە دێن تا فریای ئێوە بکەون؟! باش بزانن و

دڵنیابن، نەدەتوانن ئێوە رزگاربکەن نە فریای خۆیان دەکەون. ئێوەو خودا درۆزنەکانتان سوتەمەنی دۆزەخنو دەخرێنە ناوی.

هەڵبەتە هیچ وەلامێکیان نیەو چاوەڕوانی وەلامیشیان لێناکرێ، خۆ ئەگەر وەلامیش بدەنەوە هیچیان بەدەستەوە نیە، کەوابوو پرسیارەکە بۆ سەرزەنشتو لۆمە کردنە، بۆ سەرکوتانەوەو چاوشۆڕکردنە!!

ئیتر ﴿فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ، وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ﴾ بەرەو دەم توڕدرانە ناو دۆزەخەوە، خودا درۆزنەکانیانو بتپەرستەکان، ستەمکارو سەرانی کوفرو شوێنکەوتوانیان، تێکڕاو بەکۆمەڵ هەڵدەدرێنە ناو دۆزەخەوەو بەسەریەك دا دەترشێن، هەروەکوو چۆن لەگەڵ ئەوان دا شوێنکەوتوانی شەیتان لەیاخی بووانی ئادەمیزادو جندۆکە فڕێ دەدرێنە ناوی.

پێشخستنی خودا درۆزنەکان بۆ توڕدانە ناو دۆزەخ بۆ ئەوەیە: کە پەرستشکارەکانیان بەچاوی خۆیان بێبایەخی خودا درۆزنەکانیان زیاتر بۆ دەربکەوێو لەرزگاربوون ناهومێد ببن. هەموو ئەوانەی سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەنو دەخرێنە ناو دۆزەخەوە سەربازی شەیتانن. کەوابوو باسکردنی (جنود ابلیس) ذیکری عامە دوای خاص.

﴿قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ، تَاللَّهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ، إِذْ نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ تاقمی گومڕاو بەدبەخت - لەو حاڵەتەدا: کە زۆر خەفەتبارو رق هەڵساونو کێشەو جیدال لەنێوان ئەوانو گومڕاکەران دا گەیشتۆتە چڵە پۆپەو لەگەڵ خودا درۆزنەکانیانو شەیاتینییەکاندا دەمیان تێك ژەنیوە - دەڵێن: سوێند بەخودا ئێمە لەزەلکاوی گومڕاییدا بووین: کە ئێوەمان دەکردە هاوشانی خودا لەگەڵ خودادا یەکسان سەیرمان دەکردنو وەکوو خودا عیبادەتمان بۆ ئەنجام دەدان، پێمان وابوو شیاوی پەرستش بۆکردنن! بەراستی ئێمە سەرلێشێواوو

گومڕابووین. لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ﴾ (ص/٦٤). ئێستا دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێن، بەڵام چ سوود!

ئەمجار تاوانی گومڕایی خۆیان دەخەنە سەر گومڕاکەران و دەڵێن: ﴿وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ﴾ لەراستیدا کەس ئێمەی گومڕا نەکردووە جگە لەتاوانبارانی شەیاتینی و سەرانی ملهوڕو تاغوت و ریش سپی و پیاو ماقوڵەکانمان. ئەوان ئێمەیان گەیاندە ئەم رۆژە رەشە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا﴾ (الأحزاب/٦٧).

ئاوا بەوجۆرە تاوانەکەیان دەخەنە ملی موجریمینەکان و دەڵێن: سوچی ئەوان بووە... پاشان وەئاگا دێنەوەو دەزانن: کەکار لەکارترازاوە، ئیعلانی ماڵ وێرانی خۆیان دەکەن و دەڵێن: ﴿فَمَا لَنَا مِنْ شَافِعِينَ، وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾ ئەمڕۆ ئێمە هیچ تکا کارێکمان نیە قسەیەکی خێرمان بۆ بکا، دۆستێکی دڵسۆزمان نیە فریامان بکەوێ و تۆزێك عەزابمان لەسەر سوك بکا، ئەوانەی لەدونیادا پێمان وابوو: دەبنە شەفاعەتکارمان لای خوداو عەزابمان لێ دووردەخەنەوە درۆو دەلەسە بوون، نەخوداکانمان شەفاعەتمان بۆ دەکەن و نەدۆستێکمان هەیە سودێکمان پێ بگەیەنێ.

دەی ئەگەر شەفاعەتکارمان نەبن و دۆستێکمان نەبێ سودێکمان پێبگەیەنێ، دەبێ نەمان گێڕنەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی هەڵەکانمان راست بکەینەوە، کارێك بکەین خۆمان لەم سزا سامناکە بپارێزین.؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُواْ لَنَا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾ (الأعراف/٥٣).

دەڵێن: ﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ خۆزگە گەڕانەوەمان بۆ دونیا بۆ دەستەبەر دەبوو، ئیتر ئەوکاتە ئیمانمان بە خودا دەهێناو یەکتا پەرستیمان دەکردو هیچ شتێکمان نەدەکردە هاوەڵ و هاوشانی خودا، بڕوامان بە پێغەمبەرەکانی

دەکردو کردەوەی باشمان ئەنجام دەدا، توخن ئەوکارو کردەوانەمان نەدەکەوتین : کە لەوەوپێش ئەنجاممان داون.

بەڵام ئەوە ئاواتێکەو نایەتەدی، نەگەڕانەوەیان هەیەو نەشەفاعەتکار، ئەوەی دەشیلێن درۆو موراوەغەیە، ئەگەر لەفەرزێکدا بگەڕێندرێنەوە بۆ جیهانو وەزعو حاڵی دونیایان بۆ دروست بێتەوە، دەست دەکەنەوە بەسەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خودا، وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ (الأنعام/٢٨).

ئەمەش دڵدانەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ ئەوەی غەمو نارەحەتی بەدرۆخستنەوەی لەلایەن قورەیشییەکانەوە لەسەر سوك ببێو ئەوەندە دڵتەنگ نەبێ بەسەرپێچی گەلەکەیو رو وەرگێڕان لە بانگەوازییەکەی. تەنانەت لە جیهاندا لەو کاتەدا کە دەکەونە ناو تەنگانەو ناخۆشییەوە، ئامادەباشی خۆیان دەردەبڕن بۆ ئیمان هێنان هەر لەگەڵ لەتەنگانەکە رزگاریان بوو خێرا پاشگەز دەبنەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (المؤمنون/٧٥).

ئەمجار لەکۆتایی چیرۆکەکەدا تەعقیبە باوەکە دەهێنێو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەم لایەنەی چیرۆکی ئیبراهیم دا کە لەگەڵ قەومەکەی دا کەوتە هێنانەوەی بەڵگەو دەلیل لەسەر تاكو تەنهایی خوداو هیچ و پوچی بتەکانیانو بەبەڵگە بۆڕی دان، پەندو ئامۆژگاری هەن بەڵگەی ئاشکراو نمایان هەن لەسەرئەوە: کە هیچ خودا نین جگە لە(الله) هەرئەوو خودایەو هەرئەو شیاوی بەندایەتی بۆ کردنە. وەلێ وێڕای هەبوونی ئەم هەموو بەڵگەو دەلیلانە زۆربەی زۆری گەلی ئیبراهیم ئیمانیان بە خوداو پێغەمبەری خودا نەهێنا!!

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! کە تۆی کردوە بە پێغەمبەرو رەوانەی کردوی بۆ سەر ئادەمیزادو بەپیر بانگەوازییەکەتەوە نایەن، بەتواناو دەسەلاتە، دەتوانێ تۆڵەی سەرپێچییان لێبستێنێ، خاوەن رەحمو بەزەیییە: کە مۆڵەتیان دەداو زوو لەناویان نابا بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو ئیمان بێنن، هەروەها خاوەن رەحمو بەزەیییە بۆ موسوڵمانان‌و کۆمەکیان پێدەکاو بەسەر دوژمنانیان دا زاڵیان دەکا، لەقیامەتیش دا لەبەهەشتی جوان‌و رازاوەدا بەمرازی خۆیانیان دەگەیەنێ!

## چیرۆکی سێیەمی ئەم سورەتە: چیرۆکی حەزرەتی نووحه عليه السلام لەگەڵ گەلەکەی دا

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿١١٥﴾ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ

مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾

وەکوو زانیمان لەوەپێش لە چیرۆکی حەزرەتی موساوە گەڕاپەوە بۆ رۆژگارێکی دێرینترو لەوەپێشتر. ئێستاش بەهەمان شێوە لە چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمەوە پێدا هەڵدەکشێتەوە بۆ رۆژگارێکی پێشترو چیرۆکی دووەم بابەگەورەی ئادەمیزاد؛ حەزرەتی نووح عليه السلام رادەنوێنی، چونکە لێرەدا هێڵە مێژوویيەکە گرنگ نیەو زنجیرە مێژوویيەکە مەبەست نیە، بەڵکوو مەبەست پەند وەرگرتنە لەسەرەنجامی شیرك‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران.

چیرۆکی حەزرەتی نووح عليه السلام وەکوو چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام و موسا عليه السلام چەند جار لەقورئاندا دووبارە بۆتەوە ، هەرجارە بەئوسلوبێك رانوێندراوەو بۆ مەبەستێك هێنراوە.

حەزرەتی نووح یەکەم پێغەمبەرە: کە پەروەردگار ناردویەتی بۆ سەر دانیشتوانی سەر زەوی دوای ئەوەی بتپەرستیان تێدا پەیدابوو. هاتە ناویان‌و جڵەوگیریی لێ کردن لە هاوەڵدانان بۆ خوداو بتپەرستی، لەسەرەنجام‌و لەئاکامی بتپەرستی ترساندنی، نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناویاندا مایەوەو بانگەوازی کردن، بەشەوو بەرۆژ بەئاشکراو بە چپە لەگەڵیان خەریك بوو، بانگەوازییان بەگوێ دا

نەچوو، بڕوایان پێنەکردو بەدرۆیان خستەوە، کۆمەڵێکی کەم نەبێ کەس شوێنی نەکەوت، جاکە لێیان نائومێدبوو دوعای لەناوبردنی لێکردنو خودا بەتۆفان خنکاندنی.

دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ، إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلا تَتَّقُونَ ؟﴾ گەلی نووح پێغەمبەرانیان بەدرۆخستنەوە واتە: پەیامی نووحیان ڕەتکردەوەو ئیمانیان پێنەهێنا، کاتێك نووحی هاوڕەگەزو هاوڵاتیو هاوعەشرەتو خزمیان پێی گوتن: ئەوە بۆ لەخودا ناترسنو چۆن بەندایەتی بۆ ئەم پەیکەرانە دەکەن؟ ئایا ترسی سزای سەختی خوداتان نیە؟

هەڵبەتە گەلی نووح تەنها حەزرەتی نووحیان بە درۆخستۆتەوەو هەرئەو بانگەوازی کردون، کەچی قورئان دەفەرموێ: پێغەمبەرانیان بەدرۆخستونەوە، چونکە ریسالەی پێغەمبەران لەبنەمادا یەك ریسالەیەو هەموو پێغەمبەرێك بانگەوازی کردوە بۆ یەکتاپەرستیو بەندایەتی کردنی دڵسۆزانە بۆ پەروەردگارو بڕواکردن بە پێغەمبەرایەتیو هاتنی ڕۆژی قیامەت. جا کەسێك ئەگەر پەیامی پێغەمبەرێك ڕەت بکاتەوە وەکوو ئەوەوایە پەیامی هەموو پێغەمبەرانی ڕەت کردبێتەوە.

بەدرێژایی مێژوو بانگەوازی پێغەمبەران بۆ یەکتاپەرستی بووە، بۆ گێڕانەوەی ئادەمیزاد بووە لەبتپەرستیو هاوەڵدانان بۆ خودا بۆ چەسپاندنی ڕاستی پێغەمبەرایەتی بووە، بۆ بڕواکردن بەهاتنی ڕۆژی قیامەت بووە، هەموو پێغەمبەرێك ئەم بنەمایانەیان دوبارە کردونەوەو بەئوسلوبی خۆیان بانگەوازییان بۆ کردون، ئەم سێ شتە سەرەکییانە کوللیاتی بیرو باوەڕی ئیسلامینو هەموو پەیامێکی پێغەمبەران ئەم بنەمایانەیان لەخۆگرتوون.

ئیتر لەم ڕووەوە کۆمەڵگای ئادەمیزاد دابەش دەکرێ بۆ لای دوبەش: کۆمەڵگای موسوڵمانو کۆمەڵگای کوفر، کەوابوو بەدیدی موسوڵمانان گەلو نەتەوە خوداپەرستەکان لەهەر ڕەگەزو توخمێك بووبن، لەهەر چەرخو ڕۆژگارێك دا

بـووبن ، بەئوممـەتی ئیـسلام حـسێب دەکـرێن، ئـەوەی وانـەبوو لـەپێڕی کافرانـەو لەسـەنگەری بەرامبەردایـە، بۆیـە موسـوڵمانان بڕوایـان بـە هـەموو پێغەمبـەرێك هەیەو ڕێزی هەموان دەگـرن چـونکە هـەمویان تێکـڕا هـەڵگری پـەیامێکن ئـەویش پەیامی یەکتاپەرستییە. مرۆڤایـەتی لەدیـدی موسـوڵماندا دوبەشـە؛ ئـەهلی حـەق‌و ئـەهلی بـەتاڵ، لەهـەموو کـات‌و شـوێنێك دا موسـوڵمان لەگـەڵ ئـەهلی حەقـە دژی ئەهلی بەتاڵە، ئەمە بەرنامەیەتی‌و بەوشێوە هەڵس‌وکەوت دەکا!

**حەزرەتی نووح کە پەیامی خۆی بەگوێی گەلەکەی دا دا لەسەرەنجامی بتپەرستی ترساندنی، دوو صیفەتی خۆی بۆ گەلەکەی ڕونکردەوە:**

١- پێیـانی فـەرموو: ﴿إِنِّـي لَكُـمْ رَسُـولٌ أَمِـينٌ﴾ ئـەمن بـۆ ئێـوە پێغەمبـەرێکی ئەمیندارم، خیانـەتتان پێناکـەم، دڵسۆزم بۆتـان، چیم پێسـپێردراوە بـەبێ زێـدەو نوقصان پێتانی ڕادەگەیەنم‌و بۆتانی شی دەکەمەوە.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ لەعـەزابی سـەختی خـودا بترسـن، گـوێ بیـستی مـن بـن لەوەی فەرمانتان پێدەکەم لەخوداپەرستی‌و یەکتاپەرستی.

٢- ﴿ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەمن لەپاساوی ئـەم بانگەوازو ئامۆژگـاری کردنـەم دا، داوای کـرێ‌و پاداشـتتان لێناکـەم بمدەنـەوە. کاڵاو مەبەستی دونیاییم ناوێ، بۆ وەدەستهێنانی ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایەی دونیایی بانگـەوازیتان ناکـەم، پاداشـتی مـن لای خودایـە ئـەو ئـەرکی بانگـەوازی خـستۆتە ئەستۆم‌و هەرئەویش پاداشم دەداتەوە..

ڕاگەیاندنی ئەوە: کە لەپاساوی بانگەوازییەکەیدا مەبەستی کرێ‌و پاداشت نیـە لـەوان‌و جـەخت کردنـەوە لەسـەرئەوە: کـە هـیچ مەبەسـتێکی دونیـایی پێیـان نیـە کارێکی پێویستەو دەبێ بانگخوازانی ئیسلام هەموو کاتێ بەرچاوی خۆیانی بگـرن‌و لەناخـەوە پابەنـدبن پێیـەوە، بـۆ ئـەوەی بانگەوازییەکـەیان لـە بانگـەوازی کـاهین‌و دونیـا خـورانی بـەناو دینـەوە جیابکەنـەوە. بـەکردەوە بیـچەسپێـنن: کـە ئـەوان

پێچەوانەی ئەوانەن ئایین دەکەنە هۆکاری دونیا دەستەبەرکردنو روتاندنەوەی خەڵکی رەشو روت.

ماموستا مەلا کەریمی بیارە خودا پایەداری بکا لەکتێبی ئیقبالْ نامەدا دوای باسکردنی تاوانەگەورەکان دەفەرموێ:

**لەمانە خراپتر کاکی بەتەمکێن دونیا خواردنە بەبەهانەی دین**

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ خۆتان لەسزای سەختی خودا بپارێزن، شوێن پەیامی مـن بکەون، ئەوە بۆتـان دەرکـەوت: کـە مـن راسـت دەکـەم لەگەڵتانـدا دڵسۆزم پێغەمبـەری خـودام بـۆ سـەرئێوە، دەمـەوێ لەنەگبـەتیو چارەرەشـی هەتاهـەتایی رزگارتان بکەم.

دوجـار فـەرمان بـەخوداو فـەرمان بـەئیطـاعـەی دوبـارەکردەوە، بـۆ جەختکردنەوەو چەسپاندنی ئەو دوو فەرمانە لەدڵیاندا، چونکە تـەقواو طاعـەت بنەمای ئایینو دووروکنی سەرەکین، بەبێ ئەوان ئیمان وجودی نابێ.

ئیتر گەلی نووح لەبەرامبەر ئەم بەڵگەو بانگەوازیـەی حـەزرەتی نـووح دا هـیچ بەلگەیـەکیان بەدەسـتەوە نـەبوو، نەیانـدەزانی چـۆن بـەرەنگاری ببنـەوە، لـەئاکاما بەلگەیەکی لاوازیان دۆزیەوە. ﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ؟﴾ وتیـان: چـۆن دەبـێ ئێمـە ئیمـان بـەتۆ بێـنین لەحاڵێکـدا شـوێنکەوتوانت هەتیوەچەو خـوێڕیو پلەپایینن، چۆن دەبێ ئێمە ئیمان بەتۆ بهێـنین دابەزینـە پێـرو ریـزی ئـەو هـیچ و پووچانەوە، ئێمە پیاو ماقوڵو خانەدانو بنەماڵەی گەلەکەمانین، چۆن دەبێ بێینە ریزی ئەو هەژارو مسکێنو بێ دەسەلاتانەوە.

بەراسـتی ئەمـە شـوبهەیەکی بـێوەجو بەلگەیـەکی بـێ هێـزە هـەموو ملهوڕو طاغوتێکی نەتـەوەکانی رابوردو پـەنایان بـۆ بـردوە، هـەرکاتێ ویـستبێتیان ئیمـان نەهێنن ئەوەیان کردوە بەبیانوو: کە شوێن کەوتوانی پێغەمبەرەکە فەقیرو هەژارو بۆرە پیاوی نەتـەوەکەنو ئـەوان خۆیـان ناکـەن بـەهاوەڵو هاوشـانی ئـەوان؛ وەکوو

شتێکی باوو سروشتی هەرکاتێك پێغەمبەرێك بانگەوازی کردبێ ئەوانەی زوو بەپیر بانگەوازییەکەوە چوونو دەست پێشخەربوون بۆ ئیمان هێنان، بۆرە پیاوو رەشە خەڵك بوون، چونکە ئەوان ترسی لەدەستدانی کورسیو بەرژەوەندی دونیایان نەبووە، هەموو کاتێ چینی چەوساوەو رەشو ڕوت زووتر باوەشیان بۆ بانگەوازی تازە گرتۆتەوەو زوتر موسوڵمان بوون.

حەزرەتی نووح هیدایەت دەری مرۆڤایەتی بووە، ئایین جوداوازی ناخاتە نێوان دەوڵەمەندو هەژارەوە تەرازوو پێوەری ئایین خوداپەرستییە، نەك ماڵو سامانو شانو شەوکەت، بۆیە حەزرەتی نووح وەڵامێکی وای دانەوە: کە لەگەڵ مەنهەجی ئاییندا بگونجێو صەلاحییەتی پێغەمبەر دیاری بکا، وای وەڵام دانەوە: کە حیسابو کردەوەیان عاید بەخودایە!

﴿قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ؟﴾ حەزرەتی نووح وتی: من زانیاریم نیە دەربارەی ئەوانەو کارو پیشەکانیان نازانم چیەو چۆنە، لەبنەچەو کاروباری ناوخۆییان ناکۆڵمەوە، من سەیری رواڵەت دەکەمو ظاهیر بینم، هەرکەسێ بڕوام پێبکاو ئیمان بە پەیامەکەم بێنێ بەشوێنکەوتوی خۆمی دەزانم، نهێنی ناودڵیانو حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵیان عاید بەخودایەو پەیوەندی بەمنەوە نیە.

﴿إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ﴾ ئەگەر کردەوەیەکیان هەبێ، حیسابو لێکۆڵینەوە لەسەری لای پەروەردگارەو لەسەرمن نیە، خودا حیسابیان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشتیان دەداتەوە ئەمن تەنها راگەیاندنم لەسەرە، موژدەدەرو ترسێنەرم نەك حیسابکەرو سزادەرو پاداش دەرەوەبم! ئەگەر ئێوە هەستو شعورتان هەبێو تێبگەنو عەقڵی واعیتان هەبێ، بەڵام ئێوە پێوەری حەقو تەرازوی راستی نازانن چیە، پابەندی نەزانی خۆتانو بیروباوەڕی هەڵەی خۆتان پەیڕەو دەکەن!

مەبەست ئەوەیە شوبهەو گومانەکەیان پوچەڵ بکاتەوە، نارەزامەندی خۆی دەربڕێ بەرامبەر ئەوەی خوداپەرست بە پایینو پایە نزم لەقەڵەم بدەن هەرچەندە هەژارو بۆرە پیاویش بن ، چونکە بەگوێرەی پێوەری یەزدانی کێ

تەقوای زۆرتری بێ ئەوە ڕێزدارترە. کافرەکان کە گوتیان: چۆن دەبێ ئێمە ئیمان بەتۆ بێنین لەحاڵێك دا شوێنکەوتوانت چینی هەژارو ڕەشە خەڵكو بۆرە پیاون، بەضیمنی ئەوەیان مەبەست بوو: کە حەزرەتی نووح ئەوانە دەرکاو لەخۆیان دووربخاتەوە، ئەمجار ئەوان بیر لە ئیمان هێنان دەکەنەوە، ئیتر بەئاشکراو بێ ڕوپامایی ئەو داواکاریە ضیمنییەی ئەوانی ڕەتکردەوەو فەرموی:

﴿وَمَـا أَنَـا بِطَـارِدِ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ مـن هـەرگیز موسـوڵمانان لـەکۆڕو پێـڕی خـۆم دەرناکەم، چۆن دەبێ من ئەوانە لەخۆم دووربخەمەوە: کە ئیمانیـان بـە پەیامەکەم هێناوەو شوێنم کەوتوون؟ من هەرگیز شتیوا ناکەم!

﴿إِنْ أَنَـا إِلاَّ نَـذِيرٌ مُـبِينٌ﴾ مـن تـەنها ترسـێنەرێکی ئاشـکراو نمایـانم، هەرکەسـێ بەدرۆم بخاتەوە لەعەزابی سەختی دۆزەخ دەیترسێنم.

جـا کـە حـەزرەتی نـووح بەبەڵگـەی بـەهێز بـۆڕی دان‌و نـەیانتوانی چـیدی بەردەوام بن لـەحیوارو گفتوگۆدا، پـەنایان بـردە بـەر هەڕەشـەو بـەکارهێنانی هێـز ئائەمەش داب‌و نەریتی هەموو ملهوڕو طاغوتێکە لەگەڵ لەبواری حیوارو گفتوگۆدا تێکشکا، پەنا دەباتە بەر هەڕەشەو تۆقاندن.

﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنْ الْمَرْجُومِينَ﴾ وتیان: ئـەی نـووح ئەگـەر لـەم هەڵوێستەی خۆت دانەبەزیو واز لەم بانگەوازییەی خۆت نەهێنیو زیـاتر لەسـەری بڕۆیو بەردەوام بی لەسەر بانگەوازیکردنت بۆمان، ئـەوە بـاش بزانـە بـەردەبارانت دەکەین، بە بەردەبارانکردن دەتکوژین، ئیتر چیدی لێت قبوڵ ناکەین‌و چاوپۆشـیت لێناکرێ! ئالێرەدا حەزرەتی نووح هانای بۆ خودای تاك‌و تـەنیا بـردو دەسـتی نـزای بەرزکردەوە بۆ لای کەسی بێکەسان‌و پشت‌و پەنای خوداپەرستان.

﴿قَـالَ رَبِّ إِنَّ قَـوْمِي كَـذَّبُونِ﴾ وتـی خودایـە! ئـەوەتا گەلەکـەم بـەدرۆیان خستمەوەو بانگەوازییەکەی منیان ڕەتکردەوە، ئیمانیان پـێ نـەهێنام ﴿فَـافْتَحْ بَيْـنِي

وَبَيْنَهُمْ فَتْحاً﴾ لەنێوان منو ئەوان دا حوکمو بڕیاری عەدالەت ئامێز دەربکەو ئەهلی حەق بەسەر بەتاڵ دا سەربخە.

﴿وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِي مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ خۆمو ئەوانەی لەگەڵم دان لەخودا پەرستان، رزگارمان بکە لەدەستی ئەو ستەمکارانەو بەهیلاکیان بەرە، چیدی مۆڵەتیان مەدە!

﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾ بەهانای پێغەمبەری خۆمانەوە هاتین، ئەو پێغەمبەرەی هەڕەشەی بەردبارانکردنی لێکرا، لەسەر ئەوەی بانگەوازی خەڵکەکە دەکا بۆ خوداپەرستی، هیچ کرێو پاداشو سوپاسێکیشی لێناوێن، لەپاساوی بانگەوازییەکەیدا پلەو پایەی دونیایی مەبەست نیە، هانای بۆهێناینو لێمان پاڕایەوە ئێمەیش دوعاکەیمان گیرا کرد، خۆیو ئەوانی ئیمانیان پێهێنابوو لەکەشتییەکی پڕ لەگیانلەبەردا رزگارمان کردن.

﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ﴾ پاشان، واتە: دوای رزگارکردنی نووحو شوێنکەوتوانی، باقی ماندەی گەلەکەیمان خنکاند، ئەوانە زۆرینەی گەلی نووح بوونو سووربوون لەسەر کوفری خۆیانو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا ، ئێمەیش بەتۆفان لەناومان بردن.

لەهەندێ ریوایەتدا هاتووە، رزگاربوەکان هەشتا یان چل پیاوو چل ئافرەت بوون.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەرزگاربوونی نووح و شوێنکەوتوانی هەروا لەهەموو گیانلەبەرێك نێرو مێیەكو ئەمجار لەخنکاندنی کافرەکاندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەرکەسێك پێغەمبەری خودا بەدرۆ بخاتەوە یان باوەڕی پێبکا. ئەمە دابو نەریتی خودایە؛ هەمیشە پێغەمبەرانو شوێنکەوتوانی رزگارکردوە. ستەمکارو ملهوڕو بەدرۆ خەرەوەکانی قەلاچۆکردون. زۆرینەی زۆری ئەو گەلە ستەمکارە موسوڵمان نەبوون.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! بەهێزو بالآدەستە بەسەر هەموو شتێکدا تۆڵەستێنە لەوانەی سوورن لەسەر کوفرو پێغەمبەرانی بەدرۆ دەخەنەوەو سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن، خاوەنی رەحمو بەزەییە بۆ ئەوانەی بەندایەتی بۆ دەکەنو تۆبە لەتاوانی رابوردویان دەکەن، ئیمان بە پێغەمبەرەکەی دەهێنن!!

## چیرۆکی چوارەمی ئەم سورەتە: چیرۆکی حەزرەتی هودە ﷺ لەگەڵ گەلەکەیدا

﴿كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ

لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾

ئەمەش چیرۆکێکی ترە بۆ پەندو عیبرەت، چیرۆکی حەزرەتی هودە(عليه السلام): کە گەلەکەی بانگەوازی کرد بۆ یەکتاپەرستیو بەندایەتیکردن بۆ خودا، لەسزاو تۆڵەی سامناکی خودا ترساندنی!

گەلی هود زێدو نیشتمانیان وڵاتی ئەحقافی یەمەن بوو، وڵاتی ئەحقاف بریتی بوو لەچەند کێوو گردێکی لمبەلآن لەنزیك وڵاتی (حضرموت)ی یەمەن. لەدوای تۆفانو فەوتاندنی گەلی نووح هاتونە کۆڕی ژیانەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً﴾ (الأعراف/٦٩).

ئەم گەلە ستەمکارە دوای پاككردنەوەی زەوی لەستەمکارانی گەلی نوح بەتۆفان، هاتنە سەر مەسرەحی ژیانو خودا خێرو بێرێکی زۆری بەسەرداڕشتن، جەستەو لەشو لاریان ساغ و پتەوو چوارشانەو بەرزو بڵندو خاوەن هێزو توانا، هەرزانیو ئاوو هەوای سازگارو رزقو رۆزی زۆرو جۆگاو کانیاوی سازگارو گوارا، کەچی وێڕای ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی خودا پێی دابوون، بەندایەتی پەروەردگاریان نەدەکرد، سەرپێچی فەرمانو جڵەوگیریەکانی خودایان دەکرد، حەزرەتی هودیان بەدرۆخستەوەو خودا لەناوی بردن! چیرۆکی حەزرەتی هودو گەلەکەی لەسورەتی (الأعراف)و سورەتی(هود)و سورەتی (المؤمنون)و ئێرەدا هەرجارە بە ئوسلوبێك لەهەرشوێنە بۆ مەبەستێك رانوێندراوە.

لێرەدا وەکوو چیرۆکی حەزرەتی نووح دەست پێدەکاو دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی عاد پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە واتە: حەزرەتی هودیان بەدرۆخستەوە بەڵام چونکە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرێك بەدرۆخستنەوەی هەموو پێغەمبەرانە بۆیەوشەی ﴿الْمُرْسَلِينَ﴾ ی بەکۆ هێنا!

﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلا تَتَّقُونَ ؟﴾ کاتێك (هود)ی هاوعەشرەت.و هاوڕەگەزیان پێی گوتن: ئەوە بۆ خۆتان لەسزای خودا ناپارێزن؟ بۆ لەعەزابی دۆزەخ ناترسن؟

﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ من بۆئێوە پێغەمبەرێکی دڵسۆزو ئەمیندارم، خیانەت لەو پەیامەدا ناکەم: کە خودا خستویەتیە ئەستۆم و بەئێوەی رادەگەیەنم.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ تەقوای خودا بکەن و پابەندی فەرمان و جڵەوگیریەکانی بن.

﴿وَأَطِيعُونِ﴾ گوێ بیستی من بن، چیتان پێ دەڵێم بەقسەم بکەن، خۆشبەختی و کامەرانی دونیاو قیامەتتان بۆ دەستەبەردەبێ!

﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ ئەمن لەسەر ئەو بانگەوازیی و پەندو ئامۆژگارییەی پێتانی رادەگەیەنم کرێ و پاداشتی ئێوەم ناوێ، مەبەستم وەدەستهێنانی ماڵ و سامان و پلەو پایەی دونیایی نیە.

﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ جەزاو پاداشتی من لای خودایە، هەر لەخودا داوا دەکەم پاداشتم بداتەوە. خودی ئەموتارە لەسەر زوبانی حەزرەتی نووح و حەزرەتی هودو حەزرەتی صالح و حەزرەتی لوطء حەزرەتی شوعەیب (علیهم السلام) ئاراستەی گەلەکانیان کراوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە کە پەیامی پێغەمبەران یەك پەیامەو هەموویان بانگەوازییان بۆ خودا بەیەك ناسین و بەندایەتی بۆ کردنی کردوە، هەموویان جڵەوگیریان لەبتپەرستی کردوە.

بانگەوازی بۆ خوداپەرستی و شوێن کەوتنی پەیامی پێغەمبەران و بەتەمانەبوونی وەرگرتنەوەی پاداش و کرێ لەخەڵك و چاو لەدەستی کەرەمی خودا

داب و نەریتی هەموو پێغەمبەرێك بووە،هەموویان یەك ریسالەیان هەبووەو لەیەك سەرچاوەوە پەیامیان بۆ هاتووە.

ئەمجار حەزرەتی هود ﷺ کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ نەتەوەکەیداو پێی فەرموون: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ﴾ ئەوە چییە ئێوە لەسەر هەموو بەرزاییەك باڵەخانەیەك رادەبەستن و بەرزی دەکەنەوەو دەیکەنە نیشانەی بەهێزی دەست و بازوی خۆتان و شانازی پێوە دەکەن.

واپێدەچێ قەومی عاد لەسەر گردو لوتکەی کێوەکان باڵەخانەی بەرزو گەورەیان بنیات ناون، لەدورەوە بینراون، مەبەستیشیان خۆهەڵنانەوەو فەخرو شانازی بوو، هیچ سودیان لێنەبینیون بۆ تێدا حەوانەوەو نیشتەجێ بوون بنیاتیان نەناون، هەروا بۆیەشیان دروست نەکردون ببنە نیشانەی رێگاو رێبوار رێگایان پێ بدۆزێتەوە، ئەگینا ئەگەر مەبەستیان سوود لێبینین بوایە قورئان بە عەبەث باسی نەدەکرد. بۆیە نارەزامەندی لەکارەکەیان دەربڕی چونکە کات بەفیڕۆدان و ماڵ بەفیڕۆدان و وزە خەرجدان بوو بێ ئەوەی سودێکی هەبێ، خۆخەریك کردن بوو بەشتێك بۆ دونیاو قیامەت سوودی نەبوو!

﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾ قەصرو باڵەخانە دروست دەکەن بۆ ئەوەی بۆ هەتا هەتایە ژیانیان تێدا بەسەر بەرن، وادەزانن: بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوەو مردنتان بەسەردا نایە. یان دەتانەوێ نەمرین و هەر لەژیاندا بمێننەوە، هەرچەندە دونیا بەجێ دێڵن هەروەکوو چۆن ئادەمیزادانی پێش ئێوە جیهانیان جێ هێشتوە.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە گەلی عاد لەژیارو بیناسازیدا گەیشتونە ئاستێك کارگەو ئامێری جۆراو جۆریان دروست کردون بۆ کونکردن و دابڕینی کێوو گردەکانی وڵاتیان، بۆ دروستکردنی بینای بەرزو قایم و پتەو بەسەر کێوەکانەوە تەنانەت بەخەیاڵی خۆیان ئەم قەصرو باڵەخانەو قەڵا دژوارانەیان لەمردنیش دەیانپارێزن و مردنیش دەگێڕنەوە، هەروا لەکاریگەری کەش و هەواو رەشەباو زریان و لافاوو بومەلەرزە پارێزگاریان لێدەکەن.

﴿وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾ ئێوە وێڕای ئەو هەموو ئیسرافەی لەقەصرو باڵەخانەو قەلای قایمو پتەودا دەیکەن، هەڵسوکەوتو مامەڵەتان لەگەڵ غەیری خۆتاندا توندو تیژە، خەڵکی دەڕوتێننەوە دەیانچەوسێننەوەو ئازارو ئەشکەنجەیان دەدەن، بەناحەق هەڵمەتی توندوتیژ بۆ ئادەمیزادانی تر دەبەن بە زەبرو زەنگ لەگەڵیاندا دەجوڵێنەوە.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ لەسزای سەختی خودا بترسن، خودای خۆتان بپەرستن، شوێن پەیامی من بکەون، ئەوە بۆ ئێوە کەڵکی هەیەو سودبەخشە، کەس لە دونیادا نەمرنابێ‌و دونیا تاسەر بۆ کەس نابێ.

ئێوە دەبوایە لەشوکرانە ژمێری ئەو نازو نیعمەتو رزقو رۆزییەی پێتان دراوە، لەپاساوی ئەو جەستە تۆکمەو پتەوەی پێتان بەخشراوە بەندایەتی خودا بکەن، بترسن لەوەی خودا قارتان لێبگرێ‌و نازو نیعمەتتان لێ بسێنێتەوە، سزاو عیقابتان بدا.

ئەمجار نیعمەتەکانی خودایان بۆ باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ، أَمَدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ، وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ خۆتان بپارێزن لە سزاو عیقابی ئەو خودایەی نازو نیعمەتی زۆری بەخشیوە بەئێوە، بەخشیویەتی بەئێوە ئەوەی بۆ خۆتان دەیزانن‌و هەستی پێدەکەن؛ ئەوەتا ئەو هەموو ئاژەڵ‌و رزقو رۆزییەی پێبەخشیون، منداڵی زۆری پی داون، باخ و باخاتو سەرچاوەی کانیاوی جوان‌و صافو گوارای بۆ دابین کردون، بەروبومی جۆراوجۆرو میوەجاتی بۆ رەخساندون، دەلە پاساوی ئەوەدا سوپاسی خودای خاوەن نیعمەت بکەن. واز لەسەرپێچی‌و سەرڕەقی خۆتان بێنن.

﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئەگەر ئێوە بەقسەم نەکەن‌و نەیەنە سەر رێبازو مەنهەجی من‌و سووربن لەسەر کوفرو بێدینی خۆتان، ترسی ئەوەم

لێتانە بکەونە بەر عەزابی ڕۆژێکی سامناک، کەس فریاتان نەکەویو هیچ شتێك دادتان نەدا.

کەچی لەوەڵامی ئەم نەصیحەتو ئامۆژگارییە دڵسۆزییەی حەزرەتی هوددا ﴿قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُنْ مِنَ الْوَاعِظِينَ﴾ وتیان: چونیەکە بەلامانەوە ئایا ئامۆژگاری بکەی، یان هەر ئامۆژگاری نەکەی، دڵنیابە ئێمە لەهەڵوێستی خۆمان لانادەینو واز لەدابو نەریتی خۆمان ناهێنین. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِي آلِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ (هود/٥٣).

ئەمە تەعبیرو شێوە ئاخاوتنێکە ئەوپەڕی سوکایەتیو سروشتوشکی لەخۆ گرتووە، کەسێك تۆزقاڵێك ئەدەبو حیشمەتی تێدابێ بەو جۆرە وەڵامی ئامۆژگاری ئاوا دڵسۆزانە ناداتەوە!

وتیان: ﴿إِنْ هَـٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئەوەی تۆ هێناوتە دەست هەڵبەستی پێشینانەو درۆو دەلەسەی ئەوانە تۆ دووبارەی دەکەیەوە. یان ئەم ئایینەی ئێمە لەسەری بەردەوامین ئایینی باوكو باپیرانی پێشینمانە، ئێمە شوێن ئەوان کەوتووین، وەکوو ئەوان ژیان بەسەر دەبەینو وەکوو ئەوان جیهان بەجێ دێڵین، زیندوبوونەوەو قیامەت نیە، پاداشو سزا لەسەر کردەوە لەگۆڕێ نیە، بەهەشتو دۆزەخ خەیاڵپڵاون. کەوابێ ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئێمە سزا نادرێین، ئەوە قسەی خۆتەو لەگیرفانی خۆت دەرت هێناوە. ئاکامی گفتو گۆی نێوان حەزرەتی هود ﷺو گەلەکەی ئەوەبوو ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ بەدرۆیان خستەوە، بانگەوازیو ئامۆژگارییەکانیان ڕەتکردەوە.

﴿فَأَهْلَكْنَاهُمْ﴾ بە ڕەشەبای توندو سارد لەناومان بردن، هۆکاری لەناو بردنەکەیان لەڕەگەزی کردەوەی خۆیان بوو، ئەوان بۆ خۆیان خاوەن هێزو تواناو زەبرو زەنگ بوون، خودای مەزن شتێکی بۆ ناردون زۆر لەخۆیان بەهێزتربوو، قەڵاو قەصرو باڵەخانەو خانوی لەکێو داتاشراو دادی نەدان، عەزابی خودا تێکیەوە

پێچان و قەڵاچۆی کردن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ (فصلت/١٥). ڕەشەبای سەخت و بەتەوژم هەموو شتێکیانی تێکەوە پێچاو وێرانی کرد وەکوو دەفەرموێ: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾ (الأحقاف/٢٥).

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بێگومان لەبەهیلاك بردنی گەلی عاددا بەهۆی ئەوەی: کە پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوە عیبرەت و پەند وەرگرتن هەیە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك: کە تۆمان کردوە بە پێغەمبەریان ئەی موحەممەد! پێویستە پەند لەوان وەربگرن و سەرپێچی فەرمانی خودا نەکەن.

﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی زۆری ئەو گەلە لەناوبراوانە لەزانیاری پێش وەختی ئێمەدا بە موسوڵمان حسێب نەکراون.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! باڵادەست و خاوەن توانایە و تۆڵە لەدوژمنەکانی دەستێنی و ناهێڵێ بەسەریانەوە بچێ، خاوەن ڕەحم و بەزەییە بۆ بەندە ئیماندارەکانی بەمەرجێ تۆبە بکەن و بەخۆیان بچارێن.

ئای چەند گەل و نەتەوە دوای گەلی عاد بەعەقڵ و هۆشی ئەو گەلە خاوەن دەسەڵاتە بیریان کردۆتەوە و بیردەکەنەوە، وەکوو ئەوان لەخۆیان بایی بوون، هەتا لەبواری ژیار و شارستانیدا پێشکەوتوتر بووبن زیاتر لەخودا دوورکەوتونەتەوە و دووردەکەونەوە!!

هەتا لەبواری تەکنۆلۆجیاو چەکسازیدا پێش بکەون پتر سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن، وادەزانن ئەو پێشکەوتن و چەکسازییە لەخودای بوونەوەریان بێئاتاج دەکا، هەرکەسە خەریکی پێشبڕکییە لەبواری دروست کردنی چەکی کۆکوژ و وێرانکەردا بۆ لێدانی غەیرو پاراستنی خۆی، پێی وایە: ئەو چەکە لەدوژمنانی

دەیپارێزێ، بەڵام کاتێك بەخۆیان زانیوە لەهەموو لایەکەوە عەزابی خودا بەسەریان دا داباریوەو خودی چەکە کۆکوژو قەڵاچۆکەرەکەی کە لەوەو پێش پێوەی دەنازین دەبێتە دوژمنی سەرەکیو هۆکاری لەناوبردنیان نموونەی رابوردو زۆرنو لەوەدواش زۆر نمونەی تر دێنەدی!!

## چیرۆکی پێنجەم لە چیرۆکەکانی ئەم سورەتە:
## چیرۆکی حەزرەتی صالحەﷺ لەگەڵ گەلەکەی دا

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا

شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَـٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

لەوە پێش چیرۆکی حەزرەتی هودی لەگەڵ گەلەکەی دا بۆ باس کردین، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆکی حەزرەتی صالح عليه السلام لەگەڵ نەتەوەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو گەلەی حەزرەتی صالحیان بۆ سەر رەوانە کراوە گەلی ثەموود بووە، ئەمانیش وەکوو گەلی عاد عەرەب بوون لەشاری (الحيجر) : کە دەکەوێتە نێوان (وادي القرى)و (شام) واتە لەسەر رێگەی مەدینە ـ شام ـ نیشتەجێ بوون، زێدو نیشتیمانیان ئەو دەڤەرە بوو، شوێنەوارو کەلاوەی شارو گوندی روخاویان ئاشکراو نمایانە. عەرەبەکانی قورەیش کە لەهاویندا کاروانی شامیان دەکرد بەسەر شوێنەواری ئەواندا تێپەڕدەبوون.

پێغەمبەر ﷺ: کە تەشریفی لەگەڵ هاوەڵانی دا چوو بە غەزای تەبوك بەلای کەلاوە روخاوەکانی گەلی ثەموددا تێپەڕیو هاوەڵانی ترساندن لەو سەرەنجامەی بەسەر ئەوان دا هات.

ئەم گەلە ستەمکارە لەدوای گەلی عاد هاتونە کۆڕی ژیانەوە، خودا حەزرەتی صالحی کردە پێغەمبەرو رەوانەی کرد بۆسەریان، بانگەوازی کردن بۆ عیبادەتکردنی خوداو یەکتاپەرستیو برواکردن بەپەیامەکەی. بەڵام ئەوان بەدرۆیان خستەوەو سەرپێچی فەرمانەکانیان کرد، ئیتر پەروەردگار بەعەزابی بوومەلەرزە لەناوی بردن، زەوی لەژێریان دا راتلەقێندراو وڵاتیان ژێرو زەبەربوو

بۆ خۆشیان ئاسەواریان بڕایەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ﴾ (الحاقة/٥).

دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی ثمود پەیامی پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، بڕوایان بە بانگەوازی پێغەمبەرەکەیان نەکرد ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلا تَتَّقُونَ﴾ کاتێك حەزرەتی صالح ﷺ کە لەرەگەزی خۆیان بوو پێی گوتن: ئەوە بۆ ئێوە لەعیقابی خودا ناترسن؟ هەتا ئیمانی پێ بێنن‌و یەکتاپەرستی بکەن، گوێ بیستی فەرمانی من بن چیتان پێ دەڵێم بەقسەم بکەن ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندارو دڵسۆزم.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ خۆتان لەعەزابی سەختی خودا بپارێزن، لەتۆڵەو عیقابی بترسن، شوێن پەیامی من بکەون، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی من بن.

﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ لەسەر بانگەوازی کردنم بۆتان داوای کرێ‌و پاداشت ناکەم لێتان، بەتەما پلەو پایەی دونیایی نیم دەستم بکەوێ، ئەرکێکە خراوەتە ئەستۆم‌و پێتانی ڕادەگەیەنم، من پاداشتی خۆم لەخودا داوا دەکەم، ئەو جەزای ئەم ئەرکەم دەداتەوە.

﴿أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ﴾ ئایا پێتان وایە: ئێوە لەدونیادا بۆ هەتاهەتایە بەدڵنیایی لەناو نازو نیعمەتدا دەمێننەوە؟

﴿فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ پێتان وایە وازتان لێدەهێنرێ بەدڵنیایی لەناو باخ‌و باخات‌و سەرچاوەو کانیاودا لەززەت وەربگرن هەروا ﴿وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾ لەناو کشتو کاڵ‌و باخی دارخورمادا؛ کە خورمای نەرم‌و شیرین‌و تام خۆشی لێدەستەبەر دەبێ، تەنانەت خورماکە هێندە باش‌و بەسوودە بەئاسانی هەزم دەبێ‌و مەعیدە ماندو ناکا. لەبەرووبوومی ئەو باخ‌و کشتوکاڵەتان بخۆن‌و پێتان وابێ ئیتر ژیانی قیامەت‌و حساب‌و پاداش‌و سزا نەبێ؟

﴿وَتَنْحِتُونَ مِنْ الْجِبَالِ بُيُوتاً فَارِهِينَ﴾ ئێوە دادەتاشن لەکێوو شاخ خانوو ماڵی ڕێك‌وپێك‌و دڵخۆشکەر، هەمیشە لەپێشبڕکێ دان‌و هەریەکەتان دەیەوێ خانووبەرەکەی لەهی ئەوی تر سەرنج ڕاکێشتر بێ، دەستڕەنگینی زیاتر تێدا بەکار هاتبێ، ئەو خانوانە بەوشێوەیە دادەتاشن‌و ڕایاندەبەستن نەك بۆ تێداحەوانەوەو نیشتەجێ بوون، بەڵکوو بۆ خۆهەڵنانەو شانازی پێوەکردن.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لەسزاو عەزابی خودا بترسن، ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی من بن، بەباشی تەقوای خودا بکەن‌و ڕوبکەنە ئەو کارو کردەوانەی سوودی دونیاو قیامەتتان لێ دەست دەکەوێ.

﴿وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ﴾ شوێن ئەوانە مەکەون کە لەتاوان‌و سەرپێچی فەرمانی خودادا زێدە ڕۆیی دەکەن، هەمیش سەرگەرمی تاوان‌و لەهوو لەعب‌و ڕابواردنن. مەبەست پیاو ماقوڵ‌و ملهوڕو طاغوتەکانیانن، ئەوانەی بانگەشەی کوفرو بتپەرستیان دەکردو نەیاندەهێشت جەماوەرەکە ڕو لەحەق بکەن.

﴿الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ ئەوانەی ئاشوب‌و فەساد لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوەو هەموو شتێکی باش تێك دەدەن‌و هیچ شتێك چاك ناکەنەوە. واتە: کارو کردەویان فەسادو ڕوخاندنە، تۆزقاڵێك چاکسازییان تێدا نیە. ئێوە شوێن ئەو ئاشوبگێڕانە مەکەون‌و خۆتانیان لێ بپارێزن!

کەچی وەڵامی پێغەمبەری خۆیان بەوپەڕی ناشیرینی دایەوەو ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مِنْ الْمُسَحَّرِينَ﴾ وتیان: تۆ جگە لەسیحر لێکراو هیچی ترنی، ئەم قسانەی تۆ پیاوی جادولێکراو دەیانڵێ، ئەتۆ هیچ عەقڵ‌و شعورت نیە، ئێمە گوێ بۆ نەصیحەت‌و ئامۆژگاری شێتی وەکوو تۆ ناگرین!

﴿مَا أَنْتَ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِنْ كُنْتَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾ تۆ ئادەمیزادێکی وەکوو ئێمە، جگە لەوە هیچی ترنی، ئەدی چۆن زێدە لەهەموومان نیگا بۆ تۆ هاتووە؟

بویتە پێغەمبەری ئێمە؟؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَأُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ، سَيَعْلَمُونَ غَداً مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ﴾ (القمر/٢٥-٢٦).

پێیان سەیر بوو ئادەمیزاد ببێتە پێغەمبەرو نیگای بۆ بێ دەیانگوت: ئەگەر راست بێ نیگا بۆ پێغەمبەر بێ، دەبێ ئەو پێغەمبەرە لەرەگەزی فریشتە بێ...

ئەمجار پێشنیاری ئەوەیان کرد: کە حەزرەتی صالح ﷺ موعجیزەیەکیان نیشان بدا بەلگەبێ لەسەر راستی پێغەمبەرایەتییەکەی، وتیان: ئەگەر راست دەکەی پێغەمبەری لەو بەردە حوشترێکی ئاواو ئاوامان بۆ دەربێنە، حەزرەتی صالحیش وەعدو پەیمانی لێوەرگرتن، ئەگەر پێشنیارەکەیان بێتەجێ ئیمانی پێبهێنن، ئەوانیش وەعدیان پی دا.

حەزرەتی صالح ﷺ هەڵسا نوێژی کردو لەخودا پاڕایەوە: کە ئەو موعجیزەیان بۆ بێنێتەدی. ئیتر بەقودرەتی خودا ئەو بەردەی ئاماژەیان پێکردبوو شەق بوو، وشترێکی لەوجۆرەی خۆیان پێشنیاریان کردبوو هاتە دەرەوە، ئیتر بڕێکیان ئیمانیان هێناو زۆربەشیان بڕوایان پێنەکردو بەکافری مانەوە.

﴿قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾ حەزرەتی صالح ﷺ موعجیزەکەی نیشان دانو بەلگەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆی نواند، پێی فەرمون: ئەمە موعجیزەی خودایە حوشترێکە بەفەرمانی خودا هاتۆتەدیو نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی منە، رۆژێك ئاوی بیرەکەتان بۆ ئەو دەیخواتەوە رۆژێکیش بۆ ئێوە، لەو رۆژەدا کەنۆرە ئاوخواردنەوەی ئەوە ستەمی لێمەکەنو لێی بگەڕێن بابەئارەزوی خۆی ئاوەکە بخواتەوە.

﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بەهیچ شێوەیەك خراپەی لەگەڵ مەکەن، دەست درێژی مەکەنە سەر نە بەلێدانو نە بەکوشتن، ئەگەر دەست درێژی بکەنەسەر عەزابی رۆژێکی گەورەتان توش دێ، ئەو رۆژە گەورەو ناودار

دەبێ، چونكە عەزابەكەی تێدا دێتە جێ، جا ئەگەر ڕۆژەكە بەهۆی عەزابەكەوە بەگەورە بژمێردرێ دیارە عەزابەكە كوشندەیە.

﴿فَعَقَرُوهَا﴾ وشترەكەیان سەربڕی ﴿فَأَصْبَحُوا نَادِمِينَ﴾ دوایی كەپێشەتای عەزابیان بینی لەكردەوەی خۆیان پەشیمان بوونەوە بەڵام تازە چ سود.

﴿فَأَخَذَهُمْ الْعَذَابُ﴾ عەزابی خودا گرتنی، عەزابەكە بریتی بوو لەوە زەوی لەژێریانەوە بوومەلەرزەیەكی توندی لێهاتو رایتلەقاندن، گرمەو ناڵەیەكی زۆر گەورەو بەهێزیان ئاراستە كرا، دڵی هەڵكەندن و زمندەقیان چوو، لەشوێن و مەسكەنی خۆیاندا لاربوونەوەو جوڵەیان لێبڕا!

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً﴾ بێگومان لەروداوو بەسەرهاتی گەلی صالح پێغەمبەردا ، لەبەدرۆخستنەوەی پەیامەكەی لەلایەن گەلەكەیەوە هەروەها دەستدرێژی كردنیان بۆ سەر ئەو حوشترەی خودا بەموعجیزە بۆی بەدیهێنابوون، نیشانەو پەندو ئامۆژگاری زۆرهەن بۆ كەسێك عەقڵ و هۆشی هەبێ. دەبێ چ بەڵگەیەك ئەوەندە گەورەبێ لەگاشە بەردێكی دیاریكراو حوشترێكی بەوشێوە پەیدابێ و ئاو خواردنەوەو شیردانیشی ئاوا موعجیزە بێ؟!

بەڵام ئەو گەلە سەرلێشێواوە بەوەش بڕوایان نەكردو حەزرەتی صالحیان بەدرۆخستەوەو حوشتری موعجیزە ئاسایان كوشت، عەزابی خودایان بەسەردا نازڵ بوو. ﴿ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی زۆریان ئیمانیان بە خوداو بەپێغەمبەری خودا نەبوو.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ تۆڵەستێنەوەیە لە دوژمنەكانی و مۆڵەتیشیان بدا پاشگوێیان ناخا، خاوەن سۆزو بەزەییە بۆ بڕواداران ئەگەر تۆبە بكەن و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە.

**چیرۆکی شەشەم: چیرۆکی حەزرەتی لووطە ﷺ لەگەڵ گەلەکەی دا**

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَـٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾﴾

ئەمەش چیرۆکێکی ترە وەکوو چیرۆکەکانی تر بۆ پەندو ئامۆژگارییە، ئەویش چیرۆکی حەزرەتی لووطە ، حەزرەتی لووط کوڕی ئارانی کوڕی ئازەرە، برازای حەزرەتی ئیبراهیمە، پەروەردگار لەسەردەمی ئیبراهیم دا کردی بە پێغەمبەرو ناردی بۆ سەر گەلو نەتەوەیەکی قەرەباڵغ کەدانیشتووی وڵاتی (ئوردون) بوون،

لەشاری عامورەو سێ شاری تردا نیشتەجێ بوون، خودای تەعالا لەناوی بردن وڵاتەکەی کردنە چاڵایی وژێرو زەبەری کرد؛ وڵاتەکەیان جیرانی کێوەکانی (بیت المقدس)و بەرامبەر کێوەکانی گەرەك و شیوێکەو لەپەنا بەحری (المیت).

حەزرەتی لووط کرا بەپێغەمبەریان بانگەوازی کردن بۆ خوداپەرستیو خودا بەیەك ناسینو فەرمانبەرداری پێغەمبەری خوداو جڵەوگیری لێکردن لەتاوانکردنو نێربازیی کە ئەم تاوانەیان داهێنراوی خۆیان بوو، پێش ئەوان کەس نەیکردبوو.

﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ گەلی لووط پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، واتە: گەلی لووط پەیامی حەزرەتی لووطیان بەدرۆخستەوە.

﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ﴾ کاتێك حەزرەتی لووط پێی گوتن. ﴿أَلا تَتَّقُونَ ؟﴾ ئەوە بۆچی ئێوە لەعەزابو تۆڵەی خودا ناترسن؟ بۆچی خۆتان لەعەزابی خودا رزگار ناکەن بەوە واز لەتاوانکردن بهێنن.

﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ ئەمن بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی دڵسۆزو ئەمیندارم، چیم پێسپێردراوە بە ئەمانەتەوە پێتانی رادەگەیەنم.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ لەسزاو عیقابی خودا خۆتان بپارێزن، ئەوەی فەرمانی پێکردون ئەنجامی بدەن، ئەوەی جڵەوگیری لێکردون مەیکەن.

﴿وَأَطِيعُونِ﴾ گوێ بیستی ئامۆژگاری من بن، چیتان پێ دەڵێم بەگوێم بکەن، نافرەت مارەبکەن، واز لەهەتیوبازی بهێنن، چیدی کاری ناشیرینو فەحشامێز ئەنجام مەدەن، ئەمە پەیامی خودایەو پێتانی رادەگەیەنم. ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ من لەپاساوی ئەم بانگەوازی کردنەم دا داوای کرێو پاداشتتان لێناکەم، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەجرو پاداشتی من لای خودای بوونەوەرە، ئەو دەتوانێ پاداشتم بداتەوە.

بێگومان ئەو دیاردە ناشیرینەی لەناو گەلی لووطدا باوبوو لادان بوو لەفیطرەتی ئادەمیزادیو هەڵگەڕانەوە بوو لە سروشت. پەروەردگار نێرو مێی

دروست کردوە، حەزو ئارەزۆی ئەم دوو رەگەزە بۆ یەکتری شتێکە ئاوێتەی سروشتیان کراوە، هەریەکەیان لەنێرو مێ مەیلی بۆ ئەوی تریان هەیە. بۆ ئەوەی حیکمەتو مەشیئەتی خودا لەدرێژە پێدانی ژیان لەرێگەی زاوو زێوە: کە لەئاکامی بەیەك گەیشتنی نێرو مێوە دەستەبەر دەبێ، بێتەجێ، کەوابوو ئەم مەیلە سروشتییەی نێرو مێ بۆ یەکتری بەشێکە لەقانوونە گشتییەکەی بوونەوەرو پەیرەو کردنی ویستی خودایە لەبەرێوەبردنی ئەم بوونەوەرەداو مەبەستێکی پیرۆزە؛ ئەویش درێژەپێدانی ژیانە لەسەر زەوی بەگوێرەی یاسای خودا. بەلام هەتیوبازیو چوونەلای نێر هیچ مەبەستێکی پیرۆزی تێدا نیەو هیچ ئاکامێکی پەسەندی لێناکەوێتەوە، لەگەڵ قانوونو یاسای بوونەوەردا ناگونجێ!

لادان لەیاسای بوونەوەر لەکردەوەی گەلی لووطدا ئاشکراو نمایانە، بۆیە کەوتبوونە سەردوو رێیانەیەك؛ یان دەبوو بگەرێنەوەو واز لەوکارە خەتەرناکە بێنن، یان لەناو بچن، چونکە ئەوان لەرەوورەوەی ژیان دەرچووبوون، بەدژی سروشت دەجولانەوەو هیچ حیکمەتێك لەمانەوەیان دا بەو حالە بەرچاو نەدەکەوت.

بۆیە حەزرەتی لووط بەتوندی دژی هەڵوێستی ئەوگەلە ستەمکارە وەستاو لۆمەو سەرزەنشتی کردنو پێی فەرموون: ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنْ الْعَالَمِينَ، وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ﴾ چۆن پێکێشی کاری ئاوا ناشیرین دەکەن؟ بەچ عەقڵێك ئەم تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدەن؟ چۆن دەچنە لای نێرو نێربازیی دەکەن؟ هەرکەسێکی بیانی بێتە ناوتان ئێوە کاری ئاوا ناشیرینی لەگەڵ دا دەکەن. پەروەردگار کارەکەیانی بەفاحیشە ناوبردوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّن الْعَالَمِينَ﴾ (الأعراف/٨٠) دەچنە لای نێرو ئافرەتەکانتان وازلێدێنن، ناچنە لای ژنەکانتان کە خودا بەسروشت بۆ ئەو مەبەستەی دروست کردون.

﴿بَـلْ أَنْـتُمْ قَـوْمٌ عَـادُونَ﴾ بـەڵام بەڕاسـتی ئێـوە نەتەوەیـەکی سـنوور بـەزێنو دەسـتدرێژکارن، زێـدەڕەویی دەکـەن لەتاوانـدا بەتایبـەتی ئـەم کـارە ناشـیرینەتان کەکەس پێش ئێوە نەیکردوە.

﴿قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ﴾ وتیان: ئەگەر واز لـەم قسانەت نـەهێنی ئـەی لـووط لەمەبـەولاوە بـەردەوام بـی لەسـەر دەعـوای پێغەمبەرایـەتیو سەرزەنشت کردنمان لەسـەر ئـەم کارەمـانو چـیتر رەخنـە لـەنێربازیی ئێمـە بگـری دەرت دەکەینو ناهێڵین لەناوماندا بمێنی، چـیتر لەگـەڵت هەڵناکـەین، وەکوو چۆن لەوەپێش کـەسـانێك کە لەمبارەوە رەخنەی لێگـرتـووین شاربـەدەرمـان کـردون.

بێگومان لەبنەڕەتدا حەزرەتی لووط خەڵکی ئـەو شـوێنو زێـدە نـەبوو، کاتێـك حـەزرەتی ئیبراهیمـی مـامی کۆچـی کـردو زێـدو نیـشتیمانی خـۆی بـەجێ هێـشت حەزرەتی (لووط)یش لەگەڵیا کۆچی کردو کەوتە ولاتی ئەردەنو لەگەڵ ئەو گەلو نەتەوە ژیا تاخودا کردی بە پێغەمبەرو بـۆ سـەریان رەوانـەی کـرد، بـۆ ئـەوەی لـەو تاوانو کردەوە ناشیرینانە بیانگێڕێتەوە، حەزرەتی لووط بوێرانە وەڵامی دانەوە، چ باکی لەهەڕەشەی توندوتیژیان نەبوو، بەڕاشکاویو بەئاشکرا دژایەتی خۆی دەربڕی بەرامبەریانو پێی گوتن:

﴿قَـالَ إِنِّـي لِعَمَلِكُـمْ مِـنَ الْقَـالِينَ﴾ مـن بـەرامبـەر ئـەو کـردەوە ناشـیرینە قێزلێکـراوەی ئێـوە رقو قـارم هەیـەو زۆر دژی دەوەسـتمو بـەهیچ شـێوەیەك پێـی رازی نیمو ناچێتە دڵمەوە، من لە ئێوە بەریمو هەڕەشەو تەهدیـدی ئێـوە مـن لـەو هەڵوێـستەم ناهێنێتـە خـواریو منـیش یـەکێکم لـەو کەسـانەی دژی ئـەو کـردەوە ناشـیرینەی ئیـومن، تەنانـەت کارەکـەتان هێنـدە ناشـیرینە خـەڵکانی تـریش قێزیـان لێیەتی.

ئەمجار هانای بۆ پەروەردگار بردو وتی: ﴿رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾ خودایە! لەعەزابی کردەوەی ئەوانە رزگارم بکە، خۆمو ماڵو خێزانم لە ئەوسزایەی تووشی ئەوان دێ لەسەر ئەو کردەوە ناشیرینەیان بەدوور بگرەو پارێزراومان بکە.

﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ، إِلاَّ عَجُوزاً فِي الْغَابِرِينَ﴾ ئێمەیش دوعاکەیمان گیراکرد، خۆیو خاوو خێزانیو هەموو ئەوانەی ئیمانیان پێهێنابوو بەشەو هەموویانمان رزگارکرد جگە لەپیرەژنەکەی لووط ئەو لەپێری لەناوبراوەکان بوو، پیرەژنێکی بەدفەساڵ بوو، بڕوای بەئایینی لووط نەکردو لەگەڵ نەتەوە ستەمکارەکەدا بەکافری مایەوەو لەگەڵ کافراندا لەناو چوو.

﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا الآخَرِينَ﴾ پاشان ئەوانەمان لەناو برد کەمابوونەوەو لەگەڵ حەزرەتی لووطو شوێنکەوتوانی دا بەشەو دەرنەچوون، سەرگەرمی هەتیوبازیو کاری ناشیرینی تر بوون، ئیمانیان بە خودا نەهێنابوو بڕوایان بەپێغەمبەری خودا نەکرد.

﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَراً فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ﴾ عەزابی سەختی خۆمانمان بەسەردا باراندن، عەزابەکە گشتگیر بوو هەموویانی گرتەوە، بەردە بارانمان کردن، بەڕاستی خراپ بارانێك بوو ئەو بارانەی کە بەسەر ئەو گەلە لەناوبراوەماندا باران، بارانێك کە باراندمان بەسەر ئەو گەلە هەڕەشە لێکراوەدا بارانی رەحمەت نەبوو بارانی غەزەب بوو.

دەڵێن: شارو گوندەکانیان بەگوندی (سدوم) یشەوە بەزەوی دا رۆچونو ناو دایپۆشین، واگومان دەبرێ شوێنەواریان لەژێر ئاوی دەریای (المیت) دایە لە ئوردون.

هەندێ لەزانایانی پسپۆڕ لەزانیاری توێژینەوەکانی زەوی دا تەئکید لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دەریای (المیت) چەند شارێکی قەرەباڵغ بەدانیشتوانی

داپۆشیوە، بڕێ لەزانایانی شوێنەوار پاشماوەی قەڵایەکیان. لەنزیك دەریاکەوە دۆزیوەتەوە، لەپەنا قەڵاکە شوێنی قوربانی سەربڕینیان کەشف کرد.

بەکورتی عەزابی نەتەوەی لووط بریتی بوو لە بومەلەرزەیەکی بەهێز وڵاتەکەیانی ژێرو زەبەرکرد، وێڕای ئەو بومەلەرزە لەئاسمانیشەوە بەردەباران و ئاگرباران کران وڵات و شوێنیان سوتێنرا، ئەمجار ئاو دایپۆشین.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بێگومان لەڕوداوی لەناوبردنی گەلی لووط دا بەو شێوە سامناکە پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەرکەسێك بەچاوی وردبینەوە تێ بفکرێ. ئەوە بوو پەروەردگار تاوانبارە هەتیوبازەکانی لەناوبردن ، موسوڵمانە راستاڵ و خاوەن باوەڕەکانی رزگارکردن.

﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی زۆری ئەو گەلە ئیمانیان نەهێنا بوو، سووربون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! تۆڵە ستێنە لەدوژمنەکانی خاوەن رەحم و بەزەییە بۆ موسوڵمانە تۆبەکارەکان.

## چیرۆکی حەوتەم: چیرۆکی حەزرەتی شوعەیبە ؈ لەگەڵ نەتەوەکەیدا

﴿ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ (١٧٦) إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٧٧) إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٧٨) فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٧٩) وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (١٨٠) ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ (١٨١) وَزِنُوا۟

بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾

ئەمە چیرۆکی حەوتەمو دوا چیرۆکە لەم سورەتە پیرۆزەدا ، هێنراون بۆ عیبرەتو پەند لێوەرگرتن، هەروەها بۆ دڵدانەوەو تەسەللا هاتنی پێغەمبەرﷺ بۆئەوەی دڵتەنگ نەبێ بەهەڵسوکەوتی قورەیشییەکان، بزانێ کە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران دابو نەریتی گەلە پێشینەکانیش بووە، هەموو پێغەمبەرێك لەلایەن گەلەکەیەوە ئەزیەت دراوە.

ئەمە چیرۆکی حەزرەتی شوعەیبە سەلامی خودای لێبێ، خودا کردی بەپێغەمبەرو رەوانەی کرد بۆ سەر ئەهلی مەدیەنو ئەهلی (الأيكة). دانیشتوانی (الأيكة) نەتەوەیەك بوون خاوەن باخو باخاتو کشتوکاڵو بەروبوومو میوەجات،

پــەروەردگار حــەزرەتی شــوعەیبی بــۆ ســەرناردن بــۆ ئــەوەی بــاری شــێواوی کۆمەلایەتییان راست بکاتەوە، جڵەو گیرییان لێبکا لەتەرازوبازیی و فەساد نانەوە لەسەر زەوی، بانگەوازی کردن و پەندو ئامۆژگاریی کردن کەواز لەتەرازوبازیی بهێنن، ئاشوب و فیتنە بەرپانەکەن، بەقسەیان نەکردو خودا لەناوی بردن.

﴿كَذَّبَ أَصْحَابُ الأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ﴾ واپێدەچێ ﴿أَصْحَابُ الأَيْكَةِ﴾ دانیشتوانی شاری مەدیەن بن ﴿الأَيْكَةِ﴾ درەختێکی گەلا پڕە، وادیارە شاری مەدیەن ئەم جۆرە درەختەی بەدەورەوە بووبێ، شوێنی شاری مەدیەن لەنێوان ولاتی حیجازو فەلەستین بووە لەدەوروبەری خەلیجی عەقەبە.

ئەصحابولئەیکە پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، واتە: حەزرەتی شوعەیبیان بەدرۆخستەوە، بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرێکیش دەبێتە بەدرۆخستەوەی هەموو پێغەمبەران، کەسێك پێغەمبەرێك بەدرۆبخاتەوە وەکوو ئەوەوایە هەموو پێغەمبەرەکانی بەدرۆخستبنەوە، بەدرۆخستەوەکەشیان ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلا تَتَّقُونَ﴾ کاتێك بوو: کە شوعەیب﷤ پێی گوتن: ئەوە بۆ لەعەزابی خودا ناترسن؟

﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ﴾ من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی دڵسۆزو ئەمیندارم.

﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ لەعەزابی خودا بترسن سەرپێچی فەرمان و جڵەو گیریەکانی مەکەن، شوێن من بکەون چیتان پێ دەڵێم: بەقسەم بکەن و گوێ بیستی ئامۆژگاریەکانم بن.

﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەمن لەپای ئەم ئامۆژگاری و بانگەوازییەم داوای کرێ و پاداشتتان لێناکەم، کرێ و پاداشتم لای خودایە، خودای بوونەوەر دەتوانێ پاداشتم بداتەوە.

ئابەوشێوە هەڵێنان بۆ خوداپەرستی و ئیمان هێنان، بەئاشکرا پێی راگەیاندن: کە ئەو پێغەمبەری ئەوانەو لەخوداوە بۆ سەریان رەوانە کراوە، دڵسۆزو ئەمیندارە لەگەیاندنی پەیامەکەی داو هیچ مەبەستێکی دونیایی بە ئەوان نیە.

ئەمجار چەند ئامۆژگارییەکی سەرەکییان ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ﴾ ئەگەر شتتان فرۆشت، بەتەواوی بۆیان بپێون، بۆیان بکێشن، ئامێری پێوانەو کێشانەتان کەمو کورتی تێدا نەبێ، لەو کەسانە مەبن کەمافی خەڵکی بەتەواوی نادەن، ئەگەر شتتان کڕی زیادە وەرمەگرنو تەماعتان لەماڵی خەڵکدا نەبێ، واتە: پێویستە لەوەرگرتنو پێداندا یەکسانی بکەن، چۆن کاڵا دەدەن بەکڕیار ئاواش کاڵا لەفرۆشیار وەربگرن.

﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ بەتەرازوی راستو دروست شت کێشانە بکەن، تەرازوبازی مەکەن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ، أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ﴾ (المطففين/١-٤).

ئەمجار جڵەوگیری ئەوەیان لێدەکا: کە ستەم نەکەن، کاڵای خەڵک بەبێنرخ سەیر نەکەن، مافی کەسانی دیکە بەکەمو بێبەها نەزانن، لەنرخو بەهای شتومەکیان دانەشکێنن، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ﴾ لەکاڵاو شتومەکی ئادەمیزادان کەم مەکەنەوە، باپێوەرەکانتان عادڵانە بن، لەکێشانەو پێوانەدا لەژمارەو هەڵسەنگاندندا لەمەزەندە کردنو تەخمیندا لەمافی ئەدەبیو مەعنەویدا عادڵانە هەڵسوکەوت بکەن، هەرشتەو مافی خۆی بدەنێ، هەرکاڵایەو بەهای خۆی بۆ دیاری بکەن، هەر رەنجدانو ماندو بوونێک بەگوێرەی خۆی هەڵیسەنگێنن.

﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ ئاشوبو فیتنەیی لەوڵاتدا بەرپا مەکەن، چەتەییو تاڵانکاریو کوشتو کوشتارمەکەن، رەزو باخو باخات وێران مەکەن.

﴿وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ﴾ بترسن لەعەزابی سەختی ئەو خودایەی بەفەزڵو گەورەیی خۆی ئێوەی بەدیهێناوە، ئەو گەلو نەتەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردوە، ئەو هەموو گەلو نەتەوە خاوەن دەسەڵاتو ماڵو سامانو هێزو

توانایەی پێش ئێوەش هێناونـە گۆڕەپانی ژیانـەوە دوایـی بـەهۆی ئـەوەوە کـە ئـەو گەلانە سەرپێچی فەرمانیان کردو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخـستەوە لـەناوی بـردن‌و بوونە پەندوعیبرەتی رۆژگار.

﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنْ الْمُسَحَّرِينَ﴾ وتیان: ئەی شوعەیب تۆ جگە لەپیاوێکی جادو لێکـراو هیـچی تـر نـی، سیحرت لێکـراوەو عـەقڵت شـێواوە، کـێ گـوێ لەقـسەی تـۆ دەگری‌و کێ گرنگی دەدا بەئامۆژگاری تۆ.

﴿وَمَا أَنتَ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا﴾ تۆ پیـاوێکی وەکـوو ئێمـەو هیـچی تـر، چیـت لەئێمـە زیاتر نیە، ئیتر چی تۆی والێ کرد فـەزڵ‌و ڕێـزت بەسـەرماندا هـەبێ، بۆچـی زێـدە لەهەموانمان تۆ بویت بەپێغەمبەر؟

﴿وَإِنْ نَظُنُّكَ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ﴾ ئەوەی ئێمە گومانمان بـۆی دەچـێ ئەوەیـە: کـە تـۆ درۆ دەکـەی‌و لـەپێری درۆزنـەکانی، بەئەنقەسـت قـسە هەڵدەبەسـتی‌و خـۆت بـە پێغەمبەر داناوە. ئەگینا لەراستیدا تۆ پێغەمبەرنیت‌و خودا تۆی رەوانە نەکردوە.

ئەگەر هەڕەشەشمان لێدەکەی بەعەزاب‌و دەڵێی ئەگەر ئیمـان نـەهێنن عـەزابی خوداتان بۆ دێ، دە بێمنەت بە ئەوە ئێمە ئیمانت پێ‌ناهێنین.

﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفاً مِنْ السَّمَاءِ إِنْ كُنـتَ مِـنْ الـصَّادِقِينَ﴾ ئەگـەر راسـت دەکـەی پارچە هەورێکی پڕ لەعـەزابمان بەسـەردا بـدە، ئـەو عەزابـەی هەڕەشـەمان پـێ لـێ دەکـەی بابۆمـان بـێ! هەڵبەتـە ئـەم داواکارییـەیان نیـشانەی ئـەوە بـوو: کـە ئـەوان سـوورن لەسـەر ئینکـاریی‌و ئیمـان نـەهێنان‌و بەدرۆخـستنەوەی حـەزرەتی شوعەیب‌و بڕوانەبوونیان بەهاتنی عەزاب بۆ سەریان.

ئـەم هەڵوێـستە دەق دەشـوبهێتە هەڵوێـستی قورەیـشییەکان: کـە چـەند پێشنیارێکیان ئاراستەی پێغەمبـەر ﷺ کـردو وتیـان ئیمانـت پـێ نـاهێنین تـا فـلان شت یان فلان شتمان بۆ دەستەبەر نەکـەی، ﴿أَوْ تُـسْقِطَ الـسَّمَاءَ كَمَـا زَعَمْـتَ عَلَيْنَـا

كِسَفاً أَوْ تَأْتِيَ بِاللّهِ وَالْمَلآئِكَةِ قَبِيلاً﴾ (الإسراء/٩٢). یان ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ (الأنفال/٣٢).

گەلی شوعەیب پێیان وابوو ئەگەر عەزابەکەیان بۆ نەیە نیشانەی ئەوەیە حەزرەتی شوعەیب درۆزنەو درۆزنیەکەی دەردەکەوێ بۆیە حەزرەتی شوعەیب ﷺ وەڵامی دانەوەو ﴿قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ وتی: خودای من زاناترە بەکردەوەکانتانو دەزانێ چی دەکەنو زوو یان درەنگ سزاتان دەداتەوەو تۆڵەتان لێدەستێنێ، وەلێ من هیچ دەسەڵاتێکم لەهێنانو نەهێنانی عەزابدا نیە، ئەوە بەدەست خودایە، ئەگەر شیاوی عەزاب بن بۆتان دەنێریو چۆنی بوێ ئاواتان لەگەڵ دەکا. حەزرەتی شوعەیب ﷺ دوعای لێنەکردن بەڵکوو عەزاب دانیانی حەواڵەی خودا کرد. جا کە بەردەوام بوون لەسەر کوفرو سەرڕەقی خۆیان بەگوێرەی پێشنیاری خۆیان خودا عەزابی (يوم الظلة)ی بۆ ناردن.

دەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ﴾ کە بەردەوام بوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکەیان، ئیتر عەزابی (يوم الظلة) گرتنی: کە بریتی بوو لەگەرماییەکی بەشیددەت هەناسەی گرتن، گەرماکە هێندە توند بوو، سێبەرو ئاو چاری نەکردن، ناچاربوون شار بەجێ بێڵنو روو لەسارا بکەن، هەورێك لەسەریان پەیدابوو تۆزێك ساردیو نەرمە بایەکی پێوەبوو، هەموویان لەژێریدا کۆبونەوە بەو هیوایەی لەژێریدا بحەسێنەوەو کەمێك گەرماییان لێدوربخاتەوە، بەڵام بەپێچەوانە بوو، هەورەکە ئاگر بارانی کردنو هەموویانی کردە قەرەبروت وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَرَوْا كِسْفاً مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطاً يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ﴾ (الطور/٤٤).

﴿إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ بەراستی ئەو عەزابەی بۆ سەر ئەوان نێردرا عەزابی رۆژێکی گەورە بوو، عەزابێکی ترسناكو قەڵاچۆکەر بوو، ئاسەواری

بڕینەوە، عەزابێك بوو بریتی بوو لە هەورە بروسکەو چەخماخەو شریخو هوڕێکی ترسێنەرو تۆقێنەر.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً﴾ بێگومان لەم چیرۆکە رەوانو سەرنج راکێشەدا پەندو ئامۆژگاری بۆ قورەیشییەکانو هی تریش هەیە، نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدەو، بەڵگەیە لەسەرئەوە: کە هاتنی عەزاب بەدەست خودایەو ئەو کاتو شوێنو چۆنیەتی دیاری دەکا.

﴿وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ زۆربەی زۆری گەلی شوعەیب موسوڵمان نەبوون، بەکافری لەناوچوون.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ بێگومان خودا تۆ ئەی موحەممەد! خاوەن دەسەڵاتو توانایە، تۆڵە لەتاوانباران دەستێنیو فەرامۆشیان ناکا، خاوەن رەحمو بەزەییە بۆ موسوڵمانانو چاودێریانە.

ئەم چیرۆکانە ئاماژە بەوە دەکەن: کە هەموو پێغەمبەران تێکڕا بانگەوازییان بۆ یەك جۆر ئایین کردوە، هەموویان بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستی کردوە، هەوڵیان داوە بۆ رێزگرتن، لەئەخلاقی بەرزو جوانو بڵاوکردنەوەی فەضائیلو دژایەتی کردنی رەزائیل.

ئەمجار هەریەکەیان چارەسەری نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکانیان بەشێوەو شێوازێکی جیاو تایبەتی چارە سەرکردوە هەر گەلو نەتەوەیەك جۆرە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی تێدا بەرجەستە بووەو تەشەنەی کردوە. ئەوەتا حەزرەتی هود﷣ دوای بانگەوازی یەکتاپەرستیو پابەندبوون بەفەرمانو جڵەوگیرییەکانی پەروەردگار هەوڵ دەدا نەخۆشی شانازی کردنو خۆبەزلزانیو بینا رابەستنی زیاد لەپێویست چارەسەربکا، تەماعکاریو ئاشوبو تاڵانکردنو رێگریو چەتەکارییان تێدا نەهێڵێ. ئەوە حەزرەتی صالحە﷣ دەیەوێ

گەلەکــەی واز لەپێــشبڕکێی بیناســازیو رازاندنــەوەی خانووبــەرەو قەصــرو باڵەخانەکانیان بهێنن، هێندە هەڵپەی دەستەبەرکردنی لەززەتە مادییەکان نەکەن.

حەزرەتی (لوط) یش نارەزامەندیی توندی خۆی دەربڕی بەرامبەر دیاردەی نێربازیی کە لەناو گەلەکەیدا باوبوو، بە توندی رەخنەی لێ گرتنو کارەکەیانی بە پێچەوانەی قانونو یاسای بونەوەر دانان. حەزرەتی (شوعەیب ﷺ)یش بەتوندی رەخنەی لەتەرازو بازیو ستەمکاری نەتەوەکەی گرتو هەڕەشەی ترسناکی لێ کردن ئەگەر سووربن لەسەر هەڵوێستی نادروستیان.

هەموو پێغەمبەرەکان جەختیان لەسەر خودا پەرستی کردووەو خەڵکیان هەڵناوە بۆ دڵسۆزی لەعیبادەت کردندا. هەموویان ئەوەیان راگەیاندوە: کە لەپاساوی بانگەوازییەکەیاندا بەتەمای کرێو پاداشتی گەلەکانیان نینو ئەجرو پاداشتی خۆیان لەخودا داوا دەکەن.

هەموویان وەرە بەرزو پشوو درێژو دڵسۆزو بێباك بوون لەبەرامبەر سەرپێچیکارانو ستەمکاران دا، هیچ هەڕەشەو تەهدیدێك كاری لێ نەكردونو پشتیان بەخودا قایمو پتەو بووە.

## قورئان لەخوداوە نێردراوە بۆ ترساندنی موشریکەکانو موژدەدان بە موسوڵمانان

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ ءَايَةً أَن يَعۡلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِيٓ

إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا۟ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾

دوای ڕانواندنی چیرۆکی ئەو پێغەمبەرانە: کە خودا گێڕانیەوە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو تەسەللادانەوەیو ترساندنی موشریکەکانی قورەیش: کە خۆیان توشی ئەو عەزابو سزایەی نەتەوە پێشینەکان نەکەنو پێغەمبەر بەدرۆ نەخەنەوە. بۆ ئەوەی بەدەردی گەلە پێشینەکان نەچنو وەکوو ئەوان لەناو نەچن.

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی نازڵکردنی قورئان دەکا، بۆ سەردڵی پێغەمبەرﷺ کە بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدە، هەروەها بۆ ئەوەی لەنێوان سەرەتاو کۆتایی سورەتەکەدا تەناسوب دروست ببێ، چونکە سەرەتای سورەتەکە، باسی روو وەرگێڕانی موشریکەکان دەکا لەقورئان ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ الرَّحْمَنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ﴾ (ئایەتی٥). بۆیە کۆتایی سورەتەکەشی بەباسی قورئان بەڕێ دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ واتە: ئەو قورئانەی لەسەرەتای سورەتەکەدا باس کرا، نامەی ئاسمانییەو لەخوداوە نازڵکراوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ.. نامەیەکی فەصیحەو موعجیزەیە، لەتوانای ئادەمیزادو جندۆکەدا نیە شتی ئاوا بخەنە ڕو، کەوابوو لەخوداوە نازڵ بووەو شاکاری خودای بوونەوەرە، هەروەها هەواڵی نهێنیو بەسەرهاتی رابووردوی تێدایە ئەمەش بەنیگاو سروش نەبێ نازانرێ.

﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ﴾ ئەمینداری نیگاو سروش (جوبرائیل) بۆی هێناوەتە خوارێ، فریشتەی پایە بەرز لەعالەمی باڵاوە ئەو پەیامە پیرۆزە بەفەرەی خستۆتە ناو دڵو دەرونی تۆوەو تێی گەیاندوی، بەبێ زیادو کەم قورئانی پێ راگەیاندوی ﴿عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ﴾ بۆ ئەوەی لەپێڕی ترسێنەران بێ، گەلو نەتەوەکەت بترسێنی، بەڵکوو هەموو ئادەمیزاد بەگشتی بترسێنی لەعەزابی خودا، موژدە بدەی بەئەوانەی شوێنت دەکەونو ئەوانە بترسێنی: کە سەرپێچیت دەکەنو پەیامەکەت بەدرۆدەخەنەوە.

نازڵکردنی قورئان بۆسەر تۆ ئەی موحەممەد! ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ﴾ بەزوبانی عەرەبیو ئاشکراو رەوانو سەرئاسا تابەجوانی تێی بگەنو قورەیشییەکان بیانویان نەمێنێ.. چونکە ئەوان یەکەم گەلو نەتەوەیەکن قورئانیان بەگوێدا دراوە، بەسەریاندا خوێندراوەتەوە، دەی دەبوایە زوو بەپیر بانگەوازی ئیسلامییەوە

بهاتنایەو خێرا ئیمانیان بهێنایە، ئەوان پێغەمبەر دەناسن، ئاگایان لەژیانی رابووردوی هەیە، قورئان بەزمانی خۆیانەو ئوسلوبو شێوەو شێوازی لەهی کەلامی بەشەر جوداوازەو لەژوور تواناو دەسەڵاتی ئەوان دایە. لێیان عەیانو ئاشکرایە ئەم قورئانە لەجۆری قسەو ئاخاوتنی ئادەمیزاد نیە، لەسەرچاوەیەکی غەیری ئادەمیزادەوە هاتووە، کەچی وێرای ئەوەش بەهۆی عینادو سەرڕەقی خۆیان ئیمانیان نەهێناو پێغەمبەریان بەدرۆخستەوە.

﴿وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ﴾ باسو خواسی قورئانو ئاماژەپێکردنی لەنامە ئاسمانیە پێشینەکاندا هەیە. پێغەمبەرانی پێشوو یەك لەدوای یەك موژدەی هاتنی پێغەمبەرو نازلکردنی قورئانیان بەگەلەکانیان داوە، دوا پێغەمبەر کە ئەم پەیامەی بەگەلو نەتەوەکەی راگەیاند حەزرەتی عیسا‌ﷺ بوو کە موژدەی رەوانەکردنی پێغەمبەری ئیسلامی بەگەلو نەتەوەکەی راگەیاند، وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ (الصف/٦). یان دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ (البقرة/٨٩) یان دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ﴾ (المائدة/٤٨).

**بەکورتیو پوختی ئەم ئایەتانە سێ بەڵگەیان لەخۆ گرتووە لەسەر ئەوە: کە قورئان لەخوداوە هاتووە:**

یەکەمیان ئەوەیە: قورئان نازڵ بووە بۆ سەردڵی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار: کە لەوەوپێش هیچی لەو بارەوە نەزانیوە. کە قورئانەکەی بۆ هات باش وەری گرتو پەیرەوی کرد. دووەم ئەوەیە: بەزوبانی عەرەبی ئاشکراو نمایان نازڵ بووەو تەحەددای عەرەبو غەیری عەرەبی کرد بتوانن وێنەی قورئان یان دەسورەتی

تەنانـەت سورەتێکیـشی بخەنـەڕو. نـەیانتوانیو دامـاوو دەسەوسـان بـوون. ئەمـەش نیشانەی ئەوەیە: کە قورئان لەخوداوەیەو دەست هەڵبەستی موحەممەد نیە.

بەڵگـەی سـێهەم: ئەوەیـە قورئـان لەکتێبـە ئاسمانییـەکانی پێـشودا ئامـاژەی پـێکراوەو مزگێنـی پـێدراوە.. جاکـە ئـەوەمان بـۆ چەسپا: کـە قورئـان لـەخوداوە نازلکراوە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیش دەچەسپێ!

بەڵگەیەکی تر لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممـەدﷺ ئەوەیـە زانایـانی ئـاینی نەتـەوەی ئیـسرائیل نـاوی قورئـانو نیـشانەکانی پێغەمبــەریان لەکتێبە ئاسمانییەکانی خۆیاندا دەست کەوتووە.

دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ آيَةً أَنْ يَعْلَمَـهُ عُلَمَـاءُ بَنِـي إِسْـرَائِيلَ ؟﴾ ئایـا بەڵگـەی تــەواوو نیــشانەی راســتی پێغەمبەرایــەتی موحەممــەد نابێتــە نیــشانە بــۆ قورەیشییەکان: کە زاناکانی نەتەوەی ئیسرائیل باسی قورئانو رەوشتی پێغەمبەری ئیـسلام بـەرونیو ئاشـکرا لەکتێبـە ئاسمانیەکانیانـدا دەسـت بکـەوێ، تەنانــەت زاناکانیان موحەممەدیان وەکوو کوڕی خۆیان ناسیوە!! تەنانەت عەبدوڵڵای کوڕی سەلام کە لەم بارەیەوە پرسیاریان لێکرد، وتی: ئێمە پێغەمبەر ﷺ لەکوڕی خۆمان باشتر دەناسین.

قورەیـشیەکان زۆرجـار دەچوونە لای ماڵـە جولەکـەکانو دەربـارەی پێغەمبـەر پرسیاریان لێدەکردن، ئەوانیش نیشانەو رەوشـتەکانی پێغەمبـەری ئـاخیر زەمانیـان بۆ روون دەکردنەوە.

ئیمامی ثەعلەبی لـەئیبنو عەبباسـەوە ریوایـەت دەکا: دەفـەرموێ: دانیـشتوانی مەککە شاندێکیان نارد بۆلای جولەکەکانی یەثریب بۆ ئـەوەی دەربـارەی پێغەمبـەر ﷺ پرسیاریان لێبکەن ئەوانیش لەوەڵامدا وتیان: بەڵێ کاتی رەوانەکردنی هاتووەو هەندێ لەرەوشتەکانی پێغەمبەریشیان بۆ رون کردنەوە[1].

---

[1] (١) تەفسیر مەراغی ج١٩/١٠٥.

ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە ئەو قورەیشییە سەرڕەقە نەفامانە وێڕای هەبوونی ئەو هەموو بەڵگانە سورن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیانو بەڵگەو دەلیل کاریان تێ ناکاو پەند ئامێز نابنو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَاهُ عَلَى بَعْضِ الْأَعْجَمِينَ، فَقَرَأَهُ عَلَيْهِمْ مَا كَانُوا بِهِ مُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئێمە قورئانمان بەزوبانی عەرەبی بۆسەر پێغەمبەرێکی زمان عەرەبو رەگەز عەرەب ناردۆتە خوارێ، بەزمانێکی رەوانو بەلیغ بۆیان دەخوێنێتەوە، دەیبیسنو تێی دەگەنو دەزانن: ئەوە ئاخاوتنێکی موعجیزەو لەکەلامی بەشەر ناچیو ئادەمیزادو جندۆکە ناتوانن کەلامی ئاوا بخەنەڕو، کەچیوێڕای ئەوەش هەرئیمانی پێناهێننو ئینکاری دەکەنو جارێك دەڵێن: شیعرە، دەمێك دەبێژن: چیرۆکە کۆنە، برێك کاتیش بەقسەی کاهینو کۆڵەوە نانی لەقەڵەم دەدەن.

دەی ئەگەر قورئانمان نازڵبکردایە بۆسەر هەندێ کەسی ناعەرەب، بمان ناردایە بۆسەر کەسێك نەتوانێ عەرەبی بخوێنێتەوەو عەرەبی نەزانیایەو نەیتوانیایە بەسەریان دا بیخوێنێتەوە دوبارە پێی کافر دەبوونو بڕوایان پێنەدەکرد، دەیانگوت: تێی ناگەینو نازانین چی دەڵێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أَعْجَمِيّاً لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ ؟﴾ (فصلت/٤٤).

بەکورتی وەك یەك وایە چ جوداوازییەکی نیە ئێمە قورئان نازڵ بکەین بۆسەر پیاوێکی عەرەبی ناسراوو رابوردو پاكو بێگەردو بەزوبانێکی عەرەبی فەصیح و بەلیغ و ئاشکرا، گوێیان لێ بێو تێی بگەنو بیناسنو بزانن کەلامێکی موعجیزەو سەرئاسایە، یان قورئانەکە نازڵ بکەین بۆ سەر پیاوێکی ناعەرەب چ لەزمانی عەرەبی نەزانێ لەهەردوو حاڵەکەدا ئەوان بڕوایان پێی نابێو ئیمانی پێناهێنن!!

ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکراو نمایانە لەسەر دڵڕەقیو بێ ویژدانی کافرەکانی قورەیشو رۆچونیان لەکوفرو بێدینی دا، ئەوەتا لەگەڵ ئەوەشدا نهێنی فەصاحەتو بەلاغەتی قورئانیان زانیوەو لێی حاڵیبوون لەسەر زوبانی کەسێکی وەکوو حەزرەتی موحەممەد: کە رابووردو بنەچەی دەزاننو لەوەپێش

ناسیویانەو بە(الأمین) لەناویان دا بەناوبانگ بووە بۆیان دەخوێندرێتەوە، کەچی بەهۆی لوت بەرزیو دەمارگیریان پشتی لێهەڵدەکەنو ئیمانی پێناهێنن.

ئەمجار پەروەردگار ئەم هەڵوێستە ناشیرینەیان جەخت دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ سَلَكْنَاهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: وەکوو چۆن رەوشتی بەدرۆخستنەوەیان بۆ قورئان بەخوێندنی کابرایەکی ناعەرەب لەدڵدا چەسپاوەو جێگیرمان کردوە، هەر بەو جۆرەش بەدرۆخستنەوەی قورئان لەدڵی قورەیشییەکان دا چەسپاوەو جێگیرمان کردوە، بەکورتی رەوشتی دڵرەقیو بڕوانەکردن بەقورئانو رەتکردنەوەی، شتێکی سروشتییەو لەگەڵ خوێنو ئێسقانیان تێکەڵاوبووە.

قورئانیان بەهۆی ئادەمیزادی عەرەب یان ناعەرەب بۆ بنێرین ئەوان لەهەڵوێستی خۆیان لانادەنو واز لەکوفرو بێدینی ناهێننو سوورن لەسەر بتپەرستی. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَاباً فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ (الأنعام/٧).

ئەمجار زیاتر جەخت لەسەر مانای پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لا يُؤْمِنُونَ بِهِ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الآلِيمَ﴾ ئەوان ئیمان بەحەقو راستی ناهێنن، بەکافری دەمێننەوەو لەدڵدا ئینکاری قورئان دەکەنو بەدرۆی دەخەنەوە هەتا بەچاوی خۆیان عەزابی سەخت دەبیننو یەخەیان دەگرێ.

﴿فَيَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ ئەو عەزابە سەختە بەناگەهانو گۆزو گومەت توشی ئەوانە دەبێ: کە قورئان بەدرۆدەخەنەوە، بەخۆیان نازانن: کە یەخەیان دەگرێو تێکیانەوە دەپێچێ؛ جائەو کاتە:

﴿فَيَقُولُوا هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ دەڵێن: دەبێ ئێمە کەمێ مۆڵەت بدرێین بۆ ئەوەی بەخۆماندا بچینەوەو خوداپەرستی بکەین ؟؟ واتە ئاواتە خوازی ئەوە دەبن کە کەمێك مۆڵەت بدرێن. بەڵام نەمۆڵەتیان دەدرێو نەپەشیمان بوونەوەشیان سودی

دەبێ، بۆ خۆشیان دەزانن: کە لەقیامەت دا پەنانەماون‌و هیچ شتێك دادیان نادا، وەلێ قسەیەکە دەیکەن‌و دەیانەوێ دڵی خۆیان تۆزێ خۆش بکەن!

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوە وەزع‌و حاڵیان دەبێ، وێڕای ئەو هەموو هەڕەشانەو ترساندنانە نەفامی‌و ئەحمەقی سەرو دڵی گرتوون‌و داوای زووهاتنی عەزاب دەکەن. ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ؟﴾ ئایا ئەوانە پەلە لەهاتنی عەزابی ئێمەدەکەن؟ بە تەحەدداوە دەڵێن: ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفاً مِّنَ السَّمَاءِ﴾ (الشعراء/١٨٧) یان دەڵێن ﴿فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا﴾ (الأعراف/٧٠)

ئەمجار کە عەزابەکەشیان بۆ دێ داوای مۆڵەتدان‌و دواکەوتنی دەکەن؟! ئەوان بۆیان روون بۆتەوە، چۆن گەلە ستەمکارەکانی پێشوومان لەناوبردن‌و چۆن ئاسەوارمان بڕینەوە.

﴿أَفَرَأَيْتَ إِنْ مَتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ، ثُمَّ جَاءَهُمْ مَا كَانُوا يُوعَدُونَ، مَا أَغْنَى عَنْهُمْ مَا كَانُوا يُمَتَّعُونَ﴾ ئایا وادەزانن: کە داهاتووی کار وەکوو چۆن ئەوان بۆی چوون ئاوا دەبێ؟ ئەی موخاطەب! گریمان ئێمە ژیانی ئەوانمان درێژکردەوەو لەلەزەت‌و خۆشی دا تەمەنی درێژمان پێدان، دوایی عەزابی هەڕەشە پێ لێکراومان بۆ ناردن‌و بەناگەهان‌و یەخەی گرتن، ئایا ئەو خۆش رابواردنە، ئەو نازو نیعمەت‌و خۆشییە عەزابەکەیان لەسەر لادەبەن؟ یان لێیان سوك دەکەن؟ نەخێر تەمەنی درێژو پڕ نازو نیعمەت، نەعەزابیان لەسەر لادەبا نەلێیان سوك دەکا، ماوەی عەزابی قیامەتیش کۆتایی نایەو بێبڕانەوەیە.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ﴾ (البقرة/٩٦) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى﴾ (اللیل/١١).

بەکورتی خۆشڕابواردنی درێژخایەن، عەزابی خودا رەت ناکاتەوە. چەندێك ژیان بەخۆشی بەسەر بەرن ئەوکاتە عەزابی خودا یەخەیان دەگرێ هیچیان لەبیر

نـامێنێ هـەروا دەزانــن قەتقـەت خۆشـیان نـەبینیوە، وەكـوو لەشـوێنێكی تـردا دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا﴾ (النازعات/٤٦).

لـە فـەرموودەی صـەحیحدا هـاتووە دەفـەرموێ: ڕۆژی قیامـەت كـافر دێـنن یـەكجار لـەئاگری ڕۆدەكـەن‌و دەری دەهێننـەوە، ئـەمجار پێـی دەڵـێن: ئـەرێ قـەت لـەززەت‌و خۆشـیت بینیـوە؟ دەڵـێ: نـەوەڵلاهی هـەرگیز خۆشـیم نـەدیوە. ئـەمجار موسوڵمانێكی ژیان ناخۆشی دونیا دەهێنن بەئاوی بەهەشت جارێك دەیشۆرن دوایی پێـی دەگـوترێ: ئـەرێ قـەت ناخۆشـیت بینیـوە؟ دەڵـێ: نـاوەڵلاهی قـەت ناخۆشـیم نەبینیوە.

ئـەمجار پـەروەردگار یاسـای عەداڵـەتكاریی خـۆی ڕادەگەیـەنی‌و دابو نـەریتی خۆی لەبوونەوەردا ڕون دەكاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ إِلاَّ لَهَا مُنذِرُونَ، ذِكْرَى وَمَا كُنَّا ظَـالِمِينَ﴾ ئێمـە هـیچ شارو گونـدێكمان‌وێران نـەكردوە مەگـەر دوای ئـەوەی: كـە پێغەمبـەرمان بـۆ سـەر نـاردون بانگـەوازی دانیـشتوانی ئەوشـارو گوندانەیان كردوە بۆ خوداپەرستی‌و لەعەزابی خـودا ترسـاندویانن‌و مـوژدەی نـازو نیعمــەتی بەهەشــتیان بــدەنێ ئەگــەر ئیمــان بهێــنن‌و پابەنــدی فــەرمان‌و جڵەوگیرییەكانی پەروەردگار بن.

نــاردنی فروســتادە بــۆ ســەریان‌و بانگــەوازییكردنیان بــۆ یادخــستنەوەو ئاگاداركردنەوەیانـە دەربـارەی ئـەوەی پێویـستە ئـەنجامی بـدەن. بـەهیچ جۆرێـك‌و لەهیچ حاڵێك دا ئێمـە ستەممان لێنـەكردون‌و بـەناڕەوا عـەزابمان نـەداون، بـەڵكوو بەهۆی سووربونیان لەسەر بێدینی‌و پەرستش كردنیـان بـۆ غـەیری ئێمـە توشـی ئەودەردە هاتوون! ئێمە دروستمان كردون عیبادەتی غـەیری ئێمـەیان كـردوە، نـازو نیعمـەتمان پـێ داون شـوكرانە ژمێرنـەبوون، سـپڵەو پێنـەزان بـوون، بەشـێك لەرەحمـەتی خـودا ئەوەیـە تـا پێغەمبـەر نـەنێرێ و بانگـەوازی دانیـشتوان نـەكا ئەوانیش بەدرۆی نەخەنەوە عەزابی خۆی نارژێنێ بەسەریان دا.

ئەمە مەبدەئێکەو چەند جار قورئان ئاماژەی پێکردوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الإسراء/١٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ (القصص/٥٩).

بێگومان پەروەردگار عەهدو پەیمانی سروشتی لە ئادەمیزاد وەرگرتووە: کە بەتاکو تەنها بیناسن‌و تەنها بەندایەتی ئەو بکەن. فیطرەتیش بۆ خۆی هەست بەهەبوونی پەروەردگار دەکا، بەمەرجێ لەرێڕەوی خۆی لانەدا.

وێڕای ئەوەش پەروەردگار بەڵگەی جۆراو جۆری لە بوونەوەردا بڵاو کردۆتەوە، هەموویان نیشانەی هەبوونی خودای تاک‌و تەنهاو بەدیهێنەرە.. جا ئەگەر ئادەمیزادەکان، وادەو پەیمانی فیطرەتیان لەبیرچۆوە، بەڵگەی ئیمانیان فەرامۆش کردن، خودا ترسێنەری بۆ ناردون‌و وادەو بەڵێنی فەرامۆش کراویان وەبیر ئادەمیزادەکان هێناوەتەوە، لەخەوی غەفڵەت رایان پەڕاندون.

کەوابوو پێغەمبەرایەتی وەبیرخەرەوەی بیرچووەوانە، ئاگادارکەرەوەی بێئاگایانە، ئەمەش زێدە فەضل‌و رەحمەتی خودایە بۆ بەندەکانی. جا ئەگەر وێڕای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە: سەرباری ئەو وادەو بەڵێن وەرگرتنانە، ئەمجا پێغەمبەر ناردن‌و بانگەوازی کردن‌و ترساندن‌و موژدەپێدان، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئادەمیزادەکان موسوڵمان نەبن‌و نەیەنەسەر رێبازی راست، ئەگەر خودا عەزابیان بەسەردا بدا کەی ستەمە؟ بەڵکو ئەوپەڕی عەدالەتە.

ئەمجار پەروەردگار رەددی موشریکەکان دەداتەوە: کە دەیانگوت: موحەممەدﷺ کوڵەوە نانییە. ئەو پەیامەی بۆی دێ وەکوو ئەو ئیحاو جەنجەلوتە وایە: کە شەیاتینیەکان بە کۆڵەوەنانیەکانیان دەگەیاند. دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ الشَّيَاطِينُ﴾ ئەم قورئانە شەیاتینی‌و جندۆکە وەریان نەگرتووە بە پێغەمبەریان گەیاندبێ، وەکوو چۆن جەنجەلوت‌و شتی ئاوا بەکاهینەکان رادەگەیەنن.

﴿وَمَا يَنْبَغِي لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ تەنانەت شەیاتینیو جندۆکە رایەیان ناکەوێو ناتوانن ئەوکارە ئەنجام بدەن.

﴿إِنَّهُمْ عَنْ السَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ بێگومانو جندۆکەو شەیاتینی دوورخراونەوە لەوەی ئاخاوتنی فریشتەی تایبەت بەنیگا ببیسن، بەڵکوو ڕێگایان نادرێ هیچ ئاخاوتنێکی فریشتەی ئاسمانەکان ببیسن.

**بەکورتی شەیاتینی رایەی ئەوەیان ناکەوێ قورئان لەعالەمی بالا وەربگرنو بەنیگا بۆ پێغەمبەری بهێنن بەسێ بەڵگە:**

١- نیگا هێنان بۆ پێغەمبەرو فێرکردنی ئیشی ئەوان نیە، چونکە رەوشتی ئەوان فەسادو گومڕاکردنی ئادەمیزادە. قورئانیش هەمووی پەندو ئامۆژگارییە، فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەیە، هیدایەتو نوورو بورهانە، دەی لەنێوان قورئانو کارو کردەوەی شەیاتینی دا ئاسمانو ڕێسمانە.

٢- ئەوان ناتوانن: قورئان وەربگرنو بەنیگا بۆ موحەممەدی بهێنن، توانای تەحەممول کردنی قورئانیان نیە وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ (الحشر/٢١).

٣- ئەگەر شیاوی وەرگرتنیش بنو بتوانن تەحەممولی بکەنو بیگەیەنن هەر بۆیان ئەنجام نادرێ، چونکە شەیاتینی دوور دەخرێنەوە لەبیستنی قورئانو ناتوانن توخنی بکەون، چونکە ئاسمان پڕە لەپارێزەرو تیر ئەستێرە پارێزگاری قورئان دەکەن لەکاتی نازڵبوونی بۆسەر دڵی پێغەمبەرﷺ.. هیچ شەیاتینییەك بۆی ناکرێ پیتێکی قورئانی دەست بکەوێ. بەوپەڕی پارێزراویو دەست لێنەدراوی لەعالەمی بالاوە ئەو نیگایە بەهۆی حەزرەتی جوبرەئیلەوە دەگاتە سەر دڵی پێغەمبەرو شەیاتینی رایەیان ناکەوێ توخنی بکەون.!

## ئاداب‌و رەوشتی بانگخوازانی ئیسلام‌و ئەرکی سەرشانیان

﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ ﴾

دوای گێڕانەوەی چیرۆکی پێغەمبەران‌و بەڵگە هێنانەوە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدﷺ هەروەها رەتدانەوەی بوختان‌و بیرو بۆچونی موشریکەکان. خیطاب دەکاتە خودی پێغەمبەرو دەیترسێنێ لەوە هاوەڵ بۆ خودا دابنێ!

هەڵبەتە هاوەڵ دانان بۆ خودا لەلایەن پێغەمبەرەوە شتێکی دوورو نەگونجاوە، بەڵام بۆ ئەوەیە: کە غەیری پێغەمبەر خۆیانی لێ دووربخەنەوەو توخنی نەکەون، چونکە هاوەڵ دانان تاوانێکی هێندە گەورەو ماڵوێران کەرە، لە فەرزێکدا ئەگەر پێغەمبەریش ئەنجامی بدا لێی قبوڵ ناکرێ‌و دەکەوێتە بەر عەزابی خودا جادەبێ غەیری پێغەمبەرﷺ چۆنی لێ قبوڵ بکرێ.

لەکاتێکدا پێغەمبەرﷺ هەڕەشەی بەعەزاب لێبکرێ ئەگەر لەفەرزی مەحاڵ دا شتێکی تری کردە هاوەڵی خودا! ئەی دەبێ غەیری پێغەمبەر وەزعیان چۆن بێ ئەگەر ئەو تاوانە ئەنجام بدەن؟؟ بەکورتی لەم تاوانەدا محابات‌و لێبوردن نیە! هەرکەسێ ئەم تاوانە گەورەیە ئەنجام بدا عەزابی سەختی خودا دەچێژێ!

دەفەرموێ: ﴿فَلا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتَكُونَ مِنْ الْمُعَذَّبِينَ﴾ ئەی موحەممەد! نەچی لەتەك خودادا خودایەکی تر بپەرستی، نەکەی هاوەڵ بۆ خودا دابنێی، ئەگەر وابکەی بەتەئکید لەپێڕی ئەوانە دەبی: کە عەزابی خودا دەیانگرێتەوە، ئەمە مەبدەئێکە ئەم لاو ئەولای تێدا نیە هەرکەسێ تەنانەت پێغەمبەریش هاوەڵ بۆ خودا دابنێ خودا عەزابی دەدا ودەیخاتە ناو دۆزەخەوە!!

دوای ئەوەی پەروەردگار هەڕەشەی لەخودی پێغەمبەرﷺکرد، ئەمجار ئەرکی ترساندنی خێزان و عەشیرەتەکەشی دەخاتە ئەستۆو فەرمانی پێدەکا: کە بانگەوازییان بکا، مژدەی بەهەشت بدا بەفەرمان بەرداران و سەرپێچیکاران لەعەزابی دۆزەخ و ئاگری سەخت بترسێنێ، دەفەرموێ:

﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ﴾ خزمە نزیکەکانت بترسێنە، پێیان رابگەیەنە: کە ئەگەر لەسەر شیرك و گومڕایی بمێننەوەو ئیمان نەهێنن سزای سەختی دۆزەخ چاوەڕێیانە.

بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردوە دەفەرموون: کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمبەر ﷺ هات و چووە سەر کێوی صەفا، ئەمجار هاواری کرد (یاصباحاه)! ـ لەکاتی خەتەردا ئەم رستە دەگوترێ: ئیتر ئەوەی گوێی لەم هاوارەبوو یان خۆی هات یان نوێنەری نارد، هەموو خەڵك لێی کۆبونەوە.

ئەمجار فەرموی: ئەی خێڵی (عبد المطلب) ئەی خێڵی فیهر! ئەی خێڵی لوئەی! ئایا ئەگەر من هەواڵتان بدەمێ: کە سوپایەکی ئەسپ سوار لەو دیو ئەو کێوەیەوە دەیەوێ لەنکاوێك لەبەرەبەیاندا هەڵمەتتان بۆ بێنێ، ئایا پێم بڕوا دەکەن؟!

هەموو ئامادەبووان تێکڕا وتیان: بەڵێ بڕوات پێ دەکەین.

ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فأني نذير لكم بين يدي عذاب شديد) دەبزانن: کە من ترسێنەرم بۆتان لەپێش هاتنی عەزابێکی بەئێش و سامناك. ئەبو

لەهەب وتی: دەك لەناوچی دەك ماڵت وێران بێ، ئایا ئەمە نەبێ هیچ شتێکی تر نەبوو ئەم کۆبوونەوەی بۆ ئەنجام بدەی؟!

ئیتر پەروەردگار سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ....﴾ ی نازڵ کرد. ئیمامی موسلیم بەزنجیرەی خۆی لەخاتوو عائیشەوە دەفەرموێ: کە ئایەتی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ نازڵبوو پێغەمبەرﷺ هەستاو فەرموی: ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد! ئەی صفیەی کچی (عبدالمطلب) ئەمن ناتوانم لای خودا هیچتان بۆ بکەم. لەماڵی دونیا چیم هەبێ داوام لێبکەن دەتاندەمێ بەڵام ناتوانم تۆزێك عەزابی خوداتان لێ دووربخەمەوە.

موسلیمو تیرمیذی بەزنجیرەی تیرمیذی لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن. دەفەرموێ: کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمبەرﷺبانگی قورەیشییەکانی کرد بەگشتیو بەتایبەتی فەرمووی: ئەی کۆمەڵی قورەیش! خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن، ئەی کۆمەڵی بەنی کەعب خۆتان لە ئاگر رزگاربکەن، ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد! خۆت لە ئاگر رزگاربکە، چونکە وەڵلاهی من ناتوانم تۆزقاڵێك عەزابی خوداتان لێ دووربخەمەوە بزانن من لەگەڵ ئێوەدا خزمایەتیم هەیە، لەدونیادا صیلەی رەحم بەجێ دێنمو لەقیامەتدا هیچم بۆ ناکرێ.

ئەم ریوایەتانەو هی تریش ئەوەمان بۆروون دەکەنەوە: کە پێغەمبەرﷺ بە چ شێوەیەك نیگای وەرگرتووەو چۆنی گەیاندوە، چۆن خێرا خزمو عەشیرەتو هۆزو دەوروبەری خۆی بانگ کردوە، ئەرکی سەرشانی ئەنجام داوەو کارەکەیانی حەواڵەی خودا کردوە، بۆی روونکردونەوە کە خزمایەتیان بۆ پێغەمبەر دادیان نادا ئەگەر کردەوەیان خراپ بێ.

بانگەوازیو ترساندنو مـوژدەدان بەشێك بووە لەئەرکی سەرشانی پێغەمبەرﷺ وەکوو لەچەند شوێنێکی قورئان دا ئاماژەی پێدەکاو دەفەرموێ: ﴿وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا﴾

(الأنعام/٩٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ (الشورى/٧) یان دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً﴾ (الفرقان/١).

هەروەها پەروەردگار بۆ پێغەمبەری خۆی ڕون دەکاتەوە: چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو موسوڵمانانە بکا: کە بەپیر بانگەوازییەکەیەوە دێن. دەفەرموێ: ﴿وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ باوەشی سۆزی خۆت بۆ موسوڵمانان بگرەوە بە نەرم و نیانی مامەڵە لەگەڵ ئەوانەدا بکە: کەبە پەیامەکەت باوەڕیان هێناوە، ئەو جۆرە هەڵس و کەوتە نەرم و نیانەت زیاتر دڵی ئەوان بەئیسلامەوە پەیوەست دەکا.

هەڵبەتە پێغەمبەرﷺ بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ هاوەڵانیدا نەرمونیان و دڵسۆز بووە، ڕەوشت و ئەخلاقی قورئانی بووە، ژیان و هەڵسوکەوتی تەرجەمەیەکی پڕاو پڕی قورئان بووەو بەمو لێی لانەداوە.

جا وەکوو فەرمانی پێکردوە لەگەڵ موسوڵمانان خاوەن سۆزو لەسەرخۆبێ، هەروەها فەرمانیشی پێکردوە لەگەڵ یاخیبوان و سەرڕەقەکان دا توندو تیژبێ دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ ئەگەر ئەوانەی دەیانترسێنی لێت یاخی بوون و پابەندی فەرمان و جڵەوگیریەکانت نەبوون، پێیان بڵێ: من لێتان بەریم و بەرپرسیاری کاری ئێوە نیم و ڕۆژێ سزای کردەوەکانتان وەردەگرنەوە. هەڵبەتە ئەم ئایەتە مەککەییەو ئەو کاتە پێغەمبەر فەرمانی بەشەڕ لەگەڵ موشریکەکان پێنەکرابووە.

ئەمجا ڕێنمونی پێغەمبەر ﷺدەکا: کە پشت بە خودا ببەستی و دەفەرموێ: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾ هەموو کارو بارێکت حەواڵەی خودا بکە، ئەو دەتوانێ پڕاوپڕ تۆڵە لەدوژمنانی بسێنێتەوە، خاوەن سۆزو بەزەییە بۆ خۆشەویستانی، ﴿الَّذِي يَرَاكَ حِينَ تَقُومُ﴾ ئەو خودایەی کاتێک هەڵدەستی بۆ نوێژکردن بەموسوڵمانەکان ئاگای لێتەو دەتبینێ.

﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ﴾ هەروەها ئاگای لەحاڵەتی چوونە رکوع و چوونە سوژدەتەو چاوی لێتە: کە دەچیە رکوع و سوژدەو پێشنوێژی بۆ خوداپەرستان دەکەی. بۆیە نوێژکەرانی بە (ساجدین) ناوبرد چونکە نزیکترین کاتی بەندە لەخودا ئەو کاتەیە کە لەسوژدەدایە.

﴿إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان پەروەردگار شنەوایە بۆ وتەو ئاخاوتنی بەندەکانی، زاناو ئاگادارە بەکردەوەو جمو جوڵیان، بەنیازو مەبەستیان بەشاردراوەی نێو دڵیان. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾ (یونس/٦١).

ئیبنوعەباس دەفەرموێ: مانای ﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ﴾ بریتییە لەگوێزانەوەی رەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ لەپشتی باوکانی دا، هەر لە حەزرەتی ئادەمو حەزرەتی نووح و حەزرەتی ئیبراهیمەوە هەتا لەدایکبوونیو بوونی بە پێغەمبەر ﷺ .

هەندێ لەزانایان ئایەتی ﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي السَّاجِدِينَ﴾یان کردوە بەبەڵگەی ئەوە کەباوكو دایكی پێغەمبەرﷺ موسوڵمان بوون ئەو حەدیثەشیان کردوە بە بەڵگە لەسەر رایەکەیان: کە دەفەرموێ: (لم أزل أنقل من أصلاب الطاهرين الى أرحام الطاهرات) بەدرێژایی مێژوو من لەپشتی باوکانی خوداپەرستەوە گوێزرامەوە بۆ منداڵدانی دایکانی خوداپەرست لە پشتی باوکانەوە رژێندرامە ناو رەحەمی داوێن پاکانەوە.

## ڕەددانەوەی بوختانی موشریکەکان: کە دەیانگوت: موحەممەد کاهینو شاعیرە

﴿ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾ ﴾

ئەمە جەولەی کۆتایی ئەم سورەتە پیرۆزەیە دەربارەی قورئان، لەجاری یەکەمدا ئەوەی چەسپاند: کە ئەم قورئانە لەخوداوە نازڵ بووە، دوایی ئەوەی ڕاگەیاند: کە جندۆکەو شەیاتینی نازڵیان نەکردووەو ئەوان ناتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن. لێرەش دا ئەوە دەچەسپێنێ: کەشەیاتینی پەیام بۆ ئادەمیزادی وەکوو موحەممەد ناهێنن، ئەوان نازڵ دەبن بۆ سەر کاهینو کوڵەوەنانییان، نەك بۆسەر پێغەمبەری دڵسۆزو ڕاستگۆ، نازڵ دەبن بۆسەر کاهینو فالگرەوەکان، نەك بۆ سەر پێغەمبەری ئەمینو خاوەن مەنهەجو هەدەفو عەقیدە.

جا هەر وەکوو قورئان لەوجۆرە نیە: کە کاهینو فالگرەوەکان لەشەیاتینی دەبیسن، شیعرو کەفو کوڵی ناو دەروونی ئەو شاعیرانەش نیە: کە غەرقی دەریای

خەیاڵو سەرگەردانی سارای قسەو ئاخاوتنن، قسەکانیان ڕەنگدانەوەی حەقیقەتو واقیع نین، نموونەی ڕاستی ناودڵو قەناعەتی عەقڵی نین.

جا چونکە ئیعجازی قورئان لەروی ماناو وشەوەیە، موشریکەکان لەبارەی ماناوە رەخنەیان لێدەگرت دەیانگوت: ئەوە جۆرێکە لەو جەنجەلوتانەی شەیاتینی بەگوێچکەی کاهینەکانی دادەن، لەبارەی وشەو رستەکانیشەوە دەیانگوت ئەمە جۆرێکە لەقسەو ئاخاوتنی شاعیرەکان.

ئیتر پەروەردگار رەددی هەردوو بیرو بۆچونەکانی دانەوەو ئەوەی رون کردەوە: کە قورئان لەوجۆرە ئاخاوتنانە ناچێو حاڵو وەزعی پێغەمبەر خۆیشی جوداوازە لەحاڵو وەزعی شاعیرو کاهین، دەفەرموێ:

﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَى مَنْ تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ﴾ ئایا پێتان بڵێم شەیاتینی بۆ سەر کێ نازڵ دەبنو جەنجەلوتو تورەهاتی خۆیان بەگوێچگەی کێ دا.دەدەن؟

﴿تَنَزَّلُ عَلَى كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ نازڵ دەبن بۆسەر درۆهەڵبەستو تاوانباران، بۆ سەر درۆزنو فاسقو چەقاوەسوو دەس بڕەکان: لەکاهینو فالگرەوەکانی وەکوو (شق) ی کوڕی رەهەمو سەطیحی کوڕی رەبیعەو مولەبلیمەو طولەیحە لەو کافرو خودا نەناسانەی بانگەوازی ئادەمیزاد دەکەن بۆ ڕێبازی شەیتانو شوێنکەوتنی. دەی موحەمەد دژی ڕێبازی شەیتانەو نەفرینی لێ دەکا. کاهینەکان زۆربەی شتیان درۆو دەلەسەیەو چاو بەستە، موحەمەد لەو هەواڵانەی داویەتی هەمووی ڕاستەو درۆی تێدا نەبوە.

﴿يُلْقُونَ السَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَاذِبُونَ﴾ کاهینەکان گوێچکە یان بۆ شەیاتینییەکان کلۆر دەکەن ، درۆو دەلەسەیان لێ وەردەگرن ، هەرچی شەیاتینی بەگوێچکەی کاهینە کانی دادەن زۆربەی زۆری درۆو بوختانو گومانو نیشانەن ، زۆربەی شەیاتینی درۆزنو بوختان هەڵبەستنە ، چونکە ئەوان شتێك بەکاهینەکان دەڵێن: کە نەیان بیستووە، بەدرۆە دەڵێن: فلانە شتمان لەعالەمی باڵا بیستوە نەیان

بیستوە.. کاهینەکانیش درۆزنـن دەڵێن: شـەیاتینی فلاّن شـتیان پـێ گووتـوین، کـە لەراسـتی دا پێیـان نـەگوتون. کـەوابوو بـیرو بۆچـونی کـاهین‌و فالگرەوەکـان لەسـەر درۆو دەلەسە دامەزراوەو بەتاڵ‌و پوچە!!

یان راناو لە ﴿يُلْقُـونَ﴾ دا دەگەرێتـەوە بـۆ ﴿الـشَّيَاطِينُ﴾ واتـە: شـەیاتینییەکان ئەو شتە لەعالـەمی فریـشتەوە دەبیـسن بـەگوێی کاهینـەکانی دادەدەن، ئـەو وشـەو رستانەی لەعالەمی نهێنیدا بەسەریدا ئاگـادار دەبـن‌و نـاوە نـاوە دەیـدزن هەنـدێکی درۆو دەلەسە پێـوە دەنـێن‌و بەگوێـچکەی کاهینـەکانی دادەدەن، دەبـێ بڵـێین: ئەمـە پێش ئەو کاتە بووە: کە جندۆکـە لەبیـستنی ئاخـاوتنی عالـەمی بـالآ مـەنع بکـرێن بەتیر ئەستێرەو ئاگرباران!

بەکورتی واقیع باشترین شاهیدو گەواهی دەرە وەکوو خۆری ناوەراستی ئاسمـان ئاشکراو عەیانە کـە جـوداوازی نێـوان پێغەمبـەرو کاهینـەکان عاسمـان‌و رێـسمانە ، هەرچـی پێغەمبـەرە ﷺ لەئاسمانـەوە هـەواڵی پێـدراوە، هـەمووی راسـتەو لەگـەڵ حەقیقەت‌و واقیع دا یەکسانە، بەدرێژایی ژیانی پڕ فەڕو بەرەکەتی، جگە لەراسـتی هیچی لێنەبیستراوە، بەپێـچەوانەی ئـەوەوە هەرچـی کاهینـەکان هـەواڵیان پـی داوە جگە لەدرۆو دەلەسە هیچی تر نەبوە، بۆیـە مێـژوو نـەفرینی لێکـردوون‌و بەچـاوی سوکەوە بۆیـان دەڕوانـی‌و عـەقڵ قێـزی لێیانـە توڕرەهـات‌و قـسە پـڕو پوچـەکانیان کەس وەریان ناگرێ‌و جگە لەمنداڵ‌و پرو پیرێـژن‌و پیـاوی سـافیلکەو نـەفام کەسـی تر، بڕوایان پێناکا.

ئـەمجار دوای ئـەوەی پـەروەردگار جـوداوازی نێـوان حـەزرەتی موحەممـەدو کاهینـەکانی رون کـردەوە، رەددی ئـەو کافرانـە دەداتـەوە: کـە دەیـانگوت بۆچـی ناگونجێ شەیاتینی قورئان بۆ موحەممەد بێنن؟ وەکوو چۆن جەنجەلوت‌و تورەهات بۆ کاهینەکان دەهێنن؟ یان هەروەکوو چۆن شیعر بۆ شاعیرەکان دەهێنـن؟؟ چونکە لـەناو کۆمـەڵگای موشـریکەکانی ئـەو رۆژگـارەدا وابـاو بـوو: کـە هـەموو کاهینێـك

شەیتانێکی هەیە، فاڵو جەنجەلوتی فێردەکا، کە هەموو شاعیرێك شەیتانێکی هەیە شیعری فێردەکا!

دەفەرموێ: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾ گومڕاو سەرلێشێواو لە ئادەمیزادو جندۆکە کەشوێنی شاعیرەکان دەکەون، ئەوانەی لەرێبازی حەقو ڕاست لایان داوەو بەخەرافاتو تورەهات هەڵخەڵەتاون، شوێن شاعیر دەکەون! بەڵام شوێنکەوتوانی حەزرەتی موحەممەدﷺ هەموویان هیدایەت دراوو پەیڕەوکاری ڕێبازی حەقو ڕاستن پابەندی فەرمانو جڵەو گیریەکانی پەروەردگارن، عیبادەتکارو خاوەن بڕواو مرۆڤ دۆستن.

**ئەمجار پەروەردگار بەدوو بەڵگە گومڕابوونی شاعیرەکانو شوێن کەوتوانیان روون دەکاتەوە، دەفەرموێ:**

١- ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾ ئەتۆ نابینی ئەی موحەممەد! یان ئەی بیسەر! کە شاعیرەکان دەم لەهەموو جۆرە قسەو ناخاوتنێکەوە دەدەن، خۆیان خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە، ئەمڕۆ قسەیەك دەکەن، سبەی هەڵی دەوەشێننەوە، ئێستا مەدحی شتێك دەکەن تاوێکی دی زەمی دەکەن، ئێستا شتێك بەگەورەو گران لە قەڵەم دەدەن پاشان بەپێچەوانەوە بێ نرخ و بەهای دەکەن!

ئەم هەڵس‌وکەوتە ناجوامێرانەی شاعیران نیشانەی ئەوەیە مەبەستیان دەرخستنی حەقو ڕاستی نییە، نایانەوێ واقیع ببینن، حەق پەرست بن ، کۆمەڵێکی هەوەس بازی خەیاڵ پەروەرو سنوور بەزێنن! بەڵام پێغەمبەرﷺ حەق بێژو حەق خوازە، ڕاستگۆو واقیع بینە، بانگەواز بۆ یەك ڕێباز دەکات. ئەویش ڕێبازی خودا پەرستیو هەوڵدانە بۆ بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەت!

٢- ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لا يَفْعَلُونَ﴾ زۆربەی زۆری قسەو ناخاوتنی شاعیران درۆو دەلەسەیە، ئەوی دەیڵێن: نایکەن، ئەوی نایکەن دەیڵێن بەقسە بەخشندەیی پەسەند دەکەن بەکردەوە ڕژدو چروکن.

ناموس و شەرەفی ئەمو ئەو لەکەدار دەکەن هەمیشە خەریکی فاحیشەو فەسادن، خۆفش دەکەنەوە، خۆ هەڵ دەنێنەوە، ئەخلاق دەڕوخێنن، بەخەیاڵ چەند عالەمێك دروست دەکەن ، بەوەهمو ئەندێشە تێیان دادەژین بەخەیاڵ چەند کردەوەو دیمەنێك رەنگرێژ دەکەنو ئەمجار ئەو خەیاڵاتە دەکەنە حەقیقەتو شتی لەسەر هەڵدەچنن و وەکوو ئەو موعەلیمەی جاحظ لە(نوادر المعلمین)دا باسی دەکا تازیە بۆ یاری بەخەیاڵ دروستکراوی لەدونیا دەرچووی نەدیدەی دادەنێ.

بەقسە ڕۆستەمی مازندەرانو حاتەمی تایی و مەلا مستەفای بارزانیو هەیاس و لوقمانن. بەکردەوە لە بەرانبەر دوژمندا ئەژنۆیان دەلەرزیو لە سەنگەردا گو بە خۆیان دا دەکەنو موعەلیمە عاشقەکەی لەمەڕ جاحیظن.

بەڵام حەزرەتی موحەممەد بەپێچەوانەی ئەو دیاردانەوە بووە، هەرشتێکی فەرمانی پێکردبێت خەڵکی بۆ هەڵنابێ خۆی بەکردەوە ئەنجامی داوە، هەرشتێکی لە خەڵکی مەنع کردبێ پێش ئەوان خۆی لێدوور گرتووە، ڕاستاڵو دڵسۆزو واقیع بینو خوداپەرستو تەقواکارو بەخشندەو خاوەن ڕەوشتی بەرز بووە، بەڵکوو لەهەموو کارێکی باشدا مامۆستاو ڕابەر بووە، سەر مەشقو ڕەچە شکێن بووە.

هەموو ڕەوشتێکی جوانی تێدابووە ، لە هەموو ڕەوشتێکی ناشیرین دوور بووە. ڕێبازی پێغەمبەر ڕێبازێکی ڕاستو جادە ڕێیە، خودا فەرمانی پێ کردووە: کە هاوەڵ بۆخودا دانەنێ، بەدڵسۆزیو ئیخلاصەوە خوداپەرستی بکات، لەپەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەردا ئەو کەسەی زیاتر تەقوا کار بێ پتر ڕێزدارە. ڕێبازی پێغەمبەر ڕێبازێکە بەر چاو ڕونو هیدایەتدراوەکان شوێنی دەکەون.

بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بانگەوازی کردنە بۆ یەکتاپەرستیو عیبادەتکردنو هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەت. دەی مەنهەجی شاعیران بەپێچەوانەی مەنهەجی پێغەمبەرانەوەیە. کەواتە چۆن دەبێ ڕەوشتی شاعیریی وەپاڵ پێغەمبەر بدرێ؟!

ئەمجار پەروەردگار ئەو شاعیرانە چەرت دەكات كە لەسەر ڕێڕەوی ئیسلام شیعر دەڵێن‌و چوار ڕەوشتی بەرزی ئیسلامیان تێدایە (ئیمان‌و كردەوەی چاك‌و یادی خوداو یارمەتیدانی حەق‌و حەقخوازان).

دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيراً وَانتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا﴾ واتە: شاعیران هەمویان سەرلێشێواو گومڕاو شوێنكەوتوانیان گومڕان جگە لەو شاعیرانەی ئیمانیان بە خوداو بەپێغەمبەری خودا هێناوە، كردەوەی باش‌و پەسەند ئەنجام دەدەن، لەشیعرەكانیاندا لەناخاوتن‌و گفتوگۆیان باسی خودا دەكەن، داكۆكی لەپێغەمبەرو ئایینی ئیسلام دەكەن. دژی شیرك‌و موشریكەكان شعرەكانیان ئاراستە دەكەن، ئەوانە حوكمیان جوداوازەو لەكۆمەڵی گومڕایان نین، شوێنكەوتوانیان بەسەر لێشێواو ناژمێردرێن.

چونكە ئیسلام دژی شیعر نییە لەبەرئەوەی شیعرە، بەڵكوو دژی ئەو شیعرو فەنیە كە لەچوار چێوەی مەنهەجی ئیسلام دەچێتە دەرەوە، دژی شیعرو فەنێكە: كەبە گوێرەی هەواو ئینفیعالات دەگوترێ. دژی شیعرو فەنێكە پابەندی مەنهەجی قورئان نەبێ، شوێن خەیاڵ پلاوو خەونی ئەرخەوانی بكەوێ، لەعالەمی واقیع دا جێگەی نەبێتەوە. بەڵام گیانی شاعیرەكان بە مەنهەجی ئیسلامی سەقامگیر دەبێ ، شیعرو فەننەكە لەچوارچێوەی پەیڕەو پرۆگرامی ئیسلامدا دەردەبڕێ و بەهەستێكی ئیسلامیەوە دەگوترێ ، ئەوە فەننێكی پیرۆزە، ئیسلام پەسەندی دەكاو شاعیرانی بۆ هەڵدەنێ، تەنانەت پێغەمبەر بەحەسسانی كوڕی ثابیتی فەرموو: (أهجهم وروح القدس معك).

هەروەها ئیمام ئەحمەدو ئەبوداود لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان كردوە: كە پێغەمبەرﷺ لەپەسنی شیعرا فەرمویەتی: (ان من البیان سحرا و ان من الشعر حكمة).

بەڵێ: کاتێك بۆ رۆحی شاعیرەکە رێبازێکی چەسپاو دەستەبەربێ، شیعرەکە بۆ مەبەستێکی ئیسلامی بگوترێ، لەکلاو رۆژنەی ئیسلامەوە بڕوانێتە دونیاو لەژێر رۆشنایی ئیسلامەوە سەیر بکاو ئەمجار تەعبیر لەم هەستە خاوێنەی خۆی بداتەوەو شیعر بڵێ، ئەوە کارێکی پەسەندەو ئیسلام دژی ناوەستیو بەفەنێکی کاریگەر دادەنرێ. ئەوەتا پێغەمبەرﷺ بەعەبدوڵلای کوڕی رەواحەی فەرموو: (اهجهم) واتە: عەیبو عاری کافرەکان بەشیعر دەربخە، هەجویان بکە (فوالذي نفسي بيده لهو أشد عليهم من وقع النبل) سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم هەجوکردنەی تۆ لەسەر دڵی موشریکەکان لەزەبری تیر کاریگەرترە.

ئیمام ئەحمەد فەرمودەیەکی ریوایەت کردوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: (ان المؤمن يجاهد بنفسه و لسانه ، والذي نفسي بيده لكأن ماترمونهم به نضح النبل) واتە: موسوڵمان جیهاد دەکا بەشمشێریو بەزوبانی، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەو شیعرانەی ئاراستەی کافرەکانی دەکەن دەڵێی تیرن تێیان دەگرن.

بێگومان قورئانی پیرۆز لەزۆر لەئایەتەکانی دا دڵو عەقڵی ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ تێفکرینو وردبوونەوە لەبوونەوەر(سروشت)و نهێنی ناودڵی ئادەمیزاد، دەی خۆی لەخۆی دا ئەمانە مادەی شیعرو فەنن.

ئەمجار پەروەردگار کۆتایی سورەتەکە بەهەڕەشەی توندو ترسناك دەهێنیو دەفەرموێ: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ بێگومان لەوە بەو لاوە ئەوانەی ستەم لەخۆیان دەکەن بەوە: کە سوورن لەسەر کوفرو بێدینی بەردەوام روی خۆیانوەردەگێڕن لەتێفکرین لەنیشانەی هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی زاتی بێچونی، خۆیان خۆیان گێل دەکەن لەوردبوونەوە لەنێوان پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو فالگرتنەوەی کاهینەکاندا، فەرقی ئایەتی قورئانو شیعری شاعیرەکان ناکەن، لەوە بەولاوە دەزانن: دوای مردن دەکەونە چ شوێنێکی ناخۆشو پڕعەزابەوە، بۆیان دەردەکەوێ چەند بەدبەختو چارەڕەش دەبن!!

ئیمامی قورتوبی جوداوازی خستۆتە نێوان وشەی (منقلب) و (مرجع)ەوە فەرمویەتی: (منقلب) بریتیە لەوەرچەرخان لەحاڵێکەوە بۆ پێچەوانەی حاڵەکە، (مرجع) بریتیە لەوەرچەرخان لەوحاڵەی تێیدای بۆ حاڵێکی تر: کە لەوەو پێش لەسەری بووی، کەوابێ هەموو (مرجع)ێك (منقلب) دەگەیەنێ بەلام هەموو(منقلب)ێك (مرجع) ناگەیەنێ.

**تێبینی:**

دەمەوێ لەکۆتایی ئەم سورەتە پیرۆزەداو بەبۆنەی تەفسیری ئەم چەند ئایەتەی کەباسی شیعرو شاعیرەکان دەکەن، هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بەشیعرو شاعیرەکان رون بکەمەوە.

هەڵبەتە چەند فەرمودەیەك لە پێغەمبەرەوە دەربارەی شیعرو شاعیر هاتووە، هەندێکیان دژی شیعرو شاعیرنو بەناپەسەندی لەقەڵەم دەدەن. هەندێ فەرمودەشیان مەدحی شیعرو شاعیر دەکەن. لەبواری زەمکردنی شیعردا ئیمامی موسلیم فەرمودەیەکی ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (لأن يمتلئ جوف أحدكم قيحا حتى يَرِيَهُ خير من ان يمتلئ شعرا ) ئەگەر ناوسنگی یەکێ لەئێوە پڕبێ لەکێمو زوخاو هەتا بیخوا (واتە: کێمەکە بیخواو ناو هەڵۆڵی بکا) باشترە لەوەی پڕبێ لەشیعر.

لەبواری پەسندی شیعردا فەرمودەیەك هەیە: ئەحمەدو ئەبوداود ریوایەتیان کردوە لەئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ان من البيان سحراو ان من الشعر حكمة) هەندێ تەعبیرو دەربڕین وەکوو سیحر دەچێ پیاو سەرسام دەبێ ، هەندێ شیعر هەیە حیکمەتو پەندە.

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی ( العاص) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (الشعر بمنزلة الكلام، حسنه كحسن الكلام وقبيحه كقبيح الكلام) (رواه البخاري في

الأدب) شیعر وەکوو قسەوایە، جائەگەر جوان بوو وەکوو قسەی جوان وایە، ئەگەر ناشیرین بوو وەکوو قسەی ناشیرین وەهایە.

کەوابوو پێویستە بڕیاری ئەوە نەدەین شیعر لەبەر خودی خۆی باشە یان خراپە، پەسندە یان ناپەسندە. بەڵکوو دەبێ بڕوانینە ئەو مانایەی لەشیعرەکەدایە، ئەگەر شیعرەکە بریتی بوو لەپێدا هەڵگوتنی ئافرەتو باسکردنی نامووس‌و خێزانی خەڵك‌و بانگەوازی بۆ فەسادی ئەخلاق‌و رەوشت‌و دڵداری لەگەڵ گەنجی نێرو مێ ئەوە شیعرەکە پەسەند نیەو پێویستە موسوڵمان خۆی لێ بپارێزی‌و توخنی نەکەوێ.

هەروەها ئەگەر کابرای شاعیر شیعر وتنی کردبوە هۆی بەڕێوەچوون‌و ژیان بەسەر بردن‌و خەریکی چڵکاو خۆری بوو، بەگوێرەی دەستکەوت‌و دابین بوونی بەرژەوەندیەکانی زێدەڕۆیی دەکرد لەمەدح و زەمدا، بەناحەق پاییني باڵا دەکردن‌و پایە بەرزانی بەپایین لەقەڵەم دەدان‌و لەپلەو پایەی دەهێنانە خوارێ، زیانی بەماڵ‌و ناموسی خەڵکی دەگەیاند، ئەم جۆرە شاعیرانە هەرچی پەیدای دەکەن بەشیعر حەرامەو هەرچی دەیڵێ ناپەسەندەو دروست نیە گوێی لێبگیری‌و یارمەتی بدرێ، بەڵکوو دەبێ جڵەوگیری لێبکرێ‌و نەهێڵدرێ بەردەوام بێ لەسەر ئەو کارە ناشیرینەی.

تەنانەت شیعری هەجوو جوێن ئاسا ئەگەر شاعیر مەبەستی هەجوو کردنی کافران نەبوو، وەڵامدانەوەی هەجووکردنی ئەوان نەبوو بۆ کافرەکان حەرامە. بەڵام ئەگەر مەبەستی هەجوەکە رەددانەوەی کافران‌و یارمەتی دانی موسوڵمانان بوو پەسەندەو دروستە. پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لاَ يُحِبُّ اللّـهُ الْجَهْـرَ بِالسُّوَءِ مِـنَ الْقَوْلِ إِلاَّ مَن ظُلِمَ﴾ (النساء/١٤٨).

ئەو فەرموودانەی لە بواری پەسەندکردنی شیعردا ریوایەتکراون ئەو فەرمودانە دەگرنەوە کە بۆ دەرخستنی حەق‌و سەرخستنی حەق گوتراون، بۆ پەندو ئامۆژگاری نوسراون، بۆ فێرکردنی نەزان‌و یارمەتیدانی ستەم لێکراوو دیفاع

لەوڵاتو ماڵو ناموسو گیان بێزراون، بۆ هەرشتێك سودی رەوای تێدابێ ، پەروەردەی دڵو دەرون بكا، عەقڵو هۆش مشتو ماڵ بكا، یەكیەتیو برایەتی بخاتە ناو گەلو نەتەوە، ئەوە شیعری پەسندەو ئیسلام قبوڵی دەكاو بەپێویستی داناوە.

بێگومان ئەم جۆرە شیعرە پەسندەو پێشەوا بەرێزەكانی فیقهو حەدیثو تەفسیر گوتویانە، زۆربەیان لەم بوارەدا دیوانی شیعریان هەیە، توێژینەوەو هەڵسەنگاندنیان تێدا ئەنجام داوە. گەورە زانایانی لوغەتو ئەدەب زۆربەی تەمەنی زێرینی خۆیان تێدا خەرج كردوەو بەبەشێك لەزانیاریە ئیسلامیەكانیان لەقەڵەم داوەو پەسندیان كردوە.

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: شیعر جۆرێكە لەئاخاوتن ئەگەر جوان بوو وەكوو ئاخاوتنی جوان وایە، ناپەسندەكەشی وەكوو قسەی ناشیرین وایە: مەبەستی ئەوەیە كەشیعر لەبەر خودی خۆی ناپەسند نیە، بەڵكوو ئەگەر مانای ناشیرینی تێدا بوو ناپەسندە..

ئیبنو عەبدولبەر دەفەرموێ: هیچ كەس لەزاناو عاقڵ مەندان شیعری جوانی بەلاوە ناپەسند نەبووە: كەسیش نەبووە لەهاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەرﷺو زاناو پێشەوایانی ئیسلام ئیللا یان شیعری گوتووە یان نموونەی پێ هێناوەتەوە، یان گوێی بۆ راگرتووە، ئەگەر حیكمەتو پەندو ئامۆژگاری تێدا بووبێو قسەی پڕو پوچو جوێنو تورەهاتی تێدا نەبووبێ پەسندی كردوەو پێی رازی بووە.

هەر كاتێ شیعر لەوجۆرە ناپەسندە بوو، ئەوە جوداوازی لەنێوان شیعرو نەثر نیە. گوێ لێراگرتنیو گوتنیو نووسینیو خوێندنی حەرامە. بەكورتی شیعری واهەیە دروستە دەمی تێوە دەیو شیعری واهەیە مەكروهە، هەیە حەرامە. هەیە سوننەتو پەسندە.

پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی گوێی لەشیعر راگرتوەو داوای كردوە بۆی بخوێننەوە. ئیمامی موسلیم لەحەدیثی عەمری كوری (الشرید) لەباوكیەوە ریوایەت دەكا دەڵێ:

رۆژێك بەدوا پێغەمبەرەوە بووم فەرموی: هیچت لەشیعری (أمیة)ی كوڕی (أبي الصلت) لەبەرە؟ منیش عەرزم كرد: بەڵێ ، فەرمووی: دەبۆم بڵێ: منیش شیعرێكم بۆ خوێندەوە، فەرمووی: دەی بڵێ: شیعرێكی ترم بۆ خوێندەوە، فەرمووی: بڵێ هەر بۆم خوێندەوە تا سەد دێڕ شیعرم بۆ تەواوكرد.

ئەم ریوایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: كە پێویستو پەسندە مرۆڤ گرنگی بە لەبەركردنی شیعری پڕ حیكمەتو مانای جوانو پەسند بدا. پێغەمبەرﷺ كە حەزی لێبوو زۆر گوێی لەشیعری (أمیة)بێ لەبەرئەوەبوو چونكە پیاوێكی داناو عاقڵ بووە.. پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرمویەتی: (كاد امية ابن صلت أن يسلم)[1].

هەڵبەتە شیعرێك حەمدو ئەنای پەروەردگار لە خۆبگرێ ئەوە پەسندو خاوەن فەڕو بەرەكەتە، خوێندنەوەو گوتنو نووسینو لەبەركردنی سوننەتە، وەكوو ئەم دێڕە شیعرە: ( الحمد لله العلي المنان * صار الثريد في رؤوس العيدان ) هەڵبەتە لەم بارەوە نموونە زۆرنو لەژمارە نایەن.

یان شیعرەكە باسی پێغەمبەرو رەوشتی جوانی بكا: وەكوو ئەوەی ئیمامی عەبباس لەمەدحی پێغەمبەردا دەفەرموێ:

من قبلها طبت في الظلال وفي مستودع حيث يخصف الورق

ثم هبطت البلاد لابشر أنت ولا مضغة ولا علق

بل نطفة تركب السفين وقد ألجم نسرا و أهله الغرق

[1] تەفسیری مەراغی ج ١١٤/١٩ ئەمیش لە تەفسیری قورطوبی ج٣٧٤١/٧ ی وەرگرتووە

یان حەزرەتی ئەبوبەكر روبەڕوی پێغەمبەر ئەم شیعرانەی خوێندەوە:

فقدنا الوحي اذ وليت عنا ووعدنا من الله الكلام

سوى ما قد تركت لنا رهينا توارثه القراطيس الكرام

فقد أورثتنا ميراث صدق عليك به التحية والسلام

جا ئەگەر خوێنەرو بیژەری ئەم شیعرە حەزرەتی ئەبوبەكر بووبێ، گوێ گرو بیسەر پێغەمبەر بووبێ ئیتر چ بەڵگەیەك لەمە بەهێزتر بێ.

تـنـقـل مـن صـالـب الـى رحـم اذا مـضى عـالم بـدا طبـق

پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووە: (لا یفضض الله فاك)

ئیمامی موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکا: کە دەفـەرموێ: گـوێم لێبـوو پێغەمبەرﷺ بۆ خـۆی لەسەرمینبەر دەیفـەرموو: ( أصدق کلمةـ او أشـعر کلمـة ـ قالتها العرب قول لبید: "ألا کل شیئ ماخلا الله باطل")[٢].

شیعری ناپەسـەندیش ئەوەیـە: کـە نووسـینو گـوتنو گـوێ لێراگرتنـی دروسـت نیە، ئەم جۆرە شیعرە ئەو شیعرەیە ناوەڕۆکی بـەتاڵو مانـای ناشـیرینو غەیبـەتو درۆو دەست درێژیکردنی تێدابێ بۆ سەر ناموسو کەسایەتی موسـوڵمانان، بـەناڕەوا پیاوی ترسنۆکو پـڕو پـوچ بکەیـە هاوشانی پیـاوی ئـازاو شۆڕشـگێڕ، لەشـکۆمەندی پیـاوی خانـەدان کـەم بکاتـەوە، پەسـتیو نزمـی پیـاوی خـوێڕی دابپۆشـیو بـەرزی بکاتـەوە، بـەناڕەوا ناکـەس بەچـە بکاتـە شـێخ مـەحمودی نـەمرو مـەلا مـستەفای بارزانو بەڵکوو وانیشان بدا ئەو جۆرە پیاوانە لەچاو ئەم ڕا هەر هیچ نەبوون!!

هەنـدێ شیعر هەیە وتنی کوفری ئاشکرایە، وەکوو ئەوە جنێو بەپێغەمبەربدا، هەرکەسێ هەجووی پێغەمبەر بکا بێ سێو دوو کافر دەبێ.

بەڵام هەجووی غەیری پێغەمبەر ﷺ هەر حەرامەو تاوانە شاعیرەکەی پێکافر نابێ. ئیبنو عەرەبی دەڵێ: بەکارهێنانی ئیـستیعارەو تەشـبیهات لەشیعردا دروسـتە بازێدەرەویشی تێدابکاو لەسنوری عادەت دەربچێ..

لـەزەمانی عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیزدا مەیـدانی شـیعر زۆر فـراوان بـوو، مەبەسـتەکانی شـیعر فـرەو هەمـە جۆربـوون، شـیعری سیاسـیو غـەزەلیو هیجـا بەتـەواوی پـەرەیان سـەندبوو، زۆربـەی زۆری شـاعیران کاسەلێـسیان بەشیعرەکانیانەوە دەکردو هونەرەکەیان کردبووە سەرچاوەی ژیـانیان.

[٢] تەفسیری قورطوبی ج٧/٣٧٤٢.

بۆیە خەلیفەی ناوبراو بەتوندی بەگژ ئەم دیاردانەدا چووەوە. دیاردەی کاسبی کردنی بەشیعر بنەبڕکرد، بەخششو عەطای خۆی لەو شاعیرانە بڕی: کە مەبەستیان لەشیعرەکانیان دابین کردنی پێویستیاتی ژیان بوو، چوار هەزار دیرهەمی دا بەفەرەزدەق بۆ ئەوەی بەچاكو بەخراپ باسی دانیشتوانی مەدینە نەکا!! سەد دیناری دا بەئەحوەصی شاعیر: کەواز لەهەجووکردنی ئەبوبەکری کوڕی عەبدولعەزیزی کوڕی مەروان بهێنێ.

جەریری شاعیر هەرچەندە مەدحی خەلیفەی کردبوو، بەلاّم کە لەگەلّ عەمری کوڕی (لجأ) تەمیمی دا هەجووی یەکتریان کرد، هەردوکیانی.سزادان.

عەمری کوڕی رەبیعە کە شاعیرێکی مێبازو ژنانی بوو لەسەر شیعرە غەزەلە ژنانییەکانی دووری خستەوە بۆ ولاّتی دەهلك.

هەرکەسێ دەیەوێ فراوانتر لەم مەوزوعە بزانێ با سەیری تەفسیری قورطوبی ج۷/۳۷٤۱-۳۷٤۹ بکا. هەروەها سەیری کتێبی ( الخليفة الراشد عمر بن عبد العزيز) دانراوی د. وهبە الرحیلی ل٦۲ بکا.

**بەیارمەتی خودا سورەتی (الشعراء) تەواوبوو خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواوکردنی سورەتەکانی تر...**

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورەتی (النمل)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (النمل) چونكە چیرۆكی شێوی (النمل)ی تێدایە، چیرۆكی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە مێرولەیەك ئامۆژگاری مێروەكانی تری كردو وتی: هەمووتان بڕۆنە ناو ماڵی خۆتانەوەو خۆتان تاقەت بكەن، نەبادا لەشكری سولەیمان پانو پلێشتان بكەنەوەو ئاگایان لێنەبێو نەتان بینن، حەزرەتی سولەیمان ﷺ كە خودا زانیاریی زمانی پەلەوەرو هەموو گیانلەبەرێكی فێركردبوو، ئاخاوتنی ئەم مێرولەیەی بیستو زەردەخەنەی بەقسەكەی هات. لەخودا پاڕایەوە كە: تۆفیقی بدا بۆ سوپاسگوزاری لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیون.

**پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشوویەوە لەچەند ڕویەكەوەیە :**

١- وەكوو تەواوكەری سورەتی پێشوو وەهایە لە ڕانواندنی چیرۆكی پێغەمبەراندا، چیرۆكی حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمان ﷺ رادەنوێنێ.

٢- تەفصیلو شیكردنەوەی تێدایە بۆ كورتەو موجمەلی چیرۆكەكانی سورەتی (الشعراء) ئەوەتا لە ئایەتی (٧-١٢) چیرۆكی حەزرەتی موسا ﷺ شی دەكاتەوە لە ئایەتی (٤٥-٥٣) چیرۆكی صالح ﷺ و لەئایەتی (٥٤-٥٨) چیرۆكی حەزرەتی لوط ﷺ شی دەكاتەوە.

٣- ئەم سێ سورەتە واتە: (الشعراء ، النمل ، القصص ) یەك بەدوای یەك دا نازڵ بوونو هەرسێكیشان مەككینو لەقورئانیشدا بەوشێوە پۆلێن كراون.

لە ئیبنوعەبباسو جابری كوڕی زەیدەوە ریوایەت كراوە كە: سورەتی (الشعراء) ئەمجار (طس) پاشان (القصص) یەك بەدوای یەك دا نازڵ بوون. هەروەكوو چۆن هەرسێكیان بە (الحروف المقطعة)ی لێكچوو دەستیان پێكراوە. (الشعراء) بە (طسم) و (النمل) بە (طس ) و(القصص) بە (طسم) دەستیان پێكراوە، واپێدەچێ لێكچونی

سەرەتای سورەتی (الشعراء) و(القصص)و جوداوازێکیان لەگەڵ سورەتی (النمل)دا ئامازەیە بۆ ئەوە کە: مەبەست بەو(حروفە موقەطەعاتە) تەحەدداکردنی موشریکەکانەو پێیان دەفەرموێ: قورئان لەم جۆرە پیتانە پێك هاتووەو زوبانی ئێوەش لەم پیتانە پێك هاتووە، دەی کە ئازانو لەتواناتاندا هەیە نموونەی ئەو قورئانە بخەنەڕو.

٤- سورەتی (النمل) دوای سورەتی (الشعراء) نازڵ بووەو لەسەر نەسەقی ئەوە، هەردوکیان پێشەکیو پاشەتایان هەیە، لەنێوان پێشەکیو پاشەتادا چەند چیرۆکێك هەن. بۆ هاوکێشەکردنو بەرامبەریکردنی نێوان هەڵوێستی موشریکەکانی مەککەو گەلو نەتەوە پێشینەکان بەمەبەستی پەندو ئامۆژگاریو تێفکرین لەدابو نەریتی خودا لەبونەوەردا.

٥- هەردوکیان لەسەرەتاوە وەصفی قورئان دەکەن بەوە کە لەخوداوە نازڵ بووە.

لەسەرەتای سورەتی(الشعراء)دا فەرموی: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا فەرموی: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ لەکۆتایی سورەتی (الشعراء)دا فەرموی: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ..﴾ هەڵبەتە بەوشەی ﴿تِلْكَ﴾ ئامازەی بۆ ﴿لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ی کۆتایی سورەتی پێشوو دەکا.

باسی سەرەکی سورەتەکە وەکوو هەموو سورەتە مەککیەکانی تر باسی عەقیدەو ئیمان بەخوداو یەکتاپەرستیو بڕوا بوونە بەڕۆژی دواییو پاداشو سزای هەروا ئیمان بەنیگاو سروشی خودا بۆ پێغەمبەرانو جەختکردنەوە لەسەر ئەوە کە: غەیب زانی هەر بۆ خودایەو کەسی تر غەیب نازانێ، هەروەها بڕوا بەوە کە هەر خودا بەدیهێنەرو رزقو رۆزیدەرە، هەموو شتێك بەدەست خودایەو هەرچی خودا بیەوێ ببێ دەبێو ئەوەی بیەوێ نەبێ نابێ.

جا بۆچەسپاندنی ئەو مەبەستو باسانە، بۆ ڕونکردنەوەی ئەو مانایەو دیاری کردنی ناکامی سەرپێچیکارو بە درۆخەرەوەکانو سەرەنجامی موسڵمانان، چەند چیرۆكو بەسەرهاتی پێغەمبەرانی ڕابوردوی هێنایەوە، لەسەر هەبونی خودای تاكو تەنها و بەتوانا و بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە ناویاندایە، هەروەها بەخشینی بیرو هۆشو عەقڵو ئاوەز بە ئادەمیزاد، هەروا ڕەخساندنو دابین کردنی هەموو پێداویستیاتی ژیان.

ئەمجار دەربڕینی ناڕەزامەندیی لە موشریکەکان کە: بڕوایان بە زیندوبونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو سزاو پاداش نییە.

کۆتایی سورەتەکەشی بەپۆلێنکردنی ئادەمیزادەکان هێناوەو کردوونی بەدوو بەش، بەختەوەرو بەدبەختو سزاو پاداشتی هەرکەس بەگوێرەی کردەوەکانیان.

دیاردەیەکی تری گشتی ئەم سورەتە بریتییە لەباسی زانستو زانیاری، بەو جۆرە شێوەو ئوسلوبە، تارمایی زانیاری لە سورەتەکەدا بەرچاو دەکەوێ. هەر لە سەرەتای سورەتەکەوە تاکۆتایی ئەم تارماییە بە زەقی دەبینرێ.

دەی بابچینە خزمەت ئایەتەکانی سورەتەکەو دەست بکەین بە ڕاڤەکردنو شیکردنەوە.

## سورەتی النمل

﴿ طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا

لَهُمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾

﴿طا: سين﴾ ئەم پیتە پچڕ پچڕانە لە سەرەتای سورەتەكاندا، چەند جار لەوە پێش ئاماژەمان بۆ ماناكانیان كردوە. پێویست ناكات دوبارەیان بكەینەوە. مانایەك كە بە پەسەندی دەزانین لەناو ئەو مانایانەدا ئەوەیە: دەفەرموێ ئێمە قورئانمان لەو پیتانە پێك هێناوە، دەی ئێوەش بتوانن هەر لەو پیتانە نامەیەكی ئاوا تەنانەت با بە ئەندازەی كورترین سورەتیشی بێ بخەنە ڕو!

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ وَكِتَابٍ مُبِينٍ﴾ ئەم ئایەتە نازڵ كراوانە بۆ سەر تۆ ئەی موحەمەد! لەم سورە تەدا بەشێكن لەئایەتی قورئان بە گشتی، ئایاتی نامەیەكی نوسراوو ئاشكراو نومایانن كە: تارۆژی قیامەت ئەو قورئانە بەرقەرار دەبێ‌وپەیڕەوی كردنی هۆی بەختەوەرییەو كارپێ كردنی ئاسان‌و لەتوانادایە. هەر كەسێ تێی بفكرێ، لێی سودمەند دەبێ‌و لەدڵیدا شیرین دەبێ، بۆی دەردەكەوێ كەلامی خودایەو زادەی بیرو بۆچونی ئادەمیزاد نیە، جگە لەخودا كەس لەتوانای دا نییەوێنەی قورئان بخاتەڕو بەڵكوو ناتوانن وێنەی كورتترین سورەت بخەنەڕو.

﴿هُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: قورئان هیدایەتدەرو ڕێ ڕۆشنكەرەوەی ژیانە بۆ ئادەمیزاد، ڕزگاریان دەكا لەڕێبازی گومڕایی، مزگێنی دەرە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕو پابەندی فەرمان‌و جڵەو گیرییەكانی خودان مزگێنی بەهەشت‌و ڕەحمەتی خودایان دەداتێ.

مانـای ئـەوە کـە: قورئـان هیدایەتـدەربێ بـۆ موسـڵمانان ئەومیـە: سـەرباری هیدایەتی خۆیان هیدایەتی تریـان بـۆ زیـاد دە کـا. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ:

﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُـمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ هیدایـەتیان دەدا بـۆ ڕێگای بەهەشتو بە بەهەشتیان دەگەیەنی وەکو دەفـەرموێ: ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِـي رَحْمَـةٍ مِّنْـهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَاطاً مُّسْتَقِيماً﴾ (النساء /١٧٥).

هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿هُـدًى وَبُـشْرَى لِلْمُـؤْمِنِينَ﴾ ئامـاژە بـۆ حەقیقـەتێکی گەورەو بەنرخ دەکا، ئەویش ئەوەیە: قورئان کتێبێکی زانستی نەظەریو ڕاهێنـان نیـە، هەرکەسـێ بیخوێنێتـەوەو لەبـەری بکـا سـودی لێـوەربگرێ، بـەڵکوو قورئـان نامەیەکە ئاڕاستـەی دڵ کـراوە سـەرەتا لەگـەڵ دڵو دەروون دەدوێ، نـوورو رونـاکی بەکەسێ دەبەخشێ دڵی کراوە بێ بۆ وەرگرتنیو سودی لێ ببینێ، هەتا دڵەکە زیاتر بەنووری ئیمان رۆشن بووبێتەوە پـتر نەرمـە بارانی بـاوەڕی لـێ دەبارێ، زۆرتـرین کاریگەری قورئان دەچێژێ.

واڕێ دەکەوێ ئادەمیزاد دەیـان جارو سـەدان جـار ئایـەتێك دەخوێنێتـەوە یـان گـوێی لێـدەبێ، بـەڵام دڵـی نـاداتیو بەسـەرپێی بەسـەری دا تێپـەڕ دەبـێ، وەهـیچ کاریگەریەك لەسـەر ئـەو دڵە بێئاگایـە بـەجێ نـاهێڵێ. کەچی لـەنکاوێك چـرایەك لـەدڵیدا هەڵـدەکریو بـەگوێ لێبـوون یـان بەخوێندنـەوەی ئایەتەکـە دڵـی وەکـوو غونـچەی گـوڵ دەکرێتـەوەو کاریگەریـەکی تێـدا پەیـدا دەبـێ کـە: بەخـەیاڵیدا نـەهاتووە. مـوعجیزە لـەژیانو خـاوەنی ئەودڵـە هەسـتیارەدا دروسـت دەکـا. لەڕێبازێکەوە دەیگوێزێتەوە بۆ ڕێبازێکی تر.

بێگومان قورئان گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووە لەبواری هیدایـەتو خوداناسـیو ڕێنومایيو جمووجوڵ بۆ دۆزینەوەی ڕێگای بەختەوەریی، ئیمانو بـاوەڕ کلیلـی ئـەو

گەنج و خەزێنەیە، ئەو کلیلەت نەبێ ناتوانی دەرگای ئەو گەنجە بکەیتەوە. ئەوکەسانەی بەڕاستی موسوڵمان بوون و باوەڕیان پتەوبوو، بەهیدایەتی ئەم قورئانە موعجیزەیان دروستکردن، بوون بەنموونەو بەنموونە دەهێنرێنەوە، بۆ؟ چونکە دڵیان ئامادەبوو بۆ وەرگرتنی هیدایەتەکەی.

بەڵام کاتێك قورئان ببێتە کتێبێك ئایەتەکانی وەکوو گۆرانی دەنگ و صەدایان تێدا تاقی بکرێتەوە، لەحەفلەو فستیڤالا بەرنامەی پێ برازێنرێتەوە ئێزگەو تەلەفزیۆنی پێ بکرێتەوە، لەترسی شەوەو دێوو درنج لەپەنای ئافرەتی زەییستان دابندرێ، لەدادگادا بۆ سوێند خواردن نەك بۆ کارپێکردن دادوەر بەشێوەیەکی رۆتینی و بۆ هەڵخەڵەتاندنی موسوڵمانان لەسەر مێزی حوکمی طاغوت دایبنێ و شایەتی پێ سوێندبدا..

هەڵبەتە هەرکاتێ وابوو، قورئان دەبیسترێ بەڵام لەگوێچکەیەوە داخڵ دەبێ و لەولاوە دەردەچی و ناگاتە دڵ و هیچ کاریگەریەکی نابێ و کەس سودی لێنابینی و گەنج و خەزینەیەکی دەرگا داخراوو بێکلیلە.

ئەو موسوڵمانانەی سود لەقورئان وەردەگرن و پێی هیدایەت ئامێز دەبن، ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاةَ﴾ ئەوانەن کە: نوێژەکانیان بەتەواوەتی و بەرێکوپێکی ئەنجام دەدەن. ئەرکان و مەرجەکانیان بەتەواوەتی بەجێ دێنن، پەروەردگاری خۆیان لەدڵدا ئامادەکەن و خوشوع و خضووعی بۆ دەکەن، خوێندنی. فاتیحەو ذیکرو دوعاکان وادەخوێنن وەکوو چاویان لەخودا بێ، ئەگەر هیچکە نەبێ وەدەزانن خودا چاوی لەوانە.

﴿وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵ و سامانی خۆیان دەردەکەن، ماڵ و دەرونی خۆیان بەو زەکاتدانە پاك دەکەنەوە.

﴿وَهُمْ بِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ ئەوان بڕوای تەواویان بەرۆژی قیامەت هەیە، دڵنیان لەوەی دوامردن زیندو دەکرێنەوە، پاداش‌و سزا بەگوێرەی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە، بەهەشت‌و دۆزەخ هەن‌و پاداشی چاکەکاران بەبەهەشت‌وسزای سەرپێچیکاران بەدۆزەخ دەدرێتەوە، فەرمان بەرداری فەرمانی خودا بن لەوشتانەی فەرمانیان پێدەکا. خۆیان دەپارێزن لەوشتانەی جڵەوگیریان لێدەکا.

ئەمجار دێتە سەرباسی ئەوانەی بڕوایان بە زیندوبوونەوەی رۆژی قیامەت‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوەی ئەو رۆژە نیە، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَالَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی قیامەت بەدرۆ دەزانن‌و بەلایانەوە دورو نەگونجاوە دوای مردن زیندوبونەوە هەبێ‌و قیامەت ڕابێ، ژیانی دونیامان لەپێش چاو جوان کردون، کردەوە ناشیرین‌و ناپەسەندەکانیانمان لەدڵ دا شیرین کردون، مۆڵەتمان داون لە گومڕایی خۆیاندا بێن‌و بچن، ئەوان سەرلێشێواو سەرگەردانن، پێوەرو پێناسەکانیان لێ تێك چون، پێیان‌وایە ئەوەی دەیکەن کاری چاك‌و پەسەندە، بیر لەئاکامی خۆیان ناکەنەوە، چاویان. لەدوارۆژو سەرەنجامی هەڵس‌و کەوت کارو کردەوەی ناشیرینی خۆیان نیە.

زەجاج دەفەرموێ: مانای ﴿زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَالَهُمْ﴾ ئەومیە: لەدونیادا لەسزای سوربونیان لەسەر کوفر، کردەوە خراپەکانمان لەدڵ دا شیرین کردون.و بەسروشت حەزیان لێیەتی.

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَهُمْ سُوءُ الْعَذَابِ وَهُمْ فِي الآخِرَةِ هُمُ الأَخْسَرُونَ﴾ ئەوانە سزایان عەزابی سەختی دژوارە لەدونیاو قیامەتدا، لەدونیادا بەکوشتن‌و دیل گرتنیان لەکاتی شەڕکردنیان لەگەڵ موسڵمانان، وەکوو لەغەزای بەدردا ڕوی دا. لەقیامەتیشدا عەزابی سەختی دۆزەخیان بۆ ئامادە کراوە بەڵکو سزاو عەزابیان

لەقیامەتدا زۆر سەختو دژوارە، چونکە عەزابەکەیان لەوێ بەردەوام سەختو نەبڕاوەیە. وە کوو عەزابی دونیایان نیە ماوەیەك بێو ببڕێتەوە.

ئەمجار دێتە سەر باسی حاڵو چۆنیەتی ئەو کەسەی قورئانی بۆ نازڵ کراوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! قورئان وەردەگریو پێت دەبەخشریو فێردەکرێ لەلایەن خودای داناو لێزان لەفەرمانو حڵەوگێریو بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، زاناو ئاگادارە بەسەر کاروبارەکاندا بەگەورەو بچوکیەوە، ئاگاداری حاڵو وەزعی مەخلووقاتی خۆیەتی، دەزانێ چی بۆیان باشەو چی لەبەرژەوەندی ئەوان نیە. هەرهەواڵێکی رایدەگەیەنێ راستە، حوکمو بڕیاری عەداڵەتکارییە.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً﴾ (الأنعام/١١٥).

ئایەتی ﴿وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ....﴾ ڕێخۆشکەرەیە بۆ ئەو چیرۆکانەی لەمەودوا لەسورەتەکەدا رادەنوێنرێن.

**چیرۆکی یەکەم: چیرۆکی حەزرەتی موسایە ﷺ**

﴿ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ۖ فِي تِسْعِ ءَايَـٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَـٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾

**دوای ئەوەی پەروەردگار هەواڵی ئەوەی دا بە پێغەمبەر ﷺ کە قورئان لەلایەن خودای داناو زاناوە وەردەگرێ، چیرۆکی حەزرەتی موسا ﷺ دەگێڕێتەوە.**

بەئەمەش ئەوە رادەگەیەنێ کە پێغەمبەر شتێکی تازەبابەت نیەو بانگەوازییەکەی نموونەی لەمێژوودا زۆرە. وەکوو ئەوە بەپێغەمبەر دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ لەم نیگا وەرگرتن‌و سروش بۆ هاتنەت شتێکی بیدعەو تازە قەڵلا نیت، ئەوەتا پێش تۆ موسا ﷺ سروشی بۆ هاتوەو نیگای بۆ کراوەو ئەرکی پێغەمبەرایەتی خراوەتە سەرشان‌و بانگەوازی فیرعەون‌و گەلەکەی کردوە!

هەروەها ئەو بەدرۆخستنەوەو سەرپێچی کردنەی لەگەلەکەتەوە توشت دێ، شتێکی تازە نیەو لەمێژوودا نموونەی زۆرە، ئەوەتا گەلی موسا هەرچەندە لەناخەوە دەیانزانی پەیامی موسا ڕاستەو بڕوایان بەموعجیزەو ئایاتی خودا هەبوو؛ کەچی بەئەنقەست‌و لەروی ستەم‌و لوتبەرزییەوە ئینکاری پەیامەکەیان کردو شوێنی نەکەوتن‌و بەدرۆیان خستەوە.

دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَى لأَهْلِهِ إِنِّي آنَسْتُ نَاراً سَآتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ آتِيكُمْ بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! یادی ئەوە بکەرەوە کاتێک موسا ﷺ لەولاتی مەدیەنەوە بەخۆی‌و خێزانیەوە دەگەڕانەوە بۆ میصر، لەشەوێکی تاریکی سەرمادا ڕێگایان لێ تێک چوو، لە هەولی ئەوەدابوون یەکێکیان دەست بکەوێ شارەزاییان بکا، یان نیشانەیەکی ڕێگا بدۆزنەوەو پێیدا بڕۆن.

ئیتر حەزرەتی موسا ﷺ ئاگرێکی بینی دەدرەوشایەوەو دەسوتا نێڵە نێڵە. کە ئەوەی بینی مزگێنی بەژنەکەی دا کەوا ڕێگای دۆزییەوەو لەتەنگانە رزگاریان بوو، وتی: ئافرەت من ئاگرێکم بینی، دەچم بۆ ئەو دەوروبەرە، هەواڵێکی ڕێگا دەزانم‌و سەرە بزوتێکیش بۆ ئێوە دەهێنم لەم شەوە سەرماو تاریکەدا خۆمانی لەبەر گەرم دەکەینەوە.

وشەی ﴿تَصْطَلُونَ﴾ واتە: خۆتان گەرم بکەنەوە، شاعیرێکی عەرەب دەڵێ:

النار فاكهة الشتاء فمن يرد    أكل الفواكه شاتياً فليصطل

بەڵێ مەزەندەکەی ڕاست دەرچوو، چۆنی گوت ئاوابوو! کە چوو گەڕایەوە بەهەواڵێکی سەرسوڕهێنەرەوە هاتەوە، نەك هەواڵی دۆزینەوەی ڕێگای نێوان مەدیەن‌و میصر بزانێ‌و لەو شەوە سەرمایەدا ڕێگا بدۆزنەوەو خۆی‌و خێزانی ڕزگاریان بێ. بەڵکوو هەواڵی پێغەمبەرێتی هێنایەوە، ڕێگای ڕزگاربوونی گەل‌ونەتەوەکەی دەست کەوت! ئاگری نەهێنایەوە بەڵکوو نووری نوبووەتی هێنا. وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَهَا نُودِيَ أَنْ بُورِكَ مَنْ فِي النَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ کاتێك گەیشتە شوێنی ڕووناکییەکە دیمەنێکی سەرسوڕهێنەری بینی.

وەهبی کوڕی (منبه) دەڵێ: کە موسا ﷺ ئاگرەکەی بینی لەنزیکیەوە ڕاوەستا، سەیری کرد ئاگرەکە لەلقی دارێکی زۆر سەوزەوە دەردەچێ، تائاگرەکە زیاتر بڵێسە بسێنێ دارەکە سەوزتر دەبوو، سەری سوڕما، دانەویەوە بۆ ئەوەی دەستە چیلکەیەك لەئاگرەکە هەڵبگرێ، ترساو تۆزێك کشایەوە، هاتەوە پێشەوەو جارێکی تر هەوڵی دا چەند سەربزوتێکی دەست.بکەوێ.

لەکاتی ئەم بینەو بەردەیەدا بوو کە: سەری بەرز کردەوە بۆ لای ئاسمان، بینی کە روناکایی ئاگرەکە بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمان‌و ئاگر نیە نوورە، روناکایی خودای بوونەوەرە، هەتا زیاتر لەو دیمەنە وردبۆوە، پتر سەری سوڕما.

ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو دیمەنەی کرد ویستی بزانێ چیەو چی نیە. ئیتر بانگی لێکراو پێی‌وترا: پیرۆزی درا بەو کەسەی لەجێگای ئاگرەکەدایەو بەو کەسەیش‌وا لەدەوروبەری شوێنی ئاگرەکە واتە: پیرۆزە ئەوەی لەناو نوورەکەدایەو شوێنی نوورەکەش پیرۆزە. مەبەست بەشوێنەکە ئەو پارچە زەوییەیە کە لەئایەتی ژمارە(٣٠) ی سورەتی (القصص)دا کە دەفەرموێ: ﴿نُودِي مِن شَاطِئِ الْوَادِي الأيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ﴾ دەوروبەری ئەو شوێنەش خاکی شامە کەوڵاتێکی پڕ فەڕوبەرەکەتە، چونکە مەڵبەندی پێغەمبەرانەو زۆربەی فروستادەکانی خودا لەو دەڤەرو وڵاتە نێردراون.

دەبێ مەبەست بەوانەی لەناو ئاگرەکەدا کێ بن؟ هەروەها دەبێ مەبەست بەوانەی لەدەوری ئاگرەکەبوون کێ بن؟ واپێدەچێ ئەو ئاگرە لەجۆری ئەم ئاگرە نەبووە کە ئێمە دایدەگیرسێنین. بەڵکوو ئاگرێك بووە سەرچاوەکەی عالەمی بالا بوو، ئاگرێك بووە (نووری بووە) گیانە پاك‌و خاوێنەکان لە فریشتە هەڵیان گیرساندوە، بۆ هیدایەتی ئادەمیزادو وەکوو ئاگری عادەتی هاتۆتە بەرچاوی موسا سەرنجی لێدەداو لێی وردەبووەوە.

بەرستەی ﴿أَن بُورِكَ مَن فِي النَّارِ﴾ بانگی لێکرا، تا نیشانەو ئاماژەبێ بەرژانی خێرو فەڕی یەزدانی بەسەر ئەوانەدا کە: لەناو ئاگرەکەدا بوون کە بریتی بوون لە فریشتەکان.. هەروەها بەسەر ئەو کەسەیش دا کەلە دەوری شوێنی ئاگرەکەیە کە بریتیە لەحەزرەتی موسا‌ﷺ، ئیتر هەموو بوونەوەر ئەم بەخشەی وەرگرت، ئەم‌وڵات‌و دەڤەرە لەتۆمارگای بوونەوەردا بووبە وڵاتێکی پیرۆزو پڕ فەڕو بەرەکەت، خودا ئەم پیرۆزییەی پێدا، هۆی ئەم فەڕو بەرەکەتە، رودانی ئەم رووداوە گەورەیە بوو کە: بریتی بوو لەگفتوگۆکردنی پەروەردگار لەگەڵ بەندەی خۆی حەزرەتی موساو کردنی بەفرستادەی خۆی بۆ سەر فیرعەون‌و دارو دەستەکەی‌و دەرخستنی موعجیزەی ( یەدی بەیضاو عەصای ئەژدیها ئاسا).

جا چونکە وەزعەکە تارمایی جەستەو جۆرە مادییەتێکی لێدەکرێ، پەروەردگار زاتی خۆی بەدوور گرت لەهەرشتێك کە شیاوی ئەو نەبێ، فەرموی: ﴿وَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ خودا پاك‌و بەرزو پیرۆزە لەهەر شتێك کە شیاوی ئەو نەبێ خودای بوونەوەرەو بەدیهێنەری کائیناتەو لەهیچ دروستکراوێکی ناچێ.

زاتی خۆی بەرز راگرت‌و ئیعلانی خودایەتی خۆی بۆ بوونەوەر راگەیاند. هەروەها خۆی لەبەندەی خۆی موسا ﷺ ئاشکرا کردو ئەوەی تێگەیاند کە: ئەوەی بانگی لێدەکا خودای زاناو دانایە. لەلایەکی ترەوە حەزرەتی موسا ﷺ بۆی دەرکەوت کە: ئەو بانگەی لێی کرا لەخوداوەیە، چونکەوەکوو ئاماژەمان پێکرد، ئاگرەکە لەدرەختێکی گەڵاوی سەوزەوە دەردەچوو، ئاگر دەهایساو درەختەکە

نەدەسووتا. ئەمەش وەكوو موعجیزەیەك و تیلنیشانێك وابوو بۆ حەزرەتی موسا ﷺ: كە ئەو بانگ كردنە لەخوداوەیە.

ئەوەی پشتگیری لەم بۆچوونە دەكا ئەوە فەرمودەیەیە كە: ئیمامی موسلیم لەصەحیحەكەی‌داو ئینوماجە لە سونەنەكەی دا لە ئیبنوعەبباسەوە ریوایەتیان كردوە هەروەها ئیمامی بەیهەقی لەئەبومووسای ئەلئەشعەرییەوە ریوایەت دەكا دەڵێن: پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ان الله لاینام، ولاینبغي ان ینام، یخفض القسط و یرفعه، حجابه النور لو كشفت لأحرقت سبحات (أنوار) وجهه كل شیئ ادركه بصره).

ئەمجار پەروەردگار خۆی لێ ئاشكرا كردو پێی فەرمووو: ﴿يَا مُوسَى إِنَّهُ أَنَا اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەی موسا! بزانەو ئاگاداربە، ئەو كەسەی خیطابت لەگەڵ دەكاو بانگت لێدەكا ئەوە (الله) یە ئەو خودایەیە، هەموو شتێك گەردنكەچیەتی، هەموو شتێك ژێرباریەتی و ئەو بەسەری دا زاڵە. حەكیم و دانایە لەقسەو كردەوەی دا هەرچی دەیڵێ هەرچی دەیكا لەجێی خۆیدایە.

ئەم بانگكردنە بۆ ئەوە بوو بزانێ هەڵبژێرراوەو كراوە بە پێغەمبەر هەڵبەتە دوابەدوای هەڵبژاردن؛ ئەركی پێغەمبەرایەتی دەخرێتە سەرشانی و دەنێردرێ بۆسەر گەورەترین ملهوڕی سەر زەوی لەو رۆژگارەدا. بۆیە پەروەردگار موعجیزەی پێبەخشی بۆ ئەوەی بتوانێ روبەڕوی ئەو طاغوتە ببێتەوە. یەكەم موعجیزەی ئەوەبوو: گۆچانی دەستی بۆ كردە ئەژدیها.

هەڵبەتە ئەو ئاخاوتنەی لەسورەتی(طه)دا دەربارەی عەصاكەی لەگەڵی دا ئەنجام دا، لێرەدا دووبارەی نەكردەوە چونكە لێرەدا عیبرەت و پەند وەرگرتن بریتییە لە بانگ لێ كردنەكەو ئەرك خستنە سەرشان، بۆیە یەكسەر كورتبڕی كردو ئەو ئاخاوتنەی بەمەزندەكراوی هێشتەوەو چووە سەر مەبەستی سەرەكی و پێی فەرمووو:

﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ﴾ دە گۆچانەکەت فڕێ دەرە سەر زەوی! ئەویش فەرمانی بەجێ هێناو عەصای دەستی فڕی دایە سەر زەوی، یەکسەر گۆچانی بێگیانو دارەوشکی چەند ساڵ لەوە پێش بڕاو، بوو بەمارێکی گەورەی سەرسوڕهێنەر، هێندەی ئەژدیهایەك گەورەو زەبەللاح.

وێڕای ئەوەش تابڵێی چوستو چالاكو تیژڕەو ﴿فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِراً وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ کاتێك گۆچانەکەی خۆی بینی بەوشێوە بەسەر زەویدا دێو دەچێ، ئەو ئەژدیها زەبەلاحەوەکوو ئەو تیرە مارانە کەوتە جمەوجوڵ، سەری سوڕماو لێی ترسا! چۆن ترسانێك؟ ترسانێکیواجگە لەهەڵاتن هیچ چارەیەکی تری بەخەیاڵ دا نەهات، لەترسانی هەڵاتو ئاوڕی نەدایەوە، بەتەما نەبوو جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ لای گۆچانی دەستی بەماربووی!

پەروەردگار بانگی لێکردو ترسەکەی لێڕەواندەوەو پێی فەرموو: ﴿يَا مُوسَى لا تَخَفْ إِنِّي لا يَخَافُ لَدَيَّ الْمُرْسَلُونَ﴾ ئەی موسا! مەترسە لەوەی چاوت پێکەوت، ئەمن هەڵت دەبژێرم بۆ پێغەمبەرایەتی، دەتکەمە فروستادەی خۆم بۆ سەر فیرعەونو دارو دەستەکەی، پێغەمبەران لەلای من ناترسن لەوکاتەدا فەرمان وەردەگرنو موعجیزەیان لەسەر دەست ظاهیر دەبێ.

﴿إِلاَّ مَنْ ظَلَمَ﴾ بەڵام کەسێك ستەمکار بێ، ئەوانە لەمەوقیفیوادا دەترسنو واقیان وڕدەمێنێ ﴿ثُمَّ بَدَّلَ حُسْناً بَعْدَ سُوءٍ﴾ مەگەر تۆبە بکەن بەهۆی تۆبە کردنەکەیانەوە ببنە چاکەکارو واز لە خراپەکاری بهێنن.

﴿فَإِنِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەوە من بۆیان لێخۆشبوو تاوانپۆشم، ڕەحمەتو لێخۆشبونم بۆیان بەرفراوانو لەبن نەهاتووە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً ثُمَّ اهْتَدَى﴾ (طه/٨٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾ (النساء/١١٠)

ئێستا کە: حەزرەتی موسا ﷺ سەرخۆکەوتەوە، دڵی ئارام بووەوە، خودا موعجیزەیەکی تری پێ دەبەخشێ پێی دەفەرموێ: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ دەستت بخەرە ناو باخەڵی خۆتەوە، دەستت بە بەرۆکی خۆت دا بکە، ئەگەر دەستت بخەیە ناو بەرۆکتەوەو دەری بهێنیەوە دەدرەوشێتەوە وەکوو پارچە ئەستێرەیەکی پرشنگداری لێدێ، هیچ دیاردەی نەخۆشیشی پێوە نابێ.

موعجیزەی یەکەم بریتی بوو لەگۆڕاندنی دارێکی وشكو برینگ کەبەدەستیەوە بوو بەمارێکی هاروهاج. موعجیزەی دووەم بریتی بوو لەگۆڕینی خودی دەستەکە بەشتێکی پرشنگدارو نوورانی.

﴿فِي تِسْعِ آيَاتٍ إِلَى فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِ﴾ ئەم دوو موعجیزەیە بەشێکن لەو نۆ موعجیزانەی پشتگیری پێغەمبەرایەتی تۆی پێ دەکەین‌و دەیانکەین بەنیشانەی راستی پەیامی تۆ بۆ لای فیرعەون‌و گەلەکەی. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ (الإسراء/١٠١).

ئەمجار بایسی ناردنی موسا بەموعجیزەوە بۆ سەر فیرعەون‌و تاقمەکەی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ واتە: چونکە ئەوان گەل‌و نەتەوەیەکی لەرێ دەرچوو بوون، لەرێبازی حەق لایان دابوو، لەچوارچێوەی سروشت دەرچووبوون، فیرعەون لافی خودایەتی لێدەداو ئەوانیش تەصدیقیان دەکردو بەخودایان دەزانی ملیان بۆشۆڕکردبوو چی پێ دەگوتن جێ بەجێیان دەکرد!!

ئەمجا بابزانین فیرعەون‌و دارو دەستەکەی چۆن بەرەنگاری حەزرەتی موسا بوونەوە؟ چ هەڵوێستیان نواند بەرامبەر موعجیزەکانی؟ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ آيَاتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ جا کە نۆ موعجیزەو بەڵگەکانی ئێمە نیشانی فیرعەون دران‌و بەئاشکرا پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موساو هارونیان (علیهما السلام) چەسپاند، ئینکارییان کرد هەرچەندە موعجیزەکان هێندە ئاشکراونمایان

بوون خۆیان خۆیان دەچەسپاند، کەچی بەڕواڵەت بەدرۆیان خستنەوەو وتیان: ئەمە سیحرێکی ئاشکراو عەیانە بە درۆخستنەوەکەیان بەزوبان بوو بەڕواڵەت بەدرۆیان خستنەوە.

﴿وَجَحَدُوا بِهَا﴾ ئینکارییان کرد بەظاهیر بەلاّم ﴿وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً﴾ لەناخی دەرونیان دا لێیان عەیان بوو کە ئەوە لەخوداوەیە، زانییان کە: ئەو موعجیزانە حەق‌و راستن، بەدرۆخستنەوە رواڵەتیەکەیان ستەم بوو لەخۆیان کرد، لوتبەرزی بوو لەبەرامبەر حەق دا نواندیان. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً عَالِينَ﴾ (المؤمنون/٤٦).

ستەمیان کرد کە: ئەو موعجیزانەیان بەسیحر لەقەڵەم دان، لوتبەرزییان نواندو ئیمانیان نەهێنا، خۆیانماڵوێرانی دونیاو قیامەت کرد، خۆیان بەفتارەداو بەدبەخت‌و چارەڕەش بوون ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەی بیسەر! بڕوانەو ووردبەرەوە سەرەنجامی ئاشوبگێڕان‌و موفسیدەکان چۆن بوو چییان بەسەرهات!؟

ئەمەش هەڕەشەیە لەوانەی حەزرەتی موحەممەدیان بەدرۆخستنەوەو ئینکاری ئەوەیان دەکرد کە: قورئانی لەخوداوە بۆ هاتبێ، هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکات کە ئەو عەزابە کۆکوژە ریشەکێشکەرەی تووشی ئەوانە هات، تووشی ئەمانیش ببێ. بۆ ئەوەی پێ لەکەللەی شەیتان بهێنێتە خواری‌و واز لەسەر رەقی‌و خۆبەزلزانی خۆیان بێنن‌و توشی ئەوجۆرە عەزابەی گەلە پێشینەکان نەبن!

**چیرۆکی دووەم: چیرۆکی داودو سولەیمانە** (علیهما السلام)

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی دووەمە لەم سورەتە پیرۆزە دا، دوا بەدوای چیرۆکی حەزرەتی موسا دێ، دیاردەی حیکمەتی خودا لەبوونەوەردا دیاری دەکا، ئەوە دەچەسپێنێ کە: قورئان لەخوداوە نازڵ بووەو لەخودای داناو زاناوە هاتۆتە خوارێ، لەم سورەتەدا پەروەردگار باسی ئەو نیعمەتانە دەکا کە: بەحەزرەتی سولەیمانی بەخشین،

پێغەمبەرایەتی‌و فەرمانڕەوایی پێداو بەختەوەری دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەر کرد.

دە با ئێستا بچینە خزمەت چیرۆکەکەو گوێ بۆ قورئان رابگرین بزانین. روداوی چیرۆکە چۆن.رادەنوێنێ!!

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ عِلْماً﴾ بێگومان ئێمە زانیاریمان بەداودو سولەیمان بەخشی، بۆ هەریەکە لەداودو سولەیمانی کوڕی، جۆرە زانیاریەکمان پی دان، فێری یاساو شەریعەتمان کردن، دەیانتوانی کیشەو نیزاعی نێوان ئادەمیزادان یەکالا بکەنەوە.

داودمان فێری خوێندنەوەی زەبوور کرد، کە دەیخوێندەوە هێندە کاریگەر بوو هەموو بوونەوەری دەوروبەری هاوکاری زەبوور خوێندن‌و تەسبیحاتەکەیان دەکرد، کێوەکان‌و پەلەوەرەکان لەگەڵیان دەگوتەوە، چونکە دەنگ و ئاوازی زۆر خۆش بوو، بەدڵ دەیخوێندو زۆر تێیدا رۆدەچوو، لەهەموو شتێکی ماددی دادەبڕاو بەتەواوی بەخوداوە پەیوەست دەبوو، هەروەها فێری زرێ دروستکردن‌و جۆرەها شتی تر بووبوو، سولەیمانی کوڕیشی لەهەندێ لەم شتانەدا هاوکاری باوکی دەکرد.

حەزرەتی سولەیمان عليه السلام فێری زمانی تەیرو تول بووبوو لەزمانی مێرولەو خشۆکەکان حاڵی دەبوو، (با) بۆی رام بووبوو، تەختەکەی بۆ هەڵدەگرت بەیانی تانیوەڕۆ مانگە رێیەك مەسافەی پێدەبڕی!

هەڵبەت لێرەدا جۆری ئەو زانیاریانەی بەداودو سولەیمان (عليهما السلام) بەخشراون دیاری ناکا، چونکە لێرەدا مەبەست خودی زانیاریەکەیە، دیاری کردنی جۆرەکانی نیە، هەروەها ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە: هەموو زانیاریەك خودا دەیبەخشێ، پێویستە هەموو زانایەك بزانێ سەرچاوەی زانیاری لەخوداوەیە، شوکرو سوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتی زانیاری‌و خودا چۆنی بوێ ئاوا فێری هی تری بکەن، وانەکەن زانیاریەکەیان ببێتە هۆی دوورکەوتنەوەیان لەخودا، یان خودایان لەبیر بەرێتەوە.

ئەوەتا حەزرەتی داودو سولەیمان (علیهما السلام) حەمدو ثەنای خودایان کرد لەسەر نیعمەتی زانیاری ﴿وَقَالا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي فَضَّلَنَا عَلَى كَثِيرٍ مِنْ عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وتیان: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەیە کە: ئێمەی ڕێزدارکردوە بەسەر زۆربەی بەندە موسوڵمانەکانیدا، بەهۆی ئەم زانیارییەی پێی بەخشیوین، خێرو فەڕی دونیاو قیامەتی بۆ دەستەبەرکردوین، ئەوەی داویەتی بەئێمە نەی داوە بەبەندەکانی تری سەردەمی ئێمە!

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ڕێزو نرخی زانیاری، ئاماژەیە بەوە کە: هیچ پلەوپایەیەك ناگاتە پلەو پایەی زانست و زانیاری، زانایان لەژوور هەموو.کەسێکەوەن، وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان ئەمە دەچەسپێنێ و.دەفەرموێ: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ (المجادلة/١١).

لەهەمان کاتدا هەڵنانی زانایانی تێدایە بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن لەسەر نیعمەتی عیلم و لەخۆیان بایی نەبن و خۆیان بەرەوشتی تەواضوع ئارایش بدەن، ئەوەتا ئەوان خۆیان لەهەموو کەس باشتر لەقەڵەم نەدا، بەڵکوو وتیان: خودا ئێمەی ڕێزدارکردوە بەسەر زۆرینەی ئادەمیزاددا، نەیانگوت بەسەر هەموو ئادەمیزاددا.

ئاشکراشە ڕێزدارترین زانیاری زانیارییە دەربارەی زات و صیفاتی خودا، هەر زانست و زانیارییەك دڵ لەخودا دووربخاتەوە زانیاری چەواشەیەو زیانی زۆرترە لەسودی. خۆشبەختی بۆ خۆی و ئادەمیزادان دەستەبەر ناکا. دەبێتە مایەی بەدبەختی و ترس و دڵەڕاوکێ و ولات وێرانبوون و قەلاچۆکردنی ئادەمیزادو هۆکاری لەناوبردنیان بەتاك و بەکۆ.

بێگومان ئەمڕۆ زانیاری پێشکەوتووەو ئادەمیزاد گەیشتۆتە پلەیەکی بەرز لەبواری دروستکردنی چەکی ئەتۆم و بەکارهێنانی زەڕەو چەکی کیمیایی، بەلام

تا ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لەو عیلم‌و زانیارییە جگە لە کوشتن‌و لەناوبردنی ئادەمیزاد بەکۆمەڵ‌و ڕیشەکێش کردنی گەل ونەتەوەو وێرانکردنی وڵات... هتد چیدی دەست نەکەوتووە، چونکە هەڵگرانی ئەو زانستە خودا ناناسن، لەخودا ناترسن، سوپاسی خودا ناکەن زانیارییەکەیان بۆ ڕێبازی خوداپەرستی بەکارناهێنن.

مرۆڤایەتی چی دەستکەوت لەچەکی ئەتۆمی ئەمریکی جگە لەو هەموو قوربانییەوەحشی گەرییەی لەئاکامی ئەو دوو قونبولە زەڕییانەی لە هیرۆشیماو ناکازاکیدا ؟! کە دەست لەعاست دووسەدو دە تا دووسەدو چل هەزار یابانی خپ کردو ئەو گۆڕستانە بەکۆمەڵەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تۆمار کرد، ئەمە جگە لەوانەی کە لەپارچە بوون‌و جەستەیان تەشویهو شێوێندرا، ئەندامیان لەدەست دان‌و دوایی بەکاریگەری ئەو زەڕیە گیانیان لەدەستدا کە: ئەمانیش بەدەیان هەزار بوون هەروەها جگە لەو کاریگەرییەی: کە تا ئێستاش‌و لەمەودواش لەسەر چینە لەدایکبووەکانی ئەو وڵاتە دوا ئەوکارەساتە، جێماوەو جێ دەمێنێ.

یان بێینە سەرباسی خۆمان‌و غەیبەتی خۆمان بکەین گەلی موسوڵمان‌و عەرەب بەگشتی‌و گەلی عێراق بەتایبەتی‌و گەلی کورد بەتایبەتی تر، چیان دەستکەوت لە پێشکەوتنی زانیاری عێراقی لەبواری چەکسازی دا؟ جگە لەو هەموو قوربانیانەی شاری هەڵەبجەو دەوروبەری‌و گوندی سێوسێنانی قەرەداغ و دۆڵی بالیسان‌و گەلێ شوێنی تری کوردستان، کە بە چەکی کیمیایی‌و گازی خەردەل ڕشێندران‌و هەناسەیان لەهەزاران خەڵکی بێدیفاع بڕی.

بەناحەق ئەو هەموو خەڵکە وەرزێرو سەپان‌و دوکانداروو حەماڵ‌و ئاژەڵدارو چەوساوەو لەژین خۆشی نەدیتوانەیان بەو چەکە کۆکوژییە نەفرین لێکراوە قەڵاچۆکردو ژینگەی هەواسازی کوردستانی پیرۆزیان پیس کرد، سەرژمێری سەرەتایی قوربانیانی کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەپانزە هەزار کوژراوو بریندار مەزەندەکرا، پێدەچێ زیاتریش بووبێ هەر خوداش دەزانێ چەند کارەساتی دڵ تەزێن‌و خاپوورکاری تر لەئاکامی پێشبڕکێی بواری چەکسازی ئێران‌و

پاكستان‌و هيندستان‌و ئيسرائيل‌و گەلێ ولاتی تری ئاسياو رۆژهەلاتی ناوەراست دەكەونەوە!!

هەلبەتە ئەوەی ئێستا ولاتە زلهێزەكانی‌وەكوو ئەمريكاو روسياو صين‌و ئينگليزو فەرەنسا ئامادەيان كردوە لەو چەكە كۆكوژيانەی وەكوو قونبولەی هايدرۆجين‌و گەلێك چەكی كوشندەی تر، قونبولەی هيرۆشيماو ناكازاكی لەچاويانەوە وەكوو تۆپی ياری كردنی مندالێوايەو بەرامبەريی ناكرێن، هەر مەگەر خودا مرۆڤايەتی بپارێزێ لەبەروبوومی زانياری زانای بێدين‌و بێ ويژدان، ئەگينا مرۆڤايەتی لەئەوپەڕی خەتەردايە!!

﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ﴾ حەزرەتی سولەيمان ﷺ دوای مردنی حەزرەتی داودی باوكی جێگای ئەوی گرتەوە، ميراتی پێغەمبەرايەتی‌و زانياری‌و فەرمانڕەوايی لێگرت، حەزرەتی داود مندالی زۆربوون، زێدە لەهەموويان ناوی سولەيمانی هێنا، چونكە ئەو بەتايبەتی ئەو، ميراتەی گرت‌و ئەو بەهرانەی بۆ بەجێمان، مەبەست ميراتی مال‌و سامان نيە پێغەمبەران ميراتی مال‌و سامانيان لێناگيرێ.

ئيمامی بوخاری‌و موسليم‌و ئەبو داودو نەسائی لەعائيشەوە فەرموودەيەكيان ريوايەت كردوە، دەفەرموێ: (نحن معاشر الأنبياء لا.نورث ، ماتركناه صدقة ).

حەزرەتی داود ﷺ خوداپەرستی‌و عيبادەتی لەحەزرەتی سولەيمان ﷺ زۆرتربوو، وەلێ حەزرەتی سولەيمان ﷺ لەبواری فەرمانڕەوايی‌دا شارەزاترو زيرەكتر بوو، فەرمانڕەوايی‌و دەسەلاتی لەباوكی بەرفراوانترو بەهێزتر بوو، بای بۆ بەيدەست بوبوو، چۆنی بويستايە ئاوا هەلێدەگرت‌و دەيگواستەوە! شەياتينی پابەندی فەرمان‌و نەهيەكانی بوون، زمانی گيانلەبەرانی دەزانی.

﴿وَقَالَ﴾ حەزرەتی سولەيمان ﷺ لەباسی نيعمەتەكانی خودادا بەسەری دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ﴾ ئەی خەلكينە! ئێمە فێری زمانی

پەلەوەر کراوین؛ خودا بەفەزڵو گەورەیی خۆی، زمانی گیانلەبەرانی فێرکردوین، هەر لەگەڵ دەنگیان لێهات دەتوانم بزانم ئەو گیانلەبەرانە مەبەستیان چیە! چیان دەوێو لەچی نارازین.

هەندێ ئادەمیزادی واهەن کە: خەریکی بەخێوکردنی گیانلەبەران دەبن، هەندێ جار لەبڕێ دەنگی گیانلەبەران حالّی دەبن، کە گوێیان لەدەنگی ئەسپ و هێسرو گوێدرێژو رەشەوڵاخو حوشترو پشیلەو سەگو مریشكو جوجیلە دەبێ لەمەبەستو داخوازییەکانیان تێ دەگەنو دەزانن کە؛ برسییانە یان تینوویانە، یان نارەحەتیو ئازاریان هەیە، یان نا.

لەزۆر رۆژگارو سەردەمیشدا خەڵکی هەوڵیان داوە لەزمانی گیانلەبەران حالّی بن. بەتایبەتی لەم رۆژگارانەدا کەسانێك هەن خۆیان تەرخان کردوە بۆ فێربوونو تێگەیشتن لەزمانی پەلەوەرو باڵندەکان! دەیانەوێ حاڵەتی کەیفخۆشیو نارەحەتیان بزانن چۆن داوای خواردنو خواردنەوە دەکەن. هەروەها هەندێ کەس هەن هەوڵ دەدەن لەزمانی مێرولەو هەنگ حالّی ببن.

وەلێ پێویستە ئەوە بزانین زمان زانینی گیانلەبەران لەلایەن حەزرەتی سولەیمانەوە لەشێوەی زمانزانینی زانایانی سەردەم نەبوە کە: هەوڵ دەدەن لەرێگەی حەدسو گومانەوە شتێکیان لێحالّیبن، بەڵکوو زمانزانینەکەی حەزرەتی سولەیمان بەشێوەی موعجیزە بووە، واتە: وەهبی بووە، کەسبی نەبوە، بەهەوڵدانو فێربونو توێژینەوە وەدەستی نەهێناوە، لەلای خوداش شتێکی زۆر ئاسانە کە بەندەیەکی خۆی فێری زمانی گیانلەبەران بکا، ئەو بەهرەیەی پێ ببەخشێو بەهرەمەندی بکا بەبێ ئەوەی هەوڵو تەقەللای بۆ دابێ!!

﴿وَأُوتِينَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ﴾ خێرو بێرێکی زۆرمان پێ بەخشراوە، خودا هەموو شتێکی پی داوین، لەئایینو دونیاو فەرمانڕواییو ماڵو سامان کەمو کورپمان نیە،لەهەموو شتێك دا دەوڵەمەندین.

﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ﴾ بێگومان ئەم بەخششەی خودا پێی بەخشیوین، ئەو عەطایەی خودا پێی بەخشیوم لە پێغەمبەرێتیو پاشایی‌و فەرمانڕەوای بەخشێکی خوداییە بەئاشکراو عەیان پێمەوە دیارەو سوپاسگوزارین لەسەری چەندێك سوپاسی بکەین هێشتا کەمە.

ئەم قسەیەی حەزرەتی داود ﷺ لەروانگەی شوکرو سوپاسەوەیەوەکوو چۆن پێغەمبەرﷺ لەفەرمووەدیەکیدا کە: موسلیم‌و ئەبوداود لەئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: (أنا سید ولد آدم یوم القیامة لافخر) واتە پێغەمبەرﷺ لەروانگەی سوپاسەوە نەك لەروانگەی شانازیکردن‌و لەخۆبایی بوونەوە ئەم فەرمودەیەی فەرمووە.

﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنْ الْجِنِّ وَالإِنْسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ سوپا بۆ سولەیمان لەهەموو لایەکەوە کۆکرایەوە لەجنۆکەو ئادەمیزادو باڵندە سوپای بۆ ڕێك خرا، بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش‌و شکۆمەند سوپا تەیار کرا، بۆ ئەوەی هەر کەسێك نەیەتە ژێر فەرمانی سولەیمانەوە بەو سوپایە تەمبێی بکا.

دام‌و دەزگای حەزرەتی سولەیمان ﷺ بە ئەوپەری ڕێك‌وپێکی کۆکرابوەوە، ڕیزێك ئادەمیزاد ڕیزێك جنۆکە چینێك باڵندە، ئەگەر پێشەتای سوپاکە تۆزێك سەرەڕۆبوونایە ڕادەگیران بۆ ئەوەی دواوەی سوپاکە بەجێ نەمێنی‌و تەرتیب‌و نیظام تێك نەچێ، کەس پێش نەکەوێ‌و کەس دوانەکەوێ. هەرکەسە شوێن جێگای خۆی بزانێ‌و لێی تێپەڕنەکا.

جنۆکە عالەمێکی نادیارن لەئێمە نازانین ماهییەتیان چیەو چۆنە، جگە لەوەی قورئان لێیانەوە دەفەرموێ: کە لەبڵێسەی ئاگر دروست کراون. ئەوان ئادەمیزاد دەبینن بەڵام ئادەمیزاد ئەوان نابینن، دەتوانن ختوکەی شەڕو فیتنەیی بخەنە ناودڵی ئادەمیزادەوە، بەڵام نازانین چۆن ئەو ختوکەیە ئەنجام دەدەن.

هەندێکیان بڕوایان بە پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر ﷺ نەی بینی بوونو بەئیمانهێنانەکەشی نەزانیبوون، خودا ئەم هەواڵەی پێدا وەکوو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَداً﴾ (الجن/١-٢).

هەر لەروانگەی قورئانەوە دەزانین کە: کۆمەڵێ لەجندۆکەو شەیاتیینی گەردنکەچی حەزرەتی سولەیمان عليه السلام بوون، بەفەرمانی ئەو جۆرەها پیشەسازیان ئەنجام داوە، میحرابو پەیکەرو مەنجەڵی گەورە بۆ خواردەمەنیو گەڵێ شتی تریان بەدیهێناوە. بنکی دەریایان پشکنیون چ کارێکی لێ داواکردبن خێرا بۆیان ئەنجام داوە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ هەموو ئادەمیزادی سەر زەوی نەبوونە سەربازی لەشکری حەزرەتی سولەیمان عليه السلام چونکە فەرمانڕەوایی حەزرەتی سولەیمان عليه السلام تەنها ئەو ناوچەیەی گرتۆتەوە: کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ فەلەستین، لوبنان ، سوریا، عێراقیش تا کەناری زێی فورات، لەم ناوچانەدا حەزرەتی سولەیمان عليه السلام فەرمانڕەوایی کردوە.

هەروەها هەموو جندۆکەو شەیاتینی نەهاتبوونە ژێر باری حەزرەتی سولەیمانەوە، بەڵکوو کۆمەڵێکیان خودا بۆی موسەخەر کردون، بەڵگەمان لەسەر ئەمە ئەوەیە قورئان دەفەرموێ: ﴿إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ﴾ (الكهف/ ٥٠ ).

لە سورەتی (الناس)یشدا دەفەرموێ: ﴿الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ، مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ﴾ ئەمە مانای وایە بڕێ لەجندۆکەو شەیاتینی بەختوکە ئادەمیزاد گومڕادەکەنو لەسەردەمی حەزرەتی سولەیمانیش دا کردویانە، دەی ئەگەر هەموو جندۆکەو شەیاتینی گەردنکەچی فەرمانی حەزرەتی سولەیمان عليه السلام بووبن، ناگونجێ کاری ختوکەدانو گومڕاکردنی ئادەمیزادیان ئەنجام دابێ، چونکە ئەو

پێغەمبەرە بانگەوازی هیدایەتی بڵاوکردۆتەوە، چۆن دەبێ کەسێك پابەندی فەرمانی ئەوبێ‌و کاری گومڕایی ئەنجام بدا!؟

هەروەها هەموو باڵندەو پەلەوەری سەر زەوی گەردنکەچی فەرمانی حەزرەتی سولەیمان ﷺ نەبوون، بەڵکوو کۆمەڵێك لەتەیرو تیول پابەندی فەرمانی بوون، چونکە کاتێك حەزرەتی سولەیمان ﷺ سەرژمێریەکی باڵندەکانی کرد ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ﴾ەی ئەنجام دا یەکسەر زانی کە پەپۆسلێمانکە دیارنیە.

فەرمووی: ﴿مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ﴾ بەشێوەی مەعریفە هێنای، دیارە هودهودێکی تایبەتی بووەو روخساری لای حەزرەتی سولەیمان ﷺ نمایان بووە. جا یان تەنیا ئەو پەپۆسلێمانکەیە لەپێری پەپۆسلێمانکەکان بەشداری ئەو مانۆڕەی کردوە، یان ئەوجارە نۆرەی ئەوبووە، هەرچۆنێك بێ ئەو هودهودە لای حەزرەتی سولەیمان ﷺ ناسراو بووە.

ئەوەی پشتگیری ئەم رایە دەکات ئەوەیە کە: ئەو هودهودە هەست‌و بیرێکی جوداوازو تایبەتی هەبووە، لەجۆرەکانی تردا نەبوو، بەڵکوو لەهوموو باڵندەکان دا نەبووە، کەوابوو دەبێ ئەو جۆرە زیرەکییە لەو جۆرە هودهودە دا بووبێ کە: گەردنکەچی حەزرەتی سولەیمان ﷺ بوون. چونکە ئەو زیرەکی‌و لێزانیەی لەو پەپۆسلێمانکەیەدا دەست کەوت هەر لەئادەمیزادی عاقڵمەندی زیرەکی خوداناس دا بەدی دەکرێ!

موجاهید دەفەرموێ: حەزرەتی سولەیمان ﷺ بەسەر هەموو کۆمەڵێك لەسوپاکەی‌دا سەرپەلێکی دانابوو، سەرپەرشتی شێوەی رۆیشتنی سوپاکەیان دەکرد، نەیاندەهێشت سوپاکە لێك پەرتەوازە ببێ. هەندێکیان زۆر پێش نەکەون‌و هەندێکیان دوابکەون‌و تەرتیب‌و نیظام تێك بچێ.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە: پێغەمبەرێتی‌و فەرمانڕەوایی بۆ حەزرەتی سولەیمان ﷺ دەستەبەر بووە. سەڵتەنەت‌و دەست رۆیشتنێکی وای پێ

بەخشراوە بۆ کەسی تر ئەوە دەستەبەر نەبووە، ئەمەش بەخششو نیعمەتێکی خودایی بووە، گیرا بوونی دوعاو پاڕانەوەکەی بوو کە: ﴿قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكاً لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ، فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاء حَيْثُ أَصَابَ، وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاء وَغَوَّاصٍ﴾ (ص/٣٥-٣٧) یان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ، يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ﴾ (سبأ/١٢-١٣).

بەسەرنجدان لەمانای ئەم ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کە: پەروەردگار ئادەمیزادی بۆ حەزرەتی سولەیمان ﷺ ژێربار کردبوون، سوپایەکی زۆرو زەبەندەی لێپێک هێنابوون، جندۆکەیشی بۆ موسەخەر کردبوون قەصرو باڵەخانەی بەرزو فراوانو مەنجەڵی گەورەو پانو پۆڕیان بۆ دروست کردون. باڵندەشی بۆ ژێربار کردبوون بۆ ئەنجام دانی زۆر شتی تر کەلەمەودوا لەباسی چیرۆکی پەپۆسلێمانکەدا ئاماژەی پێدەکەین.

بەڵێ لەشکری حەزرەتی سولەیمان ﷺ مانۆڕی خۆی دەست پێکرد، لەشکر تێکەڵاو لەئادەمیزادو جندۆکەو باڵندە، تەرتیبو نیظامی ڕێکوپێک، ڕۆیشتنو جمەوجوڵی، هەنگاوو شەپۆلی هەڵوێستەو بارگەخستنی بەیەکەوە گونجاوو سەرنج ڕاکێش. سوپا جماو ڕەو بەردەوام بوو.

﴿حَتَّى إِذَا أَتَوْا عَلَى وَادِي النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ هەتا حەزرەتی سولەیمان ﷺ بەخۆیو لەشکریەوە گەیشتە (وادي النملة) - دۆڵە مێرولە - وەکوو دەڵێن: دۆڵێکە لەشام مێروی زۆرە. بۆیە بەناو مێرووەوە ناونراوە. ئا لەو کاتەدا مێروویەک کەسەرپەرشتی مێرولەکانی تری لەئەستۆ بوو، بانگی لەمێرولەکانی تر کرد وتی: ئەی مێرولەکان! هەمووتان خۆتان تاقەت بکەنو هەریەکەتان بچێتەوە شوێنو

خانـەی خـۆی، نـەبادا سـولەیمانو لەشـکرەکەی پـان.و پلـیـشتان بکەنـەوەو پێتـان نەزانن.

هەڵبەتە عالەمی مێرو وەکوو عالـەمی هـەنگ تـەرتیبو تـەنظیمیکی سـەرنج راکێشی تێدایـە، هەرتاکـەو ئـەرکی خـۆی هەیـە، کۆمـەڵ کۆمـەڵو گـرۆ گـرۆن، هەرتاقمـەو لێپرسـراوی خـۆی هـەیە، ئـەوپـەڕی رێکخـستنو تـەنظیمو پێکـەوە گونجانی تێدا بەرچاو گیراوە، ئەو تـەنظیمو رێكوپێکییـە زۆر بەدەگمـەن لـەناو بەرەی ئادەمیزاد دا هەیە، کەم رێ دەکەوێ ئادەمیزاد بتوانن کۆمەڵگای خۆیان ئـاوا رێك بخـەن. دیـارە لـەناو خۆیـان دا زمـانی لێـك حـاڵی بـوونو تێگەیـشتنیان هەیـە، خودا جۆرە زمانێکی تایبەتی پێداون، لەناو خۆیان دا ئاخاوتنی پێدەکەن.

رسـتـەی ﴿لا يَحْطِمَـنَّكُمْ﴾ وێدەچـی وەلامـی فـەرمان بـێ واتـە: ﴿ادخلـوا لايحـطمنکم ..﴾ وەکوو دەگوترێ ( اجتهد لاترسب ) هـەروا وێ دەچـێ نـەهی بـێ لەجیاتی ئەمر بەکارهاتووە واتە: پێیان دەڵێ: لەم جێگایەی ئێستاتان مەمێننـەوە، چونکە ئەگەر بمێننەوە سوپای سولەیمان پانو پلیشتان دەکەنەوە.

حەزرەتی سولەیمان ﷺ لەئاخاوتنی مێرولەکە حاڵی بـوو، بـەو حـاڵی بوونـە کەیف خۆش بوو، لەخۆشیان خـەریك بـوو شاگەشـکەبێ. کـەیف خـۆش بـوو بـەوەی کە: ئەو جەستە بـچکۆلانەی بەنـەزانین پـانوپلیش نـەکردەوە، بـەوە کـەیف خـۆش بوو کە تێگەیشت ئەو شامێرووە چی بە مێروەکانی تر گوت، بەلایەوە نیعـمەتـێکی فرە مەزن بوو؛ کە خودا تـوانای ئەوەی پی داوە پەیوەندی بکا بەو عالەمە داخراوە لەخەڵکی تر، بتوانێ لەئاخاوتنیان لەگەڵ بگاو بزانێ چی دەڵێن. کەیـف خۆش بوو چـەنکە بەلایـەوە جێگـای سەرسـوڕمان بـوو، کـە ئـەو مێـروە ئـەو جـۆرە عـەقڵو دووربیـنییەی هەبێو مێروەکانی تر لێی حاڵی ببنو بەگوێی بکەن.

حـەزرەتی سـولەیمان ﷺ لەمانـە حـاڵی بـوو ﴿فَتَبَـسَّمَ ضَـاحِكاً مِـنْ قَوْلِهَـا﴾ زەردەخەنەیەکی لەخۆشیان هـاتێ، خێـرا ئـەم دیمـەنو روداوانـە ناخیـان جوڵانـدو

لەخۆشیان وەلەرزە کەوت. دڵی گەڕایەوە بۆ لای ئەو خودایەی ئەو نیعمەتانەی پێ بەخشیوە، نیعمەتێك: کە خۆی لەخۆیدا موعجیزەیە.

پەردە لابردنە لەنێوان حەزرەتی سولەیمان ﷺ و ئەو عالەمە دابڕاوانە لەخەڵکی تر، بۆیە لەناخەوە روی کردە پەروەردگارو لێی پاڕایەوەو.

﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ﴾ وتی: خودایە! هەموو هەستم ئامادەبکە، هەموو ئەندامەکانم رام بکە بۆ ئەوەی بتوانم سوپاسی نیعمەتەکانت بکەم، خودایە زوبان‌ودڵم، هەست.و دەروونم، وشەو رستەو کارو کردەوەم بیرو بۆچونم، هەموو هێزو توانام سەرەتاو کۆتایی ئەوەڵو ئاخری هەمووی سەرگەرمی سوپاس‌و ستایشی نیعمەتی تێگەییشتن لەزمانی باڵندەو گیانلەبەرانی تر بن.

سوپاسی ئەو نیعمەتەو نیعمەتەکانی تری زاتی بێچونت بکەم کە: بەمنت بەخشیون، هەروا ئەو نیعمەتە جۆراو جۆرانەی بەخشیوتن بەباوکم. کە لەهەموو نیعمەتەکان بەرزترو گرنگتر نیعمەتی ئیمان‌و ئیسلامە.

تەعبیر بە وشەی ﴿أَوْزِعْنِي﴾ کە بەمانای ئامادەباشی هەموو ئەندام‌و هەست‌و هێزو تواناکانە بەئامادەباشییەکی سەرتاسەری‌و بنەڕەتی‌و یەکانگیری، تەعبیرێکە ئامازەبەو ناستە بەرزە دەکا کە: دڵو دەروونی حەزرەتی سولەیمان ﷺ لەئاکامی ئەو نیعمەتانەوە پێی کاریگەربووەو رەنگدانەوەیەکی قوڵی تێدا پەیدا کردوە، دیمەنی ئەو کاریگەرییە بەجوانی دەکێشی‌و هەژانی ناخی سولەیمان‌و ئامادەباشی‌و بەندایەتی هەست بەئاتاجی خۆی بۆ لای خودا نمایش دەکا. لەناخەوە هەست بەنیعمەتەکانی خودا دەکا بەسەر خۆی‌و باوکیدا.

وێڕای سوپاس‌و ستایشی بۆ زاتی پەروەردگار داوا دەکا خودا تەوفیقی بدا بۆ ئەنجام دانی کردەوەی پەسەند، دەفەرموێ:

﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ﴾ خودایە تۆفیقم بدە بۆ ئەوەی بتوانم کردەوەی پەسندیوابکەم تۆ پێی رازی بی. ﴿وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ﴾ خودایە بەفەضلو گەورەیی خۆت لەو دونیادا بمخەرە ناو بەهەشتی ڕازاوەی خۆتو لەپێری پیاوچاکانو پێغەمبەرانو خۆشەویستانی خۆت تۆمارم بکە!

هانا بۆ خودا دەبا کە: لەپێری ڕەحم پێ کراوو ڕێ ڕاستاندا حیسابی بکا، لەخودا دەپارێتەوە لەگەڵ ئەوەدا دەزانێ پێغەمبەرەو خودا نیعمەتی پێغەمبەرایەتی پێبەخشیوە، ئادەمیزادو جندۆکەو باڵندەی بۆ موسەخەر کردون. ترسی ئەوەی هەیە کردەوەکانی کورت بێنن، شوکرو سوپاسگوزاریەکەی کەمو کورتی تێدابێ. دەیەوێ بەچاودێری خوداو توفیقو یارمەتیدانی بەختەوەری دوارۆژی مسۆگەر بکا، تەقواو خوداپەرستیو ترسی لەعەزابی خودا هەستی هەمیشە ئاتاجی بەندەیی بۆ لای خودا لەلا بەرجەستە کردبوو ، بۆیە لەوکاتەدا کە ئاثاری نیعمەتی خودا بەسەر خۆیەوە دەبینێ هانا بۆ خودا دەبا کە: تۆفیقی بدا بۆ ئەنجام دانی کاری باشو خوداپەسەند!

**دوو موعجیزە:**

هەڵبەتە ئێمە لەئایەتەکەدا هەست دەکەین بەدوو موعجیزە، دووشتی سەرئاساو لەعادەت بەدەر، یەکێکیان موعجیزەی تێگەیشتنی حەزرەتی سولەیمان ﷺ لەئاخاوتنی مێرووەکە، موعجیزەکەی تریان ناسینی حەزرەتی سولەیمانە لەلایەن مێرووەکەوە، ئەمەش بۆ خۆی موعجیزەیەکی ترە، پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەینوتێی بفکرین بزانین کە: خودا خاوەن تواناودەسەڵاتی رەهایە هەرچی دەیەوێ، دێتەدی، هەر چی بیەوێ بیکا دەیکا!

**موعجیزەی یەکەم:** کە تێگەیشتن بوو لەزمانی مێرووەکە لەلایەن حەزرەتی سولەیمانەوە هێندەی موعجیزەی دووەم سەرسوڕهێنەر نیە، چونکە بەڕواڵەت حەزرەتی سولەیمان ﷺ ئادەمیزادەو پێغەمبەرە، خودا بەموعجیزە ئەو زانیاریو

تێگەیشتنەی پێ بەخشیوە، کارەکە بەنیسبەت ئەوەوە نزیکترە لەوەرگرتنو قبوڵ بوون!

بەڵام مێرویەکی بەرواڵەت بێزمان بزانێ ئەوانە سولەیمانو لەشکرەکەیەتیو ئەگەر پێیان لێبنێن دەیان پلیشێننەوە، ئەمە موعجیزەیەکی ترەو لەهی پێشوو سەرسوڕهێنەرترەو ئادەمیزاد پێوەی ڕانەهاتوونو خاریقولعادەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ ئاماژە دەکا بەعەدالەتکاری حەزرەتی سولەیمان ﷺ و لەشکرەکەی، تەنانەت تەقواو لەخودا ترسییان گەیشتۆتە ئاستێك بەئەنقەست زیان بەمێرولەیەکیش ناگەیەنن. ئەگەر ئاگایان لێبێ مێرولەیەکیش پلیش ناکەنەوە. ئەگەر شتێکی لەو جۆرە ڕوی دا ئەوە بەنەزانییەو ئاگادارنین، بۆیە دەڵێن: حەزرەتی سولەیمان ﷺ ئەوەندەی بەتێگەیشتن لەزمانی مێروەکە کەیف خۆش بوو هێندەی تر بەوە کەیف خۆش بوو کە: خودا بەو جۆرە صیفەتی عەدالەتکاری بەخۆیو سوپاکەی بەخشیوەو پابەندی فەرمانی خوداو بەئەنقەست زیان بەکەس ناگەیەنن.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە: پەروەردگار عەقڵو غەریزەی بەرێوەچوونی ژیانی بەهەموو گیانلەبەرێك بەخشیوە، هەموویان هەستی ئەوەیان تێدایە چی زیانیان پێدەگەیەنیو چی بەسودە بۆیان.

کەسێك لێکۆڵینەوە لەسەر سروشتی گیانلەبەران بکاو سەرنجی سروشتو تایبەتمەندیەکانیان بدا، شتی زۆر سەرسوڕهێنەریان لێدەبینێو ئیلهاماتو هەستی زیرەکانەی جۆراو جۆریان لێبەدی دەکا. ئەمەش هەموو داخوازی ئەوە دەکەن کە: بڕوا بەو خودا خاوەن دەسەلاتە بکەین کە: ئەم هەستو شعوورەی بەو گیانلەبەرانە بەخشیوەو هەموو شتێکی بەرێوو جییە، هەموو کارێکی پڕە لەحیکمەتو دانایی.

ئەو خودایە کە حەزرەتی موسا ﷺ لە وەڵامی فیرعەون دا کە: لێی پرسین خودای ئێوە کییە؟ ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ (طه/٥٠).

بولبـولێکی خـۆش نـەوا بـووم بـۆی نـەوای دەوری گوڵـت
کـــی وەکـوو هـود هـود حیکایــەتی سـەبای گێرایـەوە
حەریق

## چیرۆکی هود هود لەگەڵ حەزرەتی سولەیماندا

﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَالِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّى وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَىْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ

أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَـٰبِى هَـٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾

دوای بەیانکردنی ئەوە کە: پەروەردگار ئادەمیزادو جندۆکەو باڵندەی بۆ حەزرەتی سولەیمان ژێربار کردبوون، لە سورەتەکەدا ڕۆڵی هەریەکێ لەجندۆکەو ئادەمیزادو باڵندە رون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنْ الْغَائِبِينَ﴾ حەزرەتی سولەیمان چاوی بەناو سوپاکەیدا گێڕاو هەستی کرد کە هودهود دیار نیە، لەڕانواندنی مانۆڕە سەربازییەکەدا کەلێنی دیارەو شوێنی چۆڵە، حەزرەتی سولەیمان کە: زمانی باڵندەی دەزانیو بڕێ لەباڵندەکان ژێرباری بووبوونو بەپێیویستی ئەو هەڵسوکەوتیان دەکرد، پێی سەیر بوو لەناو پێڕی باڵندەکاندا بەبێ ئیزنو روخصەتی ئەو هودهود خۆی هون کردووە، دەیزانی کە: ئەو ئیزنی نەداوەو لەپێڕی ئەوانەیە خۆیان غائیب کردووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە: ئەو پەپوسلێمانکەیە پەپوسلێمانکەیەکی تایبەتی بووە، لەو مانۆڕەدا شوێنی دیار بووە، دیارە جۆرە زەکاوەتو وریاییەکی سەرەج ڕاکێشی هەبووە. لەهەمان کاتدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە حەزرەتی سولەیمان زۆر هوشیارو وردبینو کار دروست بووە، لەناو ئەو سوپا زۆرو بێ شومارەدا پەپوسلێمانکە تاوێك خۆی هون کرد، پێی زانی، بڕیاریدا سزای خۆ هون کردنەکەی لێ بستێنێ!

راڤەکەرانی قورئان دەڵێن: حەزرەتی سولەیمان بۆیە چاوی بۆ هودهود گێڕاو پرسیاری کرد بۆچی دیار نیەو لەکوێیە، چونکە ئەو باڵندەیە دەیزانی لەژێر زەویدا لەکوێ ئاو هەیە، وا بڕیار بوو، شوێنی هەبوونی ئاو بە حەزرەتی سولەیمان بڵێ، ئەویش بەهۆی جندۆکەو شەیاتینیەوە سەر زەوی بخا، هەروا لەدەشتو

بیاباندا حەزرەتی سولەیمانو لەشکرەکەی شارەزا دەگرد بۆ ئەوەی دورو نزیك، پێی دەگوتن چەند لەئاو دورن!

جا کاتێك دیار نەبوونەکەی چەسپا هەڕەشەی لێ کرد بەسزاو تۆڵە لێستاندن ئەگەر بیانووی پەسەندی نەبێ! دیارە حەزرەتی سولەیمان دیارنەبوو نەکەی هودهودی زۆر بەگرنگ گرت، نەبادا فەوضاو خۆ غایب کردن لەناو سوپاکەیدا تەشەنە بکا، سەربازەکانی تریش چاو لە پەپوسلێمانەکە بکەنو هەرکاتێ ویستیان، خۆیان بدزنەوە، بەمەش هەیکەلی سوپاکەی کلۆر دەبێو کەس کاری بەسەر کەسەوە نامێنێو شیرازەی لەشکرەکەی تێکدەچێ، بۆیە هەڕەشەی لەسەربازی دیارنەبووی کردو وتی: ﴿لأَعَذِّبَنَّهُ عَذَاباً شَدِيداً أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ﴾ سوێندم وابێ دەبێ سزایەکی توندو تیژی بدەم، دەبێ بیکوژم، دەبێ هەرچی پەڕو پۆڵی جەستەی هەیە هەمووی هەڵکێشم!! بەڵام وەکوو ئاشکرایە حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەرە پێش ئەوەی پاشاو فەرمانڕەوا بێ! خۆ ئێستا عوزرو بیانووی هودهودی خۆ گوم کردوی گوێ لێ نەبووە، ناگونجێ پێش ئەوەی بەڵگەو بیانووەکانی ببیستێ بڕیاری نیهائی دەربارەی بدا، بۆیە خێراو دوابەدوای بڕیارو هەڕەشەکەی هێڵێکی وەرچەرخانەوەی بۆ خۆی هێشتەوەو فەرمووی: ﴿أَوْ لَيَأْتِيَنِي بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ مەگەر بەڵگەو بیانوویەکی پەسەند بهێنێتەوەوامان لێ بکا واز لە سزادانەکەی بێنین: ﴿فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾.

دیار نەبوونی هودهود هێندەی نەخایاندو هاتەوە، حەزرەتی سولەیمان داوای لێ کرد هۆی غائیب بوونەکەی روون بکاتەوە: ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ﴾ وتی: شتێکم چاو پێکەوتووەو هەواڵێکم زانیوە نەخۆتو نەسوپاکەت ئاگاداری نەبوون، هیچ کامێکتان پێتان نەزانیوە ﴿وَجِئْتُكَ مِنْ سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ ئەمن لەشاری سەبەئەوە هەواڵێکی گرنگو ڕاستو دروستم بۆ هێناوی... بێگومان پەپوسلێمانەکە زیرەکانە بەرگری لەخۆی دەکاو بەوریاییەوە دەیەوێ سەرنجی حەزرەتی سولەیمان بۆلای

خۆی ڕابکێشێ‌و وابکا گوێ بۆ بیستنی هەواڵەکە رابگرێ! بەکورتی بە حەزرەتی سولەیمان ڕادەگەیەنێ کە ئەو گەشتێکی زانستی‌و جوگرافی ئەنجام داوە، چووە بۆ وڵاتی یەمەن‌و سەرەنجی لەدانیشتوانی ئەو دەڤەرە داوەو ئاگاداری داب‌و نەریت‌و شێوەی ئایینیان بووە، دەڵێ: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ﴾ من زانیم کە وڵاتی (سبأ) ئافرەتێك فەرمانڕەوایی دەکاو ناوی بەڵقیسەو کچی شەراحیلە. شەراحیل لەسەردەمی خۆیدا پاشایەکی خاوەن شکۆ بووە.

زومەخشەری دەفەرموێ: پەروەردگار ئەوەی خستە دڵی هودهودەوە کە: بەرەنگاری حەزرەتی سولەیمان بووەستێ‌و ئەم ئاخاوتنەی ئاڕاستە بکا، بە مەبەستی تاقی کردنەوەی زانیاری حەزرەتی سولەیمان‌و ئاگادار کردنەوەی لەسەر ئەوە کە: زەعیف‌و بێ وەج ترین مەخلوقاتی خودا، زانیاری وای لا هەیە کە هێشتا سولەیمان نایزانێ بۆ ئەوەی نەفسی خۆی لەلا بچوك بێتەوەو بەزانیاری خۆی نەنازێ‌و عوجب‌و تەکەببوری زانایان نەیگرێ‌و تووشی فیتنەیی لەخۆبایی بوون نەبێ. هەر زومەخشەری دەفەرموێ: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بێ بناغەیی‌و پووچی بیروبۆچوونی کۆمەڵی رافیضە: کە دەڵێن: ئیمام هەموو زانیارییەکی هەیەو هیچ شتێکی لێ پەنامەکی نیە، پێیان‌وایە ئیمام زاناترینی خەڵکانی رۆژگاری خۆیەتی‌و کەس لەو زاناتر نیە[1].

ئەمجار هودهود درێژە دەدا بەگێڕانەوەی هەواڵەکەی بۆ حەزرەتی سولەیمان‌و دەڵێ: ئەو ئافرەتەی من دۆزیومەتەوە پاشایەکی خاوەن حەشەمە ﴿وَأُوتِيَتْ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ﴾ لەماڵ‌و سامانی دونیا ئەندازەیەکی زۆری دراوەتێ. پاشایەتی‌و ڕێزو شکۆمەندی‌و سوپاو چەك‌و دەسەڵات‌و توانایەکی زۆرو زەبەندەی هەیە. بەکورتی هەرچی پێویستیاتی فەرمانڕەوایی هەیە، بۆی دەستەبەر بووە ﴿وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾ کورسییەکی جوان‌و گەورەی هەیە لەسەری دادەنیشێ بۆ فەرمانڕەوایی، بەجۆرەها

[1] تەفسیری کەشاف ج٢/٤٤٨.

نەخش‌و نیگار ڕازاوەتەوە، ئاڵتون‌و لوئلوئی مرواری زۆری تێدا خەرج کراوە، شاژن لەسەری دادەنیشێ‌و فەرمانڕەوایی دەکا، شکۆمەندی‌و ڕێزو نرخێکی سەرسوڕهێنەری هەیە لەناو وڵات‌و گەلەکەیدا!! مێژوونوسان زۆریان لەباس‌و شکۆمەندی ئەم شاژنە نووسیوە وتوویانە: ئەم کورسییە گەورەو بەنرخە لەناو باڵخانەیەکی گەورەو بەرزو فراواندا بووە، زۆر فەننی بیناسازی تێدا بەکار هاتووە، لەلای خۆرهەڵاتیەوە سێ سەد پەنجەرەو لەخۆرئاوایەوە سێ سەد پەنجەرەی تێدابووە، باڵخانەکەوا دروست کراوە کە هەر ڕۆژە خۆر لەپەنجەرەیەکەوە لەناو باڵەخانەکە بداو لەپەنجەرەیەکی بەرامبەریشەوە ئاوابێ. جا کەبەیانیان خۆر لەناوەوەی باڵخانەکەی داوە خەڵکەکە سوژدەیان بۆ خۆرەکە بردووە، کە ئێوارانیش ئاوابووە بەهەمان شێوە سوژدەیان بۆ خۆرەکە بردوووە. وەکوو لەئایەتی دوایی دا ئاماژە بۆ خۆرپەرستنەکەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَجَدْتُهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمْ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنْ السَّبِيلِ فَهُمْ لا يَهْتَدُونَ﴾ ئەمن بینیم ئەو شاژنەو نەتەوەکەی لەجیاتی خودا، خۆر دەپەرستن، سوژدە بۆ خۆر دەبەن، شەیتان ئەم کردەوە ناشیرینەی لەپێش چاو جوان کردوون‌و وادەزانن کارێکی باش دەکەن، بەو جۆرە شەیتان لەڕێبازی ڕاست لای داون‌و تووشی گومڕایی کردوون، سەری لێ شێواندون، مەنهەج‌و ڕێڕەوی پێغەمبەرانی لێ گوم کردون، ئەوان‌وایان لێهاتووە ناتوانن بۆخۆیان بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێبازی ڕاست‌و مەنهەجی حەق بگرنە بەرو بزانن کە: ﴿أَلاّ يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَوَاتِءالأَرْضِ﴾ پیتی (لا) لە (أَلاّ يَسْجُدُوا)دا زێدەیە ئەصڵەکەی (أن يسجدوا) بووە (لا) زیادکراوە نوونی تێدا دەغم کراوە.

واتە: شەیتان لەخشتەی بردن‌و ڕێگای ڕاستی لێ گوم کردن، بۆ ئەوەی هیدایەت ئامێز نەبن‌و سوجدە بۆ ئەو خودا زاناو دانایە نەبەن، کەشتی پەنهانی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا دەردەخا، ئەو خودایە ناپەرستن، کەلە نەبوونەوە شت دروست

دەکا، هەروەها تۆم لەژێر خاکدا دەڕوێنێو دەری دەخا، هەروەها دەرخستنی شتی پەنامەکی ناو دەروونی خەڵكو تاوانی پەنامەکیو کەس پێ نەزانیو دەردەخا! بەکورتی خودا زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو نهێنیو پەنامەکییەکی ناو بوونەوەری پانو فراواندا. هەرکاتێ بیەوێ دەری خاو ئاشکرای دەکا! هەموو نهێنیو پەنامەکییەك لای خودا ئاشکراو نمایانە. وەکوو لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَوَاء مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ – الرعد/١٠﴾.

جا کە ئەوەی بەیان کرد کە: هەموو عالەمەکان ئاتاجی خودانو پێویستیان بەنەخشەو پلانی ئەو هەیە، شتێك باس دەکا وەکوو بەڵگەوایە بۆ قسەی پێشوو دەفەرموێ: گەورەترین شتو شکۆمەنترین عالەم کە عەرشی بەرینە سەنتەری بەڕێوەبردنی بوونەوەری لێوە ئەنجام دەدرێ خودا دروستی کردووەو ئاتاجی بە پەروەردگارە دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ بەدیهێنەری بوونەوەر (الله)یە، ئەو خودایەی عیبادەت هەر شیاوی ئەوە، کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە، خاوەنی عەرشی بەرینە، عەرشی بەڵقیس یان هەر شتێکی تر هەرچەند گەورەو شکۆمەند بێ لەچاو عەرشی خودادا بێ نموودە، هودهود کە مەدحی عەرشی بەڵقیس دەکا بە (عظیم) بەنیسبەت عەرشی ئادەمیزادانەوەیە، وەصف کردنی عەرشی خودا بە (عظیم) بەنیسبەت ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە. کەوابوو وەصفی عەرشی بەڵقیس بە (عظیم) نیسبیو ئیضافی یە، وەصفی عەرشی خودا بە (عظیم) مطلەقو رەهایە. ئیتر حەزرەتی سولەیمان پەلە ناکا لەبە درۆخستنەوەی هەواڵەکە، یان قبوڵ کردنی، هەروا بەچاوی سوك سەیری هەواڵی هودهود ناکا کەوتی: لەوڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی گەورەو سەرەنج ڕاکێشم بۆ هێناوی. بەڵکوو ئەو پێغەمبەرەو پێوەرو کێشەری خۆی هەیە، بەیاساو قانونی خۆی هەواڵەکە هەڵدەسەنگێنێ ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾

حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: توێژینەوە دەکەین دەربارەی ئەم هەواڵە، بۆ ئەوەی بزانین ئایا راست دەکەی یان لەپێڕی درۆزنانی!!

﴿اذْهَب بِّكِتَابِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾ واتە: حەزرەتی سولەیمان نامەیەکی بۆ بەڵقیس و نەتەوەکەی نووسی بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنان بەخوداو موسوڵمان بوون، نامەکەی دا بە پەپوسلێمانەکەو فەرمانی پێ کردو فەرمووی: ئەم نامەیەی من بەرە بۆسەر بەڵقیس و گەلەکەی بۆیان فڕێ بدەو کەمێك لێیان دوربکەرەوە، بزانە چی بەیەکتری دەڵێن: هەڵس و کەوتی ناو خۆیان چۆن دەبێ؟

ئەمەش داب و نەریتی فروستادەکانە کە: لەنێوان پاشایاندا نامە دەهێنن و دەبەن، نامەکە تەسلیم بەشوێنی مەبەست دەکەن و بۆ خۆیان دەکشێنەوە بۆ دواوەو چاوەڕوانی وەڵام دەکەن.

ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە: یەکێك لەو بوارانەی بانگەوازی ئیسلامی تێدا ئەنجام دەدرێ، نامە نووسین و فروستادە ناردنە بۆ لای بێ بڕوایان، بۆ ئەوەی بانگەوازی بکرێن بۆ ئیمان هێنان.

قورطوبی دەفەرموێ: ئەم تەفتیش و بەسەرکردنەوەی حەزرەتی سولەیمان بۆ لەشکرەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ پاشاو فەرمانڕەوا رەعییەت و وڵاتی خۆیان بەسەر بکەنەوە، چاو لەکەم و کوڕی و کەمتەرخەمی بەرپرس و سەربازەکان نەپۆشن، مەگەر بیانووی رەوایان هەبێ. بڕوانە پەپوسلێمانکە لەگەڵ ئەو هەموو بچکۆلەیی و بێ وەجیبیەی دا، حەزرەتی سولەیمان بەغائیب بوونەکەی زانی و موحاسەبەی کرد!

رەحمەتی خودا لە حەزرەتی عومەر بێ ئەوەندە بەخەم دانیشتوان و رەعیەتەکەیەوە بوو، دەیفەرموو: ئەگەر بزنێك لەسەر گوێی روباری فورات گورگ بیخوات عومەر بەرپرسیارەو لەسەری سزا دەدرێ!

بەڵقیس شاژنی وڵاتی سەبەء بووە، بەدەستهێنانی دەسەڵاتی پاشایی لەلایەن ئافرەتەوە دیاردەیەکی باوی کۆمەڵگای ناموسوڵمانانە لەکۆن و نوێ دا لەزۆر وڵاتی ناموسوڵماندا زۆرجار ئافرەت پۆستی پاشایەتی‌وەرگرتووە، بەڵام لەروانگەی ئایینی ئیسلامەوە دروست نیە ئافرەت ئەرکی ئیمامەت و فەرمانڕەوایی هەڵبگرێ، ئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کردووە دەفەرموێ: کاتێك پێغەمبەر (صَلی اللهُ عَلیهِ وسَلم) هەواڵی ئەوەیان پێدا کە فارسەکان کچی کیسرایان کردۆتە شاهەنشای خۆیان فەرمووی: «لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً» هەر گەل و نەتەوەیەك ئافرەت بکەنە گەورەو فەرمانڕەوایی خۆیان سەرکەوتوو نابن.

قازی ئەبوبکری (ابن العربی)[٢] دەفەرموێ: ئەم حەدیثە دەقە لەسەر ئەوە کە: ئافرەت نابێ بکرێ بەخەلیفەی موسوڵمانان، کۆڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ئەمە دامەزراوەو خیلافی تێدا نیە. ئەوەی لە موحەممەدی کوڕی جەریری طەبەری و ئەبو حەنیفە ریوایەت کراوە کە: گوایە دروستە ئافرەت پۆستی قەضاوەت وەربگرێ لەبواری تایبەتیدایەو بە موطلەقی نیە... واتە: دروستە ئافرەت ببێتە قاضی و حاکم لەهەندێ شتدا، کە تایبەتە بەکاروباری ئافرەتانەوە نەك بەگشتی!

## هەڵس و کەوتی بەڵقیس و وەڵامی بۆ نامەکەی حەزرەتی سولەیمان

﴿ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا

[٢] احکام القران ابن العرب/ ج٣/١٨٣.

كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

بەڵقیس: كە نامەكەی حەزرەتی سولەیمانی خوێندەوە، سەربەخۆ بڕیاری هیچی نەدا، بەڵكوو ڕاوێژی پیاوماقوڵانی گەلەكەی كردو ﴿قَالَتْ يَا أَيُّهَا المَلأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ﴾ وتی: ئەی پیاوماقوڵانو كاربەدەستانی وڵاتم! ئەمن نامەیەكم بۆ نێردراوە، نامەیەكی پیرۆزو پڕ ماناو گرنگ! هەڵبەتە پیرۆزیی‌و گرنگی نامەكە لەوەدا بووە: كە لەلایەن پێغەمبەرێكەوە نێردراوە، هەروەها چونكە نامەكە مۆركرابوو. نامەی مۆركراویش جۆرە ڕێزو نرخێكی هەیە. لایەنێكی تریش كە گرنگی بەنامەكە بەخشی بوو، ئەوە بوو هەڵگری نامەكە باڵندەیەك بوو نامەكەی فڕێ دایە بەردەم بەڵقیس‌و بۆ خۆی بە ئەدەبەوە پاشەو پاش كشایەوە، ئەمەش

شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو، پاشاو فەرمانڕەوایانی تر جگە لە حەزرەتی سولەیمان شتیوایان بۆ هەڵنەسوڕاوە.

ئەمجار شاژن ناوەڕۆکی نامەکە دیاریی دەکاو بە بەرپرس و پیاوماقوڵانی گەلەکەی رادەگەیەنێو دەڵێ: ﴿إِنَّهُ مِنْ سُلَيْمَانَ﴾ ئەو نامەیەی پێم گەیشتووە لە سولەیمانەوە ڕەوانەکراوە ﴿وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ ناوەڕۆکی نامەکە کورتو پوختەو زۆر رونو ئاشکرایە، بەناوی خودا دەست پێ دەکاو داوامان لێ دەکا لوتبەرزیی نەنوێنین، بەرامبەر داواکەی سولەیمان سەرەقی نەکەینو لێی یاخی نەبینو بە موسوڵمانیو گەردنکەچی بۆ خودا، بچین بۆلای سولەیمانو خوداپەرستی خۆمان رابگەیەنین. ئەمە پوختەو ناوەڕۆکی نامەکەیەو بابزانم ئێوە راو بۆچوونتان چییەو دەڵێن: چی؟ ﴿يَا أَيُّهَا الْمَلأُ أَفْتُونِي فِي أَمْرِي﴾ ئەی ئەهلی بارەگاو پیاوانی دەربارم، فتوام بۆ بدەن لەم کارەدا کە؛ ڕووی داوەو بەرەو رووی فەرمانڕەواییەکەم بۆتەوە ﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْراً حَتَّى تَشْهَدُونِ﴾ من یاسام وەهایە بڕیاری هیچ شتێك نادەم تا ڕاوێژ بەئێوە نەکەمو بیروباوەڕتان وەرنەگرم. هەموو بڕیاردانێکم بەویستو مووافەقەی ئێوەیە. هەر کارێك ئێوە دوای ڕاوێژ دەنگی بۆ نەدەن ئەمن نایکەم. جا پێم خۆشە ئێوە بیروڕای خۆتانم بۆ یەکالا بکەنەوە، هەتا ئەمن لەژێر رۆشنایی‌ویستی ئێوەدا هەڵوێستوەربگرم.

بەگوێرەی ئاخاوتنەکەی بەڵقیس‌وا دەردەکەوێ ئەم نامەیەی بۆی فڕێ دراوە ئاگای لێ نەبووە لەکوێوە بۆی هاتووەو کێ بۆی هێناوە، هەر ئەوەندە کاتێکی بەخۆ زانیوە نامە لەبەردەستیدایە. کە هەواڵەکەشی بەنەتەوەکەی ڕاگەیاند کاریگەریی نامەکەی لەسەر خۆی پێوە دیارەو وەصفی نامەکەی کرد بەوەی کە (کەریمە).

هەروا ئاماژەی ئەوەش دەکا: کەنیازی بەرەنگاری کردنی نیەو نایەوێ سەرپێچی خاوەنی نامەکە بکا، بەلام بەصەراحەت ئەوە نالێو بەدرکە (کنایە) دەیگەیەنێ.

پیاوانی دەربارو کاربەدەستانی وڵات ئازایەتیو فیداکاری خۆیان ڕاگەیاندو ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ﴿نَحْنُ أُوْلُوا قُوَّةٍوَأُولُوا بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ ئێمە هێزو توانای بەرگریو بەگژدا چوونەوەمان تێدایە کێ دەتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەر ئێمە، هەتا ئێمە هەبین وڵات پارێزراوەو پاشای بەڕێزتان فەرمانڕەوایە، هەرکەسێ تەماعی لەوڵاتماندا هەبێ دەستی دەقرتێنینو قاچی دەبڕینەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ﴿وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ﴾ بڕیاری یەکلاکەرەوە بەدەست تۆیەو بزانە چیمان فەرمان پێ دەکەی سەرمان لەڕێدایەو ئێمە ئەنجامی دەدەین.

بێگومان ئەمە جوانترین وەڵامەو ڕەنگە لەم وەڵامە جوانتر نەبێ، چونکە ئامادەباشیو هێزو توانای خۆیان نیشاندا لەهەمان کاتدا ئامادەباشی فەرمانبەرداری خۆشیان بۆ بڕیاری پاشا ڕاگەیاند.

بەکورتی وتیان: ئەگەر بەرەنگاری بکەین ئەو هێزو توانای بەرگریمان تێدایە، ئەگەر دەشتەوێ بەئاشتیو تەبایی لەگەڵیان ڕێك بکەوی ئەوە ئێمە پابەندی بڕیاری تۆین.

ئەمجار بەلقیس لەگەڵ پیاو ماقوڵو کاربەدەستانی وڵات کەوتە گفتوگۆو هێزو توانای لەشکری سولەیمانی بۆ شی کردنەوە، ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە: حەزرەتی سولەیمان ئادەمیزادو جندۆکەو باڵندەی ژێربارنو هێزو توانای سەربازیی زۆرە، بۆیە لایەنی ئاشتەوایی هەڵبژاردو وتی: دەترسم ئەگەر ئێمە شەڕ لەگەڵ سولەیماندا بکەین بەسەرماندا زاڵ ببێو دەرەقەتی نەیەینو خۆمانو وڵاتمان تێدا بچێو وەکوو خۆمان لێ نەیەتەوە.

﴿قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةًوَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ بەلقیس وتی: دابو نەریتی پاشاو لەشکرو سوپایان وەهایە، هەرکاتێ بە زەبری هێزی سەربازی وڵاتێك بگرنو بچنەناوی وێرانی دەکەن، ماڵو سامانی بەتاڵان دەگرنو دیاردەی شارستانی تێدا ناهێڵن، خەڵکەکەشی زەلیلو ژێردەستە

دەکەن، بەکوشتن‌و دیل کردن‌و سوکایەتی پێ کردن تەنگیان پێ هەڵدەچنن، ئەمە داب‌و نەریتی پاشاو لەشکری زاڵبووەو گۆڕانی بەسەردا نایە! دیارە بەڵقیس بنەماڵەکەی پاشاو فەرمانڕەوا بوون‌و زۆر هەواڵ‌و باسی لەم جۆرەی بۆ گێڕدراوەتەوەو ئاگاداری سەرگوزشتەی روداوەکانی رابوردو بووە. بەمەش ترسێکی زۆری خستە بەر گەلەکەی‌و لایەنی شەڕی وەلانا.

ئەمجار ویستی لەروی هۆکاری خۆشەویستی‌و دیاری ناردنەوە تەنگژەکە حەل بکاو پێشنیاری ئەوەی کرد، دیارییەکی بەنرخ بنێری‌و وتی:

﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِمْ بِهَدِيَّةٍ، فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾ من دیارییەکی بەنرخ‌و بەهایان بۆ دەنێرم‌و بەوە تاقییان دەکەمەوە، بزانم هەڵوێستی چۆن دەبێ، ئاخۆ پێغەمبەرە یان پاشایە، چاوەڕوانی هەڵس‌وکەوتیان دەکەم‌و بزانم دیاری بەرەکان بە چ شێوەیەك دەگەڕێنەوەو چ هەواڵێکم بۆ دێنن؟ دیاری دڵ نەرم دەکاو خۆشەویستی بڵاودەکاتەوەو لەوانەیە خەتەری شەڕ بڕەوێنێتەوە، تاقیکردنەوەیەکە دەیکەین ئەگەر دیارییەکەی وەرگرت ئەوە شتەکە دونیاییەو ماڵی دونیای تێدا کاریگەرە، ئەگەر وەریشی نەگرت ئەوە مەوزوع عەقیدەو باوەڕە، دەبێ چارەسەری بکەین.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: بەڵقیس بەگەلەکەی خۆی گوت: ئەگەر دیارییەکەی وەرگرت ئەوە مەلیکەو شەڕی لەگەڵ بکەن، ئەگەر قبوڵیشی نەکرد ئەوە پێغەمبەرەو شوێنی دەکەوین.

راڤەکەرانی قورئان زۆریان دەربارەی چۆنیەتی‌و چەندیەتی دیارییەکە نووسیوە، بەڵام هەموویان مۆرکی ئیسرائیلیاتیان پێوەیە[٣] ئێمەیش نامانەوێ ئەو جۆرە ریوایات‌و هەواڵانە بخزێنینە ناو نووسینەکەی خۆمان. ئەوەی گومانی تێدا

[٣] تەفسیری قورطوبی ج٧/٣٧٨٢ – ٣٧٨٣ طبعة دارالفکر.

نیە دیارییەکە دیارییەکی بەنرخ بووە، ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: قسەی ڕاست ئەوەیە کە دیارییەکە قاپێکی ئاڵتون بووە.

دەی باابزانین ئاخۆ هەڵوێستی حەزرەتی سولەیمان چۆن بووەو چی بەفروستادەکانی بەلقیس فەرمووە؟

﴿فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ، قَالَ: أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ؟﴾ کاتێك فروستادەکانی بەلقیس هاتنە لای حەزرەتی سولەیمان پێی فەرموون: ئەوە ماڵو سامانم پێشکەش دەکەن؟ دەتانەوێ بەو شتە تافیهو بێ نرخە ئێمە ڕازی بکەنو وازتان لێ بێنین؟ ئێوە لەسەر شیرکو بێدینی خۆتان بەردەوام بن؟

﴿فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِمَّا آتَاكُمْ﴾ ئەوی خودا بەمنی بەخشیوە زۆر باشترو بەنرختره لەوەی داویەتی بە ئێوە. بێگومان پەروەردگار ماڵی باشترو زۆرتری بەمن بەخشیوە.

بەڵکوو لەماڵو سامان باشتریشی پێ بەخشیوم زانیاریو پێغەمبەرێتی پێ بەخشیوم، جندۆکەو باڵندەی بۆ ژێربار کردوم، شتێك نیە لەماڵو سامان من کەیف خۆش بکاو لەهەڵوێستی خۆم دامبەزێنێ، پێویستیم بەدیاری ئێوە نیەو ناتوانن لەڕێگای دیارییەوە من لەخۆتان ڕازی بکەن.

﴿بَلْ أَنْتُمْ بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾ بەڵکوو ئێوە بەم جۆرە دیارییانە کەیف خۆش دەبن، بەدیاری پێشکەش کردن شاگەشکە دەبن، ئەمن داواتان لێ دەکەم موسوڵمان بنو واز لەخۆرپەرستیو هاوەڵدانن بۆ خودا بهێنن، ئەمن جگە لە ئیسلام بوون هیچی ترتان لێ قبوڵ ناکەم.

ئەمجار وێڕای ڕەتکردنەوەی دیارییەکەیانو نارەزامەندی لەکارەکەیان هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿ارْجِعْ إِلَيْهِمْ﴾ دیارییەکەیان بۆ بەرەوەو پێیان

رابگەیەنە با چاوەڕوانی سەرەنجامی ترسناك بن ﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُمْ بِجُنُودٍ لا قِبَلَ لَهُمْ بِهَا﴾ با دڵنیابن: کە ئێمە هێرشیان بۆ دەهێنینو بە سوپایەکی زۆرو بەهێزو زەبرو زەنگەوە دێینە سەریان، ئەوان بەهیچ جۆرێ ناتوانن بەرگری بکەن ﴿وَلَنُخْرِجَنَّهُمْ مِنْهَا أَذِلَّةً وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ بەتەئکید ئەگەر موسوڵمان نەبن لەوڵاتو زێدی خۆیان دەریان دەکەینو تێکیان دەشکێنینو سوکایەتییان پێ دەکەینو دەیانکەینە پەندو عیبرەتی رۆژگار!

## موسوڵمان بوونی بەڵقیسو هاتنی بۆ لای حەزرەتی سولەیمان

﴿ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ

مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

دوای ئـــەوەی فرســـتادەکان بـــەخۆیان و دیارییەکانیانـــەوە گەڕانـــەوە بـــۆلای بـــەلقیس و هـــەواڵی هەڵوێـــستی حـــەزرەتی ســـولەیمانیان پێـــدا، بـــەلقیس دووبـــارە پیاوماقوڵ و کاربەدەستیی وڵاتەکەی کۆکردەوەو پوختـــەی ڕای پێـــشووی خـــۆی بـــۆ دووبارە کردنەوەو پێی گوتن: کەناتوانن بەرەنگاری سوپای بێ شوماری پڕچەکی حەزرەتی سولەیمان بکەن، ئەمجار هاتە سەر ئەوە بەپیر بانگەوازییەکەی حەزرەتی سولەیمانەوە بچن لەسەر دەستی حەزرەتی سولەیمان موسوڵمان ببن، گەردنکەچی خۆیان و نەتەوەکەیان بۆ فەرمانی خودا ڕابگەیەنن. حەزرەتی سولەیمان هەواڵی ئـەوەی زانـیو زۆر کـەیف خـۆش بـوو، جندۆکـەی نـارد سـات دوای سـات هـەواڵی هاتنەکەیانی پێ ڕابگەیەنن. جا کە شاندی بەلقیس لەوڵاتی شام نزیك بووەوەو حەزرەتی سولەیمان کاربەدەستانی خۆی لەجندۆکەو ئادەمیزاد کۆکردنـەوە ﴿قَالَ﴾ پێیانی فەرموو: ﴿يَا أَيُّهَا الْمَلأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ؟﴾ ئـەی کاربەدەستانی وڵات! کێتـان دەتوانێ عەرشی پاشایەتی بـەلقیس لێـرە ئامادە بکا پـێش ئـەوەی بـەخۆی و شاندەکەیەوە بگاتـە ئێـرەو موسـوڵمان بـبن و گەردنکەچی خۆیـان ڕابگەیـەنن، بـۆ ئـەوەی هێنـانی عەرشـەکەی ببێتـە بەڵگـە لەسـەر ڕاسـتی

پێغەمبەرایەتی ئێمەو دڵنیای کە هێزو دەسەڵاتی ئەو بەنیسبەت قودرەتی خوداوە بچکۆلەیەو ئەوگەر سەرپێچی بکردایە بەئاسانی دەستی ئێمەی دەگەیشتێ ﴿قَالَ عِفْرِيتٌ مِنْ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ﴾ شەیاتینییەکی بەشان‌و بازوو بەهێز وتی: من دەتوانم پێش ئەوە ئەمڕۆ لەشوێن خۆت هەڵسیی‌و دەوام تەواو بێ کورسییەکەی بەلقیس بگەیەنمە ئێرە. ﴿وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ﴾ ئەمن لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە بەتواناو دەسەڵاتم‌و بەئەمینی‌و دڵسۆزی دەتوانم جێبەجێی بکەم، هیچ لەزێڕو زیو مرواری‌و جەوهەراتی هەڵناگرم‌و بەساغی عەرشەکە لێرە ئامادە دەکەم، هەڵبەتە حەزرەتی سولەیمان بەم پێشنیارە رازی نەبوو، ویستی بەزوترین کات عەرشەکە بهێندرێ‌و گەورەیی‌و عەظەمەتی ئەو دەسەڵاتەی خودا پێی داوە دەربکەوێ، ببێتە نیشانەو موعجیزە بۆ بەلقیس‌و وەفدەکەی، کە حەزرەتی سولەیمان لەخوداوە پارمەتیدراوە، خودا موعجیزەی (خاریقولعادەی) پێداوە ﴿قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنْ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ یەکێك لەوانەی کەزانیاری نهێنی بوونەوەری دەزانی، نەفس‌و دەروونی ئامادەباشی ئەوەی تێدا بوو کە پەیوەندی بەهەندێ نهێنی‌و هێزی کەونییەوە بکا، زانیاری کتێبی یەزدانی لەلا بوو، دڵی پەیوەست بوو بە پەروەردگاری خۆیەوەو ئامادەباشی‌وەرگرتنی فەیزو بەخششی خودایی تێدابوو. دیارە حەزرەتی سولەیمان ئەمەی پەسەند کردووەو کارەکە لەچاو لێکانێکدا ئەنجام دراوە. ئەمجار ئایا ئەم زانایە کێ بووە: کە زانیاری نهێنی کتێبی خودایی لەلا هەبووە. هەندێ لە موفەسیرین دەڵێن: فریشتە بووە، جا جوبرائیل بووە یان غەیری ئەو بووە. هەندێك دەڵێن: حەزرەتی حضر بووە.

هەندێك دەڵێن: ئاصەفی بەرخیا بووە: کەوەزیری حەزرەتی سولەیمان بووەو ئیسمی ئەعظەمی زانیوە. ئیبنو عەبباسی ئەمەی بەلاوە پەسەندە.

هەندێ موفەسیرین لەوانە (ئیمامی رازی)یش دەفەرموێ: ئەو کەسە حەزرەتی سولەیمان خۆی بووە، چونکە ئەو پێغەمبەر بووەو لەهەموو کەس زیاتر زانیاری کتێبی هەبووە، ئەبو حەییان دەفەرموێ: ئەم رایەی کە دەڵێ: ئەو کەسە حەزرەتی سولەیمان خۆی بووە، رایەکی غەریبو وێ نەچووە. چونکە حەزرەتی سولەیمان بوایە سیاقی قورئانەکە ناوی دەهێناو ناوی نەدەشاردەوە، هەروا چۆن دەبێ حەزرەتی سولەیمان خیطاب لەگەڵ خۆی بکاو بڵێ: ﴿أَنَا آتِيكَ﴾؟ ئەوەی گرنگەو پێویستە بڕوامان پێی هەبێ ئەوەیە لەو ماوە کورتو قیاسییەدا عەرشەکە هێنرایە لای حەزرەتی سولەیمان!! جا ﴿فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرّاً عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾؟! کاتێك حەزرەتی سولەیمانو داروودەستەکەی بەچاوی خۆیان دیتیان عەرشی بەلقیس لەوڵاتی یەمەنەوە بەچاو لێکنانێك هێنراوەتە لایو ئامادەکراوە، وتی: ئەمە نیعمەتو فەضلی خودایە پێی بەخشیویم بۆ ئەوەی بە تاقیم بکاتەوە، دەربکەوێ ئاخۆ شوکران ژمێرمو دەزانم ئەوە لەخوداوەیە، یان ئینکاری نیعمەتی خودا دەکەمو ئەو هێزو توانایە پاڵ خۆم دەدەم!!

بێگومان خودا بێ ئاتاجە لەسوپاسی خەڵكو پێویستی بەشوکرو سوپاسی ئەمو ئەو نیە، هەر وەکوو چۆن کوفرانی نیعمەت زیانی پێ ناگەیەنێ ﴿وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ کەسێك سوپاسی خودا بکا سودی سوپاسەکەی بۆ خۆیەتیو بۆ خودا نیە، چونکە بەهۆی شوکرو سوپاسەوە نیعمەتەکان بەردەوام دەبن، کەسێکیش بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا سپڵەیی بکاو سوپاسگوزار نەبێ، ئەوە با باش بزانێ خودای من لە شوکرو عیبادەت کردنی ئەوان بێ ئاتاجە، کوفرو بێدینی ئەوان چ زیانێك بەخودا ناگەیەنێ، کەریمو خاوەن بەخششە ئەگەر کەمیش عیبادەتی بکەن ئەوە نیعمەتەکانی خۆی لە بەندەکانی نابڕێ، بەڵام لەقیامەتدا سزای سەرپێچی کردنو کوفرانی نیعمەتیان لێ دەستێنێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا

رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ – فصلت/٤٦﴾ یان لەسەر زوبانی حەزرەتی موسا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى: إِن تَكْفُرُواْ أَنتُمءمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ – إبراهيم/٨﴾ لە صەحیحی موسلیمدا فەرمووودەیەکی قودسی هاتووە دەفەرموێ: پەروەردگار دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوەڵو ئاخرتان، بە ئادەمیزادو جندۆکەتانەوە هەمووتان لەشێوەی بەتەقواترین دڵی پیاوێکتاندا بن، هیچ لەشکۆمەندیی‌و خودایەتی من زیاد ناکا، ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوەڵو داواتان، بە ئادەمیزادو جندۆکەتانەوە لەشێوەی بێدینترین پیاوتاندا بن، هیچ لە شکۆمەندیی‌و خودایەتی من کەم ناکا، ئەی بەندەکانم! ئەوەی کردەوەی خۆتانە لەسەرتانی تۆمار دەکەم‌و پاشان بەگوێرەی ئەو کردەوانەتان پاساوتان دەدەمەوە، جا ئەگەر کەسێك کرداری باشی کردو پاداشتی باشی درایەوە با سوپاسی خودا بکا، کەسێکیش وانەبوو با سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکاو خەتای خۆیەتی‌و خۆی بە خۆی کردووە.

ئەمجار دوای ئەم هەست دەبڕینە بەرامبەر بە نیعمەتەکانی خوداو هەستکردن بەوە کە: ئەم نیعمەتانە تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانە، حەزرەتی سولەیمان فەرمان دەکا بەوە کە: موفاجەئات بۆ بەلقیس ئامادە بکەن، فەرمانی کرد کە: بڕێ گۆڕانکاری لەعەرشەکەی بەلقیسدا بکەن بۆ ئەوەی ئەندازەی زیرەکی‌و هۆشمەندیی بەتاقی بکاتەوە. ﴿قَالَ: نَكِّرُوا لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِي أَمْ تَكُونُ مِنْ الَّذِينَ لا يَهْتَدُونَ﴾ حەزرەتی سولەیمان فەرمانی بەدارو دەستەی خۆی کرد کە: بڕێك گۆڕانکاری لە عەرشەکەیدا بکەن، بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ دەیناسێتەوەو دەزانێ ئەمە عەرشەکەی خۆیەتی، یان لێی تێك دەچێ‌و خەیاڵی بۆ ئەوە ناچێ، کە ئەوە عەرشی خۆیەتی، وێ دەچێ ئەمە جۆرە تاقیکردنەوەیەکی بەلقیس بووبێ لەلایەن حەزرەتی سولەیمانەوە بۆ ئەوەی ئاستی زیرەکی‌و وریایی بەلقیسی بۆ دەرکەوێ، ئیتر هەموو شتێك بەگوێرەی‌ویستی حەزرەتی سولەیمان ئەنجام درا، بەلقیس لە یەمەنەوە بەسەرۆکایەتی شاندێکی پایە بەرز گەیشتە فەلەستین‌و لە مەقەڕی حەزرەتی سولەیمان ئامادە بوو، دیاردەی عەرشی بەلقیس گۆڕانکاری تێدا کراوەو کاتی

تاقیکردنەوەیە، مەراسیمی پێشوازی ئامادە کراوەو کاتی بەیەك گەیشتنە! ﴿فَلَمَّا جَاءَتْ قِيلَ أَهَكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُ هُوَ﴾ کاتێك بەڵقیس گەیشتە جێ عەرشەکەی خۆی نیشان دراو پێی گوترا: ئایا عەرشی تۆیش ئاوایەو بەم شێوەیە دروستکراوە؟ ئەوەندە گەورەو ڕازاوەیە؟ لەوەڵامدا وتی: هەر دەڵێی هەوە، واتە: لەعەرشی من دەچێ‌و دەشوبهێتەوە ئەو! بەڕاستی موفاجەئەیەکی سەرسوڕهێنەر بوو، هەرگیز بەخەیاڵی مەلیکە بەڵقیسدا نەهاتووە عەرشی ئەو لەیەمەن لەو تاغی خۆیدا قفڵ دراوەو پارێزەری بەسەرەوە جێ هێشتوون بگاتە وڵاتی فەلەستین!! یەمەن لەکوێ‌و بەیتولمەقدیس لەکوێ؟ چۆن ئەم عەرشە هێنراو کێ هێنای!! لەهەمان کاتدا وەڵامەکەی وەڵامێکی عاقڵمەندیی‌و زیرەکی‌و لێهاتووی پێوە دیار بوو، چۆن ئەوانویستیان بەڵقیس تاقی بکەنەوەو سەری لێ تێك بدەن، ئەویش سەری لەوان تێکدا.

﴿وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهَا﴾ ئێمە زانیاریمان دراوەتێ دەربارەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی سولەیمان پێش هێنانی عەرشەکەشم بۆ ئێرە ﴿وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾ ئێمە گەردنکەچی فەرمانی حەزرەتی سولەیمان بووین‌و لەو کاتەوە کە دیارییەکەی رەت کردەوە خۆمان ئامادە کردووە بۆ ئیمان هێنان‌و موسوڵمان بوون... ئەمە ئەگەر ڕستەی ﴿وَأُوتِينَا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾ ئاخاوتنی بەڵقیس بێ، دەشگونجێ قسەی حەزرەتی سولەیمان بێ، ئەوکاتە مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبێ (ئێمە زانیاریمان پێ درابوو بەوەی: کە خودا هەرچی بیەوێ دەیکا، پێش ئێستا ئەوەمان دەزانی، یان بە موسوڵمان بوون‌و هاتنی بەڵقیس لەپێش هاتنیدا، ئێمە لەهەموو ئەم رووداوانەدا یەکتاپەرست‌و گەردنکەچی پەروەردگارین).

دەشگونجێ لەئاخاوتنی دارو دەستەی حەزرەتی سولەیمان بێ، ئیبنو کەثیر ئەم ڕایە پەسەند دەکاو دەفەرموێ: ئەوەی پشتگیری ئەم رایە دەکا: قسەکەی موجاهیدە

کە دەفەرموێ: بەڵقیس تا نەچووە ناو باڵەخانە شوشە بەندەکە موسوڵمان نەبوو[٤].

ئەمجار پەروەردگار بیانووی موسوڵمان نەبوونی بەڵقیس تا ئەو کاتە، روون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَتْ تَعْبُدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِنْ قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾ خۆرپەرستی مەنعی خوداپەرستیو عیبادەتکردنی لێ کردبوو، چونکە ئەو لەناو نەتەوەیەکی کافرو خۆرپەرستدا پەروەردە بووبوو! ئەو ژینگەو دەوروبەرە تێیدا کاریگەر بوونو رەنگدانەوەی خۆیان لەسەر جێ هێشتبوو. نەیتوانی بوو بیروباوەڕی خۆی بگۆڕێ، هەتا گەیشتە وڵاتی فەلەستینو بەخزمەت حەزرەتی سولەیمان گەیشتو لەوەوە فێری ئایین بوو، قەناعەتی هەبوونی خودایەکی تاكو تەنهاو کار دروستی بۆ پەیدا بوو، لەوە حاڵی بوو کە ئەو خودایە خاوەنی هەموو بوونەوەرو مانگو خۆرو ئەستێرەکانە.

حەزرەتی سولەیمانوێڕای هێنانو ئامادەکردنی عەرشی بەڵقیس بەو شێوەی ئاماژەمان پێ کرد، موفاجەئەیەکی تری بۆ بەڵقیس ئامادە کردبوو، هەر کە شاندی میوان بەسەرۆکایەتی بەڵقیس گەیشتە بەیتولمەقدیسو پێشوازییان لێ کرا، بەگوێرەی دابو نەریتی پێشوازی کردنی پاشایانو سەرۆکی وڵات پێشوازی لێ کرا، ویستیان لەباڵەخانەیەکی سەرەنجڕاکێشدا پێشوازی لێ بکرێ.

﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ﴾ لەلایەن وەفدی پێشوازیکارەوە پێی گوترا: فەرموو بچۆرە ناو ئەو باڵەخانە بەرزو ڕازاوەیە، ئەوە تەرخان کراوە بۆ پێشوازیکردنی پاشاو گەورە پیاوان! حەزرەتی سولەیمان مەبەستی ئەوە بوو موڵكو سەڵتەنەتی خۆی نیشان بەڵقیس بدا، موڵكو فەرمانڕەواییەکی نیشان بدا لەهی خۆی گەورەترو شکۆمەندتر بێ. تەختی هۆڵی قەصرەکە لەشوشەی سپی شەففاف دروست کرابوو ﴿فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً﴾ کە بەڵقیس ڕاڕەوی هۆڵەکەی بینی وای

[٤] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج/٣/٣٦٥.

زانی بلوری تەختی هۆڵەکە ئاوە ﴿وَكَشَفَتْ عَنْ سَاقَيْهَا﴾ قاچی هەڵکردن بۆ ئەوەی ناوی بکەوێ. ﴿قَالَ: إِنَّهُ صَرْحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ قَوَارِيرَ﴾ حەزرەتی سولەیمان پێی فەرموو: ئەمە باڵەخانەیەکە لە روخامی لووس‌و شوشەی شەففاف دروست کراوەو ئاوەکە لەژێرەوەیەتی، هەرکەسێك نەزانێ وادەزانێ ئاوە، ئیتر بەڵقیس سەرسام بوو، لەئاست ئەم شتە سەرسوڕهێنەرەدا واقی وڕما، چونکە لێی عەیان بوو، کە ئەوە لە ژوور توانای ئادەمیدایەو نیشانەی ئەوەیە: حەزرەتی سولەیمان هێزێکی گەورەتر لەتوانای ئادەمیزادی لەگەڵدایە، ئەم شتانەی بەچاو بینیی، کردنی بە بەڵگە لەسەر تاك‌و تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی سولەیمان‌و ئیعلانی موسوڵمان بوونی خۆی کردو بۆلای خودا گەڕایەوە، تۆبەی کردو دانی بە ستەمکاری لەوەپێشی خۆی داناو ﴿قَالَتْ: رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ وتی: خودایە! من ستەمم لەخۆم کردووە، کە لەجیاتی خودا خۆرم پەرستووە، ئەوا لەئێستاوە رایدەگەیەنم کە من گەردنکەچم لەگەڵ حەزرەتی سولەیماندا بۆ خودای بوونەوەر. منیش‌و ئەویش هەردووکمان بەندەی خودای بوونەوەرین... بێگومان خاتوو بەڵقیس زوو هیدایەتی‌وەرگرت‌و دڵی بەنووری ئیمان ڕەوشەن بوو، هەرزوو زانی کە گەردنکەچی بۆ خودا گەردنکەچی نیە بۆ کەسێکی تر، تەنانەت با ئەو کەسە یەکێکی وەکوو حەزرەتی سولەیمانیش بێ، پێغەمبەرو خاوەن موعجیزەو فەرمانڕەوا بێ! بەڵکوو موسوڵمان بوون گەردنکەچییە بۆ خودای بوونەور، هەمئاهەنگی کردنە لەگەڵ موسوڵمانان بۆ خودا پەرستی.

بێگومان ملهوڕەکانی قوڕەیش بەلایانەوە ناخۆش بوو لەسەر شانیان گران بوو، کەشوێن پێغەمبەر بکەون‌و موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ببێتە سەرۆکیان، جا قورئان ئەم بیرۆکەیان بۆ ڕاست دەکاتەوەو پێیان رادەگەیەنێ کە موسوڵمان بوون گەردنکەچییە بۆ خودا لەگەڵ پێغەمبەردا ئەوەتا لەمێژوودا ئافرەتێکی‌وەکوو

خاتوو بەلْقیس فێریان دەکا، کە گەردنکەچی بۆ خودا یەکسانە لەنێوان بانگەواز بکەرو بانگکراودا، لەنێوان پێشەواو شوێنکەوتوانیدا، ئەگەر ئەوان موسوڵمان بن، گەردنکەچی خۆیان بۆ خودا رادەگەیەنن‌و پێغەمبەریش لەگەڵیاندا گەردنکەچی خودایە. زۆر لەموفەسیرین لە کۆتایی ئەم چیرۆکەدا باسی شوکردنی خاتوو بەلْقیس بە حەزرەتی سولەیمانیان کردووە، هەندێك بە (ئا) هەندێك بە (نا)!

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ئەوەی بەسەر دەم‌و زاری خەڵکەوەیە ئەوەیە کە: حەزرەتی سولەیمان بەلْقیسی مارە کردبێ، وەلێ نەلە قورئانداو نە لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا پشتگیریمان بۆ ئەو رایە دەست ناکەوێ. لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت کراوە کە: کاتێ بەلْقیس موسوڵمان بووە، حەزرەتی سولەیمان پێی فەرموو: لەنەتەوەکەی خۆت یەکێك هەڵبژێرەو شوی پێ بکە. لەوڵامدا خاتوو بەلْقیس گوتی: مەلیکەی‌وەکوو من شوو ناکا بەیەکێك لە نەتەوەکەی. حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: شووکردن داب‌و نەریتێکی موسوڵمانانە. خاتوو بەلْقیس گوتی: کەوابێ شوو دەکەم بەیەکێك لەپاشاکانی هەمەدان حەزرەتی سولەیمان رایەکەی پەسەند کردو مارەیی بڕی لەیەکێك لە تەبابیعەکان کە مەلیکی هەمەدان بوو، پاشان گێڕایەوە بۆ یەمەن تالە دونیا دەرچوو بە پاشایەتی یەمەن مایەوە.

## چیرۆکی حەزرەتی صالح (درووودی خوای لەسەر بێ)

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ

تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُواْ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُواْ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ .

**لەزۆر شوێنی قورئاندا چیرۆکی حەزرەتی صالح هەر جارەی بەشێوەیەك و بۆ مەبەستێك هێنراوە، جاریوا هەیە لەگەڵ چیرۆکی حەزرەتی نوح و حەزرەتی هودو لوطو شوعەیب هێنراوە، جاری وایش هەیە لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمدا هاتووە.**

لەم سورەتەدا کە: تەرکیز لەسەر چیرۆکی نەتەوەی ئیسرائیلە، لەوە پێش باسی چیرۆکی حەزرەتی موساو حەزرەتی داودو حەزرەتی سولەیمانی کرد، کە لەنەتەوەی ئیسرائیلن، ئەمجار دێتە سەر گێڕانەوەی چیرۆکی نەتەوەیەکی عەرەب نەژاد کە: گەلی ثەموودە، حەزرەتی صالح، کە پێغەمبەریانە بەرای نژادیان بوو، مەبەست لەهێنانی ئەم چیرۆکە بیرخستنەوەی قورەیش بەتایبەتی‌و عەرەب بەگشتی، بۆ ئەوەی بەئاگا بێنەوەو بزانن کە: پێغەمبەرە عەرەب نەژادەکانی پێش حەزرەتی موحەممەدیش بانگەوازی گەل‌و نەتەوەکانی خۆیان کردووە بۆ یەکتاپەرستی‌و دەستبەرداربوون لە بتپەرستی، ئەمە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران بووە، بە عەجەم‌و عەرەبیانەوە. هەموویان بانگەوازییان کردووە بۆ خوداناسین‌و یەکتاپەرستی‌و تایبەتکردنی عیبادەت بە زاتی پاکی پەروەردگار. لەهەمان کاتدا ئەم چیرۆکە رابوردوە دێرینانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە حەزرەتی موحەممەد ئەم قورئانەی لەخوداوە بۆ هاتووەو لەو سەرچاوەوە هەواڵی ئەم روداوە دێرینانەی پێ گەیشتوون. هەروەها هەڕەشەو ترساندنی هەموو کافرو موشریکێکە لەکۆن‌و نوێدا.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾ سوێندبێ. بەتەئکید ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای هۆزی ثەمودی عەرەب نەژاد، پێغەمبەری خۆمان؛ کەناوی صالح بوو، لەهۆزو ڕەگەزو نژادی خۆیان بوو. لەسەر زوبانی ئەو پێغەمبەرە پێمان گوتن: عیبادەتی خودا بکەن‌و یەکتاپەرستی بکەن‌و جگە لەئەو کەسی تر بەخودا مەزانن، کاتێک حەزرەتی صالح بانگەوازی کردن، بوون بەدوو تاقم؛ تاقمێکیان بڕوایان پێ کردو زۆربەشیان بەدرۆیان خستەوەو پێی کافر بوون. هەردوو تاقمەکە دەربارەی ئایین دووبەرەکییان لێ دروست بوو، هەرتاقمەو دەیگوت: حەق‌و ڕاستی لەگەڵ مندایەو ڕێبازی من ڕاستە، ئەوی تر هەڵەیە، وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ: اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ؟ قَالُواْ إِنَّا

بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ - الأعراف/٧٥ - ٧٦﴾. هەڵبەتە لێرەدا بۆشاییەك لەچیرۆكەكەدا دەردەكەوێ بەگوێرەی ئایەتەكەی دوایی مەزەندە دەكرێ، ئەمەش دیاردەیەكی چیرۆكەكانی قورئانەو لەزۆر شوێندا ئەم تیلنیشانو مەزەندە كردنانە دادەنێ.

لێرەدا بە مەزەندە دەزانین تاقمی بەدرۆخەرەوەو پشت هەڵكردو پەلەیان لەو عەزابە كردووە كە: حەزرەتی صالح هەڕەشەی پێ لێ كردوون، وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: گەلی صالح بە صالحیان دەگوت: ﴿يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ - الأعراف/٧٧﴾. لەجیاتی ئەوەی داوای هیدایەتو بەخششی خودا بكەن، داوای هێنانی عەزابیان لێ كردووە، وەكوو چۆن قورەیشییەكان هەمان داوایان لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وسَلَّم) دەكردو هەمان هەڵوێستیان بەرامبەر نواند. ﴿قَالَ يَا قَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾؟ حەزرەتی صالح پێی فەرموون: ئەی گەلو هۆزەكەم! ئەوە بۆ داوا دەكەنو پەلە لەهاتنی عەزابو عیقابی خودا دەكەن پێش ئەوەی ئیمانم پێ بهێنن؟ دەبوایە داوای هیدایەتو رەحمەتو پاداش لەخودا بكەن نەك هاتنی عەزاب!!

واتە: خودا هیدایەتی بۆ ئێوە ڕەخساندووە، دەتوانن بەهۆی ئیمان هێنانەوە ڕەحمەتی خودا بۆخۆتان مسۆگەر بكەن، پاداشی باش دەستەبەر بكەن بۆ خۆتان. دەی بۆچی لەم بەختەوەرییە لادەدەنو پەلە لەهاتنی عەزابی سەختی خودا دەكەن؟!

حەزرەتی صالح هەواڵیدا بیانخاتە سەر ڕێبازی تۆبەو ئیستیغفار بۆ ئەوەی ڕەحمەتی خودا بیانگرێتەوە، هەڵینان داوای لێخۆشبوون لەخودا بكەنو لەهەڵوێستی ناپەسەندی مل شكێنی خۆیان دابەزن پێی فەرموون: ﴿لَوْلا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ ئەوە بۆ داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار ناكەن بەڵكوو رەحمتان پێ بكرێ، بۆچی بۆلای خودا ناگەڕێنەوەو تۆبەیەكی نەصوحانە ناكەن؟!

چونکە هەرکاتێ عەزابی خودا نازڵ بوو ئیتر تۆبەو پەشیمانی دادتان ناداو هیچ شتێك ناتوانێ عەزابی خودا بگێڕێتەوە. ئیتر وەڵامی گەلە ناپەسەندەکەی ئەوەبوو: ﴿قَالُوا: اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَنْ مَعَكَ﴾ بەڕقو تووڕەیی و فسقەڵ بوونەوە وتیان: ئێمە بەهۆی تۆو شوێنکەوتوانت تووشی نەگبەتی بووینو لەوەتای تۆ ئەم بانگەوازیو ئایینەی خۆت خستۆتە ناوەوە ئێمە خێرو خۆشیمان نەدیوەو نەگبەتی گرتوینی، تەنگو چەڵەمەت بۆ ناوینەوە، دووبەرەکیو دوژمنایەتیت تێدا دروست کردوین. ئەوەندە پیسو نەگریس بوون هەریەکێکیان تووشی ناخۆشیەك ببوایە خەتاکەیان دەخستە ملی حەزرەتی صالحو شوێنکەوتوانی!! ﴿تطير﴾ و رەشبینی دابو نەریتێکی جاهیلییە، گەلە نەفامو نەزانەکان لەکۆنو نوێدا پەیڕەوی دەکەن!

لەسەردەمی نەزانیدا ئەگەر یەکێك بیویستایە کارێك بکا باڵندەیەکی هەڵدەفڕاند جا ئەگەر باڵندەکە لەلای ڕاستییەوە بۆلای چەپی بفڕیایە پێیان دەگوت: ﴿السانح﴾ گەشبینییان پێوە دەکردو دڵیان بەکارەکەیان خۆش دەبوو پێیانوابوو سەرکەوتوو دەبن، خۆ ئەگەر باڵندە هەڵفڕێنراوەکە لەچەپییەوە بۆ لای ڕاستی هەڵفڕیایە بە ڕەشبینی دەزانیو پێیان دەگوت: ﴿البارح﴾و دەیگوت ئەو کارە ئەنجام نادەم چونکە تووشی زیان دەبم! ئای لەم بێ عەقڵیو نەفامییە!؟ دەبێ باڵندەیەکی بێ زوبان چ لەنهێنی بزانێ؟ دەبێ فڕینی باڵندەیەك جموجوڵی ئەو بەستە زمانە چۆن بکرێتە نیشانەی ڕوداوێکی غەیبی؟ هەڵبەت لەڕاستیدا فڕینی باڵندەیەك یان پشمینی منداڵێك، یان توشبوونی گیانلەبەرێك لەرێگادا چ دەخلێکیان بەروداوی نهێنییەوە نیە. بەڵام نەفسی ئادەمیزاد ناتوانێ بەبێ ئەوەی پشت بەشتێکی نادیارەوە ببەستێ هەڵبکا، جا هەرکاتێ پشتی بەخودای زاناو داناو بەدەسەڵات نەبەستو لەو سەرچاوە ئیمانییە بێ بەش بوو، پەنا بۆ ئەو خەڕافاتو تورەهاتانە دەبا، بەداخەوە لەناو کۆمەڵگای کوردەواری خۆشماندا هەندێ لەم ڕەشبینیو بڕوا بوون بە خەڕافات باوە. کابرا خەریکی سەفەرەو منداڵەکەی

دەپشمێ، یان کەڵەشێرەکەی دەخوێنێ سەفەرەکەی تێکدەداتەوە، دەڵێ: ئەو پشمینە یان ئەو خوێندنەی کەڵەشێر نیشانەی ئەوەیە: سەفەرەکەم نەکەم باشە!! یان کابرا بەڕێگادا دەڕوا لەپڕێکا چاوی بە ڕێوییەك دەکەوێ، یان مارێك دەبینێ گەشبینی لێ دەکاو دەڵێ ڕێویم دیوە سەفەرەکەم سەرکەوتوو دەبێ. خۆ ئەگەر کەروێشکی بینی ڕەشبینی لا پەیدادەبێو جاریوادەبێ کابرا لەنیوەی ڕێگادا دەگەڕێتەوە دەڵێ سەفەرەکەم شوومە!

کەسانێك هەن خۆیان بەزاناو ڕۆشنبیر دەزانن، لافی زانستو پێشکەوتن خوازی لێ دەدەن، کەچی گرنگییەکی زۆر دەدەن بە ژمارەی (١٣)، هەروا ئەگەر پشیلەیەکی ڕەشیان بەبەردەمدا تێپەڕی زۆر نەخشەو پیلانی خۆیانواز لێ دێنن، دەڵێن: پشیلەی ڕەشمان دیوە!! دەلاك خانەکانیش ڕۆژی سێ شەممە دەکەن بەڕۆژی پشوودانی خۆیانو پێیانوایە: لەڕۆژی سێ شەممەدا سەرتاشین باش نیەو شوومە!! بەهەرحاڵ لە ئیسلامدا ڕەشبینیو گەشبینی نیە، ڕێویو پشیلە ڕەشو کەروێشكو ژمارەی (١٣) چ دەخلێکیان بەسەر بەختەوەری یان نەگبەتییەوە نیە.

جا کە گەلی صالح قسە نەفامانەکەی خۆیانیان ئاڕاستەی حەزرەتی صالح کرد وتیان: ئێمە بەهۆی خۆتو شوێنکەوتوانت تووشی نەگبەتی بووین! حەزرەتی صالح ویستی لەو گومڕاییە بیانگێڕێتەوە بۆ نووری یەقینو ڕاستیان پێ بڵێ: ﴿قَالَ: طَائِرُكُمْ عِندَ اللَّهِ﴾ فەرمووی: بەختو دوارۆژو سەرئەنجامتان لای خودایەو، پەروەردگار بۆ هەموو شتێك یاساو قانوونی تایبەتی داناوە، فەرمانی بە ئادەمیزاد کردووە کە پەیڕەوی ئەو یاساو نیزامانە بکا، هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردونەوە، کەسێك شوێن یاساو سوننەتی خودا بکەوێ تووشی خێرو خۆشی دەبێ.

کەسێکیش لەڕێبازی خودا لایدا تووشی شەڕو نەگبەتی دەبێ (تەشائوموتەطەییور) چ دەخلێکیان بە ناخۆشو تەنگو چەڵەمەوە نیە.

﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ﴾ بەڵکوو ئێوە گەلو نەتەوەیەکن بە عیابەدەتکردن بۆ خوداو سەرپێچی فەرمانەکانی بەتاقی دەکرێنەوە، بەمە کە خودا منی کردووە بە

پێغەمبەر بۆ سەر ئێوەی ڕەوانە کردووم، جا ئەگەر فەرمانبەرداری فەرمانی خودا بن، ئەوە پاداشی باشتان دەداتێ، ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن ئەوە عیقابو تۆڵەی تاوانەکانتان لێ دەستێنێ، کەوابوو وریایی‌و بەئاگایی‌و تێفکرین لە سوننەت‌و داب‌و نەریتی خوداو بەشوێندا چوونی ڕووداوەکان‌و پەندو عیبرت‌وەرگرتن لێیان‌و هەستکردن بەوەی خۆی حەشارداوەو لەپێش ڕووداوەکان ئەوانە خێرو خۆشی‌و بەختەوەری ڕاستەقینە دەستەبەر دەکەن بۆتان نەك تەشائومو ڕەمڵ هاویشتن بە جموجوڵی هەندێ لەمەخلوقاتی خودا لەباڵندەو گیانلەبەرانی...!! ئیتر ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: مانای (تفتنون) (تستدرجون)ەواتە: لەو گومڕاییەی ئێستا تێیدان مۆڵەت دراون‌و وردەوردە بەرەو هەڵدێر هەنگاو دەنێن. کەوابوو هۆی نازڵبوونی شەڕو نەگبەتی بۆ سەرتان سەرپێچی خۆتانە بۆ خۆتان بەدەستی خۆتان ملی خۆتان دەشکێنن! ئەمجار پەروەردگار باسی ملهوڕو گومڕاکانی گەلی ثەمود دەکاو ئەوە ڕادەگەیەنێ کە: زێدو نیشتمان‌و شاری گەلی ثەمود کانگای فەسادو بەدڕەوشتی بوو دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ لەناو شاری (الحجر)دا کەشاری سەرەکی گەلی ثەمود بوو لەریش سپی‌و پیاوماقوڵانی گەلی صالح نۆ نەفەر هەبوون، فەسادو ئاشوبیان لەسەر زەوی بڵاودەکردەوە، جگە لە خراپەو فەسادو ئاشوب هیچی تریان لێ چاوەڕوان نەدەکرا!. بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بۆ کوفرو گومڕایی، بۆ بەدرۆ خستنەوەی حەزرەتی صالح. هەر ئەوانیش تەگبیری سەربڕینی حوشترەکەی صالحیان کردو سەریان بڕی، ئەمجار پیلانی کوشتنی حەزرەتی صالح‌و شوێنکەوتوانی ئەویان داڕشت‌و ویستیان ئەنجامی بدەن. ﴿قَالُوا: تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ لەکاتی کۆبوونەوەو پیلان دانان بۆ کوشتنی حەزرەتی صالح‌و دوای سەربڕینی وشترەکە، هەندێکیان بە هەندێکیان گوت: وەرن با پەیمان ببەستین‌و بۆ یەکتر ببینە سوێندخۆرو شەو لەناکاو هەڵکوتینە سەر صالح‌و

شوێنکەوتوانی بیانکوژین‌و قەلاچۆیان بکەین، دوایی لەلای خوێنگرەکانی سوێند دەخۆین. کە ئێمە ئاگاو خەبەرمان لەکوشتنی ئەمانە نیەو نازانین کێ صالح‌و شوێنکەوتوانی صالحی کوشتووە. ئاگامان لەم روداوە نیە. ئێمە ڕاستگۆین لەوەدا کە دەڵێین: نازانین کێ صالحی کوشتووەو کێ شوێنکەوتوانی ئەویان کوشتووە. زومەخشەری ئەم ئایەتەی کردۆتە بەلگەیەکی تری ڕێبازە ئیعتیزالیەکەی‌و دەڵێ: ئەم ئایەتە بەلگەیە کە درۆ لای کافرو بێ بڕوایانیش دزێو ناشیرینە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە عەقڵ (بێ هەبوونی شەرع) دەرکی باش یان خراپی شتەکان دەکا. کەوابوو درۆ لەڕوانگەی عەقڵەوە کارێکی خراپە!!

زەجاج دەفەرموێ: ئەو (نۆ) شەقاوە ئاشوبگێڕە پەیمانیان بەست کە: شەو پەلاماری حەزرەتی صالح‌و دارو دەستەکەی بدەن‌و بیانکوژن‌و دوایی لای خزم‌و خوێنگرەکانیان خۆیان بەبێ ئاگا نیشان بدەن‌و بڵێن: ئێمە ئاگامان لەکوشتن‌و لەناوبردنی ئەمانە نیە. ئەمەش مەکرو پیلان بوو لەو کۆمەڵە ئاشوبگێڕو فیتنە جۆیە. ئەم پیلان‌و مەکرە شومەیان دوای ئەوە بوو کە: وشترەکەیان کوشت‌و حەزرەتی صالح هەڕەشەی لەناوچوونی لێ کردن‌و پێی فەرموون: ﴿تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ - هود/٦٥﴾.

بەلام خوادای بالادەست، فرت‌و فێڵ‌و پیلانەکەیانی هەلوەشاندەوە، قەلاچۆکردنی تووشی خۆیان کرد. دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُوا مَكْراً وَمَكَرْنَا مَكْراً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: پیلانیان دانا، فرت‌و فێڵیان کرد، ئێمەیش تۆڵەی فرت‌و فێڵکانیانمان لێ ستاندن، قەلاچۆمان کردن‌و زوو عیقابمان دان بەبێ ئەوە بزانن عەزابی ریشەکێشکەریان بۆدێ عەزابمان بۆ ناردن‌و قەلاچۆمان کردن: داب‌و نەریتی خودا وایە پیلانی خراپە هەر یەخەی خاوەنەکەی دەگرێتەوە.

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڕوانە ئاکامی موئامەرەکەیان چۆن بوو چییان بەسەر هات، ئەوەتا بێگومان ئێمە

ئەوانەمان قەلاچۆ کردن، خۆیان‌و گەلەکەیانمان بە عەزابی ریشەکێش لەناوبردن. جگە لەوانەی ئیمانیان بە حەزرەتی صالح هێنابوو! ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ئاکامی نازلبوونی عەزاب بۆ سەریان ئەوەبوو زێدو خانوو مەسکەنیان چۆڵ‌و خاڵی‌و کەس تێیدا نەماو خاپوورا! ئەمەش بەهۆی ئەوە بوو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد، خۆیان بەخۆیان کرد، بێگومان لەم سزادان‌و لەناوبردنەدا پەندو عیبرت‌و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانێك خاوەنی زانیاری‌و عەقڵ‌و هۆش بن‌و بەگوێرەی داب‌و نەریتی خودا لەبوونەوەردا هەڵس‌وکەوت بکەن، چونکە یاسای خودا لەبوونەوەردا وا دامەزراوە: کە ئاکام‌و سەرەنجام پەیوەست بن بەهۆکارەکانەوە، هاوار سەد هاوار بۆ کەسێك بڕوای بەخودا نەبێ‌و پێغەمبەرەکەی بەدرۆ بخاتەوەو واز لەملهوڕی‌و سەرپێچی خۆی نەهێنێ. ﴿وَأَنْجَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو بە حەزرەتی صالح‌و تەقواکارو خۆپارێزو لەخودا ترس بوون لەو عەزابە رزگارمان کردن‌و بەرەو وڵاتی شام رەویان کردو لە (الرملة)ی فەلەستین نیشتەجێ بوون! چونکە ئیمان‌و خۆپاراستن لەعەزابی خودا بە طاعەتکردن هۆکارێکی کاریگەرو سەرەکین بۆ رزگاربوون لەعەزابی دونیاو قیامەت!

مەبەست لەم چیرۆك‌و هەڕەشانە هۆشیار کردنەوەی قوڕەیشییەکانە بەتایبەتی‌و عەرەبەکان بەگشتی‌و ترساندنیان لەوە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان ئەوانیش‌وەکوو گەلە ناوبراوەکانی پێشوو عەزابی خودا دەیانگرێتەوەو لەناویان دەبا، پێغەمبەرو هاوەڵانیشی رزگار دەکاو تووشی عیقاب نابن!

## چیرۆکی چوارەم لەم سورەتەدا چیرۆکی حەزرەتی لوطە لەگەڵ گەلەکەیدا

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾.

ئەمە زنجیرەیەکی کورتی چیرۆکی حەزرەتی لوطە (علیه السلآم) لەم زنجیرەیەدا دیاردەیەکی فاحیشەی گەلی لوط دیاری دەکا، دیاردەی (نێربازی)و وازهێنان لەچوونە لای ئافرەت! بەڕاستی دیاردەیەکی ناوازەو سەرەنج ڕاکێشە لەمێژووی کۆمەڵی ئادەمیزاددا نێر بچێتە لای نێرو لەگەڵیدا جوت بێ، ئەم دیاردە نەشازە ببێتە دابو نەریتو هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بگرێتەوە، ڕێ دەکەوێ لەکۆمەڵگادا یەکێك یان چەند کەسێك تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن، یان هەندێ کەس و هەواو بارو دۆخ وا دەکەن نێر مەیلی نێر بکاو (نێربازی) ئەنجام بدەن، زۆربەی کات ئەم دیاردەیە لە سەربازخانەو ئەو شوێنانەدا کە پیاوی تێدا کۆدەبنەوەو ئافرەتیان لێ دوورە وەکوو بەندینخانە، ئالەم جۆرە کەش و هەوایانەدا تاك و تەرا پیاوی وا دەبێ زەختی جنسی تینی بۆ دێنێ و ئینحیراف دەکاو پرکێشی ئەو کارە دزێوە دەکا!! ئەم دیاردەیە هەرچەند کەمە بەلام زۆرجار لێرەو لەوێ و لەڕابوردوو ئێستاو داهاتوودا ڕوی داوەو ڕودەدا.

وەختە بڵێین ئەوە زۆر جێگای سەرسوڕمان نیە، چونکە لەهەموو کۆمەڵگایەکدا لەکۆن و نوێدا بینراوەو دەبینرێ.

بەلام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانەو حەقوایە بەغەریب بزانرێ کە: ولاتێك تێکڕا دانیشتوانی روبکەنە ئەم کارە ناشیرینەو سەرلەبەر پیاوانی لە سروشت

هەڵگەڕێنەوە، وێڕای هەبوونی ئافرەتی زۆرو دەستەبەر بوو، تاقمی نێرینەی ئەو کۆمەڵگایەواز لەژنهێنانو چونە لای ئافرەت بهێننو بەرببنە یەكو نێربازی بکەن، بەڕاستی ئەمە ددیاردەیەکی سەرەنج ڕاکێشەو نیشانەی ئەوەیە: ئەو کۆمەڵگایە فڕیان بەسەر مرۆڤایەتیەوە نەماوەو بەتەواوی داڕوخاونو لەپلەی ئاژەڵیش دابەزیونو پیاوێکی ڕەشیدیان تێدانەماوە. بێگومان خودای زاناو کار دروست لەسروشتدا بەگشتیوای داناوە ئەم ڕەگەزە مەیلی ئەو ڕەگەز بکا، ڕگەزی نێر حەزی لە پەیوەندی کردن بێ لەگەڵ ڕەگەزی مێینەداو بەپێچەوانەشەوە چونکە بەردەوام بوونی ژیان پەیوەستە بەم حەز لێکردنو پێکەوە هەڵکردنەی نێوان نێرو مێ. پەروەردگار لەهەموو زیندوێکا گیانلەبەر بێ یان ڕوەك و درەخت بێ نێرو مێی داناوەو بەهۆی پەیوەندی کردنی نێرو مێ بە یەکترەوە ژیانو ڕەچەڵەك بەردەوامەو درێژەی پێ دەدرێ.

بەکوردیو کورتی بەردەوام بوونی هەموو گیانلەبەرو ڕوەك و درەختێك بەگوێرەی تەلقیحو تێکەڵاوبوونی نێرو مێ دەستەبەر دەبێو درێژە بەمانەوەی گەراکەیان دەدەن، تەنانەت ئەو شتانەی لە ڕەگەزەکەیاندا نێرو مێ نیە، خانەی نێرو مێ لەتاکەکانیاندا هەیەو بەکۆبونەوەی خانەکان ڕەچەڵەکی خۆیان دەپارێزن.

جا چونکە بەیەکگەیشتنی نێرو مێ (تزاوج) بنەمای ژیانەو یاسای گشتی بەدیهێنراوانە، بۆیە خودای مەزن هێزێکی کێشندەی لەنێوان ژنو مێردا دروست کردووەو لەناخەوە ئەو مەیلە هەیەو پێویستی بەفێرکردنو بیرکردنەوە نیەو هەموو نێرو مێینەیەك پەی پێ دەبا. ئەمەش بۆ ئەوەی ژیان بەرێبازی خۆیدا بڕواو بەگوێرەی سروشتی ڕەسەنو پەسەند ئەو بەیەکگەیشتنو تێکەڵاوبوونە ئەنجام بدرێ، زیندووەکان بەم جوتبوونو تێکەڵاوبوونە لەززەتی خۆیان دەست دەکەوێو قودرەتی خودای کار دروستیش لەئاکامی ئەم بەیەکگەیشتنەویستی خۆی دێنێتە دیو بنەمای کۆرپەلە لەمنداڵدانی مێینەدا پەیدا دەبێو دەکەوێتە خۆ.

پەروەردگار هێنی پیاو وانێکی ئافرەتی بەشێوەیەك دروست کردووە کە: بۆ یەکتر گونجاو بن‌و لەززەت لەیەکدی وەربگرن! دەی ئەم گونجان‌و لەززەتە سروشتییە لەپەیوەندی کردنی نێر بەنێرەوە دەستەبەر نابێ‌و ئاکامی نەخۆشی ترسناك‌و قەلاچۆکەری لێ چاوەروان دەکرێ. بۆیە زۆر سەیرو سەرەنج ڕاکێشە کە نەتەوەی حەزرەتی (لووط) تێکڕا ئاوا لە سروشت هەڵبگەڕێنەوەو هەموویان روبکەنە ئەو کارە دزێوە ناسروشتیە!!! جگە لەلادان‌و ئینحیراف هیچ فاکتەری تر نەبوون ئاوا پێچەوانەی سروشت بجولێنەوە، بۆیە حەزرەتی لووط بەشێوەی ئینکارو سەرسوڕمانەوە خیطابی ئاڕاستە کردن. دەفەرموێ: ﴿وَلُوطاً إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ وَأَنْتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر چیرۆکی لووطو نەتەوەکەی بۆ گەلەکەت بگێڕەوە، کاتێك (لووط) هەڕەشەی لەگەلەکەی کردو لەنیعمەت‌و عەزابی خودا ترساندنی دەربارەی ئەو کارە دزێوەی لەناویاندا باو بوو لەنێربازی‌و پێش ئەوان کەس نەی کردبوو، خۆیان دایان هێنابوو، حەزرەتی لووط بەشێوەیەکی سەرزەنشت ئامێزو نارەزایی دەربڕین پێی فەرموون: ئەوە چۆن ئێوە پرکێشی نێربازی دەکەن‌وازتان لەئافرەتاکانتان هێناوە؟! بەچ عەقڵێك سوواری یەکتری دەبن‌و ئەو کارە دزێوەتان تێدا بڵاوبۆتەوەو بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجامی دەدەن! لەکاتێکدا بۆخۆتان دەزانن کە: دیاردەیەکی دزێو زەرەرئامێزە، گەراتان دەبڕێتەوەو دوژمنایەتی دەخاتە نێوانتانەوە دژایەتی لەنێوان چینی نێرینەو چینی مێینە بەرپا دەکا. یان چۆن ئێوە ئەو فاحیشەو کارە دزێوە لەپێش چاوی یەکتری ئەنجام دەدەن.؟ دەچن لەدیوەخان‌و نادییەکانتان بەئاشکراو لەپێش چاوی یەکتری نێربازی دەکەن!؟.

﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِّسَاءِ؟﴾ چۆن ڕێگا بەخۆتان دەدەن لەجیاتی ئەوەی بچنە لای ئافرەت دەچنە لای پیاو؟ ئەوە شذوذی جنسییەو لادانە لەسروشت‌و وازهێنانە لەشتێك کە خودا حەڵاڵی کردووە بۆتان، ئەنجامدانی کارێکە

خودا لێی حرام کردوون ﴿بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ لەڕاستیدا ئێوە گەلو نەتەوەیەکی نەفامو بێ هۆشن، چاکەو خراپەی خۆتان نازانن، سەرەنجامی کارە ناشیرینەکانتان دەرك ناکەن، کردەوەی ناشیرینو قیزەون کە نێربازییە هەڵدەبژێرن بەسەر کردەوەی حەلاڵو سروشتیدا، کە چوونە لای ئافرەتە. وەکوو لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ، وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ – الشعراء/١٦٥ – ١٦٦﴾. واتە: ئێوە کردەوەی نەفامان دەکەن، لەو کارە ناشیرینانەتاندا جوداوازی چاكو خراپ ناکەن[٥].

**بەیارمەتی خودا شەوی (١١/٩/٢٠٠٠) لە پاکنووسی جزمی (١٩)ی تەفسیری ڕەوان بوومەوە بەمەش کۆتایی بەئایەتی (٥٥)ی سورەتی (النمل) هات**

[٥] شیاوی باسە لێرەدا جزمی نۆزدە تەواو بوو بەلاّم ئێمە چیرۆکەکە تەواو دەکەین ئەمجار کۆتایی بە جزمەکە دەهێنین.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

**بەڵگەکانی تاك‌و تەنهایی خوداو نیشانەی دەسەڵاتی بێ سنووری**

﴿ ۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن

﴿يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾

دواى ئەوەى پەروەردگار لەئايەتەكانى پێشوودا چیرۆكى چوار پێغەمبەرى لەگەڵ نەتەوەكانیاندا بۆ گێڕاینەوە، باسى لەناوبردنى ئەو نەتەوانەو جۆرى لەناوبردنەكەیانى بۆ كردین كە: بەهۆى هاوەڵدانان بۆ خوداو بتپەرستىو هەڵگەڕانەوە لەسروشتو فەرمانى پەروەردگارو سوور بوون لەسەر كارو كردەوە قێزەونەكانیان، خودا بەغەزەبى خۆى ڕیشەكێشى كردن.. ئەمجار بەڵگەى جۆراو جۆرى هێنانەوە لەسەر دەسەڵاتى بەرفرانىو یارمەتیدانى پێغەمبەرانى بەسەر دوژمنەكانیاندا، فەرمانى بەپێغەمبەرو خۆشەویستى خۆى حەزرەتى (محمد) ﷺ كرد كە: شوكرو سوپاسى خودا بكا لەسەر ئەو نیعمەتانەو درووود بنێرێ بۆسەر گیانى ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارانە: كەلەپێناو گەیاندنى پەیامى یەزداندا كەمتەرخەمییان نەكردو بەڵێ هاتوویى ئەركى سەرشانى خۆیان ئەنجام دا. ئەمجار

رەدی بتپەرستەکانی دایەوەو جۆرەها بەڵگەو نیشانەی بەهێزو پتەوی هێنانەوە لەسەر تاكو تەنهایی زاتی پاکیو دەسەڵاتی رەهاو بێ سنووری لەدروستکردنو بەدیهێنان دا..!

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلاَّ أَنْ قَالُوا أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ﴾ وەڵامی گەلەکەی جگە لەڕاگەیاندنی سووربوونی خۆیان لەسەر کردەوە ناشیرینەکانیان هیچی تر نەبوو، لەجیاتی ئەوەی پەندئامێز بن وەبە خۆیاندا بچنەوەو واز لەو عادەتە قیزەونەیان بهێنن زیاتر لەسەر کارەکەیان سووربوون، پاش دەمە دەمێو راوێژ کردن لەنێو خۆیاندا، وتیان: لووطو کەسوکارو شوێنکەوتوویان لەوڵات دەربکەن، مەهێڵن کەس لەگەڵیان دابنیشن! چونکە ئەوانە بەکەڵکی ئەوە نایەن هاوسێیمان بکەن، بەنەسیحەتو ئامۆژگارییەکانیان فسقەڵ دەبینو قسەکانیان لەسەر شانمان گرانە. وڵات وڵاتی خۆمانەو لووطو تاقمەکەی بەئێمە بێگانەنو ئێمە لەگەڵیان هەڵناکەین. ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ ئەوانە کەسانێکن لە کردەوەی ئێمە نارازینو خۆیان بەخاوێن حیساب دەکەنو (بیلامانا خۆیان پیس ناکەن!!).

ئەمە دابو نەریتی بەدکارانە لەهەموو چەرخو رۆژگارێکدا، نایانەوێ فیسقو فجوری خۆیان بە ئامۆژگاری ئامۆژگاریکارانو موصلیحەکان لێڵ بکەن، دەیانەوێ کەس رەخنەیان لێ نەگرێ بۆ ئەوەی لە فەسادو بەد رەوشتی خۆیاندا نقوم بن! جا کە گەلی لووط عەزمیان جەزم کرد لەسەر دەرکردنی لووطو شوێنکەوتوانی لەشارو وڵاتیان، خودا وڵاتەکەیانی بەسەردا وێران کردن. ﴿فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ قَدَّرْنَاهَا مِنْ الْغَابِرِينَ﴾ حەزرەتی لووطو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنابوو رزگارمان کردن جگە لەژنەکەی لووط، ئەو رازی بوو بە کردەوە ناشیرینەکانی خەڵکەکەو لەژێرەوە یارمەتیدەریان بوو جاسوسی بۆ دەکردن، کە حەزرەتی لووط میوانی دەهاتن راپۆرتی لێ دەدانو هەواڵی بەخەڵکەکە رادەگەیاندن، بۆیە ئێمە بڕیارماندا

کە ئەو ژنە لەپێری لەناوچوان بێ، چونکە کەسێ بەکاری منکەر ڕازی بێ با بۆخۆشی نەیکا سزای بکەرانی هەیە.

﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَراً فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنذَرِينَ﴾ واتە: بەردەبارانمان کردن بە بەردە بارانکردن، بەو بەردە بارانکردنە لەناومان بردن، خراپ بارانێك بوو ئەو بەرد بارینەی ئەو گەلە هەڕەشە لێکراوەمان پێ لەناوبردن، بیانوویان هێنانەوەو بیانوومان بڕین، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاریان کرد، پێغەمبەری خۆیان بەدرۆخستەوەویستیان پێغەمبەرو شوێنکەوتوانی لەشار وەدەرنێن، بۆیە لەناومان بردن‌و کردمانن بەپەندو عیبرەتی رۆژگارو ئەوە ئاکام‌و سەرەنجامی سەرپێچیکاران‌و لەرێ دەرچوونە.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ئەی موحەممەد! بڵێ سوپاس بۆ خودایە، حەمدو سوپاسی خودا بکە لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە مەزن‌و جۆراو جۆرانەی کە: لەژمارە نایەن‌و بەبەندەکانی خۆی بەخشیون، هەروەسا سوپاسی خودا بکە لەسەر تایبەتمەندیی زاتی پاکی بەو صیفەتە بەرزو شکۆمەندییانەی پێیانەوە (متصف)ە. بەو ناوە جوانانەی کەهەنی‌و هاواری لێ دەکرێ پێیان! ﴿وَسَلَامٌ عَلَى عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَى﴾ ئەی موحەممەد! درووود بنێرە بۆ سەرگیانی پاکی ئەو بەندانەی خودا کە: هەڵی بژاردون بۆ فروستادەیی‌و پەیامی خۆی پێدا ناردوون بۆسەر بەرەی ئادەمیزاد، ئەوانیش بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوەو پەیامی ئاسمانیان بەدانیشتوانی سەر گۆی زەوی راگەیاندوە.

فەرمانەکە بە پێغەمبەر ﷺ کراوە: کەبەردەوام بێ لەسەر حەمدو سوپاسی خوداو ناردنی درووود بۆسەر گیانی پێغەمبەران هەروەها موسوڵمانانیش فێری ئەم حەمدو سوپاسە بکاو ئەوانیش چاو لەو بکەن!

بەشێکیش لەو نیعمەتانە هیدایەتدان‌و رزگار کردنی پێغەمبەران‌و موسوڵمانانە، یارمەتیدان‌و سەر خستینیانە بەسەر دوژمنانیان داو ڕیشە

کێشکردنی دوژمنانە، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی تـرە کە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الصافات/١٨٠-١٨٢).

ئـەمجار دوای ئـەم پێـشەکیو ڕێ خۆشـکردنە، لـەدەرگای ئـەو دڵانـە دەدا، کەئینکاری ئایـاتی خـودا دەکەنو سەرەتا پرسیارێکیان ئاراستە دەکا کە تـەنیا وەڵامێکی هەیەو بەس! دەفەرموێ: ﴿أَاللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ؟﴾ ئایا ئەو خودایەی نـاوی (الله) یـەو خـاوەنی شکۆمەندیو توانـاو دەسـەڵاتی ڕەهایـە، ئـەو شیاوترە بـۆ پەرسـتنو بەندایـەتی بـۆ کـردن یـان ئـەم خـودا درۆزنانـەی بەناحـەق کردویـانن بەهاوەڵی خوداو دارای هیچ شتێك نین؟؟ ئەوشتانەی کە ئەوان کردویانن بـەهاوەڵی خودا بتو صەنەم بن یان فریشتەو جندۆکە بن یان هەر مەخلوقێکی تر بێ لەمەخلووقاتی خودا، شیاوی ئەوە نیە ببێتە هاوەڵی خوداو پەرستشی بۆ بکرێ. ج جـایی بگاتـە ئـەو ئاسـتەی لـەخودا باشـتر بـێ! هـەرگیز بـەدڵی عاقـڵ دا نایـە کـە مووازەنەو هاوکێشەیی بکا لەنێوان ئەوشتانەو خودادا، بۆیە بەم ئیستیفهامە ئینکار ئـامێزەو بـەم شـێوازە کـە کۆمـەڵێك سەرزەنـشتو (تهكم)و (تبكيـت) ی لـەخۆ گرتـوونو لۆمـەیان دەکـا لەسـەر ئـەوە کـە بتپەرسـتییان هەڵبـژاردوە بەسـەر عیبادەتکردن بۆ خودادا، مەبەستەکەش ئاماژەکردنە بۆ گومڕاییو نـەفامی ئـەوان. ئەگینا ئاشکراو نمایانە کە هـیچ خێـرو بێرێـك لەبەندایـەتی کردنـی ئەوانـەدا نیـە هەتا شیاوی ئەوەبن بەرامبەرییان لەگەڵ خودای بەدیهێنەرو زاناو دانادا پێ بکرێ، کەوابێ (مووازەنە) کە: کەئەنجام دراوە بەگوێرەی بیرو بۆچونی ئەوانە، کەپێیان وایە: بتەکانیان سودو قازانجیان پێ دەگەیەنن!!!

بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیفەرموو: (بل الله خير وأبقى وأجل واكرم).

ئـەمجار سـیاقەکە لەسەرزەنـشتو لۆمـەی کـورت ئاسـاوە دەگوێزێتـەوە بـۆ ڕەددانەوەیـەکی درێـژو تێـرو تەسـەلو پـڕ بەڵگـە، لەپرسـیاری ئینکـار ئـامێزەوە دەگوێزێتەوە بۆ پرسیارێکی تـر کـە: لـەواقیعی بوونـەوەر هەڵیدەسـتێنیو بەچاوی خۆیـان دیاردەکـانی دەبیـنن، لەروانگـەی بەڵگـەی جیـا جیـاوە رەدی بتپەرسـتەکان دەداتەوەو ئەوە دەچەسپێنێ: کە پەروەردگار خودایـەکی تـاکو تـەنهاو بـێ هاوەڵـە، خاوەن تواناو دەسەڵاتی رەهایە، دەتوانێ هەموو شـتێك بکـا، هیـچی لێ عاسـی نابـێ، هـەموو نیعمـەتێك لەوەوەیـەو ئـەو رەخـساندونی، دەی ئەوانـە بـەچ عـەقڵێك بەندایەتی بۆ شتێك دەکەن کە هیچ شتێکی لەدەست نایە!!

دەفـەرموێ: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُمْ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا﴾ ئایـا بتپەرسـتیو عیبـادەتکردن بـۆ ئەو شتانەی سودو قازانجیان بەدەست نیە باشە یان عیبادەتکردن بۆ خودایـەك کـە بەدیهێنـەری ئاسمانەکانـە بـەو هـەموو جـوانیو بـەرزیو فراوانییـەوە لەگـەڵ ئـەو حەمکـە ئەسـتێرەو مـانگو خـۆرەی لەفەلـەكو جەمـسەرو هێڵـەکانیاندا دێـنو دەچن؟؟ هەروەها زەوی دروستکردوە بەو شێوەی بگونجێ بۆ تێدا ژیان، کێوو دۆڵو سـارای تێـدا رەخـساندون، ئـەمجار لەئاسمانـەوە بارانمـان بـۆ سـەربارانـدوە درەخـتو رەوەکمان تێدا رواندون! ئەگەر باران نەبوایە نەدەڕوان، دەریاو زێو چۆمو کانیـاوو بـیرو شـەلالان تێـدا رەخـساندون، باخـچەو بـاغو دارسـتانمان تێـدا خوڵقانـدوە، بەروبومو دانەوێڵەمان تێدا بەدی هێناوە، جۆرەها ئاژەڵو گیانلەبـەری ترمـان تێـدا دروست کـردوە، ئەمانـە هـەموویان بـۆ بەرژەوەنـدیی ئێـوەی ئـادەمیزادە، بـۆ دابـین بوونی ڕزقو رۆژیی ئێوەیە، بۆ ژیانخۆشـیو لـەزەت وەرگرتنـی ئێوەیـە، خـۆ ئەگـەر پەروەردگار ئەو گیاوو گژو دارو درەختەی بۆ ئێوە نەخوڵقاندایـە، کـەی ئێـوە دارای ئەوەتان هەبوو بیانڕوێنن؟؟ ئێوە دەسەڵاتی بەدیهێنانی چڵەگیایەکتان نیـەو دارای خوڵقاندنی دەنکە دانەوێڵەیەك نین!!!

هەر خودا خولقێنەرو بەدیهێنەرە، هەر ئەو رزق و رۆزیدەرە ﴿أَئِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ؟﴾ ئایا دەگونجێ و عەقڵ پەسندی دەکا لەگەڵ هەبوونی خودای تاک و تەنیاو بەتواناو زانادا خودای تر هەبن، عیبادەتیان بۆ بکرێ؟! نەخەیر خودای تر نین و هەر (الله) خودایەو هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنە! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ﴾(المؤمنون/٩١).

بەڵام ئەم موشریک و نەفامانە سەریان لێ تێک چووە، گومرابوون، لەحەق لایان داوەو چوونە ناو زلکاوی باطل و فەسادەوە، هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن و غەیری خودا دەبەنە ریزی خوداو بەندایەتی بۆ دەکەن!!

بێگومان دیمەنی باغ و باخچەی رازاوەو رەنگاو رەنگی گوڵ و گەڵاکانی، بەروبوم و میوەجاتی، بۆنی خۆش و دیمەنی جوانی، تێفکرین و سەرنج لێدانیان داخوازی ئەوەن تەمجیدو تەقدیسی خودایان لەسەر بکرێ. ئەوەمان داوا لێ دەکەن کە پێویستە بەندایەتی بۆ بەدیهێنەری ئەو گوڵ و گوڵزارە بکرێ، تێفکرین لەبوونەوەر؛ لەتاکەکانی بوونەوەر هەر لەدارو درەخت و روەک و کانیاو و چۆم و دەریاوە، تا دەگاتە ئادەمیزاد خۆی و گیانلەبەرانی تری ناو دەریاو وشکانی بەپێرۆو خشۆک و باڵەفڕەیەوە: هەمووو هاندەرن بۆ ئیمان هێنان بەهەبوونی خودایەکی باڵادەست و کاردروستی هەمیشە زیندوو زاناو دانا.

چونکە رەنگاندنی تاقە گوڵێک و تەنسیق تێیدا گەورەترین هونەرمەندی ئادەمیزاد لەئاستیدا دەسەوسان و جۆش داماوە. مەوجاندنی رەنگەکان و پێکەوە گونجان و تێکەڵبوونی هێڵە رەنگییەکان و رێکخستنی پەلکە گەڵاکانی تاقە گوڵێک کارێکی سەرئاسایەو لەتوانای ئادەمیزاد دا نیە ئەنجامی بدا چ جایی بتوانێ ژیان و گەشەو نەش و نما بخاتە درەختەکە خۆیەوە، کەوابوو بەهیچ جۆرێ لەتوانای ئادەمیزاد دا نیە درەختێک، یان روەکێک بەدی بێنێ، بەڵکوو ئادەمیزاد چەندێک لەزانست و زانیاری دا پێشکەوتن بەدەست بێنێ هەرگیز پەی بەنهێنی ژیان ناباو

نــازانێ روح چــیەو نهێنــی گیــانو زینــدویی نــاو گیانلەبــەرو درەخــتو روەك نادۆزێتەوەو لەبەرامبەری دا کۆڵەوارە.

هەتا ئێستاو لەمەدواش ئادەمیزاد نازانێ ئەم ژیانە چۆن هاتووەو چۆن دروست بــووەو چۆن دروســت دەبــێو چــۆن پەیوەنــدی بــەمادەوە دەکـا!! بەناچـاری دەبــێ بیگێڕینەوە بۆ تاکە سەرچاوە سـەرەکیو بـێ نموونەکـەی کـە پـەروەردگارە.. ئـەتۆ چارت نیەو چـەندێك لـەم بـارەوە خـۆت مانـدو بکـەیو بتـەوێ بزانـێ گیـان چیـەو لەچی پەیـدا دەبـێ بێهودەیـەو خـۆ مانـدو کردنـە، زوربـەی زۆری کـافرو گومـڕاکـان بڕوایان وابوە کە خودا بەدیهێنـەرە، دەیانزانی دروسـت کـاری بوونـەوەر بـەئاسمانو زەوییەوەو ئەوەی تێیان دایە (الله) یە لەم بارەوە کەسیان نەدەکرد بـەهاوەڵی خـودا تـەنها لـەڕوی عیبـادەت بـۆ کردنــەوە هاوەڵیـان بـۆ دادەنـا وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ﴾ (الزخـرف/٨٧) یـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِـهِ الْأَرْضَ مِـن بَعْـدِ مَوْتِهَـا لَيَقُـولُنَّ اللَّـهُ﴾ (العنکبوت/٦٣)

ئەمجار قورئان سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ حەقیقەتێکی تـری بوونـەوەرو بــەرەنگارییان دەبێتــەوەو دەفــەرموێ: ﴿أَمَّــنْ جَعَــلَ الْأَرْضَ قَــرَاراً﴾ واتــە ئایــا عیبادەتکردن بـۆ بـتو صـەنەمێك باشـە کـە هـیچ سـوودو قانزانجیـان لێ چاوەڕوان ناکرێ؟ یان بۆ خودایەك کەزەوی واڕەخساندوە بەکەڵکی قەرارگای ئادەمیزادو شتی تریش بـێ، ئـەم زەوییـە گـەورەو فراوانـەی وادروسـت کـردوە ئـاوو هـەوای سـازگارو لەبارە بۆ تێدا ژیان، جمو جووڵی بەجۆرێکە بگونجێ لەگەڵ ژیـانی گیانلەبـەرانی سەری، ئەوەندە خێرا هەڵئاسوڕێ قەبارەکانی سەری بەگیاندارو بـێ گیانـەوە خـۆی لەسـەر نـەگرنو فڕێیـان بـدا!! ئەوەنـدەش بەهێواشـی هەڵئاسـوڕێ کـە زیـانی بـۆ گیانلەبەرانو دارو درەخـت بـێ! خـۆ ئەگـەر دووریو نزیکـی زەوی لـەخۆرو مـانـگ وەکوو ئێستای نەبوایـە، یـان ئەگـەر قـەبارەو شـکڵو شـێوەی گـەورەتر یـان بـچوکتر

بوایە، یان سوڕانەوەی مانگ بەدەوری دا خێراتر بوایە یان....هتد ئەوە زەوی بەکەڵکی ژیان نەدەهاتو گیانلەبەران نەیان دەتوانی تێ یدا بژین.

هەڵبەتە ئەوکاتەی قورئان نازڵ بووە ئادەمیزادان جگە لەپێغەمبەر ﷺ بەم شێوەی ئەمڕۆ چۆنیەتی بوونەوەرو هەڵسوڕانی قەبارەکانی کە تێیدا هەڵدەسوڕێن نەزانیوە، لەئایەتی ﴿أَمَّنْ جَعَلَ الأَرْضَ قَرَاراً﴾ ئەو وردیاتو عەجایەباتەی چۆنیەتیو هەڵسوڕانی زەوییان هەست پێ نەکردوە، بەڵام بەشێوەیەکی ئیجمالی بینیویانە سەر زەوی بەکەڵکی تێدا ژیان دێو ناتوانن لاف ئەوە لێ بدەن کە: شتێکی تر هەبێ لەبتەکانیانو غەیری بتەکانیان هاوبەشییان هەبێ لەدروستکردنی زەوی دا، بەم شێوە جوانو ڕێکو پێکو گونجاوە، ئەمەش بەسە بۆ بەلگە هێنانەوە، لەهەمان کات دا دەقەکە هەڵدەگرێ زانایان چین دوای چین بەگوێرەی زانیاری خۆیانو پێشکەوتنی باری ڕۆشنبیری سەردەم مانای تازەو زانست ئامێزی لێ وەرگرنو ڕۆژ دوای ڕۆژو ساڵ دوای ساڵ مانای تازەی لێ دەربێنن، ئەمەش موعجیزەیەکی تری قورئانەو دیاردەیەکی تایبەتە بەو کەلامە ئاسمانییەوە چونکە خیطابەکەی بۆ هەموو عەقڵو هۆشێکە، بۆ هەموو دڵو دەرونێکە بەدرێژایی مێژوو... کەوابوو: هەرکەسە دەتوانێ بەگوێرەی عەقڵو زانیاریی خۆی مانای لێ وەربگرێ!

﴿وَجَعَلَ خِلالَهَا أَنْهَاراً﴾ پەروەردگار لەزەوی دا کێوو دۆڵو دەشتایی ڕسکاندونو بەناو زەوی دا زێو چۆمو چەمیلکەی دروست کردون!

چۆمو زێ یەکان لەزەوی دا ڕەگی ژیانو نیعمەتی پەروەردگارن بۆ گیانلەبەران، ئەو زێو چۆمانە بەناوی دا لەباکورەوە بۆ باشوورو لەباشوورەوە بۆ باکورو لەخۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاواو بەپێچەوانەوە دەکشێنو زەوی شەق دەکەن، لەگەڵ خۆیان فەڕوبەرەکەتو ژیان نەقڵ دەکەن، چۆم پێک دێ لەکۆبوونەوەی ئاوی باران بەشێوو دۆڵەکان داو دوایی یەکدیگیر بوونیان لەشێوەی چۆمێکی گەورە یان بچووک داو کشانی بەرەوخوار بەگوێرەی وڵاتەکە.

ئـەو خودایـەی بوونـەوەری بـەدیهێناوە هـەر ئـەو نەخـشەی چۆنیـەتی کـشانی چۆمەکانی کێشاوە، هەر ئەو سەرچاوەکانی بـەدیهێناوە، هـەر ئـەو لەبـەرزایی یـەوە بارانی باراندوەو هەندێکی لەطەبەقـەکانی زەوی دا پەزمەنـدە کـردوەو کردویـەتی بەسەرچاوەی هەمیـشەیی زێو چـۆمەکان کـە لەشـێوەی کانیـاوو بلّقـاوو شـەلالدا لەزەوی هەڵدەقوڵێن‌و دەبنە سەرچاوە بۆ ئەو چۆمانە. هەڵبەتە کەس ئەوەنـدە بـێ عەقڵ‌و بێ دەماغ نیە لاف ئەوە لێ بدا کە شتێك هەبێ جگە لەخودا ئـەو چۆمانەی بەدی هێنابن، یان هاوبەشی خودایان کردبێ لەبەدیهێنانیان دا!!

﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ﴾ پـەروەردگار لـەزەوی دا کێـوی بـەدیهێناون، وەکـوو بزمـار لەزەوی دا دایکوتاون‌و لەنگەری زەوییان راگرتووە، ناهێڵن لەرەبکا، لەزوربەی شوێن دا ئەم کێوانە سەرچاوەی چۆمەکانن‌و لەوانـەوە ئاوهەڵدەقوڵێ‌و سـەرەوژێر بـەرەو شێوو دۆڵەکان هەڵدەرژێ‌و زێو چۆمەکان پێك دێن.

﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً﴾ پـەروەردگار لـەنێوان ئـاوی شـیرین‌و گـواراو ئـاوی سوێردا نێوەندی داناوە، واتە: لەنێوان دەریای سوێرو تـاڵ‌و چـۆمی شـیرین‌و گـوارادا پەردەی داناوە. (بەشێوەی تەغلیب) بەچۆم دەڵێ دەریا، چونکە مادەکەیان کەناوە هاوبەشە لەنێوان دەریاو چۆم دا.

زۆربەی وەختیش پەردەی نێوان دەریاو چۆم پەردەیەکی سروشتی یە، ئـەویش بریتییە لەوەی ئاسـتی ئـاوی چـۆم لەئاسـتی ئـاوی دەریـا بـەرزترە، ئـاوی چـۆمەکان دەرژێتــە نــاو ئــاوی دەریاکــان، مــەجرای چــۆمەکان لەلایــەن ئــاوی دەریاکانــەوە داناپۆشرێ، بەم شێوە ئاوی شیرین‌و گوارای چۆمەکان تێکـەڵ بـەئاوی تـاڵ‌و سـوێری دەریاکان نابێ، بۆئەوەی ئاوی دەریا رۆڵی خۆی بگێرێ‌و سەرچاوەی بـاران بـێ، ئـەو هەوایەی سەرخۆی بەپاکی بمێنێتـەوە، هـەروەها بـەهۆی ئـەو تـاڵ‌و سوێرییەی ئـاوی دەریاکان بۆگەن ناکا، ئەگەر وانەبوایە بەهۆی مانەوەی زۆر بۆگەنی دەکرد.

هەروەها ئاوی چۆمەکانیش بۆ خواردنەوەی ئـادەمیزادو ئـاودانی گیانلەبـەرانی ترو ئاودێر کردنی باغ‌و باغات‌و دارو درەخت‌و گژو گیا بەکاربهێندرێ!

تەنانەت لەو كاتەش دا كە ئاستی روبەری چۆم لەڕوبەری دەریا لەبەر هۆیەك لەهۆیەكان نزم تریش بێ لەمپەڕی نەهێشتنی تێكەلاوبوون هەر بەردەوامە، چونكە سروشتی خودی ئاوەكان لێك جودان؛ ئاوی چۆم سووكەو ئاوی دەریا قورسترە، مەجرای هەردوكیان بەردەوام لێك جودانو تێكەڵ بەیەكتر نابنو هیچیان بەسەر ئەوی تریان دا زاڵ نابێ، ئەمەش قانونو یاسای خودایە لەدروستكردنی بوونەوەردا ئاوا بەوشێوە دوو شلەمەنی لەیەك مادە لەپەنایەكەوە تێكەڵ بەیەك نابن.

دەی كێ ئەم تەصمیمەی داناوە؟ كێ هەیە لاف ئەوە لێ بدا كە غەیری خودا ئەمەی بەدیهێناوە؟ یەكیەتی قانوونی بوونەوەرو یەكیەتی تەصمیمو خەریتە وا لەعاقڵمەندان دەكەن ئیعتراف بەتاكو تەنهایی بەدیهێنەر بكەن ﴿أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زوربەی زۆری ئادەمیزاد ئەندازەی گەورەییو بەتواناییو دانایی خودا نازانن، هەست بەزیانی بتپەرستی خۆیان ناكەن، نازانن خوداپەرستیو یەكتاپەرستی چەند بەسودە بۆیان!!

نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێكی ترە وەكوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَاراً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾ (غافر/٦٤)

یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخاً وَحِجْراً مَحْجُوراً﴾ (الفرقان/٥٣) ئەمجار سیاقی قورئان لەرانواندنی دیمەنەكانی بوونەوەرەوە دەگوێزێتەوە بۆ دیاردە تایبەتمەندییەكانی خودی خۆیانو دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ﴾ ئایا ئەو شتە هیچ لەبارا نەبوانەی بێ گیانو هەستن باشن بۆ خودایەتیو شیاوی پەرستش بۆ كردنن؟ یان ئەو خودایەی بەهانای لێ قەوماوو داماوانەوە دێ ئەگەر هاواری لێ بكەن، ناخۆشیو تەنگانەو بەلایان لەسەر لادەباو دەیانكاتە جێگرو میراتگریی پێشینان، چین لەدوای چین دەیانكاتە میراتگریی

یەکتریی! ﴿الْمُضطَرَّ﴾ کەسێکە نەخۆشیی یان هەژاریی‌و بەڵاو کارەسات وای لێ بکەن هاوار بۆلای خودا بکاو پەنای بۆبەرێ!!

لێقەوماو لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی دا بۆی دەردەکەوێ کە: جگە لەخودا کەس فریادرەس نیە، کەس ناتوانێ ببێتە پەناو بەهانایەوە بێ، ئەوانەی دەکەونە حاڵەتی تەنگانەو روبەروی مردن دەبنەوە لەو سات‌و کاتانەدا بۆیان دەردەکەوێ کە: کەس بەکەڵکی هاوارلێکردن نایە، هەموو پەناو پشتیوانێك لەبیر دەچنەوە جگە لەخودا کەسی تر بەخەیاڵ دا نایە، ئەوانەی دەخرێنە زیندانی رەشی طاغوت‌و ملهورەکان، دەخزێندرێنە ژورێکی تەسکی چوار دیواری بێ پەنجەرەو دەرگا لەسەر گاڵدراوە، هاواریان بەکەس ناگا، ئەوانە باش خودا دەناسن‌و بەدڵسۆزیی هاواری لێ دەکەن‌و هانای بۆ دەبەن. کەم کەس هەن لەکاتی تەنگانەو لێقەومان دا لەکاتێك دا بەڵاو کارەسات تابینەقاقای دەگرن خودای بیر نەکەوێتەوەو هانای بۆ نەبا!

ئالەوکاتە تەنگانەو ناخۆشیانەدا ئادەمیزاد سەیری دەوروبەری خۆی دەکا، دەروانێ بێ یارمەتیدەرو هۆکاری رزگاربوونە، ئەو هێزو یارمەتیدەرانەی لەوەپێش پشتی پێ دەبەستن هیچیان پێ ناکرێ ئەوانیش وەکوو خۆی دەسەوسان‌و داماون، هێزێك نیە رزگاری بکاو بەهانایەوە بێ، ئالەم کات‌و هەلۆیستانەدا سروشت بەئاگا دێ‌و پەردەی غەفڵەتی لەسەر لادەچێ‌و لەناخەوە هەست بەهەبوونی هێزی خودایی دەکاو دەزانێ جگە لەئەو کەسی ترشیاوی بەفریاکەوتن‌و بەهانا هاتنەوە نیە، ئالەوکاتانەدا ئادەمیزاد لەناخەوە رودەکاتە (الله) هانای بۆ دەبا، تەنانەت ئەگەر لەوەپێش لەکاتی خۆشی‌و لەشساغی‌و هەرزانی دا خوداشی لەبیر چووبێتەوە لەو کاتانەدا وەبیری دەکەوێتەوە بەباشی دەیناسێ‌و بەدڵسۆزی هاواری لێ دەکاو هانای بۆ دەبا.

﴿أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ﴾ ئایا دەگونجێ ئەو خودایەی ئەوە زات‌و صیفاتنی خودایەکی تری لەگەڵ دا بێ؟! ئایا جگە لەخودای زاناو داناو بەتوانا کەسێکی تر هەیە ئەو

کردەوەو صیفاتانەی لێ بوەشێتەوە؟ کەسێکی تر هەیە شیاوی لێ پاڕانەوەو عیبادەت بۆ کردن بێ؟

نەخەیر جگە لەخودا کەسێکی تر نیە شیاوی خودایەتی بێ، هاواری لێ بکرێ بەهانای لێ قەوماوانەوە بێ!!

﴿قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئای چەند بەکەمی یادی نیعمەتەکانی خوا دەکەنەوە، چەند سپڵەو پێ نەزانن؛ چەند غافڵو بێ ئاگان لەوکەسەی شارەزاییتان دەکا بۆ ڕێبازی حەقو ڕاستو زەوی بۆ ڕام کردون، هۆکاری تێدا ژیانی بۆ ڕەخساندون، عەقڵو هۆشو هێزو توانای پێ داون بۆئەوەی سروشت بۆ بەرژەوەندیی خۆتان ڕام بکەنو بەکاری بێنن، مردنو ژیانی بۆ ئێوە داناوە، چین لەدوای چین شوێنی یەکتری دەگرنەوە، ئەگەر مردن نەبوایەو ئادەمیزادانی کۆن بمانایە، ئێستا سەر زەوی هێندە قەرەباڵغ دەبوو، جێگا نەدەبووەوە، ژیان تێیدا زەحمەت تر دەبوو، ڕەوڕەوەی حەضارەتو بیرکردنەوە سستو بێ گوڕ دەبوو لە پێشکەوتن دا. شوێنی یەکدیگرتنەوە وادەکا بیرو بۆچوونو ئەزمونەکان تازەگەریو پێشکەوتنیان تێدا بێتەجێ، شێوەو نەمەطی ژیان گۆڕانکارییان تێدا بکرێ بەبێ ئەوەی کۆنو نوێ بەرەنگاری یەکتر ببنەوەو لێك هەڵبەزنەوە، خۆ ئەگەر ئادەمیزادانی کۆن بمانایەو تێکەڵ بەئادەمیزادانی سەردەم بونایە، ڕوبەڕوبوونەوەو ئیعتراض گرتن لەنێوانیاندا هێندە زۆرو بێ شومار دەبوون ڕەوڕەوەی پێشکەوتنو ژیاریان پەك دەخستو ژیان لەشوێنی خۆی دەوەستا. خۆ ئەگەر ئادەمیزاد بیر لەو حەقیقەتانە بکاتەوەو تێیان بفکرێ هەرگیز پەیوەندیی لەگەڵ خودادا نەدەپچڕاو پەیوەندییە سروشتی یە ئەزەلی یەکەی دەمایەوەو ساتە وەختێك لەخودا غافڵ نەدەبوو کەسی تریشی نەدەکردە هاوەڵی!

ئەمجار سیاقەکە هەندێ حەقیقەتی تری ئاشنا بەژیانی ئادەمیزاد رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَنْ يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ

رَحْمَتِهِ ؟﴾ ئایا ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە بەخودایان دەزانن هیچیان لەدەست نایە باشن؟ یان ئەو خودا گەورەو مەزنە باشە: کەڕێنمویی ئێوە دەکا لەتاریکایی شەودا، یان تاریکایی ناو دەریادا کاتێ ڕێگاتان لێ هەڵەبوو، ڕەهنومایتان دەکا بەهۆی ئەو بەلگەو نیشانە زەوی‌و ئاسمانییانەوە کە: لەبوونەوەردا ڕەخساندونی عەقڵ‌و هۆشی پێداون لەوشکانی‌و ناو دەریاو هەوادا ڕێگا دەبڕن‌و قۆناغو مەنزڵی خۆتان دەزانن، کاروانسەراو فڕۆکەخانەو بەندەرەکانی خۆتان لێ تێك ناچێ، هەرکاتێکیش ڕێگاتان لێ هەڵە بوو بەهۆی کێوو دۆڵ‌و ساراو ئەستێرەو دیاردەکانی تری سروشتەوە ڕێبازی خۆتان دەدۆزنەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَلامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ (النحل/١٦) یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾ (الانعام/٩٧)

هەروەها ئەوکەسەی (با) دەنێرێ وەکوو مزگێنی باران کە ڕەحمەتی خودایەو زەوی مردو زیندو دەکاتەوە.

﴿أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ ؟﴾ ئایا دەگونجێ خودایەکی تر هەبێ لەگەڵ خودای مەزن دا ئەم بوونەوەرەیان نەخشەکێش کردبێ؟! نەخەیر خودای مەزن بۆخۆی تەنیا ئەم بوونەوەرەی ڕەنگرێژ کردوەو بەدیهێناوە، کەس هاوەڵی نیەو هەر خۆی خودایەو هەر خۆی پەروەردگارە ﴿تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ خودای مەزن زۆر بەرزو پیرۆزترە لەوەی هاوەڵی هەبێ، ئەو خودا درۆزنانەی ئەو نەفامانە بەخودایان دەزانن، خودانین‌و شیاوی خودایەتی نین، ئەوانە بوختانیان پێ دەکەن!!

کۆتایی ئەم سەر کوتانەوەیە بەئاراستە کردنی پرسیار لێیان دەربارەی چۆنیەتی دروستکردن‌و مراندن‌و زیندو کردنەوەو رزق‌و ڕۆزیی پێدانیان تەحەددایان دەکا بتوانن بەلگەیەك لەسەر بیرو بۆ چوونی خۆیان بهێننەوە، دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَئِلَهٌ مَعَ اللَّهِ؟﴾

ئایا ئەو خودا درۆزن‌و بێ دەسەلاتانە باشن، یان ئەو خودا مەزن‌و خاوەن توانایەی کە: بەدەسەلاتی خودایەتی خۆی بوونەوەری بەدیهێناوە ئێوەی لەنەبوەوە دروست کردوە، بێ ئەوەی لەوەپێش نموونەتان هەبووبێ، ئێوەی بەوشێوە جوان‌و نایابە هێناوەتە گۆڕەپانی ژیانەوە، پاشان بوونەرو ئێوەش لەناو دەبا، سەر لەنوێ لەقیامەت دا زیندوتان دەکاتەوە! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ (البروج/١٣) یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ (الروم/٢٧).

ئەو خودایەی کە: رزق‌و رۆزیی ئێوە فەراهەم دەهێنێ بەوەی لەئاسمانەو باران دەبارێنێ‌و لەسەر زەوی دانەوێڵە وەبەرهەم دێنێ. ئایا دەگونجێ خودایەکی تر هەبێ یارمەتی خودای مەزنی دابێ بۆ ئەنجامدانی ئەوکارانە؟! عەقڵ وەری دەگرێ لەتەك خودادا خودایەکی تر هەبێ ئێوە بیکەنە هاوەڵ‌و شەریکی خودا لەبەدیهێنان‌و ئەنجامدانی کارەکانی!!

دروستکردن‌و بەدیهێنانی مەخلووقات حەقیقەتێکی بەرچاوو حاشا هەڵنەگرە، کەس ناتوانێ ئینکاری بکاو ناشگونجێ بەهیچ شتێك جگە لەتەعلیل بەبوونی خودا پاساوی بدەینەوە! چونکە وجودی بوونەوەر بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودا، هەر هەوڵ‌و تەقەلایەك بۆ هۆکاری بەدیهێنانی بوونەوەر بەبێ دانان بە هەبوونی خوداداو ئیعتراف بەبەدیهێنەریی خودا بۆ بوونەوەر خۆ خافلاندن‌و خۆگێل کردنە، چونکە دیاردەی مەخلوقاتی خودا ئادەمیزاد ناچار دەکەن دان بەتاك‌و تەنهایی خودادا بنێن.. بوونەوەر تێکڕا ئاماژە بەهەبوونی خودایەکی تاك‌و تەنها دەکاو دەڵێ نەخشەکێشی ئەم بوونەوەرە هەڵسوڕاندن‌و بەڕێوە بردنی لەلایەن خودایەکی بالادەستی تاك‌و تەنها ئەنجام دەدرێ! بەویستی خودایەك هاتۆتەدی‌و بەقانوون‌و یاسای خودایەك لەگەڕدایە.

زیندوبوونەوەی دوا مردن‌و هاتنی رۆژی قیامەت شتێکە کافرەکان لەکۆن‌و نوێ دا کردویانە بەکێشەو جیدال‌و بڕوای پێ ناکەن، وەڵێ دانان بەسەرەتای بەدیهێنان

بەوشێوەی ئایەتەکە ئاماژەی پێ دەکا. کەئەوپەڕی کاردروستی‌و دەست ڕەنگینی‌و نەخشە دانانی تێدایەو بەبێهودە نەهێنراوەتە دی، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ ئەوەی دان بەزیندو بوونەوەش دابنێن، بۆئەوەی ئادەمیزادەکان سزاو پاداشی کردەوەی دونیایان وەربگرنەوە چونکە لەدونیادا چاکەو خراپە پڕاوپڕ پاساویان نادرێتەوە بۆ نموونە زۆر تاوانبارو ملهوڕو ستەمکار هەن ناتواندرێ لەدونیادا سزایان پڕاو پڕ بدرێتەوە. ئەگەر تاوانبارێکی وەکوو هیتلەرو موسولونی یان ئەوانەی ستەم لەگەڵێکی چەوساوەی وەکوو کورد دەکەن بمانەوێ لەدونیادا سزای تاوانەکانیان بدەینەوە هەرچی لێیان بکرێ لەئازاردان‌و کوشتن‌و بڕین هێشتا بەشێکی کەمی تاوانەکانیان قەرەبوو کراوەتەوەو زۆری ماوە تۆڵەیان لێ بسەندرێتەوە. کەوابوو هەبوونی تەنسیق‌و پەیوەندیی نێوان کردارو پاداش؛ کردار لەدونیاو پاداش‌و سزا لەقیامەتدا داخوازی ئەوەیە دوارۆژێك هەبێ بەتەواوی هەموو کەس پاداش‌و سزای خۆیانی تێدا وەربگرنەوە، دەی بۆچی لەدونیاو لەم سەر زەوییەدا ئەو تەنسیقە ڕەهایە لەنێوان کردەوەو سزاو پاداش بەدی نەهێنراوە؟ وەڵامی ئەوە لای پەروەردگارەو ئێمە هیچی لێ نازانین، بەڵکوو هەر ڕەوانیە ئەو جۆرە پرسیارانە ئاراستە بکرێن، چونکە خودای بەدیهێنەر هەر بۆ خۆی دەزانێ مەخلووقاتی خۆی چۆن دروست کردون، نهێنی دروستکراوانی لای خۆیەتی‌و کەسی تری بەسەردا ئاگادار نەکردوە.

ئاماژە کردن بۆ فەراهەم هێنانی ڕزق‌و ڕۆزیی بۆ ئادەمیزاد لەئاسمان‌و زەوی پاش ئاماژە کردن بۆ بەدیهێنانی سەرەتاو زیندو بوونەوەی سەر لەنوێ ی دوای مردن پەیوەندییەکی پتەوو تۆکمەیان بەیەکەوە هەیە، پەیوەندیی ڕزق‌و ڕۆزیی زەوی بەسەرەتای دروست کردن‌و بەدیهێنانی ئادەمیزاد ئاشکراو نمایانە، ئادەمیزاد کەدێتە کۆڕی ژیانەوە بەو ڕزق‌و ڕۆزییەی سەر زەوی دەژی، پەیوەندی ئەو ڕزق‌و ڕۆزییەی بەزیندوو بوونەوەی قیامەت لەم ڕووەوەیە کە: ئادەمیزاد لەقیامەت دا سزاو پاداش وەردەگرنەوە لەسەر هەڵس‌و کەوتیان لەبەرامبەر ئەو ڕزق‌و ڕۆزییەی

لـەدونيادا پێيـان بەخـشراوە، پەيوەنـديى رزق‌و رۆزى بەسـەرەتاى دروسـتبونەوە (واتە: هۆكارەكانى رزق‌و رۆزى كە: بريتييە لەتيشكى خۆرو روناكى مانگ‌و باران‌و هێـزو وزەكـانى تـر كـە: خـودا بـەدى هێنـاون بـۆ فەراهـەم هێنـانى بـژيو) ئاشكراو نمايانە لەدونيادا بۆ درێژەدان بەژيانەو لەقيامەت دا بۆ پاداش‌و سزادانەوەيە.

سەرەتا دروستكردن‌و پاش مردن سەرلەنوێ زيندوبوونەوە حەقيقەت‌و راستە، رزق‌و رۆزيى ئاسمان‌و زەوى حەقيقەت‌و راستە وەلێ ئادەميزاد لێ ى غافڵ‌و لەئاست ئەم حەقيقەتانەدا چاوى خۆيان نوقاندوەو گوێى خۆيان هاخنيوە.

ئەى مەحەممەد! لێيان بپرسە ئايا دەگونجێ لەگەڵ خوداى زاناو داناو بـەتواناو كـار دروسـت خودايـەكى تـر هـەبێ؟ دەتەحـەدايان بكـەو بەمەبەسـتى بـۆڕدان‌و دەسەوەسـانكردن ﴿قُـلْ هَـاتُوا بُرْهَـانَكُمْ إِنْ كُنـتُمْ صَـادِقِينَ﴾ ئـەى پێغەمبـەرى خۆشەويست! پێيان بڵێ: بەڵگە لەسەر بيرو بۆچوونى خۆتان بهێننـەوە نيشانەيەك بخەنـەڕو پـشتگيريى راسـتى بـيرو باوەڕەكـەتان بكـا، هـاوەڵ دانـان بـۆ خـوداو بتپەرستيتان بچەسپێنێ، دەكوا ئەگەر راست دەكەن لەگەڵ خۆتان‌و غەيرى خۆتـان بەڵگـە بخەنـەڕو!! لەراسـتى دا هـيچ بەڵگـەتان بەدەسـتەوە نيـە، دەليلێكتـان نيـە عاقڵانە بێ‌و لێتان وەرگيرێ، هەرچى دەيڵێن: بێهودەو بۆش‌و بـێ بناغەيـەو هيـچى بەسەر هيچەوە نيە!

وەكوو لەئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لَا بُرْهَـانَ لَـهُ بِـهِ فَإِنَّمَـا حِـسَابُهُ عِنـدَ رَبِّـهِ إِنَّـهُ لَـا يُفْلِـحُ الْكَـافِرُونَ﴾ (المؤمنـون/١١٧).

## هەر خودا غەیبزانەو کەسی تر بەسەر نهێنی ئاسمانەکان‌و زەوی‌دا ئاگاداریی نیە

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَاۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ ﴾

دوای ئەوەی جەولەیەکی بەناو بوونەوەرو خودی ئادەمیزادەکان دا کردو تاک‌و تەنهایی خودای مەزنی چەسپاندو لەهاوەڵ‌و هاوشان بەرزو پیرۆزو بەدووری گرت.

ئەمجار جەولەیەکی تریان لەگەڵ دەست پێ دەکاو دەربارەی غەیبی شێردراوە کە: هەر خودا دەیزانێ‌و کەسی تر پەی پێ نابا، سەرنجیان رادەکێشێ‌و ئەوە رادەگەیەنێ کە: زانیاری نهێنی تایبەتە بەخوداوە، هەروەها زانیاری دەربارەی کاتی هاتنی قیامەتیش جۆرێکە لەنهێنی‌و هەر خودا دەزانێ کەی رادەبێ‌و چۆن رادەبێ!

دەفەرموێ: ﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالآرْضِ الْغَيْبَ إِلاّ اللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر بەهەموو خەڵك رابگەیەنەو تێیان بگەیەنە کە: هیچ کەسێك لەئاسمانەکان‌و زەوی دا جگە لەخودا غەیب نازانێ، زانیاری غەیب تایبەتە بەخوداوەو کەسی تر هیچی لێ نازانێ مەگەر خودا بۆخۆی هەندێك لەبەندەکانی بەسەر هەندێ لەو نهێنی یەدا ئاگادار بکا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاّ هُوَ﴾ (الانعام) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الآرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان/٣٤) تەنانەت رێزدارترین‌و خۆشەویسترین بەندە لەلای خودا کە حەزرەتی موحەممەدە ﷺ ئەویش هیچی لەو

زانیارییە نەزانیوە جگە لەوەی کەخودا بەسەر هەندێ لەو غەیبیاتەدا ئاگاداری کردوە.

موسلیمو ئەبوحاتەم لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن؛ کە فەرمویەتی: هەرکەسێ پێی وابێ پێغەمبەر ﷺ دەیزانی لەرۆژی داهاتوودا چی رودەداو نهێنی زانیوە بێگومان بوختانی لەسەر خودا هەڵبەستووە!؛ چونکە خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالآرْضِ الْغَيْبَ إِلآ اللَّهُ﴾ جا کە نەفی زانیاری غەیبی (جگە لەخودا) لەهەموو کەس کرد بەگشتی.

ئەمجار زانیاری غەیبی تایبەتیشیان لێ دادەرنێ کەتایبەتە بەزانیاری دەربارەی قیامەت، دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ ئەهلی ئاسمانەکانو زەوی نازانن کەی قیامەت رادەبێو مردو زیندو دەکرێنەوە، ئادەمیزاد بەگشتی لەهەموو سەردەمو چینو توێژەکانی دا بەدرێژایی مێژوو بەرامبەر قەضییەی قیامەتو زیندوبوونەوە هەڵوێستێکی سەیرو سەرسوڕهێنەریان نواندوە، وێڕای ئەوەی کە هاتنی قیامەتو هەبوونی رۆژی جەزاو پاداش شتێکی ئاسایی‌و پێویستە، کەچی ئادەمیزادەکان زوربەیان بەدرێژایی مێژوو ئینکاری هاتنی ئەو رۆژەیان کردوە، هەر پێغەمبەرێك کەهەواڵی زیندوبوونەوەی دوا مردنی بەگەلەکەی داوە خێرا بەدرۆیان خستۆتەوەو گاڵتەیان پێ کردوە.

قیامەت بۆ خۆی نهێنی یەکە لەو نهێنی یانەی جگە لەخودا کەسی تر نازانێ کەی رادەبێ، هەر پێغەمبەرێك رەوانە کرابێ بۆسەر نەتەوەیەك یەکسەر داوایان لەپێغەمبەرەکەیان کردوە کاتی رابوونی قیامەتیان بۆ دیاریی بکا، جا کە پێغەمبەرەکە نەیتوانیوە ئەمجار بەدرۆیان خستۆتەوە، ئەمە دابو نەریتێك بووە بەدرێژایی مێژوو باو بووە. لێرەش قورئان ئەو حەقیقەتەی دووبارە کردوەو رایگەیاند کە: زانیاریی نهێنی تایبەتە بەخوداوە کەسی تر غەیب زان نیە، زانیاری ئادەمیزاد دەربارەی کاتی هاتنی رۆژی قیامەتو چۆنیەتەکەی مەحدودەو هەرئەوەندەی لێ دەزانن: کە دێو لەداهاتوودا رادەبێ!!

بێگومـان ئـادەمیزاد هـەر لەبەرەبـەیانی مێـژووەوە لەبەرامبـەر غـەیبدا دەسەوەسـانو کۆڵـەوار بـووە، نـەیتوانیوە هیـچی لـێ دەسـتەبەر بکـاو هـیچ لـەدوا پەردەی غەیبەوە نازانێ، مەگەر ئەو هەنـدە نهێنـی یـەی کـە: خـودای زانـاو ئاگـادار فێـری هەنـدێك لـە بەنـدەکانی کـردوە، هەڵبەتـە ئـەم غـەیب زانینـە بـۆ ئـادەمیزاد پێویـست نـەبوەو خێـرو بێـری لەوەدایـە: کەئـەو جـۆرە زانیارییـەی نیـە، ئەگـەر زانینەکەی لەبەرژەوەندیی ئادەمیزاد بوایـەو خێـرو بێـری تێدا بوایـە، پـەروەردگار دەرگای غەیبی والآدەکـرد بـۆ ئـادەمیزادی تینـوو بـۆ ئاگـادار بـوون بەسـەر جیهـانی نهێنی دا!

بێگومـان پـەروەردگار ئەوەنـدەی هێـزو توانـاو وزەی جـۆراو جـۆر بەئادەمیزاد بەخشیوە کە: بتوانێ جێنشینی خۆی لەسـەر زەوی دا پـێ ئـەنجام بـداو ئەرکـەکانی سەرشانی جێ بەجێ بکا، لادانی پەردەی غەیب لەبەر دەمیا نابێتە یارمەتیـدەر بـۆ ئەنجامدانی ئەرکی خەلافەتی سەر زەوی، بەڵکوو شاردنەوەی غـەیب هەڵیـدەنێ بـۆ لێکۆڵینەوەو هەوڵدان بەدوا زانیاری دا لەناو زگی زەمـین دا لـەناو قـوڵایی دەریاکـان داو لەئاسـۆو ئـەقطارەکـانی فـەضادا، شـارەزای یاسـای بوونـەوەرو هێـزو وزە تێـدا حەشـاردراوەکانی دەبـێ پێداویـستی خـۆی بـۆ ژیـانو ئاوەدانکردنـەوەی زەوی لێ دەستەبەر دەکا! ئەرکی جێنشینی خۆی لەسەر زەوی ئەنجام دەدا.

پەردەی غەیب هەر بەسەر ئادەمیزاددا دانەدراوەتـەوە، بـەڵکوو بەسـەر ئـەهلی ئاسمانـەکانو زەویدا دادراوەتـەوە بەفریـشتەو جنـدۆکەشـەوە، جگـە لـەخودا خـۆی کەس غەیب زان نیەو بەسەر نهێنی دا ئاگادار نیە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً﴾ (الاعراف/١٨٧)

واتـە: زانیـاریی دەربـارەی رابـوونی قیامـەت کـارێکی قـورسو گرانـەو ئـەهلی ئاسمانـەکانو زەوی پـەی پـێ نابـەنو جگـە لـەخودا کـەس نـازانێ کـەی قیامـەت

هەڵدەستێو کاتی حیسابو لێکۆڵینەوە دێ، کوتوپڕو ناگەهان پەیدا دەبێو کەس ناتوانێ کاتەکەی تەحدید بکا.

﴿بَلْ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الآخِرَةِ﴾ بەڵکوو لەئاست زانینی کاتی هاتنی قیامەت زانیاری ئادەمیزاد بەکۆتا گەیشتووەو لەوبارەوە بڕستیان لێ بڕاوەو دەستەوستان کەوتوون. واتە ئەو زانیاریانەی هەیانبوو دەربارەی سەلماندنی قیامەت زنجیرە دوا زنجیرە هەڵوەشایەوەو هیچیان بەدەستەوە نەما!

﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِنْهَا﴾ بەڵکوو کافرەکان لەحاڵەتی حەیرانیو سەراسیمەیی دان شكو گومانیان هەیە دەربارەی هاتنی قیامەت!

﴿بَلْ هُمْ مِنْهَا عَمِينَ﴾ بەڵکوو ئەوانە لەکوێریو نەفامیو بێ ئاگایی دان دەربارەی قیامەتو رووداوەکانی، ئەوان نایەن ژیرانە بیر بکەنەوە، هێزو توانای خۆیان بخەنەگەڕو لەناخەوە هەوڵ بدەن بەڵگەکانی سەلماندنی هاتنی قیامەتو چەسپاندنی دەستەبەر بکەن، هەر شتێك ئەو حەقیقەتەیان بۆ رون بکاتەوە، هەر بەڵگەیەك ئەو راستی یەیان لەلابچەسپێنێ خۆیانی لێ گێل دەکەنو گوێچکەی خۆیانی لێ دەهاخنن!

## موشریکەکان ئینکاری زیندو بوونەوە دەکەن

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُن

فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار نەفامی موشریکەکانی دەربارەی قیامەت رون کردەوە، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی بیرو بۆچونیان دەربارەی قیامەتو ئینکاریکردنیان بۆ ئەو روداوە گرنگە دەکا، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَئِذَا كُنَّا تُرَاباً وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ؟﴾ موشریكو ئینكاریكەرانی زیندو بوونەوە؛ ئەوانەی بڕوایان بەهەبوونی خودای تاكو تەنهاو زاناو داناو بەتوانا نیە، پێغەمبەرەكانی بەدرۆ دەخەنەوەو دەڵێن: ئایا ئەگەر ئێمە گیانمان دەرچوو ئەندامو جەستەمان ڕزیو پۆلكا، بووینەوە بەخۆڵو جەستەمان پەرتو بڵاوبۆوە، ئەمەش حاڵەتێكە بەدەگمەن نەبێ بەسەر هەموو مردوێك دا دێ، هەموو كەس جگە لەحاڵەتی شازو دەگمەن دوای مردنی بەماوەیەك جەستەی دەڕزێ، دەی ئەگەر ئەو ڕزینو پولكانەیان بەسەردا هات؛ ئایا دەگونجێ جارێكی تر ئێمەو باوكو باپیرانمان گیانیان بەبەردا بكرێتەوە؟! ڕێی تێدەچێ جەستەی پولكاوو بەخۆڵ بوومان جارێكی تر ڕێك بخرێتەوەو گیانی تێ بچێتەوە؟

ئەم قەسەیە دەکەن و ئەو حاڵەتە مادییەیان کردۆتە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم تەصەورو تێڕوانینیان بۆ ژیانی دوارۆژ، ئەوەیان لەبیر چۆتەوە کە: ئەوان لەسەرەتادا لەنەبوەوە دروست کراون، هیچ کام لەئەوانە نازانن خانەکانی لەشیان و گەردیلەکانی پێکهاتەی جەستەیان لەچی دروست بووە، بێگومان گەردیلەو خانەکانی جەستەیان لەپێش دا پرژو بڵاو بووە، لەناو چین و توێژەکانی زەوی دا، لەناو دەریاو لەناو بۆشایی بەرفراوان دا، هەر پارچەیەکی لەشوێنێك بووەو وردە وردە کۆبوونەوەو ئەم پەیکەرە ئادەمیزادییەیان لێ پێك هاتووە، هەندێکی لەگڵ و خۆڵەوە، برێکی لەپێکهاتەی هەواو ئاوەوە، پچێکی لەوزەی خۆرو نووری مانگ و هەناسەی ئادەمیزادو گیانلەبەران و نەفەسی درەخت و ڕوەك بەشێکی لەو تەپ و تۆزەی پەیدا بووە لەگیانلەبەری رزیوو دارو درەختی پوڵکاوەوە پەیدا بوون، ئەم شتانە؛ ئەم خانەو گەردیلانە تێکەڵ بەخواردن و خواردنەوەیان بون و لەگەڵ هەوادا هەڵیان مژیون و وزەیەك بوون خۆیان بێ گەرم کردۆتەوە تابەم جۆرە ئەم هەموو گەردیلەو خانانە: کەهەر خودا ژمارەیان دەزانێ و هەر خودا سەرچاوەکانیان لێك جیا دەکاتەوە، کۆبونەوەو یەکیان گرتوەو لەپەیکەری ئادەمیزادێك دا خۆیان نواندوە، ئەم جەستەو لەش و لارە، سەرەتا لەهێلکە تۆماوێکەوە کەدوای بەیەکگەییشتنی نێرو مێ بەدیواری منداڵدانەوە دەنووسێ و وردە وردە گەش و نما دەکاو دێتە ناوکۆڕی ژیانەوەو دوایی پەرە بەژیان دەدا تا کۆتایی ژیانی دێ و دەخرێتە ناو گۆڕەوە؛؛ ئەوانە بەوشێوە دروست بوون و ئاواجەستەیان لێکدراوەو پەیکەریان پێك هاتووە، دەی بۆ دەبێ بەلایانەوە جێگای سەر سوڕمان بێ، ئەگەر جارێکی تر بەو شێوە یان بەشێوەیەکی تر دروست بکرێنەوە؟!

بەڵام بەدرێژایی مێژوو ئەوە هەڵوێستی موشریك و بەدرۆ خەرەوەکان بووەو ڕێگایان بەخۆیان نەداوە بڕوا بەهاتنی ڕۆژی قیامەت بکەن و زیندوبوونەوەیان لەلا بچەسپێ. هەر پێغەمبەرێك هاتبێ و بانگەوازی کردبێ بۆ ئیمانهێنان بەخوداو بەڕاستی پێغەمبەرایەتی و راستی زیندوبوونەوە بەو بیانوە لاوازە بەرپەرچیان

داوەتەوەو، هەر رۆژە بەجۆرێك‌و هەر دەمە بەشێوازێك پەیامی پێغەمبەرەکەیان ڕەتکردۆتەوە، کافرە قورەیشیەکانیش هەمان هەڵوێستیان نواندوەوهەمان بڕو بیانوویان دۆزیونەوە، ئەمجار سوور بوونی خۆیان لەسەر ئەو هەڵوێستە نادروستە بەچەند بەڵگەیەکی بێ هێزو لاواز پاساو داوەتەوەو بەشێوەی لافرتێ‌و بە تەوسەوە دەیانگوت: ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا هَذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ﴾ بێگومان بەدرێژایی مێژوو ئێمەو باوك‌و باپیرانمان ئەو جۆرە قسەو باسەمان بیستوەو دەیبیسین، هەر قسەیەو ناوەڕۆکی نیە، ئیسمی بێ موسەممایە، چ حەقیقەتێکی واقیعی نیە.

کەس دوای مردن زیندو نەبۆتەوە ﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ ئەم قسەو وادەو بەڵێنانە دەربارەی زیندوبوونەوە جگە لەئەفسانەو خەرافات‌و تورەهات زیاتر هیچی تر نیە، چیرۆکە کۆن‌و قسەی پڕو پووچە، چین لەدوای چین ئادەمیزاد لێکتریان وەرگرتووەو بەلگەیەکی مەعقوول پشتگیریی ناکا.

بێگومان موشریکەکانی مەککە دەیانزانی کە لەوەپێش پەروەردگار پێغەمبەری ڕەوانە کردون بۆسەر گەل‌و نەتەوەکان، دڵنیا بوون لەوەی کەباوك‌و باپیرانیان بەزیندو بوونەوەو حیساب‌و لێکۆڵینەوەی قیامەت ترسێندراون، کەوابوو نابێ بگوترێ: عەرەبەکان بێ ئاگاو زەینخاڵی بوون‌و دەربارەی تاك‌و تەنهایی خوداو ناردنی پێغەمبەران‌و هاتنی قیامەت‌و زیندو بوونەوە هیچ زانیارییەکیان نەبوە، بەڵکوو ئەوان دەیان بینی لەمێژەوە ئەم هەڕەشەو وادەو بەڵێنە دراون‌و هیچیشیان نەهاتوونە دی. ئیتر لەسەر ئەوە گاڵتەیان بەهاتنی قیامەت دەهات‌و هەموو باسێکیان دەربارەی قیامەت بەچیرۆکە کۆن‌و ئەفسانە دەزانی‌و دەیانگوت: (محمد) یش هەمان ئەفسانە کۆنەکان دووبارە دەکاتەوە، بێ ئاگا بوون لەوەی قیامەت کاتی خۆی هەیەو پاش‌و پێش ناکا، نەبەعەجەلە کردنی ئەوان پێش دەکەوێ نەبەحەزو ئارەزۆی ئەوان دوا دەکەوێ، لەکاتی دیاریکراوی خۆی دا ڕادەبێ‌و هەڵدەستێ. جگە لەخودا کەسی تر کاتی هەڵسانی قیامەت نازانێ‌و نهێنی یە لێیان. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ کەدەربارەی کاتی ڕابوونی قیامەت پرسیاری لێ کرا فەرمووی: (ما

المسؤول عنها بأعلم من السائل) پرسیارلێکراو لەبارەی دیاریکردنی هاتنی قیامەت لەپرسیارکەر ئاگادارتر نیە واتە: هیچی لێ نازانم.

ئیتر لێرەوە سەرنجیان رادەکێشێ بۆ بەسەرهاتو لەناو چوونیو ئەو تاوانبارو سەر رەقانەی گەلە پێشینەکان: کە پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆخستوونەوە چییان بەسەر هات، بەمەش ئاماژە بەوە دەکا: کەئەوەی بەسەر موجریمو کافرەکانی پێشوو هات دوور نیە بەسەر موجریمەکانی دوایش بێ، چونکە سونەنو دابو نەریتی خودا گۆڕانی تێدا نیە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بەو موشریكو خودا نەناسانە بلێ: بەناو خاکی حیجازو شامو یەمەنو شوێنی تریش دا بگەڕێن، سەرنج لەئاکامو بەسەرهاتی کافرەکانی پێشووتان بدەن، بزانن سەرەنجامی ئەوانەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستوونەوە چی بوو؟ ئەوانیش وەکوو ئەوان بەژیانی دونیاییان لەخۆیان بایی بوون، بەنازو نیعمەتەکانی هەڵخەڵەتان، پێغەمبەرانیان بەدرۆخستەوە، ئینکاری هاتنی قیامەتو زیندو بوونەوەی دوا مردنیان کرد، خودا بەهۆی تاوانەکانیان بەهیلاکی بردن، زەویو زارو مڵكو ماڵو شوێنەواریان لەپاش بەجێ ما، پاشماوەو کەلاوە کۆنەکانیان نیشانەو پەندو عیبرەتن بۆ ئادەمیزادانی دواخۆیان، لەهەمان کاتدا کە: ئەوانەی لەناو برد، پێغەمبەرو شوێنکەوتوانیانی رزگار کردن، عەزابی ڕیشەکێش نەیگرتنەوە، ئەمەش نیشانەی راستی ئەو وادەو بەڵێنانەیە؛ کە پەروەردگار لەسەر زمانی پێغەمبەران بەئادەمیزانی راگەیاندوە، بەڵگەیە لەسەر راستی ئیمان بەخوداو بەزیندوبوونەوەو هەبوونی حیسابو لێکۆڵینەوە، ئەوە دابو نەرێتی خودایە لەبوونەوەردا، هەرکەسێ پێغەمبەرانی بەدرۆ بخاتەوە، تۆڵەی لێ دەستێنێ، کەوابێ بۆ قوڕەیشییەکانو غەیری ئەوانیش هەمان تاسو حەمامە.

ئەمجار تەسەللای پێغەمبەر ﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُنْ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەتۆ دڵتەنگو خەفەتبار مەبە بەوەی ئەو موشریکە قوڕەیشییانە ڕولەبانگەوازییەکەت وەردەگێڕنو پەیامەکەت بەدرۆ دەخەنەوە، پیلانت لێ دەگێڕنو هەوڵی تیرۆر کردنت دەدەن، گوێیان پێ مەدەو بەهەندیان مەگرە، چونکە خودا پارێزەرو یارمەتیدەرتە، لەپلانو دەستی ئەوان دەتپارێزێو ئایینەکەت بڵاو دەکاتەوە بەسەر ناحەزانت دا زاڵت دەکا.

ئەمجار پەروەردگار باسی ئینکاریکردنێکی تریان دەکاو هەڵوێستێکی تری نادروستیان دەخاتەڕوو دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەو موشریکانەی مەککەو هی تریش لەبارەی قیامەتو بەدوور زانینیان بۆ هاتنی، بەشێوەی گاڵتەو لاقرتێوە دەڵێن: ئەوە ئەو عەزابەی هەڕەشەمان پێ لێ دەکەن ئەگەر راست دەکەنو راستگۆن، کەیەو کەی دێ.؟ بۆ نەهات؟ ئەوە لەمێژە ئەم هەڕەشەیەمان لێ دەکرێ بەڕۆژی قیامەتو عەزابی سەختی دەمانترسێنن!

پەروەردگار وڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ عَسَى أَنْ يَكُونَ رَدِفَ لَكُمْ بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: نزیکەو لەوانەیە بڕێ لەو عەزابەی ئێوە پەلەتان لێیەتی بەشوێنتانەوە بێو لێتان نزیک بووبێتەوەو هاکا یەخەی گرتن. بەم شێوە قورئانی پیرۆز ترسو قەلەق دەخاتە ناو دڵی موشریکەکانەوە، دیمەنی وایان نیشان دەدا تارمایی عەزابی تێدا ببینن.

(ردیف) بەوکەسە دەڵێن: کەلەدوا سوارەوە سوار بووبێ، واتە: دوو کەس سواری وڵاغێك بن بەوی دوایان دەگوترێ: ﴿رەدیف﴾ پاشکۆ.

کەوابێ ئەو عەزابەی ئەوان پەلەیان لێیەتی، لەوانەیە زۆریان لێ نزیك بووبێتەوە، ئەوان بەخۆیان نەزانیوە، ئاگایان لێ نیە، کێ دەزانێ لەژێر پەردەی غەیبەوە چییان بۆ ئامادە کراوەو چییان بەسەردێ!! چ عەزابێك لەدوا پەردەی نهێنی یەوە چاوەڕوانیانەو لەنکاوێك بینە قاقایان دەگرێ!!

زومەخشەری دەفەرموێ: (عسی، لعل، سوف) لەوادەو هەڕەشەی پاشایانو خاوەن دەسەڵاتان دا نیشانەی راستیو گرنگی ئەمرەکەیەو ئاماژەیە بۆ ئەوە: کەئەو شتە گومان لەڕاستیو رودانی دا نیە، مەبەستیشیان بەو جۆرە تەعبیرانە دەرخستنی بارقوڵیو شکۆمەندیی خۆیانەو ئاماژەیە بۆ ئەوە: کە لەتۆڵە ستاندنو عەزابدان بەپەلە نینو دڵنیان لەوەی؛ کەدوژمنیان لەچنگیان دەرناچیٚو بتمانەیان بەهێزو توانای خۆیان هەیە، هەر لەم روانگەوەیە: کەهەندێ جار وادەو هەڕەشەی پەروەردگاریش بەم جۆرە تەعبیرانە دەردەبڕدرێن[1].

ئەمجار پەروەردگار هۆی دواخستنی عەزابی خۆی بۆ ئادەمیزاد رادەگەیەنیٚو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَشْكُرُونَ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! خاوەنی فەضلو بەخششە بەسەر هەموو ئادەمیزاددا بەموسوڵمانو کافریانەوە، بەچاکو خراپو تاوانبارو بێ تاوانیانەوە، نازو نیعمەتی خۆی دەڕێژێ بەسەریان دا هەرچەندە خۆیان ستەم لەخۆیان دەکەنو شوکرو سوپاسی خودای خاوەن نیعمەت ناکەن!

پەلە لەعەزابو تۆڵە لێ ستاندنەوەیان ناکا لەپاساوی کوفرو تاوانبارییان دا، وەلێ لەگەڵ ئەوەش دا زۆربەی ئەو ئادەمیزادانە شوکرو سوپاسی خودا ناکەنو سپڵەو پێ نەزانن و چاکەو نیعمەتی خودایان لەبەرچاو نیە.

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ بێگومان خودای تۆ زاناو ئاگادارە بەو نهێنی یانەی وا لەدەروونی ئادەمیزادان دایە، هەر وەکوو چۆن ئاگاداری شتە ئاشکراکانیانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَوَاء مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ﴾ (الرعد/١٠) یان دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ (طه/٧) لێرەدا مەبەست ئەوەیە: خودا زاناو ئاگادارە بەو قینو خەشمەی موشریکەکان لەدڵی خۆیان دا دژی پێغەمبەر حەشاریان داوە، ئاگاداری ئەو پیلانو فرتو

[1] تەفسیری کەششاف ج ٢/٤٦٠ .

فێلانەیە کە: لەدژی فروستادەکەی ئەنجامی دەدەن و لەکاتی خۆی دا تۆڵەیان لێ دەستێنێ و سزایان دەدا! ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە کە: هەرچی زانیاری بوونەوەر هەیە لە لەوحولمەحفوظ دا تۆمار کراوە. دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾ هیچ شتێکی نهێنی و پەنامەکی نیە لەبوونەوەردا، لەئاسمانەکان و زەوی دا، ئیللا زانیاری دەربارەی لە لەوحولمەحفوظ دا تۆمار کراوە، هەرچی بووەو هەرچی دەبێ لەڕابوردوو داهاتوودا، خودای مەزن دەیزانێ و زانیاریی تەواوی دەربارەی هەیە، ئاشکراو نهێنی وەکوو یەك دەزانێ، زاناو ئاگاداری نهێنی ناو ئاسمانەکان و زەوییە.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ (الحج/٧٠).

یان لەشوێنێکی تردا لەسەر زمانی حەزرەتی لوقمان دەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ (لقمان/١٦)

بەڕاستی ئەم ئایەتانە تێکڕا بیرو هۆش دەخەنەگەڕ، خەیاڵ دەخەنە مەلەو هەوا پەروازیی و سەرنجی ئادەمیزاد بۆئەوە کێش دەکەن: کەهەموو نهێنی یەك، هەموو پەنامەکی و هەواڵ و سەرگورشتەیەك لەهەموو کون و قوژبنی بوونەوەردا کۆنترۆڵکراویی زانیاریی خودای مەزن و باڵا دەستن. هیچ شتێك نیە بتوانێ لەژێر کۆنترۆڵی زانیاریی خودا دەربچێ!

## قورئانی پیرۆز بەڵگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ﴾

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار باسی مەبدەئو مەعادی کرد، بەڵگەی جۆراو جۆری عەقڵیو حیسسی لەسەر زیندو بوونەوەی دوامردنو هاتنی ڕۆژی قیامەت هێنایەوە، ئەمجار لێرەدا بەڵگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەهێنێتەوە، گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەوە قورئانی پیرۆزە: کە لەفظو مانای موعجیزەن، جا: کە قورئان موعجیزە بێ، بێگومان موعجیزەشە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ .

بێگومان ئەوکتێبەی بەڵگەی جۆراو جۆری تێدان لەسەر صیفاتی کەمالو جەلال بۆ خودای مەزنو شکۆمەند، هەروەها چەسپاندنی هاتنی ڕۆژی قیامەتو

زیندوبوونــەوەو حیــسابو لێکۆڵینــەوە، ســزادانی تاوانبــارانو پاداشــدانەوەی چاکەکاران. هەڵبەتە بڕوا بەخودای تاكو تەنهاو سەلماندنی صیفاتەکانی، هەروەها سەلماندنی ڕۆژی قیامەت دوو بنەمای سەرەکی ئایینی پیرۆزنو قورئان لەخۆی گرتوون.

جا هەر بەبۆنەی باسکردن دەربارەی زانیاری ڕەهای خوداو ئاگاداریی بەسەر هەموو شتێك دا، باسی ئەو زانیاریانە دەکا کە: قورئان لەخۆی گرتوونو یەکالاکردنەوەی ئەو کێشەو نیزاعانەی نەتەوەی ئیسرائیلن، چونکە یەکالا کردنەوەی ئەو کێشەو نیزاعانەش بەشێکە لەزانیاریی خوداو نموونەیەکی فەضلو گەورەیی پەروەردگارە، بەشێکە لەقەضاو یەکالا کردنەوەی زاتی بەرزیی لەنێوان کێشەکاران دا، بەمەش تەسەللای پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە بۆئەوەی وازیان لێ بێنێ بۆ خودا، ئەو دادگاییان بکاو تۆڵەی تاوانیان لێ بستێنێ!

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان ئەم قورئانە پیرۆزە هەواڵ دەدا بەنەتەوەی ئیسرائیل کەهەڵگری تەوراتو ئینجیلن بەحەقیقەتو ڕاستی زۆرشت لەوانەی تێیدا کەوتوونە کێشەو نیزاعەوە، حەقیقەتیان بۆ ڕون دەکاتەوە، وەکوو ئەو دووبەرەکیو نیزاعەی هەیانە دەربارەی حەزرەتی عیساو دایکی؛ جولەکە بوختانیان بۆ دەکەنو مەریەم بەداوێن پیسو عیسا بە بەبیژو لەقەڵەم دەدەن. مەسیحی هێندەیان بەرز دەکەنەوە دەیانگەیەننە پلەو پایەی خودایەتیو بەخودایان دەزانن!!

ئیتر قورئان هات، حەقیقەتی ڕون کردەوەو قسەی حەقی بەیان کردو ڕایگەیاند: کە عیسا عليه السلام بەندەیەکی پەروەردگارەو پلەی پێغەمبەرێتی پێ بەخشراوە.

تەنانەت مەسیحیەکان خۆشیان ڕاجیاییو کێشەیەکی قوڵیان هەیە دەربارەی حەزرەتی عیساو خاتوو مەریەمی دایکی.

هەندێکیان دەڵێن: مەسیح ئادەمیزادەو بەس! هەندێکی تریان دەبێژن (باوکو کوڕو روح القدس) چەند نموونەیەکی جیاجیان خودا خۆی تێدا رانواندن بۆ خەڵك، بەڕاوو بۆچوونی ئەم کۆمەڵە، خودا لەسێ ئوقنوم پێکهاتووە (باوك، کوڕ، روحولقودس) مەبەستیان بەکوڕ حەزرەتی عیسایە ﷺ دەڵێن: خودا (کە باوکە) لەوێنەی روحولقودس دا دابەزیوە لەخاتو مەریەم دا چۆتە دیمەنی ئادەمیزادەوە منداڵێکی لێ کەوتۆتەوە لەشێوەی یەسوع دا!!

کۆمەڵێکی تریان دەڵێن: (کوڕ) واتە عیسا ﷺ وەکوو باوکی (واتە خودا) ئەزەلی نیە، بەڵکوو لەپێش دروستبونی عالەم دا دروست کراوە، بۆیە پلەی عیسا ﷺ لەخوار پلەی خوداوەیەو گەردنکەچە بۆ خودا! بڕێکی تریان ئینکاری ئەوە دەکەن: کەروحولقودوس ئوقنوم بێ! کۆڕی (نیقیە) ساڵی ٣٢٥ز و کۆڕی قوستەنطینیەی مەسیحیەکان ساڵی ٣٨١ ز بڕیاری ئەوەیان دا کە: کوڕو روحولقودس لەگەڵ باوك دا یەکسانن لەیەکیەتی لاهووتی داو هەر لەئەزەل دا کوڕ واتە: (عیسا) لەباوك واتە: (خودا) بەوەلەد بووە.

کۆڕی (طليعة) یان ساڵی ٥٨٩ی ز بڕیاری ئەوەی دا کە: (روحولقودوس)یش لەکوڕ واتە: لەعیساوە ﷺ پەیدا بووە، ئیتر لێرەوە، کەنیسەی خۆرهەڵاتو کەنیسەی خۆرئاوا کێشەیان تێکەوتو لەم خاڵەدا نەگەیشتنە ئامانجو کێشەیان درێژەی کێشا. ئیتر قورئانی پیرۆز هات لەم بارەوە قسەی حەقو یەکالاکەرەوەی راگەیاندو حەقیقەتی رون کردەوە: دەربارەی عیسا ﷺ دەفەرموێ: عیسا ﷺ فەرمانی پەروەردگارە ئاراستەی خاتوو مەریەم کراو گیانێکە لەخوداوەیەو ئادەمیزادە. هەروەها مەسیحی کەوتوونە ئیختیلافو کێشەوە دەربارەی ئیعدامکردنو هەڵواسینی عیسا ﷺ هەندێکیان پێیان وایە: عیسا ﷺ بەزیندویی لەدار دراو بەهەڵواسراوی گیانی دەرچووە، دوایی بەخاك سپێردراوە، پاش سێ رۆژ لەگۆڕ راست بۆتەوەو بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمان. هەندێك دەڵێن: یەهوذا (کە یەکێکە لەحەوارییەکانی) خیانەتی لەعیسا ﷺ کردو کافرەکانی شارەزا کرد بۆ

ئەوشوێنەی عیسای لێیە، ئیتر یەهوذا بۆخۆی چووە شکڵ‌و ڕوخساری حەزرەتی عیساوە، کافرەکان وایانزانی ئەوە عیسایە، ئیتر یەهوذایان لەجیاتی لەدار دا.

هەندێکی تریان دەڵێن: روخساری عیسا، ﷺ خراوەتە سەر حەوارییەکی تر: کەناوی (سیمون)ەو ئەو لەدار دراوە!!

قورئانی پیرۆز لەم بارەشەوە هەواڵی یەقینی داوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ﴾

لەوەپێشیش جولەکەکان تەوراتیان گۆڕیوەو یاسا ئاسمانییەکانیان شێواندون، قورئانی پیرۆز هات بنەماو پاڵفتەی شەریعەتەکەیانی بەوشێوەی کە: خودا نازڵی کردوە چەسپاند، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾

هەروەها هەواڵی راست‌و دروستی گێڕایەوە دەربارەی مێژووی خۆیان‌و ژینامەی پێغەمبەرەکانیان، رووداوەکانیانی بەواقیعی‌و دوور لەئەو ئەفسانەو بوختان‌و ئەو قسەلۆکانەی ریوایەتەکانی خۆیان پاڵ پێغەمبەرەکانیان داوە، رانواند بەم جۆرە لاپەڕەی ژینامەی پێغەمبەرەکانی نەتەوەی ئیسرائیلی لەو ریوایەتە ئەفسانە ئامێزانەی جولەکەکان پاك کردەوەو بوختان‌و درۆو دەلەسەکانیانی رەتکردنەوە. ئەو نەفرین لێکراوانە ژینامەی پێغەمبەرێکی خۆیانیان بەراستی نەهێشتۆتەوە ئیللا پیسیان کردوە، بۆ نموونە بەگوێرەی ریوایاتی ئیسرائیلی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ خێزانەکەی خۆی پێشکەش بەپاشای فەلەستینی یەکان‌و فیرعەونی میصر کرد بەو ناوەوە: کە خوشکی یەتی بۆئەوەی شتێکی لێیان دەست بکەوێ، هەروا بەگوێرەی ریوایەتی ئەوان حەزرەتی یەعقووب ﷺ : کەباپیرە گەورەی بەنو ئیسرائیلی یەکانەو خۆی بەئیسرائیل ناسراوە، بوختانی ئەوەی پێ دەکەن کە: فەرو بەرەکەتی لەئیسحاقی باوکی‌و ئیبراهیمی باپیری دزیوە!!! بەفرت‌و فێڵ

جێگـای ئـەوانی گرتۆتـەوە، ئـەوان پێیـان وایـە پلـەو پایـەو فـەڕو بەرەکـەتی پێغەمبەرایەتی دەبوایە بدرێ بەبرا گەورەی یەعقووب ﷺ کەناوی عیسو بووە!

بەگوێرەی ریوایەتی ئەوان کچەکانی حەزرەتی لووط ﷺ باوکیان سەرخۆش کردوە بۆئەوەی لەگەڵیان جووت بێ بەڵکوو کوڕیان ببێ ماڵو میراتیان نەکەوێتە دەست بێگانە، چونکە حەزرەتی لوط ﷺ میراتگری نێرینەی نەبوە!!

بـەگوێرەی ریوایـەتی ئـەوان حـەزرەتی داوود ﷺ لەسـەر بـانی باڵەخانـەی خۆیەوە ئافرەتێکی جوانی دیوە، دوایی بۆی دەرکـەوتووە: کەئـەو ئافرەتـە خێزانـی جونـدی یـەکی خۆیـەتی، ئـیتر حـەزرەتی داود ﷺ ئـەو جوندییـەی نـارد بۆشـەڕ بۆئەوەی بکوژرێو دوایی ژنەکەی پێ ببڕێ! بـەگوێرەی ریوایـەتی ئـەوان حـەزرەتی سولەیمان ﷺ لەبەرخاتری خێزانێکی کەزۆری خۆش دەویست، ویستی بتپەرستی بکا! هەروا لـەم شێوەتانو بۆیـە ژینامـەی فروسـتادەکانی خودایـان شێواندوە، ئـەم درۆو دەلەسەیان وەپاڵ داون، ژینامەکانیان پـڕ کـردون لەئەفسانەو توڕەهات. ئـیتر قورئان هات ژینامەی ئەو زاتانەی لەو ئەفسانەو توڕەهاتانـە پـاك کـردەوەو راسـتی واقیعی ژیانیانی رانواند.[٢]

﴿وَإِنَّهُ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومـان قورئـان هیدایەتـدەری موسوڵمانانە، شارەزاییان دەکا بۆ ڕێبازی راستو دروست، رەحمـەتو بەرەکەتـە بۆیـان لەهـەموو رویەکـەوە، لـەبارەی ئـەو حوکمانـەی پەیوەنـدییان بەعەقیـدەوە هەیـە.. وەکـوو یەکتاپەرستیو باسی زاتو صیفاتی پەروەردگارو زیندوبوونـەوەو حـەقو حیسابو پێغەمبەرایەتی، هەروا ئەو حوکمانـەی پەیوەنـدییان بەئەحکامـە عەمەلییەکانـەوە هەیە لەگەڵ پێویستیاتی ئادەمیزاد وا دەگونجێنو بەرژەوەنـدی دونیـاو قیامـەتیان بۆ دروست دەبێ!

(٢) بەداخـەوە هەنـدێ لـە تەفسیرو کتێبـە وەعظییـەکانی ئێمـەیش ئـەم ئەفسانەو توڕەهاتـە ئیسرائیلیەیان تێکەوتوون.

هەروەها قورئان هیدایەت‌و رەحمەتە بۆ موسوڵمانان، چونکە لەبارەی رەوانی‌و گوزارەکارییەوە گەیوەتە چڵەپۆپەو هەموو ئادەمیزادو جندۆکەی بۆڕ داون‌و هەموویان لەبەرامبەری دا دەسەوەسان‌و جۆش داماون! ئەمەش نیشانەی سەر ئاسایی قورئانەو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە: کەلامی خودایەو لەلایەن خودای زاناو داناوە نازڵ کراوە!

هیدایەتە بۆ موسوڵمانان چوونکە ئەوان سوودی تەواوی لێ وەردەگرن‌و لێ ی بەهرەمەند دەبن! لەکێشەو نیزاع‌و گومرایی دەیانپارێزێ، تەوحیدی مەنهەج‌و رێبازی ژیانیان دەکا، پەیوەستیان دەکا بەیاسای بونەوەرەوە، ئەو یاسایەی خودا بۆ بوونەوەری داناوەو گۆڕانی بەسەردا نایە.

رەحمەت‌و بەخشە بۆیان، قەلەق‌و سەرگەردانییان لێ دەرەوێنێتەوە، پەیوەستیان دەکا بەخوداوەو لەپەنای دا ئارامی دڵ‌و دەروونیان بۆ دەستەبەر دەبێ، بەئاشتی‌و ئارامی لەناو خۆیان‌و لەگەڵ خەڵك دا دەژین! بەڕاستی مەنهەجی قورئان مەنهەجێکی تاقانەو بێ وێنەیە لەزیندو کردنەوەو دروست کردنەوەی دڵ‌و دەروونەکان داو رێکخستنیان بەگوێرەی سروشت، ئەمجار دوای ئەم تیلنیشانە بۆ فەضل‌و بەخشندەیی خودا بەسەر ئادەمیزاد دا بەو قورئانەی کەکێشەو نیزاعی بەنوئیسرائیلی یەکان یەکالا دەکاتەوەو موسوڵمانان شارەزا دەکا بۆ رێبازی راست‌و رەحمەتی خۆی دڕژێنێ بەسەریان دا. ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دووپات دەکاتەوە: کە پەروەردگار دادگایی لەنێوان پێغەمبەرو نەتەوەکەی دەکاو بڕیاری کۆتایی هەڵنەشاوەی خۆی دەربارەیان دەدا. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ بِحُكْمِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد ﷺ : زۆربەی ئەوشتانەی کەنەتەوەی ئیسرائیل تێ یدا کەوتونە کێشەو نیزاعەوە بۆیان یەکالا دەکاتەوە، دڵنیابە خودای تۆ (کە ئەوە بڕێکە لەزانایی‌و دانایی) رۆژی قیامەت حوکم دەکا لەنێوان بەهەڵە چوو لەنێوان ئەوانەدا کەرێبازی راستیان گرتووە، بەحوکم‌و عەداڵەتکاریی خۆی بڕیاریان لەنێوان دا دەردەکا، ئەو خودایە، بەتواناو خاوەن

دەسەڵاتە کە: تۆڵە لەبەتاڵخوازان بستێنێ، پاداشتی چاکەکاران بداتەوە، حوکمو بڕیاری هەڵناوەشێتەوە، زاناو ئاگادارە بەکردارو گوفتاری بەندەکانیو حوکمو بڕیاری ڕاستو دروستیان بۆ دەردەکا، چونکە تەواوی زانایی هەیە بەوەی حوکمی بۆ دەردەکاو بەوەی حوکمی لەسەر دەردەکا، بڕیارەکانی هەموویان موطابیقی واقیعو عەدالەتکاریو ڕەوان.

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا کە: هەر پشت بەخودا ببەستێو چ گرنگی یەك بەدوژمنانی ئاپین نەدا. دەفەرموێ: ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ﴾ پشت بەخودا ببەستەو بتمانەت هەر بەئەو هەبێ، هەموو کارێکت بەئەو بسپێرە، بەردەوام بە لەسەر بانگەوازیی خۆتو پەیامی خۆت ڕابگەیەنەو گوێ بەناحەزانی ئاپین مەدە، چونکە بێگومان تۆ لەسەر ڕێبازی حەقو خودا پەسندی، هەرچەندە ئەوانە دژت بدوێنو ڕەخنە لەپەیامەکەت بگرن گوێیان پێ مەدەو سووربە لەسەر ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانت!

جا ئەگەر بەپیر بانگەوازییەکەتەوە نەهاتنو ڕویان وەرگێڕا ئەوە تۆکەمتەرخەمیت نەکردوەو ئەتۆ بەرپرسیار نیت.

﴿إِنَّكَ لا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ﴾ چونکە بێگومان کەسێك بەپیر بانگەوازییەکەتەوە دێ: کەدڵ زیندو بێو دڵو گوێچکەی خۆیان بۆ بانگەوازییەکە بکەنەوە، بەڵام ئەوانەی دڵیان مردوەو چاوی دڵیان نابینێ، بەڵگەی هیدایەتو ئیمان نابیسن، ئەتۆ ناتوانی بەزۆر بیانخەیە سەر هیدایەت، ئەتۆ ناتوانی شتێك بخەیە گوێچکەیانەوە سودبەخش بێ، ئەوان لەوکاتەدا: کەپشت هەڵدەکەنو ڕو وەردەگێڕن وەکوو مردو وانو نەصیحەتو ئامۆژگارییەکانت کاریان تێ ناکاو هیچی لێ حاڵی نابن. وەکوو کەڕو کوندێك وەهان: کەهیوای بیستنو تێگەیشتنیان لێ ناکرێ، وەکوو کوێرو نابینایەك وەهان: کەهیچ نابینن، چونکە دڵیان پەردەی بەسەردا دراوەو گوێچکەیان بەقوڕقوشم هاخاندراوە. لەدڵو دەرونیان دا فیزو خۆبەزلزانی هەیە، ملیان بۆ حەق کەچ ناکەن، ئیتر پێغەمبەر

ڕێگا چارەیەکی نیە بۆئەوەی دڵیان بکاتەوەو پەیامی خودایان تێ بگەیەنێ، کەوابێ گومڕایی‌و بێ گوێی کافرەکان چ زیانێکی بۆ پێغەمبەر نیە، ئەو ئەرکی خۆی ئەنجام داوەو بانگەوازی خۆی بەنەوپەڕی دڵسۆزییەوە ڕاگەیاندوە. بەکورتی، پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کەپشت بەخودا ببەستێ‌و ڕو لەغەیری خودا وەرگێڕێ‌و گرنگی بەهیچ شتێك نەدا، چونکە ئەو لەسەر حەقەو غەیری ئەو لەسەر بەتاڵەو هیچ هیوایەکیش نیە ئەو موشریکانە ئیمان بێنن‌و بەپیر بانگەوازی حەقەوە بێن.

مەبەست بەنەبیستنی مردوان بیستنێکە کە: بەدوایدا وەڵام‌و تێگەیشتن هەبێ، کەوابێ چ دژایەتی‌یەك نیە لەنێوان مانای ئەم ئایەتەو مانای ئەو فەرمودەو دەقە ئیسلامییانەی بیستنی مردوو دەچەسپێنن‌و ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، تەنیا لەحەدیث دا چەسپاوە کەمردو گوێی لەدەنگی پێڵاوی مردو نێژەکانە کەدوای لەگۆڕنان بەجێ ی دێڵن. هەروا ئەوە چەسپاوە: کە: پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لەگۆڕی شەهیدانی غەزای بەدر کرد، هەروەها خیطابی ئاراستەی کوژراوانی موشریکەکان کرد لەلای بیری بەدر، هاوەڵان عەرزیان کرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن ئاخاوتن لەگەڵ چەند جەستەیەکی بێ گیان دەکەی! پێغەمبەر ﷺ لەوەڵام دا فەرموی: (والذی نفس محمد بیده ما أنتم باسمع لما أقول منهم)

ئەمجار مانای ئایەتی پێشەوە جەخت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَنْ ضَلاَلَتِهِمْ﴾ ئەی موحەممەد! ئەتۆ ناتوانی ئەوانەی چاوی دڵیان کوێر بووەهیدایەتیان بدەی‌و لەگومڕایی خۆیان بیانگێڕیەوە، چونکە پەردەی کوفرو گومڕایی چاوی دڵی داپۆشیون، تێفکرینیان لەپەیامی تۆ بۆناکرێ، ناتوانن ورد بوونەوەیەك ئەنجام بدەن حەق بناسن‌و سوودی لێ ببینن ﴿إِنْ تُسْمِعُ إِلاّ مَنْ يُؤْمِنُ

بآياتِنَا فَهُمْ مُسْلِمُونَ﴾ نەوەكوو بیستنی پەیامی تۆ سوودی هەیە ئیللا بۆ كەسانێك كەلەزانیاری خودا دا چەسپاوە ئیمانت پێ دەهێننو تەصدیقت دەكەن، ئەوانە خاوەن بڕواو یەكتاپەرستن، گەردنكەچی فەرمانو جڵەوگیریەكانی دەبن. واتە: بەپیر بانگەوازی تۆوە نایە مەگەر كەسێك چاوی دڵی بینا بێو ئامێری بیستنو دیتنی خۆی بۆ دەرك كردنی حەقائیق بەكار بێنێو ئامادەباشی ئەوەی تێدابێ حەق وەربگرێ، ئائەوانە موسوڵمانی راستاڵو خوداپەرستی تەواون.

بێگومان ئیسلام ئاشكراو واضیحو گونجاوە لەگەڵ سروشت دا، هەر دڵو دەرونێك ساغ بێ وەری دەگرێ، هەر دڵێك نەخۆش نەبێ پابەندی پەیڕەوو پرۆگرامی دەبێ. گرانیو زەحمەتی تێدا نابینێ، هەر لەگەڵ بانگەوازیی ئیسلامی بیست بەبێ سێو دوو وەری دەگرێو گەردنكەچی فەرمانو جڵەوگیریەكانی دەبێ.

## هەندێ لەنیشانەو بەڵگەكانی هاتنی قیامەت

﴿ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ

﴿٨٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی جۆراو جۆری هێنانەوە لەسەر دەسەڵاتو زانیاری رەهای خۆی، ئەمجار جەولەیەکی تر دەست پێ دەکاو سەرنجی ئادەمیزادەکان رادەکێشێ بۆ پەیدابوونی نیشانەکانی قیامەتو هەندێ لەدیمەنەکانی رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ لەکۆتایی دونیاداو لەو رۆژگارەدا کە: ئادەمیزاد تووشی فەسادو بێدینی دەبنو ئایینی خودا فەرامۆش دەکەن، لەجیاتی ئایینی ئیسلام شوێن یاسای دانراوی گاورو جولەکە دەکەون، رێبازی حیزبو پارتی عیلمانی پەیرەو دەکەن، شیاوی ئەوە دەبن سزای هەرەشە پێ لێکراویان بۆبێ، ئەمەش لەپێشەتای هاتنی قیامەت دا دەبێ، جالەوکاتەدا خودای مەزن پیرۆیەك لەزەوی بۆ ئادەمیزاد دەخاتەڕۆو هەواڵیان پێ دەدا: کەزوربەی زۆری ئادەمیزاد بڕوایان بەنیشانەکانی خودا نیەو کافرن.

هەندێ لەراڤەکەرانی قورئان پێیان وایە مەبەست بە (دابة) ئادەمیزادێکە زمانزانو قسەڕەوانو زانا، بەر بەرەکانی ئەهلی بیدعەو کوفر دەکاو بەگژیاندا دەچێتەوە. بەڵگەشیان رستەی (تکلمهم)ە چونکە قسەکردن بۆ ئاژەڵ نابێ. بەڵام ئیمامی قورطوبی ئەم رایە پەسند ناکاو رەتی دەکاتەوە[٢] بێگومان باسی هاتنەدەرو سەرهەڵدانی (دابة) ی ناوبراو لەزۆر فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، هەندێ لەو حەدیثانە صەحیحنو زانایانی زانیاری فەرموودە فەرموویانە: هیچ وەصفو نیشانەیەکی ئەو (دابة) یە نەهاتووە.ئەو حەدیثانەی ئەوصافی دابەکەیان تێدا

[٢] تەفسیری قورطوبي ج ٧/ ٢٨١١ .

هاتووە نەگەیشتوونە پلەی صەحیح بۆیە وەکوو مامۆستا سەید دەفەرموێ: نایان هێنین‌و گوێیان پێ نادەین.

لەڕاستی دا نازانین چ سودێك هەیە لەرانواندنی ئەو هەموو ریوایات‌و عەنعەناتانەی کتێبە تەفسیرەکانی وەکوو ئیبنو کەثیرو قورطوبي لەبارەی ئەوصافی (دابة)ی ناوبراوەوە هاخنیویانەتە ناو تەفسیرەکانیانەوە؟ دەبێ چ سوودێکی لێ رەچاو بکرێ ئەگەر بگوترێ: درێژی یەکەی شەصت زیراعە![4] یان پەڕوباڵی وایەو ریشی وەهایە، سەری وەکوو سەری کەڵەگا وایە! چاوی لەچاوی بەراز دەچێ! گوێی وەکوو گوێی فیل وایە، شاخی لەشاخی حەیوانە کێوی دەچێ، ملی دەڵێ ی ملی نوعامەیە سنگی لەسنگی شێر دەچێ، رەنگی لەپڵنگ دەکا، خالیگەی لەخالیگەی پشیلە دەچێ! کلکی دەڵێی دوگی بەرانە، قاچەکانی لەقاچی حوشتر دەکا!! لەڕاستی دا راگواستنی ئەو ریوایاتە ناصەحیحانە چ خزمەتێکی قورئان ناکاو چ سودێکیش بەموسوڵمانان ناگەیەنێ‌و پێویستە بەحەزەرەوە تێیان بڕوانین‌و سوفیلکانەو سافیلکانە وەریان نەگرین‌و ئایاتی قورئانیان پێ تەفسیر نەکەین! ئەوەی پێویستە ئەوەیە: کەئێمە لەچوارچێوەی دەقی قورئانەکەو فەرموودە صەحیحە لەکەوو بێژینگ دراوەکان دەرنەچین. چونکە شتی غەیبی کاتێك واجبە تەصدیقیان بکەین؛ کەبەبەڵگەی حاشا هەڵنەگر لە پێغەمبەرەوە بەئێمە گەیشتبێ. دەقەکەی قورئان‌و فەرموودەی صەحیح ئەوە دەگەیەنن: کە هاتنەدەرو بەدەرکەوتنی (دابة) نیشانەی قیامەتەو یەکێکە لەنیشانە گەورەکان‌و کاتێك ئەو (دابة) یە دەردەکەوێ: کەدەرگای تۆبە دادەخرێ‌و کاتی رابوونی قیامەتە، تۆبە لەکەس وەرناگیرێ‌و کاتی تەکلیف بەسەر دەچێ‌و گۆڕانکاری لەبیرو باوەڕدا چ رۆڵێکی نامێنێ، ئالەو کات‌و دەمەدا خودا (دابة) یەك بۆ ئادەمیزاددەخاتەڕو ئاخاوتنیان لەگەڵ دەکا، هەڵبەتە (دابة) قسە ناکا، یان بڵێین ئادەمیزاد لێ ی تێ ناگەن، بەڵام وەکوو موعجیزەیەك

---

([4]) تەفسیری قوروطوبی ج ٢٨٠٩/٧ ٢٨١٥ تەفسیری ئیبنو کەثیر ج ٣/ ١٣٨٥- ١٣٨٧.

لەو رۆژەدا خەڵك لێ ی حاڵی دەبن و دەزانن: کەئەوە نیشانەی دونیا خرابوون و رابوونی قیامەتە، لەوەپێش بڕوایان بەو رابوونە نەبووەو ئینکاری هاتنی رۆژێکی ئاوەهایان کردوە!![1]

یەکێك لەو فەرموودانەی دەربارەی (دابة) ی ئاماژە پێکراو ریوایەتکراوە ئەو فەرمودەیەیە: کەئیمامی موسلیم و خاوەنی سونەنەکان لەحوذەیفەی کوڕی ئوسەیدی (الغفاری) یەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: ئێمە لەگەڵ کۆمەڵێك لەهاوەڵان دەربارەی قیامەت گوفت و گۆمان بوو پێغەمبەر ﷺ لەژوورێکەوە تەشریفی چاوی لێمان بوو فەرمووی: (لاتقوم الساعة حتى تروا عشرة آيات: طلوع الشمس من مغربها، والدخان، والدابة وخروج يأجوج ومأجوج وخروج عيسى بن مريم ﷺ ، والدجال، وثلاثة خسوف: خسف بالمغرب، وخسف بالمشرق، وخسف بجزيرة العرب، ونار تخرج من قعرعدن، تسوق أو تحشر الناس، تبيت معهم حيث باتوا وتقيل معهم أينما قالوا) قیامەت رانابێ تا دە نیشانە بەچاوی خۆتان نەبینن: دەرکەوتنی خۆر لەخۆرئاواوە، پەیدا بوونی دووکەڵ، پەیدا بوونی (دابة)، هاتنەدەرەوەی یاجوج و ماجوج، هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم ﷺ درودی خودای لەسەربێ، پەیدا بوونی دەجال، سێ رۆچون لەزەوی پەیدا دەبێ، رۆچونێك لەخۆرئاوا، رۆچونێك لەخۆرهەلات، رۆچونێك لەنیوە دورگەی عەرەب، هەڵگیرسانی ئاگرێك لەعەدەن، خەڵك وەبەرخۆی دەدا لێیان ناکەوێتەوە بەشەوو بەڕۆژ بەدواوەیانەو لەگەڵیانە.

دەربارەی ئەو شوێنەی یەکەمجار ئەو (دابة) ی لێ دەردەکەوێ پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا وتیان: ئەو دابەیە لەکوێ دێتەدەر؟ پێغەمبەر ﷺ لەوەلام دا فەرمووی: (من أعظم المساجد حرمة على الله تعالى، يعني المسجد الحرام) لەبەرێزترین مزگەوتی خودا سەر هەڵدەدا واتە: لەمەسجیدول حەرام پەیدا دەبێ!

[1] بڕوانە (فی ظلال القران) بەرگی شەشەم/ ل ٣٠٨.

ئەمجار سیاقی قورئان لەم نیشانەوە دەگوێزێتەوە بۆ نیشانەیەکی تر ئەویش دیمەنی حەشرە، دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجاً مِمَّنْ يُكَذِّبُ بِآيَاتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ، حَتَّى إِذَا جَاءُوا قَالَ أَكَذَّبْتُمْ بِآيَاتِي وَلَمْ تُحِيطُوا بِهَا عِلْماً أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ؟﴾ ئەو رۆژەی کە: لەهەموو ئادەمیزادانی چەرخ و رۆژگارەکانی دونیا کۆمەڵێکی زۆر لەسەرانی ستەمکارو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەران و نیشانەی خودایەتی خودا لەسارای مەحشەردا کۆ بکەینەوە، بۆ حەق و حیساب لەگەڵ کردن، جا کەهەموویان کۆبوونەوەو کۆ کرانەوە، لەبەر دەستی خودادا رادەگیرێن بۆ حیساب و لێکۆڵینەوە لەگەڵیان، پەروەردگار بەشێوەی سەرزەنشت و سەرکوتانەوە پێیان دەفەرموێ: ئەوە ئەو ئایات و نیشانانەی ئاماژەیان بۆ ئەم رۆژە دەکرد بەدرۆتان دەزانین؟ بڕواتان بە پێغەمبەران و نامە ئاسمانییەکان نەکرد کە هاتنی قیامەتیان پێ راگەیاندن؟؟ دەی ئەگەر لەئایەتەکان ورد نەبوونەوەو گوێتان بۆ ئامۆژگاری پێغەمبەران رانەگرت، ئەدی بەچییەوە مەشغوڵ بوون، بەچییەوە خۆتان خەریك کردبوو تەصدیق و تەکذیبی چیتان دەکرد؟؟

پرسیاری یەکەم پرسیاری لۆمە ئامێزەو دیارە ئەوان پەیامی خودایان بەدرۆ خستۆتەوە!.

پرسیاری دووەم پڕە لەسووکایەتی پێکردن و تانووت لێدان، ئەوەش ئوسلوبێکی ئاخاوتنی کاریگەرەو لەزمانی عەرەبی دا نموونەی زۆرە. ئایا فروستادەکانی ئێمەتان بەدرۆخستنەوە؟ ئەدی چی ترتان ئەنجام داوە؛ کوا جگە لەو کارە ناشرینەو تاوانە گەورەیەتان چی ترتان ئەنجام داوە؟ هەڵبەتە نموونەی ئەم جۆرە پرسیارانە وڵامیان بێ دەنگی و جۆش دامانە، پرسیارە کە زوبانیان لاڵ و پەت دەکاو دەحەبەسێن!

﴿وَوَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ بِمَا ظَلَمُوا فَهُمْ لا يَنطِقُونَ﴾ ئیتر ئەوکاتەی عەزابی سەختی خودا نازڵ دەبێ بۆ سەر ئەو ستەمکارو بەدرۆ خەرەوانە هیچیان هۆشی عوزر

هێنانەوەو قسە کردنیان نامێنێو متەقیان لێوە نایە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ﴾ (المرسلات/٣٥)

سەیر بکە لەوەپێش (دابە) ئاخاوتن ئەنجام دەداو قسەو گفتو گۆ لەگەڵ خەڵك دەکا! کەچی ئێستا ئادەمیزاد کەقسەو ئاخاوتن بەشێکە لەپێکهاتەیانو صیفەتێکی سروشتی یانە دەمیان بەسراوەو زمانیان ناگەڕێ، ئەمجار لەدیمەنی بەدرۆ خەرەوەکانی ئایاتی خودا کەلەسارای مەحشەردا ماتو دۆش داماوو زمان بەسراوو متەق لێوە نەهاتوون دەگوێزێتەوە بۆ دیمەنێك لەدیمەنەکانی جیهان کەدەبوایە لەژیان دا سەرنجیان لەو دیمەنە بدایەو ویژدانیان پێ ی بەخەبەر بهاتایە!

بانگەوازیان دەکا بۆ تێفکرینو وردبوونەوە لەیاسای بوونەوەرو دیاردەکانی، کەهەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە نیشانەی هەبوونی خودایەکی باڵادەستو زاناو دانایە، هەموو دیاردەیەکی ئاماژە بەوە دەکا: کەخودایەکی بەتواناو خاوەن بەزەیی هەیە چاودێری دەکا هۆکاری ژیانو راحەت بۆ ئادەمیزاد دەرەخسێنێو رەخساندویەتی، بوونەوەری وا بەدیهێناوە گونجاو بێ لەگەڵ ژیانی مرۆڤ داو بتوانێ بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بێنێ. دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوە ئەو ئادەمیزادانەی پەیامی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە نابینن: کەئێمە شەومان بەدیهێناوە بۆ ئارام گرتنو حەسانەوەو پشوودان تێ یدا! هەروەها رۆژی روناکمان بۆ بەدی هێناون بۆ گەڕانو هەوڵدان بەدوای کاسبی کردن دا، بۆ هاتوو چووی وڵاتانو بینینی سروشتو سوود بینینو دابینکردنی پێویستی یەکانی خۆیان! بێگومان لەو خوڵقاندنو بەدیهێنانو رام کردنەدا نیشانەی جۆراو جۆر هەن لەسەر تاكو تەنهاییو بەتوانایی خودا بۆ زیندو کردنەوەی ئادەمیزاد لەدوای مردنیان، حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردنیانو پاداشدانەوەیانو تۆڵە لێ ستاندنیان، بۆ کەسانێك بڕوایان هەبێ بەخوداو بە پێغەمبەری خودا، بێگومان دیمەنی شەوی بێدەنگو ئارام، دیمەنی رۆژی روناكو

پڕ جمو جوڵ شیاوی ئەوەن کە: ویژدانی ئادەمیزاد بهەژێننو سەرنجیان رابکێشن بۆ پەیوەندیکردن بەخودایەکەوە کە: شەوو رۆژ بەشوێن یەکدا دەهێنێ. چونکە لەراستی دا شەوو رۆژ دوو نیشانەی زەقن لەسەر هەبوونی خودای تاكو تەنهاو خاوەن توانا، بۆ کەسانێك دڵو دەروونیان ئامادەباشی ئیمانهێنانی تێدا بێ!!

ئەگەر شەو نەبوویایەو هەموو کاتێ رۆژ بویایە، ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو، هەروەها ئەگەر رۆژ نەهاتایەو هەمووکاتێ شەو بوویایە هەر ژیان نەدەبوو، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکوو ئەگەر شەو یان رۆژ دەهێندەی ئێستای خۆیان زیاتر درێژ بوونایە، بەرۆژ خۆر هەرچی روەكو شیناوەردە دەیسوتاند، بەشەویش هەموو شیناوەردێکی دەبەست! ئیتر ئەوکاتە ژیان محاڵ دەبوو! کەوابێ لەهەبوونی شەوو رۆژدا بەم شێوەی ئێستایان کەلەگەڵ ژیان دا دەگونجێن ئایاتو بەڵگەی زۆر هەن لەسەر هەبوونو بەتواناییو زانایی خودای مەزن!!

هەر کەسێك لەبەشوێن یەکدی هاتنی شەوو رۆژ وردببێتەوە بڕوانێ خودا چۆن گۆڕانکاری لەبوونەوەردا دەکاو چۆن لەحاڵەتی شەوەوە کە دەشوبهێتە مردن حاڵەتی روناکیو جمو جوڵ دا دێنێو پاش تاریکیو بێ هەستو خوستی زیندەوەرەکان، روناکیو جمو جوڵ دێنێتە ئاراوە، بۆی دەردەکەوێ: کەقیامەت دێو گومان لەهاتنی دا نیەو پەروەردگار هەموو مردوانی ناو گۆڕ زیندو دەکاتەوە!

## فووکردن بەشاخی صورداو رۆیاندنی کێوەکان

﴿ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلۡجِبَالَ تَحۡسَبُهَا جَامِدَةٗ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ

شَيۡءٍۚ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾

لەوەپێش باسی نیشانەی یەکەمی رابوونی قیامەتی کرد، کەپەیدا بوونی (دابة) بوو قسەکردنو ئاخاوتنی بوو! ئەمجار باسی دوو نیشانەی تری رابوونی قیامەت دەکا؛ ئەوانیش نەفخی صورو رۆیاندنی کێوەکانە، دوابەدوای ئەوە باسی حاڵو وەزعی ئادەمیزادەکان دەکاو لەو رۆژەدا کەدووبەشی سەرەکین هەر بەشەیان بەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداش وەردەگرنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الآرْضِ إِلآ مَنْ شَاءَ اللَّهُ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوە بۆ ئادەمیزادەکان باس بکە: کە فوو دەکرێ بەشاخی (صور) دا، هەرچی زیندەوەری ناو ئاسمانەکانو سەر زەوی هەیە لەترسان زەندەقیان دەچێو دەمرن، جگە لەوانەی پەروەردگار نایەوێ بمرن، بەوجۆرە دڵیان دادەمەزرێنێو ترسیان لەبەر ناکەوێ، ئەوانەش برێك فریشتەن وەکوو جوبرائیلو میکائیلو ئیسرافیلو ئیزرائیل. هەندێك پێیان وایە ئەوانە شەهیدەکانن چوونکە بەدەقی قورئان شەهیدان لای پەروەردگار لای خودا زیندوونو رزقو رۆژییان دەدرێتێ.

**فوکردن بەصوردا دووجارە:**

١- فوکردنی جاری یەکەم: کەفوکردنی دونیا وێرانبونو زیندو مردنە، ئەو فوو کردنەیە کە قورئان لەئایەتێکی تردا دەربارەی دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الآرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾ (الزمر/٦٨)

٢- فوکردنی دووەمجار: فوکردنی زیندوبوونەوەیە ئەو فوکردنەیە کەقورئان لەکۆتایی ئایەتەکەی سورەتی (الزمر) دا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ

يَنظُرُونَ﴾ یان لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ (يس/٥١)

کەوابوو فوکردن بەصووردا دووجارە جارێکیان بۆ مراندنی هەموو زیندوێکە جگە لەخودا جاری دووەمیشیان بۆ زیندو کردنەوەی هەمووانە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، ئەوانەیش کەئایەتەکە بە ﴿إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾ چەرتی کردون دوای فوکردنی یەکەمو پێش فووکردنی دووەم دەمرێندرێن.

﴿وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ﴾ هەموو مەخلووقات بەبێ ماتەڵ بوونو دواکەوتن بەهەڵەداوان دەکشێن بۆ سارای مەحشەرو بەگەردنکەچی لەبەردەم پەروەردگاردا رادەوەستنو چاوەڕوانی حیسابو لێکۆڵینەوەن، ئەوانەی تاوانبارن زەلیلو مەهتوكو بێ ڕێزو داماو، ئەوانەیش: کە موسوڵمانانن لەهەیبەتو شکۆمەندیی خودای مەزن دەحەبەسێنو گەردنکەچو بێدەنگ متەقیان لێ نایەو هەستو خوستیان لێ دەبڕێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾ (مريم/٩٣) ئەمجار دێتە سەر وێنەکێشانی نیشانەی دووەمو دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾ ئەتۆ لەو رۆژەدا دەڕوانی بۆ کێوەکان وایان دەبینی کە: ڕاوەستاوو نەجوڵاون، وەلحاڵ ئەو کێوانە بەخێرایی دەڕۆنو لەگەڕدان، وەکوو چۆن هەور بەهەوی بای توندو بەهێزەوە دەڕۆن؛ چونکە قەبارەی گەورە ئەگەر بشڕوا هەست بەڕۆیشتنەکەی ناکرێ.

لەچەند ئایەتێك دا ئاماژە بەڕۆیشتنی کێوەکان لەو رۆژەدا کراوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْراً، وَتَسِيرُ الْجِبَالُ سَيْراً﴾ (الطور/٩-١٠) یان دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ وَتَرَى الْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ (الكهف/٤٧) یان دەفەرموێ: ﴿وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَاباً﴾ (النبأ/٢٠) رۆیاندنی کێوەکان - هەرچەندە لەنەفخەی یەکەم دا وردو خاش دەبن - بەڵام رۆیاندنەکەیان لەدوا نەفخی دووەم

دەبێ بۆ ئەوەی ئەهلی مەحشەر هەموویان بیان بینن ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ ئائەوە کردەوەی ئەو خودایەیە: کەهەموو شتێکی بەکاراماییو دەسەلاتی خۆی ئەنجام داوە، لەهەموو شتێك دا کاردروستو دەست رەنگینە ﴿إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ بێگومان خودای بالآدەستو بەتوانا زاناو ئاگادارە بەهەموو کردەوەی بەندەکانیو سزاو پاداشیان بەگوێرەی کردەوەکانیان دەداتەوە!!

ئەمجار پەروەردگار بەیانی حاڵو وەزعی موکەلەفە بەختەوەرو کامەرانەکانو موکەلەفە بەدبەختەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا وَهُمْ مِنْ فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾ کەسێك بێتە سارای مەحشەر حاڵو وەزعی وابووبێ ئیمانی بەخودا هەبووبێ یەکتاپەرست بووبێ، کردەوەی چاکی ئەنجام دابن، لەپاداشی ئەوەدا لای خودای بەخشندەو دادوەر لەبەهەشتی بەرینو رازاوەدا نازو نیعمەتی زۆرو زەبەندەی دەدرێتێ، لەترسی ئەو رۆژە سەختە سامناکە رزگاری دەبێ، ترسی گەورەی زیندو بوونەوە نایگرێتەوە وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ﴾ (الانبیاء/١٠٣) مانای (الحسنة) لەئایەتەکەی ئێرەدا باوەرو کردەوەی باشە، ئیبنوعەبباسو ئیمامی نوخەعیو قەتادە دەفەرموون: (الحسنة) بەمانا (لاإله الا الله) یە وشەی (خير) مانای (افعل التفضيل) ی لێ وەرناگیرێ چونکە هیچ شتێك نیە لە (لا إله الا الله) باشتر بێ، کەوابوو مەبەست بەوشەی (خير) لێرەدا دوو چەندانەی پاداشو بەردەوامییەتی. چونکە کردەوە تەواو دەبێو پاداش نەبراوەیە.

لەم رۆژە ترسناکەدا ئەمینیو دڵنیایی لەترسی گەورە، (الفزع الاكبر) پاداشی کردەوە باشەکانیانە، ئەمە جگە لەو هەموو نازو نیعمەتە بەردەوامو نەبراوەی دوایی پێ ی دەبەخشرێ! رزگار بوون لەو ترسو بیمە بۆخۆی پاداشە، دوایی چی دەدرێتێ فەضلو مینەتی پەروەردگارە، ئەوانە لەدونیادا لەخودا ترساون، لەو رۆژەدا تووشی ترس نابن، ترسان لەخودا لەدونیاداو فەزعی قیامەت

لەئادەمیزادێك دا کۆنابنەوە. بەڵکوو لەو رۆژەی دا کەخەڵك زەندەقی دەچێ ئەوان پارێزراونو ترسیان توش نایە.

﴿وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾

کەسێکیش لەدونیادا هاوەڵی بۆ خودا دانابێو تاوانی ئەنجام دابن، بەو تاوانانەوە بێتە سارای مەحشەر هیچ چاکە لەتەرازوی کردەوەکانی دا نەبن یان خراپەکانی بەسەر چاکەکانی زاڵ بن، ئەوە بەرەودەم تورِ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە، ئەمجار بەوان دەگوترێ واتە: بەکافرەکان دەگوترێ: ئایا ئەمە سزای کردەوەی خۆتان نیە؟ ئایا ئەم عەزابە جگە لەتۆڵەی کردارەکانی خۆتان زیاتر هەیە؟!

## خەریك بوون بەعیبادەتی خوداو خوێندنی قورئانو حەمدو سوپاسی دڵسۆزانە بۆ زاتی پاکی

﴿ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾

پاش ئەوەی پەروەردگار حاڵو وەزعی دروستبوونی سەرەتاو زیندوبوونەوەی پاش مردنو نیشانەکانی پێش هاتنی قیامەتی بەیان کرد، هەروەها وەزعو حاڵی

ئەهلی قیامەتی رون کردەوە، ئەمجار فەرمانی بە پێغەمبەر کرد ﷺ کەبەو شێوە لەگەڵ کافرەکان بدوێ‌و ئەم ئەم ئاخاوتنەیان ئاراستە بکاو پێیان رابگەیەنێ کە: ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام داوەو پەیامی خۆی گەیاندوە، هیچی تری لەئەستۆدا نەماوە جگە لەوەی سەرگەرمی خوداپەرستی ببێ‌و شوکرو سوپاسی خۆی بۆ خودا ئەنجام بدا، قورئان بخوێنێتەوە! واتە راگەیاندنی بانگەوازیی ئیسلامی لەلایەن پێغەمبەر تەواو بووە، ئێستا پێویستە ئەوان بەخۆیان دا بچنەوە، بیر لەناوەڕۆکی بانگەوازییەکە بکەنەوە، لەئایەتەکانی قورئان ورد ببنەوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَذِهِ الْبَلْدَةِ الَّذِي حَرَّمَهَا﴾ ئەی پێغەمبەر ! بەو موشریکانە بڵێ: نەوەکوو من فەرمانم پێ کراوە ئیللا بەوە فەرمانم پێ کراوە کە: عیبادەتی پەروەردگارو خاوەنی ئەو مەککەیە بکەم: کە کەخودا کردویەتی بەحەرەم‌و جێگای ئەمن‌و ئاسایش‌و ڕێزو نرخی داوەتێ. شەڕو ئاژاوەی تێدا یاساغ کردوە، خوێنی تێدا نارژێ، کەس لەوێ دا ستەم لەکەس ناکا، راوە شکاری تێدا حەرامە نێچیری تێدا ناگیرێ درەختی نابردرێ، باڵندەی ناترسێندرێ راناچڵەکێندرێ، لەوێ دا نابێ کەس هەڕەشە لەکەس بکا، لەهەر چوارلای جیهانەوە میوەو بەرو بوومی بۆ دەهێندرێ. عەرەبەکان بڕوایان بەڕێزداری مەککەو کابە هەبوو، بەچاوی ڕێزەوە تێیان دەڕوانین، شکۆ مەندی‌و ناوو شۆرەت‌و ڕێزداری خۆیان لەمەککەو ماڵی کابە وەردەگرت، بەهۆی کەعبەوە عەرەبەکانی تر ڕێزیان لەقورەیشییەکان دەگرت، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا یەکتاپەرستیان نەدەکردو عیبادەتی دڵسۆزانەیان بۆ ئەو خودایە ئەنجام نەدەدا: کەئەو هەموو نازو نیعمەتەی پێداون‌و کردونی بەخاوەن‌و چاودێری ئەو ماڵە پیرۆزە، لەئایەتەکەدا بەتایبەتی ناوی مەککەی هێنا، بۆ ڕێز لێنان‌و نرخ پێدان، چونکە یەکەم خانوێك کەلەسەر زەوی بۆ عیبادەت تێدا کردن دروست کرابێ لەو شارەدا دروست کراوە، ئەویش کابەی پیرۆزەو رەمزی یەکتاپەرستی‌و یەکیەتی موسوڵمانانە! لەئایەتێکی تردا پەروەردگار کابەی بەماڵی خودا داناوەو دەفەرموێ: ﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ،

الَّـذِي أَطْعَمَهُـم مِّـن جُـوعٍ وَآمَـنَهُم مِّـنْ خَـوْفٍ﴾ (قـريش/٣-٤) ئـیتر پێغەمبـەر ﷺ بیروبـاوەڕی خـۆی وەکـوو پێویـست رادەگەیـەنێو ئـەوە روون دەکاتـەوە: کەئـەو فەرمانی ئاراستە کراوە بەوە عیبادەتی خودای ئەو شارە پیرۆزە بکا، ئـەو خودایـەی بـێ هـاوەڵو بـێ ئیحتیاجـە، خـودای ئـەو شـارە پـیرۆزە خـودای هـەموو بوونـەوەرە، هەموو شتێك هی ئەوەو خاوەنی حەقیقی هەموو شتێکە.

هەروەها ئەوەش رادەگەیەنێ: کەفەرمانی پـێ کـراوە لـەپێری موسـوڵمانان بـێ، دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ كُلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ فـەرمانم پـێ کـراوە کـە: لـەتاقمی موسـوڵمانان بم، خـودا بـەتاكو تـەنها بناسـینو کـەس نەکـەین بـەهاوەڵو هاوشـانی، یەکتاپەرسـت بـینو بەدڵسۆزی گەردنکەچـی فـەرمانو جڵەوگیریـەکانی پـەروەردگار بـین! ئەمـە برِبـڕەی بانگەوازیی منـەو پوختـەی پەیامەکەم بریتییـە لـەوە، هۆکـارو ئـامێری ئـەم بانگەوازییەشـم خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆزە وەکـوو دەفـەرمووێ: ﴿وَأَنْ أَتْلُـوَ الْقُـرْآنَ﴾ فـەرمانم پێکـراوە کـە: قورئـان بخـوێنم، چـونکە قورئـان نامـەی سـەرەکی ئـەم بانگەوازییەیـە، دەسـتورو یاسـای ئایینـە، فـەرمانم پێکراوە شەوو رۆژ بەتەنیاو لەناو ئادەمیزاد دا لەئەو نامەئاسمانییە بخوێنمـەوە، لێ ی ورد ببمەوە، هـەوڵ بـدەم لـەماناکانی حـاڵی بـبم، بەڵگە کـەونیو گەردونیـەکان، بەراورد بکەمو لەڕوانگەی قورئانەوە تێیان بڕوانم. بۆئەوەی ئیمـانم زیـاد بکـا دڵو دەروونم زیاتر روناکی تێبکەوێ، جا ﴿فَمَـنْ اهْتَـدَى فَإِنَّمَـا يَهْتَـدِي لِنَفْـسِهِ﴾ کەسـێك رێگای هیدایەتی گرتەبەرو رِوی لەئیمان کرد ئـەوە بـۆ بەرژەوەنـدیی خـۆی شـارەزا دەبـێو هیدایـەت ئـامێز دەبـێ، کەسـێك ئیمـانم پـێ بێنـێو شـوێنم بکـەوێ ئـەوە بەختەوەرو بەمراز گەیشتووەو ئەمینە لەسزاو عەزابی سەختی من.

﴿وَمَنْ ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنـذِرِينَ﴾ کەسـێکیش گـومڕا بـوو، رێبـازی حـەقو راستی هەڵە کرد، ئیمانی نەهێنا، منی بەدرۆخستەوە، ئایاتی قورئانی رەت کردەوە، ئەوە پێیان بڵێ: هەرکەسە تـاوانی گـومڕایی یەکـەی لەئەسـتۆی خۆیـەتیو بۆخـۆی

بەرپرسیارە، منیش ترسێنەرو راگەیەنەرم، ئەرکی خۆم بەجێ هێناوەو پەیامی خۆمم راگەیاندوە، ئیتر حیسابو لێکۆڵینەوەتان عائید بەخودایە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَ غُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ (الرعد/ ٤٠) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ (هود/١٢)

﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بەو موشریکانە بڵێ: شوکرو سوپاس هەر بۆ ئەو خودایەیە ناوی (الله) یە، سزای کەس نادا مەگەر دوای ئەوەی بەڵگەیان لەسەر راست بکاتەوە، پێغەمبەریان بۆسەر بنێرێ‌و موژدەیان پێ بداو بیانترسێنێ، حەمدو سوپاس بۆ خودایە لەسەر نیعمەتەکانی؛ کەپێ ی بەخشیوم‌و هەرە گرنگەکەیان نیعمەتی پێغەمبەرایەتییە! هەروەها حەمد بۆ خودا لەسەر ئەوە فێری کردوم چۆن ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرم‌و چۆن هەڵس‌و کەوت لەگەڵ ئەم پلەو پایەیەم دا بکەم‌و چۆن پەیامەکەم بگەیەنم، دڵنیا بن خودای مەزن لەوە بەولاوە نیشانەکانی گەورەیی خۆی‌و دانایی‌و دەسەڵاتی رەهای‌و نیشانەی عەزابی سەختی نیشان ئێوە دەدا، بۆتان دەردەکەوێ: کەمن راستگۆم لەپەیامەکەم دا، هەموو شتێکتان بۆ رون دەبێتەوەو دەزانن حەقە، بەڵام کاتێك کەئیمان هێنان سوودی نابێ‌و کەڵکی لێ وەرناگرن، نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت/٥٣) راستەو پەروەردگار راستی فەرمووە، ئەوەتا رۆژ لەدوای رۆژ، ساڵ لەدوای ساڵ، نیشانەی قودرەتی خۆی نیشانی بەندەکانی دەدا، برێ لەنیشانەکانی خودایەتی لەخودی خۆیان داو لەبوونەوەردا نیشانی بەندەکانی دەدا، برێ لەنهێنی بوونەوەری پڕ لەنهێنی‌و سەر سوڕهێنەریان نیشان دەدا.

﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ خودا غافڵ‌و بێ ئاگا نیە لەوەی موشریکەکانی مەککەو کەسانی دیکە دەیکەن، بەڵکوو ئاگادارو زانایە بەهەموو کردەوەیەکیان‌و

هیچی لێ گوم نابێ‌وەلێ سزاو تۆڵە لێ ستاندنیان دوا دەخا بۆ کاتی دیاریکراوو بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی هەرکاتێ وەختی عەزابیان هات دەیانگرێو مۆڵەتیان نادا.

ئەبوحاتەم ریوایەت دەکا دەڵێ: لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (یا أیها الناس لایغترن أحدکم بالله فان الله لوکان غافلاً لأغفل البعوضة والخردلة والذرة) ئەی خەڵکینە! باکەستان بەوە لەخۆی بایی نەبێ: کەخودا بۆ ماوەیەك مۆڵەتی دەدا، وابزانێ خودا لێ ی بێ ئاگایە، چونکە ئەگەر خودا غافڵ بویایە مێشوولەو خەردەلەو گەردیلەی فەرامۆش دەکردن! دەڵێن: ئیمام ئەحمەد ﷺ زۆرجار لەبەر خۆیەوەو بۆکەسانی دیکە ئەم دوو دێرە شیعرەی دەخوێندەوە.

| | |
|---|---|
| اذا ماخلوت الدهر یوماً فلاتقل | خلوت ولکن قل علي رقیب |
| ولا تحسبن الله یغفل الساعة | ولا أن ما یخفی علیه یغیب[1] |

**بەیارمەتی خودا سورەتی (النمل) تەواوبوو خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواوکردنی سورەتەکانی تر...**

[1] تەفسیری ئیبنوکەثیر ج ٣/١٣٨٩ کۆتایی سورەتی (النمل).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

(سورەتی القصص)

﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾

ئەم سورەتە ناونراوە (القصص) چونكە چیرۆكی حەزرەتی موسای (عليه السلام) تێدایە بەشێوەیەكی سەرنج ڕاكێش هەر لەڕۆژی لەدایكبوونیەوە تادەكرێتە پێغەمبەرو نیگای بۆ هاتووە، ئەمجار ڕوبەڕوبوونەوەی لەگەڵ فیرعەونو دارو دەستەكەی دا كەبەئاشكرا ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە: پەروەردگار یارمەتیدەرو پشتگیریكاری خاوەن باوەڕانە، موسوڵمانان چاودێری دەكاو كافران ڕیسوا دەكا!

هەروەها چیرۆکی قارونی خاوەن سامان و لەخۆبایی بووی تێدایە، ئەویش وەکوو فیرعەون بەهۆی سامانداریی طوغیانی کردو لەخودا یاخی بوو! خودا ئەویشی وەکوو فیرعەون لەناو برد!

پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی (النمل) و (الشعراء)ەوە لەم ڕووەیە: ئەم سورەتە شیکەرەوەو تەفصیل دەرە بۆئەو چیرۆك و سەرگورشتانەی حەزرەتی موسا ﷺ کە لەسورەتی (النمل)و (الشعراء) دا باسیان لێوە کراوەو بەکورتی ڕانوێندراون، سەرەتا دەست دەکا بەشیکردنەوەی لەخۆبایی بوونی فیرعەون و ستەمکاری و طوغیان و لەخودا یاخی بوونی، ستەمکاری گەییشتە ئاستێك نێرینەکانی نەتەوەی ئیسرائیلی سەردەبڕی و مێینەکانی دەهێشتنەوە بۆ خزمەت و کارەکەری! بۆیە حەزرەتی موسا ﷺ هەر کە لەدایك بوو، بەزارۆکی دایکی لەترسی سەربڕین خستیە ناو صندوقێکەوەو بەئاوی نیلی دا دا، دوایی فیرعەون صندوقی گرتەوەو پەروەردەی کرد تاگەییشتە تەمەنی لاوی و بەهەڵە ڕۆژێك قبیطییەکی لەدەست کوژراو هەڵات بۆ وڵاتی مەدیەن و لەوێ بوو بەشوانی حەزرەتی شوعەیب و کچەکەشی مارە کردو دە ساڵ شوانی بۆ کردو دوایی گەڕایەوە بۆ میصرو لەڕێگا لەلای کێوی (توور) خودا نیگای بۆ کردو کردی بە پێغەمبەرو ڕەوانەی کرد بۆ سەر فیرعەون ... هتد.

ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتەکانی پێش خۆی سورەتی (النمل) و (الشعراء)دا یەك دەگرنەوە لەبواری چەسپاندنی بیرو باوەڕو یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی و زیندوبوونەوە، ئەمەش لەدوو توێی چیرۆکی پێغەمبەرەکاندا، هەروەها ڕونکردنەوەو شیکردنەوەی ئەو بەڵگەو دەلیلانەی ئەم بنەمایانە دەچەسپێنن.

سورەتەکە بەشێوەیەکی گشتی و سیمای سەرەکی تێ یدا شیکردنەوەی چیرۆکی حەزرەتی موسایە ﷺ لەگەڵ فیرعەون دا کە: لەڕاستی دا ئەم چیرۆکە نموونەی صیراعی هێزی لەخۆبایی بوو کەلەفیرعەوندا خۆ دەنوێنێ لەگەڵ هێزی بێ‌وەج و

بێ دەسەڵات کەلە حەزرەتی موسادا ﷺ خۆدەنوێنێ، بەڵام هێزی لەخۆبایی بوو پشتی بەبەتاڵ بەستووەو یارمەتیدەرانی شەیتانو سەربازەکانێ، هێزی بێ وەج و بێ دەسەڵات پشتی بەخودا بەستووەو یارمەتی لەخوداوە وەردەگرێ، بێگومان فیرعەون بەپشتیوانی هێزی خۆی طوغیانی کردو لەخودا یاخی بوو، خۆی بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل دا سەپاندو دەستی کرد بە چەوساندنەوەیان، جۆرەها تەعذیبو ئەشکەنجەی دان، نێرینەی سەر دەبڕین مێینەکانی دەهێشتنەوە. بەئەوپەڕی شێوە زەلیل کردنو چەوساندنەوە لەگەڵیان جوڵایەوە، هەتا پەروەردگار حەزرەتی موسای بۆ رەخساندو کردی بە پێغەمبەرو مەعجیزەی جۆراو جۆری پێدانو رەوانەی کرد بۆسەر فیرعەونو دارو دەستەکەی، ئەوانیش حەزرەتی موسایان بەدرۆ خستەوەو ئیمانیان پێ نەهێناو لەئاکام دا خودا لەناو دەریادا خنکاندنی.

هەڵوێستی فیرعەون دەق دەشوبهێتە هەڵوێستی قورەیشییەکان لەبەرامبەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەددا، ئەوەتا وێڕای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەموعجیزەی ئاشکراو نمایانەوە بانگەوازیی قورەیشییەکانی کرد، کەچی ئەو نەفامانە پەیامەکەیان رەت کردەوەو وتیان: سیحربازو جادوگەرە، بەبیانووی هیچ و پوچ و بێ بناغەوە پشتیان لەئیمان پێ هێنانی هەڵکرد.. ئیتر پەروەردگار هەڕەشەی لێکردنو لەسەر زوبانی پێغەمبەر ﷺ پێ ی راگەیاندن کە: ئەگەر ئیمان نەهێنن وێنەی عەزابی فیرعەونیان بۆسەر دەنێرێ، ئەوەشی بۆ رونکردنەوە: کەداب و نەرێتی خودا دەربارەی هەموو نەتەوەیەك واهاتووە: تاترسێنەر نەنێرێ و بیانوویان نەبڕێ، سزایان نادا، هەرکاتێ پێغەمبەری بۆسەر رەوانە کردنو بانگەوازی کردنو موعجیزەو بەڵگەی راستی پێغەمبەرایەتی خۆی نواندو ئیمانیان پێ نەهێنا ئیتر خودا عەزابیان دەداو بەقاری خۆی دەیانگرێ.

ئەوەشی رونکردەوە کە: هەڵبژاردنی پێغەمبەران بەویستی خودایەو خودا بۆخۆی دەزانێ: کێ شیاوی پلەو پایەی پێغەمبەرایەتییە. نەك بەویستو ئارەزۆی

موشریکەکان، ئەمجار برێ بەڵگەی لەسەر تاكو تەنهایی خودای مەزن هێنانەوەو هاتەسەر رانواندنی چیرۆکی قارونو ئاکامو سەرەنجامی ئەویشی راگەیاندو کۆتایی هەردو چیرۆکەکانی بەراگەیاندنی چەند مەبدەئێك هێنا کە: بریتی بوون لەوەی پاداشی قیامەت بۆ ئەوانەیە لەدونیادا طوغیان ناکەنو فەسادو ئاشوب نانێنەوە.

بڕوا بەتاكو تەنهایی خوداو زیندو بوونەوە، رێگای بەختەوەری یە، ئەم جیهانە کۆتایی دێو سیستەمی تێك دەچێو جگە لەخودا کەس نامێنێو پاش ماوەیەك هەموو ئادەمیزادان زیندو دەکرێنەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە.

دەفەرموێ: ﴿طسم﴾ لەوەپێش چەند جارێك لەبارەی ئەم جۆرە پیتە (مقطع)انەوە دواوین، مانای هەرە وێچوو دلگیر ئەوە بوو کە: پەروەردگار تەحەددای ئادەمیزادو جندۆکە دەکا، دەفەرموێ: ئێمە قورئانمان لەم پیتانە پێك هێناوەو ئەو کەلامە موعجیزەیە، دەئێوەش ئازابن کەلامێکی ئاوا دابێنن!

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ﴾ ئەوەی بەنیگا بۆت دێو بەسەرتا دەخوێندرێتەوە ئایاتی قورئانی رەوانو سەرئاسایە، ئایەتی ئەو کتێبەن کە: حەقیقەتو راستی ئایین رون دەکاتەوە، هەواڵی رابووردو داهاتوو رادەگەیەنێو کارو باری ئایین شی دەکاتەوە. ئەو راستییە دەچەسپێنێ کە: هێزو توانا تەنیا هێزو توانای خودایە هەر ئەو پەروەردگارو خاوەنی دونیاو قیامەتە، لەشکرو هەیبەتو شکۆمەندی خاوەن توانایان کەمەندکێشی هێزی خودای تاكو تەنهان!

﴿نَتْلُو عَلَيْكَ مِنْ نَبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ برێك لەچیرۆکی موساو فیرعەونت بۆ باس دەکەین، بەشێوەیەکی حەقو راستو واقیعی، چۆن روی داوەو چۆن بووە، ئاوا بۆتی دەخوێنینەوە، هەروەکوو بۆخۆت ئاگاداری روداوەکانی بوویی ئاوا، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی ئەو خەڵکە بڕوا بەپەیامەکەت بکەنو موسوڵمان ببنو دڵیان بەقورئان ئارام بگرێ.

بێگومـان پـەروەردگار لـەم سـورەتەدا هەنـدێکی لەچیرۆکی موسـاو هـارون ﷺ گێڕایـەوە بـۆ پەنـدو عیـبرەتو بەڵگـە هێنانـەوە لەسـەر راسـتی پێغەمبەرایـەتی حەزرەتی موحەممەدو ئامارەکردن بۆ ئەو راستیە کە: ئەم قورئانە نیگای خودایەو لەخوداوە هاتووەو کەلامی بەشەر نیە.

هەرچـەند قورئـان بەسـەر هـەموو کـەس دا دەخوێندرێتـەوە بـەڵام بۆیـە خوێندنەوەکـەی تایبـەت کـردوە بەنەتـەوەی موسـوڵمانو ئیمانـدار چـونکە ئـەوان پەندی لێ وەردەگرن، کەسێك دڵی کراوە نەبێ، گوێچکەی شنەوای حەق نەبێ سـوود لەخوێندنەوەی قورئان نابینێ، کەسێك ئامادەباشـی ئیمانهێنـانی تێدا نـەبێ، پشت لـەئامۆژگاری هـەڵبکا، لـەخۆی بـایی بـێو بڵـێ قورئـان سـیحرو جـادوە هـەرگیز بـەقورئان پەنـدئامێز نـابێ، چـەندێك ئایـەتی بـۆ بخوێندرێتـەوە، چـیرۆکی رابـووردوانی بـۆ بگێڕدرێتـەوە، کـەڵکی لێ وەرنـاگرێو ناچـێتە دڵیانـەوە.. وەکـوو لەئایەتێکی تردا پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّـةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾ ئەمجار چیرۆکەکە نمایش دەکاو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ فِرْعَـوْنَ عَـلا فِـي الأَرْضِ﴾ بێگومان فیرعەون کە پاشاو مەلیکی میـصر بـوو، بـۆغرا بـوو، یـاخی بـوو، لەخاکی میصردا فەسادو ئاشووبی بـەرپا کـرد، سـتەمکاریی پـەیڕەو کـرد، ﴿وَجَعَـلَ أَهْلَهَا شِـيَعاً﴾ دووبـەرەکی پەرتـەوازەیی خـستە نـاو دانیـشتوانی میـصرەوە، پارچـە پارچـەی کـردنو خـۆی بەسـەردا سـەپاندن، هـەمووی دەچەوسـاندنەوەو بـۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاری دەهێنان، یاسـای (فـرق تـسد) ی لـەناودا بڵاو کردنـەوە، تۆوی فیتنەیی یەتی لەناودا چاندبوون، کوردی وتـەنی (مـێش کێشەیان تـێ کـەوێ پیـاو خـەوی لـێ دەکـەوێ) ئەمـەش دابو نـەریتی هـەموو طاغـوتو داگیرکەرانـە، دەیانـەوێ بـەهۆی فیتنـە نانـەوەو دژایـەتی خـستنە نـاو دانیـشتوانەوە، خۆیـان بسەپێننو خەڵکەکە بخەنە ژێرباری خۆیانەوە... ئەمەش بەپێچەوانەی شەریعەتی ئیـسلامو ئـایینی خودایـە، چـوونکە ئـایینی ئیـسلام لەسـەر بنـەمای یەکیـەتیو

هەمئاهەنگیو خۆشەویستیو لێ بوردنو عەدالەتو وەفاداریو دڵ صاف لەنێوان کاربەدەستو جەماوەردا، دامەزراوە، هەرکاتێ ئەم بنەماو مەبدەئانە لەنێوان سەرۆكو رەعییەت دا بەرجەستە بوون، کۆمەڵگا بەئاشتیو ئارامی ژیان بەسەر دەبەن، حاکم دڵ ئارامەو بیر لەپێشخستنو داهێنانو دەستەبەر کردنی پێداویستی گەلو وڵات دەکاتەوە، گەل بەئارامی دەژیو هەوڵو تەقەڵلای پێشخستنی وڵات دەدەنو لەهەموو بوارەکانی ژیان دا سەرکەوتن بەدەست دێنن.

﴿يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ﴾ دابو نەریتی فیرعەون وابوو: کۆمەڵێکیانی دەچەوساندنەوە بەهەموو جۆرێك ئازارو ئەشكەنجەی دەدان.

بێگومان بەتەواویی نازاندرێ ئەو فیرعەونەی رووداوەکانی چیرۆکەکەی وەپاڵ دراون کام فیرعەونەیەو لەچ رۆژگارو سەردەمێك دا ژیاوە، وادیارە زانیاری لەوبارەوە پێویست نیە، دەستنیشانکردنی چەرخو سەردەم بۆ چیرۆکەکانی قورئان مەبەستو ئامانج نینو بەگرنگ سەیر ناکرێن، ئەگەر سوود لەدیاریکردنی سەردەمو رۆژگاردا هەبوایە، قورئان لێی بێدەنگ نەدەبوو! ئەوەندەمان بەسەر: کە ئەم رۆژگارە دوای سەردەمی یوسف ﷺ بووە، چونکە لەسەردەمی ئەودا باپیرە گەورەی نەتەوەی ئیسرائیل: کە حەزرەتی یەعقووبە ﷺ هاتووە بۆ میصرو نەتەوەی ئیسرائیل لەکورەکانی ئەو کەوتوونەوە نەتەوەیەکی زۆرو گەورەیەیان پێك هێناوەو لەسەردەمی فیرعەون صەدان هەزار کەس بوون.

ئەم فیرعەونو ملهوڕە لەخودا یاخی بووە، بۆغرا بوو خۆی بەزلزانی، ئاشوبی نایەوە، هەموو دانیشتوانی میصری لێك کردن بەدوژمنو گرۆ گرۆی کردن، هەر تاقمو گرۆهێکی بۆ بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆی بەکارهێناو ئەرکێکی خستە سەرشانی، نەتەوەی ئیسرائیلی لەچەوساندنەوەو ژێربار کردن دا، بەشی شێریان پێ برابوو، لەژێر تیری چەوساندنەوەدا دەیان ناڵاندو زیاتر لەهەموو کەس ئازاریان دەچەشت، چونکە بیرو باوەڕیان لەهی فیرعەونو نەتەوەکەی جودابو، ئەوان لەسەر ئایینی باپیرە گەورەیان حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بابە گەورەیان حەزرەتی

یەعقووب ﷺ بوون، هەرچەندە ئایینەکەیان چەواشەیی و ئینحیرافی تێدا پەیدا بووبوو، بەڵام تارمایی یەکی بیروباوەڕ بە خودایان لامابوو، ئینکاری خودایەتی فیرعەونیان دەکردو ئامادە نەبوون بەدڵسۆزیی بەندایەتی بۆ بکەن. لەلایەکی ترەوە فیرعەونی ملهوڕ هەستی بەخەتەرو هەڕەشەیەك لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی خۆی کرد بوو، وجودی نەتەوەی ئیسرائیلی لەمیصردا بەو چڕی و زۆرییە بەخەتەر دەزانیّ لەسەر فرمانڕەوایی و پاشایەتییەکەی، نەیدەتوانی دەریان بکا، چوونکە ژمارەیان بەسەدان هەزار بوو، ئەگەر دەری بکردنایە پاڵیان لەدوژمنی فیرعەون دەدا، ئەوکاتە خەتەرەکەیان زۆرتر دەبوو، بۆیە ڕێگایەکی دڕندانەو جەهەننەمی دۆزییەوە بۆئەوەی ئەو خەتەرە لەخۆی و مەملەکەتی دووربخاتەوە، ئەوە بوو هات ئەرکی قورس و کاری گرانی خستە ئەستۆیان و بەتەواوی زەلیلی کردن، چەند شێوە تەعذیبی تێدا بەتاقی کردنەوە، سەرباری ئەوەش هات سامناکترین شێوەی قەلاچۆی تێدا داهێنان ئەویش ئەوە بوو بڕیاری دا هەر منداڵێکی نێرینەیان لەدایك بیّ یەکسەر سەرببڕدریّ و مێینەکانیشیان بهێڵدرێنەوە، بۆئەوەی ژمارەی پیاویان کەم و ژمارەی ئافرەتیان زۆر بیّ، هێزو توانایان لاوازبیّ!

دەگێڕنەوە کە: فەرمانی کرد مامانی نەتەوەی ئیسرائیل لە ئافرەتانی قیبطی بن و هەر لەگەڵ نێرینەیەك لەدایك بوو، خێرا هەواڵی پیّ بدەن ئەویش یەکسەر یاساوڵ و جەللادەکانی بنێریّ زارۆکی تازە لەدایکبووی بیّ تاوان سەرببڕن!! پاش ماوەیەك دارو دەستەو راوێژکارەکانی پێیان گوت: ئەگەر لەسەر ئەم یاسایە بڕۆین پاش ماوەیەکی تر نەتەوەی ئیسرائیل پیاویان نامێنن و کەس نابیّ خزمەتمان بکاو ئەو ئەرکە قورسانەی ئێستا پیاوەکانی ئەوان ئەنجامی دەدەن پاش ماوەیەکی تر دەبیّ پیاوانی قیبطی پیّ ی هەڵسن؛ ئەمجار فیرعەون بڕیاریدا کە: هەر ساڵە ناساڵێك منداڵەکانیان سەربڕن بۆئەوەی نێرینەکانیان گەرابڕاو نەبن، ئەوەندە نێرینەیان تێدا بمێننەوە بەشی خزمەتکاری و ئەنجامدانی ئەرکە قورسەکانیان بکەن. ئیتر حەزرەتی هارون ﷺ لەساڵێك دا لەدایك بوو کەساڵی هەڵبواردن بوو،

لەوساڵەدا نێرینەکانیان سەر نەدەبڕدران، ساڵی دوایی کەساڵی منداڵە نێرینە سەربڕین بوو حەزرەتی موسا ﷺ لەدایك بوو؛؛ بەڵێ لەم بارودۆخە ناهەموارەی کەنەتەوەی ئیسرائیل تێی کەوتبوونو بەم شێوە قەڵاچۆ دەکرانو کار گەیشتە ئەوەی فیرعەون ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ﴾ نێرینەکانی سەردەبڕینو مێینەکانی دەهێشتنەوە ﴿إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ بەڕاستی فیرعەون لەپێڕی موفسیدو تاوانباران بوو، نەتەوە فڕکەرو وڵات وێرانکەر بوو، ئالەم بارو دۆخە ناهەموارەدا حەزرەتی موسا ﷺ لەدایك بوو فیرعەونی ملهوڕ بەخەیاڵی پووچی خۆی، بەم کارە دڕندانە کەس نەکردەی خۆی، بەربەستی خەتەری سەر مەملەکەتو گیانی خۆی. دەکرد بەڵام ئەوەی لای فیرعەون خەیاڵ بوو لای خودا بەتاڵ بوو، ویستی پەروەردگار پێچەوانەی ویستی فیرعەونە تەقدیری خودا لەپلانی فیرعەون جوداوازە، ملهوڕو طاغییەکانی جیهان بەهێزو توانای خۆیان بوغرا دەبنو قودرەتو دەسەڵاتی خودایان لەبیر دەچێتەوە، پێیان وایە دەتوانن ئەوەی بۆخۆیان پێیان خۆشە دەستەبەری بکەنو ئەوەی بۆ دوژمنەکانیان دەوێ ئەنجامی بدەن!! ئەمە دابو نەریتی هەموو ستەمکارو طاغوتێکی جیهانە بەدرێژایی مێژوو ئەمڕۆشی لەگەڵ دا بێ، ستەمکاران هەمیشە لەقەلەقو دڵە ڕاوکێ ی لەدەستدانی کورسیو دەسەڵاتەکەیانن، بۆ بەرقەرار بوونی کورسی ستەمکارییان ئەم جۆرە کارانە ئەنجام دەدەن، چونکە بڕوایان بەقەزاو قەدەری خودا نیە، ئیمانو باوەڕیان بەدەسەڵاتی ڕەهای پەروەردگار نیە، تەنیا بەبیری تەسکی خۆیان هەڵسو کەوت دەکەن! ئەگەر تۆزێك بیر لەنیشانەکانی بوونەوەر بکەنەوە، ئیمان بەخودا دڵیان ڕوناك بکاتەوە، بەدڵنیاییو ئارامی ژیان بەسەر دەبەنو لەسەر زەوی دا فەسادو ئاشوب بڵاو ناکەنەوەو چ پێویستیان بەو ستەمکاریو چەوساندنەوە نابێو وڵات وێران ناکەنو گەلو نەتەوە قەڵاچۆ ناکەنو ژینگە ناشێوێنن، باغو بێستانو دارو درەخت سوتماك ناکەن، کانیاوو دیمەنی دڵڕفێنو قەشەنگو سروشت خاپور ناکەن!!

بێگومان لەڕوانگەی ئەو بیرو بۆچوونە تەسكو ستەمكارییە بوو: كەلەدوای ساڵی (١٩٧٧ز) بەم لاوە دەست كرا بە بەراگواستنی لادێیەكانی كوردستانی عێراقو وەرزێرو سەپانو كشتیارانیان لەكۆڵێتو لانەی خۆیان هەڵكەندنو لەموجەمەعاتی زۆرە ملێیان پەستاوتنو ئەمجار بەربوونە روخاندنی ئەخلاقو رەوشتی رەسەنیان؛ پێش دروستكردنی خەستەخانەو قوتابخانەو مزگەوت، یانەی خواردنەوەو شوێنی قومارو مەیسیریان بۆ كردنەوە؛؛ نەیاندەهێشت لادێیەكان بچنەوە دارگوێزو دارقۆخو هەنجیرو مێوو هەردو شێوی خۆیان بەخێو بكەن، لەزیخاڵكو چەقەنو رەقەنان سنەوبەرە زەرەیان بەموجەخۆرانی داشیرەی كشتو كاڵ دەناشت، رەزو باخی برزوتو كورە كاڵاوو هەورامانو خۆشناوەتیو برواری بالاوژێریو گەڵێ شوێنی تریان سوتماك كردبونو لەم لاو لەولا لەشوێنی روتەنو بیرۆن سنەوبەری گرنكۆكەیان دەناشتنو پڕوپاگەندەی ئەوەشیان دەكرد گوایە كودرستان زەنوێر دەكەنەوە ئەوەش بۆ پارێزگاری كردنی كورسی ستەمو زۆرداریو تەنفیذكردنی سیاسەتی چەپو شۆفێنی بوو.

رەببی مووی لێ بێ زوبانیو پەنجەكانی هەڵوەرێ

هەركەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

بەڵام كوردی گوتەنی: ئەوەی لای عەبدان خەیاڵە لای خودا بەتاڵە. چەرخو رۆژگار سوڕانو خودا كارێكی رەخساند پیلانی كوردستان وێران كردنو راگوێزانی هەزارانی كورد لێك هەڵوەشاو راپەڕین دروست بوو، جەماوەری كوردستان هەوای ئازادییان هەڵمژیو بەئازادیو راشكاوی چوونەوە سەر مەڵبەندی باوكو باپیری خۆیانو مڵكو ماڵی خۆیان ئاوەدان كردەوەو لەجاران باشتر رەزو باخەكانیان دەكێڵدرێنو رەوەندەكان گەرمێنو كوێستان دەكەن، شوانو پەزەوانەكان لەلاپاڵو قەدشاخان مەڕو بزنەكانیان شەوێن دەدەن.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار پێنج رەوشتی ناشرینو نەكڵەوەتی بۆ فیرعەونی ستەمكار بەیان كرد: كەبریتی بوون لەخۆبەزلزانیو چەوساندنەوەی

ژێردەستەکانیو کوشتنی زارۆکی نێرینەو هێشتنەوەی مێینەو فەساد نانەوەی گشتی. لەبەرامبەردا پێنج نیعمەتی خۆی بۆنەتەوەی ئیسرائیل رادەنوێنێ کە: بریتی بوون لەرزگارکردنیان لەستەمو دەستەبەر کردنی فەرمانڕەوایی بۆیان دوای لەناو بردنی فیرعەونو دارو دەستەکەی، کردنیان بەمیراتگریی ولاتی میصرو شام، گرتنە دەستی دەسەلات لەو ولاتە بەرفراوانو پیرۆزو خۆشەدا، ئیظهار کردنی ئەو هەڕەشەو ترساندنەی فیرعەونو هامانی پێ ترسێندرانو هێنانەدی ئەو هەڕەشانە.

١- دەفەرموێ: ﴿وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ﴾ ئیرادەو ویستی ئێمە وابوو: کەفەضلو نیعمەتی ئازادیو فرمانڕەوایی ببەخشین بەچەوساوەکانی نەتەوەی ئیسرائیل؛ ئەوانەی فیرعەون لەوەپێش ژێرباری کردبوونو بەجۆرەها شێوە دەیچەوساندنەوەو ئازارو ئەشکەنجەی دەدان.

٢- ﴿وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً﴾ ویستمان وابوو ئەوانە بکەینە فرمانڕەواو کاربەدەست، هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەری کارو باری ئایینیو دونیا.

٣- ﴿وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ بیانکەین بەمیراتگرو خاوەن دەسەلات لەشوێنی فیرعەونو تاقمەکەی، هەموو ئەو ولاتو هەرێمانەی لەوەپێش لەژێر کۆنترۆڵی فیرعەون دا بوون، لەفیرعەونمان ستاندنەوەو بەخشیمان بەنەتەوەی ئیسرائیل.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ (الاعراف/١٣٧)

٤- ﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ فرمانڕەواییو دەسەلاتیان بۆ دەستەبەر بکەین لەسەر زەوی میصرو شام بەئارەزۆی خۆیان ئەسپی دەسەلاتیانی تێدا هەلینگ بدەن.

٥- ﴿وَنُرِي فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾ نیشانی فیرعەونو هامانو دارو دەستەکەیان بدەین ئەو شتەی لێ ی دەترسان کە: لەدەستدانی فرمانڕەواییو ملكو سامان بوو لەسەر دەستی منداڵێکی ئەو نەتەوەیە، ئەوە قەزاو

قەدەری پەروەردگارە، خۆپاراستنی لێ ناکرێ، بڕیاری پەروەردگارەو لەئەزەل دا دراوە، دەبێ دەسەڵاتو فرمانڕەوایی فیرعەون بەدەستی کەسێك لەناوبچێ کە: فیرعەون جۆرەها نەخشەو پلانی دانان بۆئەوەی ئەوکەسە سەرهەڵنەدا، بەهۆی ئەوەوە هەزاران زارۆك بەمەلۆتکەیی کێردییان لەگەردن دراو بەناڕەوا سەربڕدران. بەڵێ ویستی خودا وابوو: کە پەروەردە بوونو پێگەیشتنی حەزرەتی موسا ﷺ لەماڵی فیرعەون داو لەنوێنو پێخەفی ئەودا پێ بگا، دەستی قودرەت لەماڵی فیرعەون دا پەروەردەی کردو پێ ی گەیاند، بەهیلاکچونو فەوتانی فیرعەونو لەشکرەکەی بەدەستی ئەو کوڕە بەناز پەروەردە بوو. بۆئەوەی بزاندرێ کە: تەنیا بڕیاری خودای ئاسمانەکانو زەوی دێتەجێو هەرچی ئەو نەیەوێ بێتەدی هەرگیز نایەتەدی. بەڵێ حەزرەتی موسا ﷺ لەسایەی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی باڵی کێشا بوو بەسەر نەتەوەی ئیسرائیل دا لەدایك بوو، حەزرەتی موسا ﷺ چاوی بەجیهان هەڵێناو خەتەر دەورەی دابوو، مردن چاوشارکێ ی لێ دەکرد، کێردی جەللادەکانی فیرعەون لەگەردنی نزیك بوو، ئێستانا ئێستا پێ ی دەزانن و ملی بەکێرد هەڵدەبرِن، ئەوەش دایکە بێ دەسەڵاتو بێ چارەکەیەتی زەمیستانەو تازە منداڵی بووە هەمیشە لەدڵە راوکێ دایەو ترسی ئەوەی هەیە هەواڵی لەدایکبوونی موسای کوڕی بگاتە بەر گوێی جەللادەکانی فیرعەونو هەمیشە دڵی لەسەر سەد لێ دەدا، لەترسی کێردی جەللادەکان خەو لەچاوی ناکەوێ، ئەوەتا منداڵی ساوای لەناو ئەو خەتەرو ترسەدایەو ناشتوانێ هیچ پارێزگارییەکی لێ بکا، نازانێ چۆنی بشێرێتەوە، ناتوانێ نەهێلێ بگری، منداڵ تازە لەدایکبووە بەسروشت تاوە ناتاوێك دەگریو ناتوانێ دەنگی کپ بکاتەوە، کوونە مشکی لێ بوونە قەیسەریو هەرچی فکر دەکاتەوەو سەر دێنێو دەبا ڕێگاچارەیەك نادۆزێتەوە منداڵی ساواو تازە میوانی پێ بپارێزێ..

ئێستا کاتی ئەوەهاتووە دەستی قودرەتی پەروەردگار تـەدەخول بکاو بەئاشـکرا بکەوێتـە گـەڕو بارودۆخەکـە وابگـەنجێنێ چـی تـر دایکـی حـەزرەتی موسـا ﷺ لەدڵەراوکێ دا نەمێنێتەوە؛ دەی بابزانین لەحەلقەی داهاتوودا چی ڕوودەدا؟

## فڕێدانی موسا بۆناو زێی نیلو دوایی گێڕانەوەی بۆلای دایکی، مژدەپێدانی بەوە کەئەم زارۆکە دەکەینە فرستادە

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ

فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾

بەڵێ وائێستا دەستی قودرەت (تدخل) دەكاو پەیوەندیی دەكا بەدایكی ترساوو حەجمین لێ هەڵگیراو، نەخشەی یەزدانی دەخاتە ناو دڵیەوە، ڕێگای نیشان دەدا، خەمو ترسی لێ دەڕەوێنێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ نیگامان بۆ دایكی موسا ﷺ كرد، خستمانە دڵیەوە كە: بەم شێوە هەڵسو كەوت لەگەڵ واقیعەكەدا بكا، شیری بداتێو چەندێكی بۆ دەكرێ پەنهانی بكاو نەهێڵێ یاساوڵەكانی فیرعەون پێ ی بزانن.

ڕیوایەتكراوە سێ یان چوار مانگ بەنهێنی شیری پێ داو پەروەردەی كرد.

﴿فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ﴾ هەركاتێ ترسای لەوەی جاسووسەكانی فیرعەون، یان جیرانەكانت بەمنداڵەكەت بزانن و خەبەر بەفیرعەون و جەللادەكانی

بدەن ئەوە تۆ فرێی دەرە ناو نیلەوە ﴿وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي﴾ ترسی لەناوچونیت نەبێ ئێمە پارێزگاری دەکەین، خەمی دابڕانو لێ دوور کەوتنەوەیت نەبێ.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: خانووی دایکی موسا ﷺ لەسەر کەناری نیل بووە، صندوقێکی بۆ دروست کردبوو لەناوی دا بیشکەیەکی بۆ تەرتیب کردبوو، شیری دەدا بەمنداڵەکەی، هەرکەیەکێك لەوانە لێیان دەترسا دیدەنیان دەکرد، خێرا منداڵەکەی دەخستەناو صندوقەکەوەو دەم ئاوی نیلی دەدا، بەگوشێکی درێژ دەیبەستەوەو لایەکی گوشەکەی لای خۆی شەتەك دەدا. رۆژێك یەکێك لەوانەی ترسی لێیان بوو چووە ماڵی، ئەویش خێرا خستیە ناو صندوقەکەوەو دەم نیلی داو لەبیری چوو لای خۆی گووشەکە ببەستێتەوە، ئاوەکە بردی هەتا گەیاندییە لای ماڵی فیرعەون، دارو دەستەکەی فیرعەن صندوقەکەیان گرتەوەو بردیان بۆ ماڵی فیرعەون، نەیانکردبوەوە تابزانن چی لەناو صندوقەکەدایە، ترسا بوون لەوەی بەبێ ئاگاداری ژنی فیرعەون بیکەنەوە، نەوەکوو موحاسەبە بکرێن، کاتێك خێزانی فیرعەون سەری سندوقی هەڵدایەوە بینی منداڵێکی جوانو خوێن شیرینو روح سووك، هەر کەچاوی پێ کەوت پەروەردگار خۆشەویستی منداڵەکەی خستە دڵی ژنی فیرعەونەوە، فیرعەون کەبەوەی زانی ویستی سەری ببڕێ، بەڵام ژنەکەی چووە بن کلێشەیەوەو لێ ی پاڕایەوە کەسەری نەبڕێ، ئاخاوتنی لەگەڵ کرد تاوازی لەسەر بڕینی هێنا.

﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ مەترسێ منداڵەکەت دەم ئاوی نیل بدە، ئێمە لەدوایی دا دەیگێڕینەوە بۆلای خۆت، کارێکی وادەڕەخسێنین: کەخۆت ببیە شیردەرو بەخێوکەری تاگەورە دەبێو پێ دەگا، لەدوایی دا دەیکەین بە پێغەمبەرو فروستادەی خۆمان بۆسەر دانیشتوانی وڵاتی میصرو شام.

ئایەتەکە دوو فەرمانو دوو نەهیو دووهەواڵو مزگێنی لەخۆگرتوون. فەرمانەکانی (أرضعيه، ألقيه) یە، نەهیەکانی ﴿وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي﴾ یە

هەواڵەکان ﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ مزگێنی یەکانیش لەناو دوو هەواڵەکەدان. ﴿فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾ دارو دەستەی فیرعەون موسایان لەناو نیل دا گرتەوەو بردیانەوە بۆ ماڵو بەخێویان کرد، وەدایەنیان بۆ پەیدا کرد، تا لە ئاکامدا ببێتە دوژمنو ناحەزیان، بەهۆی تێکۆشانو بەربەرەکانی بیرو باوەڕەکەیانو تووشی غەمو پەژارەیان بکا بەخنکانو لەدەستدانی دەسەڵاتو مڵكو سامانیان (لام) ی (لیكون) لامی عاقیبەی پێ دەگوترێ، لامی تەعلیلو بایس نیە، چونکە فیرعەون هەرگیز بەو هەڵگرتنەوەو لەخۆگرتنو بەخێوکردنە مەبەستی ئەوە نەبوە لەئاکام دا ببێتە دوژمنیانو لەناویان بەرێو خەمو خەفەتیان دەرخوارد بدا، وەلێ خودا وای رەخساند: کەبەدەستی خۆیان دوژمنی خۆیان هەڵبگرنەوە، بەنانو ئاوو جلو بەرگی خۆیان دوژمنی خۆیان پەروەردە بکەن، بۆئەوەی لەئاکام دا ببێتە هۆی لەناو چونو دڵتەنگییانو ئەوەی چاوەڕوانی بون بێتەجێ.

زومەخشەری دەفەرموێ: (لام) ی (لیکون) لامی تەعلیلو بایسە، بەلام بەشێوەی مەجاز نەك بەحەقیقەت.

﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ﴾ بێگومان فیرعەونو هامانو دارو دەستەو تاقمو کۆمەڵیان تاوانبارو ستەمکار بوون، پەروەردگار عیقابی دان، بەوە کەدوژمنی گیانی بەگیانی خۆیان بەدەستی خۆیان بەخێوکرد.

یان مانای ئەوەیە ئەوان بەهەڵە چوون نەیاندەزانی کەلەسەر دەستی ئەوەی بەخێوی دەکەن لەناو دەچن.

بەلام مانای یەکەم لەهەموو ماناکانی ترویچوو ترە، سوبحانەللا! هەر خودا خۆی کەریمی کارسازەو خۆی هۆکارەکان دەرەخسێنێ، ئەو فیرعەونەی خۆی بەخودا دەزانیو ئەوەندە ستەمکارو جەببار بوو کەبووەتە نموونەی ستەمکاران، کەچی تائەوپەڕی سنوور گوێ بیستی ژنەکەی بوو، هەر لەو رۆژەوەی کەئەو ئافرەتە سەللارە چووە ناوباڵەخانەی فیرعەونوبوو بەهاوسەری دڵو دەروونی

فیرعەونی داگیر کردو بەئوسلوبی ئافرەتانەی خۆی بەسەریدا زاڵ بوو، فیرعەونی واکەوی کردبوو بارە گوێزی لێ بنایە خرەی نەدەهات. ئیتر خۆشەویستی حەزرەتی موسا ﷺ لەدڵی خێزانی فیرعەون دا وای کرد: کەزەخت بخاتە سەر فیرعەون نەهێڵێ موسا ﷺ بەزارۆکی سەر ببڕێ! هەڵبەتە بەلای خوداوە زۆر ئاسان بوو؛ کەموسا ﷺ- بەشێوەی تر لەچنگی فیرعەون بپارێزێ، بەڵام ئەوە ویستی خودایەو وای ویستووە. حیکمەتو ئیرادەی ئەو هۆکارەی هەڵبژاردووە.

فیرعەونی ستەمکارکە: ئاگاداری دۆزینەوەی منالی بەئاودا دراو بوو، لەفیتی خۆی گەییشتوو زانی ئەم منداڵە لەترسی ئەو بەئاودا دراوە، بۆیە ویستی بیکوژێو بەسەر قافی خۆیەوە نەچێ. بەڵام ژنی فیرعەون خێرا وەدەست هاتوو کەوتە پاڕانەوەو بەرگری کردنو بەڵگە هێنانەوە بۆ وازهێنان لەئەنجامدانی ئەو تاوانە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتْ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ قُرَّةُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ لا تَقْتُلُوهُ﴾ ژنی فیرعەون بەمێردی ستەمکاری گوت: ئەم منداڵە فێنکایی چاوی منو تۆ دەبێ، لەوە بەولاوە خەمو کەسەری بێ منداڵی خۆمانی پێ بەبا دەدەین، دەیکەینە کوڕی خۆمانو پەروەردەی دەکەین، فێنکایی چاوی خۆمانی پێ دەهێنینو دڵی خۆمانی پێ خۆش دەکەین، کەوابێ بەقسەم بکەو سەری مەبڕە. ﴿عَسَى أَنْ يَنفَعَنَا﴾ بەڵکوو لەداهاتوودا سوودی لێ ببینین، هۆکاری خێروفەڕ بێ بۆمان، ئەوەتا لەئێستاوە نیشانەی فەڕو خۆشی پێوەدیارە، منداڵێکی جوانو روح سووکە بەکەڵکی ئەوە دێ پاشاو شاژنێکی وەکوو منو تۆ پەروەردەی بکەین.

﴿أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَداً﴾ یان هەر دەیکەین بەکوڕی حەقیقی خۆمانو کەلێنی وەجاخکوێری پێ پڕ دەکەینەوە، بەڕاستی لەبەر چاوم منداڵێکی هەڵکەوتووەو بەکەڵکی ئەوەدێ بیکەینە کوڕی خۆمان!

ئەم ئافرەتە کە: خێزانی فیرعەون بوو منداڵی نەبوو، پەروەردگار ئاواتی بۆ هێنایە دیو فیرعەون رازی بوو کەلەخۆی بگرنو پەروەردەی بکەنو بیکەنە کوڕی خۆیان، حەزرەتی موسا ﷺ بوو بەهۆی بەختەوەریی دونیاو قیامەت بۆ ژنی

فیرعەون‌و بیرۆشی بێ منداڵی خۆی پێ هات‌و دواییش خودا هیدایەتی داو ئیمانی بەموسا ﷺ هێناو بەهۆی ئیمانەکەیەوە خودا داخڵی بەهەشتی کرد.

﴿وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ وەڵێ فیرعەون‌و دارو دەستەکەی نەیاندەزانی کە: لەناوچونیان لەسەر دەستی ئەم منداڵە دەبێ: کەوا بەخێوی دەکەن، نەیاندەزانی کە: ئەم منداڵە لەداهاتوودا دەبێتە پێغەمبەرو فروستادە بۆسەر ئەوان ڕەوانە دەکرێ‌و ئەوان بەدرۆی دەخەنەوەو جۆرەها موعجیزە لەسەر دەستی دەردەکەون‌و ئەوان بڕوای پێ ناکەن لەسەر ئەوە خودا لەناویان دەباو لەدەریادا دەیانخنکێنێ.

هەر خودا بۆخۆی دەزانێ چۆن کارەکان دەڕەخسێنێ‌و سازیان دەدا، هەر خۆی یارمەتیدەری پێغەمبەرانی خۆیەتی‌و پشتگیریی ئایینەکەی دەکاو دوژمنانی ڕیسوا دەکا. بۆئەوەی موسوڵمان‌و کافر پەندئامێز بن، بەخۆیان دا بچنەوە؛ موسوڵمان هەوڵ بدا زیاتر خوداپەرستی بکاو کافر تۆبە بکاو ڕو لەخوداپەرستی بکا.

ئەوا موسا ﷺ لەسەربڕین ڕزگاری بوو بەڕواڵەت کەوتە ناو نازو نیعمەتەوە. ئاسیەی خێزانی فیرعەونیش ئاواتەکەی هاتەدی، ئەی دەبێ حاڵی دایکی موسا ﷺ چۆن بێ، دەبێ لەوکاتەدا لەچ دڵەڕاوکێ‌و سەرەتاتکەو بارو دۆخێك دا ژیابێ؟ دەفەرموێ: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغاً إِنْ كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلا أَنْ رَبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ دوای ئەوەی حەزرەتی موسا ﷺ خرایە ناو صندوقێکەوەو بەدەم ئاوی نیل دا درا، ئیتر دڵی دایکی موسا ﷺ لەهەموو کاروبارێکی دونیا خاڵی بوو، جگە لەکۆستی موساو چاوەڕوانی ئاکام هیچی تری تێدا نەمابوو، واتە عەقڵ‌و هۆشی لەلای خۆی نەمابوو ترس‌و بیم‌و غەم‌و پەژارەیەك سواری دڵ‌و دەروونی بووبو، خەریك بوو شێت‌و هاربێ، بەتایبەتی کاتێ بیستی کەکۆرپەکەی لەلایەن دارودەستەی فیرعەونەوە هەڵگیراوەتەوە، خەم‌و پەژارەو ترس وای لێکرد خەریك بوو بەتەواوی بڕوخێ‌و کاری خۆی ئاشکرا بکاو نهێنی بدرکێنی‌و حەقیقەت بۆ خەڵکەکە ڕون بکاتەوە، خەریك بوو بەدەمی خۆی شێتانە هاوار بکاو بڵێ: ئەو کۆرپەیە منداڵی منەومن ئەو منداڵەم بەوەلەدهێناوەو من شیرم داوەتێ‌و

خستوومەتە صندوقەوەو بەدەم ئاوەدا داوە، ئەگەر پەروەردگار دڵی پەیوەست نەکردایەو صەبرو ئارامی پێ نەبەخشیایە ئەعصابی نەدەماو راستی لەخۆی دەگوت، بەڵام خودا صەبرو ئارامی پێ بەخشیو هێزو توانای دایەو دانی بەجەرگی خۆی دا گرت، حەقیقەتی نەدرکاند، بۆئەوەی بچێتە پێری بتمانەکاران بەوادەو بەڵێنی خودا، صەبری گرت لەسەر بەتافیکردنەوە، دڵنیا بوو لەراستی وەدی هاتنی وادەی یەزدان؛ کەبەنیگاو ئیلهام پێ ی فەرمووە: ﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾.

بەکورتی ئەگەر صەبر پێ بەخشینو یارمەتیو دڵقایم کردنی خودا نەبوایە راستی لەخۆی دەگوتو کۆرپەی بەسەر بڕین دەگەیاند، جەرگی خۆشی تووشی سوتاندن دەکرد.

هەندێکی تر لەراڤەکەران مانایەکی تر بۆ ڕستەی ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغاً...﴾ دەکەن، دەڵێن: کاتێ دایکی موسا ﷺ هەواڵی ئەوەی زانی کە: ماڵی فیرعەون کۆرپەکەیان گرتۆتەوەو بڕیاریان داوە بەخێوی بکەن، ئیتر دڵی دایکی موسا ﷺ هیچ غەمو پەژارەی تێدا نەما، لەخۆشیانا خەریك بوو راستی بڵێو روداوەکە بدرکێنێو بڵێ ئەوە کوڕی منەو ئەوە حاڵو بەسەرهاتیەتی، ئەگەر ئێمە دڵمان رانەگرتایەو چاودێریمان نەکردایە، بۆئەوەی لەپێری موسوڵمانان بژمێردرێو بزانێ: کەوادەی خودا راستەو دێتەجێ.

بەهەرحاڵ دایکی موسا ﷺ لەهەوڵدان نەکەوتو ئاگری جەرگ حەجمینی لێ هەڵگرتو ویستی بەتەواویی لەهەواڵەکە ئاگاداربێ ﴿وَقَالَتْ لأُخْتِهِ قُصِّيهِ﴾ بەخوشکی موسای گوت: (کە کچە گەورەی خۆی بوو) هەستە بڕۆ بزانە خەبەرو باسی موسا ﷺ چیەو چی بەسەرهاتووەو چی بۆ بڕیار دەدەن، لەملاو لەولا گوێ هەڵخەو هەواڵێکی راستیم بۆ بهێنەوە، ئەویش دەست لەعاست بەپیر هەواڵەکەوە چوو، ﴿فَبَصُرَتْ بِهِ عَنْ جُنُبٍ وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ بەترسو حەزەرەوە گوێی رادەگرتو

پرسـیاری دەکـرد، دەیەویـست بزانـێ دەسـتی قـودرەت براپـچکۆلەکەی بـەکوێ گەیاندوەو چی بەسەرهاتووە، تالەدوورەوە بینی ئەوا موسا ﷺ لەباوەشی چەند کارەکەرو ئافرەتی دەرباری مالّی فیرعەون دایەو سەرگەرمی ئەوەن ئافرەتێکی شیردەریان دەست بکەوێ مەمکی بگرێ‌و شیری بداتێ، دارو دەستەی فیرعەون نەیانزانی کەئەم ئافرەتە خوشکی ئەو مندالّە ساوایەیە: کەوا بەدەستیانەوەیەو بەدوا هەوالّی ئەودا وێلّە.

دەستی قودرەت دەیپارێزێ‌و کارەکانی بۆ دەرەخسێنێ وادەکا دارودەستەکەی فیرعەون هەلّیبگرنەوە، خۆشیان بوێ، بریار بدەن بەخێوی بکەن، هەولّ بدەن دایەنی بۆ بگرن! ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ﴾ خودا دەفەرموێ نەمان هێشت مەمکی هیچ ئافرەتێك بگرێ پێش ئەوەی خوشکی موسا ﷺ بێ‌و پێش ئەوەی بیگێرینەوە بۆلای دایکی، ویستی خودا وابوو جگە لەشیری دایکی شیری هیچ ئافرەتێکی تر نەخوا، جا: کەخوشکی موسا ﷺ ئەوحالّەتانەی بینین‌و زانی زۆریان مەبەستە دایەنێکیان دەست بکەوێ شیری بداتێ: لێیان چووە پێشەوە: ﴿فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ﴾ پێی گوتن: ئەرێ دەتانەوێ شارەزاییتان بکەم بۆ خێزانێك بتوانن بەباشی ئەم مندالّەتان بۆ لەخۆبگرن‌و پەروەردەی بکەن‌و شیری بدەنێ‌و پارێزگاری بکەن نەصیحەت‌و ئامۆژگاری بکەن!!

ئیبنوکەثیر دەفەرموێ: کاتێك مەریەمی خوشکی موسا ﷺ ئەم قسانەی ئاراستەکردن گومانیان لێ پەیدا کرد وتیان: تۆ چوزانی لەوێ ئەومالّە جوان بەخێوی دەکەن‌و خۆشیان دەوێ‌و نەصیحەت‌و ئامۆژگاری دەکەن؟

لەوەلاّم دا وتی: باش بەخێوکردن‌و چاودێری کردنەکەیان بۆی بۆئەوەیە پاشا دلّخۆش بکەن‌و پاداشی باشیان بداتێ، ئیتر قسەکەیان چووە دلّەوەو داوایان لێکرد لەگەلّیان بچێ ئەو مالّەیان پێ بلّێ کەئامادەباشی بەخێوکردنەکەیان تێدا هەیە، ئیتر موسای کۆرپەو نازداریان لەباوەش گرت‌و رۆییشتن بۆمالّی دایکی موسا ﷺ،

موسایان خستە باوەشی دایکیەوەو مەمکی لەدەم ناو منداڵ مەمکی گرتو دەستی کرد بەشیرخواردنو مەمك مژین، ئیتر هەموویان کەوتنە خۆشیو فەرەحییەوەو پێکەنینو بزە کەوتە سەردەمو لێویان، یەکێك لەکارەکەرو کاربەدەستی ماڵی فیرعەون بەهەڵەداوانو بەپەلە رۆیشتەوە بۆ ماڵی فیرعەونو هەواڵی مەمك خواردنی موسای دا بەخێزانی فیرعەون، ئیتر خاتووئاسیە ناردی بەدوای دایکی موساداو رێزی لێگرتو بەخششی زۆری پێ دا، چونکە ئەم موشکیلەی بۆ حەلکردنو منداڵەکەیان مەمکی ئەوی گرتووە.

ئەمجار خاتوئاسیە داوای لەدایکی موسا کرد کە: لەماڵی فیرعەون دا بمێنێتەوەو لەوێ دا پەروەردەی بکا، بەڵام دایکی موسا ﵇ وتی: من ماڵو مێردم هەیەو ناتوانم لێرە بمێنمەوە،وەلێ ئەگەر دەتانەوێ دەیبەمەوە ماڵی خۆمانو لەوێ بۆتان بەخێو دەکەم. ئیتر خێزانی فیرعەون رازیی بوو، نەفەقەو تفاقی بۆ بڕیەوەو کۆرپەی تەسلیم کرد، دایکی موسا ﵇ گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیو کوڕی لەباوەش دا دڵخۆشو چاوڕوون.[1]

ئاواو بەوجۆرە وادەی خۆمان بەجێ هێناو ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ موسامان بەکۆرپەیی گێڕایەوە بۆلای دایکی، پاش ئەوەی لەلایەن دارو دەستەی فیرعەونەوە هەلگیرایەوە گێڕامانەوە بۆلای دایکی بۆئەوەی چاوی پێ رون ببنەوەو دڵخۆشو ئارام بێ بەنزیکی کۆرپەو جگەرگۆشەیو خەمو خەفەتی فیراقو لێ دوور کەوتنەوەی نەبێو دڵنیابێ: کەوادەی خودا دێتەجێو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، ئیتر بەوپەڕی لێهاتوویيو دڵسۆزی بەخێوی کردو ئەخلاقو رەوشتی جوانی فێرکردو دڵنیا بوو لەدوا رۆژدا دەبێتە فروستادەو پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ دەدرێ.

[1] تەفسیری ئیبنوکەثیر ج ٣/١٣٩٢.

﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زۆربەی زۆری ئادەمیزاد ئاگاهو سەرەنجامی حوكمو بڕیاری خودا نازانن، زۆرجار وادەبێ كارێك دێتە پێشەوەو بەڕواڵەت لەسەرشان گرانەو دڵی ئادەمیزاد پێ ی ناخۆشە، كەچی سەرەنجامی خێرەو دەبێتە فەڕو پیرۆزیی، وادەبێ بەپێچەوانەوە دەبێ. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ (البقرة/٢١٦) یان دەفەرموێ: ﴿فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ (النساء/١٩)

هەڵبەتە قورئان بێدەنگ بووە لەدیاریكردنی چۆنیەتی ژیانی حەزرەتی موسا ﷺ لەبیست ساڵی فەترەی دوای منداڵی دا: كە چاخی منداڵیو لاویەتیو گەنجییەتیو پێگەیشتنیەتی، نازانین دوای گێڕانەوەی بۆلای دایكی بۆشیر پێدانی چۆن پەروەردە بووە، نازانین پلەو پایەی لەباڵەخانەی فیرعەونو دەرەوەی باڵەخانەدا چۆن بووە، واتە سەردەمی نێوان گێڕانەوەی بۆلای دایكی بەشیرە خۆرەییو كوژرانی كابرای قیبطی لەسەر دەستی: كە ئەو كاتە تەمەنی لەدەوروبەری سی ساڵی دا بووە قورئان لێی بێدەنگ بووە.

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ جاكەپێگەیشتو تەمەنی لەسی ساڵی تێپەڕی، هێزو تواناو جەستەو عەقڵی كامڵ بوونو بوو بەپیاو، كردمانە فروستادەو پلەی پێغەمبەرێتیو تێگەیشتن لەشەریعەتو ئایینمان پێ بەخشی! جاهەر بەوجۆرە چاكەو ئیحسانەی لەگەڵ موساو دایكی دا كردمان، چاكەی هەموو چاكەكارێك دەدەینەوە، چاكەو ئیحسانی كەس پاشگوێ ناخەینو پاداشیان دەدەینەوە.

لەڕاستی دا ئێمە نازانین ئاخۆ موسا ﷺ لەقەصرو باڵەخانەی فیرعەون دا تا ئەو دەمەی تێیداو بووە بەپیاوو كامڵ بووە ماوەتەوە؟ یان لەفیرعەونو خێزانەكەی جیابۆتەوەو نەفسی بەرزیی نەیتوانیوە لەو كۆمەڵگایە پیسو پڕ

جەورو ستەمەدا هەڵبکا؟ بەتایبەتی کەلەباوەشی دایکی دا پەروەردە بووەو ئەو ئەدەبی داداوە، فێری رەوشتی بەرزی کردوە، بەبێ گومان دایکی حەقیقەتی فیرعەونی بۆ رونکردۆتەوەو راستی روداوەکانی بۆ گێڕاوەتەوە، تێی گەیاندوە فیرعەون کێیەو بیرو باوەڕی چیەو چ ستەمکارو ملهوڕێکە؟! حەزرەتی موساش ﷺ کەفامی کردۆتەوە بەچاوی خۆی دیاردەی ستەمو زۆرداریی فیرعەونی بینیوە، دەی دەبێ چۆن لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا خۆی گونجاندبێ‌و هەڵی کردبێ؟!

ئەگەر بەووردی لەئایەتەکانی دوایی بڕوانین تروسکایەکی ئەوەمان نیشان دەدا: کە حەزرەتی موسا تائەوکاتەی کابرای قیبطی لەدەست کوژراوە لەباڵەخانەی فیرعەون دا نەماوەتەوە، لەمەبەولاوە دەستنیشانی ئەو تروسکایانە دەکەین.

## کوژرانی کابرای قیبطی بەهەڵە لەدەستی حەزرەتی موساو هەڵاتنی لەوڵاتی میصر

﴿ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَـٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَـٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ فَٱسْتَغَـٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ قَالَ هَـٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا

لِّلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصۡبَحَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَسۡتَصۡرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيّٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی نیعمەتەکانی خۆی کرد: کە بەخشیونی بە حەزرەتی موسا ﷺ: کە هەندێك لەو نیعمەتانە رزگار بوونی بوو: لەسەربڕین بەمنداڵیو زانیاریو حیکمەت پێدانیو ئامادەکردنی بۆ پلەی پێغەمبەرایەتی، ئەمجار باسی نیعمەتی تری خۆی دەکا بەسەر موسادا ﷺ کەئەویش بریتی بوو لەڕزگاربوونی لەدەستی یاساوڵەکانی فیرعەون دوای ئەوەی بەهەڵە کابرای قیبطی لەدەست کوژرا، کەئەمەش بوو بەهۆی ئەوە بەخزمەت حەزرەتی شوعەیب بگاو بێتە زاوایی‌و دوایی ببێتە پێغەمبەر بۆسەر فیرعەون‌و نەتەوەکەی‌و هەروەها نەتەوەی ئیسرائیل.

﴿وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِنْ أَهْلِهَا﴾ حەزرەتی موسا ﷺ رۆژێ لەرۆژان لەوڵاتی (عين الشمس)ەوە هات بۆئەو شارەی کە: پایتەختی فیرعەون بوو، لەکاتێك دا چووە ناو شارەکەوە کەبەرواڵەت لەوکاتانەدا چاوەڕوانی چوونە ناوشار ناکرێ، لەکاتێك دا چووە ناوشار، دانیشتوانەکەی بێ ئاگابوون لەڕوداوی ناوشار، لەبەرئەوە کاتەکە کاتی قەیلولەو نووستنی پاش نیوەڕۆ بوو، یان نێوانی مەغریبو عیشابوو، بەرواڵەت لەکاتانەدا دانیشتوانی شار لەماڵو شوێنی پشوودانی خۆیان دا بوونو ئاگاداری ئەو روداوانە نەبوون.

﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلانِ هَذَا مِنْ شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ﴾ لەوکاتەدا کەموسا ﷺ داخڵی شار بوو، دوو کەسی بینین بەگژیەکا چوونو شەڕیان بوو، یەکێکیان لەنەتەوەی موسا ﷺ بوو، بەنوئیسرائیلی بوو، ئەویتریشیان لەنەتەوەی فیرعەون بوو قیبطی بوو، لەپێڕی دوژمنانی بوو. ﴿فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ﴾ کابرای بەنوئیسرائیلی داوای لەموسا ﷺ کرد یارمەتی بدا دژی کابرای قیبطی، ﴿فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ﴾ ئیتر موسا ﷺ لەکابرای قیبطی چووە پێشەوەو شەپلاغە یان مستەکۆڵەیەکی لێ دا، کابرای کوشت، واتە: ئەو مستەکۆڵەیە سەری کێشا بەگیان دەرچوونی کابرای قیبطی، هەر خێرا خستیە چاڵێکەوەو ژێرخاکی کرد، بەبێ ئەوەی کەس پێ ی بزانێ جگە لەکابرای بەنوئیسرائیلی.

بێگومان ئەمە یەکێکە لەو بەڵگەو تروسکایانەی: کەئاماژە بەوە دەکەن: موسا ﷺ تاسەر لەماڵی فیرعەون دا نەماوەتەوە، چونکە ئەگەر موسا ﷺ ئەوکاتە لەماڵی فیرعەون دا بوایەو بەکوڕی فیرعەون بناسرایە، هەرگیز کابرای ئیسرائیلی داوای لەموسا نەدەکرد یارمەتی بدا، بەلام کەداوای یارمەتی لێ کرد، بتمانەی تەواوی هەبوو: کەموسا پەیوەندیی بەقەصرەوە نەماوەو لەنەتەوەی ئیسرائیلەو رقی لەپاشاو دارو دەستەکەیەتیو کۆمەکی بەگەلە چەوساوەکەی خۆی دەکا.

وادیـارە حـەزرەتی موسـا ﷺ بـەو مـستەکۆڵە لێدانـە مەبەسـتی ئەوەنـەبوو کـابرای قیبطـی بکـوژێ، وەلـێ وارێکـەوت هەرلەگـەڵ مـستەکۆڵەی لێ دا کـابرا بـوو بەجەسـتەیەکی بـێ گیـانو سـاردبۆوە، وادیـارە مـستەکۆڵە لێدانەکـەی زۆر بـەرق هەڵساوی‌و توندو تیژ لێداوەو رەنگدانەوەی رق‌و کینەی بـووە لەفیرعـەون‌و هـەموو ئەوکەسانەی پەیوەندییان بەو ستەمکارەوە هەبووە.

بـەڵام کـە: دیتـی کـابرا گیـانی دەرچـووە، خێـرا پەشـیمان بـۆوەو کارەکـەی پـاڵ شـەیتاندا ﴿قَـالَ هَـذَا مِـنْ عَمَـلِ الـشَّيْطَانِ إِنَّـهُ عَـدُوٌّ مُـضِلٌّ مُـبِينٌ﴾ وتـی: ئـەم کـارە لەشـەیتانەوە بـوو، بێگومـان شـەیتان دوژمنێکـی گومڕاکـەرەو بەئاشـکرا دژایـەتی ئادەمیزاد دەکا.

بێگومـان روداوەکـە لـەئاکامی غـەزەب‌و رق هەڵسانەوە بـوو، رق‌و غـەضـەبیش شەیتانە، یان باووبژی شەیتانە! ئیتر خێرا دان بـەتاوانی خـۆی دا دەنـێ‌و رودەکاتـە پەروەردگارو داوای لێخۆشبوون‌و عەفوو دەکا ﴿قَـالَ رَبِّ إِنِّـي ظَلَمْـتُ نَفْـسِي فَـاغْفِرْ لِـي﴾ وتـی: خودایـە! مـن بـەم کـارەم سـتەمم لـەخۆم کـرد، ئـادەمیزادێکم بـەناڕەوا کوشـت، تـاوانم ببۆشـەو لـێم خۆشـبە، بـەم تاوانـە مـەمگرە، مـن تۆبـە دەکـەم‌و پەشیمانم، پەروەردگار دوعاو پاڕانەوەی قبووڵ کردو ﴿فَغَفَرَ لَهُ﴾ لـێ ی خـۆش بـوو ﴿إِنَّهُ هُـوَ الْغَفُـورُ الـرَّحِيمُ﴾ بێگومـان خـودا تـاوانی بەنـدە تۆبـەکارەکان دادەپۆشـێ‌و بەرەحم‌و بەزەیی یـە بـۆ بەنـدەکانی‌و پـاش تۆبـە کردنیـان‌و قبووڵبـوونی تۆبـەیان سزایان نادا.

جاوەکوو بڵێ ی ئەوە موسا ﷺ دڵێکی زیندوو هەسـتێکی تیـژو ناسـکی هـەبێ، کـەدوعاو پاڕانەوەکـەی کـرد، هێنـدە بـەکوڵ‌و بـەدڵ پاڕایـەوە، هەسـتی کـرد پەروەردگار نزاکەی گیرا کردوە، دڵی موسوڵمان هەرکاتێ بگاتە ئـەو ئاسـتە والـەکوڵ بێ هەست بەپەیوەندیی بـەخوداو گیرابـوونی دوعـای خـۆی دەکـا، بۆیـە دوابـەدوای دوعاو پاڕانەوەکەی عەهدو پەیمانێك دەبەستێ ﴿قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ

ظَهِــيراً لِلْمُجْــرِمِينَ﴾ وتــی: پــەروەردگارا لەهەڵـەو تـاوان بمپـارێزە، بەحـەقی ئـەو نیعمەتانەی پێت بەخـشیوم لـەزانیاریو حیکمـەتو یەکتاپەرستی، لەشکۆمەندیو لەشـاغیو هێـزو توانـاو نـازو نیعمـەت ئەگـەر چاودێریم بکـەیو لـەتاوانو هەڵـە بمپـارێزی، ئـیتر لـەوە بـەولاوە نابمـە پـشتیوانو یارمەتیـدەر بـۆ ستەمکارو تـاوان، بەهیچ جۆرێ یارمەتی ستەمو ستەمکاران نادەم. یان سوێندم بەوهـەموو نیعمەتـە جۆراو جۆرانەی بەسەر منت دا رشتوون، من تۆبەیەکی نەصوح دەکەمو ئیتر بـڕای بڕای یارمەتی موشریكو ستەمکاران نادەم.

هەنــدێك دەڵــێن: مەبەســت بەپــشتیوانیکردن لەموجریــمین هاوڕێیــەتی فیرعــەونو هەڵـسانو دانیـشتن لەگـەڵ دارو دەسـتەکەی دایـە . یـان مەبەسـتی پشتیوانیکردنی لەکەسـانێکەك کەپـشتیوانیکردنەکەی سەربکێـشێ بۆتـاوان وەکـوو ئەو یارمەتیدانـەی کـابرای ئیـسرائیلی: کـە سـەری کێـشا بـۆ کوشـتنی ئادەمیزادێـك کەکوشتنی رەوا نـەبوو. ﴿فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفاً يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِـالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُبِينٌ﴾ واتە: موساش ﷺ روداوی کوشتنی کابرای قیبطی خستبویە دڵـەڕاوکێ دەترسـا لـەوەی دەربکـەوێ: کەئـەو بکـوژەو راپێـچی لێپرسینەوەی بکەن، وای لێ هاتبوو سەرەتاتکەی دەکردنو چاوەڕوانی ئەوە بوو پـێ ی بزانــرێو بکوژرێتــەوە، بــەترسو لــەرزو نهێنــی بەهەنــدێ ڕێگـادا دەڕۆیـشت، نەیدەوێرا بەراشکاوی بەهەموو ڕێگایـەك دا بـڕوا، ئالـەم حاڵەدا بـوو کـاتێکی زانـی ئـەوکابرا ئیـسرائیلیـیەی کـە دوێنـێ داوای یارمــەتی لـێ کـرد، ئـەمڕۆش لەگـەڵ کابرایەکی قیبطی تردا تێك هەڵچونو شەڕیانە، کـابرای بەنوئیـسرائیلی: کەموسـای بینـی داوای کۆمـەکیو بـەهانا چـونی لـێ کـرد، حـەزرەتی موسـا ﷺ وتـی: کـابرا!! تۆمرۆڤێکی شەڕانیو گومڕای!!

﴿فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَنْ يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَهُمَا قَالَ يَا مُوسَـى أَتُرِيـدُ أَنْ تَقْتُلَنِـي كَمَـا قَتَلْتَ نَفْساً بِالْأَمْسِ﴾ جا کە: موسا ﷺ ویستی لەکابرای قیبطی تورە ببێو نـەهێڵێ

ستەم لەکابرای بەنوئیسرائیلی بکاو هەڵمەتی بۆ برد، کابرای بەنوئیسرائیلی ترساو وایزانی موسا عليه السلام پەلاماری ئەودەدا، بۆیە خێرا هاواری لێ هەڵساو وتی: ئەی موسا! ئەوە بەتەمای منیش بکوژی؟ وەکوو چۆن دوێنێ پیاوێکت کوشت!

هەندێ لەڕاڤەکەران پێیان وایە: ئەو وتەیە هی کابرای قیبطی بووە. لەم روەوە: کەهەواڵی کوژرانی کابرای قیبطی رۆژی پێشوو بڵاو بووبێتەوەو هەندێ گومان لەدەوری موسا کۆببنەوە، چونکە موسا عليه السلام بەوە ناسرابوو کەڕقی لەستەمو چەوساندنەوە بووە، دژی ستەمکاری فیرعەون‌و تاقمەکەی بووە، وێڕای وێچوونی ئەوەش کەکابرای ئیسرائیلی بەنهێنی لەناو بەنوئیسرائیلییەکان دا بڵاوی کردبێتەوەو ئیتر هەواڵەکە لەوانەوە دزەی کردبێ بۆ گوێچکەی فیرعەون‌و دارو دەستەکەی! کوردی وتەنی (قسە کەوتە زارێکی دەکەوێتە شارێکی)

ئەمەش شتێکی وێچوو ڕێ تێچووە، چونکە کوشتنی کابرایەکی قیبطی‌و دەرباری فیرعەون لەتێك هەڵچونێکی نێوان ئەوو بەنوئیسرائیلی یەکدا رووداوێکی دڵخۆشکەرە بۆ بەنوئیسرائیلی یەکان‌و رووداوی ئاوەهاو لەبارو دۆخی ئاوەهادا بەنهێنی سرتە سرت لەناو خەڵك دا بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە قسەو باسی بەرئاگردان‌و سرتە سرتی نێوان ئەم‌و ئەو! بەتایبەتی: کەلەوەپێش موسا عليه السلام بەوە ناسرابێ کەدژی ستەم‌و چەوساندنەوەیە، کەوابێ رێی تێدەچی، کاتێك موسا عليه السلام ویستوویەتی پەلاماری کابرای قیبطی دووەم رۆژبدا، کابرا ئەم تۆمەتەی ئاڕاستەی موسا عليه السلام کردو پێ ی گوت: ئەوە دەتەوێ من بکوژی وەکوو چۆن دوێنێ کابرایەکی ترت کوشت؟!

﴿إِنْ تُرِيدُ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ جَبَّاراً فِي الأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَنْ تَكُونَ مِنْ الْمُصْلِحِينَ﴾ ئەی موسا عليه السلام وادیارە ئەتۆ جگەلەوەی کەببێتە پیاو کوژو ستەمکارو چەوسێنەرەوە هیچی ترت ناوێ‌و ئاواتت ئەوەیە ئەزیەتی خەڵك بدەی‌و هیچ بیر لەدوا رۆژ ناکەیتەوەو ناتەوێ لەئەهلی ئیصلاح‌و چاکەخوازبی. ناتەوێ کێشەی نێوان خەڵك بەحیکمەت‌و لێزانی حەل بکەی، ئەمەش بەڵگەو نیشانەیەکی ترە لەسەر ئەوە

کەموسا ﷺ ئەوکاتە پەیوەندیی بەقەصری فیرعەونەوە نەماوە، ئەگینا کابرا نەیدەتوانی بەم جۆرە روبەڕوی موسا ﷺ ببێتەوە. وادیارە حەزرەتی موسا ﷺ بەبیستنی ئەم قسەیە تەزوێکی ساردی بەجەستەدا هاتووەو کەوتۆتە هەڵو مەرجێکی دژوارەوە، بۆی نەکراوە پەلاماری کابرای قیبطی بدا، کابرا لەچنگانی رزگاری بووە!؛ ئیتر بەهەڵە داوان بەرەو ماڵی فیرعەون قوچاندویەتی بۆئەوەی نهێنی قیبطی یە کوژراوەکەی دوێنێ بەفیرعەونو دارودەستەکەی رابگەیەنێو بۆیان لەبنی کولەکەکە بدا، ئیتر دارو دەستەی فیرعەون کەوتنە پلان دانان بۆگرتنی موساو تۆڵە لێ ستاندنی.

﴿وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ﴾ پیاوێکی موسوڵمان لەتاقمی فیرعەون کە: ئیمانی خۆی شاردبۆوەو نەیهێشتبوو خەڵك بزانن کە: خاوەن باوەڕە لەشوێنێکی دووری شارەوە بەپەلەو هەڵەداوان هات بۆلای حەزرەتی موساو هەواڵی نەخشەو پلانی قەصری فیرعەونی پێ راگەیاند. وتی: ئەی موسا! پیاوماقوڵو کاربەدەستانی فیرعەونو یاساوڵەکانی دەربارەی تۆ سەرگەرمی گفتو گۆو راوێژن، خەریکی نەخشەدانانن بۆ کوشتنو لەناوبردنت، خێراو بەبێ دواکەوتن لەشار دەرچۆو خۆت قوتار بکە، من بۆتۆ دڵسۆزەمو راستت پێ دەڵێمو نامەوێ تووشی هیلاکەت ببی.

﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ حەزرەتی موسا ﷺ لەپایتەخت بەترسەوە دەرچوو، شاری بەجێ هێشتو ڕێگای هاتو نەهاتی گرتەبەرو بەدەم رۆیشتنەوە ئاوڕی دەدانەوەو چاوەڕوانی ئەوە بوو یاساوڵەکانی فیرعەون بەشوێنیەوە بن بۆ گرتنی!! ئالەم تەنگو چەڵەمەو نارەحەتیەدا موسا ﷺ هانای بۆ پەروەردگاری بردو ﴿قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ وتی خودایە! رزگارم بکەی لەو ستەمکارانە، خودایە نەمخەیە ژێردەستی ئەو ستەمکارو زاڵمو زۆردارانەوە نەمخەیەبەردەستی فیرعەونو تاقمەکەیەوە.

ئیتر پەروەردگار نزاو پاڕانەوەکەی گیرا کردو لەچنگی فیرعەون و پاساوڵەکانی ڕزگاری کردو گەییشتە وڵاتی مەدیەن. وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەوەدەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَتَلْتَ نَفْساً فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُوناً﴾ (طه/٤٠).

## ڕۆیشتنی موسا ﷺ بۆ وڵاتی مەدیەن و مارەکردنی کچی حەزرەتی شوعەیب لەوێ

﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا

يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی فیرعەون‌و پیاوماقوڵانی قەصر پلانی کوشتنی موسایان دارشت‌و خوداپەرستە قیبطی‌یەکە بەهەڵەداوان هات هەواڵی پیلانەکەی بەموسا ﷺ راگەیاند ئامۆژگاری کرد بەبەجێ هێشتنی شار بەپەلەو بێ دوا کەوتن، حەزرەتی موسا ﷺ بەرەو وڵاتی مەدیەن رێگای هەڵاتنی گرتەبەر؛ چونکە لەنێوان بەنوئیسرائیلی‌یەکانی میصرو دانیشتوانی وڵاتی مەدیەن دا خزمایەتی‌و پەیوەندی دێرین هەبوو، مەدیەنییەکان لەنەوەی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بوون، نەتەوەی ئیسرائیلیش لەنەتەوەی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمن کە: گەییشتە شاری مەدیەن بوو بەشوانی پەزەکانی حەزرەتی شوعەیب‌و کچێکی ئەویشی مارە کردو پاشان گەڕایەوە بۆ میصرو لەرێگای گەڕانەوەی دا بوو بەپێغەمبەرو نیگای بۆکرا. دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَنْ يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾ واتە: کاتێک موسا ﷺ رێگای مەدیەنی گرتەبەرو پایتەختی فیرعەونی بەجێ هێشت، وتی: هیوادارم خودا بەفەضلی خۆی رێگای راست‌و کورت‌و ئەمینم نیشان

بدا، لەنێوان سێ ڕێگادا ڕێگای ناوەڕاستی هەڵبژاردو درێژەی بەرەوی خۆیداو جار جار پرسیاری ڕێگای لەهەندێ کەس دەکرد کە تووشیان دەبوو... وەکوو ڕیوایەت کراوە لەم ڕێگا دوورودرێژەی نێوان پایتەختی فیرعەون و مەدیەن دا کەهەشت ڕۆژ ڕێ بوو نەتێشووی پێ بوو نەوڵاخی سواری ئەوماوە دورو درێژە خواردنی گژوگیاو پەلکە گەڵای درەختەکان بوو.

﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِنْ النَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِنْ دُونِهِمْ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ﴾ کاتێك حەزرەتی موسا ﷺ گەیشتە سنووری شاری مەدیەن و چووە سەربیری ئاوەکەی، کۆمەڵێکی شوان و خاوەن ئاژەڵ دین خەریکی ئاودانی ئاژەڵەکانیان بوون، لەخوار ئەوانیشەوە دوو ئافرەتی دیتن پێشیان بەمەڕو بزنەکانیان گرتبوو، نەیاندەهێشت بێنە سەر دوێڵاوو شوێنی ئاو خواردنەوەکە، نەوەکوو مەڕو بزنەکانیان تێکەڵاو بەمەڕو بزنی کەسانی دیکە ببێ‌و تووشی ناڕەحەتی ببن.

حەزرەتی موسا ﷺ کەئەم دوو ئافرەتەی دیتن، بەزەیی پێدا هاتنەوە، پرسیاری لێیان کردو پێی وتن: ئەوە بۆچی ئێوەش لەگەڵ ئەو شوان و خاوەن ئاژەڵانەدا مەڕو بزنەکانتان ئاونادەن؟؟ لەوەڵام دا وتیان: تائەو خاوەن ئاژەڵانە ئاژەڵەکانیان ئاو نەدەن، ئێمە ناتوانین پەزەکانمان بێنینە سەر دوێڵاوەکان، باوکیشمان پیاوێکی پیرو کەنەفتە توانای ئەوەی نیە لەجیاتی ئێمە بەکاری پەروەردەکردنی مەڕو بزنەکانمان هەڵسێ‌و وەکوو ئەو پیاوانە ئاو هەڵێنجێ‌و مەڕو بزنەکان ئاوبدا، بۆیە ئێمە لەناچاری‌و بێ کەسیمان دا بۆخۆمان بەم کارە هەڵدەستین‌و هەر ئەوەندەشمان بۆدەکرێ، ئێمەی ئافرەت‌و بێ دەسەڵات ناتوانین پێشبرکێ‌و ئاوبڕی‌و نۆرەبڕی لەگەڵ ئەوپیاوانەدا بکەین. دەبێ لەپێشدا ئەوچوار شانەو خاوەن دەسەڵاتانە ئاوی صاف‌و ڕون بدەن بەئاژەڵەکانیان‌و تێرئاویان بکەن، ئەمجار ئێمە بەبەرماوەی ئاژەڵی ئەوان مەڕو بزنەکانمان تێراوبکەین. بەمەش هۆی ئەوەیان ڕون کردەوە کە: خۆیان ئەرکی مەڕ لەوەڕاندن‌و مەڕ ئاودانیان لە

ئەستۆگرتووەو باوکیان پیرو کەنەفتەو بەناڕاستەوخۆ داوایان لەموسا ﷺ کرد کە: یارمەتیان بداو مەڕو بزنەکانیان بۆ ئاوبدا! ئیتر حەزرەتی موسا ﷺ غیرەتی جوڵاو سروشتی پاكو خاوێنی هەژا، راپەڕیو خۆی گورج کردو ویستی ئەو نارەوایی یە قەڵاچۆ بکا، وەکوو دابو نەریتی پیاوانی خاوەن غیرەتو شەرەف چووە پێشەوە، مەڕو بزنەکان بۆ دوو ئافرەتەکە ئاوبدا، ئەمەش کارێکی ناوازەیەو نیشانەی چاونەترسیو بەغیرەتی حەزرەتی موسایە، چونکە ئێستا ئەو لەخاکێك دایە غەریبو بێ پشتیوانە، هیلاكو ماندو هەڵاتووە، لەرێگایەکی دوورەوە هاتووە بێ تێشوو، بۆخۆی راوەدو نراوەو دوژمنی بێ بەزەیی بەدواوەیەتیو ئەگەر چنگیان کەوێ بەسەریەوە ناچن، وەڵێ هەموو ئەم کۆسپو تەگەرانە موسایان لەئەنجامدانی کاری پیاوەتیو هەڵوێستی مرۆڤانەی دەستەبەستە نەکرد، هەستا بەرەو بیرە ئاوەکە چوو بەوحاڵە ماندویەتیو برسیایەتیەی بەردێکی گەورە کە: سەرقاپی بیرەکە بوو، بەهەشت نۆکەس نەدەجووڵا، بەبەرچاوی شوانو خاوەن ئاژەڵەکانەوە بەتەنیا لای بردو ئاوی هەڵێنجا! بەمەش هەیبەتێکی هێزی مەعنەویو هێزی دەستو بازوی خۆی خستەناو دڵی ئەوشوانانەی: کەدەیانەویست پێش کچەکانی حەزرەتی شوعەیب ﷺ ئاژەڵەکانیان ئاوبدەن.

﴿فَسَقَى لَهُمَا﴾ مەڕو بزنی دوو ئافرەتەکەی ئاوداو دوایی بەردەکەی خستەوە سەر بیرەکە. بەمەش شەهامەتی خۆی نواند، تەرازوی لاری بێ دەسەڵاتانی ڕاست کردەوە.

ئیبنو ئەبی شەیبە لەئیمامی عومەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا دەڵێ: بەردی سەربیرەکە بەدەکەس نەبوایە لانەدەبرا![1]

﴿ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ﴾ ئەمجار کە: مەڕو بزنەکەی ئاودان، چووە ژێرسێبەری درەختێکەوە بۆ پشوودانو حەسانەوە، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە:

---

[1] ئیبنو کەثیر ج ٣/ ١٣٩٣.

سەفەرەکە لەکاتی گەرمادا بووە. ماندویی‌و شەکەتی زۆری بینیوە، لەخودا پاڕایەوە ﴿فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ وتی: خودایە! من زۆر پێویستیم بەهەندێ خۆراک‌و بژێو هەیە، ئاتاجی هەندێ خواردەمەنیم، ئازاری برسیایەتیمی پێ فەرامۆش بکەم، بەم شێوە پەنای بردە بەرسێبەری درەخت بۆئەوەی جەستەی لەتینی گەرما بپارێزێ، هانای بردە بەرسێبەری پەروەردگارو بەگیان‌و دڵی. پاڕایەوە وتی: خودایە من موحتاجم، خودایە من تەنهام، خودایە من زەبوونم، خودایە من پێویستم بەفەضل‌و بەخششی تۆ هەیە، ئاتاجی کەمێك لەنیعمەتی تۆم!!

هێشتا حەزرەتی موسا ﷺ سەرگەرمی موناجات‌و پاڕانەوە بوو، کاتێکی زانی دەرووی خێری لێ کرایەوە ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا﴾ ئەوە بوو ئەو رۆژە کچەکانی شوعەیب ﷺ زوو رۆیشتنەوەو مەڕو بزنەکانیان بردەوە، باوکیان بەلایەوە سەیر بوو وازوو مەڕو بزنەکانیان ئاوداون‌و گەڕاونەوە، پرسیاری لێکردن ئەوانیش سەرگورشتەیان بۆگێڕایەوە، ئیتر حەزرەتی شوعەیب ﷺ یەکێك لەکچەکانی نارد بەدوو موساداو بەشێوەیەکی داپۆشراوو بەئەدەب‌و حیشمەتەوە هاتەوە بۆلای موساو پێ ی گوت: باوکم دەیەوێ بتبینێ‌و پاداشی مەڕ ئاودانەکەت بداتەوە!

ئەمە دەرو لێکردنەوەی خودایە، بەهانا هاتنی پەروەردگارە، کارەکانی بۆڕەخساندن، پیرە مێردی کۆنەساڵ لەدوای ناردبێ بی بینێ، کچەکەی خۆی بەدوودا نارد، کچە پێغەمبەری عاقڵ‌و دانا هات بۆلای بەحەیاو ئەدەبەوە، نموونەی ئافرەتی داوێن پاکی سروشت خاوێن‌و دڵپاك‌و بێگەرد، کاتێك تووشی پیاوی بێگانە دەبێ، بەبێ ئەوەی خۆی دەرخاو لارو لەنجە ئەنجام بدا!!

هات بۆلای بۆئەوەی دەعوتنامەی باوکی پێ ڕابگەیەنێ، هات دەعوەتنامەکەی بەکورترین شێوەو جوانترین ئوسلووب‌و بەزوبانێکی رەوان‌و لەسەرەخۆو بێ گرێ‌و گۆڵ‌و بێ مینگە مینگ پێی راگەیاند، بەڕواڵەت ئافرەتی سروشت پاك‌و داوێنپاك

شـەرم لـەپیاوی بێگانـە دەکـا، نایـەوێ قـسەی لەگـەڵ بکـا، ئەگـەر قـسەشی کـرد شلەژانێکی پێوەدیارە، وەلێ ئەم ئافرەتە هێندە لەداوێنپاکی خۆی دڵنیابوو، هێندەی بتمانەی بەخۆی بوو، هیچ نەشڵەژاو بەرێكو پێکی بەکورتو پوختی دەعوەتنامەی باوکی پیرەساڵی بە حەزرەتی موسا ﷺ راگەیاند! حەزرەتی موساش ﷺ بێ سێو دوو دەعوەتنامـەی قبـووڵ کـردو ویـستی بەخزمـەت ئـەو پیرەمێردەبگا: کـەباوکی ئافرەتی وابەرێزە، سەرباری ئەوەش حەزرەتی موسا ﷺ برسـیو رێبـوارو راوەدوو نراوبـوو، دەیەویـست پەناگەیـەکی دەسـت بکـەوێ، بۆیـە یەکـسەر هەڵـساو پـێش ئافرەتەکە کەوتو بەرەوماڵی پیرەمێردی خاوەن دوو کچەکە رێگای گرتەبەر.

لێـرەدا تێبینـیـیـەك هەیـە ئـەویش ئەوەیـە: ئایـا ئـەم پیـاوە پـیرە حـەزرەتی شوعەیب ﷺ بێ؟ هەندێك پێیان وایە ئەوزاتـە حـەزرەتی شـوعەیبە، هەنـدێکیش پێیان وایە: برازای حەزرەتی شوعەیب بووەو ناوی (یەثرون) بووە.

ئەوەی پاڵپشتی ئەوەدەکا کە: ئەو پیرەمێردە غەیری حـەزرەتی شـوعەیب ﷺ بووبێ ئەوەیە حەزرەتی شوعەیب ﷺ بەچاوی خۆی لەناوچوونی گەلەکەی خـۆی بینی، جگە لەوانەی ئیمانیان پـێ هێنـابوو کەسـی تـر لەگەلەکـەی دەرنەچـوو! دەی ئەگەر ئەم پیرەمێردە حەزرەتی شوعەیب ﷺ بووبێ، چۆن ئەو گەلە ئەوەندە بـێ ئـەدەب دەبـوون نـەهێڵن کـچی پێغەمبەرەکـەیان مـەڕو بزنـەکانیان ئاوبـدەن هـەتا ئاژەڵەکانی خۆیان تێر ئاو نەکەن؟ بێگومان ئەو هەڵسو کەوتەی خاوەن ئاژەڵـەکان بەرامبـەر بـەو دووئافرەتـە مەرلەوەرێنـە دەیاننوانـد لەهـەڵسو کـەوتی کۆمـەڵی ئیماندار ناچنو نـاگونجێ ئیمانـداران ئـاوا مامەڵـە لەگـەڵ پێغەمبـەرو کچەکانی دا بکەن! سەرباری ئەوەش قورئانی پیرۆز ج ئاماژەیەکی بۆئەوە نەکردوە: کەخـەزوری موسا لەماوەی ئەو دە ساڵەی پێکەوە بوون ﷺ تەعلیماتێکی پێغەمبەرانەی دابێتە حەزرەتی موسا ﷺ دەی ئەگەر ئەو پیرەمێردە حەزرەتی شوعەیب بوایە، دەبوایـە دەنگێکی پێغەمبەرانە، تەعلیماتێکی پێغەمبەرانە، لەماوەی ئەو دە ساڵەدا: کەموسا ﷺ بەشوانیو زاوا بەندی لای خەزوری مایەوە ببیسرایە!!

بابێینەوە سەرباسی سەرەکی خۆمانو بزانین زنجیرەی چیرۆکەکە بەچی دەگا؟ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنْ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ کاتێك حەزرەتی موسا ﷺ هاتەلای پیرەمێردو سەرگوزشتەی خۆی بۆ گێڕایەوە. باسی ستەمکاریی فیرعەونو دارو دەستەکەی کرد، هەواڵی چەوساندنەوەی نەتەوەی ئیسرئیلی لەسەر دەستی ئەو ستەمکارەو نەتەوەکەی پێڕاگەیاند. نەخشەی پلانی گرتنو کوشتنی خۆیو هۆی هەڵاتنو ئاوارەبوونی خۆی بۆ گێڕایەوە، پیرەمێردی مەدیەنی کۆنەساڵ پێ ی وت: مەترسە، دڵنیابەو ئارام بگرە. تۆ لەدەستی ستەمکاران رزگارت بووە، لەوڵاتی ئەوان دەرچووی، فیرعەونو تاقمەکەی دەستیان بەم هەرێمە ناگا!

بێگومان وەکوو ئاماژەمان پێکرد موسا ﷺ پێویستی بەدوو شتی سەرەکی بوو؛ ئەمینی لەگیانی خۆیو نەهێشتنی برسیایەتی، وەڵێ زیاتر پێویستی بەئەمینی یەکە بوو بۆیە پیرەمێرد هەر لەگەڵ موسا ﷺ سەر گوزەشتەی خۆی بۆگێڕایەوە وتی مەترسە لەدەستی ستەمکاران ڕزگارت بووە.

هەڵبەتە لەگەڵ گێڕانەوەی سەرگوزشتەی خۆیو ئاخاوتنی لەگەڵ پیرەمێردی کۆنەساڵ دا خواردنو خواردنەوەیەکیش بۆ میوانی دەعوەتکراو ئامادە کراوەو ئازاری برسیایەتیو تینوایەتیش نەماوە، بڕێکیش لەماندویی شەکەتی جەستەی موسای ڕێبوارو راوەدوونراو ڕەویوەتەوە. سکی تێرو دڵی ئارامە. لەماڵی پیرەمێردێکی لەکارکەوتووی خاوەن دوو کچی سروشتپاکە، دووکچی واقیع بینو راستگۆ، لەهەمان کات دا بێزار لەشوانیو مەڕ لەوەڕاندنو مەڕئاودان، ئەوە کاری پیاوانەو ئەوانی ئافرەت لەبەرناعیلاجیو بێ کەسی خستویانەتە ئەستۆی خۆیان زۆر بێزار بوون لەبەجێ هێشتنی شوێنی سروشتی، ئیش کردنی خۆیان کەبەڕیوە بردنی ماڵو خێزانە، بێزار بوون لەماڵ جێ هێشتنو شانەو شان کردنو تێکەڵاو بوونیان بەپیاوان لەسەر ئاوو ئاژەڵ ئاودان!

بۆیە ئێستا لەم مەشهەدەی دوایی دا دەنگی مێینەو ئافرەتی سروشت پاك دەبیسین، ئافرەتێك وەرزە لەكاری ناسروشتی خۆی، دەیەوێ ئافرەتێك بێ لەشوێن لەوەڕو ئاودا تێكەڵاوی لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا نەكا، ئافرەتێكی مەستوورەو خانوو نشین بێ، ئافرەتی داوێن پاكو دڵپاكو سروشت پاك بەتێكەڵاو بوون لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا دڵتەنگ دەبێ، ژیانی ئاسایی خۆی لێ تێك دەچێ. بۆیە هەر لەگەڵ موسا عليه السلام سەرگورشتەی خۆی گێڕایەوەو پیرەمێرد دڵنیای كرد: كەلەدەستی ستەمكاران رزگاری بووە ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾ یەكێك لەدوو كچەكانی پیرەمێرد هاتە قسەو وتی: بابەگیان! ئەم پیاوە بەكرێ بگرە بۆ لەوەڕاندنی مەڕو بزنەكانمان باشترین كەسێك كەتۆ بەكرێ ی بگری ئەم كوڕە گەنجەیە، چونكە بەهێزو توانایە بۆئیش كردنو ئەمینیشە ترسی ئەوەی لێ ناكرێ خیانەت بكا.

بەڕاستی ئافرەتەكە ئافرەتێكی عاقڵو داناو سەلاربوو، دەبینێ كوڕێكی گەنجو غەریبو ڕاوەدونراوە، لەهەمان كات دا خاوەن دەستو بازوی بەهێزو لەشساغو چوارشانەیە، ئەمینو بەناموسو خاوەن حەیایە، بەچاوی خۆی بینی: كەچوو مەڕو بزنەكانیان بۆ ئاوبدا چ سامو هەیبەتێكی خستەناو دڵی شوانو خاوەن ئاژەڵەكانەوە، ئەوكاتەش: كەباوكی ناردیەوە بۆلای، دەعوەتی كرد بۆ ماڵەوەو لەگەڵی هاتەوە، بۆی دەركەوت چەند ئەمینو دەست پاكو دڵپاكە!!

سەفیانی ثەوری لەئەبو ئیسحاقەوە ئەویش لە ئەبوعوبەیدەوە لەعەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە رضي الله عنه ریوایەت دەكەن فەرمویەتی: (أخرس الناس ثلاثة: أبوبكر حين تفرس في عمر وصاحب يوسف حين قال: اكرمي مثواه، وصاحبة موسى حين قالت ﴿يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ .....الاية﴾[1]

[1] تەفسیری ئیبنوكەثیر ج ٣/١٣٩٤.

ئـەمجار پیرەمێـرد پێـشنیاری کـچەکەی پەسـند کـردو روی لـە حـەزرەتی موسـا ﵇ کردو ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَـةَ حِجَـجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْراً فَمِـنْ عِنْـدِكَ وَمَـا أُرِيـدُ أَنْ أَشُـقَّ عَلَيْـكَ سَـتَجِدُنِي إِنْ شَـاءَ اللَّـهُ مِـنَ الصَّالِحِينَ﴾ وتی: من دەمەوێ بتکەمە کوڕی خۆم‌و خۆم بکـەم بەخـەزورت‌و یـەکێ لەکچەکانمت لێ مارە بکەم، خۆت سەرپشك بە. تۆش هەشـت سـاڵ شـوانیم بـۆ بکـە. ئەگـەر هەشتەکەیـشت کـرد بەدەسـاڵ ئـەوە پیـاوەتی خۆتـە، مـن زۆرت لێ ناکـەم‌و نامەوێ زەحمەتت بدەم بەتـەواو کردنـی دەسـاڵ، تەنانـەت هەنـدێ کـەم‌و کورپـشت هەبێ چاوپۆشیت لێ دەکەم، خودا پشتیوان بێ من دەبینی لەپێری پیاوچـاکان دەبم لەگـەڵت داو خزمایـەتیمان تاسـەر دەبـێ‌و لێـك عـاجز نـابین. وێدەچـێ پیرەمێـردی زاناو دووربین هەستی بەمەیلێکی سروشتی‌و نێوان کچەکەی‌و حەزرەتی موسا ﵇ کردبـێ، زانیبیـەتی کەبتمانــەیان بەیــەکتر هەیــەو شــیاوی ئــەوەن کەبەیەکــەوە خێزانێك دروست بکەن.

بێگومان گـەنجی‌و هێـزو توانـاو ئـەمینی کـە لـەپیاودا کۆبوونـەوە لای ئـافرەتی سروشت پاك پەسندەو مەیلی لێ یە، دڵی بۆی لێ دەدا.

بەوئوسلووبە ئاسایی‌و بێ گرێ‌و گۆڵ‌و بێ کینایەو بێ مـەجازە، پێشنیاری ئەوە دەکـا کـچەکەی خـۆی لـە حـەزرەتی موسـا ﵇ مـارە بکـا، هـیچ بەلایـەوە عـەیب‌و شورەیی نیە، چ خەجاڵەتیەکی تێدا نەبینی، پێشنیاری پێـك هێنـانی خێـزان دەکـاو لانـەی سروشـتی بـۆ کـچەکەی دەدۆزێتـەوەو ئەمـەش خەجاڵەتیـەکی تێـدا نیـە. پێویـستی بەکینایـەو پـێچ‌و پەنانیـە، حـەرەج‌و عەیبـەی تێدا نیـە، ئەمـە هـەڵس‌و کەوتێکی خوداپەسندەو مامەڵەیەکی راست‌و رەوایە، حەق وایە هەرکاتێ بەرپرسی ئافرەت باوك بێ یان برا گەورە بێ، پیاوێکی پەسندی چنگ کەوت دەگونجا لەگەڵ کچەکەی دا، یان لەگەڵ خوشکی‌دا خێزان پێك بهێـنن، بـەبێ لـێ سـڵەمینەوە ڕازیـی دڵی خۆی بدرکێنێ‌و چ نەنگییەکی تێدا بـەدی نـەکا. دەبـێ چۆن ئادەمیزاد هـەوڵ

دەدا ئافرەتی چاك بۆ كوڕەكەی یان براكەی بدۆزێتەوە ئاواش هەوڵ بدا هاوسەری چاك بۆكچەكەی یان خوشكەكەی بدۆزێتەوە.

بەڕاستی ئەو دابو نەریتەی والە (وەلی ئەمری) ئافرەت دەكا دەستپێشخەر نەبێ بۆبەشوودانی ئافرەتەكە بەكەسێك كەلەڕەوشتی رازییەو گونجاوە بۆهاوسەرێتی كچەكەی یان خوشكەكەی دابو نەریتێكی دواكەوتوانەیەو لەسەرچاوەی ئایینی خوداوە سەرچاوەی نەگرتووە.

لەكۆمەڵگای بەناو موسوڵمانی ئێمەدا زۆر لەچەمكەكان هەڵەوگێر كراونو بەلینگەو قووچی مامەڵەیان پێوە دەكەین، دەبینی كچو كوڕ یەكتری دەبینن‌و پێكەوە قسەو ئاخاوتن ئەنجام دەدەن، بەبێ شەرمو بێ حەیا بەدەم یەكەوە پێدەكەنن‌و بەشێكی زۆری جەستەی یەكتری دەبینن‌و بەلایانەوە كارێكی ئاسایی یەو رەوایە، كەچی لەگەڵ باسی خوازبێنی‌و مارەكردن هاتە پێشەوە، زۆرجار عەیبە عەیبەو شەرمكردن‌و لەمپەرە دەستكردە ناپەسندەكان دەخەنەگەڕ؟؛ جۆرەها كۆسپ‌و تەگەرە لەنێوان كوڕو كچ دا قوت دەكەنەوە!! بێگومان لەسەردەمی پێغەمبەردا زۆرجار باوكەكان بۆخۆیان كچەكانیان عەرزی ئەو پیاوانە كردوە كەلەڕەوشتیان رازیی بوون، بەڵكوو ئافرەت هەبووە خۆی خۆی عەرز كردوە، بەوپەڕی صەراحەت‌و پاكی‌و بەئەدەبی یەوە ئەم رانواندنە ئەنجام دراوەو ج نەنگی‌و حەرەجێكیان تێدا بەدی نەكردوە.

ئیمامی عومەر بۆخۆی پێشنیاری بۆ ئەبوبەكر ﷺ كرد كە حەفصەی كچی لێ مارەبكا، ئەبوبەكر بێدەنگ بوو، دوایی داوای لەئیمامی عوسمان ﷺ كرد ئەو مارەی بكا ئیمامی عوسمان ﷺ عوزری هێنایەوە. كە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بیست دڵنەوایی حەزرەتی عومەری كردو فەرمووی: بەڵكوو خودا لەئەبوبەكرو عوسمانی باشتر بەنسیب بكا، وارێكەوت دوایی پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی مارەی كرد، ئافرەتێكی تر خۆی عەرزی پێغەمبەر ﷺ كرد: كەمارەی بكا، پێغەمبەر ﷺ عوزری بۆ هێنایەوەو پێشنیارەكەی رەت كردەوە، ئەمجار ئافرەتەكە وتی: كە بۆ خۆت مارەم ناكەی،

یەکێکم بۆ بدۆزەرەوە بەلاتەوە پەسند بێ لەئەوم مارە بکە: ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەکابرایەکی مارە کردجگە لەدوو سورەتی قورئان هیچی تری نەبوو بیکاتە مارەیی، فێر کردنی ئەو دوو سورەتەی قورئانی کردە مارەییو گواستییەوە!!

بەم شێوە بەسیطو ئاسانو بێ پێچو پەنایە کۆمەڵگای موسوڵمانان خێزانیان پێکەوە دەناو لانەی هاوسەرییان دروست دەکردو ئەو گرێ بەندییە پیرۆزەیان لەنێوان ئافرەتو پیاودا دەبەست..

پیرەمێردی دنیا دیدەو خوداپەرستو خەزوری حەزرەتی موساش ﷺ بەوشێوە هەڵسو کەوتی کرد، وادەی پێدا کەزۆر ماندوی نەکاو زیاد لەوزەی خۆی ئەرکی نەخاتە سەر، داوای لەخودا کرد: کەپشتیوانی بێو وەکوو پیاوچاکان هەڵسو کەوت لەگەڵ پیاوچاکان دا بکا! سەیری ئەم جۆرە ئەدەبو تەواضوعە!! پاکانە بۆخۆی ناکاو دان بەپیاوچاکی خۆی دا نانێ، بەڵکوو هیوا خوازی ئەومیە، لەپێڕی پیاوچاکان بێ، کارەکە حەواڵەی ویستو مەشیئەتی خودا دەکا.

حەزرەتی موسا ﷺ پێشنیارەکەی قبووڵ کردو وەڵامی دایەوە ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ﴾ بەخەزوری گوت: ئامادەم بەو مەرجو خالانەی فەرمووتن ڕازیم ﴿أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ هەر ماوەیەکیانم تەواو کرد بەدەست خۆم بێ، خۆم سەر پشك بم؛ هەشت ساڵەکە تەواو دەکەم یان دەیکەمە دە ساڵ زۆریم لێ نەکرێ، لەکاتی ڕەنجبەریەکەشم دا زیاد لەتوانای خۆم داوام لێ نەکرێ، ئەگەر زیاد لەهەشت ساڵم شوانی بۆ کردی پیاوەتی بێو ئەگەر نەمکرد داوام لێ نەکەی. خودا شاهیدو چاودێرمان بێ، هەریەکەمان بتوانێ ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکا!

**تێبینی:** زانایانی ئیسلام لەڕستەی ﴿أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ....﴾ چەند حوکمێکی شەرعییان دەرهێناوە:

١- ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە: بۆ وەلی دروستە کچی خۆی رابنـوێنیّو پێشنیاری ئەوە بکا بۆ پیاوێك کـە: بەلایـەوە گونجاوبـێ بێتـە خـوازبێنی کـچەکەی. ئەمـە دابو نـەریتێکی ئـایینیو پەسـندەو لەکۆنـەوە خوداپەرسـتان پـەیڕەوییان کردوە. ئەوەتا پیرەمێردی خوداناسی مەدیـەن کـچەکەی خـۆی بـۆ حـەزرەتی موسـا ﷺ رانواند، عومەری کوری خەتتاب ﷺ حەفصەی کچی بۆ ئەبوبـەکرو پاشـان بـۆ عوسمان رانواندو ئەوەی پێی راگەیانـدن: کـەپێ خۆشـە حەفـصەیان لـێ مـارە بکـا، کەئەبوبەکرو عوسمان ﷺ ئامادەباشییان تێدا نەبوو، پێغەمبـەر ﷺ بۆخـۆی مـارەی کرد.

ئافرەتێکی تر بۆخۆی بە پێغەمبەری گوت: کەپێ ی خۆشە مارەی بکا.

ئیمامی بوخاریو نەسائی لەئیبنوعومەرەوە ریوایەتیان کردوە دەفـەرموێ: (لما تأيمت حفـصة مـن حذافـة بـن خنـيس الـسهمي قـال عمـر لعثمـان ان شـئت أنكحـك حفـصة بـن عمـر) بەهـەمان شـێوە موفاتەحـەی ئەبوبەکریـشی کـرد، بـەلام هەردووکیان بیانوویان بۆ عومەر ﷺ هێنایەوە ئامادەباشـییان تێـدا نـەبوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەوەپێش رۆژێك بەباشی نـاوی حەفـصەی هێنـا ئەبوبـەکرو عوسمـان ﷺ گومانیان وابوو کە: وێدەچێ پێغەمبەر ﷺ خۆی مارەی بکا. هەروایش دەرچوو.

٢- رِسـتەی (أنكحـك) بەلگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە: نیکـاح بەدەسـت (وەلی) یـەو ئـافرەت نـاتوانێ بۆخـۆی پێـی هەلّـسێ، ئەمـە رای جـەماوەری زانایانـە جگـە لەئەبوحەنیفە.

٣- هەروەها ئایەتەکە بەلگەیە لەسەر ئەوە کە: بـاوك دەتـوانێ کچی رەسـیدەی خۆی لەپیاوێکی گونجاو مارەبکاو داوای ئیـزنو رەزامەنـدیی لـێ نـەکا، ئەمـەش رای جەماوەری شەرعزانانە، بەلام ئیمامی ئەبوحەنیفە فەرموویـەتی: هـەرکاتێ کـچۆڵە رەسـیدە بـوو، بـەبێ رەزامەنـدیی خـۆی کـەس بـۆی نیـە مـارەی بکـا، چـوونکە بەرەسیدەبوون دەگاتە قۆناغی تەکلیفو بەرپرسیاریەتی. بەلام پێش رەسـیدەبوون

ئەوە (وەلی) دەتوانێ بەبێ ڕەزامەندیی کچەکە خۆی مارەی بکا، چونکە پێش بالغ بوون ئیعتیبار بەئیزن‌و ڕەزامەندیی ناکرێ.

٤- شافیعییەکان لەڕستەی (انی ارید ان انکحك...) حوکمی ئەومیان دەرهێناوە کە: گرێ بەندیی مارەکردن بەبێ وشەی (تزویج)و (انکاح) دانامەزرێ. مالیکییەکان دەڵێن: گریی بەندیی مارەکردن بەهەموو وشەیەك دادەمەزرێ کە: تەملیك بگەیەنێ بۆ هەتا هەتایە. بەمەرجێ شایەتی لەسەر بگیرێ. چونکە تەلاق بەوشەی صەریح‌و بەوشەی کینایە دەکەوێ، دەی مارە کردنیش بەوشەی صەریح‌و بەوشەی کینایە جێ بەجێ دەبێ.

## گەڕانەوەی موسا ﷺ بۆ میصرو نیگا بۆهاتنی

﴿۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ مِن شَٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ

إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ ﴿٣١﴾ اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٣٢﴾

ئـەوا موسا ﷺ لەمەدیـەن نیـشتەجێ بـوو، بووبـە ڕەنجبـەری خـەزوری، ژنـی گواستەوەو هاوسەری بـۆ پەیـدا بـوو، خێزانـی پێکەوەنا، دە سـاڵ تێپـەڕیو شـەرتی پەڕی، سیاقی قورئانەکە هیچ شتێك لەم بـارەوە بـاس ناکاو لێیـان بێدەنگە. ئێـستا زەمـەن دەپێـچێتەوەو زنجیرەیـەکی تـری چیرۆکەکە دەسـت پـێ دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْآجَلَ﴾ کاتێك موسا ﷺ ماوەی دەساڵەی تەواو کردو بەتەواوی ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێنا، بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی میصرو دیـدەنی خزمو کەسو کاری بکا ﴿وَسَارَ بِأَهْلِهِ﴾ لەگـەڵ خێزانـی دا بـەرەو شوێنی مەبەسـت کەوتـەڕێو شـەویان لێ بەسـەرهاتو ڕێگایـان لێ تێـك چـوو، سـەرمایان بـوو، ئالـەم وەزعو حاڵەدا بـوون ﴿آنَسَ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ نَاراً﴾ ئـاگرێکی دووری بینـی لـەلای کێوی (طوور)ەوە، دەدرەوشایەوە ﴿قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا﴾ فـەرمانی کـرد بـەخێزانیو ئەوانەی لەگەڵیان دا بوونو پێی گوتن: ئێوە لێـرە بمێننـەوە ﴿إِنِّي آنَسْتُ نَاراً﴾ ئەمن ئاگرێکم بینی دەچم بزانم چیە، ﴿لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنْ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ بـەڵکوو هـەواڵێکی ڕێگـام دەسـتکەویو سـوراخێکی بکـەم یـان دەستەچیلەو سـەرەبزوتێك لـەو ئـاگرە بهێـنم خۆمـانی پـێ گـەرم بکەینـەوەو لـەو سەرمایە ڕزگارمان بێ!!

﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِنْ شَاطِئِ الْوَادِي الآيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَنْ يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ کاتێ گەیشتە ئەو شوێنەی لەدوورەوە بینی ئاگرەکەی لێ دەهایسا، لە کەناری لای راستی دۆڵەکەوە بانگی لێ کرا، واتە لەلای راستی موساوە ﷺ بەلای خۆرئاواوە بانگی لێ کرا. لەو شوێنەدا درەختێکی بەرزی سێبەرداری لێ بوو، ئەو دۆڵەیش کەوتبووە پارچە زەوییەکی وا کە خودا بەفەضلی خۆی پیرۆزی کردوە، بەوە پیرۆز بوو کەسەرەتای نیگا کردن بۆ موسا ﷺ لەو شوێنەدا ئەنجام دراو لەوێدا خودا ئاخاوتنی لەگەڵ کرد.

پەروەردگار لەوشوێنە پیرۆزەدا لەلای درەختەکەوە بانگی لێ کردو فەرموی: ئەی موسا من ناوم (الله) یە خودای تۆم، پەروەردگاری بوونەوەرم، هەر من خودام و شیاوی بەندایەتی بۆکردنم و هیچ خودای ترنین، نەعلەکانت داکەنە بەپێخاوسی و بەئەدەبەوە ئامادەباش بە بۆ وەرگرتنی فەرمان، ئەتۆ ئێستا لەسەر پارچە زەوییەکی پیرۆز وەستاوی و خیطابت لەگەڵ دەکرێ.

بێگومان پەروەردگار لەو کاتەدا زانیارییەکی یەقینی لەموسادا خوڵقاند کە: دڵنیابێ ئەوەی دەیبیسی کەلامی، خودایە، جا چۆنی بیست و لێی حاڵی بوو، ئەوە هەر خودا بۆخۆی دەزانێ و لەچوارچێوەی زانیاری ئادەمیزاد بەدەرە.

ئەبولحەسەنی ئەلعەشعەری دەفەرموێ حەزرەتی موسا ﷺ کەلامی قەدیم و ئەزەلی راستەوخۆ لەخودا بیست نەك لەدرەختەکە. ئەبو مەنصووری ماتوریدی دەڵێ خودا دەنگ و پیتی بیستراوی لەدرەختەکە خوڵقاندن و لەدرەختەکەوە ئاخاوتنەکەی بیست!!!

بێگومان دەستی قودرەت هەنگاو بەهەنگاو قۆناغ بەقۆناغ حەزرەتی موسای ﷺ پێگەیاند، هەر لەوکاتەوە کەتازە لەدایك بووەو شیرە خۆرە بووە تائەوکاتەی کراوە بە پێغەمبەرو رەوانەکراوە بۆ سەر فیرعەون، ژیانی هەمووی موعجیزەو لەبۆتەدان و بەتاقیکردنەوە بووە، دایکی فرێی دایە ناو دەریای نیلەوە بۆئەوەی ئالی فیرعەون بیگرنەوە، لەدڵی خێزانی فیرعەون دا شیرین بوو بۆئەوەی لەماڵی

دوژمنـی سـەر سـەختی دا پـەروەردە بکـرێ، ڕۆژێـك لـەڕۆژان لـەکاتێکی وادا هاتـە ناوشارەوە دانیشتوانی شار هەموویان لێ ی بێ ئاگابوونو خەریکی ئیستیراحەتو حەسانەوەو نووستن بوون. ئالەوکاتـەدا موسا ﷺ خۆی بەشاردا کـرد بۆئـەوەی بەسـەر شـەڕی کـابرای قیبطیو بەنوئیسرائیلی دا بکـەوێو بەزللەیـەك کـابرای قیبطی بکـوژێ، کـابرای خوداپەرستی لـەئالی فیرعـەون بۆنـارد بۆئـەوەی هـەواڵی موئامـەرەو پیلانـی گـرتنو کوشـتنی پـێ بـداو ئامۆژگـاری بکـا بەهـەڵاتنو بـەجێ هێشتنی شـاری میصر! بەدرێـژایی ڕێگـای نێـوان میصرو مەدیـەن؛ ڕێگایـەکی خەتـەرناكو کـاکی بـەکاکی دەستی قـودرەت لەگـەڵی دا بـوو، پاراستی، بـێ تێـشوو ولاغـی سـواریی‌و بەنەشـارەزایی ڕێگـای سـامناکی بـڕیو بەخزمـەت پیرەمێـردی کۆنەساڵ گەییشتو دەساڵ ڕەنجبـەریو شوانی کـرد، تالـەئاکام دا لەگـەڵ خێزانـی گەڕایـەوە بۆمیصرو لـەڕێگا نیگـای بۆهـاتو پلـەی پێغەمبـەرێتی پـێ بەخـشرا! بەڕاستی ژیـانی هـەمووی بۆتـەدانو چـاودێریکردنی پـەروەردگار بـوو، هـەمووی تاقیگـاو بەتاقیکردنـەوە بـوو، لەترسـان فـڕێ درایـە ناودەریـاوە، بـەبێ کەسـی هەڵگیرایـەوە، خۆشەویـستی خرایـە سـەرو لـەدڵی خێزانـی دوژمنـی دا شـیرین بـوو بەنانو ئاوی دوژمنی سەرسەختی پەروەردە کرا، بەنازو نیعمەتی قەصری پاشایان پێگەیی‌و لەناو حەریرو جێگای نەرمو نۆڵ دا پەروەردە بوو، تووشی پیاوکوشتنو پەشیمانی لەهەڵەو ئەمجار تۆبـەو ئیستیغفار بـوو، ناچار بـوو خۆحەشـار بـداو بەڕاشکاوی نەگەڕێو لەهەموو شوێنێك خۆدەرنـەخا، تووشی ڕاوەدونـانو هـەڵاتنو دەربەدەریی‌و ئاوارەیی بوو، ژیانی تـەنیایی‌و غـەریبی‌و برسـیایەتی بـەتاقیکردەوە، لەژیانی پڕ نـازو نیعمـەتی قەصری پاشایانەوە هاتـە ناوژیـانی ڕەنجبـەریو شوانی ئاژەڵو ڕەهەندەیی. ئەم گۆڕانکارییـە جوداوازیانـە زنجیرەو فلیمـی ژیـانی هەسـتو شعووری جۆراو جۆری لەلا خولقاندن، زانستو زانیاریان لێ فێـر بـوو، ئەمـە وێـڕای ئەو عـیلمو حیکمەتـەی خـودا پـێ ی بەخـشی‌و ئامـادەی کـرد بۆهـەڵگرتنی ئـەرکی گەورەو پیرۆزی فروستادەیی!

بێگومـان پێغەمبەرایـەتی ئـەرکێکی قـورس‌و گرانـە، گـەڵ لایـەن‌و ئـەرك‌و زەحمـەتی لـەخۆگرتووە، کەسـێك ئـەو پلـەو پایەیـەی پـێ ببەخـشرێ، پێویـستی بەتێـشوویەکی زۆرو چـڕو پڕهەیـە لەتاقیکردنـەوەو ئەزموونگـەری‌و زانـست‌و زانیـاری‌و لەبۆتـەدان‌و قـاڵبوون‌و چەشـتنی تـاڵی‌و سـوێری ژیـان!! ئەمـە وێـڕای بەخشش‌و نیگای یەزدانی کە: پێی دەدرێ‌و بەسروش ڕێنمویی دەکرێ.

پـەیامی حـەزرەتی موسا ﷺ بەتایبـەتی لـەناو پەیامـە ئاسمانییـەکان دا دوای پەیامی حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ گەورەترین ئـەرك بـووە کـە: خراوەتـە ئەسـتۆی ئـادەمیزاد، چـونکە ئەوزاتـە ڕەوانـە کـراوە بۆسـەر فیرعـەونی ملـهوڕو سـتەمکار، سەرڕەقترین پاشـای ڕۆژگاری خـۆی، کۆنترین بنەماڵەی پاشایەتی‌و دامـەزراوترین فرمـانڕەواو چەوسـێنەرەوەترین پاشـا بـۆ مـسکێن‌و قەلەنـدەرە ژێـر دەسـتەکانی. لەهەمووکەس زیاتر خۆپەرست بوو، لافی خودایەتی لێ دەداو خۆی بەخودای میـصر دەزانی، موسا ﷺ ڕەوانە کرابوو بۆسـەر ئـەو سـتەمکارە دڕەنـدەو بۆڕزگـار کردنـی گەل‌و نەتەوەی ئیسرائیل لەژێردەستی ئەو ستەمکارە ملهوڕە..

ڕەوانـــەکرابوو بۆڕزگـــار کردنـــی نەتەوەیـــەك هێنـــدە چەوســـێندرابوونەوەو ستەمیان لێ کرابوو باریان پێوە گرتبوو، چەوساندنەوەو زەلیلی‌و ژێردەسـتەیی ئـاوا درێژ خایەن‌و ڕەگ داکوتراو سروشت تێك دەداو نەخوەو پیاوەتی دەمرێنـێ‌و هێـزو تواناکان پـەك دەخـاو هەسـت‌و شـعور کول‌و کۆڵـەوار دەکا، سروشـتیان دەگـەنێنێ‌و دەپۆڵکێنێ، دەی ڕزگار کردنی گەل‌و نەتەوەی ئاواو سەرلەنوێ ژیاندنـەوەیان تـابڵێ ی کارێکی ئەستەمەو ئەرکێکی گرانە!

حەزرەتی موسـا ﷺ ڕەوانـەکرابوو بۆسـەر گـەل‌و نەتەوەیـەك بـیرو بـاوەڕێکی کۆنیان هەبوو لێیان لادابوو، دیمەنی بـیرو باوەڕەکـەیان لێ شـێوا بـوو، وانـەبوو دڵ‌و دەروونیـان لەهـەموو عەقیـدەو باوەڕێـك خـاڵی بـن‌و بەئاسـانی بیروبـاوەڕی تـازە وەربگرن، چونکە بەڕواڵەت دڵ‌و دەروونی خاڵی زوو بانگەوازیی وەردەگـرن، لەسـەر بیروباوەڕی خۆیشیان نەمابوون، کەوابوو چارەسەرکردنی دڵ‌و دەروونی ئاوا شێواوو

عەقیدەی ئاوا تێکچوو کۆمەڵگای ئاوا لەگرێژنە دەرچوون، زۆر زەحمەتو دژوارەو پێویستی بەکەسێك هەیە زۆری ئەزمونو تاقیکردنەوە بینیبیٚو زۆرجار لەبۆتە درابیٚ.

بەکورتی حەزرەتی موسا ﷺ ڕەوانە کرابوو سەرلەنویٚ کۆمەڵگای بەنو ئیسرائیل دروست بکاتەوە، نەتەوەی ژێردەستەو خوێڕیو پوڵکاو زیندوبکاتەوە.

کەوابوو حەزرەتی موسا ﷺ (منقذ ومصلح)ی بیٚ وێنەی نەتەوەکەیەتی. لەسەر دەستی ئەو بۆیەکەمجار نەتەوەی ئیسرائیل بوون بەگەلێکی سەربەخۆو خۆناسو خاوەن پێناسە، ژیانی تایبەتییان دەست پیٚ کردو نامەی ئاسمانی بوو بەپەیڕەوو پرۆگرامیان. بێگومان رزگار کردنی نەتەوەو دروستکردنەوەو ژیاندنەوەی کارێکی قورسو ئەرکێکی ئەستەمو پڕ ئاستەنگە! دەگونجیٚ لەبەر ئەم مەبەستا نەبیٚ کە: قورئانی پیرۆز ئەوەندە گرنگی داوە بەم چیرۆکەو بەو هەموو شێوە جۆراو جۆرانە گێڕاویەتەوە، بێگومان چیرۆکی حەزرەتی موسا ﷺ نموونەی ناوازەو ئاوێنەی باڵانمایە بۆ دروستکردنەوەی نەتەوە لەسەر بنەمای بانگەوازییو زاڵ بوون بەسەر ئەو کۆسپو تەگەرە ناوخۆییو دەرەکیانەی دێنە سەرڕێی بانگەوازییەکە.

ئەگەر حەزرەتی موسا ﷺ هەر لەقەصری فیرعەون دا بمایەوەو نازو نیعمەتی قەصری پاشای لیٚ نەبڕایەو تووشی ڕاوەدونانو دڵەراوکیٚو ترسی برسییەتیو ڕەنجبەریو شوانی نەبوایە، هەرگیز ئامادەباشی هەڵگرتنی ئەرکی پێغەمبەرایەتی تێدا نەدەبوو، تەجرەبەو ئەزموونی دەساڵ ڕەنجبەریو شوانی بۆئەوە بوو، ژیانی پڕ نازو نیعمەتی قەصری پاشای لەبیر بەرێتەوەو ئامادەباشی تێدا بیٚ بۆ ژیانی پڕمەشەقەتو قورسو گرانی بانگەوازیو پێغەمبەرایەتی، بێگومان ژیانی ناو قەصری پاشاو باڵەخانەی سامانداران کەشو هەوایەکی تایبەتی هەیە، دابو نەریتی خۆی هەیە، بەناز پەروەردە بوونو ژیانی نەرمو نۆڵ، دڵو دەروونو نەفس بەشێوەیەکی تایبەتی ئاراستەدەکەنو پەروەردەی دەکەن، هەرچەندە

نەفس‌و دەروونی بەناز پەروەردە پاك‌و خاوێن‌و خاوەن هەست‌و شەفافیەتی تێدا بێ، کەش‌و هەوای قەصری پاشا گاریگەریی خۆی تێدا دەخولقێنن، پێغەمبەرایەتیش بریتییە لەماندو بوون‌و هەلگرتنی ئەرك‌و ئورکی جەماوەرو بەخەمەوە بوونیان.

کۆمەلگا دەولەمەندو هەژاری تێدایە، باش‌و خراپی تێدایە، دلپاك‌و دلپیسی تێدایە، ماندوو حەساوەی تێدایە، گورج‌و گۆلّ‌و تەمبەلی تێدایە......هتد.

هەریەکە لەم چین‌و توێژە جیاجیایانەی کۆمەلگا داب‌و نەریتی تایبەتی خۆیان هەیە، شێوەی نانخواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك‌و هەلس‌و کەوت‌و تێگەیشتنیان لەژیان‌و دەربڕینی هەست‌و شعوریان، پەیوەندی کۆمەلایەتی‌و خزمایەتییان جۆرە تایبەتیەکی تێدایە، دلّ‌و دەروونی بەناز پەروەردەبوان‌و پێگەیشتوانی ناو قەصرو بالەخانەی پاشایان ناتوانن هەلس‌و کەوتی لەگەلّ دا بکەن، تەنانەت ناتوانن سەیری بکەن‌و ببینن، چ جایی شانی بەردەن‌و چاکی لێ هەلبکەن‌و هەولی گۆڕانی سەد دەرسەدی بدەن‌و چارەسەری بکەن!

پێغەمبەرایەتی ئەرکێکی قورس‌و گرانە، دەبێ کەسێك شانی بەربدا، کەتالّی‌و سوێری ژیانی چەشتبێ، بەناز پەروەردەو قەصر نشینەکان چەندێك ئامادەباشی گیانفیدایی‌و خۆبەختکردنیان تێدابێ، بەهۆی ئەو ژیانە خۆشەی تێیدا پەروەردە بوون، ناتوانن بۆماوەیەکی زۆرو درێژ لەناو ژیانی زبرو پڕناڕەحەتی دا خۆبگرن بەردەوام بن لەسەر تێکۆشان‌و بەرخودان!!

ویستی پەروەردگار وابوو موسا ﷺ لەو ژیانە نەرم‌و نۆلەی ناو قەصری فیرعەون داببڕێ‌و تووشی ئەو هەموو دەردەسەری‌و ڕاوەدونانەی بکاو ڕێگای هات‌و نەهات بگرێتەبەرو لەئاکام دا بکەوێتە ناو پێری شوان‌و رەنجبەرانەوە، وای قالّ کرد بەو ترس‌و راوەدونانە، بەو زەحمەت‌و مەشەقەتەی تووشی بوو، هەست بەنیعمەتی خودا بکا کەوا شوانەو بەهۆی رەنجبەری بژیوو سوکنایی دەست کەوتووە، لەهەست‌و شعووری دا گیانی لوتبەرزی‌و ئیشمیزاز لەهەژاران‌و بێ

نەوایان دارنێ، هەستی دووره پەرێزیو خۆهەڵاواردنی تێدا نەهێشت، گیانی شانازی کردن لەئاست نەزانیو هەژاریو شرۆڵی گەلەکەی دا تێدا پوکاندەوە، بۆئەوەی بەگەورەیی فرێ بدرێتە ناو شەپۆلی دەریای ژیانەوە، پاش ئەوەی بەمندالّی فرێ درایە ناو شەپۆلی دەریاوە، بەلّێ بەوشێوە حەزرەتی موسا ﷺ لەژێر چاودێری پەروەردگاردا پێگەیی، دەستی قودرەت پەروەردەی کردو ئامادەباشی کرد بۆ وەرگرتنی ئەو ئەرکە قورسو گرانەی خرایە ئەستۆی!!

دەبێ چ خەیالّێك بەدلّی حەزرەتی موسا ﷺ دا هاتبێو چۆن بڕیاری گەڕانەوەی دابێ بۆ وڵاتی میسر؟ ئەو لەترسی فیرعەونو دارو دەستەکەی میسری بەجێ هێشتو بەپەلە پەل خۆی ڕزگار کرد، هێشتا فیرعەون بۆخۆی لەژیان دایەو لەوپەڕی دەسەلاتو فرمانڕەوایی دایە، چ عافواتو لێبوردنێکی بۆ دەرنەچووە. ئەی چۆن بڕیاری گەڕانەوەی دا؟ بێگومان ئەمە دەستی قودرەتەو هەنگاوەکانی پێ دەهاوێژێ،وێدەچێ حەزێکی سروشتی بۆ دیدەنی خزمو عەشیرەتی، بۆ زێدو نیشتمانی پالّی پێوەنابێ بۆ گەڕانەوەو ترسو خۆفی لەبیر چوبێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو ئەرکەی بۆی بڕیاردراوە بیگرێتە ئەستۆی، وەری بگرێو شانی بەربدا.

بەهەرحاڵ وا حەزرەتی موسا ﷺ گەڕایەوەو خێزانی لەگەڵ دایە، کاتەکە زستانەو سەرمایەو شەوە زەنگەو ڕێگایان لێ گوم بووە، پێویستیان بەئاگر هەیە خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە، خواخوایانە یەکێکیان دەست بکەوێ ڕێگایان نیشان بدا، حەزرەتی موسا ﷺ فەرمان بەخێزانی دەکا کە: ئەوان لەشوێنی خۆیان بمێننەوە بۆخۆی بچێ سۆراخی ڕێگا بکاو دەستەچیلەو سەرەبزوتێك بێنێو خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە، بەلاّم کە لەئاگری دوور دیتراو نزیك بووەوە، سەری سوڕما، ئاگر لەدرەختی سەوزەوە دەردەچێو ئاگرەکە درەختەکە ناسوتێنێ، ئالەوکاتەدا : کەئەو لەقەراخ شیوەکەوبەتەنیشت کێوی طورەوەیەو دۆڵەکە کەوتۆتە لای دەستی ڕاستیو لەو پارچە زەوییە پیرۆزەدا کە: لەوکاتەوە پیرۆزیی پێ برا، نیگای ئاسمانی بۆکرا! ڕاستەو خۆ لەخوداوە بانگی لێ کرا، بەتەنیا لەو شەوە تاریکە سەرمایەدا، لەو دۆڵە

فووڵە ترسناکەدا، پەیامی ئاراستە کرا، پەیامی بیستو نیگای وەرگرت، بەوجۆرە کەهەرخودا خۆی دەزانێ چۆنی بیستو چۆنی وەرگرت. ئەوشوێنە پیرۆز بوو چونکە خودا نووری تێدا دەرخستو ئەو شیوو دۆڵەش تایبەتمەندی خۆیان پێدرا کەبەو تەجەللیە پیرۆز بوون: حەزرەتی موسا ﷺ گەیشتە بەرزترین پلەیەك کەئادەمیزاد بیگاتێو لەبەرزترین مەوقیف دا راوەستا، شەرەفو رێزی ئاخاوتن لە پەروەردگاری بوونەوەری پێ برا!! بانگی ئاسمانی درێژەی کێشاو تەکلیف لەبەندەی گۆچان بەدەستی دەستەو نەظەر راوەستاو کرا؛ پەروەردگاری بوونەوەرو خاوەن فەضلو بەخشش، ویستی نیشانەی قودرەتی خۆی نیشان بدا، بانگی لێ کرد ﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ واتە: ئەو گۆچانەی بەدەستەوەیە فرێی بدە، بیهاوێژە، حەزرەتی موسا ﷺ خێرا دەست بەجێو بەمەبەستی ئەنجامدانی فەرمانی پەروەردگاری عەصای دەستی فرێ دا، بەڵام چ روی دا؟!!

هەر لەگەڵ گۆچانی هاویشت ئەو گۆچانە نەما: کەساڵەهای ساڵ بوو بەدەستیەوە بوو دەیزانی دارێکی بێ گیانە: بینی ئەوە بەجەستە مارێکی گەورەو زەبەللاحە، بەگورجو گۆڵیو تیژرەوی وەکوو تیرەمارە، زانیو لێی مەعلووم بوو ئەوکەسەی ئاخاوتنی لەگەڵ دەکا ئەوخودا خاوەن دەسەڵاتەیە کەبەهەرشتێك بڵێ ببە دەبێ ﴿فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِراً وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ جا: کەعەصاکەی بینی کەوتۆتە جمو جووڵ دەتگوت: جندۆکەیە لەزەبەللاحیو خێرایی دا، یان دەتگوت: تیرەمارە لەشێوەو تیژرەوی دا، پاشەو پاش کشایەوە، هەڵبەتە ئەو دیمەنە بۆ حەزرەتی موسا ﷺ موفاجەئەیەك بوو لەوەپێش ئامادەباشی بۆ نەکردبوو، بۆیە هەر لەگەڵ بینی یەکسەر پاشەوپاش کشایەوەو هیچ بیری لەوە نەکردەوە: کەبگەرێتەوە بزانێ حەقیقەتی ئەوە چیە عەصاکەی پێش تاوێك دارێکی رەق بوو بەدەستییەوە بوو ئێستا بۆ وای لێ هات.

ئەمجار پەروەردگار ترسەکەی ڕەواندەوەو پێی فەرمووو: ﴿يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ﴾ ئەی موسا! بگەڕێوە بۆشوێنی خۆت‌و وەرەوە شوێن ڕاوەستانی پێشووت، لەوەوارە ئەژدیها هارە مەترسە، ئەتۆ پارێزراوی، حەزرەتی موسا عليه السلام گەڕایەوە مەقامی هەوەڵجاری‌و دەستەو نەظەر ڕاوەستایەوە، ترس‌و بیمی نەما!

ئەمجار پەروەردگار پێی فەرمووو: ﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ دەستت بخەرە باخەڵتەوە ئەگەر دەستت بخەیتە باخەڵتەوە کە: دەری دەهێنیەوە دەدرەوشێتەوە، پڕتەوو ڕوناکییەکی هەیە دەڵێی پارچەیەکە لەمانگ، سپی بوونەکەشی هۆی عەیبداری‌و نەخۆشی نیە..

حەزرەتی موسا عليه السلام فەرمانی بەجێ هێنا دەستی خستە باخەڵی خۆیەوەو دەری هێنایەوە، چی ببینێ؟! دەستی سپی بووەو دەدرەوشێتەوە، هیچ دیاردەی ئازارو بەڵەکی‌و عەیبداری بەدەستی خۆیەوە نەبینی، لەوەپێش ڕەنگی دەستی گەنم ڕەنگ‌و ئەسمەر بوو، ئێستا ئەوا لەپڕێکا ئەم درەوشانەوەو ڕوناکی یەی بەسەردا هات!! حەزرەتی موسا عليه السلام لەحەقیقەتی ئەو دیمەنە حاڵی بوو لەهەیبەت‌و سەرسامی لەودیمەنە خاریقولعادانە کەوتە لەرزین!!

ئیتر دووبارە چاودێریی پەروەردگار ئارامی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ﴾ لەبەر ئەو سام‌و هەیبەتەی تووشت بووە، دەستت بخەرە سەرسنگت بۆئەوەی دڵە کوتەت نەمێنێ‌و ترس‌و خۆفت بڕەوێتەوە. فەرمانی بەجێ هێناو دڵی ئارامی گرت‌و ترسی نەما!

ئیبنوعەبباس رضي الله عنه فەرموویەتی: هەرکەسێك ترسا ئەگەر دەستی بخاتە سەرسنگی ترسەکەی نامێنێ.

﴿فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِنْ رَبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ﴾ ئەونیشانانە: عەصای بەئەژدیها بوو دەستی درەوشاوە، دوو بەڵگەو موعجیزەی

بەردەوامی تۆن، دوو بەڵگەو نیشانەی ئاشکران لەسەر قودرەتی پەروەردگارو راستی پێغەمبەرایەتی تۆ بۆسەر فیرعەون‌و دارو دەستەو گەلەکەی، بێگومان ئەوان لەفەرمانبەرداریی خودا دەرچوون، سەرپێچی فەرمان‌و ئایینی خودا دەکەن، شیاوی ئەوەن تۆ بکەینە پێغەمبەرو بەو موعجیزانەوە بتنێرین بۆسەریان!

ئێستا وائەو ئەرکەی لەمنداڵییەوە بۆی پەروەردە کرابوو خرایە ئەستۆی، ئەرکی پێغەمبەرایەتی بۆسەر فیرعەون‌و دارو دەستەو گەڵ‌و شوێنکەوتوانی، ئەوە ئەو وادەو بەڵێنانەی خودا خستبوونیە دڵی دایکی یەوە لەوکاتەدا کەشیرە خۆرەبوو: کەنیگای بۆ کرد فەرمووی: ﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ هاتنە دی.

## پێغەمبەرێتی حەزرەتی هارون ﷺ لەگەڵ موسا ﷺ داو بەدرۆخستنەوەیان لەلایەن فیرعەونەوە

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَـٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ۚ بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا بَيِّنَـٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَـٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا

بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

حەزرەتی موسا ﷺ کە موعجیزەی عەصای بەئەژدیها بوو یەدی بەیضای پێدرا، زانی: کەرەوانە کراوە بۆسەر فیرعەون‌و گەلەکەی، ئەوەی بیرکەوتەوە: کەکاتی خۆی پیاوێکی لەو گەلە بەهەڵە لەدەست کوژراوە، ئەو لەترسی تۆڵەو سزای تاقمی فیرعەون میصری بەجێ هێشتووە، بۆیە ویستی ئیحتیاط بۆپەیامەکەی بکا، یەکەم وادەی ئەوە وەربگرێ: کەفیرعەون ناتوانێ بیکوژێتەوە، دووەم یارمەتیدەرێکی بخاتە گەڵ، بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْساً فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ﴾ موسا ﷺ فەرمووی: خودایە! من چۆن بڕۆم بۆسەر فیرعەون‌و گەلەکەی؟ لەکاتێك دا من پیاوێکم لەنەتەوەی فیرعەون کوشتووە، ترسی ئەوەم هەیە: کەچاویان پێم کەوت یەکسەر بم کوژن، بەمەش بانگەوازی‌و پەیامەکەم هەر لەسەرەتاوە ببڕێتەوەو هیچ بەهیچ نەکەم! هەڵبەتە ئەمەی گوت بۆ ئیحتیاط‌و دڵنیایی‌و بەرچاوڕوونی نەك بۆ عوزر هێنانەوەو تەمبەڵی، یان ترس‌و بیم لەگیانی خۆی.

﴿وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَاناً فَأَرْسِلْهُ مَعِي رِدْءاً يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ﴾ هەروەها هارونی برام زوبانی لەمن ڕەوانترە، باشتر دەتوانێ بەڵگەو نیشانەکان بخاتەڕو، داواکارم ئەویش لەگەڵ مندا بکەیە پێغەمبەرو ببێتە یارمەتیدەرم، هەرکاتێ قسەم کرد پشتگیریم بکاو بەڵگەو نیشانەکان ڕونتر بکاتەوە، شوبهەو گومانەکانی فیرعەون‌و تاقمەکەی پوچەڵ بکاتەوە، من دەترسم بەدرۆم بخەنەوە، کەبەدرۆیان خستمەوە پێویستیم بەیارمەتیدەر هەیە لەگەڵمدا

بەرچەرچی بەدرۆخەرەوەکان بداتەوە، ئەگەر کوشتیشیانم خێرا ببێتە جێ نشینمو نەهێڵێ درەختی بەبەری پێغەمبەرایەتی وشك بێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي، يَفْقَهُوا قَوْلِي، وَاجْعَل لِّي وَزِيراً مِّنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي، اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾ (طه/٢٧-٣٢)

پەروەردگار وەڵامی حەزرەتی موسای دایەوەو داخوازییەکانی گیرا کردنو ﴿قَالَ﴾ فەرمووی ﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾ پشتت بەهێز دەکەین بەوە هارونی براشت دەکەینە پێغەمبەرو یارمەتیدەرت. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى﴾ (طه/٣٦) سەرباری ئەوە ﴿وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَاناً فَلا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا﴾ بەلگەو نیشانەی بەهێزو پتەوتان دەدەینێ، واتان لێ دەکەین بەسەر دوژمنەکەتان دا زاڵ ببن، دەستی ستەمکاری ئەوتان ناگاتێ، ناتوانێ زیانتان پێ بگەیەنێ. خوداتان لەگەڵەو کێ دەتوانێ دەستتان بۆ درێژبکا!!

هەندێ لەزانایانی سەلەف فەرموویانە: کەس هێندەی حەزرەتی موسا ﷺ پیاوەتی بەسەر برای خۆیەوە نیە، ئەوەتا ئەوەندەی بۆ پاڕایەوە خودا کردی بە پێغەمبەرو لەگەڵ موسادا ڕەوانەی کرد بۆسەر فیرعەونو نەتەوەکەی! بۆیە پەروەردگار دەربارەی موسا ﷺ لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ (الاحزاب/٦٩)[١]

ئیمامی (السدی) فەرموویەتی: بێگومان دوو پێغەمبەرو دوو موعجیزە لە پێغەمبەرێكو موعجیزەیەك بەهێزترن. بڕۆن بۆلای فیرعەون، یان ئێمە ئێوە زاڵ دەکەین بەئایاتو موعجیزەی خۆمان.

﴿بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾ ئەی موسا! ئەتۆو هارونی براتو ئەوانەی شوێن پەیامی ئێوە دەکەون بەبەلگەی بەهێزو پتەوتان سەرکەوتوو دەبن.

---

[١] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج ١٣٩٨/٣.

ئیتر سیاقەکە کۆتایی بەم دیمەنو مەقامو شوهودە دەهێنێو زەمانو مەکان دەپێچێتەوەو کاتێك دەزانین ئەوا موساو هارون بەرەو رووی فیرعەون بوونەوە. دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ مُوسَى بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الأَوَّلِينَ﴾ کاتێك حەزرەتی موسا عليه السلام و هارون عليه السلام هاتنە سەر فیرعەونو تاقمو کۆمەڵی، پەیامی خۆیان بەسەردا رانواند، موعجیزەو نیشانەی راستی خۆیان ئاشکرا کردن، بانگەوازییان کرد بۆ خودا ناسینو یەکتاپەرستیو شوێنکەوتنی فەرمانو نەهی پەروەردگار، بانگەوازییەکەیان رەتکردنەوە، وتیان: ئەم پەیامەی ئێوە جگە لەسیحرێکی ئاشکرا هیچی ترنیە، درۆیەکی هەڵبەستراوەو هەرگیز ئێمە لەوەپێش پەیامی ئاوامان نەبیستووە، باسی تاكو تەنهایی خوداو بەندایەتیکردن بۆ خودامان لەپێشینانی خۆمان بەگوێ دا نەدراوە.

موشریکەکانی قورەیشیش لەمەککە هەمان ئاخاوتنیان بەرووی پێغەمبەردا دایەوەو وتیان: ﴿مَا هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الأَوَّلِينَ﴾ ئەمە دابو نەریتی هەموو ئەو ملهورانەیە کە: مل بۆ حەق نەوی ناکەن، لەبەرامبەر حەقو راستی دا بێ بەڵگەو وەڵامن، لەمەیدانی موناقەشەدا بۆر دەخۆنو هیچیان بەدەستەوە نامێنێ، ئیتر پەنا دەبەنەبەر ئەم جۆرە قسانە، قسەی نەفامانەی وا: کە حەق ناچەسپێننو بەتاڵ پوچ ناکەنەوەو داوا رەت ناکەنەوە، جا چونکە فیرعەونو تاقمەکەی چ بەڵگەیان نەهێنانەوە هەتا موسا عليه السلام موناقەشەیان بکا، داوای بەڵگەیان لێ نەکرد هەتا بیانداتێ، بۆیە حەزرەتی موسا عليه السلام یەکالا کردنەوەی کارەکان حەواڵەی پەروەردگار دەکا! دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ مُوسَى رَبِّي أَعْلَمُ بِمَنْ جَاءَ بِالْهُدَى مِنْ عِنْدِهِ وَمَنْ تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ واتە: موسا عليه السلام وەڵامی فیرعەونو دارو دەستەکەی دایەوە وتی: خودای من: کەهیچ خودای تر نین جگە لەئەو، ئەو خودایەی بەدیهێنەری هەموو شتێکەو غەیبی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، ئەو لەمنو ئێوەش زاناترە بەوە کێ لەسەر حەقەو کێ لەسەر بەتاڵە، کێ

بانگەوازیی حەقەو کێ بانگەوازیی بەتاڵە، کێ شیاوی سەرکەوتنەو کێ سەرەنجامی پیرۆزو سەربەرزانە بەدەست دێنێ، ئەو خودایە زاناو دانایە لەوە بەولاوە نێوانی منو ئێوە دەکا، بێگومان ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن سەرکەوتوو نابنو بەمراز ناگەنو بەختەوەر نابن!

بەڕاستی ڕەتدانەوەو ئوسولوبێکی بەئەدەبو بەرزی پەیڕەو کرد، بەکینایەو مەجاز ئاخاوتن دەکاو ڕەد دەداتەوە، لەهەمان کات دا ڕەدەکەی واضیحو ئاشکرایەو پێچو پەنای تێدا نین. بتمانەی تەواوی بەخۆیەتیو دەزانێ لەئاکامی کێ بڕکێو بەرەنگاری دا حەق سەرکەوتووە.

## دەمە دەمێی فیرعەون دەربارەی خودایەتی (اللە)و سەرەنجامی سەررەقی خۆیو نەتەوەکەی

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَـٰهَـٰمَـٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَـٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ

ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

فیرعەون لەبەرامبەر ئەو ڕەدە کورتو بتمانە بەخۆ بوونو ئەسلووبە جوانەی موسادا گەزاتی کێشاو فسقەڵ بوو، زیاتر سەر ڕەقی نواندو گاڵتەی بەموسا کردو، بانگی هەڵدا: وەکوو قورئان لێیەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ وتی: ئەی پیاو ماقوڵانی دیوانو خەڵکی دەربارو ڕاوێژکارانم! تائێستا من نەمزانیوە ئێوە جگە لەمن خودایەکی ترتان هەبێ؛ ئەو خودایەی موسا باسی دەکا نیەو هەرمن خوداتانم...! بەڕاستی وشەیەکی ناشیرینو کوفرێکی گەورەو داوایەکی وێ نەچوو بوو، کەچی ئەشرافو پیاوماقوڵانی دەربار ئیقراریان پێدەکردو تەسلیمی دەبوونو هیچ بەرپەچیان نەدەدایەوە. فیرعەون لەم ئیدیعایە کوفر ئامێزەی دا پشتی بەئەفسانەو چیرۆکە کۆنی میصرییەکان بەستبوو، دەربارەی بنەماڵەو نژادی پاشاو فیرعەونە خۆبەزلزانەکانی پێشوو! هەروەها پشتی بەزەبرو زەنگی بێ بەزەییانەی خۆی بەستبوو، بەهۆی زەبرو زەنگو چەوسانەوەوە نەیدەهێشت کەس بیر بکاتەوە، زمانێك ورتەی لێ بهاتایە

دەبیرِی، سەرێك بیری دژ بەخودایەتی فیرعەونی تێدا بوایە دەیتەقاند، سەیر بوو ئەو گەلە بەچاوی خۆیان فیرعەونیان دەبینی ئادەمیزادێکە وەکوو ئەوان دەخواو دەمرێی‌و دەخەوێ‌و هیچی لەئەوان زیاترو جوداواز نیە، کەچی ئەم قسە گەورەیان ئاراستە دەکاو دەیبیسن‌و کەس رەخنە ناگرێ، قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی تردا هۆی ئەوە رون دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ (الزخرف/٥٤) ئەو بەچاوی سووکەوە دەیرِوانییە گەلەکەی‌و ئەوانیش ملکەچی بوون‌و ئیطاعەیان کرد بەرِاستی ئەو نەتەوە نەتەومیەکی فاسق‌و هیچ‌و پووچ بوون.

ئیمامی رازیی دەفەرموێ: فیرعەون مەبەستی بەخودایەتی خۆی ئەوە نەبوە بەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەوی بوو‌بێ، بەڵکوو مەبەستی ئەوە بووە: کەشیاوی عیبادەت بۆ کردن‌و رِێز لێگرتنەواتە: پێ ی وابوو پاشای گەورەو فەمانرِەاوی رەهایەو پێویستە هەموو کەس گەردنکەچی فەرمان‌و نەهیەکانی بن، بەدەسەڵات‌و فەمانرِەوایی خۆی بوغرِابوبوو لەخۆی بایی بوبوو.[1]

ئەمجار وانیشان دەدا: کەئەو دەیەوێ بگاتە نەتیجەو لەبارەی خودای موساوە توێژینەوە بکا، بەڵام لەواقیع دا گاڵتەو لاقرتێ دەکا دەڵێ: ﴿فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحاً لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ بەهامانی وەزیری دەڵێ: ئەی هامان! کورەخانەی خشت بخەرە ئیش‌و خشتم بۆ سوور بکەرەوە کەرەسەی بینا دابین بکە، باڵەخانەیەکی بەرزم بۆ دروست بکە، بەڵکوو پێ یدا سەر بکەوم‌و بەرزببمەوە، خودای موسا ﷺ ببینم، بزانم ئەو خودایەی موسا ﷺ باسی دەکا چیەو چۆنە؟ من پێم وایە: موسا ﷺ درۆ دەکا لەوەی دا دەڵێ: خودایەکی ترتان هەیە جگە لەمن!!

[1] تەفسیریی رازی ج ٢٤/٢٥٣.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحاً لَّعَلِّي أَبْلُغُ الآسْبَابَ" أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لآظُنُّهُ كَاذِباً وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾ (غافر/٣٦-٣٧) فیرعەون ویستی بەم لاف لێدانو خۆ بەخودا زانییەی چاوو راو لەخەڵکەکە بکاو وانیشان بدا: کەموسا ﷵ درۆ دەکاو جگە لەخۆی کەسی تر خودانیە، ﴿وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الآرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لا يُرْجَعُونَ﴾ فیرعەونو دارو دەستەکەی بەناڕەوا فیزیان کردو بوغرا بوونو فەسادو وێرانییان لەسەر زەوی بەرپا کرد، بیرو باوەڕیان وابوو: قیامەت نایەو زیندو بوونەوە نیە، حیسابو لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەر ئەفسانەیەو سزاو پاداش لەسەر کردەوە خەیاڵە، هەرکەسێك ئەمە بیروباوەڕی بێ، لەرێ دەرچوونو تەکەبوور کردنو فەساد نانەوەی لەسەر زەویو لەناو دڵان دا بەلاوە ئاسانو ئاسایی یە. ئیتر لێرەدا سیاقەکە هەندێ زنجیرەی چیرۆکەکە دەقرتێنێو خێرا ئاکامەکە نیشان دەدا، دەفەرموێ: ﴿فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ﴾ فیرعەونو تاقمەکەیمان بەقارو غەزەبی خۆمان گرتنو فڕێمان دانە ناو دەریاوە، کەسیان لێ دەرنەچوو، سوبحانەڵلا: ئەو دەریایەی موسا ﷵ بەمنداڵی فڕێدرایە ناویو بوو پەناو هۆی رزگاربوونی؛ کەچی هەمان دەریا فیرعەونی ستەمکارو خۆبەخودازانی تێ فڕێ درا فەوتاو لەناو چوو، کەوابوو ئەمینی هەر لەپەنا خودادا دەستەبەر دەبێ، هەرکەسێ خودای لەپشت بێ هەرچەندە بۆخۆی بێوەجو زەعیف بێ سەرکەوتووە، کەسێکیش خودای لێ برەنجێ چەندێك بەرواڵەت خاوەن هێزو توانابێ بەهیلاکچوو فەوتاوە.

﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ ئەی خاوەن هەستو هۆش؛ تێبفکرە لەدەسەلاتو توانای پەروەردگار ، سەرەنجام چی بەسەر ستەمکاران هات؟ ئەو ستەمکارانەی بڕوایان بەهەبوونی خودا نەکردو ملهوڕی گەورەیان خۆی بەخودا زانیو پەیامی پێغەمبەری خودای بوونەوەری رەتکردەوەو گاڵتەی پێکرد!!!

سەرەنجامی فیرعەون سەرەنجامێکی ئاشکراو نمایانە بۆ ئادەمیزادانی دوا ڕۆژگاری خۆی، لەشکری موسا ﷺ بەچاوی خۆیان بینیان فیرعەون چۆن لەناوچوو دوایش لاشەی ڕزگار کرا بەمردویی، ئەو خۆبەخودازانە لاشەکەی هەلگیراو ئێستاش لەیەکێ لەئەهرامەکانی قاهیرەدا هەلگیراوە! پەندو عیبرەتی تێدایە بۆ عاقڵمەندانو هەڕەشەیە لەوانەی بەملهوڕی شەریعەتی خودا پاشگوێ دەخەن، ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ﴾ فیرعەونو دارو دەستەکەیمان کرد بەپێشەواو مامۆستای گومڕاییو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەرانو ئینکاریکردنی هەبوونی خودای بەدیهێنەر، چونکە هەربەوەندە نەوەستان کەخۆیان گومڕابوون بەڵکوو کەسانی دیکەشیان گومڕاکردن، ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لا يُنصَرُونَ﴾ ئەوانە ڕۆژی قیامەت یارمەتییان نادرێ، کەس شەفاعەتیان بۆناکا، کەس نیە غەزەبی خودایان لێ دووربخاتەوە، بەدبەختو چارە ڕەش خۆیانن، ڕیسواو ماڵوێرانی دونیاو قیامەت بوون، لەسزای خۆبەخودازانیو ملهوڕیو لووتبەرزی فیرعەونو ڕازی بوونی دراودەستەکەی بەولاف لێدانەی فیرعەون لەدونیادا تێکمان شکاندنو لەقیامەتیش دا هەربەشیان تێشکانە، وێڕای ئەوەش نەفرەت لێکردنو دوورکەوتنەوەیان لەڕەحمەتی خودا! وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ﴾ لەم جیهانەدا بەبەردەوامی لەسەر زوبانی موسوڵمانانو پێغەمبەران نەفرینیان لێ دەکرێو ڕیسواییان پاڵ دەدرێ، هەروەکوو چۆن ڕۆژی قیامەت لەڕەحمەتی خودا دوور دەخرێنەوە، لەڕەزاگرانو بەدشێوەکان دەبن. تفو لەعنەتیان لێ دەکرێ، لەپێش چاوی مەخلووقاتی سارای مەحشەر ڕیسوا دەکرێن!!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەربارەی فیرعەونو تاقمەکەی دەفەرموێ: ﴿وَأُتْبِعُواْ فِي هَذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ﴾ (هود/٩٩) ئەمجار سیاقەکە لێرەدا زنجیرەیەکی تری چیرۆکەکە دەقرتێنێو باسی دەرچوونی بەنوئیسرائیلی یەکان لەمیصرو ئەو ڕوداوانەی لەو سەرو بەندەدا ڕویان دا، هەموویان دەپێچێتەوە

بۆئەوە دوابەدوای بەشی فیرعەون بەشی موساش بەیان بکا: دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الأُولَى بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ پەروەردگار نیعمەتی خۆی بەخشی بەبەندەو پێغەمبەری خۆی موسای کەلیم ﷺ : کە بریتی بوو لەنامەی تەورات، ئەوەش دوای لەناوبردنی فیرعەون‌و گەلەکەی‌و ئەو گەل‌و نەتەوانەی پێشووی وەکوو گەلی نووح‌و گەلی هودو گەلی صالح‌و گەلی لووط. بۆئەوەی ئەو نامە ئاسمانییە ببێتە سەرچاوەی هیدایەت‌و بەرچاو ڕوونی‌و روناك کەرەوەی دڵەکان‌و جوداکەرەوەی نێوان حەق‌و بەتاڵ، رەحمەت‌و فەرو بەرەکەت بۆ ئەوانەی ئیمانی پێ دەهێنن‌و رێنمویی کەر بۆ کردەوەی باش، بەڵکوو ئادەمیزاد بەخۆیان دا بچنەوەو بیر لەبەرژەوەندی خۆیان بکەنەوەو پەندو عیبرەت وەربگرن.

ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم‌و بەززار لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ فەرمودەیەکی ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما أهلك الله قوما بعذاب من السماء ولامن الأرض بعد ماانزلت التوراة على وجه الأرض غير أهل القرية الذين مسخوا قردة بعد موسى) ئەمجار ئایەتی ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الأُولَى﴾ ی خوێندنەوە. واتە: پەروەردگار دوای نازلکردنی تەورات بۆسەر زەوی هیچ گەل‌و نەتەوەیەکی بەعەزابی کۆکوژی ئاسمانی یان زەمینی لەناو نەبردوە، جگە لەدانیشتوانی ئەو شارەی: کە دوا موسا بوون بەمەیمون!![1]

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٣٩٩ لەوێدا بەچەند ریوایات ئەم مانایە ریوایەت کراوە.

**پێویستی ئادەمیزاد بۆ ناردنی پێغەمبەران‌و لەكۆتایی دا ناردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ**

﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأۡنَا قُرُونٗا فَتَطَاوَلَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيٗا فِيٓ أَهۡلِ مَدۡيَنَ تَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَيَقُولُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی رون كردەوە: كە حەزرەتی موسای ﷺ رەوانەكرد بۆسەر نەتەوەی ئیسرائیل دوای لەناوبردنی گەل‌و نەتەوە پێشینەكان‌و كوێر بوونەوەی ئاسەواری شەریعەت‌و یاسای پێغەمبەرەكانیان، خەڵكەكە ئاتاجیان بە پێغەمبەرێك بوو شارەزاییان بكا بۆ رێبازی راست‌و دروست. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی ئەوە دەكا: كەرەوانە كردنی حەزرەتی موحەممەدیش ﷺ لەبەر هەمان

ئەو پێویستیو داخوازییانە بوو کەبوونە هۆی ناردنی حەزرەتی موسا، بەتێکڕا ناردنی پێغەمبەران بۆشارەزایی کردنی ئادەمیزادە، بۆئەوەیە ئادەمیزاد بیانوویان بېڕێو نەڵێن: پێغەمبەرمان بۆ نەهاتوونو ترسێنەرو موژدە دەرمان بۆسەر ڕەوانە نەکراون! هەروەها ئاماژە بەئەوەش دەکا: کەقورئان کەلامی خودایەو بەنیگاو سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەوانەکراوە. دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنْ الشَّاهِدِينَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەتۆ ئامادەو ئاگادار نەبووی بەلای خۆرئاوای کێوەکەوە، ئەو شوێنەی خودا ئاخاوتنی تێدا لەگەڵ موسا ﷺ کردو ئەلواحی تەوراتی پێدا، هەروەها تۆ لەپێڕی ئەو حەفتا کەسەش نەبووی: کە موسا ﷺ هەڵیبژاردبوون بۆ بیستنی تەفاصیلی ئەو نیگاو سروشەی دامانە موسا، تۆبۆخۆت ئامادە نەبووی هەتا هەواڵیان بدەیتێو بۆ خەڵکەکەی بگێڕیەوە. بەڵکوو ئێمە بەنیگاو سروش ئاگادارمان کردی کردمانی بەفروستادەو ڕەوانەکراو بۆسەر ئادەمیزاد بەگشتی.. ئەم موعجیزە گەورەیە: کەقورئانەو موعجیزەی تریشمان پێداوی بۆئەوەی ببنە نیشانەی ڕاستی پێغەمبەراتیەکەت. خۆئەگەر نیگاو سروشمان بۆ نەناردیتایە، ئەم هەواڵانەت نەدەزانینو بۆ کەست نەدەگێڕانەوە. ﴿وَلَكِنَّا أَنشَأْنَا قُرُوناً فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ﴾ هۆی ئەوە: کەئێمە ویستمان سەرلەنوێ نیگات بۆ بنێرینو هەواڵی ڕابووردوانت لەقورئان دا بۆ بگێڕینەوە، هەبوونی چەند گەلو نەتەوەیەك لەدوا ڕۆژگاری موساو تێپەڕ بوونو درێژبوونەوەی ڕۆژگار بەسەریان دا، زانیاریەکانی گەلە پێشینەکان کوژانەوە، یاساو شەریعەتەکان گۆڕانیان بەسەردا هات، ئادەمیزادەکان بەڵگەو نیشانەکانی هەبوونی خودایان لەبیر چوونەوە، نیگاو سروشی پێغەمبەرانی ڕابوردو لەیادی خەڵکەکە چوبوەو، سەر زەوی پێویستی بە پێغەمبەرێکی تر هەبوو، بۆیە تۆمان کردە پێغەمبەرو ڕەوانەمان کردی بۆسەر ئادەمیزاد بەگشتی، هەتا عەهدو پەیمانی خودایان لەگەڵ تازە بکەیەوە، پەیامی خودایان تێ بگەیەنیو ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر بەخودای بوونەوەر بۆ ڕون بکەنەوە. وەکوو

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَى فَتْرَةٍ مِّنَ الرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَاءنَا مِن بَشِيرٍ وَلاَ نَذِيرٍ فَقَدْ جَاءكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (المائدة/١٩) کەوابوو پێغەمبەری ئیسلام رەحمەتە بۆ ئادەمیزادو هیدایەتدەرە بۆیان، لەهەمان کات دا بەڵگەو بیانووبڕە بۆئادەمیزادانو رۆژی قیامەت ناتوانن بڵێن: ئێمە ترسێنەرو موژدەدەرمان نەهاتۆتەسەر، گۆزو گومەت راپێچی ناو عەزاب کراوین. پەروەردگار بەناردنی حەزرەتی موحەممەدو نازلکردنی قورئان بۆیان بیانووی بڕیون، کەس بۆی نیە بڵێ: من بانگەوازیی ئیسلامم پێ نەگەیشتووە.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کەقورئان موعجیزمیە، چونکە هەوڵدان لەڕوداوی کۆنینەو سەدان ساڵ پێشین لەلایەن پێغەمبەرەوە بەبێ ئەوەی ئامادەیان بووبێو هاوچەرخیان بووبێ، نیشانەی ئەوەیە: کەهەواڵدەر سروشو نیگای بۆ هاتووەو پێغەمبەری خودایە! ئەگینا لەکوێ ئەتۆ ئەی موحەممەد هەواڵی بەسەرهاتی موسات دەزانین!؟ لەکاتێك دا تۆ هاوچەرخی ئەو نەبووی، هەروەها ﴿وَمَا كُنتَ ثَاوِياً فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَلَكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ ئەتۆ دانیشتووی شاری مەدیەنو یەکێك نەبووی لەناو گەلی شوعەیب ﷺ دا ژیانت بەسەر بردبێ چیرۆکی گەلی شوعەیبو بەسەرهاتەکانیانت دیتبێ یان لەکەسانێکت بیستن: کەڕوداوەکانیان بەچاوی خۆیان بینیبنو ئیتر ئایاتی ئێمەت لەوان وەرگرتبێو بەسەر موشریکەکانی مەککەدا بیخوێنیتەوە وەکوو یەکێ دەرسێ لەمامۆستای وەربگرێو بخوێنێتەوە تارەوانی دەکاو بەوشێوە هەواڵی رابواردنت زانیبێ. بەڵکوو روداوەکانت لەڕێگەی نیگاو سروشەوە زانیوەو ئێمە نیگامان بۆ کردوییو کردومانی بە پێغەمبەری ئادەمیزادو بەموعجیزەو نیشانەی بەهێز پشتگیریمان کردوی، ئەگەر نیگاو سروشت بۆ نەهاتایە تۆئەم هەواڵانەت نەدەزانین. هیچ هەواڵێکت لەم بارانەوە رانەدەگەیاندن! هەروەها ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَكِن رَّحْمَةً مِّن

رَبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْماً مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ ئەی موحەممەد ئەتۆ لەقەراخی کێوی (طور) نەبووی لەوکاتەدا کەئێمە ئاخاوتنمان لەگەڵ موسادا ئەنجام دا، هەتا بنچو بناوانی ئەو ئاخاوتنەت گوێ لێ بووبێو بۆ خەڵکی بگێڕیەوە، ئەتۆ لەکاتی خۆی دا ئەو ئاخاوتنەت گوێ لێ نەبووە، لەکاتی خۆی دا کەس ئەو قسەو ئاخاوتنەی تۆمار نەکردوەو بەکەلەپور مابێتەوەو دوایی بەردەستی تۆ کەوتبێ‌و فێری بووبیو بۆ کەسانی دیکەی بخوێنیەوە!! بەڵکوو ئەمە رەحمەت‌و بەزەیی پەروەردگارە بەئومەتی تۆ ئەی موحەممەد، بەوە: کەچیرۆکی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ گێڕایەوەو ئەو چیرۆکانە نیشانەی راستی پێغەمبەرایەتی تۆن‌و بەڵگەن لەسەر راستی ئەو بانگەوازییەی ئاڕاستەیان دەکەی. بۆئەوەی ئەو مەردومگەلە بترسێنی، کەزۆر لەمێژە پێغەمبەریان بۆسەر نەنێردراوە، لەسەردەمی ئیسماعیلی باپیرە گەورەیانەوە هیچ پێغەمبەریان بۆسەر رەوانە نەکراوە، بەڵکوو بەم پەیامەی تۆ بیر بکەنەوەو بەخۆیان دا بچنەوە واز لەبتپەرستی بهێنن‌و وەبیریان بێتەوە: کەئەوان نەوەی ئیسماعیلن ئەویش وەکوو تۆ بانگەوازیی کردوە بۆ یەکتاپەرستی‌و پەیڕەو کردنی ئاینی حەق‌و خوداپەسند!

مێژوو ئەوەی چەسپاندوە: کەدوا حەزرەتی ئسماعیل عليه السلام هیچ پێغەمبەرێك رەوانەنەکراوە بۆسەر نەتەوەی عەرەب. پەیامی حەزرەتی موسا عليه السلام هەتا پەیامی عیسا عليه السلام تایبەت بووە بەنەتەوەی ئیسرائیلەوە!

ئەمجار پەروەردگار بەئاشکرا هۆی ناردنی حەزرەتی موحەممەد ﷺ رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلا أَنْ تُصِيبَهُمْ مُصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا رَبَّنَا لَوْلا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولاً فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ وَنَكُونَ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە: کەئەو ئادەمیزادانەی تۆیان بۆسەر رەوانەکراوە بەعەرەبە موشریکەکانی قوڕەیشیشەوە کاتێ عەزابی ئێمەیان بۆ دێ‌و بەهۆی کوفرو تاوانی خۆیانەوە سزا دەدرێن - پێش ئەوەی تۆیان بۆسەر رەوانە بکەین - دەیانگوت: خودایە! بۆچی پێش ئەوەی سزامان بدەی لەسەر کوفرو بێدینی سزامان بدەی پێغەمبەرێکت بۆ

نەناردین بیروباوەڕی راستو یەکتا پەرستیمان فێربکاو شەریعەتو یاسای تۆمان بۆ رون بکاتەوەو تێمان بگەیەنێ تائێمەیش ئیمانمان پێ بهێنایەو کارمان بەشەریعەتی پەسندی تۆ بکردایە؟!!

بەکورتی بۆیە تۆمان رەوانەکرد بۆلای ئەو کافرانە هەتا بیانویان نەمێنێ.

ئەوەتا ئێمە تۆمان کردوە بە پێغەمبەرو دەستورو یاسای پەسندو گونجاو بۆ ئادەمیزادو هۆی بەختەوەری هەردو دونیامان بۆ نازڵ کردوی، فەرمانمان پێ کردوی بانگەوازییان بکەی، پەیامی خودایان تێ بگەیەنی، عەقیدەو ئەخلاقو دەستووری ژیانیان بۆ رون بکەیتەوە، بیانوویان ببڕیو ئیقامەی (حجة) یان لەسەربکەی! رۆژی قیامەت نەڵێن: پێغەمبەرمان نەهاتۆتە سەرو کەس لەعەزابی خودا نەیترساندوین.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيماً﴾ (النساء/١٦٥) یان دەفەرموێ: ﴿أَن تَقُولُواْ إِنَّمَا أُنزِلَ الْكِتَابُ عَلَى طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ، أَوْ تَقُولُواْ لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَى مِنْهُمْ فَقَدْ جَاءكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ (الانعام/١٥٦-١٥٧)

ئەمە بڕیاری پەروەردگارە لەبوونەوەردا، پێغەمبەر بنێرێ، بیانووی ئادەمیزاد ببڕێ، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾.

## رەتکردنەوەی قورەیشییەکانی مەککە بۆ قورئانو بەدرۆخستنەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُواْ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُواْ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُواْ

سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُواْ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾

بێگومان ئەگەر پێغەمبەرمان بۆ نەناردنایە، دەیانگوت: بۆچی پێغەمبەرت بۆ نەناردوین، ئەگەر پێغەمبەر موعجیزەی پێ نەدرانایە دەیانگوت بۆچی مەعجیزەی پێ نیە، کەچی: کە پێغەمبەرمان بۆسەر رەوانە کردنو موعجیزەی حەقو راستی پێ بوو پشتیان هەلکردو پەیامەکەیان رەتکردەوە، داوای موعجیزەی ماددی تریان لێ کرد، وتیان: بۆچی وەکوو موسا ﷺ موعجیزەی عەصاو یەدی بەیضای پێ نیە؟.

دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَى﴾ واتە: کاتی پەیامی حەقو راست لەخوداوە هاتەسەریان: کە قورئانی پیرۆزە، دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری، ئەوانەی لەوەپێش پێغەمبەریان بۆسەر رەوانە نەکرابوو، بەشێوە عینادو مل نەدانو سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینیو نەفامیو گومڕایی وتیان: ئەوە بۆچی موحەممەد موعجیزەی وەکوو موعجیزەی موسای نەدراوەتێ؟ بۆچی موعجیزەی لەشێوەی عەصاو یەدی بەیضاو بارینی گەزۆو

پەلەوەری شێلاقەو ئاوهەڵقولان لەبەردو ئەم جۆرە موعجیزانەی پێ نەدراون؟!
هەتا بۆمان مەعلوم بوایە: کەڕاست دەکا پێغەمبەرەو لەخوداوە نێردراوە!

وەلێ ئەمە هەر بیانوو بوو دەیانگرتو خۆدزینەوە بوو لەئیمان هێنان ﴿أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِنْ قَبْلُ﴾ ئەی ئەوە نەبوو ئەو ئادەمیزادانەی موسایان بۆسەر نێردرابوو بەو موعجیزانەوە پەیامی موسایان رەتکردەوەو ئیمانیان پێ نەهێنا. ئەو پەلپو بیانوو گرتنە دابو نەریتی هەموو سەر رەقو بێ بڕوایەکە: کەنایانەوێ ئیمان بهێنن، ئیتر ئەوجۆرە پەلپو بیانوانە دەدۆزنەوە.

﴿قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾ ئەو موشریکانەی مەککە وتیان: قورئانو تەورات دوو سیحرو جادوبازین، موحەممەدو موساش ساحیرن یارمەتی یەکتری دەدەن. لەسەر جەدەلو جادوبازیی‌و هەریەکەیان پشتی ئەوی تریان دەگریو دەیانەوێ فێل لەجەماوەر بکەنو درۆ دەکەن خودا نەیناردون بۆ رەهنوومایی ئادەمیزاد. ﴿وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ﴾ وتیان: ئێمە بڕوا بەهیچیان ناکەین نەقورئانو نەتەورات. بێگومان لەنیوە دورگەی عەرەبیدا جوولەکە هەبوون تەوراتیان لابوو، کەچی عەرەبەکان بڕوایان پێ نەکردو شوێن پەیامی تەورات نەکەوتن، بیستبویانو دەیانزانی: کەڕەوشتو نیشانەکانی پێغەمبەری ئیسلام لەناو تەورات دا هەیە. چوونەلای مالە جوولەکەکانو لەبارەی پێغەمبەرەوە زۆر پرسیاریان لێ کردن. ئەوانیش فتوای راستیان بۆ دانو وتیان: رەوشتو ناوو نیشانەی لەگەڵ زانیاریی ناو تەورات یەك دەگرنەوە، دەی لەگەڵ ئەوەش دا ئیمانیان پێ نەهێنا، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو ئیدیعای ئەوەیان کرد: کەتەورات سیحرەو قورئانیش سیحرە، بۆیە ناوەرۆکەکەیان لێك دەچیو پشتگیری یەکتر دەکەن! هەڵبەتە ئەوانە پەلپو بیانوو دەگرن، بەشوێن حەقو راستی دا ناگەڕێن، موعجیزەو نیشانەکان کەمو کورییان تێدا نیە، ئەوان نایانەوێ ئیمان بهێنن ئەو برو بیانووانە دەهێننەوە. بەلام وێڕای

ئەوەش قورئان هەنگاوێکی تریان لەگەڵ دەهاویێ‌و دەیانخاتە ناو مەوقیفێکی واوە کەبۆڕ بخۆن‌و دەسەوەستان ببن.

ئەمجار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا: کەتەحەددای موشریکەکانی قورەیش بکاو داوایان لێ بکا ئەگەر راست دەکەن قورئان‌و تەورات سیحرن دەبا نامەیەکی باشتر لەقورئان بخەنەڕوو! دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەی موحەممەد! بەموشریکە نەفامەکانی قورەیش بڵێ: ئەگەر تەورات‌و قورئان بەسیحر دەزانن‌و بەلاتانەوە بەکەڵکی ئەوە نایەن بکرێنە بەرنامەی ژیان، دەئەگەر راست دەکەن‌و مەبەستتان چەسپاندنی حەقیقەت‌و پوچاندنەوەی بەتاڵە، ئێوە نامەیەکی باشتر لەو دوو نامە ئاسمانییە بخەنەڕوو، هەتا من شوێنی بکەوم بیکەمە بەرنامەی ژیانی خۆم، ئەوە عەرزو ئەوە گەز!

﴿فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ واتە: ئەگەر بەپیر بانگەوازیەکەتەوە نەهاتن‌و ئەوەی داوایان لێ دەکەی بۆیان نەکراو سەرباری ئەوەش شوێن حەق نەکەوتن‌و ئەوەی بانگەوازییان دەکەی بۆئیمانهێنان بەقورئان‌و پەیامی تۆ قبووڵیان نەکردو ئەنجامیان نەدا، ئەوە تۆ بزانە ئەوانە بەبێ بەڵگەو دەلیلی راست‌و دروست شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون، ئەوانە هەوەسبازن!

﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ﴾ کێ لەوکەسە گومڕاترو سەرلێ شێواو ترە: کەبەنەزانی شوێن هەواو هەوەسی خۆی بکەوێ؟! واتە کەس گومڕاتر نیە لەوکەسەی شوێن هەواو هەوەسی خۆی بکەوێ‌و، بەڵگەو نیشانەیەکی لەقورئانی پیرۆز پێ نەبێ! بێگومان ئەوانە ستەمکارن‌و ستەمیان لەخۆیان کردوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ بێگومان خودا تۆفیقی ئەوانە نادا: کەبەهۆی شوێن کەوتنیان بۆ هەواو هەوەسی خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردوە، پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە، سوورن لەسەر گومڕایی خۆیان.

ئەمجار حیکمەتی نازلکردنی قورئان بەوەجبە وەجبە بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ بێگومان ئێمە بەگوێرەی داخوازی حیکمەتو بەگوێرەی پێداویستی بەرژەوەندی ئادەمیزادو بەجۆرێکی گونجاو لەگەڵ بارو دۆخو رووداوەکان دا قورئانمان بەشبەش نازڵ کردوە، بۆئەوەی ئەوانو غەیری ئەوانیش لەئادەمیزاد پەندئامێز ببنو تێ ی بفکرنو لێ ی وردببنەوەو بزانن چی لەخۆی گرتووە، ئیمان بێنن بەقورئانو بەوکەسەی ناردویەتیو ئەو کەسەی هێناویەتی....

## ئیمانهێنانی چەند کۆمەڵێك لەخاوەن نامەکان بەقورئان

﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ (٥٢) وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ (٥٣) أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (٥٤) وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ (٥٥) ﴾

ئیبنو کەثیر دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٥٣) لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەم (٧٠) کەشیشە نازڵبوو: کە نەجاشی ناردنی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ: کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ

سورەتی (یس)ی لەسەرتاوە بۆ کۆتایی بەسەردا خوێندنەوە، هەموویان دەستیان کرد بەگریانو ئیمانیان هێنا.[1]

ئیبنو جەریر لەعەلی کوڕی ریفاعەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: دە تاقم لەئەهلی کیتاب رۆیشتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ریفاعەشیان لەناودا بوو (مەبەستی باوکیەتی) ئیمانیان هێنا تووشی دەردی سەری بوونو ئەزیەت دران، ئیتر ئایەتی ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ...﴾ دەرحەق بەوان نازڵ بوو.[2]

هەر ئیبنو جەریر لەقەتادەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد: کە ئەم ئایەتە دەرحەق بەکەسانێك لەئەهلی کیتاب نازڵ بوو، کە لەسەر رێبازی حەق بەردەوام بوون هەتا خودا حەزرەتی موحەممەدی بەپێغەمبەریی بۆ سەر ناردنو ئیمانیان پێ هێنا، سەلمانی فارسیو عەبدوڵلای کوڕی سەلام لەوان بوون. ریوایاتی تریش هەن بەپێویستمان نەزانی راگوێزی ئێرەیان بکەین.

بەهەر حاڵ وەکوو زانایانی ئوصوولی فیقهی ئیسلامی دەڵێن: عیبرەت بەگشتگیریی وشەکەیە نەك بەخصوصی هۆکاری نازڵبوونە (العبرة بعموم اللفظ لابخصوص السبب).

لێرەدا قورئانی پیرۆز موشریکەکان دەخاتە بەر حاڵەتێکی واقیعیو چەسپاو لایان بەجۆرێك نەتوانن ئینکاری بکەن، نموونەی کەسانێکیان بۆ دەهێنێتەوە: کە بەدڵسۆزی قورئانیان وەرگرتووە، دڵیان پێوەی پەیوەست بووەو ئارامی گرتووەو زانیویانە حەقو راستەو دەق لەگەڵ ناوەرۆکی کتێبەکەی ئەوان دەردەچێو هیچ هەواو هەوەسێك ئەوان لەئیمان هێنان پێی ژێوان ناکاتەوە، ئامادەن لەپێناو بیرو باوەڕی چەسپاو بەو قورئانە هەموو ئەزیەتو دەردی سەرییەك لەخۆبگرنو گوێ

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٠١-١٤٠٢.

[2] ریوایەتەکەی (محمد)ی کوڕی ئیسحاق لەسیرەکەیدا لەگەڵ ریوایەتی ئیبنو جەریر ماناکانیان لێك دەچێو تۆزێ بەدرێژ تر هێناویەتی سەیری (في ظلال القرآن ج٦/٣٥٨) بکە.

بەتانووتو ئەزیەتدانی ملهوڕان نەدەن! خۆگرو بڕوا پتەو بن، هیچ شتێك نەتوانێ ئەوان لەهەڵوێستی خۆیان تۆزقاڵێك داببەزێنێ.

دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِهِ هُمْ بِهِ يُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان کۆمەڵێك لەزانایانی ئەهلی کیتاب لەجوولەکەو مەسیحی؛ ئەوانەی هاوچەرخی پێغەمبەر بونو ئیمانیان بەقورئان هێناوە چونکە لەگەڵ ناوەڕۆکی نامەی ئەوان یەك دەگرێتەوە، ئەو نامە ئاسمانییانەی پێش قورئان مزگێنی هاتنی حەزرەت (محمد)یان ڕاگەیاندوە، ناوو ڕوەشتی ئەو زاتەیان دیاری کردوە. ئەوانە بڕوایان بەقورئان یان بە(محمد) یان بەهەردوکیان هەیە، ئەمە یەکێکە لەنیشانەی ڕاستی قورئانو ڕاستی پەیامی پێغەمبەری ئیسلام.

نامە ئاسمانییەکان هەموویان لەخوداوەن، هەموویان لەیەك سەرچاوەوە هاتوونو ناوەڕۆکیان لێك دەچێو پشتگیری یەکتر دەکەن! کەسێ نامەی ئاسمانی لەپێشدا پێ درابێو گۆڕانکاری تێدا نەکرابێ، کە دوایی نامەی ئاسمانی تری پێ دەگا، دەزانێ حەقو ڕاستەو ئیمانی پێ دەهێنێو وەگری دەبێ، چونکە دەزانێ هەموویان لەخوداوە هاتوون. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاَوَتِهِ أُوْلَـئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾(البقرة/١٢١) یان دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلّهِ﴾(آل‌عمران/١٩٩) یان دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ أُوتُواْ الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً، وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً﴾(الأسراء:١٠٧-١٠٨).

﴿وَإِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ﴾ هەر کاتێك ئایاتی قورئانیان بەسەردا بخوێندرێتەوە، هێندە ئاشکراو ڕونو ڕەوانە یەکسەر دەڵێن: ئەم کەلامە بەڕاست دەزانینو نیگای خودایەو لەڕێی پێغەمبەرەوە بۆ ئێمە هاتووە، ئیمانمان پێ هێناوە، بێگومان قورئان نامەی ئاسمانییەو

بتمانـەمان پێیـەتیو ئێمـە لـەپێش نـازڵبوونی قورئـان یـان پـێش ڕەوانـە کردنـی حـەزرەت موحەممـەد ﷺ بڕوامـان پـێ بـوو، هـەواڵی ڕەوانـە کردنـی پێغەمبـەری خاتەمو قورئانی پیرۆزمان لەنامەی ئاسمانی خۆماندا دیوەو بیستووە، ئیمانمان پێ هێناوە، چونکە بانگەوازی بۆ ئـایینی ئیسلام دەکـاو ئیسلامیش بەرنامـەی هـەموو پێغەمبەرانو ئایینی هەموو خوداپەرستانە!

﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ﴾ ئەوانـەی پـێش هـاتنی پێغەمبـەری ئیـسلامو نـازڵبوونی قورئـان گەردنکەچـی فـەرمانی خـودا بـوونو ئیمانیـان بەپێغەمبەری خۆیانو نامەی ئاسمانی خۆیان بووە، پاشان هـەر بەبیـستنی قورئـان خێرا ئیمانیـان پـێ هێنـاوەو شوێن پـەیامی پێغەمبـەری ئیـسلام کـەوتوون، ئەوانـە پاداشی دووچەندانەیان هەیە، پاداشی صەبرو خۆڕاگرییان لەسەر ئیمانی پێشوویان ئـەمجار لەسـەر ئیمـانی تازەیـانو گـوێ نـەدان بـەتانووتو ئەزیەتـدانی ئـەمو ئـەو، چونکە خۆڕاگری لەسەر ئایینی حەقو پاڵفتە، بەربەرەکانی کردنی هەواو نـەفسو ئارەزۆ، گوێ نەدان بەتوانجو گاڵتە کردنو ئەزیەتدان لەلایەن گومڕایانەوە کـارێکی قـورسو زەحمەتـە، کەسێك بتوانـێ لـەناو کۆمـەڵگای گـومڕاو نـەفامانـدا پابەنـدی ئایینی حەقو ڕاست بێ، شیاوی پاداشی دووچەندانەیە.

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا فەرمودەیەك هەیە ئەبو موسای ئەلئەشعەری ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ثلاثة يؤتون أجرهم مرتين، رجل من أهل الكتاب آمن بنبيه ثم آمن بي، وعبد مملوك أدّى حق الله وحق مواليه، ورجل كانـت لـه أمـة فأدبّهـا، فأحـسن تأديبهـا، ثـم أعتقهـا فتزوجهـا﴾ سێ کـەس هـەن پاداشـی دووچەندانەیان دەدرێتەوە، پیاوێکی ئەهلی کیتاب، لەوەپێش ئیمانی بەپێغەمبەری خۆی هەبووبێ دوایی ئیمانی بـەمن هێنابـێ، کۆیلەیـەك مـافی سەرشـانی بەرامبـەر بـەخوداو بەرامبـەر خاوەنەکـەی ئـەنجام بـدا، پیـاوێکیش ئـافرەتێکی کۆیلـەی لابـێ، جوان پەروەردەی کردبێو دوایی ئازادی بکاو مارەی بکا.

ئیمامی ئەحمەد لەئەبو ئومامەوە ریوایەت دەکا: کە دەڵێ: (اني لتحت راحلة رسول الله ﷺ يوم الفتح، فقال قولاً حسناً جميلاً، وقال فيما قال: من أسلم من أهل الكتاب فله أجره مرتين، وله مالنا، وعليه ماعلينا).

ئەمجار دوا ئەوەی پەروەردگار پەسنی ئەو موسوڵمانە بەرێزانەی راگەیاند لەم رووەوە: کە ئیمانی پتەوو دامەزراویان هەیە، لەرویەکی ترەوە مەدحیان دەکا: کە بەسەر نەفسی خۆیاندا زاڵو باڵادەستن، جڵەوی نەفسی خۆیان کردومو گەیشتونە ترۆپکی شکۆمەندیو دامەزراوی، پشو درێژو بارقوڵن، ﴿وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ﴾ خراپە بەچاکە وەڵام دەدەنەوە، لەبەرامبەری نەفامی گاڵتەکەردا لەسەرخۆو هێدیو هێمنو خاوەن چاکەن، بەراستی ئەمە پلەیەکە تەنها خاوەن باوەڕی راستەقینە دەیگاتێ، ئەوانە دەیگەنێ خودا لێیان رازییەو ئەوانیش لەخودا رازین.

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەو رزقو رۆزییە حەڵاڵەی پێمان داون دەبەخشن. زەکاتی واجب لەماڵو سامانی خۆیان دەردەکەن، خێرو خێرات بەخزمو خۆیشو ئاتاجان دەبەخشن، پێداویستی خاوو خێزانیان دابین دەکەن، ﴿وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾ (لەغو: قسەی بۆشو بێ سوودو ناشیرینو کاتکوژە). هەر کاتێ قسەی ناشیرینو نابەجێ لەموشریکەکانو غەیری موشریکەکان ببیسن، گوێیان لەجنێوو توانجو لەککەدار کردن بێ، کوێچکەی خۆیانی لێ دەهاخنن و پشت لەلەغوەچییەکان هەڵدەکەنو لەکۆڕو کۆمەڵیان دوور دەکەونەوە، خۆیان لەوە بەرزتر دەگرن خۆیان تێکەڵی تاقمو پێڕی ئەوان بکەن. ئەگەر یەکێك بەرامبەریان ناماقوڵیەکی کرد، دەڵێن: کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانو ئێمە بەرپرسیاری کارو کردەوەی خۆمانین لەروی پاداشو سزاوە، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانو تاوانی خۆتان لەئەستۆی خۆتان. ئێمە وەڵامی لەغوەی ئێوە نادەینەوە سەلامتان لەسەربێ، سەلامی لێك دابڕانو جودابوونەوە، ئێمە نامانەوێ رێبازی نەفامان بگرینو هەڵسو کەوتی

ئەوان پەیڕەو بکەین. ئێمە قسەی شیرینو ڕەوان هەڵدەبژێرینو زمانمان بەقسەی جوانو شیرین ڕاهاتووەو وەڵامی ئاخاوتنی ناشیرین بەقسەی ناشیرین نادەینەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەربارەی پەسنی ئەو ڕەوشتە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً﴾(الفرقان/٦٣).

ئیبنو ئیسحاق لەکتێبە بەناوبانگەکەی (سیرة ابن اسحاق)دا دەگێڕێتەوە: دەڵێ: هێشتا پێغەمبەر لەشاری مەککەدا بوو، بیست کەسێکی نەصرانی یان نزیك بەو ژمارەیە: کە هەواڵی پێغەمبەریان لەحەبەشەوە پێ گەیشتبوو، هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوتی کابەدا بەخزمەتی گەیشتن، لەلای دانیشتن، قسەیان لەگەڵ کردو پرسیاریان ئاڕاستە کردن، لەو کاتەدا پیاوانی قوڕەیش لەدەوروبەری کەعبە لەدیوەخانەکانی خۆیاندا بوون، جا: کە میوانەکان لەپرسیار کردن بوونەوە، پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی کردن بۆ ئیمان هێنانو قورئانی بەسەردا خوێندنەوە. کە گوێیان لەقورئان بوو، چاوەکانیان فرمێسکی لێ هەڵ ڕژاو پاشان هەموو ئیمانیان هێناو موسوڵمان بوون، وەصفو ناوو نیشانی پێغەمبەر ﷺ کە لەکتێبەکانیاندا تۆمار کراوە بەراورد کردو ڕاست دەرچوو، لێیان مەعلوم بوو: کە ئەو پێغەمبەرەی لەتەوراتو ئینجیلدا ئاماژەی پێ کراوە ئەوە.

جا کە لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ هەڵسانو هاتنە دەرەوە، ئەبو جەهلو چەند قوڕەیشی‌یەکی تر پێشیان پێ گرتنو پێیان گوتن داوەشێن بۆچ شاندێك بوون، ناردویانن بزانن ئەو پیاوە واتە: پێغەمبەر کێیەو دەنگو باسی چیە! کەچی ئێوە لای ئەو ئەوەندە نەمانەوە بحەسێنەوە وازتان لەئایینی خۆتان هێناو بڕواتان پێ کرد، لەڕاستی‌دا ئێمە هیچ کۆمەڵو تاقمو شاندی وەکوو ئێوە نەفامو ئەحمەقمان نەدیوە! ئەوانیش لەوەڵامی ئەم قسە ناشیرینو نەفامانەی ئەبو جەهلو هاوەڵانی وتیان: سەلامتان لێ بێ ئێمە وەڵامتان نادەینەوەو بیرو باوەڕی خۆمان بۆخۆمان بیرو بۆچونی خۆتان بۆ خۆتان، ئێمە گرنگی بەو قسانەی ئێوە نادەین. نامانەوێ خێرو فەرمان لەکیس بچێو بەدبەختو چارەڕەش ببین!

## رەتدانەوەی شوبهەو گومانی موشریکەکان

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَاۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًاۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن

مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٦١﴾

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥٦) ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ...الآية﴾ لەصەحیحەیندا هاتووە: کە ئەو ئایەتە دەربارەی (ئەبو طالیب)ی مامی پێغەمبەر ﷺ نازڵ بووە، ئەبو طالیب لەژیانیدا زۆری پشتگیری لەپێغەمبەر ﷺ کرد، هەتا گیانی تێدا بوو بەرەوروی قورەیشییەکان وەستاو نەیهێشت ئەزیەتی بدەن‌و دەست درێژی بکەنە سەر، پارێزەرێکی دڵسۆزو پشتیوانێکی بەهێزبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بانگەوازییەکەی بڵاو بکاتەوە لەپێناو پارێزگاری کردن لەپێغەمبەر ﷺ زۆر ماندوبوو، کە قورەیشییەکان قورمتێنەیان خستە سەر بەنو هاشم‌و بەنو موطەلیب، حەصاری (ئابوری‌و سیاسی‌و ئیعلامی)یان خستە سەر پێغەمبەرو یارمەتیدەرانی لەشیوەکەدا (ئەبو طالیب)یشی گرتەوە لەم پێناوەدا زیانی ماڵی‌و جەستەیی‌و نەفسی زۆری لێ کەوت. بەڵام پشتگیرییەکەی لەبەر خاتری خودا نەبوو، لەبەر دەمارگیری‌و خزمایەتی بوو، جا نەخۆش کەوت‌و کەوتە گیانەڵاو پێغەمبەر ﷺ داوای ئیمانهێنانی لێ کرد، بەڵام خودا ئەو بەهرەیەی پێ نەدا بوو ئیمانی نەهێنا.

ئیمامی زوهری دەفەرموێ: سەعیدی کوڕی موسەییب لەباوکییەوە :کە (المسیب)ی کوڕی حەزنی (المخزومي)یە بۆی گێڕامەوە؛ وتی: کە ئەبو طالیب کەوتە حاڵەتی سەرەمەرگەوە، پێغەمبەر هاتە لای، لەو کاتەدا ئەبو جەهل‌و عەبدوڵڵای کوڕی ئومەییەی کوڕی موغەیرەی لابوو. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (یاعم قل: لا إله إلا الله کلمة أحاج لك بها عند الله) ئەبو جەهل‌و عەبدڵڵای کوڕی ئومەییە وتیان: ئەی ئەبو طالیب چۆن دەبێ تۆ لەئایینی (عبد المطلب) پاشگەزبیتەوە، ئیتر چەندێك پێغەمبەر ﷺ داوای ئیمانهێنانی لێ کرد، ئەو دوو نەگریسە بەو وتەیەی

خۆیان وایان لێ دەکرد ئەبو طالیب سوور بێ لەسەر بتپەرستیو کوفری خۆی.. تا لەئاکامدا لەسەر ئایینی (عبد المطلب) مرد، وشەی (لا إله إلا الله...) بەدڵو زوباندا نەهاتو بەکافری سەری نایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (والله لأستغفرن لك مالم أنه عنك) ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى﴾(التوبة/١١٣ ) هەروا ئایەتی ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾ دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووە.

موسلیم لەصەحیحەکەیداو تیرمیذی لەحەدیثی یەزیدی کوڕی کەیسان لەئەبو حازیمەوە لەئەبو هورەیرەوە دەڵێ: کاتێك ئەبو طالیب مردن یەخەی گرتو کەوتە گیانەڵاوەوە پێغەمبەر ﷺ هاتەی لایو پێی فەرموو: (یاعماه قل: لا إله إلا الله أشهد لك بها یوم القیامة) ئەبو طالیب وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: کە قورەیش تانوتم لێ دەدەن دەڵێن: ترسو ئازاری مردن وای لێ کرد ئیمان بهێنێ، ئیمانم دەهێناو چاوتم فێنك دەکردەوە، دانم بەئایینی تۆدا دەنا. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ی نازڵ کرد.

هەروەها لەئیبنو عەباسو ئیبنو عومەرو موجاهیدو (الشعبي)و قەتادەوە ریوایەتکراوە: کە ئایەتی ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي...﴾ دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووە، دوا وشەی ئەبو طالیب ئەوە بووە: کە ئەو لەسەر ئایینی عەبدولموطەلیبە.

بەراستی مرۆڤ لەبەردەم ئەم هەواڵەدا دەبێ بەسەر سوڕماوی راوەستێ، بڕوانێ ئەم ئایینە چەند بێباکە، چەند بێ پێچو پەنایە، چەند راستو رەوانە!! ئەوەتا مامی پێغەمبەر ﷺ ویڕای ئەو هەموو خزمەتەی کردی بۆ پێغەمبەرو ئەو هەموو داکۆکیەی لێی کرد، ئەو هەموو ماندوبوونەی تووشی بوو لەپێناو پێغەمبەردا. کەچی خودا ئیمانهێنانی بۆ بڕیار نەداوە، هەرچەندە ئەو زۆر پێغەمبەری خۆش ویستووە، پێغەمبەریش زۆری پێ خۆش بوو ئیمان بهێنێ کەچی ویستی پێغەمبەر

نەهاتە دی، چونکە خۆشەویستی ئەبو طالیب بۆ پێغەمبەر بۆ خودا نەبوو، بەڵکوو لەبەر دەمارگیری بوو، لەبەر خاتری خزمایەتی‌و نژادبوو، خودای مەزنیش ئەوەی زانیوەو بڕیاری داوە ویستی پێغەمبەر نەیەتەجێ. ئەو کارەی لەچوارچێوەی دەسەلاتی پێغەمبەر ﷺ وەدەرناو تایبەتی کرد بەویست‌و ئیرادەی خودایانەی خۆی. پێغەمبەر تەنها گەیاندنی پەیامی لەسەرە، بانگخوازانی ئیسلام تەنها ئامۆژگاری‌و تێکۆشانیان لەسەرە، لەوە بەولاوە دڵەکان لەنێوان دەستی قودرەتی پەروەردگاردان چۆنی بوێ ئاوایان رەها دەکاو ئاراستەیان دەکا.

نەسائی‌و ئیبنو عەساکیر لە(تاریخ دمشق)دا لەئەبو سەعیدی کوڕی رافیعەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پرسیارم لەئیبنو عومەر کرد دەربارەی ئایەتی ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ...﴾ ئایا راستە دەگوترێ: دەربارەی ئەبو جەهل‌و ئەبو طالیب نازڵ بووە؟! لەولامدا وتی: بەڵێ..

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٥٧) ﴿وَقَالُوا إِنْ نَتَّبِعْ الْهُدَى مَعَكَ ...﴾ ئیبنو جەریر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: کۆمەڵێك لەقورەیشییەکان بەپێغەمبەریان گوت: ئەگەر ئێمە شوێنت بکەوین، خەڵکی دەروبەرمان قەلاچۆمان دەکەن، ئیتر ئەو ئایەتە نازڵ بوو.

نەسائی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: (الحارث)ی کوڕی عوسمانی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوڕی عەبدومەناف ئەو قسەیەی کردوو بەپێغەمبەری گوت: ئێمە دەزانین تۆ لەسەر حەقی‌و پەیامت حەقە، بەلام ناوێرین ئیمانت پێ بهێنین، دەترسێن ئەگەر شوێن هێدایەتی تۆ بکەوین عەرەب گەلەکۆمەکیمان لێ بکەن‌و لەئاخی مەککە وەدەرمان نێن، ئێمە کەم‌و ئەوان زۆر دەرەقەتیان نایەین.[1]

---

(١) تەفسیری قورطوبی ج٧/٢٢٥ (٢٨٥٧).

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٦١) ﴿أَفَمَنْ وَعَدْنَاهُ...﴾ ئیبنو جەریر لەموجاهیدەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی وتو وێژی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو جەهلدا هاتۆتە خوارێ. لەڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: دەرحەق بەوتووێژی حەمزەو ئەبو جەهل نازڵ بووە.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەو ڕووەوەیە: کە لەپێشەوە باسی ئیمانهێنانی چەند تاقمو کۆمەڵێکی ئەهلی کیتابی کرد، ئەمجار لێرەدا باسی شوبهەو گومانو بیانووی ئیمان نەهێنانی موشریکەکان دەکاو پاشان ڕەدیان دەداتەوە، سەرەتا ئەوە دەچەسپێنێ: کە هیدایەتدان (مەبەست هیدایەتی تەوفیقو گەیاندن بەحەقو هێشتنەوە لەسەر حەقە) تایبەتە بەخوداوە، هەر ئەو دەتوانێ ئەو جۆرە هیدایەتە بدا، پێغەمبەر ﷺ تەنها شارەزایی کردنی لەسەرە، ئەرکی سەرشانی ئەو گەیاندنو شیکردنەوەیە.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ ئەتۆ ئەی موحەممەد! ناتوانی هیدایەتی کەسانێك بدەی: کە خۆشت دەوێن، ناتوانی کێشی‌کەی بۆ ئیمانهێنان، ئەوە کاری تۆ نیە، تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە، پەیامی خۆت بڵاو بکەرەوە، نەصیحەتو ئامۆژگاری بکە، هەر خودا دەتوانێ هیدایەت بخولقێنێ لەدڵانداو دڵەکان بەئیمان زیندوبکاتەوە تۆفیقیان بداو دڵیان ڕوناك بکاتەوەو کێشیان بکا بۆ ئیمانهێنان، هەر خودا زاناو ئاگادارە بەو کەسانەی کە ئامادەباشی ئیمانهێنانیان تێدایە، هیدایەتیان دەدا چونکە شیاوی ئیمان هێنانن، هەروەها هەر خودا دەزانێ کێ گومڕایەو سورە لەسەر کوفرو ئیلحادو ئامادەباشی گومڕایی تێدایە، هیدایەتیان نادا، چونکە شیاوی هیدایەتدان نین. مەبەستی ئایەتەکە دڵدانەوەو تەسەللادانەوەی پێغەمبەرە ﷺ کەوا ناتوانێ هیدایەتی نەتەوەکەی بدا.

تێبینی ئەوە دەکرێ: کە ظاهیری ئایەتەکە دەلالەت ناکا لەسەر کوفری ئەبو طالیب، بەڵام بەگوێرەی ئەو فەرموودانەی لەصەحیحەیندا هاتوون ئایەتەکە دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووە، وەکوو لەوەپێش ئاماژەمان پێ کرد.

ئیمامی (الزجاج) دەفەرموێ: ئیجماعی موسوڵمانان لەسەر ئەوەیە: کە ئایەتەکە دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووە.

قورطوبی دەفەرموێ: راست ئەوەیە: بگوترێ: زوربەی زۆری موفەسسرین لەسەر ئەوە کۆکن: کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو طالیب نازڵ بووە،[1] ئەمە دەقی بوخاری‌و موسلیمە.

ئەوەبوو ئەبو طالیب لەکاتی مردندا وتی: ئەی بەرەی عەبدومەناف: گوێڕایەڵی موحەممەد بکەن‌و بەراستی بزانن رزگارتان دەبێ. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی مامە! بەقسە ئامۆژگاری ئەوان دەکەی‌و خۆت بەکردەوە نایکەی؟ ئەبو طالیب وتی: ئەی برازام تۆ مەبەستت چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من تەنها یەك وشەم لەتۆ دەوێ، ئەتۆ ئێستا لەدوا رۆژی ژیانت دای، دەمەوێ بڵێی: (لا إله إلا الله) بۆ ئەوەی لای خودا شایەتیت بۆ بدەم، وتی: ئەی برازای خۆم! من دەزانم راست دەکەی پێغەمبەری، وەلێ من پێم ناخۆشە قورەیش پێم بڵێن: لەکاتی مردندا ترسا بۆیە ئیمانی هێنا. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئیمانم دەهێناو شایەتومانم دەگوت‌و چاوی تۆم فێنك دەکردەوە، چونکە دەبینم تۆ زۆرت پێ خۆشە ئیمان بێنم!! بەڵام من هەروام بڕیار داوە کە لەسەر ئایینی پیرانی قورەیش (عبد المطلب)و (هاشم)و (عبد مناف) بمرم.[1]

---

[1] تەفسیری قورطوبي ج٧/٢٢٤ (٣٨٥٦).

[1] في ظلال ج٦/٣٦١. تەفسیری قورطوبي ج٤/١٥٦ (٢٤١٢).

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾(البقرة/٢٧٢) یان ئایەتی ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾(یوسف/١٠٣).

ئەمجار سیاقی ئایەتەکان بڕو بیانووی قورەیشییەکان رادەنوێنن‌و بەهانە بێ جێو ڕێیەکانیان دەخەنە ڕو. دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَى مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا﴾ واتە: موشریکە قورەیشییەکان وتیان: ئەی موحەممەد! ئەگەر شوێن پەیامی تۆ بکەوین‌و واز لەبتپەرستی بێنین‌و لەموشریکە عەرەبەکانی دەوروبەرمان جودا ببینەوە، ترسی ئەوەمان هەیە گەلەکۆمەکیمان لێ بکەن‌و لەزێدو نیشتمانی خۆمان وەردەمان نێن.

**پەروەردگار ئەو شوبهەو بەهانە بێ جێو نامەعقوولەیان بەسێ بەڵگە ڕەت دەکاتەوە.**

١- دابین کردنی حەرەم بۆیان، ڕەخساندنی حاڵەتێك‌و نیشتەجێ بوونیان لەوڵاتێکدا: کە ئارام‌و ڕێزدارە دانیشتوانی دڵئارام‌و بێ ترسن، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَماً آمِناً يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقاً مِن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەم عوزرو بەهانەیان نابەجێو درۆو دەلەسەیە، چونکە خودای بالادەست ئەوانی لەوڵاتێکی ئەمین‌و ئارامدا نیشتەجێ کردوە، بەستی حەرەم لەوەتی هەیە ڕێزدارەو خەڵکی بەرێزەوە تێی دەڕوانن، کەس دەستدرێژی تێدا ناکاتە سەر کەس. دەی چۆن ئەو حەرەمە لەکاتی کوفرو بێدینیاندا ئەمینەو تێیدا دڵنیان‌و هیچ ترس‌و بیمی ماڵ‌و جانیان نیە. لەکاتی موسوڵمانبوونیاندا دەبێتە جێگەی ترس‌و نائارامی؟!

تایبەتمەندییەکی تری حەرەمی مەککی ئەوەیە: کە لەهەر چوار لای جیهانەوە میوەو بەروبوومی بۆ دەهێندرێ، لەهەموو وڵاتێکەوە کاڵاو شت‌و مەکی بۆ ڕەوانە دەکرێ، ئەمەش رزق‌و ڕۆزیی‌و فەضل‌و نیعمەتێکی تری پەروەردگارە، بەسەر

قورەیشییەکاندا وەلێ زوربەی زۆریان نەفامو کەودەنن، نازانن خێرو خۆشیو شکۆمەندی خۆیان لەچیدایە. بیریش ناکەنەوە بزانن: کێ شیاوی عیبادەت بۆ کردنە بۆ ئەوەی واز لەعیبادەتی ئەو شتانە بێنن: کە شیاوی پەرستش بۆ کردن نین، رو بکەنە عیبادەتکردن بۆ ئەو خودایەی شیاوی بەندایەتی بۆ کردنە.

بەراستی ئەو تێروانینەی قورەیش تێروانینێکی کورت بینیو سەطحییە، تەصەووڕێکی سافیلکانەو نەفامانەیە، ئەم بیرو بۆچوونە هەڵەیەشیان لەو تێروانینە سەطحییەوە بۆ پەیدابووە، ئەو تێروانینە نەفامانەیان خستویەتە دڵیانەوە: کە شوێنکەوتنی ئایینی خودا تووشی خەتەرو تەنگو چەڵەمەیان دەکا، دوژمنان تەماعیان تێ دەکەن، توشی هەژاریو ماڵوێرانی دەبن.

٢- هۆشیار کردنەوەیان بەوە کە لەناوبردنی گەلە پێشینەکانیان دەخاتەوە یادو دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَنْ مِنْ بَعْدِهِمْ إِلاَّ قَلِيلاً وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ﴾ ئەو نەفامانە نازانن ئەمنو ئاسایش لەچیدایەو بەهیلاکچونیان بەچییە، نازانن: هەموو شتێك بەدەست خودایەو لەخوداوەیە، کەوابێ ئەگەر دەیانەوێ خۆیان لەبەهیلاکچون بپارێزنو کەس نەوێرێ تەماعی داگیرکردنی وڵاتیان بکا، با خۆیان لەنارەزامەندی خودا بپارێزن.. چونکە هۆکاری بەهیلاکچون شوێنکەوتنی پەیامی حەق نیە، بەڵکوو بوغرابوون بەنیعمەتو سوپاس نەکردنی خودا لەسەر نیعمەتەکانی ئەوە دەبنە هۆی لەناوچونو فەوتان با خۆیانی لێ بپارێزن. با ئەو نەفامانە بزانن: کە ئیمان نەهێنانیان دەبێتە هۆکاری لێ ستاندنەوەی نیعمەت لێیانو ژێر دەستەبوونیان بۆ دوژمنان، چونکە پەروەردگار زۆر شارو گوندی بەدانیشتوانەکانیانەوە لەناوبرد، بەهۆی ئیمان نەهێنانیانو کوفرو بوغراییو طوغیانو لوتبەرزیو سپڵەیی کردن لەبەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خودای مەزندا! بەهۆی ئەوە گوندو شارەکانیان خاپور کرانو تێك رۆخێندرانو ئاداریان بەسەر پاداریەوە نەماو بایەقوشیان تێدا دەخوێنێو

کەسیان تێدا نیشتەجێ نەبوەوە!! مەگەر بۆ ماوەیەکی کەم: کە ڕێبوارێك بۆ ماوەی ڕۆژێك یان کەمتر تێیاندا بمێنێتەوە، دوای لەناوچوونی دانیشتوانە غەزەب لێگیراوەکانیان کەس تێیاندا نیشتەجێ نەبوەوە، خودا خۆی میراتگریان بوو، چونکە خودا خاوەنی حەقیقی بوونەوەرە. بەڕواڵەت ئەگەر شتێك بێ خاوەن بێ دەڵێن: ئەوە هی خودایە.

کەوابێ با ئەو قورەیشییانە خۆیان بپارێزن لەبوغڕابوون و سپڵەیی و سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی، نەبادا هیلاك و بەفتارەچون وەکوو ئەو گەلە بەدبەختانە یەخەیان بگرێ و بەدەردی ئەو غەزەب لێگیراوانە بچن: کە ئێستا ئەوان بۆخۆیان شوێنەوارو گوندە وێرانبوەکانیان بەچاوی خۆیان دەبینن!

ئەمجار پەروەردگار عەدالەتکاری خۆی لەعەزابدان و لەناوبردنی ئەو گەل و نەتەوە پێشینانە ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾ داب و نەرێتی خودای تۆ وا نەهاتوە، سوننەتی وا جاری نەبوە لەبونەوەردا: کە شارو وڵات بە دانیشتوانەکانیانەوە وێران بکا، هەتا لەپایتەخت و شاری گەورەی ئەو وڵاتەدا پێغەمبەرێك نەنێرێ و ئایاتی ئێمەی بەسەردا نەخوێندبنەوە، هەر وڵاتێکی وێران کردبێ و هەر گەل و نەتەوەیەکی لەناوبردبێ، لەپێشدا پێغەمبەری بۆ ناردون و ئەو پێغەمبەرە بانگەوازی کردون بۆ ئیمانهێنان و خودا پەرستی و ئیقامەی حوجەی لەسەر کردون، ئیتر مەردومەکەلەکە بانگەوازییەکەیان ڕەت کردۆتەوەو گاڵتەو لاقرتێیان بەپێغەمبەرەکە کردوەو پەلپ و بیانووی نابەجێیان لێ دۆزیونەوە، بەمەبەستی عینادو ئینکاریی داوای موعجیزەی جۆراو جۆریان لێ کردون، کە موعجیزە پێشنیارکراوەکانیشیان هاتوونە دی هەر ئیمانیان نەهێناوە، ئیتر خودا پێغەمبەرەکەو ئیماندارانی ڕزگار کردون و نەتەوە سەرپێچیکارەکەی لەناو بردوە. کەوابێ لەناوچوونەکەیان سوچی خۆیان بووە. ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلاَّ وَأَهْلُهَا

ظَـالِمُونَ﴾ ئێمـە هـیچ شـارو گونـدێکمان لـەناو نـەبردوەو ئـیللا دانیـشتوانەکانیان سـتەمکاربوونو بۆخۆیـان سـتەمیان لـەخۆیان کـردوە بـەوە: کـە پێغەمبەرەکـەیان بەدرۆ خستۆتەوەو ئینکاری موعجیزەکەیان کردوە.

حیکمەتی ناردنی پێغەمبەران لەناو شارە گەورەو پایتەختـەکاندا، ئـەوە بـووە: کـە بەئاسـانی پەیامەکـەیان بەدەوروبـەر بگـاو کـەس بیـانووی ئـەوەی نـەمێنێ کـە پەیامی پێ نەگەییشتووەو نەیزانیوە.

هـەر لـەم روانگـەوە پـەروەردگار حـەزرەتی موحەممـەدی لەمەککـەدا (کـە گەورەترین شاری نێـوە دورگـەی عـەرەبی بـوو) نـاردوە، سـەرەتا لـەوێدا بانگـەوازی خـۆی بـڵاو کـردەوە گەلەکـەی خـۆی ترسـاند لەسـەرەنجامی پـشت هـەڵکردنو بەدرۆخستنەوەی پەیامەکەی.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر عەدالەتکاری خودا لەبوونەوەردا: کە عیقـابو سـزای کەس نادا تا پەیامی پێ نەگا، هەر گەلو نەتەوەیەك ئیمانیـان هێنـابێ ریشەکێـشی نەکردون، بەڵکوو سزاو ریـشەکردنی کـاتی بـووە: کـە خەڵکەکـە سـتەمکارو تاوانبـار بوبنو هاوەڵیان بۆ خودا دانابێو پەیامی پێغەمبەریان رەتکردبێتەوە. نمونەی ئـەم ئایەتـە ئایـەتێکی تـرە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا كُنَّـا مُعَـذِّبِينَ حَتَّـى نَبْعَـثَ رَسُولاً﴾(الأسراء/١٥).

ئایەتەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە: کـە حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ کـە سـەرەتا لەشاری مەککەدا بووەتە پێغەمبەرو بانگەوازی کردوە بۆ یەکتاپەرستیو وازهێنـان لەبتپەرسـتی، پێغەمبـەری هـەموو ئـادەمیزادە بەعـەرەبو ناعەرەبیـەوە وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿لِّتُنـذِرَ أُمَّ الْقُـرَى وَمَـنْ حَوْلَهَـا﴾(الـشورى:٧) یـان دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُـولُ اللّـهِ إِلَـيْكُمْ جَمِيعـاً﴾(الأعـراف/١٥٨) یـان دەفەرموێ: ﴿لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾(الأنعام/١٩)

٣- ئیمانهێنـانو خوداپەرسـتی نابێتــە هـۆی لەدەسـتدانی دەسـەڵاتو سـوودو قازانج!! ئەوەشمان لەیادنەچێ کاڵای دونیا بەگشتی، لەززەتو خۆشی ژیانی دونیا بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەرچی خودا لەسەر زەوی فەراهەمی هێناوە، لەبەروبومو نیعمەت لەبەرامبەر ئەوەی لای خودا هەیە شتێکی تافیهوو کەم بایەخە.

دەفەرموێ: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾ واتە: هەموو جیهانو ئەوەی تێیدایە لەخۆشیو لەززەتو جوانیو رازاوەیی، بەنیسبەت ئەوەی لای خودایەو بۆ بەندە خوداپەرستەکانی داناوە لەبەهەشتدا، شتێکی کەم بایەخو هیچو پووچە، هەرچی بەئێوە دراوە ئەی ئادەمیزادینە! لەماڵو دارایی لەجوانیو رازاوەیی لەنازو نیعمەتی دونیا، مەتاعو لەززەتێکی کاتییەو کەم خایەنە، ئەگەر لەگەڵ نازو نیعمەتی بەهەشتدا بەرامبەری بکرێن هەر هیچ نین! چونکە نیعمەتی بەهەشت نەبڕاوەو بەردەوامن، نیعمەتی دونیا کورت خایەنو بڕاوەن. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾(النحل/٩٦). یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ لِّلأَبْرَارِ﴾(آل‌عمران/١٩٨) یان دەفەرموێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾(الأعلى/١٦-١٧).

لەفەرموودەی چەسپاودا هاتووە: پێغەمبەر فەرموویەتی (والله، مالحياة الدنيا في الآخرة إلا كما يغمس أحدكم أصبعه في اليم فلينظر ماذا يرجع إليه!) سوێندم بەخودا ژیانی دونیا لەبەرامبەر ژیانی قیامەتدا وەکوو ئەوە وایە پەنجەت بخەیە ناو دەریاوە، بڕوانە چەند لەئاوی دەریاکە بەپەنجەتەوە دێ: هەڵبەتە ئەو ئاوەی بەپەنجەتەوە دێ لەچاو ئاوی دەریاکەوە بەهیچ دەژمێردرێ. دەی بۆ بیر ناکەنەوە؟!

دەی بۆ بیرنەکەینەوە؟ بۆ تێ نەفکرین بۆچی بەخۆماندا نەچینەوە؟ بۆ دونیامان بەلاوە لەقیامەت گرنگ تر بێ؛ بۆ ژیانی بەختەوەری‌و بەردەوام‌و خۆش هەڵنەبژێرین‌و هەوڵی مەردانەی بۆ نەدەین؟

ئەمجار جەخت لەسەر مانای ئایەتەکەی پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ وَعَدْنَاهُ وَعْداً حَسَناً فَهُوَ لاقِيهِ كَمَنْ مَتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْمُحْضَرِينَ﴾ واتە: با ئادەمیزاد بۆ خۆی بەراوردێك بكا، بابۆی دەربكەوێ‌و بزانێ، ئەوەی لای خودایەو پەسندەو باشە ئەوە هەڵبژێرێ‌و ئەوە تەرجیح بدا بەسەر نازو نیعمەت‌و کالای دونیایی‌دا. چۆنیەتی بەراوردییەکە بەم جۆرەیە: ئایا کەسێك ئیمانی بەنامەی خودا هێناوەو بڕوای بەوادەو بەڵێنی خودا هەیەو دڵنیایە: کە خودا بەفەضل‌و گەورەیی خۆی لەپاداشی کردەوەی چاکی‌دا نازو نیعمەتی بەهەشتی پێ دەدا، ئایا وەکوو کەسێك وایە کافرو بەدرۆخەرەوە بێ بڕوای بەهاتنی قیامەت‌و وادەو هەڕەشەی خودا نەبێ؟ ئەم کابرایەی بڕوای بەخودا نیە، چەند رۆژێك لەدونیادا ژیان بەسەردەباو ماوەیەکی کورت لەززەت‌و خۆشی دەچێژێ‌و دوایی رۆژی قیامەت لەپێڕی سزادراوان دەبێ‌و لەناو ئاگری دۆزەخدا دەسوتێندرێ.

کەوابێ قسەی ئەو قوڕەیشییە نەفامانە: کە دەڵێن: ئێمە بۆیە شوێن هیدایەتی موحەممەد ناکەوین دەترسین بەرژەوەندی دونیامان لەکیس بچێ‌و خۆمان بفەوتێنین تووشی دەردی سەری‌و چەرمەسەری ببین هەڵەیەو قسەیەکی بۆش‌و بێ بناغەیەو راو بۆچونێکی بێ سەرو بەرو نەفامانەیە، چونکە ئایین نابێتە هۆی لەدەستدانی ئەو بەرژەوندییانە! لەلایەکی ترەوە سودو بەرژەوەندی دونیایی لەتەرازوی خودادا سوك‌و بێ نرخن، بەپێچەوانەوە هەڵبژاردنی دونیا بەسەر قیامەتدا دەبێتە هۆی لەدەستدانی بەختەوەری قیامەت‌و هۆکاری سزای بەردەوام‌و بەدبەختی نەبڕاوە.

تەنانەت ئەوەی موشریکەکان ترسیان لێیەتی ئەگەر واشبێ‌و ئیمانهێنانیان ببێتە هۆی لەدەستدانی بەرژەوەندی دونیایان، هێشتا ئەوەیان باشترە لەوەی ژیانی بەختەوەری قیامەتیان لەکیس بچێ‌و لەپێری ئامادەکراوانی دۆزەخ بن!!

بەهەر حاڵ ئەوان لەبڕیارو بۆچونیاندا بەهەڵەچون، چونکە شوێنکەوتنی هیدایەتی خودا لەدونیادا ئەمینی‌و دڵنیایی لەگەڵدایە، لەقیامەتیشدا بەخشش‌و نازو نیعمەتی بەهەشت دەستەبەر دەکا. کەوابێ کەسێك واز لەهیدایەتی خودا بێنێ، غافڵ‌و نەفامە، هێزی حەقیقی ناوبوونەوەر ناناسێ، نازانێ کوێ مەترسییەو کوێ ئارامی بەراستی تێدا فەراهەم دێ. ئەوانە گێلن‌و نازانن شتی باش بۆخۆیان هەڵبژێرن‌و خۆیان لەبەفتارچوون بپارێزن..

## ریسواکردن‌و سەرکوتانەوەی موشریکەکان رۆژی قیامەت بەسێ پرسیار

﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُواْ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا

يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾

دوای بەیانکردنی ئەو راستییە: کە لەززەت وەرگرتن لەدونیادا بەبێ هەبوونی بڕوا بەخوداو بەپێغەمبەرانی بەبێ شوکر کردنی پەروەردگار لەسەر نیعمەتەکانی، دەبێتە هۆکاری عەزابی سەختی قیامەت، ئەمجار لێرەدا پەروەردگار حاڵو وەزعی کافرو هاوەڵ دانەران رون دەکاتەوە: کە لەرۆژی قیامەتدا پەروەردگار سێ پرسیاریان ئاراستە دەکاو دەیانخاتە حاڵەتی سەرسوڕمانەوەو هیچ وەڵامیان بۆ نادرێتەوە، پرسیاریان لێ دەکا دەربارەی ئەو خودا درۆزنانەی لەدونیادا کردویانن بەهاوەڵی خودا، هەروا هاوار کردنیان لەو خودا درۆزنانەو داوای شەفاعەت کردن لێیان. هەروەها وەڵامدانەوەیان لەجیهاندا بۆ پێغەمبەران!

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بخەرەوە یادو بۆ گەلەکەتی باس بکە: کە پەروەردگار بانگ لەو موشریكو کافرانە دەکاو پێیان دەفەرموێ: کوان ئەو خودا درۆزنانەی لەدونیادا بەندایەتیتان بۆ دەکردنو بەخوداتان دەزانینو پێتان وابوو هاوەڵو هاوشانی منن؟! کوان ئەو فریشتەو جندۆکەو ئەستێرەو خۆرو بەردو دارانەی بەخوداتان دەزانینو دەتان پەرستنو واتان دەزانی هاوشانی منن؟ ئایا شەفاعەتتان بۆ دەکەن؟ یارمەتیتان دەدەن؟ هەڵبەتە مەبەست لەم پرسیارە ریسواکردنی ئەو موشریكو کافرانەیە، سەرکوتانەوەو هەڕەشەلێکردنیانە، ئەگینا ئەوان هیچ وەڵامێکیان بەدەستەوە نیە، چونکە ئەوان لەرۆژی قیامەتدانو بۆیان دەرکەوتووە: کە ئەوان هەڵەبوونو بیروباوەڕیان بەتاڵ بووە. رەنج بەخەسارو ماڵوێرانن، بەدبەختو چارەڕەشن.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَى مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾(الأنعام/٩٤)

ئەمجار وەلامی رابەرانی کوفرو گومڕایی رادەنوێنێو دەفەرموێ: ﴿قَالَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ رَبَّنَا هَؤُلَاءِ الَّذِينَ أَغْوَيْنَا أَغْوَيْنَاهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَا إِلَيْكَ مَا كَانُوا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ﴾ سەرانی کوفرو بانگخوازانی گومڕایی ئەوانەی کە بڕیاری هاخنینە ناو دۆزەخیان لەسەر چەسپاوە بڕیاری ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾(السجدة/١٣) یان بۆ دەرچووە، دەڵێن: خودایە! ئەو شوێنکەوتوانەی ئێمە: کە کوفرو بێدینیان هەڵبژاردوە، گومڕابوونەکەیان بەویستو ئیرادەی خۆیان هەڵبژاردوە، وەکوو چۆن ئێمەیش بەویستی خۆمان خۆمان گومڕاکردوە. ئێمە بەزۆر ئەوانمان گومڕا نەکردوە، بەڵکوو بەویستی خۆیان ئەو ڕێبازە گومڕاییەیان هەڵبژاردوە، کەواتە تاوانی ئەوان لەئەستۆی ئێمە نیە.

ئێستا ئێمە خۆمان لەوان بێ بەری دەکەینو حاشا لەعەقیدەو بیروباوەڕو کرداریان، لەراستیدا ئەوانە پەرستشیان بۆ ئێمە نەکردوە، بەڵکوو هەواو ئارەزۆی خۆیان پەرستووە، فەرمانبەرداری شەیتانی خۆیان بوون، ئەو رەهنومایی کردونو ئەوانیش بەویستی خۆیان شوێنی کەوتوون.

ئابەم جۆرە کادرو ملهوڕو بانگخوازانی کوفر: کە لەدونیادا خەڵکی گومڕا دەکەن لەو کاتە ترسناکەدا خۆیان لەگوێڕایەڵانی خۆیان بێ بەری دەکەن، هیچ شەفاعەتو کۆمەگییان پێ ناکەن، ئەگەر لەفەرزێکدا شەفاعەتیشیان بۆ بکەن بێ سودەو لێیان وەرناگیرێ.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا، كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾(مريم/٨١-٨٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ

عَــن دُعَــائِهِمْ غَــافِلُونَ، وَإِذَا حُــشِرَ النَّــاسُ كَــانُوا لَهُــمْ أَعْــدَاء وَكَــانُوا بِعِبَــادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾(الأحقاف/٥-٦) یان دەفەرمویَ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الآسْبَابُ﴾(البقرة/١٦٦)

پرسیاری دووەم كە لێیان دەكرێ دەبارەی بەهانا هاتنی خودا درۆزنەكانیانە بۆیان! دەفەرمویَ: ﴿وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَاءَكُمْ﴾ ڕۆژی قیامەت بەموشریكەكان دەگوترێ: دەبانگ لەو شتانە بكەن: كە لەدونیادا كردبووتانن بەهاوەڵی خوداو پەرستشتان بۆ دەكردن، هاواریان لێ بكەن با فریاتان بكەونو لەم حاڵە ناخۆشەتان ڕزگارتان بكەن، خۆ ئێوە لەدونیادا زۆرتان هومێد پێ بوون، ئەوانیش لەبەر تەنگانەو سەرسام بوونی خۆیان ﴿فَدَعَوْهُمْ﴾ بانگیان لێ دەكەن ﴿فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾ لەبەر بێ دەسەڵاتی وەڵامیان نادەنەوە، ﴿وَرَأَوُا الْعَذَابَ﴾ دڵنیان لەوەی دەخرێنە ناو دۆزەخەوەو بەرەو عەزاب ڕاپێچ دەكرێن. جا لەو كاتەدا: كە عەزابی دۆزەخ دەبینن‌و كار لەكار ترازاوە ئاواتەخوازی ئەوەن ﴿لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا يَهْتَدُونَ﴾ كە لەدونیادا موسوڵمان بوونایە، دەڵێن بریا شوێن پێغەمبەری خودا بكەوتینایە، (بەڵام داری بریا هەرگیز بەری نەگرتووە.)

مەبەست لەم پرسیارو سەرزەنشتكردن‌و سەركوتانەوەیە بۆ ڕیسوا كردنیانە لەبەردەم مەخلووقاتی مەحشەردا بەوە هاوار بكەنە كەسانێك: كە بەهانایانەوە نایەن، ناتوانن هیچ كۆمەگییەیەكیان پێ بكەن.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە: كە دەفەرمویَ: ﴿وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا شُرَكَائِيَ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقاً، وَرَأَى الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفاً﴾(الكهف/٥٢-٥٣)

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ ؟﴾ ئەی موحەممەد! یادی ئەو ڕۆژە بكەرەوە: كە پەروەردگار بانگی موشریكەكان دەكاو پێیان دەفەرمویَ: ئەرێ چیتان وەڵامی پێغەمبەرەكان دایەوە؟ چۆنتان هەڵس‌و كەوت لەگەڵ كردن؟ چۆن بەپیر

بانگەوازیەکەیانەوە چون؟ چۆنتان وەڵامی ئەو یەکتاپەرستییە دایەوە: کە بانگ کران بۆی؟

ئەمجار ئەوە بەیان دەکا: کە ئەوانە هیچ وەڵامێکیان پێ نیە، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە بیکەنە بەرگری لەخۆیانو خۆیانی پێ قوتار بکەن! دەفەرموێ: ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الأَنْبَاءُ يَوْمَئِذٍ﴾ هەرچی بەڵگەو بەرگری کردن بێ بەدەستیانەوە نیە، هیچیان بەیاددا نایە، جگە لەبێ دەنگی هیچی تریان بۆ ناکرێ. نەك هەر ئەوە بەڵکوو هەموو رێبازێکی زانیاریو تێگەیشتنیان لێ گوم دەبێ، ﴿فَهُمْ لا يَتَسَاءَلُونَ﴾ تەنانەت پرسیار لەیەکتریش ناکەن. ئینسان لەدونیادا زۆر جار: کە شتێك نازانێ، دەچێ پرسیار لەکەسانی دیکە دەکاو فێری دەبێ. لەو رۆژەدا لەعەیبەتانو لەترسان، هەروەها لەبەر ئەوەی هەموویان لەنەزانیو بێ بەڵگەییدا چون یەکن، هیچیان متەقی لێ نایەو دەمی هەڵناپچڕێ وڵامێك بداتەوە. تەنانەت لەو رۆژەدا هەندێ مەوقیف هەیە پێغەمبەرانیش وڵامیان بۆ نادرێتەوەو وەڵامی پرسیارەکان حەواڵەی زانیاری خوا دەکەن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ قَالُواْ لاَ عِلْمَ لَنَا إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾(المائدة/١٠٩).

دەی جا ئەگەر ئەوە حاڵی پێغەمبەران بێ لەم پرسیارو وەڵامدانەوەدا؛ ئەی دەبێ تۆ چ هەوایەکت بەو گومڕاو سەرلێ شێواوانە بێ؟! پێغەمبەران وڵامیان هەیەو دەڵێن: نازانین چ زانیارێکمان نیە خودایە تۆ بەسەر هەموو نهێنییەکدا ئاگاداری تۆ لەهەموو کەس باشتر دەزانی. بەڵام گومڕاکان هەر متەقیان لێوە نایە!

ئەمجار دوای رونکردنەوەو رانواندنی ئەو وێنە سامناکەی: کە موشریکەکان تووشی دەبنو تێی دەکەون، دێتە سەرباسکردنی حاڵو وەزعی تۆبەکارەکانو ئادەمیزادەکان هەڵدەنێ بۆ تۆبە کردنو گەڕانەوە بۆ لای خوداو وازهێنان لەکوفرو شیركو دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَعَسَى أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُفْلِحِينَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانەی تۆبەیان کردوە لەشیركو هاوەڵدانان بۆ خودا، بڕوایان بەتاكو

تەنهایی خودا کردوە، یەکتاپەرستییان کردۆتە ڕێبازی خۆیانو خاڵصانە عیبادەتی خودایان کردوە بڕوایان بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد کردوە، شوێن پەیامەکەی کەوتوونو کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، ئەوانە سەرفرازو ڕزگاربوون لەو ڕۆژەدا، ڕەزامەندیی خودایان بەدەست هێناوە، بەنازو نیعمەتی بەهەشت بەختەوەربوون، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین وشەی (عسی) لێرەدا بۆ تەحقیقە نەك بۆ تەرەجی.

## پەروەردگار خاوەنو خودای بونەوەرەو هەر ئەو شیاوی حەمدو سوپاسە

﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾

ئەمجار دوای سەرکۆنەکردنی موشریکەکان لەسەر ئەوەی کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو بەهیوای شەفاعەتی ئەو خودا درۆزنانەنو هیچیشیان بۆ ناکرێ. بەشوێن ئەوەدا ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە هەر خودا شەفاعەتکار دیاری دەکا نەك موشریکەکان، هەروا هەڵبژاردنی هەندێ لەئادەمیزاد بۆ پێغەمبەرێتی تەنها بەدەست خودایەو هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە، چونکە هەر خودا زاناو ئاگادارە

بەنهێنیو ئاشكراو هەر ئەو دەزانێ كێ شیاوی پێغەمبەرایەتیەو كێ بەكەڵكی ئەو ئەركە دێ.

هەروەها چونكە هەر خودا خاوەن نیعمەتەو هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ كردنە، هەر ئەو خاوەن بڕیارەو كەسی تر شیاوی خودایەتی نیە، دەفەرموێ: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمْ الْخِيَرَةُ﴾ واتە: خودای تۆ ئەی موحەممەد؛ هەروەها خودای هەموو بیسەرێك! تاكو تەنهاو بێ شەریكە لەزاتو لەصیفاتیدا، بەدیهێنەرو هەڵبژێرەرە، كەس نیە بەربەرەكانی بكا، چی بوێ دەیكاو چۆنی بوێ ئاوا دێتە دی. كاروبار هەمووی بەچاكو خراپیەوە بەدەستی ئەوەو بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، بەویستی خۆی كەسانێك هەڵدەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتی، دەیانكاتە فرستادەی خۆی، هەروەها لەفریشتەو ئادەمیزاد هەندێك هەڵدەبژێرێ بۆ ئەنجامدانی كارە تایبەتیەكان، ڕێگای شەفاعەتكردن دەدا بەكەسانێك كە هەڵیان دەبژێرێ بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە. هەندێ لەدروستكراوەكانی بالادەست دەكا بەسەر هەندێكیاندا.

نەموشریكەكانو نەغەیری ئەوان مافی هەڵبژاردنیان نیە، مافی ئەوەیان نیە بڵێن: بۆچی موحەممەد كراوە بەپێغەمبەرو فلان یا فیسار نەكراوە! مافی ئەوەیان نیە بڵێن: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾(الزخرف/٣١).

﴿سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پاكو مونەزەهیو بەرزیو پیرۆزیی بۆ خودایە لەهەموو هاوەڵو نەنگیو كەمو كوڕییەك: كە موشریكەكان بۆ خودای بەرەوا دەزانن، زۆر بەرزترە لەوەی كەسێك بتوانێ بەربەرەكانی بكاو ڕەخنە لەئیشەكانی بگرێ، مەبەست ئەوەیە: خودا بۆ خۆی مەخلووقاتی خۆی دەناسێو ئیختیاری موطلەقی هەیە بۆ بەرزكردنو نەوی كردن، بۆ زەلیل كردنو عەزیز كردن، كەس بۆی نیە ڕەخنە بگرێ یان بەربەرەكانی بكا.

ئـەمجار پـەروەردگار ئـەوە رون دەكاتـەوە: كە ئـەو ئیختیـارە مـوطلـەقـەی ئـەو هەیەتی پشتی بەستووە بەزانیاری راسـتو رەهـاو مـوطلـەقو دەفـەرموێ: ﴿وَرَبُّـكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ واتە: خودای تۆ ئەی بەنـدەی دروسـتكراو! زانـاو ئاگادارە بەهەموو شتێك؛ دەزانێ دڵو دەروونی ئادەمیزادەكان چی تێدایـەو چییان تێدا شاردراوەتەوەو چی ئاشكرا دەكـەن، چ پـیلانو دژایـەتێكیان دژی پێغەمبـەر ﷺ بەنهێنی دارِشتووەو بەئاشكرا چی دەردەخەن!

ئـەو زانـستە رەهـاو مـوطلـەقـە صیفەتی خودایەكە هـەموو تایبەتمەندییـەكی خودایەتی هەیە، فەردو صەمەدو ئەزەلیو ئەبەدییە ﴿وَهُوَ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُـوَ﴾ ئـەو زاتە تاكو تەنهایە لەخودایەتیدا، هـیچ خـودا نـین جگـە لـەوێ، هـیچ پـەروەردگارو بەدیهێنەرێك نیە جگە لەو زاتە بێچوونە، هەرچی بیەوێ دەیهێنێتـە دی. هەرچی بگونجێ بێتە دی دەیهێنێتە دی. زانایە بەهەموو شتێكو خاوەن دەسـەڵاتە بەسـەر هـەموو شـتێكدا، هـیچ نـەنگیو نەقـصێكی تێـدا نیـە، شـیاوی هـەموو حەمـدو سوپاسـێكە. بۆیـە ﴿لَـهُ الْحَمْـدُ فِـي الأُولَـى وَالآخِـرَةِ﴾ حەمـدو سوپاسـی حـەقیقی لەدونیاو لەقیامەتدا، هەر شیاوی خودایەو كەسـی تـر شـیاوی حەمـدو ئـەنـای نـاوا نیـە، چونكە پـەروەردگار بەعەدالـەتكاری خۆیو بەحیكمـەتو فـەضلو ئیحسانی خۆی، نازو نیعمەت دەبەخشێ بەسەر بەندەكانیدا.

﴿وَلَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْـهِ تُرْجَعُـونَ﴾ فرمـانرِەواییو برِیـاردانو كاردروسـتی لەهـەموو شتێكدا هەر بۆ خودایە، كەس نیە بتوانێ حوكمو برِیـاری هەڵبوەشـێنێتەوە، زاتـی پاكی باڵادەستە بەسەر بەندەكانیدا، خاوەن رەحمو بەزەییە بۆ بەندەكانی، رۆژی دوایی هەموو كاروبارێكی مەخلووقات بۆ لای خودا دەگەرِێتەوەو هەر كەسە بەپێی كردەوەكـانی سـزاو پاداشـی دەدرێتـەوە. چـاكە بەچـاكەو خراپـە بەخراپـە، لەبوونەوەردا هیچی لێ گوم نابێ.

ئایەتەکە بەروونی ئەوە دەگەیەنێ: کە هەڵبژاردنو حوکمو بڕیار تایبەتە بەخوداوە، کەسی تر مافی هەڵبژاردنی نیە. تیرمیذی لەئەبوبەکرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: هەر کاتێ پێغەمبەر ﷺ بیویستایە کارێك ئەنجام بدا دەیفەرموو: (اللهم خير لي واختر لي).

(ابن السنی) فەرموودەیەك بە(مەرفوعی) لەئەنەسەوە ریوایەت دەکا؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەی ئەنەس! کە ویستت کارێك ئەنجام بدەی حەوت جار ئیستیخارە بکە، ئەمجار چاوەڕوان بە ئاخۆ دڵت چ هەڵدەبژێرێو چی دێتە ناو دڵتەوە خێر لەوەدایە.

هەر لەسەر ئەم بنەمایە نوێژی (اسخارة) دامەزراوە: بەم جۆرە دەستنوێژ بگرێو دورکات نوێژ بکا لەرکاتی یەکەمدا دوای سورەتی (فاتیحة) سورەتی (الكافرون)و لەرکاتی دووەمدا دوای (فاتیحة) سورەتی (الأخلاص) بخوێنێ.

ئیمامی بوخاری لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەت دەکا؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو کارێکی گرنگ نوێژی (استخارة)ی فێر دەکردین وەکوو چۆن سورەتێکی قورئانی فێر دەکردین. پێشی دەفەرمووین: (إذا همَّ أحدكم بالأمر، فليركع ركعتين غير الفريضة ثم ليقل) ئەگەر یەکێك لەئێوە ویستی کارێکی گرنگ ئەنجام بدا با دوو رکات نوێژی جیا لەنوێژە فەرزەکان بکا ئەمجار بڵێ: (اللهم إني استخيرك بعلمك واستقدرك بقدرتك، وأسألك من فضلك العظيم فإنك تقدر ولا أقدر وتعلم ولا أعلم، وأنت علام الغيوب، اللهم ان كنت تعلم أن هذا الأمر خير لي في ديني ودنياي ومعاشي وعاقبة أمري، فاقدره لي ويسره لي، ثم بارك لي فيه، اللهم ان كنت تعلم ان هذا الأمر شر لي في ديني ودنياي ومعاشي وعاقبة أمري فاصرفه عني، واصرفني عنه، واقدر لي الخير حيث كان ثم رضني به) ئەمجار ناوی کارەکەی دێنێ.

زانایان دەفەرموون: پێویستە ئەو کەسەی (استخارة) دەکا دڵو دەروونی خۆی لەهەموو غائیلەو خەتەرەیەك خاڵی بکاو بەهیچ لایەکدا دڵی مەیلان نەکا، ئەمجار دڵی هاتە سەر چی ئەو کارە دەکا، چونکە خێر لەوەدایە.

## بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتی خودایانەی پەروەردگارو سەرکوتانەوەی موشریکەکان

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی چەسپاند: کە هەر خۆی بەدیهێنەری موختارە، خۆی شیاوی ئەوەیە: پلەو پایە بۆ ئەمو ئەو هەڵبژێری، نەفامی ئەوانەشی چەسپاند: کە بەندایەتی بۆ غەیری خودا دەکەن!

ئەمجار دوای چەسپاندنی ئەوە: کە هەر خۆی شیاوی حەمدو سوپاس بۆ کردنە لەسەر نیعمەتەکانی، هەندێ بەڵگەو نیشانەی خودایەتیو بەتوانایی خۆی رادەنوێنێ: کە بریتین لەفەراهەم هێنانی ئەو نیعمەتانەی کە هەر خودا بۆ خۆی دەتوانێ فەراهەمیان بێنێ! رانواندنی ئەم نیعمەتانەش بۆ یادخستنەوەی ئادەمیزادە، بۆ ئەوەیە تێیان بگەیەنێ: کە پێویستە لەسەریان سوپاسی ئەو خودا خاوەن نیعمەتە جۆراو جۆرانە بکەن، بەگوێرەی توانای خۆیان پاساوی نیعمەتەکانی بدەنەوە.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِضِيَاءٍ أَفَلا تَسْمَعُونَ ؟﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بەو موشریکانە بڵێ: ئێوە پێم بڵێنو هەواڵم بدەنێ، ئەگەر خودا کاتەکانی ئێوە هەمووی بکاتە شەوو هەمیشە وڵاتتان تاریکستان بێ هەتا رۆژی قیامەت، ئەمجار ئێوە بەو تاریکییە بەردەوامە نارەحەتو خەفەتباربن، وەکوو ئەو وڵاتە قوطبیانەی کەساڵانە نیوەی شەوو نیوەی رۆژە؛ واتە: شەش مانگ هەر شەوەو شەش مانگ هەر رۆژە! کێ هەیە جگە لەخودای باڵادەستو خاوەن توانا بتوانێ روناکاییتان بۆ فەراهەم بێنێ؟! ئەوە بۆ گوێ راناگرنو بەجوانی شت ببیسنو تێی بگەن بۆ ئەوەی بەخۆتاندا بچنەوەو واز لەهاوەڵدانان بۆ خودا بهێنن!

بەراستی ئادەمیزاد سپڵەو پێنەزانن، ئەم هەموو نازو نیعمەتەی خودایان بەسەرەوەیە، کەچی هاوەڵی بۆ دادەنێن، بەندایەتی بۆ ناکەن.

سەیر بکەن ئادەمیزاد کە زستان تۆزێك شەو درێژ دەبن چەندیان حەز لەهاتنی بەیانیو روناکبوونەوەی بوونەوەرە، یان زستان کە سروشت دەبێتە هەورو هەڵاو بەفرو بارانو کرێوەو ماوەیەك خۆر لێیان گوم دەبێ، چەند بەتاسوقەوەن

خۆر هەڵبێ‌و گەرمایی‌و روناکی خۆی بەسروشت ببەخشێ. دەی دەبێ حاڵیان چۆن بێ ئەگەر خۆر هەڵنەیەو روناکایی‌و گەرمایی ئەویان بۆ هەتا هەتایێ لێ بسەندرێتەوە؟ ئەگەر بەمەزندەو گۆترەکاری بڵێن: بێ خۆر ژیان بەرقەرار دەبێ. لەفەرزی محاڵدا وای دابنێن. ئەگینا لەراستی‌دا ئەگەر خۆر هەڵنەیەو روناکایی خۆر پەخش نەبێ بەبوونەوەردا ژیانیش نابێ.

ئەمجار پێچەوانەی حاڵەتی پێشوو باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ النَّهَارَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلا تُبْصِرُونَ ؟﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەو مونافیقانە بڵێ: پێم بڵێن‌و هەواڵم بدەنێ، ئەگەر خودا کاتەکانی ئێوە هەموو بکا بەرۆژی روناک‌و تا رۆژی قیامەت دونیا هەمیشە روناک بێ‌و گۆڕانکاری شەوو رۆژ بەسەر بوونەوەردا نەیە، جەستەو عەقڵ‌و هۆشتان ماندووبێ، هەمیشە لەجم‌و جۆڵدا بن‌و کاتی پشوودان‌و حەسانەوەتان نەبێ، کێ هەیە جگە لەخودا بتوانێ شەوتان بۆ دابێنێ تێیدا ئیسراحەت بکەن‌و ئارامییەك بدەن بەجەستەو عەقڵ‌و هۆشتان، ئەوە بۆچی ئەوەندە نەفام‌و سپڵەو پێنەزانن‌و ئەم دیاردە ئاشکراو نمایانە نابینن‌و هەست ناکەن بەو نیعمەتە گەورەیە: کە شەوەو تێیدا دەحەسێنەوە؟؟ بۆچی بیر ناکەنەوەو تێ نافکرن تا بزانن‌و بۆتان دەربکەوێ ئەو خودایەی ئەو نیعمەتەی فەراهەم هێناوە، هەر ئەو شیاوی خودایەتی‌یەو هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردن‌و بەندایەتی بۆ کردنە. ئادەمیزاد کە دەکەونە وەرزی ئاخرو ئۆخری بەهاران‌و سەرەتای هاوینان رۆژ چەند سەعاتێك درێژ دەبن‌و شەو کورت دەبن، بەتاسوقەوەن بۆ هاتنی شەوو دەیانەوێ چەند ساتێك لەتاریکی‌دا ئارام بگرن‌و بحەسێنەوە، کفت‌و کۆی جەستەی ماندویان بنیشێ‌و هێزو توانایان تازە ببێتەوە.

بەڵێ ژیان هەمووی پێویستی بەکاتی شەو هەیە بۆ ئەوەی ئەو تاقەتو هێزو توانایەی بەرۆژ خەرجی دەکا بەشەو بەهۆی ئارامگرتنو حەسانەوە قەرەبووبیان بکاتەوە، بەنیشاطی تازەو هێزو توانای تازەوە رۆژی دوایی دەست بەکار بکاتەوە.

دەی باشە دەبێ وەزعو حاڵی ئادەمیزادو زیندەوەرانی ترو روەكو درەخت چۆن بونایە ئەگەر زەمان هەمووی هەر خۆرەتاو بوایەو دونیا شەوی بەسەردا نەهاتایە، ئەمە لەفەرزی ئەوەدا ئەگەر بەبێ هەبوونی شەوو گۆڕانکاری لەنێوان روناکیو تاریکیدا ژیان بگونجێو دەستەبەر ببێ. چونکە بەگوێرەی زانست ئەگەر هەموو کاتێك دونیا روناك بوایە ژیان نەدەبوو هەموو زیندەوەرو دارو درەخت دەفەوتان.

ئەی ئادەمیزادینە! ئاگاداربینەوە، وەهۆش خۆبێنەوە، بزانن: هەموو شتێك بەپێودانە، هەموو گەورەو پچوکێك بەنەخشەو پلانە، هەموو شتێك لای خودا بەئەندازەیە.

﴿وَمِنْ رَحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ بەشێکە لەرەحمەتو فەضلی خودا بەسەر ئێوەدا ئەی خەڵکینە! کە شەوو رۆژ بەشوێن یەکتریدا دێنو ئەمیان دەڕواو ئەویان دێتە شوێنیو جوداوازییان تێ دەکەوێ. شەوی وا بەدیهێناوە تاریكو تەڵەم بێ بۆ ئارامگرتنو پشوو دانو حەسانەوە تێیدا، بۆ ئەوەی دڵو دەروونیان ئارام بگرێو، ماندو شەکەتی کارو جمو جۆڵی رۆژی لەکۆڵ بکەوێ!!

هەروا رۆژی بۆ فەراهەم هێناون بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن رزقو رۆزیی خۆتان دابین بکەن، گەشتو گوزارو هاتوچۆی نێوان ئەم وڵاتو ئەو وڵاتتان بۆ بکرێ، بتوانن طاقەی خۆتان صەرف بکەن بەدوا دابینکردنی پێداویستی خۆتان: کە بەرواڵەت زۆر لەو کارانە بەتاریکی ئەنجام نادرێن، یان بڵێن بەئاسانی جێ بەجێ ناکرێن. کەوابوو پێویستە لەسەر ئێوەی ئادەمیزاد: کە بەهەموو شێوەیەكو

هەمیشە شوکرو سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتانەی بەمنێوەی بەخشیوە.

بێگومان شتێکی ئاشکراو نمایانە: کە گۆڕانی شەوو رۆژو بەشوێن یەکدیدا هاتنیان، گەورەترین نیعمەتی خودایە بەسەر مەخلووقاتدا، بەڵکوو گۆڕانی شەوو رۆژ گەورەترین بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتی رەهای پەروەردگار. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً﴾(الفرقان/٦٢).

ئەمجار جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ سەر مەوزوعی بانگ کردن لەوانەی هاوەڵ بۆ خودا بڕیار دەدەنو بەندایەتی بۆ غەیری خودا دەکەن، ئەوەمان بۆ رون دەکاتەوە: کە لەرۆژی قیامەتداو لەمەوقیفێکی حەریجو دژواردا لەپێش چاوی جەماوەری دەشتی مەحشەر، پەروەردگار بەمەبەستی ریسواکردنی موشریکەکان بانگیان لێ دەکاو سەرکۆنەیان دەکا.

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِي الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەوە بۆ موشریکەکان باس بکەو ئەو رۆژەیان بێنە بەرچاو: کە خودای تۆ بانگیان لێ دەکاو پێیان دەفەرموێ: کوانو لەکوێن ئەو شتانەی کردبووتانن بەهاوەڵی منو پێتان وا بوو هاوشانی منن! هاواریان لێ بکەن با ئەمڕۆ بەهاناتانەوە بێنو فریاتان بکەون!

مەبەست لەم دووبارە کردنەوەو جەختکردنەوەی بانگ کردن لەموشریکەکان لەسارای مەحشەردا، ئاماژە کردنو ئاگادارکردنەوەی ئادەمیزادە بەوە: کە هیچ شتێك هێندەی هاوەڵدانان بۆ خودا نابێتە هۆکاری هاوردنی غەزەبی پەروەردگارو هیچ شتێکیش بەئەندازەی یەکتاپەرستی نابێتە هۆی رەزامەندیی پەروەردگار.

قورطوبی دەفەرموێ: ئەم بانگ کردنە لەخوداوە نیە، چونکە خودا ئاخاوتن لەگەڵ کافرەکان ناکا ئاماژە بەئایەتی ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾(البقرة/١٧٤)

بەڵکوو فەرمان دەکا بەفریشتە ئەوان سەرکۆنەیان بکەنو ئیقامەی (حجة)یان لەسەر بکەن. وتەیەکیش هەیە دەڵێ: دەگونجێ ئاخاوتنەکە لەخوداوە بێ، ڕەنگە قسەنەکردنی خودا لەگەڵیاندا، کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ئەو کاتە بێ: کە پێیان دەگوترێ: ﴿اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُون﴾(المؤمنون/١٠٨)[1]

هەڵبەتە لەئاکامی ئەو بانگ لێکردنە ئابڕووبەرەیەدا: کە لەپێش چاوی مەخلووقاتی سارای مەحشەردا ئەنجام دەدرێ لەوەڵامی پرسیاردا موشریکەکان بێ دەنگو چاو بەملۆق وەستاو دەبن، ترسو غەمو ناڕەحەتییان سات دوای سات زیاتر دەبێ، ئەمجار بۆ زێدە ناڕەحەتیو غەمبارییان پەروەردگار شایەتیشیان لێ ڕاست دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيداً فَقُلْنَا هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ فَعَلِمُوا أَنَّ الْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ لەهەموو گەلو نەتەوەیەك شایەتێکمان ڕاست کردەوە بۆ شایەتیدان لەسەریانو زێدە ڕیسوا کردنیانو خەفەتبارکردنیان.

موجاهید دەفەرموێ: ئەو شایەتە لەسەر هەر نەتەوەیەك پێغەمبەرەکەیانە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيداً﴾(النساء/٤١) هەموو پێغەمبەرێك دەبێتە شایەد بەسەر بیرو باوەڕو کارو کردەوەی گەلو نەتەوەکەیەوە، پێغەمبەری ئیسلامیش دەبێتە شایەت بۆ پێغەمبەرەکان.

جا کەلەهەموو گەلو نەتەوەیەك شایەتێك ڕاست دەکەینەوە ئەمجار بەموشریکەکان دەڵێین: بەڵگەو شایەد لەسەر ڕاستی بیرو باوەڕەکەتان بهێنن، گوا بەڵگەتان لەسەر ئەوەی کە دەتانگوت: خودا هاوەڵی هەیە. ئەوانیش وەڵامیان دەست ناکەوێ، ئەو کاتە دڵنیا دەبن: کە شیاوی خودایەتی هەر (الله)یەو کەسی تر خودا نیەو بەکەڵکی خودایەتی نایە، هەر ئەو پەروەردگارەو کەسی تر ڕایەی ناکەوێ لافی پەروەردگاریەتی لێ بدا. ئەو کاتە هەست بەخەسارەتمەندیو

[1] تەفسیری قورطوبی ج٧/٢٣٢ (٢٨٦٤).

بەدبەختی خۆیان دەکەن، چاووڕاوو درۆو دەلەسەو بوختانیان بۆ ناکرێ، بتەکانیان لێ گوم دەبن‌و هیچ یارمەتی‌و قازانجیان پێ ناگەیەنن، دڵنیان لەوەی دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو رزگاربوونیان نیە!

## چیرۆکی قارون لەچەند زنجیرەیەکدا

### زنجیرەی یەکەم:

### ستەمکردنی لەنەتەوەی موساو بوغرابوونی بەماڵ‌و سامان

﴿ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾

دوای سەرکۆنەکردنی موشریکەکانو ریسواکردنیان پەروەردگار چیرۆکی قارونمان بۆ دەگێڕێتەوە بەمەبەستی عیبرەت وەرگرتن لەسەرەنجامی ملهوڕان لەدونیاو قیامەتدا، ئەوە رون دەکاتەوە: کە قارون بەزەویدا رۆچێنراو بەخۆیو ماڵو سامانیەوە فەوتا، لەقیامەتیشدا وەکوو موشریکەکان لەئەهلی دۆزەخە.

قارون: کوڕی (یصهر)ی کوڕی قاهیثە: کە باپیری حەزرەتی موسایە. واتە: کوڕی مامی حەزرەتی موسایە. قارون پیاوێکی شۆخو شەنگو جوانخاص بووە، لەناو بەنوئیسرائیلیەکاندا لەهەموویان زیاتر تەوراتی لەبەر بووەو ئاگاداری بووە، ئەویش وەکوو سامیری دووڕوو دەرچوو، بەهۆی لەخۆبایی بوونو بوغراییەوە خودا لەناوی برد.

قارون پیاوێکی ئیسرائیلی بوو خودا ماڵو سامانێکی زۆری پێ دابوو، هێندە دەوڵەمەند ببوو کلیلی گەنجینەو خەزێنەی ماڵو سامانی بەکۆمەڵێك کرێکار نەبوایە هەڵنەدەگیران. ئەهلی وەعظو ئامۆژگاریی زۆریان نەصیحەت کرد: کە واز لەبوغرایی بێنێ، خۆ بەزل نەزانێو لەماڵو سامانی خۆی ببەخشێو خودا لەخۆی رازی بکا، وا نەکا خودا قاری لێ بگرێو نازو نیعمەتەکانی لێ بستێنێتەوە، ئیتر چیان لەگەڵ کردو چیان پێ گوت نەهاتە سەر رێو پەندئامێز نەبوو، وتی: ئەم ماڵو سامانەم هەمووی بەرەنجی شانی خۆم پێکەوە ناوە، بەزیرەکیو لێزانی خۆم کۆم کردۆتەوە، بێ ئاگا بوو لەوەی خودا چی بەملهوڕو طاغووتەکانی رۆژگار کردووە چۆنی تێکەوە پێچاون![1]

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ﴾ بێگومان قارون کە بۆتە نموونەی دەوڵەمەندو ساماندارى بوغراو لەخۆبایی بوو، لەنەتەوەی ئیسرائیل بوو، بەهۆی ساماندارییی لەخۆی بایی بوو، ستەمی لەنەتەوەکەی کرد، لەستەمکاریدا زێدەڕەوی کرد، داوای لێ کردن هەموویان ببنە ژێر دەستەییو

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٠٦.

ژێرباری بن، خۆی کرد بەملهوڕو طاغوت بەسەریانەوە! دەیچەوساندنەوە زەوی‌و ئاوی لێ داگیر دەکردن، یارمەتی هەژارانی نەدەدا.

﴿وَآتَيْنَاهُ مِنْ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ﴾ هێندەمان ماڵ‌و سامانی نەقدی‌و کاڵاو شتومەکی عەینیمان پێ دابوو: کە هەڵگرتن‌و گواستنەوەی کلیلی گەنجینەکانی کۆمەڵێ پیاوی زۆرو بەهێزی ماندو دەکرد!

﴿إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ﴾ لەو سەرو بەندەدا کۆمەڵێك لەئامۆژگاریکەرانی گەلەکەی پێیان گوت: بەماڵ‌و سامانی دونیا لەخۆت بایی مەبە، چونکە خودا ئەوانەی خۆش ناوێن: کە لەخۆیان بایی دەبن‌و لوتبەرزیی دەنوێنن، شوکرو سوپاسی خودا ناکەن لەسەر ئەو نازو نیعمەتەی پێی داون، یارمەتی ئاتاجان نادەن‌و خۆیان ئامادە ناکەن بۆ ژیانی بەختەوەری قیامەت! واناکەن خودا لەخۆیان رازیی بکەن!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾(الحديد/٢٣).

﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ﴾ ئەو ماڵ‌و سامانەی خودا پێی داوی بەکاری بێنە بۆ خودا لەخۆرازیکردن، یارمەتی هەژارو ئاتاجان بدە، پاشەڕۆژی بەختەوەر بۆخۆت دابین بکە،

﴿وَلا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا﴾ بەشی خۆیشت لەرابواردنی دونیا واز لێ مەهێنە، لەو نازو نیعمەتەی خودا پێی داوی بەهرەمەند ببە، بەجۆرێ بژی کە سودت بۆخۆت‌و کۆمەڵت هەبێ، چاکەو پیاوەتی لەگەڵ خاوەن ئاتاجان بکە، یارمەتی بێنەواو هەژاران بدە.

﴿وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾ چاکە لەگەڵ بەندەکانی خودادا بکە وەکوو چۆن خودا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردوە..

﴿وَلا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ إِنَّ اللَّـهَ لا يُحِـبُّ الْمُفْـسِدِينَ﴾ هەوڵ مەدە فەسادو ئاشوب لەسەر زەوی بەرپا بکەی، نەکەی ستەم لەبەندەکانی خودا بکەی، لەخۆت بایی مەبە بێگومان پەروەردگار ئاشوبگێڕانی خۆش ناوێن سزایان دەدا، رەحمەتو بەزەیی خۆی لەفەساد جۆیان دەگرێتەوە.

وەلێ قارون بەم ئامۆژگاریکردنە فسقەڵ بوو، بوغرایی نواندو تووڕە بوو ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِنـدِي﴾ قارون وتی: ئەم ماڵو سامانەی من هەمە، هەمووی بەزیرەکیو زانیاری خۆم کۆکردۆتەوە، ئیتر پێویست ناکا ئێوە ئامۆژگاریم بکەن، خودا کە ئەم ماڵو سامانەی پێداوم بۆیە پێی داوم چونکە دەزانێ شیاوی ئەم ساماندارییەم، هەروەها بەلێزانیو زانیاریو هەوڵو تێکۆشانی خۆم پەیدام کردوە، من شیاوی ئەم ماڵو گەنجو خەزێنانەم.

ئەمە هەڵسو کەوتی زوربەی زۆری ساماندارانی لەخۆبایی بووە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ﴾(الزمر/٤٩).

یان دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَـاهُ رَحْمَـةً مِّنَّـا مِـن بَعْـدِ ضَـرَّاء مَسَّتْهُ لَيَقُـولَنَّ هَـذَا لِي﴾(فصلت/٥٠).

ئیتر پەروەردگار وەڵامی قارونو هەموو لەخۆبایی بوێك دەداتەوەو هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ:

﴿أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِنْ قَبْلِهِ مِنْ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَـرُ جَمْعـاً وَلا يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمْ الْمُجْرِمُونَ﴾ ئەوە قارون لەبیری چۆتەوەو نازانێ، ئەوەندەی زاینـاریو تێفکـرینو هۆشـیاریی نیـە: کـە بـەماڵی زۆرو گـەنجو جـەواهیرات بوغرانـەبێ، نازانـێ کـە پـەروەردگار لـەپێش رۆژگـاری ئـەودا، لەچـاخەکانی

رابوردودا زۆر کەسی بوغرابوو لەخۆبایی بووی بەهیلاك بردوە: کە زۆر لەقارون بەهێزترو ساماندارتر بوون؛ ئەو ماڵو سامانەی پێمان دابوو لەبەر ئەوە نەبوو خۆشمان ویستبێ، یان شیاوی ئەوە بووبێو لەسەرمان واجب بووبێ بیدەینێ.

بێگومان خودا ئەو ساماندارە سپڵەو لەخۆبایی بوانەی لەناوبردنو خستنیە زبڵدانی مێژووەوە..! با قارونو هەموو ئەوانەی رەوشتیان وەکوو قارون وایە بزانن: کە تاوانباران لەوە بێ بایەخترن: کە پرسیار لەتاوانەکانیان بکرێ، کاتێك لەناوبردنیان بڕیار درا پرسیاریان لێ ناکرێ دەربارەی تاوانەکانیان، واتە: پێویست ناکا پرسیاریان لێ بکرێ چ تاوانێکیان ئەنجام داوەو چەندییەتو چۆنیەتی تاوانەکانیان چۆنەو چیە. نەشایەتن نەناوبژیکەرن واتە: پرسیاری (استفسار)و زانیاریی لێ وەرگرتنیان لێ ناکرێ، ئەگینا پرسیاری سەرکوتانەوەو ریسواکردنو خەفەتبارکردنیان ئاراستە دەکرێ.

## برێ دیاردەی بوغرابوونی قارونو لەخۆبایی بوونی

﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ

يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾

ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەشێکی ترن لەچیرۆکی قارونو بەسەرهاتی. ئەوە بوو لەوەپێش پەروەردگار باسی بوغرابوونو ستەمکاریی قارونی کرد، لەم کۆمەڵە ئایەتەشدا برێ دیاردەی بوغرابوونەکەی رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ﴾ رۆژێك قارون بەمەبەستی خۆڕانواندنو فەخرو شانازیی کردن بەسەر خەڵکدا خۆی رازاندەوەو چاکترین پۆشاکی پۆشیو باشترین وڵاغی سواریو بەنرخترین زینو سەرزینی بۆ ئامادە کرابوو لەگەڵ دارو دەستەکەیدا بەناو خەڵکەکەدا پیاسەیەکی کردو بەو خۆ ئارایشدانەوە خۆی نیشانی مەردومگەل دا.

لەراستیدا قورئانی پیرۆز باسی چۆنیەتی خۆرازاندنەوەکەی قارونی بەتەفصیل نەکردوە، تەنها بەو رستە کورتبڕە سەرنج راکێشە تابلۆکەی کێشاوەو بەس!

ئیتر ئەو وەصف کردنو پێدا هەڵدانەی موفەسسرینی سەلەف (رەحمەتی خودایان لێ بێ) لەم بارەوە ئەنجامیان داوە هیچی پشتی بەبەڵگەی راستو بەهێزەوە نەبەستووەو مۆرکی ئیسرائیلیان پێوە دیارەو پێویستە بەحەزەرەوە تێیان بڕوانینو سەد دەرسەد بەراستیان نەزانین!! بۆ نموونە قەتادە دەڵێ: بۆیانگێڕاوینەوە: کە قارون بەخۆیو دارودەستەکەیەوە: کە خۆی رانواند، چوار هەزار وڵاغیان پێ بوو، هەموویان پۆشاکی سوریان لەبەردابوو، لەم چوار هەزار

ولاغـە هـەزاریان ئێـستری سـپی بـوون. بەسـەر ولاغەکانیانـەوە پارچـە قوماشـی قەدیفەی ئورجوانی هەبوو.

موقاتیل دەڵێ: قـارون کـە هاتـە نـاو خەڵکەکە سواری ئێـسترێکی بەڵـەك بـوو، زینەکەی لەزێڕ دروستکرابوو، چوار هەزار ئەسپ سـواری لەگـەڵدا بـوو، هـەموویان پۆشـاکەکەیان ئورجـوانی بـوو. سـێ سـەد (جاریـة) کـچۆڵەی لەگـەڵدا بـوو سـواری ئێستری بەڵك بوو بوون.

ئیبنـو زەیـد دەڵێ: بەحـەفتا هـەزار کەسـەوە هاتـە نـاو خەڵکەکـەوە، هـەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون پۆشاکی رەنگاو رەنگیان لەبەردا بوو.

کولەبی دەڵێ: قارون: کە هاتە دەر بـۆ نـاو خەڵکەکە پۆشـاکی سـەوزی لەبـەردا بوو، کاتی خۆی خودا بۆ موسای نازڵ کردبوو دوایی قارون لـێی دزی.[1]

بۆیـە ئیمـامی رازی لـەم بـارەوە دەفـەرموێ: قورئـان هـەر ئـەو رسـتەیە واتـە: ﴿فخرج علی قومه في زينتـه﴾ هێنـاوەو بـەس، مەبەسـتی ئەوەیـە: ئـەو ریوایەتانـەی موفەسسیرە کۆنەکان تەفسیرەکانی خۆیان پـێ هـاخنیون لـەم بـارەوە، بـێ بەڵگـەن و دەبێ بەحەزەرەوە لێیان بڕوانین.[2]

جا لەو کاتەدا: کە قارون بەو شێوە سەرنج راکێشە هاتە نـاو گەلەکەیـەوە، دڵـی کۆمەڵێك کەسـی بـۆ لای خـۆی کـێش کـردو دڵیـان خورپـەی پـێ کـەوت، بـەجۆرێك ﴿قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّـهُ لَـذُو حَـظٍّ عَظِـيمٍ﴾ ئەوانەی دووربین نەبوون و نەفام و بێ هۆش بوون، دڵیان بەدونیاوە پەیوەست بـوو، وتیان خۆزگـە ئێمـەیش وەکـوو قـارون دەوڵەمەنـد بوینایـە، ئـەوەی دراوە بـەقارون بدرایە بەئێمەش، بەراستی بەختـەوەرەو بـەش و بـارێکی گـەورەو نـازو نیعمـەتێکی زۆرو فراوانی پێ بەخشراوە.

[1] تەفسیری قورطوبی ج٢٢٨/٧ (٢٨٧٠).

[2] تەفسیری رازی ج١٧/٢٥.

ئەمە سروشتی ئادەمیزادەو هەمیشە حەزی لەسامانداریو دەسەڵاتەو ئاواتی بۆ دەخوازێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ﴾(العاديات/٨).

لەبەرامبەر ئەم کۆمەڵەدا کەسانێکی دیکە هەبوون: تێگەیشتوو خاوەن عەقڵو فام، دوور بینو بەرچاو رونو خوداپەرست. بەرپەرچی کۆمەڵی پێشوویان دایەوە، نەصیحەتو ئامۆژگارییان کردن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً وَلا يُلَقَّاهَا إِلاّ الصَّابِرُونَ﴾ ئەوانەی زاناو دڵسۆزو خوداپەرستو هۆشیار بوون، پێیان گوتن: هاوار؛ ماڵوێرانو سەرلێ شێواو خۆتان! کورە ژێوان ببنەوە، واز لەو ئاواتەخوازییە بهێنن، چاو مەبرنە ئەو نازو نیعمەتانەی دراوە بەقارون، هەوڵی بەختەوەریی ژیانی قیامەت بدەن، چونکە ئەو پاداشو نازو نیعمەتەی خودا لەبەهەشتدا بۆ بەندە رستاڵەکانی ئامادە کردوە، زۆر باشترو بەردەوام ترە لەوەی ئێستا ئێوە خۆزگەی بۆ دەخوازن، وەلێ نازو نیعمەتو ژیانی بەختەوەرانەی بەهەشت دەستەبەر نابن مەگەر بۆ خاوەن صەبرو خۆڕاگران؛ ئەوانەی بەردەوامن لەسەر خوداپەرستیو خۆپاریزی لەتاوانو سەرپێچی فەرمانی پەروەردگار. ئەوانەی رازین بەو رزقو رۆژییەی خودا پێی داونو هەوڵ دەدەن بۆ ژیانی دوارۆژو بەختەوەریی هەمیشەیی. ئەم ژیانەی: کە پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی قودسیدا دەربارەی دەفەرموێ: (يقول الله تعالى: أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت، ولا أذن سمعت، ولا خطر على قلب بشر، واقرؤوا ان شئتم ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(السجدة/١٧)[1]

جا کە فیتنەی ماڵو سامانو رازانەوەو لەخۆبایی بوونی قارون گەیشتە ئەو ئاستەی: کە بەو جۆرە کۆمەڵێك ئاواتی بۆ بخوازن، ئیتر دەستی قودرەت هاتە ناوەوە بۆ ئەوەی ئاستێك دابنێ بۆ ئەو فیتنەیەو نەهێڵێ چی تر سەرنجی ورە

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٠٧.

نزمـەکان رابکێـشێ. ئـادەمیزادی زەعیـفو کـورت بـین پـێی هەڵنەخەڵـەتێن. لوتبەرزیو لەخۆبایی بوونی بوغرایان قەلاچۆ بکاو نـەهێڵێ چی تـر بـەتاڵ خۆی رانوێنێ. دەفەرموێ: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الأَرْضَ﴾ ئیتر خۆیو ماڵو سامانو خـانوو باڵەخانـەیمان بـەزەویدا بـردە خـوارێ، ئـەو زەوییـەی خـۆی لەسـەر بـادەداو خـۆی بەسەر خەڵکدا رادەوەشاند قوتیدا بەناخی خۆیدا بردیە خوارێ!!

لەصەحیحی بوخاریدا هـاتووە دەفـەرموێ: سـالم لەباوکیـەوە ریوایـەت دەکـا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بینما رجل يجر ازاره، إذ خسف الله به فهو يتجلجل في الأرض إلى يوم القيامة).

لەناوچوونی قارون بەو شێوە سەرنج راکێشە، سزای تەکەببورو فیـزو دەعیـەی بـوو ﴿فَمَا كَانَ لَهُ مِنْ فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنْ الْمُنتَصِرِينَ﴾ کـەس نـەبوو کۆمەگی پێ بکا نەماڵو نەحاشیەو دارو دەستەی کەسیان فریای نەکەوتن، هیـچیان نـەیانتوانی غـەزەبو قـاری خـودای لـێ دوربخەنـەوە. بۆخـۆی دەسەوەسـان بـوو، نەیتوانی یارمەتی خۆی بداو خۆی رزگار بکا بێ یارمەتیدەر بـەزەلیلیو زەبـوونی بەناخی زەویدا رۆیشتە خوارێ، لەگەڵ خۆیدا فیتنەییو طوغیانەکەشی سووڕگوم بوو. ئیتر ئەم دیمەنە خەڵکە هەڵخەڵەتاوو ئاواتەخوازەکانی لەخەوی بێداری راست کردەوە، خەڵکی پەندو عیبرەتی لێ وەرگرت.

﴿وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ﴾ ئەوانـەی دوێنـێ ئاواتیـان بـەقارون دەخواسـتو مـاڵو سامانی ئـەو کێشی کردبوون. وایان لـێ هات دەیـانگوت: ئـای ئـەوە نـابینین: کـە خـودا بەویـستی خـۆی رزقو رۆژیـی دەدا بەکەسـانێکو لەهەنـدێکی دەگرێتـەوە. هەنـدێ کـەس دەوڵەمەند دەکاو هەندێ هەژار، ماڵو ساماندان بەکەسێک نیشانەی ئەوە نیە خودا خۆشـی دەوێ بۆیـە دەوڵەمەنـدی دەکـا. بـەڵکوو خـودا بەویـستی خـۆی سـامان دەدا بەفلانو نایدا بەفیسار، بۆ خۆی حەکیمو داناو کاردروستە.

لەفـەرموودەی صـەحیحدا: کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود بەمـەرفوعی ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: ﴿ان الله قسم بينكم أخلاقكم كما قسم أرزاقكم، وان الله يعطي من يحب ومن لايحب، ولايعطي الإيمان إلا من يحب﴾ پەروەردگار ئـەخلاقو رەوشتی لـەناودا بـەش کـردون، وەکوو چۆن رزقو رۆزیـی بەسـەردا بـەش کـردون. بزانن: کە خودا ماڵو سامان دەدا بەوانەی خۆشی دەوێنو بەوانـەی خۆشـی نـاوێن، وەلـێ ئیمان نادا بەکەس جگە لەوانەی خۆشی دەوێن.

﴿لَوْلا أَنْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّـهُ لا يُفْلِـحُ الْكَـافِرُونَ﴾ ئەگـەر لـوطـفو کەرەمی خودا نەبوایە، ئەگەر چاکەو لێبـوردوویی خـودا نەبوایـە، ئێمـەیش وەکوو قـاروون بـەناخی زەویـدا رۆ دەچوین. ئـەوە خـودا رەحمـی پـێ کـردین؛ ئـەگینا ئێمـەیش بـەدەردی ئـەو دەچووین! چـونکە ئێمـەیش بەنـەفامی ئاواتـەخوازبووین مـاڵو سـامانی ئـەومان ببوویایـە. نـابینن: پـەروەردگار سـەرفرازیو سـەرکەوتن بـۆ ئەوانـە دەسـتەبەر ناکـا: کـە بـێ بـڕوانو پێغەمبـەرانی بەدرۆدەخەنـەوە، ئینکـاری پاداشو سزای رۆژی قیامەت دەکەن؟

## پەند وەرگرتن لەچیرۆکی قارون

﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾

لەوەپێش باسی ئامۆژگاریکردنی کۆمەڵێك لەزانایانی بەنوئیسرائیلی کرد: کە بەرپەرچی تاقمی دونیا پەرستو ورەنزمو نەفامەکانیان دایەوەو وتیان: ﴿ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ...﴾

دیمەنی فەوتانی قارونی رانواند، ئیتر پەردە بەسەر ئەو دیمەنەدا دادەتەوەو ئاکامو سەرەنجامی خوداپەرستانو دونیا پەرستان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الأَرْضِ وَلا فَسَاداً﴾ خانووی قیامەتو نازو نیعمەتی زۆرو هەمەجۆری: کە هەرگیز برانەوەیان نیەو بەبێ ئەرکو ماندوبوون دێنە بەردەست، دەیکەینە پاداشو بەخشش بۆ ئەوانەی لەدونیادا لوتبەرزیی نانوێننو مەیلی ناکەن، خۆیان بەسەر بەندەکاندا راناوەشێنن بەناحەق تەکەببورو ستەمکاری ئەنجام نادەن نایانەوێ بیکەن.

مافی خەڵك زەوت ناکەن، فەسادو ئاشوب بڵاو ناکەنەوە!

ئایەتەکە وادەو بەڵێنی نازو نیعمەتی بەهەشتی پەیوەست کردوە بەمەیل نەکردن بۆ لوتبەرزییو خۆبەزلزانی، نەك بەوازهێنان لەلوتبەرزیو تەکەببور، واتە: نازو نیعمەتی قیامەت بۆ ئەو کەسانەیە کە لەدڵو دەروونیاندا ئارەزۆی تەکەببورو لوتبەرزییان نیە، لەناخیاندا هیچ دیاردەیەکی خۆبەزلزانیو لەخۆڕازی بوونیان تێدا نیە.

موسلیمو ئەبو داود ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر، فقال رجل: ان الرجل يحب أن يكون ثوبه حسناً ونعله حسنة، فقال: ان الله جميل يحب الجمال، الكبر بطر الحق وغمط الناس) ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك مثقالە زەرڕەیەکی تەکەببورو خۆبەزلزانی لەدڵدا هەبێ. پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەریەکێ لەئێمە پێی خۆشە پۆشاکی جوانو خاوێن بێ، نەعلەکانی پاكو خاوێن بێ، پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی: خودا پاكو خاوێنە پاكو خاوێنی خۆش دەوێ. تەكەببورو خۆبەزلزانی بریتییە لەپێشێل كردنی حەقو پێشێل كردنی مافی خەڵك.

﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ ئاكامی باشو بەختەوەر: كە بریتییە لەبەهەشت بۆ كەسانێكە: كە خۆیان لەعەزابو قاری خودا دەپارێزن، بەدڵسۆزیی بەندایەتی خودا دەكەن، خۆیان لەسەرپێچی فەرمانی خودا دەپارێزن، توخن (محرمات) ناكەون!

﴿مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْهَا﴾ كەسێك رۆژی قیامەت بەكردەوەی چاكەوە بێتە مەیدانی حەشرو حیساب، ئەوە پاداشی باشتری دەدرێتەوە، پاداشی پەروەردگار زۆر لەچاكەی بەندە باشترەو خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی پاداشی دوچەندانەو چەند چەندانە دەكاتەوە.

﴿وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلا يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ كەسێكیش لەرۆژی قیامەتدا بێتە مەیدانی حەشرو كردەوەی خراپی هێنابێ، ئەوە پەروەردگار لەروی عەداڵەتكاری خۆیەوە بەئەندازەی تاوانەكانی سزای دەداو هیچی لێ زیاد ناكا.

## هەندێ سەرگورشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دا

﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍۢ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍۢ مُّبِينٍۢ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبُ إِلَّا رَحْمَةًۭ مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًۭا لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ

ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعۡدَ إِذۡ أُنزِلَتۡ إِلَيۡكَۖ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾

لەوەپێش بڕێ چیرۆکی گێڕانەوە، ئاکام و سەرەنجامی ڕەتکردنەوە، ئێستا خیطاب ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ دەکا، ئەم خیطاب ئاڕاستەکردنە لەکاتێکدایە: کە پێغەمبەر ﷺ لەمەککە دەرکراوەو بەرەو مەدینە ڕەوی کردوەو هێشتا نەگەیشتۆتە ئەوێ. وەکوو لەریوایات هاتووە، هێشتا پێغەمبەر ﷺ لە(الجحفة) بوو: کە شوێنێکە لەنزیك مەککەو لەخەتەری قورەیشییەکان دەرنەچوو بوو، ترسی ئەوەی هەبوو دەستیان بیگاتێو زیانی پێ بگەیەنن، ئەم خیطابەی لەکاتێکدا ئاڕاستە کرا: کە پێغەمبەر ﷺ دڵی بەزێدی خۆیەوە بوو، ئەگەر لەپێناو بانگەوازیی ئیسلامدا نەبوایە، پێی ناخۆش بوو مەککە جێ بێڵێ: کە شوێنی لەدایکبون و پەروەردەبوونیەتی، گەلێك بیرەوەری منداڵی و سەردەمی گەنجی تێدا لەبەرچاوە، ئالەو کاتە ناسك و حەسساسەدا پەروەردگار خیطابی خۆی ئاڕاستەی پێغەمبەر دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ﴾ ئەی موحەممەد! پەیامی خۆت ڕابگەیەنە بەئادەمیزادو قورئانیان بۆ بخوێنەوە، دڵنیابە ئەو کەسەی کارکردن بەقورئانی لەسەر پێویست کردوی و فەرمانی پێ کردوی بەگەیاندنی بەخەڵك دەتگێڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆشەویستی خۆت دوای ئەوەی: کەوا بەناچاریی تۆ بەجێی دێڵی، لەبەر زەختی قورەیشییەکان ڕەو دەکەی، بەسەرکەوتویی و شکۆمەندییەوە دێیەوە ناوی!

ئەمە وادەو بەڵێنی پەروەردگارە دەیدا بەپێغەمبەری خۆی لەو کاتە ناسکەدا: کە موسوڵمانان کەم و بێ دەسەڵاتن، پێغەمبەر ﷺ بەناچاریی مەککەی جێ

هێشتووە، هێشتا لەسنووری مەککە دەرنەچوە، دڵی بۆی دەکورکێنێ، پەروەردگار دڵنیای دەکا: کە بەسەرکەوتوویی دەگەڕێتەوە ناوی، بەراستی ئەم ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنن، چونکە پاش ماوەیەك موسوڵمانان لەمەدینەدا بەهێز بوونو بەسوپایەکی زۆرەوە هاتن شاری مەککەیان لەکوفرو بتپەرستی رزگار کردو کانگای کوفرو شیرکی هەڵوەشاندو کابەی پیرۆزی لەبتو بتپەرستان پاك کردەوە.

جا کە پەروەردگار ئەم وادەیەی بەپێغەمبەر دا، فەرمانی پێ کرد: کە بەشێوەی سەرزەنشتو لۆمە بەموشریکەکانی مەککە بڵێ: خودا دەزانێ کێ سەرلێ شێواوەو کێ لەسەر رێبازی هیدایەتە، فەرمانی ئاراستە کردو پێی فەرموو: ﴿قُلْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەوانە بڵێ: کە دژایەتیت دەکەنو بەدرۆت دەخەنەوە، پێیان بڵێ: ﴿رَبِّي أَعْلَمُ مَنْ جَاءَ بِالْهُدَى وَمَنْ هُوَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ خودای من: کە (الله)یە زاناو بیناو شنەوایە بەهەموو شتێك، نهێنیو ئاشکرا دەزانێ،خودای من دەزانێ لەمنو لەئێوە کێمان هیدایەتدراوین، دەزانێ کێمان گومڕاو سەر لێ شێواوین، دەزانێ کێ هیدایەتی هێناوە (مەبەستی پێغەمبەر خۆیەتی ﷺ مەبەستیش بەهیدایەتەکە قورئانە.) دەزانێ کێ شیاوی چ پاداشو رێزو بەختەوەرییەکە لەقیامەتدا، دەزانێ کێ شیاوی بەرزکردنەوەو یارمەتیدانە بۆ گێڕانەوەی بۆ شاری مەککەو سەرخستنی بەسەر دوژمنانیدا.

لەوە بەولاوە بۆتان ئاشکرا دەبێ، سەرەنجامی بەختەوەریی بۆ کێیە؟ سەرفرازی دونیاو قیامەت بۆ کێ دەستەبەر دەبێ؟!

ئەمجار پەروەردگار نیعمەتی پێغەمبەرێتی وەبیر پێغەمبەر دێنێتەوە: کە پلەو پایەی پێغەمبەرێتی پێ بەخشیوەو کردویەتی بەهیدایەتدەری ئادەمیزادو رەوانەی کردوە بۆ سەریان: دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوا أَنْ يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلاَّ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ لەوەپێش بەخەیاڵتدا نەدەهاتو گومانت نەدەبرد: کە

پەیامت بۆ بنێردرێ‌و قورئانت بۆ سەر نازڵ بێ، هەواڵ‌و بەسەرهاتی رابوردوان بزانی‌و فێری یاساو رێسای ژیان ببی‌و رێبازی بەختەوەریی‌و سەفرازیی هەردو جیهان بۆ ئادەمیزاد رون بکەیەوە. وەلێ: کە خودا نیگای بۆ کردویی‌و قورئانی بۆ ناردوی‌و رەحمەت‌و فەضلی خودایە بۆ خۆت‌و بۆ ئوممەتەکەت. جا: کە ئێستا خودا بەفەضل‌و بەخششی خۆی ئەم رێزەی لێ ناوی، پلەو پایەی پێغەمبەری پێ بەخشیوی، ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجام بدە، پابەندی ئەم پێنج فەرمانانە ببە بەرێك‌و پێکی جێ بەجێیان بکە.

١- ﴿فَلا تَكُونَنَّ ظَهِيراً لِلْكَافِرِينَ﴾ بەهیچ جۆرێك یارمەتی کافرەکان مەدە، لێیان جودا ببەوەو دژیان بوەستە، یارمەتیدەری موسوڵمانان بەو کۆمەکییان پێ بکە، پەروەردگار پشتیوانتە.

٢- ﴿وَلا يَصُدُّنَّكَ عَنْ آيَاتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ﴾ سەرمنج لەکافرەکان مەدە، وریابە کارت تێ نەکەن، گوێ مەدەرە دژایەتیکردنیان بۆ تۆ، پابەندی ویست‌و حەزی ئەوان مەبە. چونکە ئەگەر نەرمییان لەگەڵدا بنوێنی‌و بەقسەیان بکەی، ناهێڵن پەیامەکەت بگەیەنی، دەبنە کۆسپ‌و لەمپەڕو لەشوێنکەوتنی پەیامی خودا دەتگێڕنەوە، تۆ ئەی پێغەمبەر بەردەوام بە لەسەر رێبازی خۆت‌و جگە لەخودا لەکەس مەترسە، بێگومان خودا یارمەتدەرتە، پشتگیری لەپەیامەکەت دەکا، ئاینەکەت بەسەر هەموو ئاینەکاندا سەردەخاو باڵادەستی دەکا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾(المائدة/٦٧).

وامەکە: موشریکەکان لەرێبازی خۆت لات بدەن، چونکە موشریك‌و بێ بڕوایان هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن بانگخوازی رێبازی خودا لابدەن، بەهەموو جۆرێك کۆسپ‌و تەگەرەیان بۆ دروست دەکەن. رێبازی خوداپەرستان راست‌و رەوانە،

پێویستە ڕێبازی خۆیان بگرنەبەرو گوێ نەدەنە ماندوبونو هەبوونی کۆسپو تەگەرە، ئەوان قورئان بەرنامەیانەو ڕەهنومای ڕێبازیانە!!

٣- ﴿وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بانگەوازیی بکە بۆ عیبادەتی خودای خۆت. بەبێ ترسو ڕاڕایی ئایینەکەی بلاو بکەرەوە، بەئاشکرا بانگەوازیی خۆت رابگەیەنە. بانگەوازیی کافرو موشریکەکان بکە بۆ ئایینی خودا، بانگەوازیی بکە بۆ لای خودا، نەك بۆ ڕەگەزپەرستیو دەمارگیریو زێدو نیشتمانو ئالاو بەرژەوەندی مادییو دەستکەوت. جا کەسێك پێی خۆشە دڵسۆزانە شوێن بانگەوازیی خودا بکەوێ با شوێنی بکەوێ کەسێکیش بیەوێ وێڕای ڕێبازی خودا ڕێبازی تریش ڕەچاو بکا ئەوە بابزانێ بەهەڵە چووە ڕێبازی خودای نەگرتۆتەبەر.

٤- ﴿وَلا تَكُونَنَّ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ نەکەی لەگەڵ ئەوانە بی: کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، نەچیە پێڕی موشریکەکانەوە بەفتارە دەچیو دەفەوتێی، چونکە کەسێك ڕازی بێ بەڕێبازی ئەوان لەوانەو عەزابی ئەوانی بەردەکەوێ.

٥- ﴿وَلا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لا إِلَـهَ إِلاّ هُـوَ﴾ لەتەك خودادا هیچ کەسی تر بەخودا مەزانە، جگە لەخودا عیبادەت بۆ هیچ شتێکی تر مەکە، چونکە عیبادەت هەر بۆ خودا ئەنجام دەدرێ، جگە لەخودا نزاو پاڕانەوە ئاراستەی کەسی تر مەکە، هانا هەر بۆ خودا ببەو هەر ئەو بەخودا بزانە. خودایەتی هەر شیاوی ئەوە، پەرستراو هەر ئەوە، هەر ئەو خاوەنو پەروەردگاری بوونەوەرە: وەکوو دەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً﴾(المزمل/٩).

ئەم پێنج فەرمانە هەر چەندە ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کراون، وەلێ هەموو کەس دەگرێتەوەو ئەوان مەبەستن، ئاراستە کردنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ بەمەبەستی ڕێزلێنان لەخۆیو گەیاندنی بەخەڵکە. (کورد وتەنی: بوکێ لەگەڵ تۆمەو خەسوو گوێت لێ بێ).

ئـەمجار پـەروەردگار بـەیانی صیفەتە تایبەتییـەکانی خـۆی دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاّ وَجْهَهُ﴾ هەرچی لەبوونـەوەردا هەیـە هـەمووی دەفـەوتێ جگـە لەزاتی پـەروەردگار، ئـەو هـەر بـووەو هـەر دەمێنـێ! مـەخلووقات دەمرێنـێو خـۆی نامرێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ، وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّـكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾(الرحمن/٢٦-٢٧).

﴿لَـهُ الْحُكْـمُ﴾ خاوەنیـەتیو فـەرمانڕەوایيو بڕیـاردان لەبوونـەوەردا هـەر بـۆ خودایە، هەر ئەو بڕیاری دێتە جێو هەڵوەشانەوەی نیە.

﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُـونَ﴾ سـەرەنجام گەڕانـەوەی هـەموو مـەخلووقات بـۆ لای خودایـە، هـەموویان زینـدو دەکرێنـەوەو دەچـنەوە بـەربارەگای زاتـی پـاکیو بـەگوێرەی کردەوەکانیان سزاو پاداشیان دەداتەوە. چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

**بەیارمەتی خودا سورەتی (القصص) تەواوبوو خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواوکردنی سورەتەکانی تر...**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورة ( العنكبوت )

سورەتی عەنكەبووت مەككىیە واتە: لەمەككە نازڵ بووە، هەندێ ریوایات ئەوە دەگەیەنن: كە پانزە ئایەتی سەرەتای سورەتەكە مەدەنین، چونكە باسی جیهادو باسی مونافیق دەكەن، وەلێ رای صەحیحو دروست ئەوەیە: كە سەر لەبەر سورەتەكە هەمووی مەككىیە. لەسەرەتاوە بۆ كۆتایی هەموو ئایەتەكانی پێكەوە گونجاوو یەك نەسەقیان هەیە.

ناوەرۆكی سورەتەكەش وەكوو هەموو سورەتە مەككییەكانی تر جەخت لەسەر بنەمای عەقیدە دەكەنەوە، تاكو تەنهایی خودا دەچەسپێنن، باسی پێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو حیسابو لێكۆڵینەوەو پاداشو سزا دەكەن، باسی بەهێز كردنو چەسپاندنی ئیمان لەدڵو دەروونەكاندا دەكەن، بەتایبەتی لەكاتی بەڵاو نارەحەتیدا. سەرەتا بەباسی تاقیكردنەوەی ئادەمیزاد دەست پێ دەكاو كۆتاییشی بەباسی سەرفرازیو هیدایەت وەرگرتنی تێكۆشەرانی رێبازی پەروەردگار دێو ئەوە دەچەسپێنێ: كە ئەوانەی جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆیان دەكەن باشترین رێبازی خوداپەسند دەگرنە بەرو خودا یارمەتییان دەداو سەركەوتوو دەبن!

پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی پێشەوە، لەچەند رویەكەوەیە: كە هەموویان لەچوارچێوەی كێ بركێی نێوان حەقو بەتاڵو ئاكامو كاریگەری صەبرو خۆڕاگریی لەسەر ئیمانو ئاكامی بێ ئیمانیدا خۆیان دەنوێنن. لەسورەتی (القصص)دا پەروەردگار باسی لوتبەرزیو جەبەروتی فیرعەونو تەفرەقە پێكردنی جەماوەرەكەیو چەوسانەوەی نەتەوەی ئیسرائیلی كرد: كە نێرینەكانی سەردەبڕینو مێینەكانی دەهێشتەوە، سەرەنجامیش رزگاربوونی موساو گەلەكەیو فەوتانی فیرعەونو داروودەستەكەی بوو!

لـەم سـورەتەشدا پـەروەردگار چـیرۆكی موسـوڵمانەكانی مەككـەمان بـۆ دەگێڕێتـەوە، ئەوانـەی ملـهوڕە قوڕەیـشییەكان تووشـی دەردی سـەری‌و تـەعزیب‌و تەنگ‌و چەڵەمەیان كردن، فشاری زۆریـان بـۆ هێنـان بـۆ ئـەوەی لەموسـوڵمان بـوون ژێوانیـان بكەنـەوە، تەنانـەت چەوسـانەوەی قوڕەیـشییە ملـهوڕەكان بـۆ هەنـدێ لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ چـی وای كـەمتر نـەبوو لەچەوسـانەوەی فیرعـەون بـۆ نەتـــەوەی ئیـــسرائیل. بـــەم پێكـــەوە بەســـتنەی نێـــوان چەوســـاندنەوەی بەنوئیـسرائیلی‌یـەكان لەلایـەن فیرعەونـەوەو چەوسـاندنەوەی هـاوەڵانی پێغەمبـەر لەلایەن قوڕەیشیەكانەوە، پەروەردگار موسوڵمانانی سەردەمی مـەككی هەڵـدەنێ بـۆ خۆڕاگری‌و پشوو درێژیی، تەسەللا هاتنـەومیان بـەو نارەحـەتی‌یـەی شـوێنكەوتوانی موســـا چەشـــتوویانە. هـــەروا باســـی رزگـــابوونی حـــەزرەتی نـــوح‌و هـــاوەڵانی لەكەشتی‌یەكەداو خنكاندنی نەتەوە ستەمكارەكەی: كە بەدرۆیان خستەوەو بڕوایان پێ نەكرد.

هەروەها لەنێوان ئەم سورەتەو سورەتی پێشوودا دەربـارەی كۆچـی پێغەمبـەرو موسـوڵمانان لێكـچوونێكی بەرچـاو هەیـە. ئـەوەتا لـەكۆتایی سـورەتی (القـصص)دا ئاماژە بۆ كۆچی پێغەمبەر ﷺ كراوەو دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الَّـذِي فَـرَضَ عَلَيْـكَ الْقُـرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ﴾ لـەكۆتایی ئـەم سـورەتەشدا ئامـاژە بـۆ كۆچـی موسـوڵمانان كـراوە دەفەرموێ: ﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ﴾(العنكبوت/٥٦)

هەروەها لەنێوان هەردوو سـورەتەكاندا پەیوەندییـەكی ئاشـكرا هەیـە لـەبارەی ئاكام‌و مەبەستەوە لەسورەتی (القصص)دا ئاماژە كراوە بەسەرەنجامی باش‌و پەسند بـۆ خـودا پەرسـت‌و خـاوەن رەوشـتە بـەرزو جوانـەكان ئەوانـەی لوتبـەرزی ناكەن‌و ئاشوبگێڕ نین وەكوو فـەرمووی: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِـي الْأَرْضِ وَلَا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾(القصص:٨٣)

لــەم ســورەتەشدا ســەرەنجامی بــاش و بەختــەوەریی بــۆ موســوڵمانە کردارپەسـندەکان دەچەسـپێنێ و دەفـەرموێ: ﴿وَالَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ لَنُبَـوِّئَنَّهُم مِّـنَ الْجَنَّـةِ غُرَفـاً تَجْـرِي مِـن تَحْتِهَـا الأَنْهَـارُ خَالِـدِينَ فِيهَـا نِعْـمَ أَجْـرُ الْعَامِلِينَ﴾(العنكبوت:٥٨).

**ئەم سورەتە پیرۆزە بەشێوەی گشتی ئەم سەرە باسانەی لەخۆ گرتوون:**

١- بەتاقیکردنەوەی موسوڵمانان بۆ ئەوەی راستی بیرو باوەڕیان دەربکەوێ.

٢- جیهادو تێکۆشان سودی بۆ تێکۆشەرەکە هەیە، ئەگینا خودا چ پێویستییەکی بەو تێکۆشانە نیە.

٣- چاکە خراپە دەشواتەوە.

٤- فەرمان بەئادەمیزاد: کە چاکەکار بێ لەگەڵ باوك و دایکی.

٥- دووڕوو ناتوانێ لەپێناو ئایینی خودادا تەحەمولی ئەزیەت بکا.

٦- چیرۆك و بەسەرهاتی هەندێ لەپێغەمبەران.

٧- دەمکوتکردنی موشریکەکان.

٨- بۆڕدانی خاوەن نامەکان و نەهی کردن لەجیدال لەگەڵ کردنیـان بەشـێوەی توندوتیژ.

٩- ســەلماندنی پێغەمبەرایــەتی حــەزرەتی موحەممــەد ﷺ بــەهۆی راســتی موعجیزەکەیەوە.

١٠- باسـی هەنـدێ شـوبهەو گومـانی موشـریکەکان دەربـارەی پێغەمبەرایـەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ.

١١- پەلە کردنی کافرەکان لەهاتنی عەزاب بۆیان.

١٢- فـەرمانکردن بەموسـوڵمانان کـە لەهـەر شـوێنێك نـەیانتوانی کـاری ئـاینی خۆیان بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن بافیرار بەئاینەکەیانەوە بکەن و بچنە شوێنێکی تــــر: کـــە بتـــوانن کاروبـــاری ئـــایینی خۆیـــان ئـــەنجام بـــدەن.

١٣- سەرئەنجامو سەرفرازیی بۆ ئەوانەیە، وێڕای هەبوونی بیروباوەڕی راستیان کردەوەی باشیش ئەنجام دەدەن.

١٤- موشریکەکان دان بەوەدا دەنێن؛ کە بەدیهێنەری بوونەوەرو رزقو رۆژیدەر خودای مەزنە.

١٥- منەتکردنی پەروەردگار بەسەر دانیشتوانی مەککەدا بەوە کە لەحەرەمدا جێنشینی کردونو ئەمنو ئاسایشی بۆ فەراهەم هێناون. کەچی ئەوان کوفرانی نیعمەتی خودا دەکەنو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، پێغەمبەری خودا بەدرۆ دەخەنەوە.

١٦- بەیانکردنی پاداشی ئەوانەی خۆڕاگرو پشوو درێژن لەبەرامبەر تەنگو چەڵەمەدا.

## بەتاقیکردنەوەی ئادەمیزادو پاداشەکەیان

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٧﴾

ریوایەت کراوە دەڵێن: ئەم ئایەتانە دەربارەی کۆمەڵێك لەهاوەڵان نازڵ بوون: کە لەبەردەم ئەزیەتدانو فشار بۆ هێنانی کافرەکان جەزەعو فەزەعیان بووەو وەکوو پێویست خۆڕاگر نەبوون!

ریوایەتێك هەیە دەڵێ: دەربارەی عەمماری کوڕی یاسر نازڵ بووە: کە لەپێناو ئایینی خودادا زۆر ئەزیەتی دراوە.

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیر لە(الشعبي)یەوە ریوایەت دەکەن: کە دەربارەی ئایەتی ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ... الآية﴾ وتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك کە لەمەککە بوونو موسوڵمان بوون، ئەو کاتە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەمەدینە بوون، جا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەوە هەواڵیان بۆ ناردن: کە ئیمانهێنانتان لێ وەرناگیرێ هەتا کۆچ نەکەن بۆ مەدینە، ئەوانیش بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ موشریکەکان شوێنیان کەوتنو گێڕایاننەوە، ئیتر ئەم ئایەتە دەربارەیان نازڵ بوو، دووبارە هاوەڵان لەمەدینەوە خەبەریان بۆ ناردن: کە دەربارەتان ئایەت نازڵ بووەو (واو وا دەفەرموێ) ئەمجار ئەوانیش بڕیاریان دا کۆچ بکەن، ئەگەر کافرەکان شوێنیان کەوتن شەڕیان لەگەڵ بکەن، لەسەر بڕیاری خۆیان لەمەککە دەرچوون بەرەو مەدینە، قورەیشییەکان پێیان زانیو شوێنیان کەوتن، ئەوانیش بەگژیاندا چوونەوەو شەڕیان لەگەڵ کردن، هەیانبوو شەهید بوو، هەیانبوو رزگاری بوو. ئیتر پەروەردگار دەربارەیان ئایەتی ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِن بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾(النحل/١١٠) نازڵ کرد!!

هەر ئیبنو ئەبی حاتەم ریوایەتی کردوە دەڵێ: ئایەتی ﴿الٓمٓ: أَحَسِبَ النَّاسُ... الآيةَ﴾ دەربارەی کەسانێکی مەککەیی نازڵ بووە: کە لەمەککە دەرچوون‌و ویستیان بۆ مەدینە کۆچ بکەن، موشریکەکان رێیان پێ گرتن‌و گەڕانەوە، هاوەڵانیان لەمەدینەوە بۆیان نوسین کە دەربارەتان ئایەت نازڵ بووەو (واو وا دەڵێ) ئەمجار کۆچیان کردو لەرێگا لەگەڵ قورەیشییەکان تووشی شەڕ بوون، ئەوی کوژرا کوژرا، ئەوی رزگاری بوو، رزگاری بوو، ئیتر دەربارەیان ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ نازڵ بوو.

موقاتیل دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە دەربارەی (میهجەع): کە بەندەی ئیمامی عومەر بووە نازڵ بووە، ئەم زاتە یەکەم کەس بوو لەشەڕی بەدردا شەهید کرا، عامیری کوڕی (الحضرمي) تیرێکی پێوەناو شەهیدی کرد، ئەو رۆژە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سيد الشهداء مهجع، وهو أول من يدعى إلى باب الجنة من هذه الأمة) باوك‌و دایکی زۆریان پەرۆش بوو جەزەع‌و فەزەعیان زۆر بۆ کرد ئیتر ئایەتی ﴿الٓمٓ، أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا... الآيةَ﴾ نازڵ بوو.

بەهەر حاڵ ئەسبابی نزولەکە هەر کامێکیان بێ (عیبرەت بەعوموومی لەفظەو بەخصوصی سەبەب نیە.) ئایەتەکان حەقیقەت‌و راستی ئیمانیان لەخۆ گرتووە، شێوەی بەتاقیکردنەوەی پەروەردگارو داب نەرێتی دەربارەی خاوەن باوەڕان رون دەکەنەوە. سەرەنجامی موسوڵمان‌و کافرودوڕووەکان دیاری دەکەن‌و دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ﴾ لەخوێندنەوەدا دەبێ ئەم جۆرە وشانەی لەسەرەتای سورەتەکانی قورئاندان بەپچڕپچڕی بخوێندرێنەوە (ألف، لام، ميم) وەکوو لەسەرتای سورەتی (البقرة)دا ئاماژەمان پێ کرد، چەند مانایەکیان بۆ دیاری کراوە، بەڵام ئەو مانایەی لای موفەسسیرەکان پەسەندەو زیاتر بەدڵا دەچێ ئەوەیە: کە پەروەردگار بەم پیتە پچڕ پچڕانە تەحەددای عەرەب‌و ناعەرەبی کردووەو ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە: کە قورئان لەم جۆرە پیتانە پێك هاتووە، ئەم جۆرە پیتانەش لەبەر دەستی هەموو

کەس دان، دە ئەگەر راست دەکەن ئەم قورئانە کەلامی ئادەمیزادە، ئێوەش لەو پیتانە کەلامێکی ئاوەها بخەنە ڕو، (ئەوە عەرزو ئەوە گەز).

وەڵێ نەئەوان‌و نەغەیری ئەوان لەعەرەب‌و لەناعەرەب، کەس ناتوانێ کەلامێکی ئاوەها دابنێ، چونکە ئەوە شاکاری پەروەردگارەو زادەی مێشکی ئادەمیزاد نیە.

تێبینی‌یەکی تریش هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ‌و بگوترێ: ئەویش ئەوەیە: هەر سورەتێکی قورئان بەم جۆرە پیتە پچڕ پچڕانە دەستی پێ کرابێ، باس‌و خواسێکی قورئانی لەخۆگرتووە، جا یا یەکسەر دوا بەدوای پیتەکان دەست دەکا بەباسی قورئان، یان لەناوەندی سورەتەکەدا، وەکوو لەم سورەتەدا بەرچاو دەکەوێ: کە دەفەرموێ: ﴿اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ...﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ...﴾ یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ﴾ یان ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ﴾ ئەمجار دوای دەست پێکردن‌و چوونە ناو جیهانی سورەتەکەوە، دەست دەکا بەباسی بیرو باوەڕو ئەو تاقیکردنەوەو ئەزموونانەی موسوڵمانانی پێدا تێپەڕ دەکەن‌و روبەرویان دەبنەوە، بۆ چەسپاندنی بیرو باوەڕو جودا کردنەوەو دەست نیشانکردنی راستگۆیان‌و دووڕووان بەهۆی ئەو تاقیکردنەوەو لەبۆتە دانەی بەسەریان دێ: دەفەرموێ: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لا يُفْتَنُونَ﴾ ئایا ئەو خەڵکە پێیان وایە، وازیان لێ دەهێندرێ‌و تووشی تاقیکردنەوەو لەبۆتەدان نابن؟ هەر بەوەندە کە بەزوبان دەڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوەو بڕوامان هەیە ئیتر وازیان لێ دەهێندرێ‌و ئەرکی جیهادو تێکۆشان‌و کۆچکردن‌و بەربەرەکانی شەهەوات‌و ئارەزویان ناخرێتە سەر شان؟ پێیان وایە ئەرکی ئەنجامدانی طاعەت‌و خواپەرستی‌و فەرائیضە ماڵی‌و بەدەنییەکانیان ناخرێتە سەر شان؟ تووشی کارەساتی ماڵی‌و جەستەیی‌و لەدەستدانی خۆشەویست‌و ماڵ‌و سامان‌و کەمبوونەوەیان نابن؟

بێگومان بیرو باوەڕ هەر ئەوە نیە کابرا بەڕواڵەت بڵێ من موسوڵمانم‌و بەس! بەڵکوو بیرو باوەڕ حەقیقەتێکە ئەرك‌و نارەحەتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمانەتێکە هەر کەسێ لەئەستۆی گرت ئەرك‌و ماندوبوونی خۆی هەیە، جیهادو تێکۆشانێکە پێویستی بەصەبرو خۆراگریی هەیە، هەر ئەوەندە کیفایەت نیە بەدەم بڵێن: ئیمانمان هێناوەو بەعەمەلی‌و لەمەیدانی واقیعدا نەیچەسپێنن: کە راست دەکەن لەئیمانەکەیاندا یان نا!!. دەبێ لەکەوو بێژنگ بدرێن‌و بکەونە ناو تاقیکردنەوەو لەبۆتەدان دەربچن، وەکوو چۆن ئاڵتون دەخرێتە سەر ئاگرو لەبۆتە دەدرێ؛ بۆ ئەوەی لەچڵك‌و مەوادە مەغشووشەکان جیا بکرێتەوە. ئادەمیزادە موسوڵمانەکانیش تووشی دەردو مەینەتی دەبن، بۆ ئەوەی دەربکەوێ کێ موسوڵمانی ساغ‌و خاوەن باوەڕی پتەوەو کێ مونافیق‌و ساختەچییە.

سەرەتا ئایەتەکە بەهەمزەی ئیستفهام دەست پێ دەکا، ئیستیفهامەکەش بۆ ئینکارە. ئەوە دەگەیەنێ: کە دەبێ موسوڵمانان تووشی دەردو چەرمەسەریی ببن‌و کارەساتی ناخۆش‌و دڵتەزێنیان لێ روبداو دەربکەوێ بۆ خۆیان‌و غەیری خۆیان تا چ ئاستێك پابەندی بیرو باوەڕەکەیانن! چونکە بەڵاو موصیبەت پێوەری بیرو باوەڕن.

لەفەرمودەی صەحیحدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أشد الناس بلاء الأنبياء، ثم الصالحون، ثم الأمثل فالأمثل، يبتلى الرجل على حسب دينه، فان كان في دينه صلابة، زيدله في البلاء) قورسترین بەڵاو ناخۆشی تووشی پێغەمبەران دەبێ، پاشان پیاوچاکان، ئەمجار پلە پلە هەتا بیرو باوەڕی لاواز تر بێ، بەڵای سوکتری تووش دەبێ، ئادەمیزاد بەگوێرەی بەهێزی‌و بێ هێزی ئیمانی بەڵای بەسەر دێن. هەتا بیرو باوەڕی پتەو تر بێ، بەڵای قورستری تووش دەبن!!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللّهُ الَّذِينَ جَاهَدُواْ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ﴾(آل‌عمران/۱٤۲) یان دەفەرموێ:

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ﴾(البقرة/٢١٤).

لەوەپێش لەباسی ئەسبابی نزولی ئایەتەکاندا ئاماژەمان بەوە کرد: کە ئەم ئایەتە دەربارەی هەندێ کەس نازڵ بووە: کە تازە لەمەککەدا موسوڵمان بوبوون و قورەیشییەکان لەسەر بیرو باوەڕی ئیسلامی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەیان دەدان عەمماری کوڕی یاسرو دایکی عەممار کە ناوی (سمیة) بوو. باوکی عەممار: کە ناوی (یاسر) بوو هەروەها عەیاشی کوڕی ئەبی رەبیعە وەلیدی کوڕی وەلیدو سەلەمەی کوڕی هیشام نموونەی هەرمزەق و بەرچاوی ئەم ئازار دراوانە بوون.

بێگومان خودا پێش بەتاقیکردنەوەکە حەقیقەتی دڵ و دەروونەکان دەزانێ و ئاگای لێیەتی: وەلێ تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانەکە بۆ ئەوەیە: ئەوەی لەزانیاری خودادا هەیە، لەعالەمی واقیع و مەکشووفدا دەربکەوێ: ئەوەی لەزاینیاریی ئادەمیزاد نهێنییە بکەوێتە ڕو، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان لەسەر هەڵوێست و کردەوەکانیان حیساب و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێ، نەك لەسەر ئەوەی: کە خودا دەربارەیان پێش وەخت ئاگای لێیەتی. ئەمەش لەلایەکەوە فەضل و گەورەیی خودایە بەسەر بەندەکانەوە، لەلایەکی ترەوە عەداڵەتکارییەو لەسەرێکیشەوە پەروەردە کردنی ئادەمیزادەکانە. کەس سزای نادرێتەوەو پاداش وەرناگرێ مەگەر بەوەی لەکارو هەڵوێستی ئاشکرا بووەو بەکردەوە چەسپاندویەتی. ئەگینا هیچ کەس وەکوو خودا حەقیقەتی دڵ و دەروونەکان نازانێ.

وا دیارە دووچاربوونی ئادەمیزاد بەبەڵاو کارەساتەوە دیاردەیەکی هەمیشەیی و بەردەوامە لەناو ئوممەتی پێغەمبەردا. هەتا ئیسلام لەوجوددا هەبێ و حەق و بەتاڵ لەصیراع و کێ بڕکێدا بن، ئەزیەتدان و چەوساندنەوەی موسوڵمانان بەردەوامە. هەتا بیرو باوەڕی راستەقینەی ئیسلامی روبەروی رەشەبای ئیلحاد کوفرو عەلمانی و گروپە چەپ رەوو شوشیال و مادەپەرست و ملهوڕپەرستەکان بوەستێ و

بەربەرەكانییان بكا، هەتا قورئانی پیرۆز پێناسەی موسوڵمانان بێ‌و پارێزگاری هەبوونیان بكاو لەباوەشی بگرن‌و بیخوێنن‌و بیانهەژێنێ، ئەزیەتدانی خوداپەرستان لەلایەن كۆمەڵانی كوفرو ئیلحادەوە بەردەوام دەبێ. بەڵام لەهەمان كاتدا هەرگیزاو هەرگیز كۆمەڵی كوفر ناتوانن دەنگی ئیسلام كپ بكەنەوە، چەندێك ئەسالیبی چەوساندنەوەیان بەهێزو كاریگەرو چڕو پڕ بێ، موسوڵمانان لەسەر هەڵوێستی خۆیان سوورتر دەبن‌و لەگرتووخانەو زەبرو زەنگی دوژمنانیان پتەوتر دەبن، چونكە داینەمۆی بیرو باوەڕیان قورئانی پیرۆزە، پەیڕەوو پڕۆگرامیان كەلامی خودایە، رابەریان پێغەمبەرە ﷺ بەكردەوە رێگای بۆ شكاندون.

هەر لەو رۆژەوە حەق‌و بەتاڵ كێ بركێیانەو رو بەڕووی یەكدی بوونەوە لەبۆتەدان‌و ئەزیەتدانی موسوڵمانان لەگۆڕێیەو هەر بەردەوامیش دەبێ. بۆیە پەروەردگار بۆتەسەللا دانەوەی موسوڵمانان‌و بەرچاو رونییان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ واتە: سوێند بێ ئێمە خوداپەرستانی رابوردومان بەجۆرەها ئازارو ئەشكەنجە بەتاقی كردونەوە، بەڵكوو پێغەمبەرانی پێشوومان بەجۆرەها تاڵی‌و سوێری لەبۆتە داون‌و خستومانەنە ناو تاقیكردنەوەی سەخت‌و دژوارەوە، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا اسْتَكَانُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾(آل‌عمران/١٤٦).

هەڵبەتە وەكوو وتمان خودا پێش بەتاقیكردنەوەكە حەقیقەتی ناو دڵ‌و دەرونەكان دەزانێ، وەلێ بەتاقیكردنەوەكە ئەوەی لەزانیاری خودادا ئاشكراو نمایانە، لەجیهانی واقیعیش‌دا ئاشكراو نمایانی دەكا. كەوابێ ﴿فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا﴾ پەروەردگار ئەوانەی راستگۆن لەئیدیعای ئیمانداریان‌دا دەیانخاتە رو ئاشكرایان دەكا. ﴿وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾ هەروەها درۆزنەكانیش جیادەكاتەوەو

پەردەیان لەسەر هەڵدەماڵێو ئاشکرای دەکا کێ راستگۆیە لەدعوای ئیمانداری‌داو کێ درۆزنە. هەر کەسەش بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەردەگرێتەوە.

ئەهلی سوننەتو (جەماعە) کۆڕایان لەسەر ئەوە هەیە: کە خودای مەزن پێش وەخت زانیاریی تەواوی هەیە دەربارەی هەموو ئەو شتانەی بونو دەبنو نابنو چۆن دەبنو کەی دەبن. بۆیە ئیبنو عەبباس لەتەفسیری (الا لنعلم)ی قورئاندا دەفەرموێ: ﴿الا لنري﴾ چونکە بینینو نیشاندان پەیوەند دەبێ بەشتی هەبووەوە هەر شتێك نەبێ (رؤیەت) تەعەلوقی پێوە نابەستێ، بەڵام عیلم لە(رؤیەت) گشتی ترە چونکە ئەو تەعەللوق دەبەستێ بەهەبوو نەبووەوە.

بێگومان لەبۆتەدانو بەتاقیکردنەوە زۆر شێوازو جۆری هەن، جاری وا دەبێ موسوڵمان راستەوخۆ لەلایەن بەتاڵخوازانەوە ئەزیەت دەدرێو کەسیش نیە پاڵپشتی بکاو هێزێکی دەست ناکەوێ روبەڕوی طوغیان ببێتەوە. ئەمە وێنەیەکی هەرەبەرچاوی فیتنەو لەبۆتەدانە. وەلێ ئەمە دیمەنی هەرە سامناکی فیتنەیی نیە. بەڵکوو بەتاقیکردنەوە زۆرو هەمەجۆرن.

فیتنەیی ماڵو منداڵو کەسو کارو خێزانو دۆستو ناسیاو.

فیتنەیی رۆتێکردنو دەستەبەر بوونی دونیا بۆ بەتاڵخوازانو بەرواڵەت سەرکەوتنیان لەژیاندا. دونیا بۆیان پێدەکەنێو جەماوەر چەپڵە رێزایینان بۆ دەکەن. قارەمانیەتیو شکۆمەندیان پاڵ دەدەن، سەروەریو بەهرەمەندیان بۆ دەست نیشان دەکەن. دەیانبەنەوە سەر رشتەو نژادی بنەماڵەی دیارو وەجاخزادە. لەهەمان کاتدا کاکی موسوڵمان هەرچەندە خۆی زۆر لەو دونیا خۆرە دونیا بۆ هاتووە بەشیاوتر دەزانێ، پاشگوێ خراوە.

فیتنەی نامۆییو دووروویی لەکۆمەڵگا بەهۆی عەقیدەو هەڵوێستی ئایین پەروەرییەوە. فیتنەیەکی تر: کە ئەمڕۆ باوو لەڕووە ئەویش فیتنەیی ئەوەیە: موسوڵمان دەبینێ چەندان حکومەتو فەرمانڕەوا تا بینەقاقایان لەگومڕاییو رەوشتی ناشیرینو پەستدا نقوم بوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین

کۆمەڵگایـەکیان پێکـەوەناوە لـەبواری ژیـارو شارەسـتانیدا تابڵـێی پێـشکەوتوو سـەرکەوتوون. تـاکی ئـەو کۆمەڵگایـە ئەوپـەڕی ژیـانی خۆشـی بـۆ دروسـت بـووەو بەوپەڕی هەستی مرۆڤ دۆستیەوە مامەڵەی ڕۆژانەی لەگەڵدا دەکرێ!!

فیتنەی گەورەو دژوارتر لەوانە فیتنـەی نـەفسو شـەهوەتە، خۆویـستیو حـەز لـەماڵو سـامانو هێـزی دەسـەڵاتو فرمـانڕەواییـە، هـەر کەسـێ بـەمانا بەتاقیکرایەوەو دەرنەچوو هاوار بەماڵی.

هەڵبەتە پەروەردگار هەرگیز نایـەوێ موسوڵمانان بەتاقیکردنـەوەو لەبۆتـەدان ئەزیـەت بـدا، مەبەسـتی ئـەوە نیـەو حاشـا! وەڵێ پـەروەردەکردنیان بـۆ هـەڵگرتنی ئەمانـەتو بەرپرسیاری پێویـستی بـەو لەبۆتەدانـە هەیـە. بـەبێ ئـەو تەربییەتـە تایبەتییـەو هـەڵسو کـەوت کـردن لەگـەڵ ناڕەحەتیـەکاندا دەسـتەبەر نابـێ. دەبـێ موسوڵمان بەشێوەیەکی عەمەلیو واقیعی وای لـێ بـێ بتوانـێ جڵەوی نەفسو ئارەزۆ بگرێتەوە، بەسەر شەهوەتو ئارەزۆبازییدا باڵادەست بێ لەبەرامبـەر ئـێشو ئـازارو مەینەتیدا خۆگربێ، بتمانەی تـەواوی بەیارمـەتیو کۆمـەکی پـەروەردگاری هـەبێ، یەقینی وا بێ پاداشو ئەوابـی لەسـەر ئـەو کارەسـاتو ناخۆشیانە دەسـت دەکـەوێ. ئـەو نـەفسو دڵو دەروونانـەی بـەڵاو کارەسـات لەبۆتـەیان دەدەنو غـەمو پـەژارە مـشتو ماڵیـان دەکـەن لەچـڵکو تـەپو تـۆزی مـادەو ڕەوشـتە پەسـتەکان پاکیـان دەکەنەوە، حەتمەن هێزە مەعنەوییە شاراوەکانیان وەخەبـەر دێـنو دەکەونـە خـۆ. پەیوەندییان بەخوداوە بەهێز دەبێو بتمانەیان بەوەدەبێ: کە یەکێ لەدوسەرەوەری (سەرکەوتن یان پاداش) یان بـۆ دەسـتەبەر دەبـێ. ئـا ئەوانـەن: کـە لـەئاکامدا ئـاڵای خودا پەرستیو ئاوەدانکردنەوەی زەویو ڕابەری مرۆڤایەتی دەگرنەدەسـتو دەبنـە باشـترین گـەلو نەتـەوەو فـەرمان بەچاکەو نـەهی لەخراپـە دەکـەن، چاکە خـوازو خێرخوازو مرۆڤ دۆستو خوداویست دەبن، بەختەوەریی دونیاو قیامـەت مـسۆگەر دەکەن.

ئەوانـەی موسـوڵمانانیش تووشـی ئەزیـەتو دەردی سـەری دەکـەن، خراپـەکارو سـتەمکارو بـێ بـڕواو مەبـدەئن ئەوانـە هـەرگیز لەچـنگی غـەزەبو قـاری خـودا رزگاریان نابێ، چەنـدێك باطلیان بەڕواڵەت باڵابێو سەرکەوتن بەدەست بێنن، دەبێ لەناکامدا بکەونە بەرقارو غەزەبی خودای خاوەن دەسەڵاتو تۆڵەستێن.

نموونەی تـەعـذیبدانی موسـوڵمانان بەدەسـتی بێـدینان پـێش هـاتنی ئیـسلامو دوای نــاردنی حــەزرەتی موحەممــەدو ئێــستاشی لەگــەڵدا بــێ، چەوســانەوەی خوداپەرستان لەسەر دەستی ملهوڕو ستەمکاران لەکۆنو نوێدا دەریایەکی بێ بنـەو لەنووسین نایە. کارێکی ئەستەمەو دەبێ (عـەددادی) زانیـاریی خـودا کـۆنتڕۆڵی بکـاو یەکالای بکاتەوە.

ئیمامی بوخاریو ئەبوداودو نەسائی لەخـەبابی کـوڕی ئەڕەتـەوە فەرمودەیـەك ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: شکایەتی وەزعو حـاڵی خۆمـان لای پێغەمبـەر ﷺ کـرد، لەو کاتە پێغەمبەر ﷺ لەسێبەری کابەدا عەباکەی خۆی کردبوە سەرینو راکشابوو: عەرزمان کرد بۆچی داوای یامەتیمان بۆ ناکەی؟ بۆ بۆمان ناپاڕێیـەوە لـەخودا ئـەم ناڕەحەتیەمان لەسەر لابا؟ لەوەڵامدا فەرمووی: (قـد كـان مـن قـبلكم يؤخـذ الرجـل فيحفر له في الأرض فيجعل فيها، فيجاء بالمنشار فيوضع على رأسـه فيجعـل نـصفين، ويمشط بأمشاط الحديد لحمه وعظمه فما يـصرفه ذلـك عـن دينـه، والله ليـتمن هـذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء إلى حضر موت لايخاف الا الله والذئب علـى غنمـه، ولكنكم تستعجلون).

ئیبنو ماجە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکا دەڵـێ: چـومە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ ناسـاغ بـوو لەسـەر لێفەکـەی بەسـەریەوە بـوو دەسـتم لـێ دا دەسـتم گەرمایی پێ گەیشت عـەرزم کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! دەردو تایەکـت چـەند بەتەوژمە لەسەرت!! فـەرمووی: ئێمـە وەهـاین بـەڵاو نەخۆشـیمان بـۆ دووچـەندانە دەکرێتـەوە، پاداشیـشمان بـۆ دوو چـەندانەیە! وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! کـێ لەئادەمیزادان لەهەموو کەس زیاتر بەڵای لەسەر توندو بەشیدەت دەبن؟ فـەرموی:

پێغەمبەران، وتم، پاش ئەوان؟ فەرموی: پاشان پیاوچاکان، هی وایان هەیە تووشی بەڵای هەژاریی دەبێ، تەنانەت جگە لەعەباکەی هیچی دەست ناکەوێ بیبڕێو بیدرێ بۆ پێویستی خۆی. هی وایان هەیە کەیف خۆش دەبێ بەبەڵا وەکوو چۆن بەخۆشی کەیف خۆش دەبێ.

بەکورتی ژیان گۆڕەپانی تێکۆشانو هەوڵدانو ماندوبونو جمو جوڵە. هەتا ئەرکو بەرپرسیاریەتی زۆرو گەورە بن لەرێزو نرخی بەرپرسیارەکە زیاد دەبێ، کەوابێ تەکلیفو بەرپرسیاریەتی نیشانەی رێزلێنانو قەدرزانییە، رەمزی کەسایەتیو چەسپاندنی مرۆڤایەتییە، کەسێك هیچ ئەرکی لەئەستۆ نەبنو تەکلیفی لەسەر نەبن بەمرۆڤ حلێب ناکرێ. ژیان بەبێ کارو کردەوەو تەکلیف بەژیان ناژمێردرێ. خۆشیو لەززەتی ژیان لەوەدایە ئادەمیزاد بۆ مەبەستێك کار بکاو هەدەفێکی هەبێ، ئەگینا دەکەوێتە ناو ژیانی بێ مەبەستو سەرگەردانیەوە. کەوابوو پێویستە سوپاسی خودا بکەین لەسەر ئەوەی: کە ئەرکی جۆراوجۆری خستۆتە ئەستۆمان. هەروەها پێویستە خاوەن صەبرو سوپاسگوزار بین لەسەر بەڵاو کارەسات!

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَنْ يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ بەڵکوو ئایا ئەوانەی تاوان ئەنجام دەدەن پێیان وایە ئەوان لەچنگی قاری ئێمە قوتار دەبنو تۆڵەی ستەمکاریو تاوانبارییان لێ ناستێنین؟ نا با وا نەزانن: ئەوان لەچنگی عەزابو سزای ئێمە رزگاریان نابێ، بەهەڵەچوون خراپ گومانێکە بۆیان پەیدا بووە، بڕیارێکی نابەجێو هەڵەیان داوە: کە وا دەزانن لەخودا یاخی دەبنو سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەنو تۆڵەشیان لێ ناسەندرێ! ئەو بڕیارو بیرو بۆچوونەیان پێچەوانەی عەقڵو شەرعو دادە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەستی ئایەتەکە (الوليد)ی کوڕی (المغيرة)و ئەبو جەهلو (الأسود)و (العاص)ی کوڕی هیشامو شەیبەو عوتبەو وەلیدی کوڕی عوتبەو

عوقبەی کوڕی ئەبو موعیطو حەنظەلەی کوڕی ئەبو سەفیانو (العاص)ی کوڕی (وائیل)ە.[1]

ئەمجار دوای ڕاگەیاندنی ئەوە: کە هەر کەسێك ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ نەهێنێ سزا دەدرێ. ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە هەر کەسێك خاوەن بیرو باوەڕی ڕاستو پەسندبێو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بداو کار بۆ ژیانی قیامەت بکا. خودا پاداشی باشی دەداتەوە؛ دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ هەر کەسێ بەتەما خێرو فەڕو پاداش بێ لەخودا، چاوەڕوانی بەهەشت بێ لەژیانی قیامەتدا، وێڕای ئەوە کردەوەی چاك بکاو ئەرکی سەرشانی بەڕێكو پێکی ئەنجام بدا، ئەوە بێگومان خودا ئاواتەکەی بۆ دێنێتە جێو پاداشی کردەوەکانی بەتەواوی دەداتەوە، چونکە هاتنی قیامەتو زیندوبوونەوە. حەقیقەتەو گومان لەهاتنیدا نیە، خوداش شنەواو زانایە بەکردەوەی بەندەکانیو هیچی لێ گوم نابێ، زانایە بەهەموو بونەوەر ئاگاداری بیروباوەڕو کرداری بەندەکانیەتیو هەر کەسە بەگوێرەی کردەوەی پاداشی دەداتەوە مەبەست بە(أجل الله) پێدەچێ مەبەست مردن بێ. دەشگونجێ مەبەست هاتنی ڕۆژی قیامەت بێ.

جا ئەگە پەروەردگار بەتاقیکردنەوەو لەبۆتەدانی بۆ بڕیاردابنو لەسەری پێویست کردبن: کە جیهاد بکەنو نەفسی خۆیان وارام بکەن تەحەمولی مەشەقەتو ناڕەحەتی بکا، ئەوە سودو قازانجی بۆ خۆیانە، بۆ چاکبونو تەواو بوونی خۆیانە، بۆ ئەوەیە لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەرییان بۆ دەستەبەر ببێ. ﴿وَمَنْ جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ کەسێك جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆی بکا، خۆی وارام بکا خۆگرو پشوو درێژ بێ لەبەرامبەر کارەساتو ناخۆشیدا، فەرمانی خودا بەجێ بێنێو واز لەو شتانە بێنێ کە خودا نەهی لێ کردوە، بێگومان بەروبوومی ئەو جیهادو خۆگریو تێکۆشانەی بۆ خۆیەتی، بۆخۆی

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/٢٤٦ (٢٨٧٨).

سودی لـێ وەردەگـرێ. وەكـوو لەئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿مَـنْ عَمِـلَ صَـالِحاً فَلِنَفْسِهِ﴾(فصلت/٤٦) یان دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لأَنفُسِكُمْ﴾(الإسراء/٧).

جیهادو تێكۆشـان، دڵو دەروونـی تێكۆشـەرەكە مـشتو مـاڵ دەكـا، تەصـەورات‌و ئاسۆی بیروبۆچونی بەرز دەكاتەوە، لەچڵكی رژدیو بەخیلی پـاكی دەكاتـەوە، هێـزە مەعنەوییـەكانی ناوكیـانی دەوروژێنـێ‌و ئامادەباشـییان تێـدا دەخوڵقێنـێ، ئـیتر رەوشت‌و بیرو بۆچوونی، كار لەكۆمەڵ دەكەن‌و سودی بۆ كۆمەڵیشی دەبێ!

ئـەمجار پاداشـی فەرمانبـەرداران رون دەكاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَالَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واتـە: ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو كـردەوەی بـاش دەكـەن، ئـەوە بێگومـان تاوانـەكانیان دەسـڕینەوە، بەمـەرجێ هـاوەڵی بـۆ خـودا دانـەنابێ، لەگوناهـەكانی خـۆش دەبـین. هـەروەها بـەهۆی ئیمانەكـەی‌و كـردەوە باشـەكانی تاوانـەكانی دادەپۆشـین، لـەناو كـردەوە باشەكانیـشی‌دا بـەپێی باشـترین كـردەوەی پاداشـی دەدەینـەوە، بـۆ نموونـە ئەگەر كابرا پەنجا نوێژی سوننەتی كرد بێ، كامیان لەهەموان زیاتر بەرێك‌و پێكـی ئەنجامی دابـێ، ئـەوە دەكـەین بەنموونـەو هـەموو نوێـژەكانی تـری بـەگوێرەی ئـەو نوێژە باش‌و تەواوە نوێژەكانی تری بـۆ حیـساب دەكـەین. ئەگـەر بیـست جـار مـاڵی خـۆی بەخـشیبێ بـەداماوان كـام جارەیـان بەخـشینەكەی لەهـەموو جارەكـان باشـتر بووە بەپێی ئەو جارە پاداشی بۆ حیساب دەكەین!!

بەراستی ئەمە موژدەیەكی خۆشە، رەحمەت‌و فەڕو بەرەكەتێكی فراوانـە، ئـەوە دەگەیەنێ: كە پەروەردگار بۆ پاداش دانـەوە لـەبیانوو دەگـەڕێ، بـەلام بـۆ سـزادان‌و قار گرتن لەبەهانە ناگەڕێ! لەكاری چاكەو طاعات كەمیش بێ قبووڵی دەكا، پاداش یـەك بـەدە تـا یـەك بەحـەوت سـەد دەداتـەوە، بـەلام بـۆ خراپـە هـەر بەئەنـدازەی خراپەكە سزای دەدا یان هەر لـێی خۆش دەبێ!!

کەوابێ با موسوڵمانانی تێکۆشەر دڵخۆش بن بەوەی کە لای خودا بۆیان بڕیار دراوە، لەلێخۆشبوون لەتاوان و پاداشی باش لەسەر کردەوەی چاکە. باصەبر بگرن لەسەر ئەرکی جیهاد لەگەڵ دوژمنان و نەفس و ئارەزۆبازیی، خۆڕاگربن لەسەر بەڵاو دەردو مەینەتیو لەبۆتەدان، ئاسۆی رون و پاداشی باش چاوەڕێیانەو خەنێ لەخۆیان.

**تێبینی:**

ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئاماژە بەوە دەکا: کە کردەوە لەئیمان جوداوازە، چونکە عەطفی (عملوا) بۆ سەر (آمنوا) بەواو کراوەتەوە، عەطف بە(واو)یش نیشانەی جوداوازی نێوان (معطوف)و (معطوف علیه)یە. ئیمان بریتییە لەبڕوا بەخوداو بەپێغەمبەران و فریشتەو نامە ئاسمانییەکان و هاتنی رۆژی قیامەت و زیندوبوونەوەو ئیمان بەقەزاو قەدەر بەخێرو شەڕییەوە.

کردەوەی باش بریتییە لەکردنی هەر شتێك خودا فەرمانی بەکردنی کردبێ. عەمەل کاتێ بەصالح و باش دەژمێردرێ: کە لەبەر خاتری خودا ئەنجام بدرێ. نیەتیش مەرجە دەبێ کابرا: کە کردەوە باشەکە ئەنجام دەدا مەبەستی خودابێ و لەبەر خاتری خودا ئەنجامی بدا. عەمەلی صالح: کە لەئیمانەوە هەڵنەقوڵێ بەرزنابێتەوە. کەوابێ بێ بڕواکاری چاکیش بکا لەقیامەتدا سودی لێ نابینێ. ئیمان و عەمەلی صالح بەیەکەوە دەبنە هۆی بەختەوەریی ژیانی دونیاو قیامەت.

## هەڵوێست و هەڵس وکەوت لەگەڵ باوك و دایكدا بەتاقیکردنەوەی موسوڵمانان و هەڕەشە لەکافرو دووڕووەکان

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَـٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ

تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ... الآيـة﴾ تـیرمیـذی ریوایەتی کردوە دەڵێ: ئایەتەکە دەربـارەی سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەققـاص و دایکـی نازڵ بووە: کە ناوی (حمنة) و کچی ئەبو سەفیان بوو.

سـەعد لەدەسـتە موسـوڵمانە سـەرەتاییـیـەكـان بـوو، بـۆ دایكـی زۆر بـاش بـوو. گوێڕایەڵی بوو، زۆری خزمەت دەكرد، كە سەعد موسوڵمان بوو رۆژێك دایكی پێی گوت: ئەم ئایینە چیە خوت پێوە گرتووە! سوێندم وا بێ لەو ئایینە ژێوان نەبیەوە من نانو ئاو ناخۆم تا دەمرم؛ جا ئەم كاتە بـۆ هـەتا هەتایـە نـاوت دەزڕێو دەڵێن: ئـەوە بكوژی دایكیـەتی! ئـیتر مـانی لـەخواردنو خواردنـەوە گـرتو شـەوو رۆژێـك هیچی نـەخواردو نـەخواردەوە، نەچوە ژێـر سـێبەر. زۆر نارەحـەتو شـەكەت بـوو. رۆژی دوایی‌و شەوی دواییش هەر لەسەر مانگرتنەكەی بـەردەوام بـوو، ئـیتر سـەعد هات بۆ لای‌و وتی: دایكە! دڵنیابە ئەگەر سەد گیانت تێدابێو یـەك بـەدوای یـەكدا گیانـەكانت دەربـچن ئـەمن واز لـەئایینی خـۆم نـاهێنمو پاشـگەز نابمـەوە! جـا تـۆ كەیفی خۆتە دەخۆی ناخۆی (قیر بەقەرەسی). ئیتر: كە ناهومێد بـوو دەسـتی كـرد بەنان خواردنو ئاو خواردنەوەو ئایەتی ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ...﴾ نازڵ بوو.[1]

موجاهید دەڵێ: ئایـەتی ﴿وَمِنَ النَّـاسِ مَـن يَقُـولُ...الآيـة﴾ دەربـارەی كۆمـەڵێك ئادەمیزاد نازڵ بووە: كە بەزوبان (نەك بەدڵ) ئیمانیـان هێنـابوو، هـەر كـە تووشـی بەڵاو ناخۆشی‌یەك دەبوون دەستیان دەكرد بەدەربڕینی نارەزایی‌و ئاخو ئۆف.

ضـەححـاك دەڵـێ: ئـەو ئایەتـە دەربـارەی كۆمـەڵێك دووڕوو نـازڵ بـوو: كـە لەمەككـەدا بەڕواڵـەت ئیمانیـان هێنـابوو، هـەر كـە توشـی ئەزیـەتو ناخۆشـیـەك دەبوون كافر دەبوونەوە.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: دەربـارەی كۆمـەڵێك موسـوڵمان نـازڵ بـووە: كـە موشریكەكان لـەئایین ژێوانیـان كردنـەوەو مورتەدبوونـەوە. واتـە دەرحـەق بەوانـە نازڵ بـوو: كـە ئایـەتی ﴿إِنَّ الَّـذِينَ تَوَفَّـاهُمُ الْمَلآئِكَـةُ ظَـالِمِي أَنْفُـسِهِمْ﴾(النـساء/٩٧) دەربارەیان نازڵ بووە.

[1] تەفسیری مەراغی ج٢٠/١١٧.

هەنـدێکیش دەڵـێن: ئایەتەکە دەربـارەی (عیـاش)ی کـوڕی ئـەبو ڕەبیعـە نـازڵ بووە، موسوڵمان بـوو کۆچی کـرد، دوایـی توشی ئەزیـەتو ناڕەحـەتی بـوو لـەئایین ژێوان بووەوە.

پەیوەنـدی ئـەم ئایەتانـە بـەهی پێـشەوە لـەم ڕووەوەیـە: کـە پـەروەردگار دوای ئـەوەی ئـەوەی بـەیان کـرد: کـە کـردەوەی بـاش تـاوان دەشـواتەوەو پاداشـی چـاکە دوچەندانەو چـەند چـەندانە دەداتـەوە. بەشـوێن ئـەوەدا باسـی چاکەکردن لەگـەڵ باوكو دایكدا دەکا. ئـەمجار ئـەوە ڕون دەکاتـەوە: کـە هـەر کەسـێك وێـڕای ئیمـانی ڕاسـتەقینە کـردەوەی باشـیش ئـەنجام بـدا خـودا دەیخاتـە پێـڕی پێغەمبـەرانو صاڵحانەوە، ئەمجار باسی دووڕووەکـان دەکاو پـەردەیان لەسـەر لادەبـا، دوایـی دێتـە سەرباسی هەوڵو تێکۆشانی کافرەکان بۆ ئەوەی موسوڵمانان ژێوان بکەنەوە.

**دەتوانین بڵێین: ئەم کۆمەڵە ئایەتـانە لەسێ بـاسی سەرەکیدا دەخولێنەوە:**

١- باسـی یەکـەم: پابەنـد بوونـە بەخوداپەرسـتیو خـودا بەیەکناسـین بابـاوكو دایکیش ناڕازی بن، دەفـەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً وَإِنْ جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتـە: فەرمانمان بـەئادەمیزاد کـردوە: کـە بەتـەواویو ڕێـكو پێکـی چاکە لەگـەڵ بـاوكو دایکیاندا بکەن، هەڵسو کەوتیان لەگەڵیاندا چاکەو پیاوەتی بـێ، گوێڕایـەڵیان بـن، دڵیـان ئـازار نـەدەن. بـەکردارو گوفتـار شـتێك نەکـەن دڵیـان گـەرد بگـرێ. چـونکە باوكو دایك بەڕواڵەت هۆکاری پەیـدابوونی ئـەون، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بەوە دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾(الإسراء/٢٣-٢٤).

ئەمجار وێڕای ئەم ئامۆژگارییەی یەزدانو ئەم فەرمانە گشتییە بەکوڕو کچ:
کە لەگەڵ باوكو دایکیاندا بەسۆزو چاکە کاربن پاساوی چاکەکانیان بدەنەوە،
چونکە باوكو دایك بەئەركو ماندووبوونو شەونخوونی پەروەردەیان کردونو
تەمەنی عەزیزی خۆیانیان لەپێناودا براندونەوە، وێڕای بەرچاو گرتنی ئەمانە
هەموو، ئەگەر باوكو دایك بۆ خۆیان موشریك بونو ویستیان منداڵەکانیان
لەئایینی راستو خواپەرستی لابدەن، ئەوە نابێ بەگوێیان بکەنو بۆ رازی کردنی
ئەوان خودا لەخۆیان برەنجێنن، بۆیە پەروەردگار خیطابەکە ئاراستەی هەریەکێ
لەکوڕو کچ دەکاو پێیان دەفەرموێ: ئەگەر دایكو باوکت داوایان لێ کردیو سوور
بوون لەسەر ئەوەی هاوەڵ بۆ من دابنێیو بیرو باوەڕێك پەیڕەو بکەی: کە بێ
بناغەو بۆشەو هیچ زانیارییەکت دەربارەی نیەو راستیو دروستی ئەو بیروباوەڕەت
لا نەچەسپاوە، ئەوە بەگوێیان مەکە، چ جایی بیرو باوەڕێك کە لێت رونە بەتاڵە!

فەرموودەیەکی صەحیح هەیە ئیمام ئەحمەدو (الحاكم) لەعیمرانو
لە(الحكم)ی کوڕی عەمری (الغفاري)یەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ
فەرموویەتی (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) گوێڕایەڵی بۆ هیچ مەخلووقێك
نیە لەبواری لەخودا یاخی بووندا، نابێ بەقسەی هیچ کەس خودا لەخۆت
برەنجێنی.

گەڕانەوەتان بۆ لای منە، هەمووتان بەموسوڵمانو کافرتانەوە، بەئەوانەی
گوێڕایەڵی باوكو دایکیان کردوەو ئەوانەی ئەزیەتیان داون، هەر هەمووتان رۆژی
قیامەت دێنەوە بۆ لای منو بەگوێرەی هەڵوێستو کردەوەتان سزاو پاداشتان
دەدەمەوە. چاکە بەچاکەو خراپە بەخراپە.

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ﴾ ئەوانەی ئیمانیان
بەهەبوونی خوداو بەتاكو تەنهایی خودا هێناوەو شوێن پەیامی پێغەمبەر
کەوتوونو ئەوەی خودا فەرمانی پێ کردون لەکردەوەی چاك، ئەنجامیان داوە، دڵو
دەروونی خۆیان لەنەخۆشییە دەرونیەکان پاك کردۆتەوە، ئەرکی سەرشانیان

بەرێك و پێكی جێ بەجێ كردوە، ئەوانە لەپێزی (صالحين)دا حەشر دەكەین و لەگەڵ ئەواندا دەیانخەینە ناو بەهەشتەوە.

٢- باسی دووەم حاڵ و وەزعی دووڕووەكان بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ﴾ كۆمەڵێك هەن لەناو ئادەمیزاددا درۆزن و دووڕوون؛ ئەوانەی بەزوبان دەڵێن: ئێمە بڕوامان بەخودا هەیەو موسوڵمانین، پێمان وایە خودا تاك و تەنهایە، وەلێ لەراستیدا ئەوانە درۆ دەكەن و ئیمان نەچۆتە ناو دڵیانەوە، بەڵگە لەسەر ئەوەی: كە ئیمان لەدڵیاندا جێگیر نەبوە ئەوەیە: هەر كاتێ تووشی بەڵاو كارەساتێك بوون، موشریكەكان لەسەر بیرو باوەڕ ئەزیەتیان دان، پێیان وایە: ئەوە تۆڵەو سزای خودایەو لەئیمان زێوان دەبنەوە، ئەزیەتدانی كافرەكان بۆیان دەبێتە هۆی لادانیان لەئیمان، وەكوو چۆن عەزابی خودا دەبێتە هۆی لادانی موسوڵمانان لەكوفر، موسوڵمانی ساغ هەتا زیاتر لەبۆتە بدرێ و بەڵاو موصیبەتی تووش بێ زیاتر پابەند دەبێ بەئاینەوە. عەزابی ئادەمیزاد چاری هەیەو پارێزگاری لێ دەكرێ، بەڵام عەزابی خودا هەرگیز لێ قوتار بوونی نیەو كەس ناتوانێ خۆی لێ رزگار بكا، ئەزیەتدان لەئادەمیزادەوە دەبێتە هۆی پاداش و بەختەوەری قیامەت. عەزابی خودا عەزابی قیامەتیشی بەشوێندا دێ.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە: كە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ﴾(الحج/١١)

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە كە پاشگەزبوونەوە لەئیمان بۆ مونافیق ئاسانەو هەر لەگەڵ تینی بۆ هات خێرا پەشیمان دەبێتەوە، چونكە ئیمانەكە نەچۆتە ناو دڵ و دەروونیەوە، بەڵكوو موسوڵمانیەتەكەی هەر بەدەم بووەو بۆ دونیا خواردن بووە، دونیا خواردنیش بەبەهانەی ئاینەوە لەتاوان تاوانترە.

ئەمجار باسی هەڵپەرستی دوڕووەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ جَاءَ نَصْرٌ مِنْ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەگەر لەخوداوە سەركەوتنێك بەدەست بێنی، غەنیمەت‌و دەستكەوتێك دەست كەوێ، ئەو دووڕووانە هێندە هەلپەرست‌و بێ شەرم‌و حەیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵتان بووین‌و یارمەتیمان داون‌و برای ئایینی ئێومین‌و دژی دوژمنی ئێوە جەنگاوین. ئیتر خودا ڕەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ﴾ ئایا خودا زاناتر نیە لەهەموو كەس بەوەی كە لەناو دڵی ئادەمیزاداندا حەشاردراوە؟ ئایا خودا نازانێ دڵیان ئیمانی تێدایە یان دووڕوویی؟ با بەڕواڵەتیش خۆیان بەموسوڵمان دەربخەن‌و لافی ئیمانداریی لێ بدەن!! بەڵێ خودا زانایە بەهەموو شتێك، هیچ نهێنی‌و شاراوەیەكی لێ نادیار نیە، دەزانێ كێ موسوڵمانی ساغ‌و راستەو كێ دووڕوو درۆزنە!

﴿وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ﴾ دڵنیابن پەروەردگار ئادەمیزادەكان لەبۆتە دەداو بەخۆشی‌و ناخۆشی بەتاقییان دەكاتەوە، ئیتر لەئاكامی بەتاقیكردنەوەكەدا بۆ ئادەمیزادەكان خۆیان دەردەكەوێ كێیان لەهەموو بارودۆخێكدا خودا پەرستی حەقیقی‌و راستی‌یەو كێ لەكاتی تەنگانەو ناخۆشی‌دا پاشگەز دەبێتەوە. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾(محمد/٣١) شەڕی ئوحود: كە لەراستی‌دا زللەیەكی میهرەبانی بوو لەموسوڵمانان درا، سەنگی مەحەكی بەتاقیكردنەوەو لەبۆتەدان بوو، دوا بەدوای شەڕەكە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾(آل‌عمران/١٧٩).

٣- باسی سێیەم هەوڵ‌و تەقەلای هەڵگێڕانەوەی موسوڵمانەكان لەلایەن كافرەكانەوە؛ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ﴾ واتە: موشریكەكانی قوڕەیش بەموسوڵمانەكانیان دەگوت: وەرن

لـەئايينی خۆتـان ژێـوان ببنــەوە، بگەڕێنــەوە بـۆ ســەر ئـايينی خۆمـان، ئەگـەر لەڧەرزێكدا ئەو گەڕانەوەتان بەتاوان حيساب بكرێو حيسابو لێكۆڵينـەوە هـەبێ ئەوە لەئەستۆی ئێمەی دابنێو ئێمە تەحەمولی دەكەين.

بەراستـی ئـەم جـۆرە هـەوڵو تەقەلالايانـە دابو نـەرێتی گومڕايانـە لەهـەموو چاخو سەردەمێكدا، بەم شێوە هەوڵی هەڵخەڵەتاندنو لەخشتە بردنـی موسوڵمانان دەدەن، چەندەها كـەس تووشـی تـاوان دەبـێ بەقسەی هـاوەڵێكی گومڕای كـه پـێی دەڵێ: ئەتۆ ئـەو تاوانـە بكـەو هۆبـاڵی لەئەسـتۆی مـن، دەبـێ چـەند كـەس رۆژانـەو شەوانە تووشی تاوانی عەرەق خواردنەوە ببن بـەهۆی ئۆبـاڵ كێشانی هاوەڵەكـەیو لەخشتەبردنيەوە: كە پێی دەڵێ: برا تۆ ئەو پێكە بخۆرەوە ئۆباڵەكـەی لەئەسـتۆی مـن!! بەراسـتی هـاوەڵی خـراپ دوژمنێكـی سەرسـەختو كاريگـەرە، بۆيـە ئـەهلی عيرفـانو راسـتاڵان ئەوەنـدەيان جـەخت لەسـەر خۆپاراسـتن لـەهاوەڵی خـراپ كردۆتـەوەو هەميـشە لەئامۆژگاريـەكاندا جـەختيان لەسـەر دووركەوتنـەوە لەبرادەری خراپ كردۆتەوە.

ئـيتر پـەروەردگار بـەدرۆيان دەخاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا هُـمْ بِحَـامِلِينَ مِـنْ خَطَايَاهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ ئەوانە تەحەمولی تاوانی ئەوان ناكەنو هيچ بارو قورسايی تاوان لەئەوان سوك ناكـەن، ئەوانـە درۆ دەكـەن لـەوەدا: كـە دەڵێن: ئێمـە تەحەمولی تاوانی ئێوە دەكەينو ئۆبـاڵی تاوانـەكانتان لەئەسـتۆی ئێمەيـە، چـونكە كەس تاوانی كەسی بۆ هەڵناگيرێ! وەكوو لەئايـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَإِن تَـدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَى حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَـوْ كَـانَ ذَا قُرْبَـى﴾(فـاطر/١٨) يـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَـا يَـسْأَلُ حَمِـيمٌ حَمِيمـاً﴾(المعـارج/١٠) يـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾(الأنعام/١٦٤).

واتە: كەس لەجياتی كەس سزا نادرێو هەر كەسە لەتاوانی خـۆی بەرپرسـيارە، وەلـێ گومڕاكـەران وێـڕای تۆڵـەی تـاوانی گومڕابـوونی خۆيـان تۆڵـەی تـاوانی

گومڕاکردنی کەسانی دیکەشیان لێ دەسەندرێ. دەفەرموێ: ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَعَ أَثْقَالِهِمْ﴾ واتە: بانگخوازانی کوفرو ئیلحاد ڕۆژی قیامەت تاوانی خۆیان، تاوانی ئەوانەی لەخشتەیان بردونو گومڕایان کردون دەخرێنە ئەستۆی بەبێ ئەوەی کە هیچ لەقورسایی کۆڵی شوێنکەوتوانیان سوك بکەن، چونکە لەراستیدا گومڕاکەران: کە تاوانی شوێنکەوتوانیان هەڵدەگرن، هەر بەتاوانی خۆیان حلێب دەکرێو ئەوەی ئەوان لێی بەرپرسیارن گومڕاکردنەکەیە، ئەوەش کردەوەی خۆیانە، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾(النحل/٢٥).

ئیبنو ماجە لەسونەنەکەیدا فەرمودەیەك لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەت دەکا؛ دەفەرموێ: (کەسێك ڕەهنومایی کەسێك بکا بۆ کاری خێر، بەئەندازەی ئەو کەسەی خێر دەگاتێ کە کارەکەی پێ کردوە تا ڕۆژی قیامەت بەبێ ئەوەی لەخێری ئەو هیچ کەم بکا: کەسێك بانگەوازیی خەڵك بکا بۆ گومڕاییەك: تاوانی هەموو ئەوانەی لەسەرە کە تا ڕۆژی قیامەت ئەو تاوانە دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ لەتاوانی ئەوان کەم ببێتەوە).

هەروەها لەفەرمودەی صەحیحدا هاتووە دەفەرموێ: (ما قتلت نفس ظلماً الا كان على ابن آدم الأول كفل من دمها؛ لأنه أول من سن القتل) واتە: هەر ئادەمیزادێك بەناحەق بکوژرێ بەشێك لەتاوانی کوشتنەکە لەسەر کوڕی ئادەمە واتە: (قابیل): چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا.

هەروەها ئیمامی موسلیمو هی تریش لەئەبو هورەیرەوە فەرمودەیەکیان ڕیوایەت کردوە دەفەرموێ: (من سن سنة سيئة فعليه وزر من عمل بها. من غير ان ينقص من وزره شيء) کەسێك دابو نەرێتێکی خراپو ناپەسند دابهێنێ ئەوە تاوانی خۆیو تاوانی ئەوانەش: کە پەیڕەوی ئەو داب نەرێتە دەکەن لەئەستۆیدایە لەسەریان سزا دەدرێ.

﴿وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ لەوە بەو لاوە، لەرۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێ دەکرێ، واتە: پرسیاری سەرزەنشتو لۆمەو ریسوا کردنیان لێ دەکرێ لەسەر ئەو درۆو دەلەسەیەی: کە لەدونیادا هەڵیان دەبەستو خەڵکیان پێ گومڕا دەکردو دەیانگوت: ئەوە قەیناکا ئەوە تاوان نیەو ئەوە ئەگەر تاوان بێ هۆباڵی بەئەستۆی ئێمە!!

## چیرۆکی حەزرەتی نوح لەگەڵ قەومەکەی

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ ﴾

دوای رونکردنەوەی تەکلیفو بەرپرسیاریو جۆرەکانی، وادەو بەڵێن: بەموسوڵمانی رستاڵو خوداپەرست دەدا، هەڕەشە لەکافرو دووڕووەکان دەکا بەسزای بەئێشی نەبڕاوە. ئەمجار چیرۆکی بەتەمەن ترین پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە: ئەویش حەزرەتی نووحە ﷺ نۆسەدو پەنجا ساڵ بانگەوازی گەلەکەی کرد بۆ ئیمان هێنانو خوداپەرستی، وەلێ کەمێکیان نەبێ ئیمانیان پێ نەهێنا. ئەمجار بەشوێن چیرۆکی (نوح)دا چیرۆكو سەرگورشتەی هەندێ پێغەمبەری ترمان بۆ دەگێڕێتەوە: کە بریتین: لەحەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی لوطو هودو شوعەیبو صالح. لەچوارچێوەی ئەو چیرۆکانەدا سەرەنجامی ئەو گەلو نەتەوە بەدرۆ خەرەوانەمان بۆ رون دەکاتەوە، تەسەللای پێغەمبەر ﷺ

دەداتەوە، هەڵی دەنێ بۆ ئەوەی خۆڕاگرو پشوو درێژ بێ لەبەرامبەر هەڵوێستو فشارهێنانی قورەیشییەکان بۆ خۆیو هاوەڵانی. لەهەمان کاتدا جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتە دەکاتەوە: کە لەسەرەتای سورەتەکەدا ئاماژەی پێ کرد: کە بریتی بوو لەوەی بەڵاو موصیبەتو ئەزیەتو نارەحەتی سوننەتی ژیانەو بۆ تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانە!

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلاَّ خَمْسِينَ عَاماً﴾ سوێند بێ ئێمە (نوح)مان کردە پێغەمبەرو رەوانەمان کرد بۆ سەر گەلەکەی نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناو گەلەکەیدا مایەوە، بانگەوازی کردن بۆ یەکتاپەرستیو بەندایەتیکردن بۆ خوداو بڕوا بەهاتنی رۆژی قیامەت، کەمێکیان نەبێ بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەچوون، کەمینەیەك نەبێ ئیمانیان پێ نەهێنا. ئەویش لەخودا پاڕایەوە ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً، فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَاراً﴾(نوح/٥-٦). هەروەها ﴿قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَاراً﴾(نوح/٢١).

ئیتر پاش ئەو هەموو ماوە درێژەی: کە حەزرەتی نوح بانگەوازیی کردنو هەوڵو تەقەللای لەگەڵ دان، ئەوان هەر سوور بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، ﴿فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾ پەروەردگار بەتۆفان خنکاندنیو سەرزەمینی لێ پاك کردنەوە، ئەوانە خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردو بەدەستی خۆیان خۆیان بەدبەختو چارەڕەش کرد. دەی کەوابێ ئەتۆ ئەی موحەممەد! خەمو خەفەت لەوە مەخۆ: کە گەلەکەت ئیمانت پێ ناهێننو بەپیر بانگەوازییەکەتەوە نایەن، ئەوەتا نوح نۆ سەدو پەنجا ساڵ بانگەوازی قەومەکەی کردو لەگەڵیان خەریك بوو، کەچی کەمێکیان نەبێ ئیمانیان پێ نەهێنا، ئەو ماوە دورو درێژە خۆی گرتو وازی لەگەیاندنی پەیامەکەی نەهێنا. دەی ئەتۆ ئەی موحەممەد! زۆر شیاوتری بەوەی بەصەبرو خۆڕاگر بیو سوور بی لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت.

کافرەکانی سەردەمی نوح بەوە لەخۆیان بایی دەبوون: کە عەزابی هەڕەشە پێ لێکراویان زوو بۆ نەهاتو دواکەوت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رزگاریان نەبوو، دەی با قوڕەیشییەکانیش بەدواکەوتنی عەزاب، لەخۆیان بایی نەبن، چونکە هەر کاتێ خودا بیەوێ عەزاب تووشیان بێ یەخەیان دەگرێ.

﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ وَجَعَلْنَاهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ نوحو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێنا بوو، بەسواری گەمێ رزگارمان کردن، کەشتی بەناو ئەو دەریای پێ پەیدا رۆیشت تا گەیشتە سەرکێوی (الجودي)و لەسەر ئەو کێوە لەنگەری گرت. کافرو بێ بڕواکانمان بەو تۆفانە لەناو بردن، کەشتییەکەمان کردە یادخەرەوە بۆ نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی پەروەردگار بەسەر بەندەکانیدا، پەندو عیبرەتی لێ وەردەگرێو نیشانەی ئەوەیە: کە خودا هەمیشە پاڵپشتی خودا پەرستانەو سەرپێچیکەرانی لەناو بردوە.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ئەوەی راستو صەحیحە ئەوەیە: حەزرەتی نووح نۆسەدو پەنجا ساڵ بانگەوازیی گەلەکەی کرد.. پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەریش دەیان ساڵێك تەمەنی بەڕێ کردوە، پاش تۆفانیش چەند ساڵێك ژیاوە، ئەمەش تەمەنێکی درێژەو بەشێوەیەکی ناسروشتی دێتە بەرچاومانو ئێستا ئەو جۆرە تەمەنە بۆ ئادەمیزادی ئێستا غەیر مەئلوفە. وەلێ ئەم هەواڵەمان لەراستگۆ ترین سەرچاوەوە پێ گەیشتووەو سەد دەرسەد بەراستی دەزانینو نیشانەی راستییەکەی سەرچاوەکەیەتی.

ئەگەر بمانەوێ تەفسیرو هۆکارێك بدۆزینەوە بۆ ئەو تەمەن درێژییەی حەزرەتی نوح، دەتوانین بڵێین: ژمارەی ئادەمیزاد لەو رۆژگارەدا کەم بووە: کەوابێ وێدەچێ پەروەردگار لەو چاخو سەردەمانەدا قەرەبووی کەمی ژمارەی ئادەمیزادی بەتەمەندرێژییان کردبێتەوە، بۆ درێژەدان بەژیانو ئاوادانکردنەوەی زەوی، هەتا کە ژمارەی ئادەمیزاد زۆر بوو زەوی ئاوەدان بووەو ئیتر پێویستی ژیانو ئاوەدانکردنەوەی زەوی پێویستی بەتەمەندرێژی ئادەمیزاد نەما.

ئەمەش دیاردەیەکە لەتەمەنی زۆر زیندەوەردا بەچاو دەکەوێ: هەتا ژمارەیان کەمو زاووزێیان کەم بێ تەمەنیان درێژتر دەبێ، بۆ وێنە هەندێ باڵندەو خشۆك، وەکوو هەڵۆو کیسەڵ چونکە ژمارەیان کەمو زاوزێیان زۆر نیە، تەمەنیان دەگاتە سەدان ساڵ، کەچی مێش: کە بەمەلایین زاووزێ دەکەن تەمەنی هیچ کامێکیان لەدوو هەفتە تێپەڕ ناکا. شاعیرێك ئاماژە بۆ ئەم دیاردەیە دەکاو دەڵێ:

بغاث الطير أكثرها فراخاً وام الصقر مقلاة نزور[1]

## چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ نەتەوەکەیدا

﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُوا۟ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ

[1] في ظلال القرآن ج٦/٣٩٨.

يُعِيدُهُۥٓ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحْمَتِى وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٣﴾

**دوا بەدوای چیرۆکی حەزرەتی نوح کە بەدووەم بابە گەورەی ئادەمیزاد دەناسرێ. پەروەردگار چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیممان بۆ دەگێڕێتەوە: کە بەباوکی پێغەمبەران دەناسرێو رابەری خوداپەرستانە. ئەمەش بۆ دڵنەوایی کردنی پێغەمبەرو تەسەللا دانەوەی لەسەر روو وەرگێڕانی قورەیشییەکان لەپەیامەکەی دەفەرموێ: ﴿وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ئەوە بۆ نەتەوەکەت بگێڕەوە: کە ئیبراهیم بانگەوازیی گەلەکەی کرد بۆ خوداناسینو یەکتاپەرستی. فەرمانی پێ کردن بەوە: کە بەدڵسۆزی عیبادەتی خودا بکەن لێی بترسن، خۆیان لەسزاو تۆڵە بپارێزن، پێی گوتن: فەرزو ئەرکەکانی سەرشانیان جێ بەجێ بکەن، سەرپێچی فەرمانەکانی نەکەن، ئەگەر وا بکەنو پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بن، بەختەوەریی دونیاو**

قیامەت بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن، ئەوە بۆ ئێوە خێرو فەرە. ئەگەر ئێوە خاوەنی عەقڵو هەستو شعور بن ئەوە دەکەن: کە بەرژەوەندی دونیاو قیامەتی تێدابێ.

بێگومان بانگەوازییەکەی حەزرەتی ئیبراهیم ئاشکراو مەفهووم بوو، گرێو گۆڵی نەبوون، زۆر بەساکاری بانگەوازیی خۆی پێ ڕاگەیاندنو هەڵینان بۆ خوداپەرستیو خۆپاراستن لەسزاو عیقاب.

**ئەمجار دو بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ڕاستی بانگەوازییەکەیو فەسادی بیرو بۆچوونی ئەوان ڕون دەکاتەوە:**

١- بەڵگەی یەکەم ئەوەیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا﴾ ئەو بتو صەنەمانەی ئێوە لەجیاتی خودا دەیانپەرستن بریتین لەچەند قەبارەیەك لەبەردو گەچ خۆتان پێکتان هێناون، بەدەستی خۆتان داتاشیونو بەندایەتیان بۆ دەکەن. نەزیان دەگەیەنن نەسود، بۆ خۆتان ناوتان بۆ هەڵبەستونو بەخودایان دەزانن، پێتان وایە شەفاعەتتان بۆ دەکەن لای خودا، ئێوە درۆ دەکەن لەوەدا: کە دەڵێن: ئەمانە خودان، شەفاعەتکارن، هاوەڵی خوان.

٢- بەڵگەی دووەم ئەوەیە؛ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا﴾ ئەو بتو صەنەمانەی ئێوە لەجیاتی خودا بەندایەتییان بۆ دەکەن ناتوانن کەمترین بژێو بۆ ئێوە دابین بکەن، هیچیان پێ ناکرێو هیچیان لەدەست نایە. ئەدی چۆن ئێوە عیبادەتیان بۆ دەکەن؟!

﴿فَابْتَغُوا عِنْدَ اللَّهِ الرِّزْقَ﴾ داوای ڕزقو ڕۆزیی هەر لەخودا بکەن، لەکەسی تر داوای ڕزقو ڕۆزیی مەکەن؛ چونکە ئەو بتو صەنەمانە هیچیان نیەو دارای هیچ نین.

لەڕزقو ڕۆزیی پەروەردگار بخۆنو ﴿وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ تەنیا عیبادەت بۆ خودا بکەنو هەر ئەو بەشیاوی پەرستش بۆ کردن بزانن،

شوکرو سوپاسی بکەن لەسەر ئەو نیعمەتو بەخششانەی پێی داون، خۆتان ئامادە بکەن بۆ بەخزمەت گەیشتنی خوداو روبەڕوبوونەوەی لەرۆژی قیامەتدا، لەو رۆژەدا هەمووتان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، لەسەر هەموو کردەوەیەکتان پرسیارتان لێ دەکاو هەر کەسەتان بەگوێرەی کردەوەکانتان سزاو پاداش وەردەگرنەوە.

ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم بەڵگەی لەسەر پێغەمبەرایەتی خۆی هێنایەوە وتی: ﴿وَإِنْ تُكَذِّبُوا فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلآ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە دەربارەی پێغەمبەرایەتیم بەدرۆم بخەنەوە، ئەوە ئێوە بەو هەڵوێستەتان زیان بەمن ناگەیەنن، چونکە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران داب‌و نەریتی گەل‌و نەتەوەکانە، وەلێ من ئەوەتان پێ رادەگەیەنم: کە گەلە پێشینەکان لەسەر ئەو هەڵوێستەیان تووشی عەزابی سەختی خودا بوون، بۆ خۆیان زەرەریان کردو زیانیان پێ گەیشت‌و خەسارەتمەند بوون، نەك پێغەمبەرەکان، چونکە پێغەمبەر تەنها راگەیاندنی پەیامەکەی لەسەرەو ئەرکی ئەو تەنها مژدە پێدان‌و ترساندنە، کەوابێ ئێوە بەخۆتاندا بچنەوە، هەوڵ بدەن بەختەوەری حەقیقی بۆ خۆتان دەستەبەر بکەن‌و حیساب‌و پاداشتان عائید بەخودایە.

ئەمجار دوای رونکردنەوەی بنەمای یەکەم‌و بەڵگە هێنانەوە لەسەری‌و ئاماژە کردن بۆ بنەمای دووەم کە بڕوا بەپێغەمبەرایەتییە، دەست دەکا بەبەیانکردنی بنەمای سێیەم: کە هاتنی رۆژی قیامەت‌و حەشرو حیساب‌و لێکۆڵینەوەیە، ئەم سێ بنەما سەرەکییەی عەقیدە (توحید، رسالة، بعث) بەیەکەوە باس دەکرێن‌و لەزوربەی شوێنی قورئاندا لێك دانابڕێن. دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ئایا نابینن پەروەردگار چۆن شت دەخولقێنێ، چۆن سەرەتا شت دروست دەکا؟ بێگومان خودا لەنەبوەوە ئەو ئادەمیزادانەی دروست کردون، هیچ نەبون‌و هێناونیە گۆڕەپانی بوونەوە، هەست‌و هێزو توانای پێ بەخشیون، زانیاری جۆراو جۆری فێر کردون، دەی کەسێك

لەنەبوەوە بتوانێ شت دروست بکا، جارێکی تر ئیعادە کردنەوەی لا ئاسانترە، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَهُـوَ الَّـذِي يَبْـدَأُ الْخَلْـقَ ثُـمَّ يُعِيـدُهُ وَهُـوَ أَهْـوَنُ عَلَيْهِ﴾(الروم/٢٧).

ئایەتەکە خیطابـە بـۆ هـەموو کەسـێك ئینکاری هـەبوونی خـوداو هـاتنی قیامـەتو حیـسابو لێکۆڵینـەوەو پـاداشو سـزا بکـا، خیطـابێکە هـەموو بوونـەوەر بەڵگەی ناوەرۆکەکەیەتی، هەموو ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیـان دایـە نمایـشگای بەڵگەو نیشانەکانی خودان، دە تێیان رامێننو لێیان ورد ببنەوە، هـەموو بوونـەوەر لاپەڕەیـەکی کـراوەو نمایـشکراوە بـۆ بیـنینو تێفکـرین، ئاسمانـەکانو زەویو ئـەوی تێیاندایە هەموویان نیشانەو بەڵگەن لەسەر هەبوونو تاكو تەنهایی خودا، لەسـەر راســتی وادەو هەڕەشــەی، دیمەنــەکانی بونــەوەرو دیاردەکــانی هەمیــشە بەبەرچـاوەوەنو هـون نـابن، وەلـێ بـەهۆی زۆر دووبارەبوونـەوەو ئولفـەت گـرتن پێیانەوە کاریگەرییان لەسەر هەستو بیری ئادەمیزاد کەم بۆتەوە، وەکوو پێویـست سـەرنجیان راناکێشن. بۆیـە قورئـانی پـیرۆز زۆر جـار سـەرنجی ئـادەمیزاد بـۆ ئـەو دیمەنو دیاردانەی بوونەوەر رادەکێشێو هەڵیان دەنێ بۆ ئەوەی لەنهێنیو دیمـەنو دیاردەکانی بوونەوەر ورد ببنەوە، بەڵگە لەسەر هەبوونی خودایـەکی تـاكو تـەنهاو خـاوەن دەسـەلاتو بەدیهێنـەر بدۆزنـەوە... بێگومـان ئـادەمیزاد رۆژانـەو وەرزانـە بەچاوی خۆیان دەبینن خودا چۆن شت بەدی دەهێنێ، دەبینن چۆن گیاو گژ زیندو دەکاتەوە، چۆن جوجەڵە لەهێلکەو هێلکە لەمریـشك پەیـدا دەکا، هـەروەها هـەموو شتێك کە ئەمڕۆ نیەو سبەینێ وەدی دێ لەو شتانەی: کە ئـادەمیزاد بـەتاكو بـەکۆ نـاتوانن دروسـتیان بکـەن، تەنانـەت رویـان نایـە لافـی ئـەوە لـێ بـدەن: کـە ئـەوان بەدیهێنـەریانن. چـونکە لەراسـتیدا نهێنـی گیـان خـۆی لـەخۆیدا مـوعجیزەو سەرسوڕهێنەرەو کەس نەیزانیوەو کەس نایزانێ چۆنەو چۆن دێتە گۆڕێ، چ جـایی یەکێك راست بێتەوە ئەو ئیدیعایە بکا. بێگومان هیچ تەفسیرێك بۆ گیان نیە، جگە لەوەی بڵێین: ئەوە بەدیهێنانی خودای مەزنە، هەموو ساتو ئانێـك لـەپێش چاوی

ئادەمیزاد دیاردەکانی دەبینرێو ناتوانن ئینکاری بکەن، جا ئەگەر بەچاوی خۆیان، بەهەستو عەقڵو فامی خۆیان، دیاردەی بەدیهێنانی شتەکانیان دیت، ئەوە باباش بزانن ئەو کەسەی ئەو شتانەی بەدی هێناون لەدوای مردنو لەناوچون سەرلەنوێ دروستیان دەکاتەوە، ئەوە لای خودا شتێکی ئاسانەو گرنگی تێدا نیە، بەڵکوو بۆ خودا هەموو شتێك ئاسانەو ئەرکی تێدانیە. دروستکردنو ئیعادە لای خودا چون یەکەو هەر کاتێ ویستی شتێك ببێ پێی دەفەرموێ: ببەو دەبێ. ئیشی خودا (کن فیکون)ە.

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾ ئەمجار فەرمان بەئادەمیزاد دەکا کە بەزەویدا بگەڕێنو لێی ورد ببنەوە، سەیری ئاثارو نیشانەکانی بکەن، سەرنجی دەستڕەنگینی پەروەردگار بدەن: بڕوانن: چۆن شتەکان بەدی دێنێ، سەیری گۆڕانی وەرزەکانی ساڵو دیاردەی گەرماو سەرماو بەفرو بارانو گوڵو گوڵزارو دارو درەختو دیمەنەکانی تری بونەوەر بکەن، چونکە گەڕان بەناو زەویداو لێ وردبوونەوە لەدیاردەکانی دڵو چاو دەکاتەوە، بینینی دیمەنی تازە هەست دەبزوێنێ، سەرنج رادەکێشێ، زۆرجار وا رێ دەکەوێ ئادەمیزاد لەشوێنێکدایەو گوێ بەدیاردەکانی ئەو شوێنە نادا، بەڵام کە ئەو شوێنەی بەجێ هێشتو دوایی بۆی گەڕایەوە، بەوردی سەرنج لەدیمەنەکانی دەداو ئەو شتانەی: کە لەوەپێش گرنگی پێ نەدەدان ئێستا بەدیقەتەوە سەیریان دەکاو کاری تێ دەکەن.

گەڕان بەزەویداو لێکۆڵینەوە لەشوێنەوارو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چۆنیەتی دروستبونی ژیان لەسەر زەوی، وەکوو ئەو حەفریاتو پشکنینو توێژینەوەیەی زانایانی شوێنەوارناس ئەنجامی دەدەن، بۆ ئەوەی بزانن: هێڵی ژیان چۆن دروستبووەو چۆن رۆیشتووەو چۆن بڵاوبۆتەوەو چۆن پێشکەوتووە، هەرچەندە تا ئێستا دەربارەی نهێنی ژیان نەگەیشتوونە هیچ شتێكو نازانن گیان چیەو لەکوێوە هاتووە بۆ سەر زەوی؟! نازانن یەکەم زیندەوەر چۆن لەسەر زەوی پەیدا بووە؟!

هەڵبەتە ئایەتەکە زۆر مانای تر هەڵدەگرێ، چونکە ئەو کاتەی قورئان نازڵ بووە، ئادەمیزادەکان ئامادەباشی ئەو جۆرە لێکۆڵینەوە زانستی‌یەیان نەبووەو نەیان توانیوە ئەو ئامانجانەی ئەمڕۆ زانایانی شوێنەوارناس لەئاکامی لێکۆڵینەوەکانیاندا بەدەستی دەهێنن، ئادەمیزادانی ئەو رۆژگارە بەدەستی بهێنن، کەوابوو وێدەچێ ئەو کاتە قورئان شتێکی داوا کرد بێ لەئادەمیزادەکان: کە لەتوانایاندا بووبێ بەرجەستەی بکەن. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین: ئەو کاتە ئەوەی مەطلووب بووە لەوان، ئەوە بووە، بیر بکەنەوەو وورد ببنەوە ژیان چۆن لەروەکدا پەیدا دەبێ، زیندەوەرو ئادەمیزاد چۆن گیانیان پێ دەبەخشرێ؟ واتە: لەدیاردەکانی گیان بڕوانن‌و بیریان لێ بکەنەوە نەك لەخودی گیانەکە، چونکە گیان بۆخۆی نهێنی‌یەکی خودایی‌یەو جگە لەخودا کەس نازانێ چیەو چۆنە!!

هەروەها مەبەست بەرۆیشتن بەناو زەویدا وەکوو لەوەپێش ئاماژەی بۆ کرا، وەئاگا هێنانەوەی هەست‌و شعورەکان بووە بەهۆی دیتنی دیمەنە جۆراو جۆرە تازە بینراوەکان؛ بۆ ئەوەی بەوردی لەدیاردەکانی دەسەڵاتی خودا ورد ببنەوە.

ئایەتەکە مانایەکی تریش هەڵدەگرێ: کە زۆر لەگەڵ سروشتی قورئاندا گونجاوە، ماناکەش ئەوەیە: پەروەردگار تەوجیهاتی خۆی بۆ هەر چین‌و رۆژگارێك وا ئاراستە دەکا کە لەگەڵ ژیان‌و سەردەم‌و ئاستی رۆشنبیری‌و دیاردەکانی ژیانی ئادەمیزادەکاندا گونجاو بێ، بۆ ئەوەی هەموو کەس لەهەموو سەردەم‌و رۆژگارێکدا بەگوێرەی تواناو بیرو بۆچوون‌و ئاستی رۆشنبیرییان فەهمی قورئان بکەن.

﴿ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ﴾ پاشان خودا جارێکی تر سەرلەنوێ لەرۆژی قیامەتدا زیندویان دەکاتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا خاوەن دەسەڵات‌و توانایە، هیچی لێ یاخی نابێ، چونکە دەسەڵاتی رەهای هەیە، بەو دەسەڵاتە موطلەقە بەدیهێنان‌و دروستکردنەوە ئەنجام دەدا، هەر لەروانگەی ئەم دەسەڵات‌و توانا رەهایەی: کە هەیەتی: ﴿يُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَنْ

يَشَاءُ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ﴾ سزای ئەوانە دەدا: کە دەیەوێ سزایان بدا، رەحمو بەزەیی خۆیشی دەبەخشێ بەئەوانەی کە دەیەوێ رەحمیان پێ بکا. چونکە فرمانڕەوایەکی موطلەقە، بەویستی خۆی لەروانگەی عەدالەتکارییەوە کافرو تاوانباران سزا دەدا هەر لەروانگەی فەضلو گەورەیی خۆشیەوە رەحمو بەزەیی دەبەخشێ بەکەسانی خودا پەرست، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا، هەرچی ویستی، بڕیاری لەسەر دەدا، کەس نیە ببێتە کۆسپو لەمپەڕو هەڵوەشێنەوەی حوکمەکانی. کەس ناتوانێ پرسیاری لێ بکا بۆچی وا دەکاو بۆ وا ناکا؟! بەدیهێنانو حوکمو بڕیار بۆ ئەوە، پاش مردنتان هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، هەمووتان رۆژی قیامەت دەچنەوە بەر قاپی پەروەردگارو دادگایی هەموانتان دەکاو هەر کەسە بەگوێرەی کردەوەکانی سزاو پاداش وەردەگرنەوە. کەس تەنانەت بەئەندازەی گەردیلەیەکیش ستەمی لێ ناکرێ.

تێبنی ئەوە دەکرێ لەم ئایەتەدا عەزاب پێش رەحمەت خراوە، هەرچەندە بەگوێرەی حەدیثی (سبقت رحمتي غضبي) رەحمەت پێش دەخرێ، هۆیەکەی دەگونجێ ئەوە بێ، چونکە لەوەپێش سەرەتا باسی کافرەکانی کردوە، هەروەها لەبەر موناسەبەو پەیوەندی بەو هەڕەشەیەی کە لەئایەتی ﴿وان يكذبوا...﴾ فەهم دەکرێ.

دوبارە کردنەوەی رستەی ﴿و إليه تقلبون﴾ دوای رستەی ﴿إليه ترجعون﴾ ئاماژەیە بۆ ئەو راستیەیە: کە عەزابدانو رەحم پێ کردن چەندێك بومغرێو دوا بکەوێ، هەرپەیدا دەبنو دێنە وجود.

﴿وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾ ئێوەی ئادەمیزاد ناتوانن نە لەئەرزو نەلەئاسماندا پەروەردگار دەسەوەسان بکەنو نەهێڵن دەستی تۆڵەی بتانگاتێ، کەس ناتوانێ خۆ لەقەزاو قەدەری خودا رزگار بکا ﴿وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ نیە بۆ ئێوە جگە لەخودا، سەرپەرشتیارێك کاروباری ئێوە

لەخۆ بگرێ، چاودێرو پارێزەرتان بێ. یارمەتیدەرێکتان دەست ناکەوێ لەعەزابی خودا بتانپارێزێ! دوای ڕانواندنی ئەو هەموو بەڵگەو دەلیلانە دەربارەی تاك‌و تەنهایی خوداو زیندوبوونەوەو، دەسەڵاتی بەرفراوانی خودا: کە تەصەووری ئادەمیزاد ناتوانێ کۆنتڕۆڵی بکا، هەڕەشەی توند ئاڕاستەی هەموو سەرپێچیکارێك دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَلِقَائِهِ أُوْلَئِكَ يَئِسُوا مِنْ رَحْمَتِي وَأُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانەی ئینکاری ئایاتی خوداو نیشانەکانی تاك‌و تەنهایی زاتی پاکی دەکەن، پەیامی پێغەمبەرانی ڕەت دەکەنەوە، بڕوایان بەزیندوبوونەوەو لیقای پەروەردگار نیە لەقیامەتدا ئەوانە لەرەحمەتی خودا بێ بەشن، بەهۆی کوفرو گومڕایی خۆیان هیچ هیوایان بەرەحمەتی خودا نیە، چونکە ئەوانە لەعەزاب‌و عیقابی خودا نەترساون‌و بەتەما پاداش‌و بەخششی خودا نین، ئەوانە عەزابی توندو تیژیان هەیە لەقیامەتدا، ئەوانە کافرو بێ بڕوان بۆیە لەرەحمەتی خودا نائومێدن. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ لاَ يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾(يوسف/٨٧).

ئادەمیزاد کاتێك لەرەحمەتی خودا ناهومێد دەبێ: کە دڵی کافر بێ‌و بڕوای تێدا نەبێ، پەیوەندی ئەوو خودا بچڕابێ‌و مەئیووس بێ لەپەیوەست بوونی دڵی بەخوداوە. ئیتر ئەو کاتە تەڕایی ئیمانی تێدا نامێنێ‌و سەرەنجامیشی ئاشکرایە عەزابی بەئێش‌و کوشندەیە.

## وەڵامی قەومی ئیبراهیم بۆی‌و ئیمانهێنانی لوط بەئیبراهیم‌و ئەژماردنی نیعمەتی خودا بەسەر ئیبراهیمدا

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ

يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾

پاش ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆری لەسەر تاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتیو هاتنی رۆژی قیامەت بۆ گەلەكەی هێنانەوە، فەرمانی پێ كردن بەعیبادەتی خوداو دوور كەوتنەوە لەبتپەرستی، بەبەڵگەی بەهێز بۆڕی دانو هیچیان بەدەستەوە نەما بەرەنگاری پێ بكەن؛ ناچار پەنایان بردە بەر بەكارهێنانی هێزو هەڕەشە، ئەمەش دابو نەریتی هەموو ئەو كەسانەیە كە سەررەقو لوتبەرزنو مل بۆ حەق نادەنو پشت بەشانو شەوكەتی خۆیان دەبەستن، هەر لەگەڵ رێگایان بەستراو بۆڕیان خوارد خێرا پەنا بۆ هێزو دەسەڵات دەبەنو دەست دەكەن بەهەڕەشە كردن. ئەوەتا: گەلی ئیبراهیم كە

لەبواری بەڵگە هێنانەوەدا بۆڕیان خوارد، پەنایان بردە بەر هەڕەشەو بەکار هێنانی زەبرو زەنگ!! وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَنْ قَالُوا اقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنْجَاهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ گەلی ئیبراهیم لەوەڵامی ئیبراهیمدا لەبەرامبەر داخوازیی حەزرەتی ئیراهیم کە داوای لێ کردن بۆ خوداناسین‌و یەکتاپەرستی هیچیان بەدەستەوە نەما جگە لەوەی کە پیاو ماقوڵ‌و ریش سپییەکانیان گوتیان: ئیبراهیم بکوژن بەئاگر بیسوتێنن بەجۆرێك داپلۆخێ. ئیتر بڕیاریان دا ئاگرێکی زۆری بۆ بکەنەوەو بەمەنجەنیق (قۆچەقاینی) فڕێی دەنە ناوی. ئاگریان بۆ کردەوەو تێیان فڕێداو خودا رزگاری کردو بەسەلامەتی لەئاگر هاتەدەر، بێگومان لەم شێوە رزگار کردنەی کە ئیبراهیممان پێ لەئاگر رزگار کرد، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر هەن لەسەر هەبوونی خوداو بەتوانایی‌و دەسەڵاتی رەهای بۆ گەل‌و نەتەوەیەك بڕوایان بەخودا هەبێ بەبینینی بەڵگە بڕوا بکەن‌و ئیمان بهێنن.

بێگومان نەتەوەی ئیبراهیم نموونەی نەتەوەی خراپ‌و خوێڕی بوون، جێگای سەرسوڕمان‌و لێ حەبەسانن، حەزرەتی ئیبراهیم بانگەوازییان دەکا بۆ خێرو خوداپەرستی، شارەزاییان دەکا بۆ هیدایەت‌و رێبازی حەق، کەچی ئەوان پاساوی بەوە دەدەنەوە دەیخەنە ناو ئاگرەوە!!

بەڵام ئیبراهیم خودا پشتیوانیەتی‌و خوداش خاوەن تواناو دەسەڵاتە، پلان‌و نەخشەی کافرەکانی هەڵوەشاندەوە، ناو ئاگری سوتێنەری بۆ کردە کەش‌و هەوایەکی ئارام‌و سەلام. لەچەند شوێنێکی تری قورئاندا پەروەردگار بەرامبەریی لەنێوان کرداری کافرەکان‌و کردەوەی خۆیدا رادەنوێنێ‌و بۆڕخواردنی کافرەکان ئاشکرا دەکا، وەکوو دەفەرموێ: ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَاناً فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ، فَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ﴾(الصافات/٩٧-٩٨) یان دەفەرموێ: ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا

آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ، قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ﴾(الأنبياء:٦٨-٧٠).

دوای ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم لەئاگری سامناك رزگاری بوو، دڵنیا بوو: كە نەتەوەكەی ئیمانی پێ ناهێنن‌و زانی كە دڵیان بەهیچ شتێك نەرم نابێ ئیتر روبەرویان وەستاو پێش ئەوەی لێیان گۆشەگیر بێ‌و بەجێیان بێڵێ هەڵوێستی مەردانەی خۆی نواند! ﴿وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَاناً مَوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ بەشێوەی سەرزەنشت‌و لۆمەوە پێی گوتن: ئێوە ئەو بت‌و صەنەمانەتان كردون بەپەرستراوی خۆتان‌و لەجیاتی خودا پەرستشیان بۆ دەكەن، بۆ ئەوەی لەسەر بەندایەتی بۆ كردنیان كۆببنەوە، خۆشەویستی لەنێوانتاندا پەرە بسێنێ، بەبۆنەی پەرستش كردن بۆ ئەو بتانەتان دەتانەوێ وەگری یەكتری ببن‌و لەژیانی دونیادا ببنە هۆكاری گردبونەوەتان، وەلێ لەقیامەتدا بەپێچەوانەوەیە دەبنە مایەی دڕدۆمی نێوانتان‌و هەریەكەتان ئەوی تری دەدزێ.

دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُمْ بَعْضاً﴾ واتە: پاشان لەرۆژی قیامەتدا حاڵ‌و وەزعتان بەپێچەوانەوە دەبێ، دۆستایەتی‌و خۆشەویستیتان دەبێتە دوژمنایەتی‌و رق لێك بون‌و بوغزو كینە!

رابەرو پێشەواكانتان خۆیان لەشوێنكەوتوانیان بێ بەری دەكەن‌و شوێنكەوتوان نەفرین لەپێشەواكانیان دەكەن، وەكوو لەچەند شوێنی تری قورئاندا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾(الأعراف/٣٨) یان دەفەرموێ: ﴿الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾(الزخروف/٦٧). كارتان بەوە شەوە ناوەستێ، بەڵكوو ﴿وَمَأْوَاكُمْ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ سەرەنجام‌و شوێنی حەوانەوەتان ئاگری دۆزەخە، كەسیشتان دەست ناكەوێ یارمەتدەرتان بێ‌و لەعەزابی خودا رزگارتان بكا!

بەكورتى حەزرەتى ئیبراهیم پێیان دەفەرموێ: ئێوە ئەو بتانە دەپەرستن، پەرستنەكەتان چاولێكەری‌و موجامەلەكردنی یەكترییە، بیرو باوەڕی هەڵقوڵاو لەناخەوە نیە، هەمئاهەنگی یەكتری دەكەن لەبتپەرستی‌داو هەریەكەتان لەبەر رازیكردنی دڵی ئەویتریان ئەگەر حەقیشی بۆ ئاشكرا ببێ‌و بزانێ عیبادەتكردنەكەی هەڵەیە هەر وازی لێ ناهێنێ، بۆ ئەوەی برادەری‌و دۆستایەتییان تێك نەچێ لەسەر حیسابی عەقیدەو باوەڕ، وەكوو چۆن ئێستا زۆر لەهاوەڵانی حیزبەكان لەرێگای برادەری‌و دۆستایەتییەوە بەڕواڵەت كۆ دەبنەوەو هاوڕێ بۆ رەزامەندیی هاوڕێ خۆڵەو حیزب‌و ئەم حیزبەدا تۆمار دەكا؟! جا ئەگەر بەرژەوەندییان لەو حیزبەدا پارێزراو بوو، ئەوە زیاتر دڵی پێ خۆش دەكاو تا بەرژەوەندییەكە پایەدار بێ خۆپاڵدانەكەی بۆ لای حیزبەكە بەرقەرارە، كەواتە: ئینتیمائەكە چاولێكەری‌و خزمایەتی‌و دۆستایەتییە، لەسەر بنەمای عەقیدەو باوەڕی قووڵ نیەو لەناخەوە نیە. بۆیە: كە حیزبێك هەرەس دێنێ دەبینی زوربەی زۆری ئەندامانی عەریزەی بەرائەت دەنووسن‌و پەشیمانی خۆیان رادەگەیەنن.

ئیتر بانگەوازی ئیبراهیم بۆ گەلەكەی كۆتایی پێ دێ‌و جگە لەژنەكەی خۆی‌و لوطی برازای كەسی تر ئیمانی پێ نەهێنا. هەر حەزرەتی (لوط)یش لەئۆڕی كلدانیەكانی عیراقەوە لەگەڵی‌دا كۆچی كرد بۆ وڵاتی فەلەستین.

وەكوو دەفەرموێ: ﴿فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي﴾ كە ئیبراهیم لەئاگر رزگاری بوو، (لوط)ی برازای ئیمانی پێ هێناو بڕوای بەپێغەمبەرایەتیەكەی كرد.

لوط: كوڕی هارانی كوڕی ئازەرە، لەنەتەوەی ئیبراهیم جگە لەحەزرەتی لوطو سارا خاتون كەسی تر ئیمانی پێ نەهێنا ئەمجار ئیبراهیم بەنەتەوەكەی فەرمووی: من وڵاتی ئێوە بەجێ دێڵم‌و سەری خۆم هەڵدەگرم، دەڕۆم بۆ شوێنێك: كە خودا فەرمانم پێ دەكا بچم بۆی. بەفەرمانی خودا لەوڵاتی عیراقەوە كۆچی

کرد بۆ وڵاتی حەڕان ئەمجار لەوێوە چوو بۆ فەلەستین‌و حەزرەتی (لوط)یش لەشاری (سدوم) جێگیر بوو.

﴿إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ بێگومان خودای من خاوەن دەسەڵات‌و باڵا دەستە لەبوونەوەردا، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا، بەقودرەتی خۆی لەدوژمنانم دەمپارێزێ‌و بەسەریاندا سەرکەوتووم دەکا، حەکیم‌و دانایە لەبەڕێوەبردنی مەخلووقاتی خۆیدا، هەر شتێك سودو قازانج نەبێ فەرمانی پێ ناکا. هەر شتێك زیانی تێدا بێ نەهی لێ ناکا!.

کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي﴾ بێژەرەکە حەزرەتی ئیبراهیمە، راناوەکە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، وێ دەچێ بێژەر حەزرەتی لوط بێ‌و راناوەکە بۆ ئەو بگەڕێتەوە. چونکە نزیکترین مەرجیع بۆ راناوەکە حەزرەتی لوطە. بەقاعیدەی نەحویانیش (إذا دار الضمير بين القريب والبعيد فللقريب أولى) کەوابێ هەر بچێتەوە بۆ لوط باشترە.

بێژەر هەر کامێکیان بێ، چ لەمەوزعەکە ناگۆڕێ، گرنگ ئەوەیە: کۆچەکەی بۆ لای خودا بووە، بەمەبەستی رەزامەندی خودا بووە، لەناخەوە بەبیروباوەڕەوە هیجرەتی کردوە، بەدڵ‌و بەگیان بەگۆشت‌و ئێسقانەوە بۆ رەزامەندیی خودا کۆچی کردوە، لەتاو ئایینی‌و بۆ پاراستنی بیرو باوەڕی، زێدو نیشتمانی جێ هێشتووە، لەبەر خاتری خودا دەستی لەکەس‌و کارو ماڵ‌و سامان‌و وڵات هەڵگرتووە. چونکە مانەوەی لەناو وڵاتی کوفرو گومڕاییدا بێ سود بوو، دژایەتی‌و سەررەقی گەل‌و نەتەوەکەی گەیشتبووە ئاستێك تەحەممول نەکرێ.

ئەمجار پەروەردگار نازو نیعمەتی خۆی بەسەر ئیبراهیمدا دەژمێرێ، ئەوە رادەگەیەنێ: کە ئیبراهیم لەدونیاو قیامەتدا بەختەوەرە، چونکە بەدڵسۆزیی خودا پەرستی کردوە. دەفەرموێ:

١- ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ﴾ بەخشیمان بەئیبراهیم دوای ئیسماعیل، ئیسحاق، واتە: لەحالەتی پیریو کەنەفتیدا پاش ئەوەی ئیسماعیلمان پێ بەخشیبوو ئیسحاقیشمان پێ بەخشی، هەروەها ئیسحاق بۆ زێدە فەضلو بەخشش یەعقوبمان پێ بەخشی، کە دەبێتە کوڕەزای.

٢- ﴿وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾ رەخساندمان لەوەچەو نەوەی ئیبراهیم دا پێغەمبەرایەتی، هەموو پێغەمبەران لەدوا رۆژگاری ئیبراهیم لەنەوەو وەچەی ئەون، هەموو پێغەمبەرانی نەتەوەی ئیسرائیل تا دوا پێغەمبەریان: کە حەزرەتی عیسایە دەچنەوە سەر یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم، بۆیە ئەم زاتە بەبابە گەورەی پێغەمبەران دەناسرێ، هەموو ئەم پێغەمبەرانە مزگێنی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمانیان بەگەلو نەتەوەکانی خۆیان داوە!

هەروەها نامەی ئاسمانیمان ناردۆتە خوارێ بۆ ئەو پێغەمبەرانەی لەژرۆیتی حەزرەتی ئیبراهیم بوون، تەورات بۆ موساو زەبوور بۆ داودو ئینجیل بۆ عیساو قورئان بۆ حەزرەتی موحەممەد ﷺ.

٣- ﴿وَآتَيْنَاهُ أَجْرَهُ فِي الدُّنْيَا﴾ لەدونیادا پاداشمان دایەوە، قەرەبووی واز هێنان لەماڵو خزمو هۆزو نیشتمانمان بۆ کردەوە، بەوە ماڵو منداڵی زۆرمان پێ بەخشی، خێزانی باشو گونجاومان بەنسیب کرد، هەموو کەس بەچاکە باسی دەکەن، پەیڕەوکاری هەموو ئایینەکان خۆشیان دەوێو دەڵێن: لەئێمەیە.

٤- ﴿وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنْ الصَّالِحِينَ﴾ بێگومان رۆژی قیامەتیش ئیبراهیم لەپێڕی پیاوچاكو خۆشەویستانی خودادا حەشر دەكرێو لەبەهەشتدا جێگای بەرزو خۆشی دەدرێتێ. خاوەن پلەو پایەی تایبەتییە لەبەهەشتدا.

## چیرۆكی حەزرەتی لوط (عليه السلام) لەگەڵ گەلەكەیدا

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ

ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

دوا بەدوای گێڕانەوەی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم دێتە سەر چیرۆکی حەزرەتی لوط (درودی خودا لەهەردوکیان) دەفەرموێ: ﴿وَلُوطاً إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەمەبەستی عیبرەتو ئامۆژگاری چیرۆکی پێغەمبەری خودا (لوط) بۆ گەلەکەت بگێڕەوە، کاتێك خودا کردی بەپێغەمبەرو ناردی بۆ سەر دانیشتوانی (سدوم)، لەناو ئەو گەلو نەتەوەیەدا دابو نەرێتێکی ناشیرین بڵاو بوبوەوە، دیاردەیەکی ناشیرینو ناسروشتیو قێزەون لەناویان بوو بوو بەخۆو پەیڕەویان دەکرد، ئەویش دیاردەی نێربازیی بوو، ئەم دیاردەیە ئەوان دایانهێنا بوو پێش ئەوان کەس ڕەچاوی نەکردبوو، بۆیە حەزرەتی لوط ناڕەزامەندیی خۆی لەو کارە دەربڕیو پێی گوتن: ئێوە کارێکی ناشیرینو ناسروشتی پەیڕەو دەکەن، ئەو کارە ناشیرینەی ئێوە فاحیشەیەکە پێش ئێوە کەس نەیکردوە، ئێوە داهێنەرنی.

﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ﴾ ئەوەتا ئێوە نێربازیی دەکەن، دەچنە لای نێرینە وەکوو چۆن بەشێوەیەکی سروشتی دەچنە لای ئافرەت ﴿وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ﴾ دەچنە سەر ڕێبازی ڕێبوارو غەریبە، ماڵیان لێ دەستێنن، چەتەییو ڕاووروت دەکەن، هەر کەسێکتان دەست کەوت دەیگرنو سواری دەبن!!

﴿وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمْ الْمُنكَرَ﴾ ئێوە لەکۆڕو مەجلیستاندا، کردەوەو گوفتاری ناشیرین دەکەن! بەبێ ئەوەی کەسێکتان تێدابێ بەرهەڵستیتان بکا، بەئاشکرا لە

دیوەخانـەکانتاندا بـەپێش چاوی یەکترییـەوە سـواری یـەکتری دەبـن. هـیچ شـەرم لەیەکتر ناکەن؟ ئەمەش ئەوپەڕی ئەخلاق روخانو سروشت تێکچوونە.

ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ: گـەلی لـوط وێـڕای نێربـازیی تـاوانی تریـشیان ئەنجام دەدا، لەناو خۆیاندا ستەمیان لەیـەکتری دەکـرد، جنێوو قـسەی ناشـیرینیان بەیەکتری دەگوت: لەکۆڕو مەجلیسدا بەبێ شەرمانە تڕیان لـێ بـەردەبوو؛ بـەڵکوو بەئەنقەست شەڕە تڕیان دەکرد!! هـەر کەسـێك رێبـوار بوایـەو بەناوچـەو هـەرێمی ئەواندا تێپەڕبوویایە بـەردەبارانیان دەکـرد، قومـارو شـەترەنجیان دەکـرد، پۆشـاکی گولگولاویو رەنگکراویـان لەبـەر دەکـرد، شـەڕە کەڵەشـێرو شـەڕە بـەرازیان دەکـرد، دەستو پەنجەیان خەناوی دەکـرد، پیاویـان لاسایی ئـافرەتی دەکـردەوەو ئافرەتیـان لاسایی پیاویانی دەکردەوە، باجو گومرگیان لەرێبواران دەستاند. وێڕای ئەم تاوانانە هاوەڵیشیان بۆ خودا دادەنا، ئەو گەلو نەتەوە یەکەم کـەس بـوون: کـە لـوطیـەتـیو هەتیوبازییان داهێنا.

شـایانی باسـە لێـرەدا چـیرۆکەکە بـەکورتی رادەنوێنـدرێ، وا پێدەچـێ حەزرەتی لوط هەر لەسەرتاوە بەشێوەی پەنـدو ئامۆژگـاری نـەهی لـێ کـردون لـەو کـارە ناشـیرینەو ئـەوان سـوور بـوون لەسـەر ئەنجامـدانی. ئـەمجار حـەزرەتی لـوط هەڕەشەی لـێ کردونو لەعـەزابی خـودا ترسـاندونی، سەرزەنـشتو لۆمـەی کـردون، بـەلام گەلەکـەی بـەهیچ جـۆرێ ئامۆژگارییـەکانی حـەزرەتی (لـوط)یـان بـەگوێدا نەچوە، گاڵتەو قەشمەرییان بەهەڕەشەکانی هاتووە، دەفـەرموێ: ﴿فَمَا كَـانَ جَـوَابَ قَوْمِهِ إِلاَّ أَنْ قَالُوا ائْتِنَا بِعَـذَابِ اللَّـهِ إِنْ كُنـتَ مِـنْ الـصَّادِقِينَ﴾ وەلامـی گەلەکـەی هـەر ئەوەندە بوو پێیان گوت: ئەگەر راست دەکەی، ئەو عەزابە خوداییەمان بۆ بێنـەو بێ منەت بە. وا دیارە ئەم وەلامو هەڵوێستەیان لەسـەرەتادا بـووە، ئـەگینا: کـە لـوط پـەرەی بـەئامۆژگاریو جڵەوگیرییـەکانی خـۆی داو ئیلحـاحی لـێ کـردن، ئـەوانیش

هەرمشەیان ئاراستە کردوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾(الأعراف:٨٢).

جا: کە حەزرەتی لوط نائومێد بوو لەئیمانهێنانی گەلەکەی داوای لەپەروەردگار کرد: کە یارمەتی بدا ﴿قَالَ رَبِّ انصُرْنِي عَلَى الْقَوْمِ الْمُفْسِدِينَ﴾ حەزرەتی لوط داوای لەخودا کردو وتی: خودایە! یارمەتیم بدە بەسەر قەومی فاسیدو ئەخلاق روخاودا، بەسەر تاقمو پێرو گرۆهێکدا فاحیشە لەسەر زەوی بلاو دەکەنەوە.

ئاشکرایە هەر پێغەمبەرێك دوعای لەگەلەکەی کردبێ، کاتێك ئەو دوعایەی لێ کردون: کە زانیبیەتی‌و دڵنیا بووبێ: کە هیچ خێرو بێرێك لەمانەومیاندا نیە. تا لێیان هیوا براو نەبووبێ دوعای فەوتانی لێ نەکردون، وەکوو حەزرەتی نوح فەرمووی: ﴿إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِراً كَفَّاراً﴾(نوح/٢٧).

ئیتر لێرەدا سییاقی قورئان پەردە بەسەر دوعاو نزاکردنی حەزرەتی (لوط)دا دادەداتەوەو دیمەنی بەهانا هاتنی خودا بۆی رادەنوێنێ‌و فریشتە دێن بۆ لەناو بردنی گەلی لوط لەرێگایاندا دیدەنی ماڵی حەزرەتی ئیبراهیمیان کردو موژدەی بەخشینی کورێکی صالح‌و دڵسۆزیان پێ دا لەخاتو سارای خێزانی: کە لەوەپێش نەزۆك بوو. دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُو أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ﴾ جا کە فرستادەکانی ئێمە هاتنە ماڵی ئیبراهیم‌و موژدەی مندالبوونیان پێدا، وتیان: ئێمە دانیشتوانی ئەم شارە واتە: ئەو شارەی قەومی (لوط)ی لێ بوو لەناودەبەین‌و دەیانفەوتێنین، چونکە ئەوان گەل‌و نەتەوەیەکی ستەمکارن. ستەمیان لەخۆیان کردوە بەوە: کە پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستۆتەوەو سوورن لەسەر فەسادو بلاوکردنەوەو رەوشتی نێربازیی.

ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم تینی بۆ هات‌و دەستی کرد بەداکۆکی کردن‌و بەرپەرچدانەوەی فریشتەکان، داوای لێ کردن مۆڵەتیان بدەن‌و کارەکەیان

دوابخەن، بەڵكوو خودا هیدایەتیان بداو موسوڵمان بن، پەرۆشی حەزرەتی (لوط)ی برازایشی بوو ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطاً﴾ وتی: چۆن ئێوە ئەو كارە ئەنجام دەدەن‌و ئەو شارە وێران دەكەن؟ ئەی نازانن: ئەو شارەی ئێوە وێرانی دەكەن لوطی تێدایە، خۆ ئەو ستەمكار نیە، ئەو پێغەمبەری خودایە، ئاخر ئەویش بەردەكەوێ؟! ﴿قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَنْ فِيهَا لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلاَّ امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنْ الْغَابِرِينَ﴾ فریشتەكان وتیان: ئێمە باشتر دەزانین كێ تێدایە، ئێمە لوطو ماڵ‌و منداڵی‌و هەموو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە رزگار دەكەین، جگە لەژنەكەی ئەو لەپیری لەناوچووەكانە، ئەو جاسوس‌و چڵكاوخۆری كافرەكانەو یارمەتیدەرو راپۆرتدەرە بۆیان، هەمئاهەنگی شرواڵ پیس‌و ئەخلاق روخاوەكانە.

ئەمجار لەشێوەی كۆمەڵێك كوڕی لاوی جوانخاص‌دا چون بۆ ماڵی لوط عليه السلام.

﴿وَلَمَّا أَنْ جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً﴾ كە ئەم كۆمەڵە فریشتە فروستادانەی ئێمە هاتنە ماڵی لوط لەشێوەو روخساری كوڕی لاوی جوانخاص‌دا، حەزرەتی لوط تەنگەتاو بوو، ترسی لێ نیشت گەلەكەی پێیان بزانن‌و دەستدرێژی بكەنە سەریان! ﴿وَقَالُوا لا تَخَفْ﴾ وتیان: تۆ خەمی ئێمەت نەبێ‌و لەوە مەترسە ئەوانە بتوانن ئەزیەتی ئێمە بدەن!

﴿وَلا تَحْزَنْ﴾ خەمی ئەوەشت نەبێ: كە ئێمە چییان پێ دەكەین‌و چۆن لەناویان دەبەین! ئێمە هاتووین بۆ لەناو بردنیان بەعەزابی بەشیدەت ﴿إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلاَّ امْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنْ الْغَابِرِينَ﴾ ئێمە خۆت‌و شوێنكەوتوانت رزگار دەكەین‌و ئەو عەزابە نایانگرێتەوە جگە لەژنەكەت، ئەو لەپیری لەناوچوانە، چونكە ئەو لەگەڵ ئەواندا هاریكارو هەمئاهەنگە. داكۆكییان لێ دەكاو رازییە بەكردەوە ناشیرینەكانیان!

﴿إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزاً مِنْ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ ئێمە نازڵ دەكەین بۆ سەر ئەهلی ئەم شاری سەدومە عەزابێكی توندو تیژو بێ ئامان

لەئاسمانــەوە، ئــەوەش بــەهۆی ئــەو فیــسق و تاوانــەی تێیــدا نــوغرۆ بــوون. عەزابەكەشیان بریتی بوو لە بومەلەرزەیەكی وەها: كە بەزەویدا بردنیە خواریْ، شوێنی شارەكەیان چاڵ بوو، دەریاچەی مەشهوور بە(دەریاچەی لوط)ی لێ پەیدا بوو، ئەوە بوو: حەزرەتی جوبرائیل شارو ولاتی وەكوو پارچە لەزەوی پچڕی و لەناخی زەوی جیای كردنەوەو بەرزی كردنەوە بۆ ئاسمان و پارچە زەوییەكەیانی بەهەڵگەڕاوەیی كێشایەوە زەویدا بەخان و ماڵ و بەردو دارو ئاژەڵ و خۆیانەوە بەسەریەكدا ترشان، ئەمجار ئاگرباران و بەردەبارانی كردن، بەردەباران كردنەكەیان بەردە سواڵەت بوو، هەموو بەردێك دیاری كرابوو رێی كێ بكەوێ و كێ لەناوبەرێ. بێگومان گەلی لوط رۆژی قیامەت سزایان لەهەموو كەس زۆرترو توندترە. بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان بڕێ شوێنەواری شارە روخاوەكەیانمان هێشتۆتەوە بۆ ئەوەی ئادەمیزادانی دوا ئەوان پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن، هەندێ لەشوێنەوارەكانیان یان هەواڵ و چیرۆكی بەسەرهاتیان ئاشكراو عەیانە بۆ كەسێك دیقەتیان لێ بكاو تێیان بفكرێ. وەكوو لەئایەتێكی تردا خیطاب ئاراستەی قورەیشییەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ. وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾(الصافات/١٣٧-١٣٨).

## چیرۆكی حەزرەتی شوعەیب و هودو ساڵح و موسا (درودی خوایان لەسەر بێ)

﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى

دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار چـیرۆکی حـەزرەتی نـوح و ئیـبراهیم و لـوطی گێڕایەوە، بەشوێن ئەو چیرۆکانەدا چیرۆکی حەزرەتی شوعەیب و هودو صالح و موسای بەشـێوەیەکی چـڕو پـڕ ڕانوانـد، ئەمـەش بەمەبەسـتی ئامۆژگـاری و پەنـد وەرگرتن لەحاڵ و وەزعی ئەوان و هەڵس و کەوت و سەرەنجامی گەلەکانیان.

دەفەرموێ: ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُـدُوا اللَّـهَ وَارْجُـوا الْيَـوْمَ الآخِرَ وَلا تَعْثَوْا فِي الآرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ ڕەوانـەمان کـرد بـۆ سـەر دانیـشتوانی مەدیـەن

پێغەمبەری ڕێزداری خۆمان؛ کە ناوی شوعەیب بوو ئەهلی ئەو شارەش بوو، بانگەوازی کردن بۆ ئیمانهێنانو فەرمانی پێ کردن بەعیبادەتکردنی خوداو یەکتاپەرستیو دڵسۆزیی لەعیبادەت کردندا، داوای لێ کردن تێبکۆشن بۆ ژیانی قیامەتو هەوڵ بدەن خودا لەخۆیان ڕازیی بکەن، بترسن لەعەزابو عیقابی پەروەردگار خۆیان لەعەزابی قیامەت بپارێزن، جڵەوگیری لێ کردن لەوەی: کە فەسادو ئاشوب لەسەر زەوی بڵاوبکەنەوە، نەهی لێ کردن لەتەرازووبازیو چەتەییو ڕێگریو هەموو تاوانێکی تر. بەڵام ئەو گەلە بەدبەختە چارەڕەشە بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نەهاتن ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ حەزرەتی شوعەیبیان بەدرۆ خستەوە، بەرویدا هەڵشاخانەوە، سەرڕەقیو سوربوونی خۆیان لەسەر کوفرو بێدینی دوپات کردەوە، ئیتر خودا بەراتڵەقاندنی زەوی لەناوی بردن، بومەلەرزەیەکی بەهێز لێی دان، خانووبەرەی تێك روخاندنو زەنەدەقی بردن، لەماوەیەکی کورتدا سلاربوونەوەو بەسەریەکدا خپ بوون! سەرگوزشتەی گەلی شوعەیب لەسورەتی (الأعراف)و سورەتی (هود)و سورەتی (الشعراء)دا گێڕدراوەتەوە.

ئەمجار دێتە سەر ڕانواندنی چیرۆکی حەزرەتی هودو صالحو دەفەرموێ: ﴿وَعَاداً وَثَمُودَ وَقَدْ تَبَيَّنَ لَكُمْ مِنْ مَسَاكِنِهِمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ﴾ واتە: هەروەها گەلی عاد: کە حەزرەتی هود پێغەمبەریان بوو، زێدو نیشتمانیان وڵاتی (الأحقاف) بوو نزیك (حضرموت)ەو کەوتۆتە وڵاتی یەمەنەوە. بەعەزابی سەختی خۆمان لەناومان بردن.

هەروەها گەلی ثەموود: کە حەزرەتی صالح پێغەمبەریان بوو، دانیشتوی ناوچەی (الحجر) بوون، نزیکی (وادي القرى): کە کەوتۆتە نێوان وڵاتی حیجازو وڵاتی شامەوە. سەرپێچییان کردو بەعەزابی سەختی خۆمان قەڵاچۆمان کردن، (مدائن صالح) هەتا ئەمڕۆش شوێنەواری ماوەو قوڕمیشییەکان شارەزای

شوێنەوارەکانیان بوون، لەکاروانی هاوێنانیاندا بەسەر کەلاوە کۆنەکانیاندا تێپەڕ دەبوون.

دەی ئێوە ئەی دانیشتوانی مەککەو ئەی موشریکەکانی عەرەب؛ ئەوە بەهیلاکچونی گەلی عادو ثەمودتان بۆ ئاشکرا بووە بەهۆی کەلاوە کۆن‌و شوێنەوارەکانیانەوە، دەزانن چۆن لەناوچون‌و چۆن عەزاب دراون. بێگومان ئەوانە شەیتان کوفرو بێدینی لەلا جوان کردبون‌و هەڵی نابوون بۆ ئەوەی عیبادەتی غەیری خودا بکەن‌و تاوانی گەورە ئەنجام بدەن، کەسانی دیکە گومڕا بکەن‌و لەرێگەی راست لایان دەن، خۆ ئەگەر تێفکرینیان هەبوایە، دەیانتوانی رێبازی راست پەیرەو بکەن، خۆیان توشی ئەو عەزاب‌و لەناوچوونە نەکەن، چونکە عاقڵمەندو هۆشیار بوون، دەیانتوانی واز لەبتپەرستی بهێنن‌و روبکەنە خوداپەرستی، کەوابوو ئەوان عوزرو بیانوویان نیە لەوەدا؛ کە ئیمانیان بەخودا نەهێناوە، ئەوان بەئەنقەست هێزی بیرو تێفکرینی خۆیان لەکار خستووەو هێزە دەروونیەکانی خۆیان نەخستۆتە گەڕو بیریان لەسەرەنجامی بیرو بۆچون‌و کردەوەی خۆیان نەکردۆتەوە!

ئایا ئەوانە جێگای ئەوە نین: کە کەسانی دیکە پەندیان لێ وەربگرن؟ بێگومان عاقڵمەند کەسێکە پەند لەبەسەرهاتی کەسانی تر وەربگرێ.

ئەمجار دێتە سەر رانواندنی چیرۆکی حەزرەتی موساو دەفەرموێ: ﴿وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ﴾ بێگومان قارون‌و فیرعەون‌و هامانمان لەناوبردن: قارون خاوەن ماڵ‌و سامانی زۆرو زەبەندە بوو، فیرعەون پاشای میصر بوو لەسەردەمی موسادا، هامانیش وەزیری فیرعەون بوو، نموونەی طاغوت‌و سەرپێچیکاری سەردەمی خۆیان بوون ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مُوسَى بِالْبَيِّنَاتِ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ﴾ حەزرەتی موسا بەبەڵگەو موعجیزەی ئاشکراو بەهێزەوە هاتە سەریان‌و بانگەوازی کردن بۆ خوداپەرستی‌و یەکتاپەرستی. بەڵام ئەوان تەکەببوریان کردو خۆیان

بەزل زانیو بڕوایان بەموسا نەکردو ئیمانیان پێ نەهێنا. بەدرۆیان خستەوە، وتیان: ئەتۆ پێغەمبەر نیت، بڕوایان بەهەبوونی خودایەکی خاوەن دەسەڵات نەکرد، بەراستی بەهەڵە چونو تاوانبارو موفسیدو گومڕابوون، لەچنگ خودا قوتار نەبوونو هەڵاتنیان بۆ نەکرا، نەیانتوانی عەزابی خودا لەخۆیان دوور بخەنەوە. بەڵکوو عەزابی خودا یەخەی گرتنو تێکیەوە پێچانو لەناوی بردن، بێگومان پەروەردگار بالادەستو خاوەن دەسەڵاتە، هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا.

﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا﴾ ئەو گەلو نەتەوە ستەمکارانەمان لەناو برد، هەریەکەیان بەتاوانی خۆی گیرۆدە بوو، هەموو گەلو نەتەوەیەك لەوانە سزای شیاوی خۆی وەرگرت، هی وایان هەبوو ڕەشەبای بەهێزمان ناردە سەریان، ڕەشەبایەکی بەهێزی وامان ناردنە سەر چەوو زیخی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرتو دەیکێشا پێیاندا، بەڵکوو ئادەمیزادەکانی لەزەوی هەڵدەگرتو لەبەرزاییەوە دەیکێشانەوە بەزەویدا دەبوونە جەستەیەکی بێ گیانو سلارەوە بوو!

﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ﴾ هەیانبوو گرمەو ناڵەی بەشیدەت لێی دانو بەو دەنگە زەندەقبەرە لەناومان بردن!

﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ الْأَرْضَ﴾ هەیانبوو بەناخی زەویدا بردمانە خوارێ، وەکوو قارون: کە بەماڵو سامانی خۆی نازیو بوغڕابوو. لەخودا یاخی بوو، تەکەببورو جەبەروتی نواند، خودا بەماڵو سامانو گەنجو خەزێنەیەوە بەناخی زەویدا بردیە خوارێ!

﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا﴾ هەیانبوو لەناو دەریادا خنکاندمان، وەکوو چۆن فیرعەونو هامانی وەزیریمان لەگەڵ هەموو دارو دەستەی فیرعەوندا نوغرۆی ئاومان کردن ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ جا وەنەبێ

پەروەردگار بەم سزادانەی: کە ئەو سەرپێچیکارانەی پێ سزادان ستەمی لێ کردبن بەڵکوو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردو سزادانەکەیان پڕاوپڕی تاوانەکانیانە.

## حاڵو وەزعی بتپەرستەکان دەق دەشوبهێتە حاڵی جاڵجاڵۆکە

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کە ئەوانەی موشریكو بتپەرست بوون، خودا بەسزای دونیایی لەناوی بردن، عەزابی قیامەتیشیان زۆر سەختو کوشندەیە. ئەو خودا درۆزنانەیان نەلەدونیادا فریایان کەوتنو سزایان لێ گێڕانەوە، نەلەقیامەتدا سودیان بۆیان دەبێ. ئەمجار دوا بەدوای ئەو رونکردنەوەیە حاڵو وەزعی ئەو موشریکانە تەشبیە دەکا بەحاڵو وەزعی جاڵجاڵۆکە: کە خانوو دروست دەکا بۆ ئەوەی لەزیانو کارەسات بیپارێزیو تێیدا بحەوێتەوە، بەڵام لەواقیعدا ئەو خانوە لەهیچ شتێك نایپارێزێ. ساردو گەرمی لێ

دوور ناخاتەوە. بەم لێکچواندنو تەشبیهە دەیەوێ حەقیقەتێك رون بکاتەوەو ئەوە رابگەیەنێ: کە لەبوونەوەردا هێزێکی رەهاو موطلەق هەیە: کە هێزو دەسەلاتی خودایە، جگە لەو هێزە رەهایە یەزدانییە هێزو تواناکانی مەخلووقات زەبونو بێ وەجن، پارێزگاری هیچیان پێ ناکرێ، هەر کەسێك پشتیان پێ ببەستێو بەهیوا بێ سزای لێ دوور بخەنەوە، دەق دەشوبهێتە ئەو جالْجالْۆکە بەستەزمانە زەعیفە: کە پەنا دەباتە بەر ئەو تەندراوە تەنکەڵەی هیچ شتێك لێی ناگەرێتەوە. بوونو نەبوونی وەکوو یەك وایە.

دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً﴾ واتە: نەزیلەو مەثەلو نموونەی ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو لەجیاتی پەروەردگار بتو صەنەم دەپەرستنو بەتەما یارمەتیو سودو قازانجن لێیان، پەرستشیان بۆ دەکەن بەهیوای ئەوەی لەکاتی تەنگانەدا بەهانایانەوە بێن، دەق دەشوبهێتە حاڵو وەزعی جالْجالْۆکە لەزەبوونیو لاوازیدا، خانووی کردوە گەرماو سەرمای لێ دوور بخاتەوە، زیانو خەتەری لێ بگێرێتەوە. بەلام هیچ کامێکی لەمانە بۆ دەستەبەر نابێ، کاتێك پێویستی بەپاراستن بێ نایپارێزێو هیچ زیانێکی لێ دوور ناخاتەوە. رۆژی قیامەت کردەوەی ئەو کافرانەش (کە بەتەما پەرستشو کردەوەکانیانن) چاوەروانن پەرستراوەکانیان شەفاعەتیان بۆ بکەن، بەلام هیچ کامێ لەمانەیان بۆ دەستەبەر نابێ، دەق وەکوو حاڵی جالْجالْۆکە وایە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُوراً﴾(الفرقان:٢٣).

ئەمجار بێ هێزیی خانووی جالْجالْۆکە رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ بێگومان زەعیف ترین خانوو خانووی جالْجالْۆکەیە، بەکەمترین هێز دەروخێ، ئاسەوارێکی نامێنێ، کارو کردەوەی ئەو کافرانەش رۆژی قیامەت هیچ سودێکیان نیەو دەبنە تۆزو با. جا ئەگەر ئەوان تۆزقاڵێك زانیارییان بوویایەو بیانزانیایە: کە بتەکانیان؛ خودا

درۆزنەکانیان هیچ سودیان پێ ناگەیەنن، ئەو پەرستش‌و بتپەرستی‌یەیان نەدەکرد، وەلێ لەراستی‌دا ئەوان لەئەوپەڕی نەفامی‌و نەزانی‌دان‌و هیچ لەئاکام‌و سەرەنجامی شتەکان نازانن بۆیە بەتەمای سودی ئەو بتپەرستی‌یەن بەهیوان ئەو خودا درۆزنانە فریایان بکەون.

ئەمجار جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: کە ئەو پەرستراوانە هیچ نین‌و هیچیان پێ ناکرێ، هەڕەشەی لەعیبادەتکەرەکانیان کردو فەرمووی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ﴾ بێگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەحاڵ‌و وەزعی ئەوانەی ئێوە جگە لەخودا پەرستشیان بۆ دەکەن، دەزانێ: کە ئەوبت‌و صەنەمانەی ئێوە دەیانپەرستن نەسود دەگەیەنن نەزیان. هەر کاتێ خودا بیەوێ زیانتان پێ بگەیەنێ ئەو پەرستراوانەتان ناتوانن هیچ یارمەتیتان بدەن. نموونەی ئەوانە لەبێ سودی‌دا وەکوو خانووی جاڵجاڵۆکە وایە.

وێ دەچێ ماناکە بەم جۆرە بێ: ئەوانەی ئێوە جگە لەخودا دەیانپەرستن هیچ نین، ئەوەندە بێ نرخ‌و بێ دەسەلاتن بەهیچ حسێبن.

﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ﴾ پەروەردگار بالادەست‌و خاوەن دەسەلاتە بۆ تۆڵەستاندنەوە لەوانەی پێی کافرن‌و هاوەڵی بۆ بەرەوا دەزانن، دەی کەوابێ ئەی بێ بڕواو موشریکەکان خۆتان لەعیقاب‌و تۆڵەی خودا بپارێزن بەئیمانهێنان، پێش ئەوەی سزاو تۆڵەی سامناکی نازڵ بێ بۆ سەرتان، پەندو عیبرەت لەگەل‌و نەتەوەکانی پێشوو وەربگرن، با ئێوەش بەدەردی ئەوان نەچن. دڵنیابن هەر کاتێ عەزابی خودا بێتە سەرتان، ئەو بت‌و صەنەمانەی ئێوە بەخودایان دەزانن‌و پەرستشیان بۆ دەکەن هیچ سودێکیان بۆتان نابێ. ﴿الْحَكِيمُ﴾ خودا داناو لێزانە لەکارەکانی‌دا، لەهەڵسوڕاندنی بوونەوەردا، لەبەڕێوەبردنی مەخلووقاتی‌دا، هەر کەسێ شیاوی فەوتان‌و سزا بێ دەیفەوتێنێ، کەسێکیش شیاوی مانەوە بێ دەیهێڵێتەوە.

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾ ئەو پەندو مەثەلانە لەقورئاندا بۆ ئادەمیزاد لێ دەدەین، ئەو نموونەو نەزیلانەی بۆ دێنینەوە، بۆ ئەوەی ئەو شتانەی لەبیرو بۆچونیان دوورە لێیان نزیك بكەینەوە، ئەو شتانەی لێیان تێ ناگەن بۆیان رون بكەینەوە ئەو حوكمو یاسایانەی تێی ناگەن یان لەزیهنیان یاخی بووە بۆیان بەیدەست بێ و لەناوەرۆكەكەی حاڵی بن و سودو قازانجەكانیان بزانن.

﴿وَمَا يَعْقِلُهَا إِلاَّ الْعَالِمُونَ﴾ لەو پەندو مەثەلانە حاڵی نابێ، لەحەقیقەتیان ناگا، مەگەر كەسانێك: كە زاناو تێگەیشتوون لەمەسائیل و قەضییەكان ورد دەبنەوە.

هاوەڵی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ جابیر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوەو فەرمووی: ﴿العالم من عقل عن الله تعالى فعمل بطاعته واجتنب سخطه﴾ پەروەردگار بەم ئایەتە رەدی موشریكەكانی قورەیشی دایەوە: كە بەگاڵتەو لاقرتێ كردنەوە، دەیانگوت: خودای موحەممەد باسی مێش و جاڵجاڵۆكە دەكا، سەیرە ئەو سەررەق و ملهوڕانە ئەم تەصویرە قورئانییە نەیهەژاندن چونكە عەقڵیان نەبوو، نەفام و نەزان بوون.

## دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی و سودی خوێندنی قورئان و نوێژكردن

﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ

ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی بەئادەمیزاد کرد: کە ئیمان بهێنن، بێ بناغەیی بتپەرستی رون کردەوە، بەلگەو دەلیلی موشریکەکانی پوچ کردنەوە. ئەمجار لێرەدا سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ لای خودایەك: کە شیاوی عیبادەت بۆ کردنەو هیچی لێ یاخی نابێ. بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، رێبازی خوداپەرستیو طاعەتی بۆ بەندەکانی رون کردۆتەوە.

دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ پەروەردگار ئاسمانەکانو زەوی بەدیهێناونو بەو شێوە جوانو بێ خەوشییە خولقاندونی، تا ئاماژە بن لەسەر بەدەسەلاتیو قودرەتی بێ سنووری، هەروەها بۆ ئەوەی ببنە کانی خێرو فەڕ بۆ ئێوەی ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی فائیدەی دینیو دونیاییتان لێیان دەست بکەوێ، ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان لەدروستکردنیان بەو شێوە رێكو پێکە نیشانەی ئاشکراو نمایان هەن لەسەر تاكو تەنهایی خودا، لەئولوهییەتو ربوبییەتدا، نهێنی ئەو بەلگەو نیشانانە کەسانێك لێیان حالی دەبنو هەستیان پێ دەکەن: کە خاوەن بڕواو یەقین بن، چونکە هەر ئەوان بوونەوەرو دیاردەکانی دەکەنە نیشانەی هەبوونی خودای تاكو تەنها.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە قورئان بۆ ئادەمیزاد بخوێنێتەوەو تێیان بگەیەنێو هەوڵ بدا زانیاری زیاتر بەدەست بێنن لەسەر تاكو تەنهایی خودا. دەفەرموێ: ﴿اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ ئەی پێغەمبەر ئەو نیگایەی بۆمان ناردوی بۆ مەردوم گەلەکەی بخوێنەوەو تێیان بگەیەنە. هەروا هەموو شوێنکەوتوویەکیشت بەگوێرەی تواناو بۆ گونجان پێویستە درێغی نەکاو قورئان بلاو بکاتەوەو لەموسولمانانی بگەیەنێو بانگەوازی کەسانی دیکەش بکا بۆ

پـەیڕەویکردنی پـەیامی قورئـان. چـونکە قورئـان نـورو هیدایـەتو ڕەحمەتـە، ڕێنومایی خێرو سەرفرازییە، چارەسەری نەخۆشیو تەنگژەو قەیرانەکانی پێیە!!

﴿وَأَقِمْ الـصَّلاةَ إِنَّ الـصَّلاةَ تَنْهَـى عَـنْ الْفَحْـشَاءِ وَالْمُنْكَـرِ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! خۆتو شوێنکەوتوانت نوێژەکانتان جێ بەجێ بکەن، نوێژی فەرزو سوننەت ئەنجام بدەن، ڕوکنو مەرجەکانیان بەرێكو پێکی جێ بەجێ بکەن. خوشوعو گەردنکەچی خۆتانی تێدا دەربـڕن، بێگومـان نوێـژی بەراسـتی ئینـسان لـەکاری خـراپو فیتنـەو ئاشوب دەگێڕێتەوە، هەر کەسێ نوێژی بەراستی بکا، کاری خراپی لـی ناوەشـێتەوە. نوێژ ڕەهنومایی ئیمانو دڵنیاییە، هۆی لابردنی خەمو ناڕەحەتییە. پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێ کارێکی گرنگی هاتبێتە پێش، توشی غەمو ناڕەحەتیەك بووبێ پەنای بۆ نوێژکردن بردوە.

طەبەرانی فەرمودەیەکی دەرهێنـاوە بەریوایـەتی عیمـرانو ئیبنـو عـەبباس بەمەرفوعی دەڵێن: پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (مـن لم تنهـه صلاته عـن الفحشاء والمنكر لم تزده من الله إلا بعدا) کەسێك نوێژەکەی جڵەوگیری لەخراپەو ئاشوب لێ نەکا، بەنوێژ کردنەکەی جگە لەدوورکەوتنـەوە لـەخودا هیچی تـری بـۆ دەسـتەبەر نابێ!

هـەروەها ئەحمـەدو نەسـائیو حـەکیمو بەیهـەقی لەئەنەسـەوە ڕیوایـەتیان کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (حبب إلي من دنياكم ثلاث: النـساء والطيـب وجعلت قرة عيني في الصلاة).

لەدونیای ئێوەدا سێ شتم لاخۆشن: ئافرەت، بۆنی خۆش، فێنکایی چاویـشم لەنوێژدا بۆ دەستەبەر دەبێ.

خوشوعو خضوع مەرجی سەرەکی نوێـژن، دەبـێ بەدڵسۆزییو بـەڵێبڕاویی ئـەنجام بـدرێ، دەبـێ نوێژکـەر هەسـت بکـا لەخزمـەت پـەروەردگاریدا وەسـتاوەو ئاخـاوەتن لەگـەڵ ئـەو دەکـا، گـەورەییو شـکۆمەندیی خـودای لـەدڵدا بـێ، ترسـی

عەزاب‌و تۆڵەی بۆ ئامانی هەبێ، ئەگەر نوێژەکە ئاوا نەبێ ئەو کاتە بریتی دەبێ لەجم‌و جۆڵ‌و ئاخاوتنێکی تایبەتی بۆ گیان! مەبەستە سەرەکیەکەی لێ وەدەست نایە!

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر گەورەیی نوێژ دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ﴾ نوێژ گەورەترین طاعەت‌و خواپەرستییە، خودا دەزانێ ئێوە چ کارێك ئەنجام دەدەن، خێرە یان شەڕە، دەزانێ دڵەکانتان چییان تێدا حەشار دراوە، نیەت‌و مەبەستتان چیەو چی نیە، بەراستی ئەمە وادەو هەڕەشەیە، هەڵنانی ئادەمیزادە بۆ مراقەبە کردنی خودا لەهەموو حاڵ‌و وەزعێکیاندا، چونکە کەسێك بزانێ خودا دەبینێ‌و ئاخاوتنی دەبیسێ، پێویستە حەیا لەخودا بکا، لەعەزابی بترسێ، بەدڵسۆزیی عیبادەتی بۆ بکا، کەسێك بەدڵسۆزیی بەندایەتی خودای کرد، بەوەعی‌و تێفکرینەوە خوداپەرستی خۆی ئەنجام دا، بەمراز گەییشتووەو ئەرکی بەندایەتی خۆی بۆ خودای خۆی بەجێ هێناوە.

خودایە وامان لێ بکە بەدڵ‌و بەگیان بەندایەتیت بکەین، خۆمان بناسین‌و تۆ بناسین، جەزبەی تۆناسینمان تێدا دروست بکە.

**بەیارمەتی خودا شەوی (١٨/رمضان/١٤٢١هـ) (١٤/١٢/٢٠٠٠)**

**لەپاکنووسی جزمی بیستەم بوومەوە**

**خودایە تۆفیقمان بدە بۆ تەواو کردنی بەرگەکانی دیکەی ئەم تەفسیرە پیرۆزە**

**(ملا محمود أحمد محمد)**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## شێوەی رەهنومایی كردنی ئەهلی كیتاب

﴿ ۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

لەئایەتەكانی پێشوودا: كە كۆتایی جزمی بیستەم بوون شێوەی رەهنومایی كردنی موشریك و بتپەرستەكانی بۆ رون كردینەوە، ئەمجار لێرەدا شێوەی رەهنومایی كردنی جولەكەو فەلەكانمان بۆ بەیان دەكا، ئەوانەی ئینكاری پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ دەكەن و پێیان وایە شەریعەتی تەورات و

ئینجیـل نەسـڕاوەتەوەو ئەحکامـەکانیان هەڵنەوەشـاوەتەوە. سـەرەتا فـەرمان بەپێغەمبەر ﷺ شوێنکەوتوانی دەکا: کە هەبوونی بیرو باوەڕی بتەویان بـەقورئان و تەورات و ئینجیل رابگەیەنن پابەندبوونی خۆیان بەیەکتاپەرستی رون بکەنەوە.

ئـەمجار ئـەوە بـەیان دەکـا: کـە بـڕێ لەئـەهلی کیتـاب و هەنـدێ لەدانیـشتوانی مەککە بڕوایـان بـەقورئان هەیـە، چـونکە نەخوێنـدەواری پێغەمبـەر ﷺ نیـشانەی ئەوەیە: کە قورئانی بەنیگا بۆ هاتووە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئـەتۆ کێشەو موناقەشـەو دەمـەدەمێ لەگـەڵ ئـەهلی کیتـاب مەکـە، مەگەر بەشێوەیەکی جوان و لەسەرەخۆو بەئوسلوب و شێوازێکی ناسك و لەسـەرەخۆ، مەگەر ئەوانەی ستەمکارو زیـادەڕەون لـەرێبازی راسـت لایانـداوەو چـاویان بەڵگـەی ئاشـکراو رون نـابینن. قینەبـەری و لوتبـەرزی دەنـوێنن، ئوسـلوبی نـەرم و نیـان لەگـەڵیاندا بـێ سـوودە، ئامـادە نـین مەناقەشـەو حیـواری عـەقلانی پـەیڕەو بکـەن، ئەوانە رەددی (بالمثل)یان دەدرێتەوە، شەڕیان لەگەڵ دەکرێ، دەمیان دەکوترێتـەوە، هێرشیان رەت دەکرێتەوە!

موجاهیـدو سـەعیدی کوڕی جوبـەیر دەفـەرموون: ئەوانـە کەسـانێکن شـەڕیان دژی موسوڵمانان هەڵگیرساندوە، وڵامدانەوەی ئەوان بەشمشێرە، چەکیان لـێ وەکـار دەخرێ تا ئیمان دەهێنن یان سەرانە دەدەن.

قەتادەو کۆمـەڵێك لـەزانایان دەفـەرموون: بەشـی یەکـەمی ئایەتەکە بەئایـەتی (السیف) حوکمەکەی نەسخ بۆتەوە، نابێ موناقەشەو دەمەدەمێیان لەگـەڵدا بکـرێ، بـەڵکوو سـێ رێگایـان لەپێـشە: موسـوڵمانبوون، سـەرانەدان، شـەڕکردن لەگـەڵیاندا. دەڵێن: ئەم ئایەتە مەککییەو بەئایەتی سەیف نەسخ بۆتەوە.

وەلـێ هەرڕای موجاهیدو سـەعیدی کوڕی جوبـەیر راسـت و حەقـەو ئایـەتەکە موحکەو نـەسخی بەسەردا نەهاتووە. هەر کەسێ لەئەهلی کیتاب ئامادەباشی ئـەوەی تێدابێ، لەئایین حاڵی ببێ و بیەوێ تێ بگا، ئەوە ئەوانە بەئوسلوبی جوان و شـیرین

موجادەلەیان لەگەڵ بکرێ بانگەوازی دەکرێن بۆ لای ئایینی خودا، بەڵگەی جۆراو جۆری دەربارەی تاك و تەنهایی خودا بەگوێچکەدا دەدرێ، لەسەرەتاوە هەوڵیان لەگەڵ دەدرێ: کە بەحیوارو وەعظو ئامۆژگاری ئایینی ئیسلامیان لەپێش چاوان جوان بکرێ، ئوسلوبی رەق و توندو تیژییان لەگەڵ بەکارنەهێندرێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل/١٢٥).

تەنانەت پەروەردگار: کە حەزرەتی موساو حەزرەتی هارونی کردنە پێغەمبەرو رەوانەی کردن بۆ سەر فیرعەون پێی فەرموون: ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلاً لَّيِّناً لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾ (طه/٤٤)

ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەرو شوێنکەوتوانی فێری شێوازی موناقەشەو حیواری بەننا دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەخۆتو بەشوێنکەوتوانتەوە هەر کاتێ بانگەوازی ئەهلی کیتابتان کرد بۆ موسوڵمانبوون، هەواڵیان پێدان بەشتێك: کە ئێوە زانیاریتان دەربارەی نەبوو، نەتاندەزانی راستە یان درۆیە، حەقە یان بەتاڵە، تەصدیقیان مەکەن، چونکە وێ دەچێ درۆ بێ، بەدرۆشیان مەخەنەوە، چونکە وێ دەچێ راست بێ! بۆیە دەبێ لەم کاتانەدا هەڵوێستو ئاخاوتنی ئێوە بەم جۆرە بێ، پێیان بڵێن: ئیمە ئیمانمان بەو قورئانە هەیە: کە لەلایەن خوداوە بەنیگا بۆ ئێمەو ئێوەو هەموو ئادەمیزاد هاتووە، ئیمانمان بەتەورات هەیە: کە نێردراوە بۆ سەر موسا، بروامان بەئینجیل هەیە: کە نازڵ کراوە بۆ سەر عیسا، ئەو تەورات و ئینجیلەی نەگۆڕدراون پەرستراوی بەحەق و راست پەروەردگاری ئێمەو ئێوە یەکێکەو بێ هاوەڵ و هاوشانە، ئێمە فەرمانبەرداری فەرمانی ئەوین، چی فەرمانی پێ کردبین ئەنجامی دەدەین، چی جڵەوگیری لێ کردبین خۆمانی لێ دوور دەخەینەوە.

﴿وَكَذَلِكَ أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ فَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمِنْ هَؤُلاء مَنْ يُؤْمِنُ بِهِ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاّ الْكَافِرُونَ﴾ پەیڕەوو پرۆگرامی خودا زینجیرەیەكی پەیوەست بەیەكن‌و مەنهەجی خودا یەك مەنهەجە. لەروانگەی ئەم مەنهەج‌و پرۆگرامەوەیە: كە ئێمە پێغەمبەرانمان رەوانە كردون، جا وەكوو چۆن نیگاو سروشمان بۆ پێغەمبەرانی پێشوو ناردوە، نامەمان بۆ نازڵ كردون، ئەم قورئانە پیرۆزەشمان بۆ تۆ ناردوە، جا ئەوانەی لەپێش تۆوە نامەی ئاسمانییان بۆ نازڵ كراوە لەجولەكەو فەلە، كاتێ ئەم قورئانە بەرێك‌و پێكی دەخوێننەوەو لێی ورد دەبنەوە، لەنمونەی عەبدوڵلای كوڕی سەلام‌و سەلمانی فارسی یەكسەر ئیمانی پێ دەهێنن‌و دڵنیا دەبن كە لەخوداوە نازڵ كراوە، هەروەها بڕێ لەكافرەكانی قورەیشیش ئیمانی پێ دەهێنن، چونكە ئەوان لەروانگەی فەصاحەت‌و بەلاغەتیەوە دەگەنە ئەو ئاكام‌و نەتیجەیە: كە ئەو قورئانە دانراوی ئادەمیزاد نیە، بەڵكوو لەخوداوە بەنیگا بۆ سەر دڵی پێغەمبەر نازڵ كراوە.

ئایاتی ئێمە بەدرۆ ناخاتەوە مەگەر كەسانێك: كە بڕوایان بەحەق نیەو كافرو سپڵەو گومڕاو بێ ویژدانن تەنها ئەوانە ئینكاری راستی قورئان دەكەن. ئەم ئایەتانە ئەوەندە ئاشكراو رۆشنن كەسێك كوفر روحی دانەپۆشیبێ رەدیان ناكاتەوە.

﴿وَمَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِهِ مِنْ كِتَابٍ وَلا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! ئەتۆ لەوەپێش ئەوەندەی لەگەڵ گەلەكەت ژیاوی‌و لەناویاندا هەڵس‌و كەوتت كردوە پێش نازڵبوونی قورئان بۆ سەرت هیچ كتێبێكت نەخوێندۆتەوە، نووسینت نەزانیوە، نەتتوانیوە بەدەستی راستت شتێك بنووسی چونكە ئەگەر تۆ لەوەپێش نوسین‌و خوێندەوەت بزانیایە لەوانەبوو موشریكە نەفامەكان گومانیان پەیدا بكردایە دەربارەی ئەم قورئانەی بۆت نێردراوە بیانگوتایە وێدەچێ ئەم قورئانە لەنووسینەكانی لەوەپێشی خۆی وەرگرتبێ. جا كە تۆ لەوەپێش نەخوێندەواربووی‌و نووسینت نەزانیوەو وێڕای ئەوەش ئەم قورئانە

سەرسوڕهێنەرەت بۆ هێناون: کە خوێندەوارو نووسەری بلیمەت لەبەرامبەریدا دەستەوەستانن، ئیتر هیچ بیانوێکیان نامێنێ بۆ ئەوەی گومانی تێدا پەیدا بکەن!

لەراستیدا ئەمە رەتدانەوەی شوبهەو گومانە بێ ماناو منداڵبازارییەکەی موشریکانەو هەموو رێگایەکیان لێ دەگرێ‌و لەهەموو رویەکەوە بەرپەرچیان دەداتەوە، ئەگینا لەفەرزێکدا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ خوێندەوازیش بوایەو نووسنی بزانیایە نەدەبوو ئەوان گومان لەقورئان پەیدا بکەن، چونکە قورئان بۆخۆی شاهیدە لەسەر خۆی: کە کەلامو زادەی مێشکی ئادەمیزاد نیە. ئەگەر تۆزێك بەویژدانەوە سەیریان بکردایە دەیانزانی: دانانی ئەم کەلامە لەتوانای ئادەمیزاددا نیە، زانیاری ئادەمیزادو ئاسۆی زانینی کەلامی ئاوای لێ وەدی نایە، هەموو دەقێکی هەموو ئایەتێکی ئیحادەکا بۆ دڵ: کە ئەمە لەخاوەن هێزێکی رەهاوە هاتووە، هێزو توانایەك لەماناو مەفهومیدا هەیە محاڵە شتی ئاوا لەئادەمیزادەوە هەڵقوڵێ‌و زادەی بیرو بۆچونی ئەوبن!

موجاهید دەفەرموێ: ئەهلی کیتاب لەتەوراتو ئینجیلی خۆیاندا ئەوەیان دەست کەوتبوو: کە موحەممەد ﷺ خوێندنەوەو نووسین نازانێ.

کەوابوو یەکێك لەو بەڵگانەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنن بۆ قورەیشییەکان ئەوەیە: کە پێغەمبەر خوێندنەوەو نووسینی نەبوە، تێکەڵاوی ئەهلی کیتاب نەبوە، ئەو کاتە لەمەککەدا جولەکەو مەسیحی نەبوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر سەرگوزشتەو هەواڵی پێغەمبەرەکانیان گێڕاوەتەوە.

**بەکورتی**:

نیشانەو رەوشتی پێغەمبەر لەناو کتێبی ئەهلی کیتابداو مێژووی ژیانی لەناو گەلەکەیدا ئەوە دەچەسپێنن: کە پیاوێکی نەخوێندەوار بووە.

وەكوو لەشوێنێكی تردا قورئان ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ (الأعراف/١٥٧).

هیچ جێگای شكو گومان نیە: كە ئەم قورئانە لەخوداوە بەنیگاو سروش بۆ حەزرەتی موحەممەد نێردراوە، دەستی ئادەمیزادو جندۆكەی تێدا نیە، بەفەرمانی پەروەردگار حەزرەتی جوبرائیل هێناویەتیو بۆی خوێندۆتەوەو فێری كردوە. لەگەڵ ئەوەدا ئەمە حەقیقەتێكی رونو ئاشكرایە. وێڕای ئەوەی قورەیشیەكان دەیانزانی: كە پێغەمبەر نەخوێندەوارەو نووسین نازانێ، كەچی پێغەمبەریان بەوە تاوانبار دەكرد: كە قورئانی لەكتێبە كۆنەكان وەرگرتووە، وەكوو ئەوە پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الآوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ (الفرقان:٥).

ئەمجار جەخت كردنەوە لەسەر ئەوەی: كە قورئان لەخوداوە بۆ پێغەمبەر نێردراوە، دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الظَّالِمُونَ﴾ بەڵكوو ئەم قورئانە چەند ئایاتو نیشانەیەكی حەقو ئاشكرایە حەقەو حەق دەچەسپێنێ، ئەوەش حەقیقەتێكە لەدڵو دەروونی زانایانی ئەهلی كیتابدا جێگیر بووە، وەلحال هیچ كەسێك ئەم قورئانە رەت ناكاتەوەو بەدرۆی ناخاتەوە مەگەر ئەوانەی دەستدرێژكارو ستەمكارو كافرو لوتبەرزن، ئەوانەی حەق دەزانن و خۆی لێ گێل دەكەن، وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الآلِيمَ﴾ (يونس:٩٦-٩٧).

بەكورتیو پوختی قورئانی پیرۆز شاكاری پەروەردگارەو زادەی مێشكی ئادەمیزاد نیە، ئایاتی حەقو حەق سەپێنن، فەرمانو نەهیو هەواڵن، زانایان لێیان حاڵی دەبنو لەبەری دەكەن كتێبی هیدایەتو رەهنوماییە لەبەركردنو

خوێندنەوەو راڤەکردنی ئاسانە، هەر کەسێ بیەوێ فێری ببێ فێری دەبێ‌و تێی دەگا.

## تێبینی :

نەخوێندەواریی حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەپێش بوونی بەپێغەمبەر شتێکی چەسپاوەو گومانی تێدا نیەو قورئان گەواهیدەرە لەسەری، هەروا کتێبە ئاسمانیەکانی پێش قورئانیش ئەوەیان چەسپاندوەو ژیانی چل ساڵەی ناو گەلەکەشی بەڵگەیەکی ترە لەسەر نەخوێندەواریی ئەو زاتە قوڕەیشییەکان ئەمەیان لا ئاشکرا بووە.

نەخوێندەواری پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیەکی واضیح‌و ئاشکرایە لەسەر ئەوە قورئان کەلامی پەروەردگارە. بەڵام دوای نیگا بۆ هاتن‌و بوونی بەپێغەمبەر ﷺ راجیایی کەوتۆتە نێوان زانایانەوە.

١- ئیمامی (الشعبي) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ لەدونیا دەرنەچووە هەتا فێری نووسین‌و خوێندنەوە بووە، فەرمودەکەی: کە ئەبو کەبشەی (السلولي) ریوایەتی کردوە ناوەڕۆکەی ئەوەیە: کە پێغەمبەر ﷺ صەحیفەیەکی بۆ عویەینەی کوڕی حصین خوێندەوەو ماناکەشی پێ گوت. ئیبنو (عطیة) دەڵێ: ئەمە زەعیفە.

قورطوبی دەڵێ: منیش دەڵێم: لەصەحیحی موسلیمدا فەرمودەیەك هەیە دەربارەی پەیمانی ئاشتینامەی حودەیبییە (البراء) ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەعەلی کوڕی ئەبو طالیبی فەرموو: (اكتب الشرط بيننا بسم الله الرحمن الرحيم هذا ماقاضي عليه محمد رسول الله) موشریکەکان وتیان: جا ئەگەر ئێمە دڵنیا بین پێغەمبەری‌و دان بەوەدا بنێین ئیمانمان پێ دەهێنای‌و باوەڕمان پێ دەکردی، لەریوایەتێکدا: بەیعەتمان پێ دەکردی. کەوابێ بنووسە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانی بەعەلی کرد: کە وشەی (رسول

الله) بكوژێنێتـەوە، عـەلی وتـی: وەڵلاهـی مـن وشـەی (رسـول الله) ناكوژێنمـەوە. پێغەمبـەر ﷺ شـوێنەكەم پـێ نیـشان بـدە بۆخـۆم دەیكوژێنمـەوە. ئـیتر عـەلی شوێنەكەی نیشان دا، پێغەمبەر ﷺ وشەی (رسول الله)ی كوژاندەوەو (ابن عبدالله)ی نووسی.[٣٦]

زانایـانی ئیـسلام فەرموویانـە ظـاهیری ئـەم حـەدیثـە ئـەوە دەگەیـەنێ: كـە پێغەمبـەر ﷺ بۆخـۆی بەدەسـتی خـۆی وشـەی (رسـول الله)ی كوژانـدەوەو لەشـوێنی ئەوە (ابن عبدالله)ی نووسی.

بوخـاری رونـتر لەمـە، ریوایـەتێكی هێنـاوە دەفـەرموێ: پێغەمبـەر ﷺ بۆخـۆی نامەكەی بەدەستەوە گرتو نووسی.[١]

ئیمـامی قـورطـوبـی[٢] لـەم بـارەوە راوو بۆچـوونی زانایـانی ئیـسلامی هێنـاوەو ئاراكـانی لەكـەوو بێـژنگ داون، كەسـێك دەیـەوێ زاتـر لـەم بـارەوە شـارەزا بـێ بابگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیە.

٢- ئەمجار قورطوبی رای ئەوانەی هێنـاوە: كە دەڵێن: مانـای (فكتـب رسـول الله الكتـاب فكتـب): كـە لەریوایەتەكـەی بوخاریـدا هـاتووە، ئەوەیـە: پێغەمبـەر ﷺ فەرمانی بەیەكێ لەنووسەرەكانی كردوە بۆی بنووسن.

قـاضـي عـەیاض لەمعاویـەوە ریـوامت دەكـا: كـە دەڵـێ: لـەلای پێغەمبـەر ﷺ نووسینی بۆ ئەنجام دەدا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ألق الدواة وحرف القلم وأقم الباء، وفرق السين، ولاتعور الميم وحسن الله ومد الرخمن وجود الرحيم) قاضي عـەیاض دەڵێ: هەرچـەندە ریوایـەتی ئـەوە صـەحیح نیـە: كـە پێغەمبـەر ﷺ شتی

---

(٣٦) رواه مسلم بتمامه في الجهاد والسير (٩٢/١٧٨٣) باب (٣٤) صولحی حودەیبییە.

(١) صحيح بوخاري (٣٦٩٨) باب (٦) چۆن دەینووسی.

(٢) تەفسیری قورطوبي ج٧/٣٦٥ (٣٨٩٧).

نووسیبێ بەڵام ئەوە بەدوور نازانـدرێ: کە زانیاری نووسینو خوێندنەوەی هەبووبێو لێی قەدەغە کرابێ!

ئەمجار قورطوبی دەڵێ: ئائە راستو صەحیحەو هەرگیز پێغەمبەر ﷺ بەدەستی خۆی پیتێکی نەنووسیوەو خوێندنەوەو عینجەی نەزانیوە.[٣] فەرموودەیەکیش هەیە هەردوو پیری فەرمودەو ئەبو داودو نەسائی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر فەرموویەتی (أنا أمة أمية لانكتب ولانحسب).

## پەڵپو بیانوگرتنی موشریکەکانو پەلەکردنیان بۆ هاتنی عەزابی کۆکوژ بۆ سەریان

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ

[٣] تەفسیری قورطوبی هەمان جڵو لاپەڕە.

أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

ده‌رباره‌ی سه‌به‌ب نزولی ئایه‌تی ژماره (٥١) ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ...﴾ ئیبنو جه‌ریرو ئیبنو ئه‌بی حاته‌م و داریمی له‌موسنه‌ده‌که‌ی‌داو ئه‌بو داود له‌یه‌حیای کوڕی جه‌عده‌وه ریوایه‌تیان کردوه ده‌ڵێ: هه‌ندێ موسوڵمان نووسراوێکیان هێنایه خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر ﷺ بڕێ شتی تێدا بوو: که له‌ته‌وراته‌وه راگوێزرابوون، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: (كفى بقوم حمقاً أو ضلالة أن يرغبوا عما جاء به نبيهم إلى ماجاء غيره إلى غيرهم) کیفایه‌ته ئه‌حمه‌قی و گومرایی بۆ قه‌ومێك پشت له‌و په‌یامه هه‌ڵبکه‌ن: که پێغه‌مبه‌ره‌که‌یان بۆی هێناون و حه‌زیان له‌په‌یڕه‌وو پرۆگرامێك بێ غه‌یری پێغه‌مبه‌ره‌که‌یان بۆ غه‌یری ئه‌وانی هێنابێ... ئیتر ئایه‌تی ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ نازڵ بوو. عه‌بدوڕره‌زاق له‌عه‌بدوڵڵای کوڕی حادیثی ئه‌لئه‌نصاری‌یه‌وه ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێ: عومه‌ری کوڕی خه‌تتاب هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر ﷺ نووسراوێکی پێ بوو هه‌ندێ زانیاری تێدا بوو له‌ته‌ورات وه‌رگیرابوو، وتی: ئه‌م مه‌علوماته‌م له‌کابرایه‌کی یه‌هودی‌یه‌وه ده‌ست که‌وت، نیشانی جه‌نابتی ده‌ده‌م،

رەنگی دەم‌و چاوی گۆڕان بەجۆرێك هەرگیز نەم بینی بوو پێغەمبەر ﷺ ئاوا دەم‌و چاوی بگۆڕێن.

عەبدوڵلای کوڕی حاریث بەعومەری گوت: ئەوە نابینی پێغەمبەر ﷺ چۆن دەم‌و چاوی گۆڕاون؟؟ ئیمامی عومەر وتی: رازین بەخودایەتی خودا، رازین ئیسلام ئایینمان بێ، موحەممەد پێغەمبەرمان بێ، ئیتر دەم‌و چاوی پێغەمبەر ﷺ گەشایەوە، ئەمجار فەرمووی: (لو نزل موسى فاتبعتموه وتركتموني لضللتم، انا حظكم من النبيين، وانتم حظي من الأمم).

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: دوای بەیانکردنی ئەوە: کە قورئان لەخوداوە نازڵ کراوەو لەلایەن موحەممەدەوە هەڵنەبەستراوە، ئەمجار پەروەردگار شوبهەو گومانی موشریکەکان باس دەکا؛ کە دەیانگوت: ئەی موحەممەد! تۆ دەڵێی من نامەی ئاسمانیم بۆ سەر نازڵ بووە وەکوو چۆن بۆ سەر موساو عیسا نازڵ بووە، دەی باشە کەوایە ئەدی بۆچی موعجیزەیەکی ماددی وەکوو ئەو پێغەمبەرانەی پێشوومان نیشان نادەی. وەکوو حوشتری صالح، عەصای موسا، سفرەخوانی عیسا. پەروەردگار رەددی دانەوەو فەرمووی: ﴿إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ﴾ مەرجی پێغەمبەرێتی موعجیزە نیە، مەرج نیە پێغەمبەر موعجیزەی هەبن، پەروەردگار ئەگەر بیەوێ موعجیزە دەنێرێ‌و ئەگەر نەیەوێ نایەنێرێ. کیفایەتە: کە قورئان موعجیزەبێ، بێگومان قورئان موعجیزەیەکی ئاشکراو بەردەوامە.

دوای بەیانکردنی رێبازی هەردوو تاقمەکە: واتە: رێبازی موشریکەکان‌و ئەهلی کیتاب. ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەیەکی گشتی‌و سەرتاسەرییان ئاڕاستە دەکا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەبەتاڵ هێناو خودا ناناسن‌و حاشایان لێ کردوە ئەوانە هەر بۆخۆیان خەسارەتمەندن. ئەمجار دوای ئەو هەڕەشەیە ئەوە رون دەکاتەوە: کە عەزاب بەسۆنگەی داواکردنی ئەوان نایە بەڵکوو کاتێکی دیاریکراوی هەیەو خودا بەحیکمەت‌و دانایی خۆی کاتێکی بۆ دیاری کردوە.

دەفـەرموێ: ﴿وَقَـالُوا لَـوْلا أُنْـزِلَ عَلَيْـهِ آيَـاتٌ مِـنْ رَبِّـهِ﴾ موشـریکەکان لـەروی قینەبەریو دەسەوەسانکردن دەڵێن: ئەوە بۆچی موعجیزەیەکی ماددی وەکوو ئەو موعجیزانـەی بـۆ پێغەمبـەرەکانی پێـشوو هـاتووە بـۆ موحەممـەد نایـە؟ بۆچـی موعجیزەیـەکی وەکوو حوشـتری صاڵحو عەصـای موسـاو سفرەو خوانی عیـسا بـۆ موحەممەد نایە؟ تا ببێتە بەڵگە لەسەر راستی پێغەمبەرێتیەکەیو موعجیزەیـەك بێ ئەوە بچەسپێنێ: کە فروستادەی خودایەو لەخوداوە رەوانەکراوە!؟!

ئیتر پەروەردگار وەڵامی دانەوە فەرموی: ﴿قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ ئەی پێغەمبـەر! پێیـان بڵـێ: هێنـانی مـوعجیزەو نـازڵکردنی نیـشانەو ئایات عائید بەخودایەو هیچ شتێ لەو بارەوە بەدەست مـن نیـە. خـۆ ئەگـەر پـەروەردگار بیزانیایـە ئێـوە بـەناردنی ئـەو جـۆرە موعجیزانـە هیدایـەت ئـامێز دەبـنو ئیمـان دەهێـنن، بیـانووی دەبـڕینو داواکـەی بـۆ دەهێنانـەدی، چـونکە هێنانـەدی ئـەو موعجیزانە بەلای خوداوە زۆر ئاسانەو هیچ ئەرکێکی تێدا نیە، بەڵکوو هیچ شتێك نیە لەلای خودا گران بێو ماندوی بکا، وەلێ خودا: کە ئەو جۆرە موعجیزانـەم بـۆ ناهێنێتەدی دەزانێ ئێوە بەو داواکارییەتان پەڵپ دەگـرنو قینەبـەریو تەعـەننوت ئـەنجام دەدەن. بۆیـە داخوازییـەکانتان بـۆ جـێ بـەجێ ناکـاو ئـەو موعجیزانـە ناهێنێتەدی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالآيَـاتِ إِلاَّ أَن كَذَّبَ بِهَا الآوَّلُونَ وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَـا﴾ (الأسـراء/٥٩). پێیـان بڵـێ: من نێردراوم بۆ سەر ئێوە بەترسێنەر بەئاشکرا دەتانترسێنم!

ئەوانەی بیرو باوەڕیان حەقو راستە ئەوان هەست بەو رەحمەتە دەکەن لەدڵو دەروونیاندا، ئەوان هەست بەفەضلو نیعمەتی خـودا دەکـەن بەسـەر مرۆڤایـەتیدا، هەست بەکەرەمو بەخششی مـادیو مەعنـەوی پـەروەردگاریان دەکـەنو ئیشراقاتی گیانییان بۆ فەراهەم دێ.

بەڵێ ئەوانەی بێ باوەڕن و هەڵەوەرن، هەست بەم هەموو ڕەحمەت و فەضڵ و بەخششانە ناکەن، پەڵپی موعجیزەی مادی دەگرن بۆ ئەوەی بڕوا بەقورئان بکەن، ئەوانە دڵیان بۆ نوری ئیمان نەکراوەتەوە، هەوڵدان لەگەڵیان بۆ ئیمانهێنان بێ سوودە، وازیان لێ بێنە خودا ڕۆژی خۆی دادگاییان دەکاو نێوان ئێوەو ئەوان یەکالا دەکاتەوە، ﴿قُلْ كَفَى بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيداً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! پێیان بڵێ: بەسە: کە خودا ئاگادارو دادوەر بێ، بەحوکمی عەداڵەت ئامێزی خۆی نێوان من و ئێوە یەکالا دەکاتەوە، خودا لەهەموو کەس باشتر دەزانێ ئێوە چۆن بەدرۆم دەخەنەوە. ئاگادارە من چۆن بانگەوازیی ئێوە دەکەم و دەتانترسێنم لەعەزابی سەختی خودا، چۆن فەرمانتان پێ دەکەم بەچاکەو نەهیتان لێ دەکەم لەخراپە، دڵنیابن ئەگەر من درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستم تۆڵەم لێ دەستێنێ و سزام دەدا: وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ، فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾ (الحاقة: ٤٤-٤٧) بەڵکوو من ڕاستگۆم لەوەی پێتانی دەگەینم، بۆیە خوداپشتگیری کردوم بەموعجیزەی جیا جیا، هەرە گەورەو گرنگیان موعجیزەی قورئانە: کە تا دونیا دونیایە کاریگەری خۆی هەیەو بۆ هەموو چەرخ و ڕۆژگارێکە.

﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: خودا هیچی لێ گوم نابێ، ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا: کە بوەو دەبێ چ لەزەویدا بێ یا لەئاسمانەکاندا بێ، بەشێك لەو زانیارییە زانینی حاڵ و وەزعی من و ئێوەیە، ڕاستی بانگەوازیی من و بەدرۆخستنەوەو باوەڕ نەکردنی ئێوەیە.

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەو شتانە کردوە: کە غەیری خودان و پەرستشیان بۆ دەکەن، بەندایەتی بۆ بت و صەنەم دەکەن و ئینکاری هەبوونی خودا دەکەن، یان هاوەڵی بۆ دادەنێن و پێیان وایە چەند خودایەك هەن جگە لەخودا هاوشان و هاوەڵی خودان، هەرچەندە

بەڵگەی جۆراو جۆر هەن لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی لەزات‌و صیفاتی‌دا، ئەوانە خەسارەتمەندن لەمامەڵەو سەوداكەیاندا، هاتوون كوفرو بێدینییان بەئیمان كڕیوە، لەوە بەولاوە رۆژی قیامەت خودا لەسەر كردەوەكانیان تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە، لەسەر هەڵوێستی نالەباریان‌و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران‌و ئینكاریكردنی حەق‌و شوێنكەوتنی بەتاڵ‌و ئیمانهێنان بەطاغوت‌و بت‌و صەنەم بەبێ ئەوەی بەڵگەیان بەدەستەوەبێ، شیاوی سەخترین سزان.

ئەمجار پەروەردگار نەزانی‌و نەحمەقی موشریكەكان رون دەكاتەوە: لەوەدا: كە پەلە لەهاتنی عەزابی ریشەكێش دەكەن. دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ﴾ كافرەكانی قورەیش بەتاڵوكەن لەهاتنی عەزاب بۆ سەریان پەلەدەكەن لەناردنی عەزابی كۆكوژ بۆ سەریان وەكوو لەئایەتێكی تردا پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الأنفال: ٣٢) بێگومان موشریكەكان هەڕەشەكانی پێغەمبەریان دەبیست، وەلێ هەست بەحیكمەتی یەزدان ناكەن بۆچی عەزابی لێ دواخستون‌و مۆڵەتی داون بۆ ماوەیەك، بۆیە لەروانگەی تەحەدداو قینەبەرییەو پەلە لەهاتنی عەزاب دەكەن؛ زۆر جار وا دەبێ ئەو مۆڵەتدانە (دانەوداوە) بۆ گیروده بوونی ستەمكاران، بۆ ئەوەی زیاتر هەڵخلیسكێن‌و بەداوەكەوە بن. لەهەمان كاتدا ئیمتیحان‌و تاقیكردنەوەیە بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوەی باوەڕیان زیاتر دابمەزرێ‌و لەكەوو بێژنگ بدرێن‌و تەمبەڵ‌و گەرجو گۆڵ لێك جیا بكرێنەوە، دڵ دامەزراوو بڕوا پتەو لەدووڕوو راڕا هەڵبهاوێردرێن. راستی‌و بەتاڵیان بۆ دەربكەوێ‌و گومڕایان بەخۆیاندا بچنەوەو هیدایەت ئامێز ببن، یان بۆ ئەوەی وەچەو نەوەی صاڵح‌و راستاڵیان لێ بكەوێتەوە بابۆخۆشیان گومڕاو سەرلێ شێواو بن. یان هۆی دواكەوتنی عەزاب بۆ سەریان حیكمەت‌و هۆكاری ترەو خودا بۆ خۆی دەزانێ‌و لەزانیاری خۆیدا حەشار دراوە.

بـەڵام موشـریکەکان ئـەم حیکمەتانـەیان نـەدەزانین، بەتەحـەدداوە پەلـەیان لەهاتنی عەزاب بۆ سەر خۆیان دەکرد، ﴿وَلَوْلا أَجَلٌ مُسَمًّى لَجَاءَهُمْ الْعَذَابُ﴾ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: کە عەزاب لەکاتی دیاریکراوی خۆی هەیەو خودا بڕیـاری داوە عەزابی کۆکوژیـان لەسـەر دوا بخـا بـۆ ڕۆژی قیامـەت، ئـەوە یەکسەر ئـەو عەزابـەی پەلەی لێ دەکەن بۆیان بێ زوو دەهاتە سەریان، ﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُمْ بَغْتَةً وَهُـمْ لا يَـشْعُرُونَ﴾ بەتەئکیـد لەوەبـەولاوەو لـەکاتی دیـاریکراودا ئـەو عەزابـەیان بـۆ دێ‌و یەخـەیان دەگرێ‌و ناگەهان تێکیانەوە دەپێچێ بەخۆیان نازانن تا غافڵگیریان دەکا.

﴿يَـسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَـذَابِ وَإِنَّ جَهَـنَّمَ لَمُحِيطَـةٌ بِالْكَـافِرِينَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! ئـەو موشریکانە پەلە دەکـەن لـەهاتنی عـەزاب بـۆ سـەریان دەڵێن: دەزوو ئـەو عەزابـەی باسی لـێ دەکەی بۆمان بێنـە، بـا چاوەڕوان بـن ئـەو عەزابـە لـەکاتی خۆیـدا دێتـە سەریان، بێگومان دۆزەخ لەهەموو لایەکەوە دەورەی ئەوان دەداو لـەخۆیان دەگـرێ‌و بەشی هەموانیان دەکا.

ئەمجار پەروەردگار وەصفی ئەو عەزابە دەکا: کە هـەموو کـافرو موشـریکەکان لەخۆ دەگرێ، دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمْ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُـولُ ذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لـەو ڕۆژەدا: کـە عـەزابی سـەخت لەهـەموو لایەکـەوە دایـان دەپۆشـێ‌و لـەخۆیان دەگـرێ، لەسـەریانەوەو لەژێریانـەوە عـەزابیان بـۆ دێ، هـیچ دەرفـەت‌و هیوایـان نامێنـێ، لـەڕوی سـەرکۆنەکردن‌و سەرزەنـشتکردنەوە لەلایـەن فریشتەوە پێیان دەگوترێ: بچێژن سزای ئەو کردەوانەی لەژیانی دونیادا ئەنجامتان داون، ئەو عەزابە تۆڵەی کوفرو تاوانی ژیانی دونیاتانە. نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایـەتێکی تـرە: وەکـوو دەفـەرموێ: ﴿لَهُـم مِّـن جَهَـنَّمَ مِهَـادٌ وَمِـن فَـوْقِهِمْ غَـوَاشٍ﴾ (الأعراف: ٤١). یان دەفـەرموێ: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّـارِ وَمِـن تَحْـتِهِمْ ظُلَـلٌ﴾ (الزمر: ١٦).

بەراستی دیمەنێکی سامناكو ریسواکەرو ترسناکە، رۆژێکە عەزابی سەختو سەرزەنشتو لۆمەکردنی تێدایە. ئەمەش ئاکامو سەرەنجامی ئەوانەیە لەروی تەحەداو سەرڕەقییەوە پەلە لەهاتنی عەزاب دەکەن!

## کۆچ کردنو وڵات بەجێهێشتن لەپێناو ئاییندا

﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾

سیاقی ئایەتەکان دیمەنی بەدرۆخەرەوە سەرڕەقەکان جێ دێڵێ، لەناو عەزابی سەختدا دەتلێنەوەو سزای سامناك لەهەموو لایەکەوە دەورەی داون، پەردە بەسەر ئەو دیمەنەدا دەداتەوەو لەم دیمەنەوە دەگوێزێتەوە بۆ ئوسلوبێکی تر بۆ ئەوەی سەرنجی موسوڵمانان رابکێشێ بۆ ئەوە: هەر کاتێ نەیانتوانی کاروباری ئایینی خۆیان بەرێكو پێکی ئەنجام بدەن، کافرو بێدینەکان دەبوونە لەمپەڕ لەبەردەم خوداپەرستیو ئەنجامدانی شەعائیری ئایینیدا، با ئەو وڵاتە بەجێ بێڵنو بچنە شوێنێك بتوانن بەئازادی کاروباری خوداپەرستی خۆیان ئەنجام بدەن، زەوی خودا

فراوانەو پێویستە لەپێناو پارێزگاریکردنی عەقیدەو باوەڕدا قوربانی بەهەموو شتێك بدرێ، بانگەوازییەکی پڕ سۆزو بەزەیی ئاڕاستەی موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ﴾ ئەی ئەو بەندانەی بڕواتان بەتاكو تەنهایی من هەیەو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەم کەوتون، زەوی من فراوانەو تەنگەبەر نیە، هەر شوێنێکتان بەپەسەندزانی دەتوانن لەوێ ژیان بەسەر بەرن، لەهەر شوێنێك نەتانتوانی خوداپەرستی خۆتان بکەن جڵەوگیرییان لێ دەکردن لەبەجێهێنانی شەعائیری ئایینی خۆتان، ئەوە یەکسەر ئەو شوێنە بەجێ بێڵن‌و بچنە جێگایەك بتوانن بەئازادی کاروباری ئایینی خۆتان ئەنجام بدەن، تەنیا عیبادەت بۆ من بکەن‌و کەسی تر بەشیاوی عیبادەت بۆ کردن مەزانن.

ئێوە بەندەو دروستکراوی منن ئەم زەوییەش من خاوەنی راستیمی، زەوییەکی فراوان‌و پان‌و پۆڕە بەشی هەمووتان دەکا. لەهەر شوێنێك تەنگیان پێ هەڵچنین‌و نەتانتوانی خودا پەرستی بکەن ئەو شوێنە تەنگەبەرەو بەکەڵکی ژیانی ئێوە نایەو بەجێی بێڵن، بچن بۆ وڵاتێك کە بتوانن بەئازادی خوداپەرستی خۆتان بکەن!

ئایەتەکە فەرمانە بەموسوڵمانان کە کۆچ بکەن لەوڵاتێك: کە ناتوانن شەعائیری ئایینی خۆیان ئەنجام بدەن، ئەو وڵاتە جێ بێڵن‌و ڕەو بکەن بۆ وڵاتێك بتوانن بەئازادی خوداپەرستی خۆیان بکەن! بتوانن یەکتاپەرستی بکەن، دڵسۆزبن لەخوداپەرستی خۆیاندا. مەبەست ئەوەیە موسوڵمانان خۆیان وا پەروەردە بکەن ئامادەباشی ئەوەیان تێدابێ لەپیناو ئایینی خودادا گیان‌و ماڵ‌و نیشتمانی خۆیان بەخت بکەن.

ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەکی لەزوبەیری کوڕی عەووام ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر فەمویەتی: (البلاد بلاد الله والعباد عباد الله، فحيثما أصبت خيراً فأقم). وڵات وڵاتی خودایە بەندە بەندەی خودان لەهەر شوێنێك خێرت توش هات لەوێ جێنیشین ببە!

هەر بۆیە کاتێك موسوڵمانانەکان لەمەککە تەنگیان پێ هەڵچنراو کافرەکانی قورەیش تینیان بۆ هێنان ناچار بوون بەوەی: کە کۆچ بکەن بۆ خاکی حەبەشە، بۆ ئەوەی پارێزگاری عەقیدەو بیرو باوەڕی خۆیان بکەن، لەلای نەصحەمەی نەجاشی (پاشای حەبەشە) پەنای باشیان دەست کەوت، پەنای دانو حەواندنیەوە، یارمەتیدان، پاشان پێغەمبەرو بڕێ لەهاوەڵانی: کە لەمەککەدا مابوونەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینەی مونەووەرە.

ئەمجار دوا بەدوای فەرمانکردن بەموسوڵمانان بەوەی سووربن لەسەر خوداپەرستیو دڵسۆزی کردن لەخوداپەرستیدا ئەوە رون دەکاتەوە: کە دونیا خانووی مانەوە نیە، ترسی مردن نەکەنە بیانووی کۆچ نەکردنو لەپێناو عەقیدەو باوەڕدا وڵات جێ بێڵن. چونکە مردن شتێکی حەتمییەو هەموو زیندەوەرێك دەگرێتەوە، جگە لەخودا کەس نامێنێ ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ هەموو نەفسێك شەرابی مردن دەچێژێو دەبێ بمرێ، لەهەر شوێنێك بن دەستی مردنتان دەگاتێ، کەوابێ پێویست نیە ئێوە حیساب بۆ مردن بکەنو مردن بکەنە بیانووی کۆچ نەکردن، ئێوە نازانن چ شتێك دەبێتە هۆی مردنتانو ئەسبابەکانی نازانن، دوای مردنتان هەمووتان بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە، ئێوە بەفەرمانی خودا کۆچ دەکەنو زێدو نیشتمانی جێ دێڵن، لەزەوی پانو پۆڕی خودادا دێنو دەچنو دواییش بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، ئێوە لەچوارچێوەی عیبادەت کردن بۆ خودا دەرنەچن، خودا چۆنی فەرمان پێ کردن ئەوە ئەنجام بدەنو بەرژەوەندی ئێوە لەوەدایە، مردن روداوێکە کەس لێی دەرناچێو خۆپاراستنی لێ ناکرێ، لەماڵ بێ یان لەدەرەوە بێ، لەوڵاتدا بێ، یان لەغەریبی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا یەختان دەگرێو دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، جا کەسێك فەرمانبەرداری خودا بێ پاداشی دەداتەوەو کردەوەی کەس پاش گوێ ناخا.

ئەمجار جۆری پاداشەکە دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ غُرَفاً تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الآنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ

الْعَامِلِينَ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەتاك‌و تەنهایی خودا هەیەو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکەی کەوتوون، کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی بوون، ئەوانە جێ نشین دەکەین لەناو خانوو باڵەخانەی بەهەشتدا بەژێر دارو درەختی خانوو قەصرەکانیاندا چۆم‌و جۆگا ڕەوان دەبن، جۆگای ئاوو جۆگای هەنگوین‌و جۆگای شەراب‌و جۆگای شیر لەناو ئەو قەصرو باڵەخانانەدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوەو دەرچوونیان نیە، هێندە خۆش‌و دڵگیرە بۆ خۆیان دڵیان ناهێنێ بەجێیان بێڵن، سات لەدواسات دڵیان پێ خۆش دەبێ‌و پتر وەگرییان دەبن، ئەمەش لەپاداشی ئەو کردەوانەی لەژیانی دونیایاندا ئەنجامیان داون، بەڕاستی پاداشێکی باش‌و خاسە وەری دەگرنەوە. ئەم پاداشە باشە لەبەرامبەر ئەو عەزابە سەختەی موشریك‌و تاوانبارەکاندایە کە لەوەپێش بەرستەی ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ ئاماژەی پێ کرد.

بەشێك لەڕەوشتی ئەو خوداپێداوانە صەبرگرتن‌و پشت بەخودا بەستنە، دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ ئەو موسوڵمانە بەختەوەرانە کە ئەوە پاداشیانە ئەوانەن بەصەبرو ئارام بوون لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانیان نوێژو ڕۆژوو جیهادو تێکۆشانیان لەپێناو ئایینی خودا بەدڵسۆزی ئەنجام داوە، لەپێناو ئایینی خودا زێدو نیشتمانی خۆیان جێ هێشتووە، تەحەمولی زەحمەت‌و کوێرەوەرییان کردوە، لەهەموو کاروبارێکیاندا پشتیان بەخودا بەستووە، ئەوەی لەدەستیان هاتووە ئەنجامیان داوە بۆ بەدی هاتنی ئاکامیش پشتیان بەخودا بەستووە. تواناو وزەی خۆیان خستۆتە گەڕو تەوەکولیشیان لەسەر خودا بووە!.

باسکردن‌و هێنانی ڕەوشتی صەبرو تەوەکول لەم شوێنەدا لەبارو گونجاو بوو، چونکە کۆچکردن‌و جیهادو تێکۆشان وڵات جێ هێشتن‌و دابڕان لەخزم‌و کەس‌و کار ڕوبەڕوبوونەوەی ئەزیەت‌و ناڕەحەتی پێویستی بەڕەوشتی صەبرو پشوو درێژیی‌و

پـشت بەسـتن بـەخودا هەيـە. كەسـێك ئـەم دوو ڕەوشـتەى تێـدا نـەبن لـەجيهادو كۆچكردنـدا سەركەوتوو نابێ.

ئەمجار پەروەردگار باسى شتێك دەكا: كە ڕێخۆشكەرەيە بـۆ دەسـتەبەربوونى صـيفەتى تـەوەكول ئـەويش زانينـى ئـەو ڕاسـتييەيە: كـە خـودا ڕزق‌و ڕۆژيـدەرى مەخلووقاتى خۆيەتى‌و هەر كەسێ خوداى لەپشت بـێ پێويـستى بەكەسـى تـر نيـە. دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِنْ دَابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ ڕزق‌و ڕۆژيى تايبەت نيە بە وڵاتێكەوەو لەوڵاتێكى تـر نـەبێ، بـەڵكوو ڕزق‌و ڕۆژيـى خودا گشتى‌يەو بۆ هەموو گيانلەبەرانيەتى لەهەر شوێنێك بـن. چـەند ژمارەيـەكى زۆر لەگيانەوەران لەبەر بێ دەسەڵاتى‌و زەبوونى خـۆى ناتوانـێ ڕزق‌و ڕۆژيـى خـۆى دابين بكاو دەستەبەريى بكـا، ناتوانـێ بـژيوى خـۆى كـۆ بكاتـەوەو پـەزمەنـدەى بكـا، خـودا ڕزق‌و ڕۆژيـى بـۆ دەرەخـسێنێ‌و بـۆى ئاسـان دەكـا، بـۆ هـەموو گيانلەبـەرێك بـژێوى گونجـاو دەداو دەيـژێنێ، خـشۆك بـێ لـەناو زگـى زەويـدا، يـاخود باڵنـدە بـێ لەهەوادا، يان ماسى بێ لـەدەريادا، خـودا بـژێوى خـۆى بـۆ دەسـتەبەر دەكـاو ڕێگـاى نيشان دەدا چۆن خۆى بژێنێ. هەر ئەو خودايەيـە: كـە ڕزق‌و ڕۆژيـى ئێـوەش دەدا. خودا شـنەوايە بەوتـەى بەنـدەكانى‌و دەزانـێ چـى دەڵێن‌و چـى لەسـينەى خۆيـانـدا حەشار دەدەن.

بێگومـان خـودا وادە بـەخيلاف نيـەو هيـچى لـێ عاسـێ نابـێ، موسـوڵمانەكان لەمەككەوە كۆچيان كرد بۆ مەدينە، لەوێ بارى ژيانيان خۆشتر بوو ڕزق‌و ڕۆژييـان فـراوانتر بـوو، لـەش‌و لاريـان تەندروسـتى زيـاتر بـوو هـەر پـاش ماوەيـەكى كـورت‌و زۆرى پـێ نەچـوو بوونـە فرمـانڕەواى وڵات‌و زوربـەى زۆرى جيهـانى ئـاوەدانى ئـەو ڕۆژگارەيان كۆنتڕۆڵ كرد.

## موشریکەکان بڕوایان بەخودای بەدیهێنەرو ڕۆزیدەر هەیە

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾

دوای ئـەوەی لەئایەتـەکانی پێـشوودا پـەروەردگار بیروبـاوەڕی موشـریکەکانی بـەیانکرد، پـەڵپ و بیـانوە تەعجیزییـەکانیانی ڕونکردنـەوە، ئـەمجار بەشـێوەی شـیرینی ﴿يَـا عِبَـادِيَ الَّـذِينَ آمَنُـوا﴾ خیطـابـی ئاڕاسـتەی موسـوڵمانەکان کـرد، بەشێوەیەکی ئەدەبی و ئوسلوبێکی ناسك ڕەهنومایی موشریکەکانی کرد، بۆ ئـەوەی بـەخۆیاندا بچنەوەو پەنـد ئـامێز بـبن و چی تـر سواری گای هار نـەبن و لەسـەر سەرڕەقی خۆیان بەردەوام نەبن.

دەفـەرموێ: ﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ الـسَّمَوَاتِ وَالآرْضَ وَسَـخَّرَ الـشَّمْسَ وَالْقَمَـرَ لَيَقُولُنَّ اللَّـهُ فَأَنَّـا يُؤْفَكُـونَ ؟﴾. سوێندبێ ئـەی موحەممـەد! ئەگـەر تـۆ پرسـیار لـەو موشـریکانە بکـەی و پێیـان بڵـێی: ئـەوە کـێ ئاسمانـەکان و زەوی بـەدیهێناون؟ کـێ مانگ و خۆرو ئەستێرەکانی هێناونـەدی بـۆ دابـین کردنـی بەرژەوەنـدی ئێـوە؟ ئـەم

قەبارە گەورانە سالەهای سالە بەشوێن یەكتردا دێن‌و دەچن‌و شەوو رۆژیان لێ پەیدا بووە، وەرزەكانی سال‌و ئاوو هەوایان لێ بەدی هاتووە.

ئەی پێغەمبەر! ئەگەر پرسیار لەو موشریكانە بكەی بلێ‌ی كێ بەدیهێنەرو رەخسێنەری ئەم شتانەیە؟ لەوڵامدا دەڵێن: ئەوە (الله) بەدیهێنەریانە، ئەو رەخساندونی‌و فاعیلی حەقیقی خودایە! جا: كەدانیان بەوەدا ناو ئیعترافیان كرد، ئەدی چۆن رو لەیەكتاپەرستی وەردەگێرن، بۆ بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ ئەو خودایە ناكەن؟! چونكە داننان بەوەدا: كە خودا خالیق‌و بەدیهێنەرو رەخسێنەرە، دەبوایە ببێتە لەمپەرو موشریكەكان مەنع بكا لەوەی جگە لەخودا خودایەكی تر بپەرستن! بەراستی ئەمە دژایەتیكردنێكی سەیرو سەمەرەیە جێگای سەرسوڕمانە چۆن لەو حەق‌و حەقیقەتە حالی نابن، چۆن لەحەق لادەدەن‌و بڕوا بەو چەواشەكارییە دەكەن؟! دیارە ئەوانە عەقڵ‌و هۆشیان نیە، ئەگینا ئەگەر عەقڵ‌و هۆشێكیان هەبایە قبوولی ئەو چەواشەكاری‌و تێكەڵ‌و پێكەڵیەیان نەدەكرد!

ئەمجار پەروەردگار هۆكاری بەردەوامبوونی ژیان: كە بژێوە، بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار رزق‌و رۆزیی گوشاد دەكا بۆ كەسانێك بیەوێ بۆیان گوشاد بكا، بۆ ئەوە بەتاقییان بكاتەوە. بۆ هەندێ كەسیش هەر بەو مەبەستە كەمی دەكاتەوە دەستكورت‌و كەم دەرامەتی دەكا، ژیانێكی كولەمەرگی پێ دەدا پەروەردگار خۆی بەدیهێنەرو رزق‌و رۆزیدەرە، خۆی بژێویان بۆ دیاری دەكاو بەگوێرەی حیكمەت‌و دانایی خۆی‌و بەرژەوەندی بەندەكانی رزق‌و رۆزییان بۆ دەبڕێتەوە. بێگومان خوا زاناو ئاگادارە بەسەر هەمموو شتێكدا، دەزانێ بەندەكانی بەرژەوەندییان لەچی‌دایەو داخوازی فراوانكردن‌و تەنگكردنەوەی رزق‌و رۆزیی بەندەكانی چیەو چی لەمەسڵەحەتیانە، دەزانێ كام لەحاڵەتی هەژاری یان دەوڵەمەندی لەبەرژەوەندی بەندەكانی‌دایە. هەر لەروانگەی ئەم حیكمەت‌و زانیاریەوە هەندێ كەس دەوڵەمەند دەكاو هەندێكیان هەژار، هەندێ كەس لەشساغ‌و هەندێ نەخۆش، هەیە زاناو هەیە

نـەزان بـەم جـۆرە جـوداوازی لـەنێوان تاکـەکانی کۆمـەڵدا دروسـت دەبـێو هـەوڵو تێکۆشانو کێ بڕکێ لەنێوانیاندا دروست دەبێو هێزو تواناکان دەخرێنەگەڕو هەر کەسە لەعاست خۆیەوە هەوڵی دابینگرنی پێداویستی ژیانی خۆی دەداو ژیان پـێش دەکـەوێو گەشـە بـەهۆکارەکانی دەدرێ. لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەم فـەرقو جوداوازییە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ (الشوری:٢٧).

ئەمجار پەروەردگار هۆکاری رزقو رۆژی بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ هەڵبەتـە رزقو رۆژیی بەرواڵەت پەیوەندی هەیە بەهەڵسوڕانی ئەفلاکەوە، پەیوەستـە بەهـەبوونی ئاوو چاندنو روانو وەبەرهەم هێنانی بەروبوومەوە، فراوان کـردنو تـەنگ کردنـی رزقو رۆژیـی بەدەسـت خـودا خۆیـەتیو بـەگوێرەی حیکمـەتو دانـایی خـۆی گۆڕانکـاری تێـدا دەکـا، چـۆنی بـوێ ئـاوا ئـەنجامی دەدا، سەرچـاوەی رزقو رۆژیـی بەرواڵەت لەئاوی بارانو بیرو چۆمو کانیاوەوەیە دانەوێڵەیە دەچێنـدرێو وەبەرهەم دەهێنــدرێ، ئـاژەڵو پەلـەوەرە بـەخێودەکرێو زاوو زێ دەکـا زۆر دەبـێ، کـانو مەعدەنە شتی لێ دەردێندرێو دروست دەکرێ نێچیرەو راو دەکـرێ...هتـد. لـەژێر رۆشـنایی ئـەم حەقائیقانـەدا ئەگـەر تـۆ ئـەی پێغەمبـەر پرسـیار لـەو موشـریکانە بکـەیو بڵـێ: ئـەوە کـێ لەبـەرزاییـیەوە بـاران دەبارێنـێو زەوی مـردوی وشـك هەڵاتووی سوتەمەڕوی پێ زیندو دەکاتەوە؟ کێ دوای وشکبوونەوەی زەویو نەمانی نەشو نما لەروەكو درەختەکانیدا جارێکی تر ئەو زەوییە مردوە زیندو دەکاتەوەو نەشو نمای تێدا وەگەڕ دەخاتەوە؟ یەکسەر وەڵامت دەدەنەوەو دەڵێن: بێگومان هەر خودا دەتوانێ ئەو کارە بکاو ئەوە کارو صیفەتی خودایە، هـەر (الله) دەتوانـێو ئـەو کارە ئەنجام بدا. جا کە دانیان بەوەداناو ئاوا بێ پێچو پـەنا ئیعترافیـان کـرد ﴿قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ بڵێ: سوپاس بۆ خودا: کەوا بەڵگەم سوارەو بۆڕتان

خوارد، وەلێ زوربەی زۆری ئەو موشریکانە عەقڵیان بەم دژایەتیو جوداوازییانە ناشکێو نازانن: بۆ خۆیان خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە، ئەوەتا تا لەلایەکەوە دان بەوەدا دەنێن: کە خودا بەدیهێنەرو زیندوکەرەوەی زەویو رزقو رۆژیدەری گیانلەبەرانە، کەچی لەهەمان کاتدا هاوەڵی بۆ بەرەوا دەزانن و شتی تر دەکەنە خوداو لەجیاتی خودا دەیانپەرستن! بەکردەوە قسەکانی خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە. کردەوەیان دژی ئیقرارو وتەیانە. لەتەك خودای بالادەستو خاوەن صیفەتی جەمالو جەلال خودای تر دەپەرستن: کە شیاوی خودایەتی نینو هیچ رەوشتێکی خودایەتییان تێدا بەرجەستە نیەو نابێ. هیچیان لەدەست نایە.

**بەکورتی موشریکەکان دان بەدوشتی سەرەکی دادەنێن:**

١- دەڵێن: خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە هەرچی لەبوونەوەردایە خەڵقندەی پەروەردگارە.

٢- دەڵێن: خودا رزقو رۆژیدەری بەندەکانیەتیو ئەو بەقودرەتو توانای بێ سنووری خۆی باران لەبەرزاییەوە دەبارێنێو زەوی مردوو زیندوو دەکاتەوە کەچی بەکردەوە ئەم بیروباوەرەی خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە ئەوەتا شتی تر دەکەنە هاوەڵی خوداو پەرستشی بۆ دەکەن.

## هەڵسەنگاندنی ژیانی دونیاو حاڵو وەزعی کافرەکان تێیدا

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ

إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی بەیان کرد: کە موشریکەکان دان بەوەدا دەنێن: کە (الله) بەدیهێنەرو رزق‌و رۆزیدەریانە، هەر ئەو دەتوانێ باران ببارێنێ‌و زەوی مردوو زیندوو بکاتەوە، کەچی وێڕای ئەوە موشریکەکان شتی تر دەکەنە هاوەڵی خوداو پەرستشیان بۆ دەکەن مەبەستیان دەستەبەرکردنی کاڵای دونیایی‌و ژیانی خۆشە، ئەمجار پەروەردگار ئەوەیان بۆ روون دەکاتەوە: کە ئەو شتەی ئەوان هەوڵی بۆ دەدەن ژیانی کەم بایەخی دونیایەو لەئاستی قیامەتدا بەهیچ حسێب ناکرێ.

ئەوە روون دەکاتەوە: کە ژیانی حەقیقی‌و نەبڕاوە بریتییە لەژیانی قیامەت‌و حەق وایە بۆ دەستەبەربوونی ژیانی دواڕۆژ هەوڵ‌و تەقەلاّ بدەن.

ئەوەش روون دەکاتەوە: کە ئەو موشریکانە کەوتوونە سەر لێ تێکچوون‌و تەناقوضاتێکی سەیرو سەمەرەوە، ئەوەتا وێڕای ئەوەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن‌و

لەتەك ئەودا شتی تر دەپەرستن، کەچی: کە توشی ناخۆشیو تەنگانەیەك هاتن هانا بۆ خودا دەبەنو هەر ئەو دەناسنو کەسی تریان وەبیر نایەتەوە هاواری لێ بکەن؛ چونکە ئەو کاتە سورشتو فیطرەتیان وە ئاگا دێو رۆڵی خۆی دەبینێ. هەموو کەسیش بەسروشت خوداپەرستە!

ئەمجار پەروەردگار نیعمەتێکی تری خۆی باس دەکا؛ کە پێی بەخشیون ئەویش نیعمەتی ئاسایشو دڵنیایییە، ئەوەتا ئەوان لەشاری مەککەدا لەزێدو نیشتمانی خۆیاندا بەدڵنیایییەوە ژیان بەسەر دەبەن، خودا ئاسایشو ئاشتی خستۆتە ئەو دەڤەرەو دەوروبەریان هەمووی شەڕو هەرایە هێرشو چەپاوکردنە، کوشتن بڕینو فڕاندنە، کەچی ئینکاری ئەو نیعمەتە گەورانە دەکەنو سوپاسی خودا ناکەن، بۆیە ئەوان شیاوی سەرزەنشتو لۆمە کردنن..

دەبارەی ئایەتی ژمارە (٦٧): کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا...﴾ جووەیبیر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: موشریکەکانی مەککە بەپێغەمبەریان گوت: ئەوەی: کە ئێمەی والێ کردوە ئیمانت پێ نەهێنین؛ ئەوەیە: ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە ئەگەر بێینە ناو دینەکەی تۆوە، خەڵکی دەوروبەرمان بمانڕفێنن، چونکە ئێمە کەمینو عەرەبەکانی دەوروبەرمان زۆرن، هەر کاتێ بزانن: ئێمە موسوڵمان بووین هێرشمان بۆ دەکەنو دەمانڕفێننو دەمانکەنە کۆیلەی خۆیان، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَماً آمِناً﴾ی ناردە خوارێ.

ئێستاش بەبۆنەی باسی ژیان لەسەر زەویو زۆرو کەمی رزقو رۆژییەوە، بەتەرازویەکی وردخوێن ژیانی دونیا کێشانە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾ ژیانی دونیا بەهەموو رازاوەییو خۆشییەکییەوە، بریتییە لە(لەهو) خۆی پێ دەخافڵێنێ یان

گاڵتەیەکە کە بیرۆشی خۆتی پێ دێنی. بۆیە هەندێ لەزانایان فەرموویانە دونیا ئەگەر ئەویش بۆ تۆ بمێنێ تۆ بۆ ئەو نامێنی![1]

بەڵام خانووی قیامەت ماڵی بەردەوامو نەبڕاوەیە، کۆتایی نایەو بەسەر ناچێ، جا ئەگەر ئەو موشریکانە ئەم حەقیقەتەیان بزانیایە ژیانی خۆش و بەردەوامیان هەڵدەبژارد بەسەر ژیانی کورت و کەمخایەن و بڕاوەدا.

دەڵێن: جوداوازی نێوان (لهو)و (لعب) ئەوەیە: (لعب) روکردنە بەتاڵ و هەڵەوگیربوون بەشتی ناحەقە. (لهو) رو وەرگێڕانە لەحەق.

(حَیَوان) چاوگ (مصدر)ی فیعلی (حَيَ)یە وەکوو (حیاة). وەلێ (حیوان) موبالەغەی زیاتر دەگەیەنێ.

هەندێك گوتوویانە (حیوان)و (حیاة)و (حيَ) هەرسێك مەصدەرن و یەك مانایان هەیە. هەندێکیش گوتوویانە (حيَ) جەمعە لەسەر وەزنی (فِعول) وەکوو (عِصيَ).[1]

ئەمجار پەروەردگار حاڵ و وەزعی موشریکەکان بەیان دەکا لەو کاتەدا: کە دەکەونە تەنگانەو میحنەتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ واتە: هەر کاتێ موشریکەکان لەناو دەریادا سواری کەشتی دەبن و دەکەونە ناو ترس و لەرزی کارەساتی ناو دەریاوەو لەهەموو لایەکەوە تارمایی مەرگ لێیان نزیك دەبێتەوە، دڵسۆزانە هانا بۆ خودا دەبەن و هاواری لێ دەکەن، هەر ئەو دەناسن و ئەو دەپەرستن، جا کە رزگاریان بوو کەوتە فەرەحی و هاتنە سەر وشکانی سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە بۆ سەر کوفری پێشوویان و خودا درۆزنەکانی خۆیان دەپەرستن و نیعمەتی رزگاربوونیان لەبیر

---

[1] تەفسیری قورطوبی ج٧/٢٧٢ (٣٩٠٤).

[1] هەمان سەرچاوە ج٧/٢٣٧ (٣٩٥).

دەچێتەوە، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الْضُرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُوراً﴾ (الإسراء:٦٧).

موحەممەدی كوڕی ئیسحاق لە(سیرة)كەیدا لەعیكریمەی كوڕی ئەبو جەهلەوە ریوایەت دەكا: دەڵێ: كاتێك پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەككەی كرد، ئەمن هەڵاتم ویستم خۆم لەدەستی پێغەمبەر رزگار بكەم، سواری كەشتی بوم بەرەو حەبەشە رۆیشتم لەنكاوێك كەشتی كەوتە لەقەلەق و ئەملاو ئەولا كردن، سەرنشین و (ناخودا)كانی[1] وتیان: كوڕینە هاوار بكەنە خوداو بەدڵسۆزی لێی بپاڕێنەوە، چونكە لەم جۆرە تەنگانانەدا جگە لەخودا كەس ناتوانێ كەس رزگار بكا! عیكریمە دەڵێ منیش وتم: جا كە لەدەریادا جگە لەخودا كەس كەس رزگار نەكا، بێگومان لەوشكانیشدا جگە لەخودا كەسی تر رزگاركەر نیە، خودایە عەهدو پەیمان بێ ئەگەر ئەمجارە لەم تەنگانە رزگارم بوو دەچم بۆ لای موحەممەدو دەست دەخەمە دەستیەوەو موسوڵمان دەبم و حەتمەن ئەویش خاوەن لوطف و مەرحەمەت دەبێ. واش بوو!

هەر عیكریمە دەڵێ: خەڵكانی سەردەمی نەزانی هەر كاتێ سواری كەشتی بوونایە لەناو دەیادا بتەكانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد، جا كە رەشەباو شەپۆل لێی دەدان و دەكەوتنە تەنگانەوە بتەكانیان فڕێ دەداو هاواریان دەكردە خوداو (یارب یارب)یان دەست پێ دەكرد.

ئیمامی رازی لەكتێبی (اللوامع)دا دەفەرموێ: ئەمە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە: كە ناسینی خودا لەكەسێك بەفیطرەت خودا ناس و یەكتاپەرستە جا ئەگەر لەكاتی خۆشی و فەرحانیدا لێی بێ ئاگا ببن لەكاتی تەنگانەو ناخۆشیدا بەراستی خودایان بیر دەكەوێتەوەو هانای بۆ دەبەن.

---

[1] ناخودا، واتە: كەشتیەوان.

﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا﴾ (لام)ی (ليكفروا)و (ليمتعوا) (لام)ی عاقیبەتو سەرەنجامە، واتە: شەریك بۆ خودا بڕیار دەدەن، تا سەرەنجامی کارەکەیان ببێتە سپڵەییو کوفرانی نیعمەتی رزگار بوونو (تمتع)و لەززەت وەرگرتنیان بەبتپەرستیو پەیوەستبوونیان بەپێڕی کافرانەوە.

دەشگونجێ (لام)ەکە لامی ئەمر بێ، هەڕەشە بگەیەنێ. واتە: باکافر بنو لەززەت لەبتپەرستی وەربگرن، لەوە بەولاوە دەزانن چییان لێ دەکەین.

﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ لەوە بەولاوە رۆژی قیامەت ئاکامی هەڵوێستی نالەبارو کردەوەی ناشیرینی خۆیان دەزانن چی دەبێ.

ئەمجار پەروەردگار وەصفی (تناقض)و دژایەتی نێوان هەڵوێستی کافرەکان دەکا: لەم رووەوە کاتی تەنگانە دڵسۆزانە هانا بۆ خودا دەبەنو لەکاتی فەرەحیدا پێی کافر دەبنو شتی تر بەخودا دەزانن. دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ﴾ ئایا ئەو موشریکە نەفامانە نازانن ئێمە چ نیعمەتێکمان پێ بەخشیون بەوە: کە لەبەستی حەرەم؛ لەشاری مەککەدا نیشتەجێمان کردون ولاتێکی ئەمینو پڕ ئاسایشو ئارام، کەس تێیدا دەست درێژی ناکاتە سەر کەس، کەسکەس نافرێنێ، تالانو بڕۆو چەپاو کردنی تێدا ناکرێ. بچی سوپاسی خودا ناکەن لەسەر ئەو نیعمەتانەو واز لەبتپەرستی ناهێنن؟!

ئایا نابینن ئەوان لەو ئاسایشو ئارامییەدانو لەدەورو بەریشیان ئەو هەموو تالانو بڕۆیە دەکرێ، ئەو هەموو شەڕو کوشتارو فڕاندنە ئەنجام دەدرێ؟ ئەدی بۆچی ئەوان لەجیاتی ئەوەی شوکرو سوپاسی خودا بکەن کوفرانی نیعمەتەکانی دەکەن، هاوەڵی بۆ بەڕەوا دەزانن، پەیامی پێغەمبەرەکەی رەت دەکەنەوە بەدرۆی دەخەنەوە!! ئایا ئەوان ئیمان بەبەتاڵ دەهێننو کوفرانی نیعمەتەکانی خودای مەزن دەکەن؟!

بەراستی ئەمە (تناقض)ێكی سەیرو سەمەرەیە لەهەڵوێستو كارو گوفتاریاندا، هەرگیز كەسێك عاقڵو هۆشی هەبێ شتی وا ناكا.

ئەمجار پەروەردگار مۆركی ستەمكارییان پێوە دەنێو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ﴾ كێ لەو ستەمكارترەو شیاوی سزای كوشندەترە: كە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستێو هاوەڵی بۆ دادەنێو پێغەمبەرەكەی بەدرۆ دەخاتەوەو پەیامەكەی رەت دەكاتەوە؟ كێ لەو كەسە ستەمكارترە: كە لافی ئەوە لێ دەدا خودا نیگای بۆ ناردوە وەلحاڵ خودا نیگای بۆ نەكردوە، كێ لەو كەسە ستەمكارترە تاوان دەكاو دەڵێ: خودا فەرمانی پێ كردم بیكەم! دڵنیابن خودا فەرمان ناكا بەخراپەكاریی!

﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِلْكَافِرِينَ﴾ ئایا لەدۆزەخدا شوێنی حەوانەوە بۆ ئەو سپڵەو كافرو ستەمكارانە نیە؟ ئایا ئەوانە شیاوی عەزابی دۆزەخ نین؟ بێگومان هەموو ئەوانە شیاوی سزای سەختی دۆزەخنو شوێنی حەوانەوەشیان لەوێدا بۆ ئامادە كراوە، باچاوەڕوانی بنو رۆژێك دێ گیرۆدەی دەبنو ئیتر رزگاربوونیان نیە!!

ئەمجار قورئان هەر لەسەر شێوازی خۆی: كە هەر كاتێ باسی شتێكی كرد دژەكەشی رادەنوێنێ، باسی دونیای كرد قیامەت دێنێ، حاڵی كافرەكانی رون كردەوە وەزعی موسوڵمانەكانیش شی دەكاتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ ئەوانەی لەپێناو ئایینی ئێمەدا جیهادو كۆشش دەكەن دژی ئەو سپڵەو موشریكو كافرانە دەجەنگێن، بەتێكۆشانو جیهادەكەشیان مەبەستیان بەرز بوونەوەی وشەی (لا إله إلا الله محمد رسول الله)یە، ئێمە زیاتر شارەزایان دەكەین بۆ رێبازی خێرو چاكە تۆفیقیان دەدەین بۆ پەیڕەوكردنی رێبازێك بیانگەیەنێ بەبەهەشتو بەختەوەری هەردو جیهانیان بۆ دەستەبەر ببێ، لەژیانی دونیاو قیامەتیاندا سەرفیرازبن. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾ (محمد:١٧).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من عمل بما علم ورثه الله علم مالم يعلم) کەسێك کار بەزانیاری خۆی بکا، خودا زانیاری پێ دەبەخشێ دەربارەی ئەو شتانەی نایانزانێ.

ئەبو سولەیمانی دارانی دەفەرموێ: مانای جیهاد لەئایەتەکەدا تەنیا بریتی نیە لەشەڕکردن لەگەڵ کافراندا بەڵکوو بریتییە لەیارمەتیدانی ئایینو ڕەتدانەوەی بەتاڵخوازانو ریشەکێشکردنی ستەمکاران. بڕبڕەی پشتی جیهادیش فەرمان بەچاکەو جڵەوگیری کردنە لەخراپە، جیهادی هەرە گەورەش جیهادی نەفسە.

﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ بێگومان پەروەردگار لەگەڵ ئەوانەدایە کردەوەکانیان چاکەو چاکەخوازن، یارمەتی ئاینییان داوە، جیهاد لەگەڵ ئەهلی کوفرو شیرك دەکەن، بەپیر بانگەوازی پێغەمبەرەکەیەوە دەچن، پەیامەکەی قبووڵ دەکەن.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە(الشعبي)یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عیسای کوڕی مەریەم ﷺ فەرموویەتی (إنما الأحسان أن تحسن إلى من أساء إليك، ليس الاحسان أن تحسن إلى من أحسن إليك) چاکەکاری ئەوەیە چاکە لەگەڵ کەسێکدا بکەی: کە خراپەی لەگەڵدا کردوی. چاکەکاری ئەوە نیە چاکە لەگەڵ کەسێك بکەی: کە چاکەی لەگەڵ کردبی.

**بەیارمەتی خودا سورەتی (العنكبوت) تەواوبوو خوا یارمەتیمان بدا بۆ تەواوکردنی سورەتەکانی تر...**

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

## بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

## سورەتی (الروم)

ئەم سورەتە پێك هاتووە لەشەصت ئایەتو ناونراوە بەسورەتی (الروم) چونكە سەرەتا بەهەواڵی سەركەوتنی لەشكری (رۆم) كە ئەو كاتە رۆمەكان مەسیحی بوون بەسەر لەشكری فارسدا: كە ئاگرپەرست بوون دەست پێ دەكا. هەواڵێكی غەیبی بوو قورئان رایگەندو هاتەدی ئەمەش یەكێكە لەموعجیزەكانی قورئان.

سورەتەكە هەمووی مەككییە جگە لەئایەتی ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيّاً وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾.

ناوەرۆكی سورەتەكە وەكوو هەموو سورەتە مەككییەكانی تر باسی یەكتاپەرستیو صیفاتی خودایە، باسی بڕوا بەپێغەمبەرایەتیو زیندوبوونەوەو پاداشو سزایە.

پەیوەندی سورەتی (الروم) بەسورەتی (العنكبوت)ەوە لەچەند رویەكەوەیە. هەردوكیان بە(الم) دەست پێ دەكەن بەدوایشیاندا باسی قورئان نایە، بەپێچەوانەی سورەتەكانی ترەوە: كە بەو پیتە پچرپچڕانە دەست پێ دەكەن، یەكسەر بەدوایاندا باسی قورئان دێ، لەهەموو قورئاندا جگە لەم دوو سورەتەو سورەتی (القلم) كە بەحروفی (مقطعة) دەست پێ دەكا دوا بەدوای حروفەكان باسی قورئان دەكا. سورەتی (العنكبوت) بەباسی جیهاد دەست پێ دەكاو بەباسی جیهادیش كۆتایی پێ دێو دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾. سورەتی (الروم)یش بەمزگێنی سەركەوتنی خاوەن باوەڕان بەسەر بتپەرستاندا دەست پێ دەكا. هەر بەلگەو دەلیلێك لەم سورەتەدا هێنراوەتەوە دەربارەی عەقیدەو بیرو باوەڕ درێژەپێدەرو شیكەرەوەی بەلگەو دەلیلەكانی سورەتی پێشوون.

ئەو باسانەی ئەم سورەتە لەخۆی گرتوون ئەمانـەن: سـورەتەکە بەچەسپاندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەست پێ دەکاو لەسـەر زوبـانی ئـەو هـەواڵێکی غـەیبی رادەگەیـەنێ: کـە بریتییـە لەسـەرکەوتنی لەشـکری رۆم، بەسـەر لەشـکری فارسەکان لەماوەی (٣-٩ساڵ) پێش ئەوەی ماوەکە بچێتە ساڵی دەیەمـەوە هەواڵەکـە هاتەجیۆ رۆمە مەسیحییەکان بەسەر فارسە ئاگر پەرستەکاندا زاڵ بـوون، قورئـان چۆنی راگەیاندبوو هاتە دی، ئەمەش موعجیزەی قورئانەو راسـتی پێغەمبەرایـەتی حەزرەتی موحەممەد دەچەسپێنیو مژدەی سەرکەوتنی سەربازانی خودایە بەسـەر پەیڕەوکارانی شەیتاندا.

ئەمجار بەڵگەی تاكو تەنهایی خوداو دەسەڵاتو توانای بێ سـنووری رادەنوێنـێ ئەمەش لەروانگەی تێفکرین لەبوونەوەرو وردبوونەوە لەدروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو پەنـد وەرگـرتن لەبەسـەرهاتو سـەرەنجامی سـامناکی سەرپێـچیکارانو بەدرۆخەرەوەی پێغەمبەران! دوایی بەڵگەو دەلیلی جۆراو جۆر دەهێنێتەوە لەسـەر هاتنی رۆژی قیامەتو زیندوبوونەوەی ئادەمیزادو حیسابو لێکۆڵینـەوە لەگـەڵیان، ئەمجار فەرمان دەکا بـەخودا پەرستیو خـودا بەیەکناسـین، ئەمـەش حەقیقەتێکـە لەسروشتی ئادەمیزاددا خۆی حەشارداوەو ئاوێنەی فیطرەتی بووە.

لەسورەتەکەدا موناقەشە لەگەڵ موشریکەکان ئەنجام دراوەو پەنـدو مـەثـەلیـان بـۆ هێندراوەتـەوە، ئـەوەیان بـۆ رون کراوەتـەوە: کـە ئـەو شـتانەی موشـریکەکان بـەخودایان دەزانـنو پەرسـتـشیان بـۆ دەکـەن، بـێ دەسـەڵاتو دەسەوەسـانن، رۆژی قیامـەت هیـچیان لەدەسـت نایـەو نـاتوانن هـیچ جـۆرە عـەزابێك لەپـەیڕەوکارانی خۆیان دوور بخەنەوە، ناتوانن هیچ بـەدی بێـننو دارای ئـەوەیان نیـە رزقو رۆژیـی بـۆ کـەس فەراهـەم بهێـنن. هـەروا ئـەم سورەتە حەقیقـەتێکی تـر: کـە لەسـورەتی پێشوودا رانوێندرا لێرەدا دوپاتی دەکاتەوە ئەویش بریتییە لەرونکردنـەوەی حـاڵو وەزعـی موشـریکەکان: کـە لـەکاتی تەنگانـەو تـرسو بـیمدا پـەنا بـۆ خـودا دەبـەن بەدڵسۆزی لـێی دەپاڕێنـەوە، کەچـی لـەکاتی رەوینـەوەی ترسـەکەیاندا هـاوەڵ بـۆ

خـودا دادەنـێن! دوایـی پـەردە لەسـەر سروشـتی ئـادەمیزاد هەڵدەداتـەوەو ئـەوە رادەگـەیێنێ: کـە سروشـتی ئـادەمیزاد وایـە، بـەنازو نیعمـەت کـەیف خـۆش دەبـێو بەبەڵاو تەنگانە ناهومێد دەبن. مەگەر ئەوانەیان نەبێ: کە خاوەن بـڕوای پتـەوو کردەوەی باش ئەنجام دەدەن.

ئەمجار جڵەوگیری لەشوێنکەوتنی موشـریکەکان دەکـاو فـەرمان بەماڵبەخـشین بەخزمو هەژارو رێبواران دەکا: جڵەوگیرییان لێ دەکا لـەوەی ریبـاخۆنو فـەرمانیان پێ دەکا: کە ماڵو سامانی خۆیان لەرێگەی حەڵاڵەوە گەشە پێ بکـەنو بـەزەکات لێ دەرکردن پاکی بکەنەوە.

پاشـان سـورەتەکە بەرامبەرییـەك لـەنێوان سـەرەنجامی موسـوڵمانەکان لـەناو باخـەکانی بەهەشـتداو حـاڵو وەزعـی کافرەکـان لـەناو گڕوگڵپـەی دۆزەخدا ئـەنجام دەدا بۆ ئەوەی سودی ئیمانو زیانی کوفر دەربکەوێ.

بەشوێن ئەوەدا برێ بەڵگەی کەونی رادەنوێنێ: کە نیشانەی بەتوانایی خوداو بەڵگەن لەسەر تاكو تەنهایی زاتی پاکی لەزاتو صیفاتیدا.

کۆتـایی سـورەتەکەش بەدڵدانـەوەی پێغەمبـەر ﷺ دەهێنـێو تەسـەللای ئـەوەی دەداتـەوە: کە بەهەڵوێستی نالەباری گەلەکەی تەنگەتاو نەبێ، خەفەت بەوە نەخوا: کە ئیمـانی پـێ نـاهێنن هێـزو توانـا عەقڵییـەکانی خۆیـان لـەکار خـستووەو رێبـازی هیدایـەت ناگرنەبـەرو چـەندێك نیـشانەو مـوعجیزە ببیـنن ئـەوان زیـاتر شـێلگیر دەبنو سوورتر دەبن لەسەر گومڕایی خۆیان.

**یەکەم باسی سورەتەکە باسی:**

## هەواڵدانە لەنهێنی داهاتوو

﴿ الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ

ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾﴾

هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿الم، غُلِبَتْ الـرُّومُ... الآيـة﴾ ئەوەیـە تـیرمیـذی لەئـەبو سەعیدی (الخدري)یەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: کە رۆژی بـەدر هـات رۆمـەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ بوون، موسوڵمانان پێیان خۆش بوو ئیتر ئایەتی ﴿الم، غُلِبَتْ الرُّومُ...﴾ نازڵ بوو.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو شیهابی (الزهري)یەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پێمـان گەیشتووە: کە موشریکەکان موناقەشەو جیدالیان لەگەڵ موسوڵمانەکان دەکرد لەو کاتەدا کە لەمەککەدا بـوونو هێـشتا پێغەمبـەر ﷺ کۆچی نـەکردبوو بـۆ مەدینـە. بەموسوڵمانەکانیان دەگوت: ئەوە رۆمەکان ئەهلی کیتابنو لای خۆیان خوداپەرستن کەچی فارسەئاگر پەرستەکان بەسەریاندا زاڵ بـوون! ئێـوەیش پێتـان وایـە چونکە نامەی ئاسمانی هاتووە بۆ پێغەمبەرەکەتان بەسەر ئێمەدا زاڵ دەبن! دڵنیـابن چۆن فارسەکان بەسەر رۆمە خاوەن نامـە ئاسمانییەکـەدا زاڵ بـوون ئێمـەش ئـاوا بەسـەر ئێوەدا زاڵ دەبین ئیتر خودا ﴿ألم: غلبت الروم﴾ی نازڵ کرد.

تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو جەریرو ئیبنو ئـەبی حاتـەمو بەیهـەقی ریوایـەتیان کـردوە: کـە فارسـەکان هێرشـیان کـردە سـەر رۆمـەکانو لەناوچـەی (أزرعـات)و

(بصرى)ی شام پەلاماری یەکیانداو فارسەکان بەسەر رۆمەکاندا زاڵ بوون، هەواڵی سەرکەوتنی فەرسەکان بەسەر رۆمەکاندا گەیشتە پێغەمبەرو هاوەڵانی لەمەککە، پێغەمبەرو موسوڵمانەکان زۆریان پێ ناخۆش بوو چونکە فارسەکان ئاگرپەرست بوون رۆمەکان ئەهلی کیتاب، لەهەمان کاتدا موشریکەکان ئەم هەواڵەیان زۆر پێ خۆش بوو تووشی هاوەلانی پێغەمبەر ﷺ دەبوون پێ خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی، دەیانگوت: ئێوە نامەتان هەیەو ئێمەش بتپەرستین، رۆمەکانیش ئەهلی کیتابن، ئەوەتا براکانی ئێمە: کە فارسەئاگرپەرستەکانن بەسەر برادەرەکانی ئێوەدا زاڵ بوون، ئێوەیش ئەگەر شەڕ لەگەڵ ئێمە بکەن ئاوا بەسەرتاندا زاڵ دەبین، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتانەی نازڵ کردن.

حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ چووە ناویانو پێی فەرموون: ئەوە بەسەرکەوتنی برادەرکانتان بەسەر برادەرەکانماندا کەیف خۆشن؟ نانا ئێوە بەو روداوە کەیف خۆش مەبن، سوێندم بەخودا لەوەبەولاوە بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەرمان ﷺ رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ دەبن! ئوبەی کوڕی خەلەف هەستایە سەرپێو وتی: درۆ دەکەی، حەزرەتی ئەبو بەکر فەرمووی: تۆ درۆ دەکەی ئەی دوژمنی خودا! ئەگەر راست دەکەی وەرە باگرەو بکەین لەسەر دە حوشتر ئەگەر تا سێ ساڵی تر رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا زاڵ بوون دە حوشترم بدەرێ، ئەگەر فارسەکان زاڵ بوون، دە حوشترت دەدەمێ. گرەوەکەیان کرد، دوایی حەزرەت ئەبو بەکر چووە خزمەت پێغەمبەرو ئەم هەواڵەی پێ راگەیاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (زایدە في الخطر ومادە في الأجل) ئەندازەی ماڵەگرەو لەسەر کراوەکە زیاد بکەو ماوەکە درێژ بکەرەوە، حەزرەتی ئەبو بەکر چوو بۆ لایانو تووشی ئوبەی بوو پێی گوت: وا پێ دەچێ لەگرەوەکە ژێوان بویتەوە. ئەبو بەکر فەرمووی: ناژێوان نەبوومەوە، وەرە ئەندازەی گرەوەکە زیاد دەکەینو ماوەکە درێژ دەکەینەوە، ئەندازەی گرەو لەسەر کراوەکە دەکەین بەسەد وشترو ماوەکە دەکەین بە(٩) ساڵ، ئوبەی وتی: رازیم.

جا حەزرەتی ئەبو بەکر ویستی کۆچ بکا بۆ مەدینە، ئوبەی داوای کەفیلی لەئەبو بەکر کرد، ئەبو بەکر (عبد الرحمن)ی کوڕی کردە کەفیل، کاتێکیش ئوبەی چوو بۆ شەڕی ئوحود، (عبد الرحمن) داوای کەفیلی لەئوبەی کرد، ئەویش کەفیلی پێ دا، دوایی ئوبەی لەئاکامی برینداربوونێکدا کە بەدەستی پێغەمبەر بریندار بوو مرد، ڕۆمەکان بەسە فارسەکاندا زاڵ بوون، هێشتا ساڵی حەوتەم تەواو نەبووبوو بۆ تەواو بوونی ماوەکە دوو ساڵی مابوو، حەزرەت ئەبو بەکر سەد وشترەکەی لەمیراتگرانی ئوبەی وەرگرت و بەپێغەمبەری گوت: چی لێ بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیکە بەخێر. هەڵبەتە ئەم ڕوداوە پێش یاساغکردنی قومار بووە، چونکە سورەتەکە مەککییەو حەرامبوونی قومار لەمەدینە بووە، ئێستاش پاش ئەم بەرکۆڵە دێینە سەر ڕاڤەکردنی ئایەتەکان.

﴿الم﴾ ئەم پیتە پچڕپچڕانە دەبێ بەم شێوە بخوێندرێنەوە (ألف، لام، میم) باشترین ماناش بۆ ئەم جۆرە پیتانە ئەوەیە: پەروەردگار دەفەرموێ: قورئان لەم جۆرە پیتانە پێك هاتووە، دە ئێوەش بتوانن لەو پیتانە کەلامێك وەکوو قورئان بخەنەڕوو! ﴿غُلِبَتْ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ، فِي بِضْعِ سِنِينَ﴾ ڕۆمەکان تێشکان، فارسەکان بەسەریان زاڵ بوون، لەناوچەو وڵاتێکی ڕۆمدا: کە نزیکی وڵاتی عەرەبە، لەقەراخ وڵاتی شام، لەنێوان ئەردەن و فەلەستیندا، لەوەبەولاوە لەنێوان سێ ساڵ تا دەساڵ لەبڕواری جەنگەکەوە. ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان زاڵ دەبنەوە، هەر ڕۆژە نگین و سەرکەتن دەدەین بەکۆمەڵێك.

هەڵبەتە ئەمە هەواڵێکی غەیبی بوو، ڕوداوی داهاتووی دەست نیشان کردو چۆنی ڕاگەیاند، لەداهاتوودا ئاوا هاتە دی.

بێگومان ئەم ئایەتانە کاتێك نازڵبوون: کە لەشکری پاشای فارسەکان (سابور) بەسەر لەشکری پاشای ڕۆمەکان (هیرقەل)دا زاڵ بوو، وڵاتی شام تا سنووری وڵاتی جەزیرەو قەراخ و بیجاعی وڵاتی ڕۆم کەوتە ژێر کۆنترۆڵی فارسەکانەوە، هیرقەل:

کە پاشای رۆمەکان بوو ناچار بوو بەسوپاکەیەوە بکشێتەوە بۆ قوسطەنطەنییە، لەشکری فارس لەوێش وازیان لێ نەهێنا ماوەیەك گەمارۆیان دا، بەلام نەیانتوانی قوسطەنطەنییە داگیر بکەن. پاشان نگین بۆ هیرقەل گەڕایەوەو فارسەکان کشانەوە، دوای نازلبوونی سورەتی روم سالی (٦٢٢ز) بەتێپەڕبوونی چەند سالێك و بەتەحدید لەسالی (٦٢٧ز)دا لەشکری هیرقەل پاشای رۆمەکان لەنەینەوا (موصل) لەسەر روباری دیجلە جەنگێکی یەکالاکەرەوەی لەگەڵ لەشکری فارسەکان کردو شکاندنی، لەئاکامی ئەم تێشکانەی فارسەکان لەناوچەی نەینەوا، ئەو هێزانەی گەمارۆی قوسطەنطەنییەیان دابوو ناچار بوون بکشێنەوەو ئەو ولاتە بەجێ بێلن. سالی (٦٢٨ز) (کیسری أبرویز) بەدەستی کوڕی خۆی (شیرەوەیهی) کوژرا. شایانی باسە لەو رۆژگارەدا واتە: پێش فتوحاتی ئیسلامی ئیمپراطوریەتی فارس و ئیمپراطوریەتی رۆم کۆنترۆلی جیهانی ئەو سەردەمەیان کردبوو. ئیمپراطوریەتی فارس لەرۆژهەلات و ئیمپراطوریەتی رومان لەخۆرئاوادا جێگیر بوبوون. هەمیشە لەسەر ولاتی شام کێشەیان بوو هەریەکەیان دەیەویست بۆخۆی کۆنترۆل بکاو زۆر جار ئەو ولاتە بومتە مەیدانی جەنگی خوێناوی ئەو دوو ئیمپراطورە زلهێزەی ئەو رۆژگارە. ﴿لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ﴾ هەموو کاروبارێك بەدەست خودایە پێش زالبوونی رۆمەکان و دوا زالبوونیشیان بەحیکمەت و ئیرادەی خۆی نگین و شانس دەدا بەئەو ئیمپراطورەو زالی دەکا، ئەوی تریان ژێر دەخاو شکستی بەسەردا دێنێ. هەر رۆژە یەکێك بالادەست دەبێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾ (الأعراف: ١٤٠). هەموو هێزو توانا ماددیەکان نابنە هۆی سەرکەوتن بەلکوو هۆکارێکن بۆ زالبون و سەرکەوتن، ئەوەی رۆلی گرنگی هەیە لەسەرکەوتندا دەسەلات و توانای خودایە، وا دەبێ زەعیف بەسەر بەهێزدا زال دەبێ، کۆمەلی کەم بەسەر کۆمەلی زۆردا سەردەکەون وەکوو لەئایەتێکی تردا

ئاماژە بەم راستییە دەكاو دەفەرموێ: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (البقرة:٢٤٩).

﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ، بِنَصْرِ اللَّهِ﴾ ئەو رۆژەی لەشكری قەیصەری رۆم بەسەر لەشكری پاشای ئێراندا زاڵ دەبێ، خاوەن نامەی ئاسمانی بەسەر ئاگرپەرستاندا سەردەكەون، موسوڵمانان بەسەركەوتنی خاوەن ئایین بەسەر بێ ئایینندا كەیف خۆش دەبن، هەروەكوو چۆن موشریكەكان بەسەركەوتنی فارسەكان دڵخۆش بوونو بەموسوڵمانەكانیان دەگوت: ئەوەتا ئاگرپەرست بەسەر خاوەن نامەی ئاسمانیدا زاڵ بوون، ئێمەی بتپەرستیش بەسەر ئێوەی خاوەن نامەدا زاڵ دەبین. ﴿يَنصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ پەروەردگار هەر كەسێكی بوێ سەركەوتووی دەكا بەسەر دوژمنەكەیدا، پەروەردگار هەرچی بوێ بیكا دەیكاو هیچ لەمپەرێك نیە بتوانێ بەرهەڵستی بكا. خاوەن تواناو دەسەڵاتێكی وەهایە هیچی لێ عاسێ نابێ، تۆڵە لەدوژمنەكانی دەستێنێو خۆشەویستەكانی سەردەخا، خاوەن رەحمو بەزەییە بۆ بەندە موسوڵمانەكانی، ناهێڵێ زۆردارو خاوەن توانا تاسەر بێ دەسەڵات بچەوسێنێتەوە، عەجەلەو تاڵۆكە ناكا لەتۆڵەستاندنەوەدا، بەحیكمەتو دانایی خۆی بۆ هەموو شتێك كاتی دیاریكراوی داناوە وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەم حەقیقەتە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ وَلَكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ (فاطر:٤٥).

تیرمیذیو ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمو (البزار) لەئەبو سەعیدی (الخدري)یەوە ریوایەت دەكەن، دەفەرموێ: كە رۆژی (بەدر) هات موسوڵمانان ئەو سەركەوتنە گەورەیان بەدەست هێنا، رۆمەكانیش بەسەر فارسەكاندا زاڵ بوون ئیتر ئەم رێكەوتو بارودۆخە دڵخۆشی كردن، ئیتر بەم بۆنەوە خودا ئایەتی ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ، بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ی نازڵ كرد.

کۆمەڵێکی تر لەوانە عیکریمەو (الزهری)ی قەتادەو هی تریش دەڵێن: سەرکەوتنی لەشکری رۆم بەسەر لەشکری فارسدا رێکەوتی ساڵی (الحدیبیة)ی کردوە، هەندێك لەزانایان پشتگیری ئەم رایەیان بەوە کردوە دەڵێن: قەیصەری رۆم لەسەرخۆی نەذر کرد: کە ئەگەر خودا بەسەر کیسرادا زاڵی بکا، لەشاری (حمص)ەوە بەپێ بچێ بۆ ئیلیا، واتە: بەیتولمەقدیس لەشوکرانەی سەرکەوتنەکەیدا جا: کە سەرکەوت بەپێ رۆیشت بۆ بەیتولمەقدیس کە گەیشتە ئەوێ مایەوە تا نامەی پێغەمبەری پێ گەیی: کە بەدوحیەدا ناردبووی. ئیتر دوحیە نامەکەی تەسلیم بەعەظیمی (بصری) کرد عەظیمی بوصراش نامەکەی گەیاندە عەظیمی رۆم واتە: قەیصەر، قەیصەر فەرمانیدا ئاخۆ کێ لەعەرەبی حیجاز لەشامن ئەوانیش کۆمەڵێکیان قورەیشی لەشاری غەززە بۆ دوزینەوە ئەبو سەفیانو صەخری حەربیان تێدا بوون، هێنایاننە لای قەیصەرو پرسیاری لێ کردن، لەیەکێ لەپرسیارەکانیدا وتی: ئایا غەدر دەکاو وادەو پەیمان هەڵدەوەشێنێتەوە؟ ئەبو سەفیان وتی: نەخەیر. ئێستا ئێمە لەماوەیەك داین نازانین چۆن دەبێ، مەبەستی ماوەی هودنەی نێوان پێغەمبەرو قورەیشییەکان بوو کە بەصوڵحی حودەیبییە بەناوبانگە. ئیتر ئەم ریوایەتەیان کردوە بەبەڵگەی ئەوە: کە سەرکەوتنی رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا ساڵی صوڵحی حودەیبییە بووە.[1]

**بەکورتی:**

کاتێك رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا سەرکەتن موسوڵمانان بەم سەرکەوتنە کەیف خۆش بوون، چونکە رۆمەکان ئەهلی کیتاب بوونو بەبیروباوەڕ ئەوان لەموسوڵمانەکان نزیك بوون، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى﴾ (المائدة: ٨٢) کەواتە نەصرانییەکان

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٣٠.

لەهەموو گەلو نەتەوەکان نزیکترن بۆ موسوڵمانان. ﴿وَعْدَ اللَّهِ لا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوەی پێمان راگەیاندی ئەی موحەممەد! دەربارەی سەرکەوتنی رۆمەکان بەسەر فارسەکاندا لەداهاتوودا وادەی حەقو راستە لەخوداوەیەو دێتە جێ، هەواڵێکی راستە رودەداو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە هەر دەبێ روبدا، چونکە سوننەتی خودا وا هاتووە کێ لەحەق نزیکتر بێ ئەو سەردەخا، هەر چۆنێك بێ نەصرانییەکان لەمەجووسییەکان باشترن، ئەوان نیمچە بڕوایەکیان هەیە، بەڵام مەجووسییەکان هەر هیچ باوەڕێکیان بەخوداو رۆژی قیامەت نیە. وەلێ زوربەی زۆری ئادەمیزادان ئەوە نازانن: کە خودا حوکمو بڕیاری لەسەر حەقو عەداڵەت دامەزراوە، چونکە دەربارەی یاسا کەونییەکان چ زانیارییەکیان نیە. ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِنْ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنْ الآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾ واتە: زوربەی ئادەمیزادان زانیاری رواڵەتییان لەدونیاو زانیارییە مادییەکان هەیە، کاروباری ژیانیان دەزانن، لەبواری پیشەسازیو بازرگانیو کشتو کاڵو بیناسازیو ئەو جۆرە کارانەدا کارامەو لێ هاتوون، وەلێ دەربارەی ئایینو خوداناسیو قەبرو قیامەت نەفامو کەودەنن، هیچ نازانن، بیرتیژو ورد بین نین، بیر لەداهاتوو ناکەنەوە، بەتەمای پاداشو سزای قیامەت نین، گوێ نادەنە فەرمانو جڵەوگیریەکانی پەروەردگار، نازانن لەبواری ئایینو خوداپەرستیدا چی باشە بۆیانو چی بکەنو لەبەرژەوەندییانە. تەنها زانیارییان دەربارەی ژیانی دونیا هەیە، ئەویش کاکڵەی کونهو حەقیقەتەکەی نازانن، بەڵکوو بەشێوەیەکی سەرسەرەکیو رواڵەتی ظاهیری شتەکان دەبینن. لەکاروباری قیامەت بێ ئاگانو بەرژەوەندی حەقیقی خۆیان نازانن.

**بەوردبوونەوە لەئایەتەکان ئەم تێبینیو سەرنجانەمان لا دروست دەبن:**

١- پەیوەندییەکی پتەوو توندوتۆڵ هەیە لەنێوان کوفرو شیرکدا، لەهەموو شوێنێکو لەگشت چاخو سەردەمێکدا کوفرو شیرك هەمئاهەنگن لەبەرامبەر

بانگەوازی یەکتاپەرستیو بیرو باوەڕی خوداویستیدا، هەرچەندە فرمانڕەواو گەلو نەتەوەو رژێمەکانی ئەو سەردەمە پەیوەندییەکی توندو تۆڵو تۆکمەی وەهایان نەبوە بەو چەشنەی: کە ئێستا باوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موشریکەکان لەمەککە پێیان وابوو سەرکەوتنی موشریكو بتپەرستەکان بەسەر ئەهلی کیتابدا لەهەر شوێنێك بێو لەهەر گەلو نەتەوەیەك بن سەرکەوتنە بۆ ئەوان، موسوڵمانەکانیش هەمان بیرو بۆچونیان هەبوو سەرکەوتنی ئەهلی کیتابیان پێ خۆش بوو پێیان ناخۆش بوو موشریك بەسەر خاوەن باوەڕدا زاڵ ببن.

ئای کە ئەمڕۆ موسوڵمانان پێویستیان بەم هەشتە ئیمانییە هەیەو چەند موحتاجی ئەوەین بگەینە ئەو قەناعەتە: کە سروشتی جەنگی نێوان کوفرو ئیمان لەهەر شوێنێك بێ، جەنگی ئێمەی موسوڵمانە لەگەڵ کوفردا، لەهەر شوێنێك سەرکەوتنی موسوڵمان هاتە دی ئێمە بەهی خۆمانی بزانینو پێی کەیف خۆش بین. پێچەوانەش بەپێچەوانەوە.

٢- تێبینییەکی ترو سەرنجێکی کەمان ئەو بتمانە موطلەقەیە: کە لەلای حەزرەت ئەبو بەکر دروست بوو، ئەوەبوو بەبیستنی ئایەتەکە بەبێ سێو دوو بەتەواوی بتمانەو دڵنیاییەوە گرەوەکەی لەگەڵ ئوبەیدا کردو دڵنیابوو کەوادەی خودا دێتە جێو گرەوەکە دەباتەوە. هەر ئەم بیرو باوەڕە پتەوە بوو: کە دڵی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری پڕ کردبوو بەو بیروباوەڕە پتەوەوە توانییان بەرەنگاری هەموو ناخۆشیو تەنگو چەڵەمەیەك ببنەوەو سەرکەوتنیان بەدەست هێناو بەتیشکی پەیامی پڕ تەوبەخشیان تاریکی کوفرو ستەمکارییان راماڵی.

٣- تێبینی سێیەم ئەو حەقیقەتەیە: کەرستەی ناواخنی ﴿لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ﴾ دەیگەیەنێ، کە بریتییە لەگێڕانەوەی هەموو کاروبارێك بۆ دەسەڵاتو ویستی

خـودا، لـەم روداوەو لەهـەمـوو روداوەكـانی تـردا، دەبـێ داینـەمۆی كارەكـان هەڵسوڕاندنو تـاووتوێ كردنیـان بگێڕینـەوە بـۆ دەسـەڵاتی خـوداو هـەموو شـتێك بخەینە تای تەرازووی ئەم حەقیقەتە رەهایەوە. سەركەوتنو تێشكان، پەیـدابوونی دەوڵەتێكو توانەوەی رژێمێك، بەهێزبوونی لایـەنێكو زەبـوونی كۆمـەڵێك، هـەموو گۆڕانكارییـەكو هـەموو تـاوو تـوێ كردنێـك بەویـستی خـودا دێتـە جـێو ئـیرادەی مـوطلـەقو رەهـای پـەروەردگار دەیانرەخـسێنێ. پـەروەردگار بەحیكمـەتو دانـایی خۆی دەیانهێنێتە دی. هەموو روداوو گۆڕانكاریو حاڵو وەزعەكان دیاردەی ویـستی رەهای پەروەردگارن!

## هەڵنان بۆ بیركردنەوە لەو مەخلووقاتانەی نیشانەی هەبوونی خودای تاكو تەنهان

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟

أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَـٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾

ئایەتەکان پەیوەندیان بەئایەتەکانی پێشەوە هەیەو هەڕەشە لەموشریکەکان‌و هەڵنانیان بۆ تێفکرین‌و ورد بوونەوەیان لەمەخلوقاتی خودا لەخۆگرتووە، بۆ ئەوەی ئەو مەخلووقاتانە بکەنە بەڵگەو نیشانە لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی لەئولوهییەت‌و ربوبییەتدا.

دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى﴾ ئایا ئەو موشریکانە لەعەقڵ‌و هۆشی خۆیاندا بیرکردنەوەو وردبوونەوەیان پەیدا نەکردوە؟؟ بۆ لەناخی خۆیان بیر ناکەنەوە، یان بیر لەخودی خۆیان بکەنەوە بەم جۆرە بیروهۆشی خۆیان مشت‌و ماڵ بکەن، لەدڵی خۆیاندا بڵێن: بێگومان پەروەردگار ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی لەناویاندا هەیە بەبێ هودە دروستی نەکردون، بەحەق نەبێ بەدی نەهێناون، عالەمی سەروو خواروی بەگاڵتەو عەبەث دروست نەکردوە، بەبەتاڵ نەیڕەخساندون، بەڵکوو بەحەق‌و عەدالەت، بەحیکمەت‌و ئەندازە بەدی هێناون، وەگەڕی خستون‌و هەڵیاندەسوڕێنێ هەتا کاتی دیاریکراو، ڕۆژێك دێ تەمەنیان تەواو دەبێ‌و سیستەمیان تێکدەچێ‌و قیامەت ڕادەبێ، حیساب‌و لێکۆڵینەوە دێتە گۆڕێ‌و سزا دەدرێتەو، ئەو کاتە ئەرزو ئاسمان دەگۆڕدرێن بەزەوی‌و ئاسمانێکی تر، هەموو کەس گۆڕ هەڵدەتەکێنێ ڕادەبێ‌و ئەمجار ڕاپێچی سارای مەحشەر دەکرێن، هەموویان لەو دەشتە کاکی بەکاکییەدا ڕادەگیرێن‌و حیساب‌و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ!!

ئەم ئایەتە هەڵنانە بۆ ئادەمیزادان: کە بیرو هۆشی خۆیان بخەنە کارو هەوڵ بدەن‌و تێبکۆشن بۆ دۆزینەوەی ڕێبازی خوداناسی‌و یەکتاپەرستی، لەخودی خۆیان وردببنەوە، لەبونەوەر بڕوانن‌و لەدیاردەکانی تێ بفکرن، هەستەکانیان بەکار بێنن

هێزو تواناکانیان بخەنە گەڕ بۆ ئەوەی دیاردەکانی بوونەوەر بکەنە بەڵگە لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهایی لەزاتو صیفاتدا.

﴿وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ﴾ بێگومان زۆر لەئادەمیزادان بەتایبەتی کافرو موشریكو مولحیدەکان بڕوایان بەهاتنی ڕۆژی قیامەت نیەو پێیان وایە زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو پاداشو سزا وەرگرتنەوە نیە، چونکە ئەوان لەناخی خۆیان بیریان نەکردۆتەوە، لەئەرزو ئاسمانەکان ورد نەبوونەوە تا بیانکەنە بەڵگەو نیشانە لەسەر هەبوونی خودای باڵادەستو تاكو تەنها لەزاتو لەصیفاتدا..

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادەکان هۆشیار دەکاتەوەو سەرنجیان رادەگێشێ بۆ راستی پەیامی پێغەمبەرانی، بۆ راستی موعجیزەکانیان: کە نیشانەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتییان. سەرەنجامیان رادەکێشێ بۆ حەقیقەتی لەناوچونی ئەوانەی پەیامی پێغەمبەرەکانیان رەتکردەوەو رزگاربوونی خاوەن باوەڕان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئایا ئەو موشریکانەی مەککە، ئەو بێ باوەڕو بەدرۆخەرەوانەی پەیامی پێغەمبەران، ئەوانەی بڕوایان بەقیامەتو زیندوبوونەوە نیە، بۆ بەناو زەویدا گەشتو گوزار ناکەن؟ هەتا بەعەقڵو هۆشی تەواوەوە لەرابردو ورد ببنەوە، لێکۆڵینەوە لەشوێن دەستی پەروەردگاردا ئەنجام بدەن، هەواڵو بەسەرهاتی رابوردوان ببیسن، لەسەرنجامو بەسەرهاتی گەلو نەتەوە بەدرۆخەرەوەکانی رابوردو ورد ببنەوە، بزانن ئەوانەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستۆتەوە چییان بەسەر هاتووەو بەچ دەردێك چوونو چۆن لەناومان بردن.

وەلحال ئەو گەلو نەتەوانەی پێشوو لەموشریکەکانی مەککەو هاو وێنەکانیان بەشانو شەوکەت تر بوون، هێزو توانیان پترو بەدەستو بازو تر بوون، ماڵو منداڵیان زۆر تر بوو، لەموشریکەکانی مەککە زیاتر کشتو کاڵیان دەکردو پتر

زەوییـان بۆچـاندن‌و رەوانـدن هەڵگێراوەتـەوەو سـودیان لەبـەروبوومی زەوی‌و زار وەرگرتووە.

پاشـان خـودا بـەهۆی تـاوان‌و کـوفرو سـتەمکارییان، بـەهۆی رەتکردنـەوەو بەدرۆخستنەوەی پـەیامی پێغەمبـەرانیان، بڕوانـەکردنیان بـەو هـەموو مـوعجیزەو بەڵگەو نیشانانەی: کە گەواهیدەرن لەسەر دەسەڵات‌و تاك‌و تـەنهایی خـودا، لـەناوی بردن‌و ئاسەواری بڕینەوە، لەناوبردن‌و سزادانیان ستەم نـەبوو، حاشا لـەوەی خـودا ستەمکار بێ، بـەڵکوو بۆخۆیـان ستەمیان لـەخودی خۆیـان کـرد بـەوە: کـە ئایاتی خودایـان رەتکـردەوە، گاڵتـەیان بەپێغەمبـەران‌و پـەیامی پیرۆزیـان‌و مـوعجیزەی ئاشکرایان کرد، گوێیـان بـەموعجیزەو نیـشانەکانی راسـتی پێغەمبەرایـەتییان نـەدا، لەهەڕەشـەو عـەزابی خـودا نەترسـان تـا یەخـەی گـرتن‌و تێکیـەوە پێـچان. عـاقڵ‌و هۆشـیار کەسـێکە پەنـدو عیـبرەت بەکەسـانی دیکـە وەربگـرێ، بزانـێ: کـە زەرق‌و بـەرەقی جیهـان، کـاڵاو مـەتاعی کـەس‌و کـارو مـاڵ‌و منـداڵ رۆژی قیامـەت هـیچ سودێکیان بۆی نابێ‌و ئەرك‌و نارەحەتی لەسەر سوك ناکەن!

﴿ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاءُوا السُّوءَى أَنْ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِئُون﴾

پاشان سەرەنجامی ئەوانـەی خراپـەکارن عـەزابی سـەخت بـوو، لـەدونیادا بـەهیلاك چـون‌و فـەوتان‌و ریـسوا بـوون، لەقیامـەتیشدا بەمانـەوەی هـەتا هـەتاییان لـەناو دۆزەخدا، ئەمـەش لەتۆڵـەی بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەرو پـەیامی خـودا، لەتۆڵـەی رەتکردنـەوەی بەڵگـەو نیـشانەکانی خـوداو تـاك‌و تـەنهایی زاتـی پـاکی، بـەهۆی گاڵتەکردن‌و لاقرتێ کردنیان بەئایاتی خودا!

قورئانی پیرۆز خیطاب ئاراستەی بەدرۆخەرەوە گاڵتەکەران دەکا: هەڵیان دەنـێ کـە بـەناوی زەویدا بگـەڕێن هاتوچـۆی وڵاتـان بکـەن، گۆشـەگیر نـەبن‌و خۆیـان بخۆنەوەو بەسـەر یـەکتردا داهێـزێن‌و ئاسـۆی بیروبۆچـونیان فـراوان نـەبێ. بـەڵکوو پێویستە بگەڕێن‌و سەرنج بدەنە ئاکام‌و سەرەنجامی گەلە سـتەمکارەکان، چاوەڕوان بن ئەوەی بەسەر ئەوان هاتووە بەسەر ئـەمانیش دێ دڵنیـابن: کـە سـوننەتی خـودا

ناگۆڕێو خودا مەرایی بۆ كەس ناكاو منەتی لەكەس نیە، بزانن: ئادەمیزاد یەكیەتی بانگەوازیو یەكیەتی سەرەنجامو ئاكامیان هەیە.

## چەسپاندنی زیندوبوونەوەو حەشرو روداوەكانی كاتی گەڕانەوە بۆ لای خودا

﴿ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآئِ ٱلْءَاخِرَةِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی راگەیاند: كە سەرەنجامی تاوانباران ئاگری دۆزەخە، ئەوەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیە بۆ زیندوبوونەوەو حەشر كردن، ئەمجار لێرەدا بەڵگە لەسەرئەوە دەهێنێتەوە: كە ئەو خودایەی سەرەتا لەنەبوەوە ئادەمیزادی دروست كردوە دەتوانێ جارێكی دی پاش مردن سەرلەنوێ زیندویان بكاتەوە، هیچ شتێك نیە بتوانێ خودا لە ئەنجامدانی ویستو ئیرادەی دەستەوەستان

بكا، ئەمجار كاتی گەڕانەوە بۆ لای خودا دیاری دەكاو ئەوە رادەگەیەنێ: كە ئەو كاتە ئادەمیزادەكان دەبنە دوو تاقمو پێڕێكیان دەچنە بەهەشتو پێڕێكیان دەخرێنە ناو دۆزەخ.

دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: خودا هەروەكوو توانیویەتی سەرەتا ئێوەو مەخلووقات دروست بكا دەشتوانێ جارێكی تر سەرلەنوێ دروستتان بكاتەوە، ﴿الله﴾ خودایەكی ئەوتۆیە بەقودرەتو ویستی خۆیمەخلووقاتی بەدی هێناوە، هیچ شتێك نیە بتوانێ ببێتە لەمپەرو رێگای زیندوكردنەوەی لێ بگرێ، پاشان هەمووتان رۆژی قیامەت دەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو كۆ دەكرێنەوە بۆ دادگایی كردن.

هەریەكە بەگوێرەی كردەوەی خۆی پاداشو سزای دەدرێتەوە.

ئەمجار باسی حاڵو وەزعی بەدبەختەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ﴾ ئەو رۆژەی قیامەت رادەبێ بۆ دادگایی كردنی ئادەمیزادو حیسابو لێكۆڵینەوە لەگەڵیان، موشریكو تاوانباران متەقیان لێ نایە بێ دەنگو خوست دەبن، لەترسانو لەعەیبەتان بەڵگەیان بەدەستەوە نامێنێو ناهومێد دەبنو رێگای رزگاربوونیان دەست ناكەوێو كەس نیە فریایان بكەوێ ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ مِنْ شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ﴾ كافرو تاوانباران شەفاعەتكاریان دەست ناكەوێ، ئەو بتو صەنەمانەی: كە لەجیاتی خودا لەدونیادا عیبادەتیان بۆ دەكردن شەفاعەتیان بۆ ناكەن بۆشیان بكەن لێیان وەرناگیرێ، ناتوانن لەعەزابی خودا رزگاریان بكەن ئەو كاتە ئینكاری خودا درۆزنەكانیان دەكەن، خۆیانیان لێ بێ بەری دەكەن، لەكاتێكدا خیانەتیان لێ دەكەن: كە پێویستیان بەیارمەتی هەیە. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ، وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّؤُواْ مِنَّا﴾ (البقرة:١٦٦-١٦٧) ئەمە نیشانەی ئیفلاسیو خەسارەتمەندییانە.

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ﴾ ئەو رۆژەی قیامەت رادەبێ ئادەمیزاد پەرتو بڵاو دەبنو لێك جیا دبنەوە، هەر لەو كاتەوە پەروەردگار پێیان دەفەرموێ: ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ (یس:٥٩)، تێكرِا دەكرێنە دوو تاقم، تاقمی خواپەرستانو تاقمی موشریكو تاوانباران، كۆمەڵی ئیماندارو بەختەوەر دەبرێنە بەهەشتو ئەهلی كوفرو بەدبەختیش راپێچی دۆزەخ دەكرێن، ئیتر لەوەدوا ئەم دوو كۆمەڵە یەكدیگیر نابنەوە، قەتادە دەڵێ: سوێندم بەخودا لێك جیابوونەوەیەكە لەوەدوا یەكدی نابیننەوە، لێك دابرِانێكە كۆبوونەوەی بەدودا نایە. بۆیە بەشوێن ئەو هەواڵە كورتەدا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ﴾ جا ئەو موسوڵمانو خواپەرستانەی لەژیانی دونیادا ئیمانیان بەخوداو بەپێغەمبەرو رۆژی دوایی هەبوە، بەپێی فەرمانی خودا هەڵسو كەوتیان كردوەو پابەندی جڵەوگیرییەكانی شەریعەتی خودا بوون، ئەوانە لەناو لەززەتو خۆشی بەهەشتدا تەرِدەماغو دڵخۆش، لەخۆشیان دەمو چاویان دەگەشێنەوە، كەیف خۆشن بەو نازو نیعمەتەی پێیان دراوە، بەناو باغو باغاتی بەهەشتی رازاوەدا دێنو دەچنو لەززەت وەردەگرنو هەموو خۆشییەكیان بۆ دەستەبەر دەبێ، بەهەر لایەكدا برِۆن دیمەنی جوانو خۆشی هێنەرە، هەرچی سەیری بكەن دڵخۆشیان دەكاو فەرەح بەخشە. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەجوانیو رازاوەیی بەهەشت دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ (السجدة:١٧) ئیمام ئەحمەدو هەردوو پیری فەرموودەو تیرمیذیو ئیبنوماجە لەئەبوهورەیرەوە فەرمودەیەكیان ریوایەت كردووە؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خۆشیو جوانی بەهەشت فەرمویەتی: (فیها مالا عین رأت، ولا أذن سمعت، ولاخطر علی قلب بشر) لەبەهەشتدا شتی وای تێدایە چاو نەیبینیوە، گوێچكە نەی بیستووە، بەڵكوو بەسەر دڵی هیچ كەسیشدا رانەبوردوە..

﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الآخِرَةِ فَأُوْلَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾

ئەمما ئەوانەی کافرو موشریكو بێ بڕوان؛ ئینکاری هەبوونی خودا دەکەن، بڕوایان بەتاكو تەنهایی خودا نیە، پێغەمبەرەکانی بەدرۆ دەخەنەوە، موعجیزەو ئایەتەکانی رەتدەکەنەوە، پێیان وا نیە دوای مردن زیندوبوونەوە هەبێ، ئەوانە هەموویان لەناو ئاگری دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، بەبەردەوامی دۆزەخ خانەو شوێنی حەوانەوەیانەو ساتە وەختێکیش رزگاریان لێی نابێو ئەو عەزابەیان لێ سوك ناکرێ. وەکوو لەچەند ئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا﴾ (الحج: ٢٢) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ، لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ (الزخرف: ٧٤-٧٥).

بەڵێ ئەوەیە حاڵو وەزعی ئادەمیزادان لەقیامەتدا، ئەوەیە ئەو قیامەتەی ئەو نەفامانە لێی بێ ئاگان، بڕوایان پێی نیە ئەوەیە ئەو رۆژەی ئادەمیزادان لێك دادەبڕێنو ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی دی یەکتر نابیننەوە!!

ئەمجار لەم جەولە خێرایەی کردی بەناو دیمەنەکانی قیامەتداو روداوەکانی، لەو جیهانەوە دەگوێزێتەوە بۆ ئەم جیهانەو سەرنجی ئادەمیزادان بۆ دیمەنەکانی بوونەوەرو ژیان، بۆ سەرنجدان لەعەجائیبی مەخلووقاتو نهێنی دەروونو موعجیزەی دروستکردن وەکوو لەم کۆپلە ئایەتەی دوایی بۆمان دەردەکەوێ.

## تەنزیهو تەقدیسی خودا لەهەموو کاتو بارو دۆخێکدا

﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ (١٧) وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ (١٨)

﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾﴾

دوای بەیانکردنی گەورەیی خوداو تواناو دەسەڵاتی لەدروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا لەسەرەتای بەدیهێنانی بوونەوەردا، شکۆمەندی زاتی پاکی لەکاتی رابوونی قیامەتو کۆتایی هاتنی تەمەنی دونیاو پۆلێنکردنی ئادەمیزادەکان بۆ دوو تاقمو پێڕ، کۆمەڵێکیان بەهەشتیو کۆمەڵێکیان دۆزەخی. دوای بەیانکردنی ئەو حەقیقەتانە ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەبەندەکانی دەکا: کە تەنزیهو تەقدیسی بکەن، هەرچی صیفاتی جەمالو کەماڵە وەپاڵی بدەن، لەهەموو عەیبو خەوشو نەقصێك بەدووری بگرن، خەریکی حەمدو سوپاسی بن، چونکە تەنها خودا دەتوانێ ژیان ببەخشێو ژیان وەگرێتەوە. هەر ئەو دەتوانێ بارن ببارێنێو زەوی مردوو زیندو بکاتەوە، هەروەکوو چۆن دەتوانێ ئادەمیزادان لەگۆڕەکانیان راست بکاتەوە بۆ حەشرو حەقو حیساب..

دەفەرموێ: ﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾ واتە: هەموو کاتێ، لەشەوو رۆژدا تەسبیحاتی خودا بکەن، تەقدیسو تەنزیهی بکەن لەسەرەتای پەیدابوونی شەوداو لەسەرەتای هاتنی بەیانیدا سەرگەرمی تەسبیحو تەقدیس بن. لەهەموو ئەم کاتانەدا سوپاسی خودا بکەن، لەئێوارەدا نوێژی مەغریبو نوێژی عیشا دەگرێتەوە، کاتی بەیانیش نوێژی بەیانی دەگرێتەوە، بۆیەش ئێوارەی پێش بەیانی خست چونکە شەو پێش رۆژە.

﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایە حەمدو سوپاس لەئاسمانەکانو زەویدا، هەر حەمدو سوپاسێك فریشتەو ئادەمیزادو جندۆکە بیکەن شایانی خودایە، هەر ئەو شایستەی حەمدو ئەنایە. رستەی ﴿وَلَهُ الْحَمْدُ فِي

السَّمَوَاتِ...﴾ رستەیەکی ناواخنەو بەبۆنەی تەسبیحو تەنزیهەوە هێناویەتی‌و بۆ ئێرە گونجاوە! ﴿وَعَشِيّاً﴾ هەروەها تەسبیحو تەنزیهی خودا بکەن لەکاتی عیشادا، کاتێك بەتەواوی تاریکی باڵی خۆی بەسەر سروشتدا دەدا.

﴿وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ هەروەها تەسبیحی خودا بکەن لەکاتی نیوەڕۆدا، لەوکاتەدا خۆر لەهێڵی ناوەڕاستی ئاسمان لادەدا.

تێبینی دەکرێ: کە تایبەتکردنی ئەم کاتانە بەتەسبیحو تەنزیهو خوداپەرستی لەم روەوەیە: کە لەم کاتانەدا گۆڕانکاری بەسەر سروشتدا دێ، ئادەمیزاد هەست دەکا مەعالیمەکان لەحاڵێکەوە دەچنە حاڵێکی ترو لەکاتێکەوە دەگوێزنەوە بۆ کاتێکی تر دیمەنی سروشت دەگۆڕێ. فێنکایی بەیانی‌و زەردەی سەرەتاو بڵاوبوونەوەی روناکایی، بەهێزبوونی روناکی تا دەگاتە نیوەڕۆ، ئەمجار لادانی خۆر لەهێڵی ناوەڕاستی ئاسمانو مەیل کردنی بەرەو خۆرئاواو ئەمجار ئاوابوونی خۆرو هاتنی تاریکی.

بەکورتی هەموو کاتێك تەنزیهی خودا بکەن لەصیفاتی نەقصو کەم‌و کوڕی بەدووری بگرن. هەمیشە بەصیفاتی کەماڵو جەلال وەصفداری بکەن. بەدڵ یەکتاپەرست بن، بەزوبان دان بەتاك‌و تەهایی خودادا بنێنن، بەکردەوەش راستی ئەو بیروباوەڕە بچەسپێنن.

ئەمجار پەروەردگار بڕێ دیاردەی دەسەڵاتی رەهای خۆی رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنْ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنْ الْحَيِّ﴾ پەروەردگار توانای دروستکردنی دژبەیەکی هەیە، دەتوانێ زیندو لەمردو دەربێنێ‌و مردو لەزیندو دەربێنێ. ئەوەتا سەرەتا ئادەمیزادی لەگڵ دروست کردوە پاشان لەدڵۆپە ئاو، باڵندەی لەهێلکە دروست کردوە، بەپێچەوانەشەوە مەنی لەئادەمیزاد دەردێنێ‌و هێلکە لەباڵندە. هەروا موسوڵمان لەکافر دەبێ‌و کافر لەموسوڵمان.

﴿وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ هەروەها پەروەردگار زەوی وشكو مردوو سوتەمەرو بەباران زیندو دەكاتەوە، روەك لەدانەوێڵە دەردێنێو دانەوێڵە لەروەك پەیدا دەكا. ﴿وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ هەر بەو شێوەش ئێوە لەگۆڕەكانتان راست دەكاتەوە، دوای مردنو هاتنی رۆژی قیامەت ئێوە سەرلەنوێ زیندو دەكاتەوە. ئەوەش بۆ خودای خاوەن دەسەڵاتی رەهاو موطلەق كارێكی ئاسانو بێ ئەركە، بەڵكوو لای خودا هەموو كارێك كارێكی ئاسانە.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە: كە دەفەرموێ: ﴿وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ، وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنْ الْعُيُونِ﴾ (يس:٣٣-٣٤) یان دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ (الحج:٥) بێگومان دەرهێنانی مردو لەزیندو زیندو لەمردو عەمەلییەكی بەردەوامو هەمیشەیییە، هەموو ئانو ساتێك لەهەمووو كونو قوژبنێكی زەویدا لەهەوادا، لەناو قوڵایی دەریادا، ئەم دیاردانە دوبارە دەبنەوە بەڵام لەبەر ئولفەت پێوەگرتنو دوبارە بوونەوە سەرنجی ئادەمیزاد كێش ناكەنو لێیان وردنابنەوەو نایانكەنە بەڵگە لەسەر هەبوونی بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری خاوەن دەسەڵاتیان.

## برێ بەڵگەو نیشانە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو بەدەسەڵاتیو كار دروستیو روداوی حەشر

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ

فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ بِأَمۡرِهِۦۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمۡ دَعۡوَةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ إِذَآ أَنتُمۡ تَخۡرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾

لـەوەپێش فـەرمانی بـەئادمیزاد کـرد: کـە تەسـبیحو تەقدیـسی خـودا بکـەن، هەموو خەوشو نەقصێکی لێ دوور بخەنەوە، ئەوەشی راگەیاند: کە هەر ئەو شیاوی سوپاس بۆ کردنەو هەر ئـەو دەتوانـێ ژیـان ببەخـشێو ژیـان وەربگرێتـەوە، ئـەمجار لێـردا بەڵگـەی تـاكو تـەنهایی خـودا دێنێتـەوە، گـەورەییو شـکۆمەندیو بـەتوانایی خـودا دەچەسـپێنێ، بەڵگـە لەسـەر هـاتنی قیامـەتو زینـدو بوونـەوە دەهێنێتـەوە، سـەرەتا لەدروسـتکردنی ئـادەمیزاد لـەگڵ دەسـت پـێ دەکـاو ئـەمجار درێـژە پێـدانی رشتەی ئادەمیزاد بەهۆی زاوو زێوە شی دەکاتەوە.

ئـەمجار بـەدێهینانی ئاسمانـەکانو زەویو دیمەنـەکانی بوونـەوەرو جـوداوازی نێوان دەنگو رەنگی ئادەمیزادو نووستنو ئارام گرتنیـان بەشـەوو کاسـبی کردنیـان بـەرۆژ رادەنوێنـێو دەیانکاتـە بەڵگـەو نیـشانەی خـودای کاردروسـتو دانـاو زانـاو بەتوانا، ئەمجار برێ لەدیاردەکانی بوونەوەر وەك هـەورە بروسـکەو بـارینی بـارانو روەك روانو زیندو بوونەوەی زەوی رادەنوێنێ.

ئەمجار گەرندنکەچی ئاسمانو زەوی بۆ ویـستو فـەرمانی خـودا دەچەسـپێنێو زیندوبوونەوەو بەدەنگەوە هاتنی مردوەکانو رابوونیان لـەوگۆڕەکانیان بەفـەرمانی خودا دەسەلمێنێ، ئەمانـەش هـەموو لەروانگـەی کـەمالی قـودرەتو توانـاو دەسـەڵاتی رەهای خودای تاكو تەنهایە: کە چۆن سەرەتا توانیویەتی مەخلووقات بەدی بێنـێ، ئاواش دەتوانێ رۆژی قیامەت زیندویان بکاتـەوە. راپێـچی دەشـتی مەحـشەریان بکـا بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵیان!

دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ﴾ برێـك لـەو بەڵگانـەی گـەورەیـیو بەتوانایی خودا دەسەلمێنن، نیشانەی کـەمالی قـودرەتی پـەروەردگارن لەبـەدیهێنانو دروسـتکردنو فەوتانـدندا: دروسـتکردنی ئـادەمیزادە لەسـەرەتاوە، بەدیهێنانیـەتی لەنەبووەوە: ئەوەتا لەسەرەتادا باوکی ئێوە: کـە بابـە ئادەمـە لـەگڵ دروسـتی کـردوە، بناغەی ئێوە لەگڵە. سەرچاوەی بژێویشی لەدانەوێڵـەو بـەروبوومی ئـاژەڵو گۆشـتی ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان دەخورێ دابینکردوە، ئەمانەش هەموویان لەگڵ پەیـدا

دەبن، ﴿ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾ پاش دروستکردنی یەکەمجارتان لەرێی زاووزێوە پەرەتان سەندو بەمەبەستی بەدەستهێنانی رزق و رۆزی و پێداویستی ژیانتان بەدونیادا بڵاوبوونەوە هەریەکەتان بەمەبەستێك و لەبەر هۆیەك لەشوێنێکدا جێ نشین بوون و سەرزەویتان کۆنترۆڵ کرد، شارو گوندو قەڵاو شوراتان تێدا دروستکردن، کشت و کاڵ و بازرگانی و ئاژەڵداری پیشەسازیتان تێدا ئەنجام دا گەشت و گوزارو هاتووچۆتان تێدا دەست پێ کرد، هەریەکەتان بەعەقڵ و زانیاری و بیرو بۆچونی تایبەتی خۆی کەوتە کارکردن و هەوڵدان بۆ ژیان. هەریەکەتان بەشێوەیەك ژیان دەگوزەرێنن؛ هەتانە هەژارو هەتانە دەوڵەمەند، هەتانە کامەران و هەتانە بەدبەخت.

ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذی و ئەبوداود لەئەبو موسای ئەلئەشعەرییەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ان الله خلق آدم من قبضة قبضها من جميع الأرض، فجاء بنو أدم على قدر الأرض جاء منهم الأبيض والأحمر والأسود وبين ذلك والخبيث والطيب، والسهل والمزن وبين ذلك)

ئەمجار پەروەردگار باسی بناغەی خێزان دەکاو هۆکاری مانەوەی نژادی ئادەمیزاد دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ برێك لەو ئایەتانەی؛ کە نیشانەی کەمالی قودرەتی خودان و دیاردەی رەحمەتی بەرفراواننی، ئەوەیە: کە ئافرەتی لەرەگەزی خۆتان بۆ دروست کردون (ئافرەتی بۆ پیاو دروست کردوەو پیاوی بۆ ئافرەت دروست کردوە، هەردوکتان پێکەوە کۆمەڵ دروست دەکەن!) بۆیە سەرەتا لەگەزی پیاو ئافرەتی دروست کردوە بۆ ئەوەی ئێوەی پیاو وەگریان بن و خویان پێوە بگرن و ئولفەتیان لەنێواندا بەردەوام بێ، هەروەها خودا لەنێوان هەردو رەگەزدا خۆشەویستی و رەحمەت و سۆزی رەخساندوە، بۆ ئەوەی هەردولا مەیلی یەکتر بکەن و دڵیان پێکەوە دابمەزرێ و هەردوو لایان ئەرکی ژیان هەڵبگرن و کاری

سروشتی خۆیان ئەنجام بدەن، لەسەر بناغەی خۆشەویستی خێزان پێکەوە بنێن. لەسەر پتەوترین پاساو بناغە خێزان دابمەزرێنن، خۆشەویستیو دڵ ئارامیو بتمانە بەیەك کردن لەنێوانیاندا بگاتە ئاستێکی بەرزو بەجوانترین شێوە هەڵسو کەوت بکەن.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ بێگومان لەو شێوە دروستکردنەی ئێوەدا: کە سەرەتا پەروەردگار بابە ئادەمی ئێوەی لەگەڵ دروست کردووەو دوایی دایە حەوای لەرەگەزی ئادەم بەدیهێنانەوەو ئەمجار لەرەگەزی خۆتان هاوسەری بۆ بەدی هێناونو خۆشەویستی میهرەبانیو دڵسۆزی تایبەتی لەنێوان خوڵقاندون سۆزی ئالەم جرە کارە نایابە خودا کردەدا بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر هەن لەسەر بەتواناییو تەنهایی خودا بۆ کەسانێك ژیرانە بیر بکەنەوە.

باوە ئەدام لەگڵ دروست کراوە، نەوەو نرۆیتی لەدڵۆپە ئاو (مەنی) پەیدا بوون (تۆم)یش لەخوێن پەیدا دەبێ. خوێنیش لەخۆراكو خۆراکیش لەخاك پەیدا دەبێ. سەرەنجامیش دەبنەوە خاكو دواییش لەو خاکە جارێکی تر دروستتان دەکاتەوە.

پەروەردگار پەیوەندی ژنو مێردایەتی لەنێوان رەگەزی نێرو مێدا پتەو کردوە، حەزو ئارەزۆکانیانی یەکدیگیر کردونو سروشتی پێکەوە گونجاندون بیروشییان بەیەك دێو بەیەکەوە ئارام دەگرنو راحەتی نەفسیو جەستەییان لەسۆنگەی یەکترەوە بۆ دەستەبەر دەبێ، چونکە هەموو کاتێ نەفسی ئادەمیزاد حەزی لەشتێکە لەگەڵیدا بگونجێو پێداویستیەکانی دابین بکا. بەشێوەیەکی سروشتیش نێرو مێ حەزو ویستەکانی یەکتر دابین دەکەنو ئارامی بەیەکتر دەبەخشنو لەززەت لەیەکتر دەبینن و پێکەوە ژیانیان لەلا شیرین دەبێ!

ئەمجار پەروەردگار بەڵگەی تر رادەنوێنێ لەسەر هەبوونی خۆیو خودایەتیو تاكو تەنهاییو بەتواناییو بالادەستی بەسەر بوونەوەردا، داناییو دەسترەنگینی لەبەدیهێنانی بوونەوەرو ئادەمیزاددا. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ

وَالْآرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ﴾ بڕێك لەو بەڵگانەی نیشانەی کەماڵی قودرەتی پەروەردگارن دروستکردنی ئاسمانەکانو بەرزکردنەوەو راگرتنیانە بەبێ کۆڵەکە. بەخۆرو مانگو ئەستێرە رازاندویتەوە، زەوی بەدی هێناوە بەهەموو توێژو کاژێکیەوە: کە دەوڵەمەندە بەکانو مەعادینی جۆراو جۆر، کێوی تێدا چەسپاندراون بۆ ئەوەی لەرزە نەکاو دانیشتوانی خۆی لەسەر بگرن.

بێگومان دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی، واتە: دروستکردنو بەدیهێنانی ئەم بوونەوەرە گەورەو فراوانە سەرسوڕهێنەرە: کە لەراستیدا ئێمەی ئادەمیزاد کەمتر لەکەمی لێ دەزانین، ئەو هەموو ئەفلاكو مەجەڕاتو ئەستێرەو شارە ئەستێرەو خۆرو مانگو گەلێ شتی تر: کە ئێمە وێڕای ئەوەی نەمان بینیوە ناتوانین بەخەیاڵیش تەصەوریان بکەینو چۆنیەتیەکەیان بەذیهنی خۆماندا رەنگبێژ بکەین، بوونەوەرێك: کە گۆی زەوی لەئاستیدا وەکوو گەردیلەیەك وایەو ج نموودێکی نیە. کەچی وێڕای گەورەیی‌و بەرفراوانی ئەم بوونەوەرە، ئەو تەنظیمەو تەنسیقە سەرسوڕهێنەرە لەنێوان ئەفلاكو مەداراتو قەبارەکانیدا هەیە، مەلایین ساڵە هەڵدەسوڕێ، ساتە وەختێك لەگەڕان نەکەوتووە، نێوانو ئەبعادیان گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، ئەم حەشاماتە لەقەبارەی زەبەللاحو بچوك بەبەردەوامی لەهەڵسوڕاندانو دێنو دەچن، بەبێ ئەوەی لێك بخشێنو دەعم بکەن، عەطەلو خەلەلیان تێدا پەیدا بێ، ئەمە لەروی قەبارەو یاساوە، ئەگینا لەروی سروشتو نهێنی ناویان، لەروی دیاردەو نیشانەی جۆراو جۆریان، لەروی ئەو یاساو قانوونو ئەو دەسەڵاتەی رایگرتوونو هەڵیان دەسوڕێنێ درێژە بەکاری خۆیان دەدەن، ئەوە زۆر لەوە گەورەترە زانیاری ئادەمیزاد پەی پێ بەرێو بزانێ چیەو چۆنە، تا ئێستاو لەمەودواش ئادەمیزاد کەمێکی کەم نەبێ نەیزانیوەو نایزانێ، تەنانەت ئەم گۆی زەوییەی کە لەسەری دەژین تا ئێستا زانیارییەکی کەمتر لەکەمی لێ دەزانین.

ئەمە ئاماژەیەکی سەرپێیی بوو دەربارەی ئایاتی جۆراو جۆری بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی؛ کە ئێمە بەخێرایی بەسەریاندا تێدەپەڕینو سەرنجیان نادەینێو لێیان ورد نابینەوە، لەکاتێکدا بەوردیو درێژی دەربارەی کۆمپیوتەرێك ئەنتەرنێت سەیارەیەك صاروخێك...هتد کە ئادەمیزاد دروستی کردوە یان بلێین لێکی داوە، دەدوێینو بەموجەلەدات لەسەریان نووسراوە. هەرچەندە ئەو ئامێرانە بۆ ماوەیەك ئیش دەکەنو پاش ماوەیەك لەکار دەکەون، بەلام ئەو کەونە عەظیمە. ئەو هەلخولانو هاتووچۆیەی بەردەوامەو ماکینەکەی نەسواوەو تێك نەچووە. کەچی وێڕای ئەم حەقیقەتە هەندێ سەرلێ شێواوو گومڕا پێیان وایە ئەو کەونە بەرفراوانە سەرسوڕهێنەرە بەسودفە هاتۆتە وجودو بەدیهێنەری نیە، راگرو هەلسوڕێنەری نیە، کەسانێکیش هەن گوێ بۆ ئەم قسە هەرەمتو پەڕمتانە دەگرنو خۆشیان بەرۆشنبیر دەزانن!!!

جا ئەگەر رۆشنبیریی ئاوا بێ ئەی دەبێ نارۆشنبیریی چۆن بێ؟ جا ئەگەر ئایاتی ئاسمانەکانو زەوی عەجایەبو سەرسوڕهێنەر بێ، ئەوە ئیختیلافو جوداوازی ئادەمیزاد لەزوبانو رەنگیاندا ئایەتێکی ترەو نیشانەی گەورەییو تاكو تەنهایی خودای پەروەردگارەو حەتمەن پەیوەندییەکی بنەڕەتیشی بەدروستکردنی ئاسمانەکانو زەوییەوە هەیە. جوداوازیی کەشو هەوای ئیقلیمەکانو کیشوەرەکانو گەرمێنو کوێستانو بەستەلەكو گەرمەسێر کە بەهۆی سروشتی فەلەکی زەوییەوە پەیدا دەبنو کاریگەرییەکی بنەڕەتی هەیە بەجوداوازی زوبانو رەنگەوە هەیە، هەرچەندە هەموویان لەبنەماو پەیدابووندا یەك توخمنو لەیەك باوكو دایك کەوتوونەوە.

زانایانی ئەمڕۆ ئیختیلافی رەنگو روخسارو جوداوازی زوبان دەبیننو دەبیسنو لەم دیاردانە وردنابنەوە، رۆلی خودای تێدا بەدی ناکەن، نایکەنە نیشانەی تاكو تەنهایی خوداو قودرەتی رەهای وادەبێ لێکۆلینەوەیەکی زانستیانە لەسەر ئیختیلافی زوبانو رەنگەکان دەکەن، بەلام نایەن هەلوێستەیەك بکەنو بیر

لەبەدیهێنەرو نەخشەكێشی ئەم دیاردانە بكەنەوەو تەمجیدی پەروەردگار بكەن، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە: كە زوربەی ئادەمیزاد زانیاری بنەڕەتیو حەقیقییان نیەو سەرسەرەكی لێكۆڵینەوەی دیاردەكان دەكەنو كاكڵەو ناوەرۆك نازانن وەكوو لەوەپێش قورئان ئاماژەی پێ كردو فەرمووی: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ لەزانیاری پەیوەست بەدونیاوە تا ئەندازەیەك پێشكەوتن بەدەست دێنن، بەڵام ج زانیارێكیان دەربارەی ژیانی قیامەت نیە.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ بێگومان لەوەی ئاماژەمان دەربارەی ئاسمانەكانو زەویو جوداوازی زوبانو رەنگی ئادەمیزادەكان، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر هەن لەسەر قودرەتی بێ سنووری خودا بۆ گەلو نەتەوەیەك خاوەن بیرو فام بن، ژیرو خاوەن عەقڵی روناك بن، زانیاری بەسودو گەیەنەر بەحەقیان هەبێ، رەهنومایییان بكا بۆ بیركردنەوە لەمەخلووقاتو بگاتە ئەو قەناعەتە: كە ئەم مەخلووقاتە بەبێهودە دروست نەكراوەو حیكمەتو بەرژەوەندییەكی بەرزو پیرۆز لەبەدیهێنانیاندا هەیە.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ﴾ بەشێك لەنیشانەی رەحمەتی خودا لەسەر ئێوەی ئادەمیزاد ئەوەیە ماندو حەسانەوەو نوستنی لەشەودا بۆ رەخساندون، هەروەكوو لەرۆژیشدا دەتوانن بخەون. كاتی گونجاوو سروشتی بۆ ئارام گرتن حەسانەوەو نووستن شەوە. كاتی گونجاو سروشتیش بۆ جمو جوڵو هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی رزقو رۆژیو ژێوار پەیداكردن رۆژە، دابو نەریتی زوربەی ئادەمیزاد بەو شێوەیە بەشەو پشوو بدەن بەجەستەیانو بەرۆژ هەوڵی بەدەستهێنانی پێداویستی ژیان بدەن. یاخود لەشەودا برێكی بۆ نووستنو برێكی بۆ كاسبی كردن بێ، لەرۆژیشدا برێكی بۆ هەوڵو تێكۆشانی ژیان بێو برێكی بۆ نوستنو حەسانەوە بێ. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ بێگومان لەم گونجانو پەیوەندییە سروشتییەی ئادەمیزادو گیالەبەرانی تریش بەدیاردە

کەونییەکانەوەو ئەم تەنسیقە لەنێوانیاندا بەڵگەو نیشانەو پەندو ئامۆژگاری هەن بۆ گەل و نەتەوەیەك کوێچکەی بیستنی ئامۆژگارییان هەبێ. بەفامو ژیرییەوە شت ببیسن و تێی بگەن و کاری پێ بکەن، گوێیان لەبەڵگەو ئایەتەکان بێ و بیانهەژێنن، پەروەردگار سروشتی ئادەمزیادی وا دارشتوە لەگەڵ بوونەوەردا بگونجێ، روناکی رۆژ گونجاوە بۆ هەوڵدان و تێکۆشان، تاریکی شەویش لەبارە بۆ پشوودان و نوستن.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمْ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الآرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ هەروەها برێك لە ئەو ئایەتانەی نیشانەی گەورەیی و بەتوانایی خودان ئەوەیە هەورە بروسکەتان نیشان دەدا ترستان لێیەتی، بەتایبەتی ئەوانەتان: کە لەدەشت و سارادا دەبن، لەناومالّ و ئەشکەوتدا نابن. بەتەمای بارینی بارانن بۆ پێویستیاتی ژیانی خۆتان و ئاژەڵ و کشتوکاڵتان، بۆ ئاودانی باخ و باغاتتان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الآرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ (الروم: ٢٤) زەوی وشك و برینگ و سوتەمەڕۆ بەو بارانە زیندو دەبێتەوە درەخت و رووەکی وەخۆ دەکەونەوەو سەرلەنوێ زەنوێر دەبنەوە.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بێگومان لەم دیاردە کەونیانەو لەباراندنی باران و زیندوکردنەوەی زەوی وشك و سوتەمەڕۆ نیشانەو بەڵگەی جۆراو جۆر هەن لەسەر راستی هاتنی رۆژی قیامەت و زیندو بوونەوە، چونکە ئەو خودایەی دەتوانێ زەوی مردوو زیندو بکاتەوە دەتوانێ مرۆش زیندوو بکاتەوە، بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایەو هیچی لێ یاخی نابێ.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّمَاءُ وَالآرْضُ بِأَمْرِهِ﴾ برێکی تر لەو شتانەی نیشانەی هەبوونی خوداو قودرەتی خودان راوەستانی ئاسمانە بەبێ کۆڵەکە، راوەستانی گۆی زەوی لەفەضادا بەبێ ئەوەی بەسنگێکەوە هەڵواسرابێ، بەڵکوو راوەستانی ئاسمان و زەوی بەقودرەتی خودا راوەستاون خودا رایگرتوون و هەڵیان دەسوڕێنێ و بەڕێوەیان دەبا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ

تَرَوْنَهَا﴾ (الرعد:٢)، یان دەفەرموێ: ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاء أَن تَقَعَ عَلَى الأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ (الحج:٦٥) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾ (فاطر:٤١).

بەو شێوە پەروەردگار یاساو نیظامی کەونی راگرتووە هەزاران ساڵە بەڵکوو بڵێ مەلایین ساڵە ئەم چەرخی گەردوونە هەڵدەسوڕێو ئەم حەمکە ئەستێرەو مانگو خۆرو شارە ئەستێرەو مەداراتو مەجەراتانە لەگەڕدانو دێنو دەچنو ساتە وەختێك عەطەڵو خەلەل روی تێ نەکردونو بەردەوام دەبن هەتا ئەجەلی دیاریکراویانو هاتنی رۆژی قیامەت ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِنَ الأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ پاشان هەرکاتێ بانگبێژێ بانگی لێ کردن بۆ رابونو کۆبوونەوە لەسارای مەحشەردا ئەو دەمە بەپەلە لەگۆڕەکانتان راست دەبنەوەو بەرەو سارای مەحشەر دەچنو وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الأَجْدَاثِ سِرَاعاً كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾ (المعارج:٤٣) یان دەفەرموێ: ﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ (يس:٥٣).

کەوابوو ﴿وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ كُلٌّ لَهُ قَانِتُونَ﴾ هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدا هەیە ملکایەتیو بەدیهێنانو هەڵسوڕاندنو بەندایەتی، هەموو بۆ خودایەو هەموویان گەردنکەچی فەرمانی پەروەردگارن هەموو هەڵسو کەوتێکتان بەویستی خودایە؛ مردنو ژیانیان، جمو جۆڵو ئارامگرتنیان، مانو نەمانیان پێیان خۆش بێو پێیان ناخۆش بێ هەموو بەدەست خودایەو گەردنکەچی فەرمانی ئەون.

لەفەرمودەیەکی مەرفووعدا: کە ئەبو سەعید الخدري ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (كل قنوت في القرآن فهو الطاعة).

﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ هەر پەروەردگارە سەرەتا مەخلوقاتی بەدی هێناوەو لەنەبوەوە هێناونیە وجوود، ئادەمیزاد وجوودی نەبوە خودا خەڵقی کردونو پاشان دەیانمرێنێو لەناویان دەبا، ئەمجار سەرلەنوێ

زینـدویان دەكاتـەوە، ئیعـادە كردنـەومیان لەبـەدیهێنانی هـەوەڵجار ئاسـانترە، هەرچەندە بەنیسبەت خوداوە كاری ئاسانو كاری گران نین هەموو شتێك لای خودا ئاسانەو ماندوبوونی تێدا نیە، وەلێ: ئەمە بەگوێرەی (تصور)ی ئادەمیزاد كە: ئیعادە كردنەوە لەبەدیهێنانی سەرەتا گرانترە، ئەگینا بۆ خودا دروستكردنو دروستكردنەوە چون یەكن.

بوخاری دەفەرموێ: (أبو اليمان) بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: شوعەیب هەواڵی پێداین: كە (أبو الزناد) لە(الأعرج)ەوە لەئەبو هورەیرەوە رەزامەندی خودایان لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يقول الله تعالى كذبني ابن آدم ولم يكن له ذلك، وشتمني ولم يكن له ذلك؛ فأمّا تكذيبه اياي فقوله: لن يعيدني كما بدأني، وليس أول الخلق بأهون عليَ من اعادته، وأمّا شتمه اياي فقوله: اتخذ الله ولداً، وأنا الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد)[1]

﴿وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ صیفەتی بەرزو پیرۆزو كەمالی موطلەق هەر بۆ خودایە؛ كە تاكو تەنهاییە بێ هاوەڵو بێ ئاتاجە، كەسی بێ كەسانە، هیچ خودا نین جگە لەئەو، هەرچی صیفاتی كەماڵو جەلالە هەیەتی هەرچی صیفەتی عەیبو نوقصانە نیەتیو هیچ شتێك وەكوو ئەو ناچێو لەكەس ناچێ، خاوەن تواناو بالادەستو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، لەئاسمانەكانو زەویدا هیچ شتێكی لەیاخی نابێ، داناو دەستڕەنگینە لەكارەكانیدا، هەموو شتێكی بەدی هێناوەو رێكی خستتووە، چۆنیەتیو ئەندازەی گرتووەو هیدایەتی داوە، هەموو كاروبارێكی بوونەوەرو؛ هەڵسوڕانو جمو جوڵی قەبارەكانی ناوبوونەوەر بەئادەمیزادو غەیری ئادەمیزادەوە، هەمووی بەویستو ئیرادەی پەروەردگارەو بەگوێرەی حیكمەتو نەخشەی خودایە، هەموو شتێك بەگیان

[1] ئەم فەرمودە تەنها بوخاری ئیخراجی كردوەو هەر ئەویش لەحەدیثی (عبد الرزاق) لەموعەممەرەوە لەهومامەوە لەئەبوهورەیرەوە ئیخراجی كردوە. ئیبنو كەثیر ج٣/١٤٣٤.

لەبەرو بێ گیانـەوە، بـەوردو دروشتـیـەوە، هـەر شـتـەو بـەزمانی حـاڵی خـۆی دان بەهەبوونی خودایەکی تاكو تەنهاو بەدیهێنەرو خاوەن دەسەڵاتو باڵادەست بەسەر بوونـەوەردا، هـەموویان ئـەوە دەچەسـپێنن: کـە خـودا چـی بـوێ دەیکـاو هەرچـی نەیەوێ ببێ نابێ.

## واقیعی ئادەمیزاد نیشانەی تاكو تەنهایی خودایە

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَن يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

پاش ئەوەی قورئان ئەو جەولە کەونییەی کـردو سـەرنجی ئـادەمیزادی راکێـشا مێژووی کەناراوی خۆیو بوونەوەرو بردیـەوە بـۆ سـەرەتای دروسـتبونو وەدیهاتن، خـستیە حاڵـەتی خـەیاڵ پـەروازی بـەناو بوونـەوەری فـراوانو دیـاردەو ئـەحواڵی هەندێ مەوجوداتی خستە بەر سـەرنجو تێـروانین، ئـەمجار ئوسلووبەکە دەگـۆڕێو بەشـێوەیەکی تـر دەیـەوێ تـاكو تـەنهایی خـودا بـچەسپێنێ، چـونکە بەشـێك لەتایبەتمەنی ئوسلوبی قورئـان ئەوەیـە شـتی نامـادی بەشـتی مەحـسووسو هەسـت

پێكراو نیشان دەداو پەندی واقیعی ئاراستە دەكا، بۆ ئەوەی شتی مەعنەوی لەذیهن نزیك بكاتەوە، ئادەمیزادەكان ئقناع بكا.

لەم ئایەتانەی دواییدا پەروەردگار پەندو مەثەلێك بۆ ئەوانە دەهێنێتەوە: كە هاوەڵی بۆ دادەنێن‌و عیبادەت بۆ خوداو غەیری خودا دەكەن، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ خۆیان دان بەوەدا دەنێن: كە ئەو شتانەی ئەوان دەیانكەن بەهاوەڵی خودا بەندەی خودان‌و ملكی خودان، ئەوە بوو قورەیشییەكان بەتایبەتی لەكاتی حەجكردندا دەیانگوت: (لبیك اللهم لبیك، لبیك لاشریك لك الا شریكا هو لك تملكه وما ملك).

دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ لَكُمْ مَثَلاً مِنْ أَنْفُسِكُمْ﴾ پەروەردگار پەندو مەثەلێكتان بۆ دەهێنێتەوە، خۆتان جوان دەبینن‌و تێی دەگەن، چونكە لەواقیعی حاڵی خۆتاندا هەیەو لەناو خۆتاندا هەڵقوڵاوەو لەهەست‌و شعورتان رەنگی داوەتەوە، لێتان نزیكەو بەعەمەلی مومارەسەی دەكەن. پەندو مەثەلەكەش بریتییە لەئەوە: ﴿هَلْ لَكُمْ مِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنْتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنْفُسَكُمْ ؟﴾ ئایا ئێوە رازی دەبن: ئەی قورەیشییە موشریكەكان كە هاوبەشتان هەبێ لەماڵ‌و ساماندا، ئەو هاوبەشانەشتان بەندەكانتان بن‌و هاوشانتان بن لەتەصەروفكردن لەماڵ‌و سامانەكەتاندا؟ ئایا رازی دەبن ئێوەو كۆیلەكانتان یەكسان بن‌و ترسی ئەوەتان هەبێ: كە ببنە برابەشتان، دیارە ئێوە بەوە رازی نین، بۆ خۆتان ئەوە بەڕەوا نازانن، ئەدی چۆن هاوەڵ بۆ خودا بڕیار دەدەن، هەندێ لەمەخلووقاتی خۆی دەكەنە هاوشان‌و هاوبەشی؟ چۆن رێگا بەخۆتان دەدەن كە بەندەی خودا بكەنە هاوشانی خودا؟! مەبەست ئەوەیە، هەریەكێ لەئێوە پێی ناخۆشە: كە كۆیلەكەی ببێتە هاوبەش‌و هاوشانی، ئەدی چۆن هاوەڵ بۆ خودا لەمەخلووقاتی خۆی دادەنێن! ئەمە جێگای سەرسوڕمانە بەندەو مەخلووقاتی خودا دەكەنە هاوەڵی خودا كەچی نارازین كۆیلەكانی خۆیان ببنە هاوشانی خۆیان!!.

ئەمە وەكوو ئەوە وایە: كە لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ﴾ (النحل/٦٢) كافرەكان بۆ خۆیان پێیان ناخۆش بوو كچیان ببێ، هەر كاتێ یەكێكیان پێ بگوترایە: كچتان بوو خێزانت زارۆكی مێینەی بەوەلەد هێناوە، كابرا رەنگی رەش هەڵدەگەڕاو دڵی پڕ دەبوو لەغەمو خەفەتو لەشەرمان خۆی لەخەڵكی دەشاردەوە، پێی ناخۆش بوو خەڵكی ببینن لەبەر ئەو مەنتوكییەی بەسەرشانیدا هاتووە، كەچی لەگەڵ ئەم حاڵەیاندا دەیانگوت كچی هەن، فریشتە: كە هەموویان بەسروشت بەندەی ملكەچی خودان، بەكچی خودایان دادەنان، شتێك كە بۆ خۆیان پێی نارازی بوون بۆ خودایان بڕیار دەدا!!

﴿كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بەم شێوە رونو ئاشكرایە بەڵگەكان شی دەكەینەوە، بەم جۆرە دەلیلە بەهێزانە ناحەزان بۆڕ دەدەینو ئایەتەكان رون دەكەینەوە بۆ گەلو نەتەوەیەك عەقڵی خۆیان بخەنە كارو بیر لەو دەلیلە مەنطیقیو بیانوو بڕانە بكەنەوە.

﴿بَلْ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ بەڵكوو ئەو موشریكانەی ستەمیان لەخۆیان كردوە، بەوە: كە شوێن هەواو هەوەسی نەفامانەی خۆیان كەوتوون، كوێرانە بیر دەكەنەوە، عەقڵو هۆشی خۆیان ناخەنە گەڕ بەبێ دەلیلی عەقڵیو نەقڵی بتو صەنەم دەپەرستن هیدایەتو زانیاریو بەصیرەتیان نیە، جا كە حاڵ وابێ ﴿فَمَنْ يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ؟﴾ كێ هیدایەتی كەسانێك دەدا: كە خودا گومڕای كردون؟ كەس نیە هیدایەتیان بداو بیانگەیەنێ بەحەقو راستی، دوای ئەوەی بەویستی خۆیان رێبازی كوفریان هەڵبژاردوەو ئامادەباشی ئیمانهێنانیان تێدا نیەو هاوەڵدانان بۆ خوداو بتپەرستی بووەتە خوو بەسروشت حەزیان لەبتپەرستییە!

﴿وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ﴾ نیە بۆ ئەوان كەسێك یارمەتیدەرو رزگاركەریان بێ لەعەزابی خودا، كە عەزابی خودا دەوری دانو تێكیەوە پێچان كەس نیە جگە

لەخودا بتوانێ فریایان بکەوێ، خوداش بەهانایانەوە نایە چونکە ئەوانە موشریکن‌و خودا لەتاوانی شرك خۆش نابێ!

## خودا فەرمان بەئادەمیزاد دەکا بەشوێنکەوتنی ئایینی ئیسلام کە ئایینێکی سروشتییە بانگەوازی دەکا بۆ یەکتاپەرستی

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٣٠) ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (٣١) مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٣٢) ﴾

دوای ڕانواندنی بەڵگەو دەلیلی تاك‌و تەنهایی خودا، بەیانکردنی توانا‌و دەسەڵاتی خودا بەسەر هەموو شتێکدا، دوای دڵنەوایی کردنی پێغەمبەر ﷺ و دامەزراندنی لەسەر بیرو باوەڕی خۆی‌و هەڵنانی بۆ شانازیکردنی بە بانگەوازییەکەی خۆیەوەو گرنگی نەدان بەهەڵوێستی موشریکەکان، ئەمجار فەرمانی پێ دەکا بە بەردەوامبوون‌و سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆی‌و دڵسۆزی‌و ئیخلاص، لەبەندایەتی کردن بۆ خودادا، چونکە خودا پەرستی‌و یەکتاپەرستی فیطرەتێکە لەسەرەتادا خودا ئاوێتەی نەفس‌و پێکهاتەی ئادەمیزادی

کردوە، هەموو ئادەمیزادێك کە لەدایك دەبێ بەسروشت خوداپەرستە، باوكو دایكو دەوروبەر لەو سروشتە پاکە لای دەدەن.

دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً﴾ ئەی موحەممەد! چونکە لەروانگەی ئەو بەلگانەی پێشەوە ئایینی راستو حەقت بۆ دەرکەوت، زانیت بتپەرستیو هاوەڵدانان بۆ خودا چەند زیانبەخشو چەوتو بەتاڵە، کەوابێ شوێن ئەو ئایینە حەقە بکەوە: کە خودا بۆی ناردویی‌و ئەرکی گەیاندنو بلاوکردنەوەی خستۆتە سەرشانت، ئایینی سروشتیو گونجاوە، ئەو ئایینەیە ئیبراهیم بانگەوازی بۆ کردوەو پەیرەوی کردوە. ئەو ئایینەیە خودا هیدایەتی داوی بۆ پابەندبوون پێیەوە، ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾ ئایینی سروشتی پاكو خاوێنەو خودا ئاوێتەی پێکهاتەی ئادەمیزادی کردوە، هەموو ئادەمیزادێك لەسروشتیدا خوداناسیو یەکتاپەرستی هەیە، لەناخەوە دەزانێ جگە لەخودای بەدیهێنەر خودای تر نین. رو لەهەموو ئاینێکی بەتاڵ وەرگێرەو پابەندی ئایینی پاکی ئیسلام بە.

ئەمە فەرمانە بەپێغەمبەرو فەرمانیشە بەئۆمەتەکەی کە لەسەر ئەو ئاینە سروشتییە بەردەوام بنو لێی لانەدەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى﴾ (الأعراف: ۱۷۲).

ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەکی قودسی ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (انی خلقت عبادي حنفاء فاجتالتهم الشياطين عن دينهم) ئەمن لەسەرەتادا بەندەکانی خۆم بەخوداپەرست خوڵقاندونو دوایی شەیتانەکان لەو رێگە حەقە لایانداون.

بوخاریو موسلیم فەرموودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (كل مولود يولد على الفطرة فأبواه يهودانه أو ينصرانه، أو يمجسانه...).

ئایەتو حەدیثەکان بەلگەن لەسەر پاکی بناغەی سروشتی ئادەمیزادو ئاماژەیە بەوە: کە خودا بەندەکانی خۆی بۆیە دروستکردون بیناسنو بیپەرستنو بەندایەتی دڵسۆزانەی بۆ بکەن، سروشتییان لەسەر خوداناسی دروستکراوەو ئایینی

ئیسلامی پیرۆز لەفیطرەتیاندا هەیە، هەموو پێغەمبەرێکیش بانگەوازی بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە کردوەو، بەڵام دوایی هەندێ بیرو باوەڕی فاسید تێکەڵاو بەئایینی خوداپەسند بوەو ئایینەکان شێواون‌و جولەکایەتی‌و مەسیحیەتی‌و ئاگرپەرستی‌و صابیئەیەتی پەیدا بووە، بتپەرستی‌و مادەپەرستی تەشەنەی کردوە، ئایینی زۆرو جۆراو جۆر بەناو ئادەمیزاددا بڵاوبوونەوە، تەنانەت جولەکەو مەسیحیەکان بوونە حەفتاو ئەوەندە تاقم‌و گرۆ.

کە دەفەرموێ: ﴿فِطْـرَةَ اللَّـهِ﴾ (فطرة) مەفعوول بیهـ‌یە بۆ فیعلێکی مەزندەکراو کە (الزموا)وە. واتە: پابەندی ئایینی حەق‌و راست بن.

پەیڕەوی ئەو ئایینە بکەن: کە خودا ئێوەی لەسەر دروست کردوە، لەسروشتتاندا هەیە، لەگەڵ سورشتتاندا گونجاوە. ﴿لا تَبْـدِيلَ لِخَلْـقِ اللَّـهِ﴾ نابێ‌و ناگونجێ بۆ کەس واز لەئەو ئایینە سورشتی‌یە بهێنێ‌و بیروباوەڕی تر پەیڕەو بکا، رستەکە کەلامێکی خەبەرییەو بەمانا نەهیە، واتە: خودا فەرمان بەئادەمیزاد دەکا: کە ئەو ئایینە سورشتییە (کە ئیسلامە) نەیگۆڕن‌و نەچنە سەر بیروباوەڕی شیرك‌و ئیلحاد، فەرمانیان پێ دەکا: کە بۆ خۆیان پابەندی ئایینی ئیسلام بن‌و هەوڵ بدەن کەسانی دیکەش بەو ئایینەوە پابەندبن، چونکە لەناخ‌و سروشتییاندا هەیەو لەئەصڵی تەکویندا ئاوێتەی وجودیان بووە.

﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ ئەو ئایینەی فەرمانتان پێ کراوە: کە پەیڕەوی بکەن‌و پابەندی بن، ئەوە ئایینی راست‌و دروستەو خوارو خێچی تێدا نیە ﴿وَلَكِـنَّ أَكْثَـرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ وەلێ زوربەی ئادەمیزادان ئەوە نازانن‌و لێی بێ ئاگان، چونکە عەقڵ‌و هۆشی خۆیان ناخەنە کار، هەوڵ نادەن زانیاری راست‌و دروست فێر ببن، خۆ ئەگەر بەوردی بیریان بکردایەوە، زانیاری صەحیح فێر بونایە، دەوروبەرو هەواو ئارەزۆکاریان تێ نەکردنایە، هەرگیز لەو ئایینە سروشتی‌یە لایان نەدەداو

ڕێبازی گومڕاییان دەگرتەبەر، ئەو حەقیقەتە نازانن بۆیە شوێن هەواو هەوەسی خۆیان دەکەون و لەڕێگای ڕاست لادەدەن.

﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ﴾ شوێن ئایینی خوداپەسند بکەون و ڕوی تێ بکەن و بگەڕێنەوە بۆ سەری، بەباشی و دڵسۆزی لێ ببڕێن بۆ خوداپەرستی، لەئایین دامەبڕێن و کەمتەرخەمی مەکەن لەطاعەت و خوداپەرستیدا، هەمیشە لەخودا بترسن و ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ بەردەوام بن لەسەر ئەنجامدانی نوێژەکانتان بەتەواوی و بێ کەم و کوڕی ڕوکن و مەرجەکانیان جێ بەجێ بکەن، خوشوع و خوضوعی تەواوتان هەبێ. ﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ دوای ئیمانهێنان و بڕوا بەخودا نەچن هاوەڵی بۆ دابنێن، کەس مەکەن بەخودا، جگە لەخودا کەس بەشیاوی پەرستش بۆ کردن مەزانن، بەتاعەت و خوداپەرستییەکەتان مەبەستتان خودا بێ، یەکتاپەرست بن و بەدڵسۆزی بەندایەتی بۆ بکەن وا طاعەت بۆ خودا بکەن وا بزانن خودا دەبینن، خۆ ئەگەر ئێوە خودا نەبینن خودا ئێوە دەبینێ، لەهەموو شتێکدا پشت بەخودا ببەستن، هەموو شتێك بۆ لای خودا بگێڕنەوە، بەنهێنی و ئاشکرا خوداتان لەیادبێ، بەویژدانی زیندووەوە موراقەبەی خودا بکەن، لەهەموو جم و جوڵێکتاندا خوداتان لەیاد بێ.

ئەمجار پەروەردگار وەصفی موشریکەکان دەکا بەوە: کە تەفرەقەو دووبەرەکی لەناو کۆمەڵگادا دەنێنەوە دەفەرموێ: ﴿مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا﴾ لەو موشریکانەی: کە ئایینی خۆیان پەرتەوازە کردوە، ئیختیلاف و دووبەرەکییان هەیە لەو شتەی عیبادەتی بۆ دەکەن، هەر کەسە بەگوێرەی هەواو هەوەسی خۆی شتێك دەپەرستێ و ئایینی سورشتی دەگۆڕن، بیرو باوەڕەکان تێکەڵاو دەکەن بڕوا بەهەندێ لایەنی ئایینی حەق دەکەن و هەندێ لایەنی پاشگوێ دەخەن، ڕەتی دەکەنەوە، بوونە چەند تاقم و گرۆو پێڕو خیزب وەکوو جولەکەو مەسیحی و ئاگر پەرست و بتپەرست و باقی خاوەن بیرو باوەڕە بەتاڵ و پوچەکان ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ

فَرِحُونَ﴾ هەموو تاقم‌و پێـرو حیزبێـك كەیفخۆشـن بـە بیروباوەڕیـان‌و پێیـان وایـە هـەر ئـەوان لەسـەر حـەقن بەرامبەرەكـەیان ناحەقـە! لـەكاتێك بـۆ خۆیـان لەسـەر بەتاڵن‌و بەرامبەریی دەكەن لەگەڵ ئەو ئایینە حەقەی كە خودا ئاوێتـەی سروشتی ئادەمیزادی كردوە، بۆ بەندەكانی خۆی هەڵبژاردوە.

ئایەتەكە ئەو تاقم‌و گرۆیانەش دەگرێتـەوە: كـە خۆیـان بەموسوڵمان لەقەڵەم دەدەن‌و لـەناو خۆیـان بوونـە چـەند فیرقـەو تـاقم‌و گـرۆی جیـا؛ كـە لەكتێبـەكانی تایبەت بەمیلەل‌و نیحەل‌دا ئاماژەیان پێ كراوە، هەموو ئەو تـاقم‌و پێڕانـە گـومڕاو سەرلێ شێواون جگە لەكۆمەڵێك: كە ئەهلی سوننـەو جەماعەتن؛ ئەوانـەی پابەنـدن بەقورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرەوە شوێن هـەنگاوی هـاوەڵانی پێغەمبـەرو چـینی دوا ئەوان دەكەون، هەموو بیرو باوەڕو كارو كردەوەیەكیان قورئانی‌یـەو بەتـەرازوی ئیسلام دەیكێشن‌و بەو مەنهەج‌و یاسایە كار دەكەن: كە شـەریعەتی ئیـسلام، خۆیـان لەهەموو جۆرە شیركێك دوور دەخەنەوە. هەر شـتێك بـۆنی شـیركی لـێ بـێ ئـەوان دوور دەكەونەوە. هەڵبەتە شیرك فرە لایەن‌و جۆراو جۆرە، هەیە جندۆكە پەرستە، هەیە فریشتە دەپەرستێ، هەیە بنەماڵەو باوك‌و بـاپیرانی دەپەرسـتێ، هەیـە پاشـاو فرمـانڕەوا دەپەرسـتێ، هەیـە شـێخ‌و قـەن‌و گۆڕپەرسـتە، هەیـە دارو بـەرد دەكاتـە خـودای خـۆی بـەهاوەڵی خـودای دەزانـێ، هەیـە ئەسـتێرە پەرسـت‌و خـۆر پەرسـتە، هەیـە شـەو پەرسـتە، هەیـە داب‌و نـەرێت دەپەرسـتێ، هەیـە پـارە پەرسـتە هەیـە.. هەیە.. هتد.

هەریەكێ لەم شت پەرستانە خۆی بەراست دەزانـێ‌و پـێی وایـە لەسـەر حەقـە، كەیفخۆشە بـەبیرو بۆچونی خـۆی‌و خـەڵكی تـر بەهەڵـە دەزانـێ. لـەكاتێكدا حـەق یەكەو نابێ بەدوو، لەناو ئەو هەموو ئایین‌و بیرو باوەڕانە تەنها یەك گروپ لەسـەر حەقن ئەویش ئەوانەن قورئان مەنهەجیانە!

## ڕاڕایی هەندێ کەس و بەردەوام نەبوونیان لەسەر ئایینی حەق

﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾

لەوەپێش پەندو مەثەلی هێنانەوە لەسەر تاك و تەنهایی خودا، بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆری بۆ ئەو مەبەستە ئاراستە کردن. ئەمجار لێرەدا ماڵ و وەزعی دوو کۆمەڵ لەئادەمیزادان دەستنیشان دەکا، تاقمێکیان بریتین لەهەندێ موشریك کاتی تەنگانە هاوار لەخودا دەکەن و کاتی ئاسایی بتپەرستن. تاقمێکیشیان بڕێ کافرو موشریکن خوداپەرستییان بۆ دونیایە، ئەگەر وێڕای خوداپەرستییەکەیان دونیایان بۆخۆش بوو بەمرازی خۆیان گەییشتن ئەوە بەردەوام دەبن، خۆ ئەگەر وا نەبوو واز لەئایین دێنن.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ النَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا رَبَّهُمْ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾ کەسانێك هەن ئەگەر تووشی تەنگانەو ناخۆشی بوون، دەردو بەلاو نەخۆشی روی تێ کردن، گرانیو وشکە ساڵیو بێ ئاوییان توش هات، لەناو دەریا یان لەوشکانیو هەوادا خەتەری مەرگ لێیان نزیك بووەوە، دەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو هانای بۆ دەبەنو لێی دەپاڕێنەوە بەتەنها خودا دەناسنو خودا درۆزنەکانی خۆیان لەبیر دەچێتەوە. ﴿ثُمَّ إِذَا أَذَاقَهُمْ مِنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ پاشان کەخودا بەلاو نەخۆشی لەسەر لابردن، نازو نیعمەتی ئاسایشو هەرزانی بەسەردا رشتنو کەوتنە فەرەحییەوە لەجیاتی ئەوەی بەردەوام بن لەسەر خوداپەرستیو شوکرانە ژمێری خودا بکەن، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کۆمەڵێکیان لەحاڵو وەزعی ئاسایییاندا هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو دەست دەکەن بەبتپەرستی. ئەوانە هەلپەرستو دونیاویستن کاتی تەنگانە خوداپەرستو کاتی فەرەحی بتپەرستن سپڵەو پێ نەزانن.

﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ﴾ تا لەئاکامدا کوفرانی نیعمەتەکانی خودا بکەن، سەرەنجام ئینکاری فەضلو ئیحسانی بکەن، (لام)ی (لیکفروا) (لام)ی عاقیبەتی پێ دەگوترێ (لام)ی تەعلیل نیە.

هەندێ لەزانایان پێیان وایە: (لام)ەکە (لام)ی ئەمرە فیعلەکە فیعلی ئەمرە، هەڕەشە دەگەیەنێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف:٢٩) واتە: ئەوە رێگای راستو ناڕاستمان بۆ رون کردونەوە، حەقو بەتاڵ دیاری کراوە، ئەمجار کەسێك دەیەوێ با ئیمان بێنێو کەسێکیش نایەوێ ئیمان بهێنێ با کافر بێ. پاداشی ئیمان بەهەشتەو سزای کوفر دۆزەخە.

**بەکورتی:**

رستەکە فیعلی ئەمرەو هەڕەشە دەگەیەنێ، وەکوو چۆن رستەکەی دوایش ئەمرەو هەڕەشە دەگەیەنێ دەفەرموێ: ﴿فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی

موشریکەکان لەززەت و خۆشی جیهان بچێژن، بەویستی خۆتان رابوێرن، لایەنی قیامەت پاشگوێ بخەن، لەوە بەولاوە بۆتان دەردەکەوێ سزاو تۆڵەی من لەسەر کوفرەکەتان چەند بەئێشەو چەند سامناکە

بەڵێ هەڕەشەیەکی سامناك و داچڵەکێنەرە، ئادەمیزاد ئەگەر فرمانڕەوایەك هەڕەشەی لێ بکا، تەنانەت ئەگەر چەتەو یاخیبوێك هەڕەشەی لێ بکا ترسی لێ دەنیشێ و خۆپارێزی دەکا. دەی دەبێ چۆن لەم جۆرە هەڕەشانە نەترسێ: کە لەخاوەنی بوونەوەرەوە ئاڕاستەی کراون، لەخودای باڵادەستەوە تەوجیهی کافرو موشریکەکان کراون!

هەندێ لەزانایان فەرموویانە: سوێند بەخودا ئەگەر حەرەسی کۆڵانێك هەڕەشەم لێ بکا ترسم لێ پەیدا دەبێ، ئەی دەبێ چۆن ترسم لێ پەیدا نەبێ: کە هەڕەشەکە لەخودایەکەوە ئاڕاستە کراوە: کە هەموو بوونەوەری بە (کن فیکون) بەدیهێناوە؟!

ئەمجار دوای ئەم هەڕەشەو ترساندنە ئوسلوبەکە دەگۆڕێ و بەشێوەی ئینکار ئامێز پرسیاری بەڵگەیەك دەکا پشتگیرییان بکا لەسەر کوفرو بتپەرستییەکەیان، دەفەرموێ: ﴿أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا بِهِ يُشْرِكُونَ﴾ ئایا ئێمە نازڵمان کردوە بۆ سەریان بەڵگەو دەلیلێك، نامەو نوسراوێك، ئەوە بسەلمێنێ: کە ئەوان دەیڵێن ئایا هیچی وامان نازڵ کردوە پشتگیرییان بکا لەسەر بیرو بۆچوونەکەیان، لەسەر هاوەڵدانیان بۆ خودا؟ نەخەیر ئێمە شتی وامان نازڵ نەکردوە، پێغەمبەریشمان بەو پەیامە نەناردوە، بەڵکوو ئەوە شتێکە بۆ خۆیان دایانهێناوەو بۆ خۆیان هەڵی دەبەستن.

لەکاتێکدا نابێ و ڕەوا نیە بۆ هیچ کەس: کە دەربارەی عەقیدەو باوەڕ لەغەیری خودا شت وەربگرێ، دەی ئێمە هیچ شتێکمان لەم بارەوە بۆ نەناردون، بەڵکوو بەپێچەوانەوە ئێمە پێغەمبەرمان بۆ ناردون نامەمان بۆ رەوانەکردون

فەرمانیان پێ کردون: کە یەکتاپەرست بن و بەدڵسۆزی خودا بپەرستن خودا پەرستی بکەن.

ئەمجار جۆرێکی تر لەشیرك رون دەکاتەوە، ئەویش حاڵ و وەزعی کەسانێکە خوداپەرستی دەکەن لەبەر خاتری دونیا، ئەگەر خۆشی جیهانی بۆ دەستبەر بوو ئەوە رازی دەبێ، ئەگەر مرازەکانی نەهاتنە دی ناهومێد دەبێ، ناهومێد بوونیش جۆرێکە لەشیرك. دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا بِهَا﴾ هەر کاتێ نازو نیعمەتی خۆمان بەخشی بەبرێ ئادەمیزاد، پێی دڵخۆش دەبن و شانازی بەسەر کەسانی دیکەدا دەکەن. وەکوو لەئایەتێکی تردا لەسەر زوبانی ئەو جۆرە کەسانە دەفەرموێ: ﴿ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾ (هود:١٠) هێڵێکی راستی نیە بەسەریدا بڕوا، تەرازویەکی ورد خوێنی نیە شتەکانی پێ کێشانە بکا، بۆیە خۆ بۆ گۆڕانکاریەکانی ژیانی راناگرێ، بەنازو نیعمەت دڵ خۆش و تەڕدەماخ دەبن و وێڕای دڵ خۆشیەکەیان شانازی دەکەن و لەخۆیان بایی دەبن. بیر لەوە ناکەنەوە کێ ئەم نازو نیعمەتانەی بەخشیون، حیکمەتی ئەو نیعمەتانە چین و پێویستە لەپاساویاندا چی بکەن. غەرقی نیعمەتەکان دەبن و سوپاسی بەخشندە ناکەن ئەوەیان بیر نایەتەوە: کە ئەو نیعمەتانە تاقیکردنەوەو ئیختیبارن! ﴿وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾ جا ئەگەر ویستی خودا وا بوو بەهۆی خراپەکاری خۆیان تووشی بەڵاو ناخۆشیەك بن و کارەساتێکیان بەسەردا هات و دەردو بەڵا یەخەی گرتن ئیتر لەرەحمەتی خودا نائومێد دەبن دەکەونە گازندە کردن و گلەیی کردن! ئەمە داب و نەریتی ئەو دڵ و دەروونانەیە لەخودا دادەبڕێن و ئاگایان لەسونەنی خودا نیە لەبوونەوەردا!

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا پرسیارێکی تری نینکار ئامێز ئاراستە دەکاو عەجائیبی وەزعیان رادەگەیەنێ، کورتبینی و نابینایی چاوی دڵیان دەستنیشان دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ﴾ بۆچی نازانن و

نابینن: کە خودا رزق و رۆژی فراوان دەکا بۆ کەسانێك بیەوێ سامانداریان بکا، لەهەمان کاتدا بۆ هەندێکی تر رزق و رۆژی کەم دەکاتەوە، خۆشیو ناخۆشی، دەوڵەمەندیو هەژاریی پابەندی یاساو قانوونێکی خودایی بەردەوامو ثابیتە، پابەندی مەشیئەتو ویستی خودایە، هەر خودایە نازو نیعمەت دەبەخشێ، هەر ئەویشە بەبەلاو ناخۆشی بەتاقییان دەکاتەوە! بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی، بەویستو ئیرادەی خۆی هەندێ کەس دەوڵەمەند دەکا هەندێ کەس هەژار دەکا، ئەمڕۆ ئەم تاقمە دەخاتە ژیانی خۆشەوەو بەیانی دەیانخاتە تەنگانە ناخۆشییەوە. یان بەپێچەوانەوە.. کەوابێ لەکاتی خۆشیو فەرەحیدا پێویست ناکا تەڕدەماخی روبکاتە خۆشگەزرانەن، هەروەها نابێ لەکاتی بەلاو ناخۆشیدا ناهومێد بن، چونکە خۆشیو ناخۆشی حالاتو چۆنیەتین بەنۆبەو وەخت ناوەختێك بەگوێرەی حیکمەتی خودا دێنو دەڕۆن. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ لەو شتانەی باسکران، لەزۆر کردنی رزق و رۆژییو کەمکردنەوەی بەلگەی ئاشکراو نمایان هەن لەسەر تاكو تەنهایی خودا بۆ کەسانێك خاوەن بڕوابنو کارەکان هەموو بۆ خودا بگێڕنەوەو بزانن هیچ شتێك بەبێ ویستی خودا دەستەبەر نابێ.

## هەڵنان بۆماڵبەخشینو زەکات دەرکردن، رزق و رۆژیی مەضموونەو حەشرو نەشر رودەدەن

﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ

ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾

لەوەپێش ئەوەی راگەیاند: کە رزقو رۆژیدەر هەر خودایەو بەویستو ئیرادەی خۆی بۆ هەندێك زۆری دەکاو بۆ هەندێك کەم، جا کە ئەوە واقیعی حاڵ بێ، هەر خودا رزقو رۆژی بداو بەگوێرەی مەشیئەتو ویستی خۆی ماڵو سامان بۆ هەندێ فراوان بکاو لەهەندێ کەسی بگێڕێتەوە هەر ئەویش رێبازی ماڵبەخشینو ماڵ گەشە کردنو زۆر بوونی ماڵو سامان دیاری دەکا، خودا دەزانێ ماڵو سامان بەچی زیاد دەکاو چی لەبەرژەوەندی ئادەمیزاددایە، چونکە هەر کاتێ خودا رزقو رۆژی کەسێکی فراوان کرد بەلێ بەخشین کەم نابێتەوە. ئەگەر خودا رزقو رۆژی کەسێکی کەم کردو کەم دەرامەت بوو بەدەستگرتنەوە لەبەخشین زیاد ناکا. دەفەرموێ: ﴿فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾ ئەی پێغەمبەر! هەروەها ئەوانەی شوێنت کەوتوون لەئوممەتت: لەماڵو سامانی خۆتان ببەخشن بەخزمو هەژارانو رێبواران، مافی خۆیان بدەنێ لەصیلەی رەحمو چاکەیان لەگەڵ بکەنو یارمەتییان بدەن، یارمەتیدانو چاکەکردن لەگەڵ خزمو کەسو کار مافێکی سەرەکی سەرشانی ئادەمیزادە، بەشێکە لەپەیوەندی خوێنو نژادو رەچەڵەك. خزمو کەسو کارشیاوترین کەسانێکن کە پێویستە چاکەیان لەگەڵ بکرێو یارمەتییان بدرێ. دیدەنیو هەمئاهەنگییان لەگەڵدا بکرێ هەروەها مافی هەژاران بدەن کۆمەگییان پێ بکەن ئەرکی قورسی ژیانیان لەسەرشان سوك بکەن، رێبوارێك

کە لەماڵی خۆی دوور کەوتۆتەوەو دەستی بەماڵو دارایی خۆی ناگا ئەمەش پێویستە کۆمەگی پێ بکرێو پێداویستی سەفەرەکەی بۆ گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی بۆ دابین بکرێ.

لەئایینی ئیسلامدا ماڵو سامان هی خودایە، خودا خاوەنی حەقیقی ماڵو سامانە، هەر ئەو خاوەنە حەقیقی‌یە کە ماڵو سامانی بەخشیوە بەهەندێ لەبەندەکانی. بڕیاری داوە ئەو ماڵ پێ بەخشراوانە هەندێ لەماڵەکەیان ببەخشنەوە بەچینو توێژێکی تر کە پێویستیان پێیەتیو مافێکی خۆیانە بیاندرێتێ. بۆیە ئایەتەکە فەرمووی: ﴿فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ﴾ فەرمووی: مافی خۆیان بدەنێ، ماڵە بەخشراوەکەی بە(حەق) ناوهێناو وەپاڵی ماڵ پێ بەخشراوەکانیشیدا. لێرەش راناوی سێ تاقم لەوانە دێنێ: کە پێویستە ماڵیان پێ ببەخشرێو یارمەتییان بدرێ. (خزمو هەژارو رێبوار) ئەم ئایەتانە پێش واجب بوونی زەکات نازڵ بوون، ئەو کاتەی ئەم ئایەتانە نازڵ بوون نەزەکات واجب کراوە، نە زەکات پێ شیاوان دیاریی کراون، بەڵام مەبدەئەکە هەر زوو چەسپاوەو ئاماژەی پێ کراوە، لەروانگەی ئیسلامەوە ماڵ ماڵی خودایە، خاوەنی حەقیقی ماڵو سامان خودایە جا کە ماڵ ماڵی خودا بێ، دەبێ خودا چۆنی دەوی ئاوا تەصەرووفی تێدا بکرێ؛ چ لەروی تەملیکەوە بێ یان لەروی گەشە پێ کردنو لێ بەخشینەوە بێ. ئەو کەسەی کە بەوەکالەت ماڵو سامانی خودای لەژێر دەستی‌دایە، ئازاد نیە چی لەو ماڵە بکا بیکا، بەڵکوو خودا بۆ تەملیكو گەشە پێ کردنو بەخشینی ماڵ یاساو رێسای داناوەو تەوجیهی ئەمیندارەکانی دەکا: کە بەو شێوەی ئەو دەیەوێ تەصەرووفی تێدا بکەن، بەشی خزمو هەژارانو رێبوارانی لێ بدا چونکە ئەوانیش حەقیان لەو ماڵەدا هەیە.

ئیمامی ئەبو حەنیفە ئەم ئایەتەی کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە کە نەفەقەو بژێوی خزمو کەسو کاری نەبووبێ درامەت واجبە، هەر کەسێ دەوڵەمەند بوو خزمو کەسی هەژاری هەبوون پێویستە باربویان بکاو بژێویان دابین بکا.

﴿ذَلِكَ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ یارمەتیدانو باربوکردنی ئەو جۆرە کەسانەی لەئایەتەکەدا باسکران، خێرو فەڕو باشترین کارە بۆ ئەو کەسانەی کردەوەکانیان لەبەر خاتری خودا ئەنجام دەدەن، هەر کارێکی دەیکەن مەبەستیان رەزامەندی خودایەو بەهیوای پاداشی قیامەتن، نەك بۆ ریبابازیو ناوو شۆرەت! ئەوانە سەر فرازو بەمرازگەییشتون لەدونیاو قیامەت، ئەوانە ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوەو خۆیان لەتانەو لۆمەی ئاتاجان رزگار کردوە. رەزامەندی خوداشیان بەدەست هێناوە، کەسێکیش خودا لێی رازی بێ سەرفرازو رزگار بووە.

﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِباً لِيَرْبُوَا فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلا يَرْبُوا عِنْدَ اللَّهِ﴾ هەندێ لەعەرەبەکان هەوڵی زۆر کردنی ماڵو سامانی خۆیان لەو رێگەوە دەدا؛ دەهاتن دیارییان دەدا بەهەندێ لەدەوڵەمەندەکان بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان لەپاساوی دیارییەکەیاندا دیاری بەنرختریان پێ بدەنەوە، ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتە ئەوەی رون کردوە: ئەو کردەوەو هەوڵو تەقەلایە هۆکاری حەقیقی نیە بۆ گەشە کردنی ماڵو سامان. پێیان دەفەرموێ: ئەوەی دەیدەن بەخەڵك بەدیاری بەمەبەستی ئەوەی دیاری باشترتان بۆ بنێرنەوە، ئەوە لای خودا پاداشی نیەو رێبازی راستی ماڵ زۆر کردنو خێرو فەڕ دەسکەوتن نیە. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەم حاڵە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ﴾ (المدثر:٦) شتێك مەبەخشە بەهومێدی ئەوەی زیاترت پێ بدەنەوە، ئەم جۆرە بەخشینە بەتایبەتی لەپێغەمبەر ﷺ یاساغ بووە، بۆ کەسانی دیکە رەوایە وەلێ پاداشی تێدا نیەو خێری ناگاتێ.

ئیبنو عەبباس: دەفەرموێ: ریبا دوو جۆرە، جۆرێکیان دروست نیە ئەوە ریبای مامەڵەو بازرگانییە، جۆرێکی تریان ریبایە کە خراپەی تێدا نیە ئەوەیش بریتییە لەوە کابرا دیاری دەنێرێ بەمەبەستی ئەوەی زیاتری بۆ بنێرنەوە.

ئەمجار ئایەتی ﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِباً لِيَرْبُوَا فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلا يَرْبُوا عِنْدَ اللَّهِ﴾ پەروەردگار لەکاتێکدا ئەم هۆکارە بەهۆکارێکی ناڕاست دادەنێ، ڕێبازی حەقیقیو ڕاستو خێر ئاوەر بۆ گەشەکردنیماڵو سامان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُضْعِفُونَ﴾ ئەوەی دەیدەن بەئاتاجان لەصەدەقەو زەکات، ئەو ماڵەی دەیبەخشن بەهەژارو لێقەومان بۆ ڕەزامەندی خوداو مەبەستتان ئەوە نیە ماڵ پێ بەخشراوەکان پاداشتان بدەنەوە، ئەوە ئەو کەسە لای خودا پاداشی دوچەندانەی هەیە، ئەوانە گەشە بەماڵو سامانی خۆیان دەکەن، ئەوە ڕێبازی ڕاستو دروستی ماڵ گەشەپێکردنە، ئەوە هۆکارێکی زامنو تۆکمەیە بۆ ماڵ زۆر بون، ماڵ دەبەخشێ بەهەژارانو چاوەڕوانی پاداشی ئەوان نیە، تەنها لەبەر خاتری خوداو بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی ئەو ماڵی خۆی دەبەخشێ. هەڵبەتە خوداش پاداشی دەداتەوە جێگای بەخشینەکەی بۆ پڕ دەکاتەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً﴾ (البقرة:٢٤٥) یان دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ (الحديد:١١).

لەدونیادا کەلێنیان بۆ پڕ دەکاتەوە، ماڵو سامانیان بۆ زۆر دەکا، لەقیامەتیشا پاداشیان دوچەندانەو چەند چەندانە دەداتەوە. کەوابێ مامەڵەو بازرگانی سودبەخش ئەوەیەو قازانج لەوەدایە.

فەرموودەیەکی صەحیح هەیە بوخاریو موسلیمو نەسائیو تیرمیذیو ئیبنو ماجەو ئیبنو خوزەیمە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وما تصدق أحد بعدل تمرة من كسب طيب الا أخذها الرحمن بيمينه فيربيها لصاحبه، كما يرى أحدكم فلوه أو فصيله حتى تصير التمرة أعظم من أحد) وەڵلاهی یەکێك لەئێوە بەئەندازەی دەنکە خورمایەك لەماڵی حەڵاڵو خاوێنی خۆی نابەخشێ ئیللا: کە بەخشی خودا بەرێزەوە ئەو خێرەی لێ وەردەگرێو

بۆی پەروەردە دەکا وەکوو چۆن یەکێ لەمئێوە جوانو یان بەچکە حوشتر بەخێو دەکا. هەتا ئەو دەنکە خورمایە لەکێوی ئوحود گەورەتر دەبێ.

ئەمجار جەخت لەسەر باسی پێشوو دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ هەر خودا بەدیهێنەرە، ئەو ئێوەی دروست کردوە، هەر ئەو رزقو رۆزیی ئێوە فەراهەم دێنێ، لەیەکەم رۆژی ژیانتانەوە تا دوا هەناسەتان، پاشان کە تەمەنتان تەواو بوو هەر ئەو دەتانمرێنێ هەر ئەویش رۆژی قیامەت زیندوتان دەکاتەوە بۆ حەشرو حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ کردنتان لەگۆشە نیگای رزقو رۆزییو کاسبی کردنەوە چارەسەری قەضیەی شیركو بتپەرستی دەکا، نەبوونی شوێندەستی خودا درۆزنەکانیان رون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَفْعَلُ مِنْ ذَٰلِكُمْ مِنْ شَيْءٍ ؟﴾ ئایا خودا درۆزنەکانی ئێوە؛ ئەو شتانەی ئێوە بەخودایان دەزانن‌و کردوتانن بەهاوەڵی خودا، دەتوانن ئەو کارانە ئەنجام بدەن؟ دەتوانن شت بەدی بێنن؛ رزقو رۆزیی ئێوەو گیانلەبەرانی تریشش بدەن؟ دەتوانن گیان بکێشن‌و دوایی مردوو زیندو بکەنەوە؟ ئایا خوداکانی ئێوە دەتوانن ئەم کارانە ئەنجام بدەن؟! بێگومان ناتوانن هیچ لەم جۆرە کارانە ئەنجام بدەن. بەڵکوو تەنها خودای باڵادەستو بەتوانا ئەو کارانە دەکا، دروستکردن‌و رزقو رۆزیی دان‌و گیان بەبەراکردن‌و مراندن هەر بەخودا دەکرێ، پاشان رۆژی قیامەت مەخلووقات زیندو دەکاتەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە، ﴿سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پەروەردگار پاكو مونەززەهە، بەرزو دوورو پیرۆزە لەوەی هاوەڵی هەبێ، منداڵو ژن‌و دایكو باوکی هەبێ، بەڵکوو خودایەکی تاكو تەنهاو لەهەمموو کەس بێ نیازە پێویستی بەکەس نیە، هەمموو کەس پێویستی بەئەو هەیە، فەردو صەمەد خۆیەتی.

**بەکورتی:**

ئایەتەکان بەرونی ئەوە دەگەیەنن: کە بەخشینو هەدیەناردن بەمەبەستی ئەوەی زیاترت بۆ بنێرنەوە لەسەر خودی پێغەمبەر حەرام بووەو بۆ ئوممەتەکەی حەڵاڵە وەلێ خێری تێدا نیە، بەمە دەگوترێ ریبای حەڵاڵ. بەڵام ریبای مامەڵەو قەرز حەرامەو خواردنی تاوانی گەورەیە..

ئەگەر هاتو بەخشینەکە صەدەقەو زەکات بوو بەمەبەستی بەدەستهێنانی رەزامەندی خودابوو بۆ بەدەستهێنانی پاداشی رۆژی قیامەت بوو، ئەوە لای پەروەردگار پەسەندەو بۆی حلێبە، بەخشین بەبۆنەی صیلەی رەحمو خزمایەتییەوە دەچێتە بازنەی بەخشین لەبەر خاتری خودا!

بەڵام ئەگەر بەخشین بەمەبەستی ریابازیو ناوو شۆرەتو بۆ ئەوەی ماڵ پێ بەخشراو سوپاسی بکا، ئەوە لەدونیاو قیامەت پاداشی نادرێتەوە، لای خودا هیچی بۆ حسێب ناکرێ! لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاء النَّاسِ﴾ (البقرة:٢٦). چونکە هەموو کارو کردەوەیەك بەگوێرەی نیازو نیەتە. (انما الأعمال بالنيات وانما لكل امرئ مانوى...) دەی کەوابێ خودا فەرو بەرەکەت ناخاتە ماڵو کاڵایەك لەجیاتی دیاری وەرگیرابێ، نەماڵو سامانی پێ زیاد دەبێ نەخێرو ئەوابی دەست دەکەوێ.

## سزای کافرو تاوانبارانو پاداشی موسوڵمانان

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ سِيرُواْ فِى

ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلُۚ كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّشۡرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ ٱلۡقَيِّمِ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۖ يَوۡمَئِذٖ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِأَنفُسِهِمۡ يَمۡهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾

لەوەپێش خراپی ومزعو حاڵی موشریکەکانی رون کردەوە، شیرك و بتپەرستیش هۆکاری فەسادو ئاشووبە ئەمجار لێرەدا ئاماژە بەپەیوەندی نێوان بارودۆخ و ژیانی ئادەمیزادو کردەوەکانیان دەکا، ئەوە روون دەکاتەوە: کە فەسادی دڵ و دەرونی ئادەمیزادو بیروباوەڕیان، فەسادی کردەوەو گوفتاریان زەوی پڕ دەکا لەفەساد، وشکانی و دەریاکان پڕ دەبن لەفەساد هیچ شتێك لەجێی خۆیدا نامێنێ. دەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ زانایانی تەفسیر زۆر مانایان بۆ وشەی فەساد باس کردون: قەتادەو (السدی) فەرموویانە: فەساد: هاوەڵدانانە بۆ خودا. هەندێك وتوویانە: فەساد: گرانی و وشکە ساڵی و بێ ئاوی و نەمانی فەڕو بەرەکەتە. هەندێکی تر دەفەرمون: فەساد: بڵاوبوونەوەی ستەم و راوو روت و بەرپابوونی ئاژاوەو شەڕو هەرایە.. چەند رایەکی تریش هەیەو هەریەکەیان مانای فەسادیان تایبەت کردوە بەشتێکەوە.

دەربارەی (البر)و (البحر)یش چەند مانایەکیان باس کردوە. هەندێك پێیان وایە (بر)و (بحر) لەسەر مانای حەقیقی خۆیانن.

عیکریمە دەفەرموێ: هەندێك پێیان وایە: (بر) بەمانا سارایە (بحر) بەمانا گوندو شارۆچکەیە. عەرەبیش شار بەبەحر ناو دەبەن.

قەتادە دەڵێ: (البر) بەو شارو گوندانە دەگوترێ کە لەسەر چۆمو زێ نەبن، (البحر) بەو شارو گوندانە دەگوترێ: کە لەسەر شەتو چۆم بن.

موجاهید دەڵێ: هەر گوندێك لەسەر چۆم بێ ئەوە ئەو بەدەریا ناوی دەهێندێ. ئیمام (النحاس)یش شتێکی ئاوای فەرمووە: وتوویەتی: دو مەعنا لەئایەتەکە وەردەگیرێ:

١- مەبەست بەفەساد گرانی بێو مەبەست (البر) ساراو گوندەکان بێ. مەبەست بە(البحر)یش ئەو شارانە بێ: کە لەسەر دەریاو شەتاوان بنیات نرابن وەکوو دەڵێن: (کەلام لەحەزفی موضافە) وەکوو ﴿وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ﴾ (یوسف:٨٢) وایە. واتە: کەم بارانیو وشکە ساڵیو گرانی پەیدا بوو بەهۆی کردەوەی نالەباری ئادەمیزادەکانەوە.

٢- رای دووەم ئەوەیە دەفەرموێ: تاوانو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا لەوشکانیو ناو دەریادا سەریان هەڵدا، چەتەییو راوو روتو ستەمکاری بڵاو بووە. ئیتر خودا بارانی لێ گرتنەوە، رزقو رۆزیی لێ کەمکردنەوە بۆ ئەوەی برێ لەسزای کردەوەکانیان بچێژنو لەئاکامدا بەخۆیاندا بچنەوەو تۆبە بکەن.

کەوابێ مانای ئایەتەکە بەگشتی بەم جۆرەیە: فەسادو شەڕو ئاژاوە دونیای گرتەوە، زەرەرو زیان زۆربوو، سودو قازانج کەمو کشتوکاڵو بەروبوم بێ پیتو بەرەکەت، باران کەمو گرانیو بومەلەرزەو نەخۆشیو کارەسات زۆرو زەبەندە شەڕو هەراو بەکارهێنانی چەکی کۆکوژو وێرانکەر... ئەمانە هەموو: کە پەیدا بوونو پەیدا دەبن بەهۆی تاوانو ستەمی ئادەمیزاد خۆیانەوەیە، بەهۆی کوفرو پێشێل کردنی سنوورەکانی خوداوەیە، بەهۆی بێ ویژدانیو نەبوونی وازیعی ئایینییەوەیە. بەهۆی دژایەتی کردنی ئایین گوێ نەدان بەفەرمانو

جڵەوگیریـەکانی پەروەردگارەوەیـە. بـەهۆی دەسـتدرێژیکردنە سـەر مـاڵی یـەکتری‌و سەر گیانی یەکتریـەوە بەناحـەق. ﴿لِيُذِيقَهُمْ بَعْـضَ الَّـذِي عَمِلُـوا لَعَلَّهُـمْ يَرْجِعُـونَ﴾ خـودا ئـەم هـەموو ناخۆشـی‌و دەردو بەڵایانـەتان بەسـەردا دەدا بـۆ ئـەوەی تۆڵـەی بەشێك لەتاوان‌و سەرپێچییەکانتان وەربگرنەوە. لەناکاما بیر لەخۆتان بکەنەوەو بۆ لای خـودا بگەڕێنـەوە، وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَبَلَوْنَـاهُمْ بِالْحَـسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ (الأعراف:١٦٨).

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشەی عەزابی ریشەکێشکەر لەو گەل‌و نەتەوە دەکا: کە شیرك‌و فەسادیان لەناودا باوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَـةُ الَّـذِينَ مِـنْ قَبْـلُ﴾ ئـەی موحەممـەد! بـەو خەڵکە موشـریك‌و موفـسیدانەی گەلەکـەت بڵـێ: بـڕۆن بـەوڵاتاندا بگـەڕێن، لـەپاشماوەو شـوێنەوارو بەسـەرهاتی گەلەپێشینەکان ورد ببنەوە، بزانن سەرەنجامی ئەو گەل‌و نەتەوانـەی سـوور بـوون لەسەر کوفرو بڵاوکردنەوەی فەسادو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران چی بوو چییان بەسـەرهات، خـودا چـۆن بـەهۆی کـوفرو سەرپێـچیکردنیانەوە ریشەکێـشی کـردن، عەزابی سەختی پـێ چەشـتن، تۆڵەی فەسـادو بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەرانی لـێ سـتاندن‌و کردنـی بەپەنـدو عیبرەتـی مێـژوو، دەبوایـە کەسـانی دیکە پەنـدیان لـێ وەربگرتنایە. بێگومـان بەهیلاکچوون‌و لـەناو بردنـی زوربـەی ئـەو گـەل‌و نەتەوانـە بـەهۆی شـیرك‌و بەدرۆخـستنەوەی پێغەمبـەران بـووە، ﴿كَـانَ أَكْثَـرُهُمْ مُـشْرِكِينَ﴾ زوربـەی زۆری ئـەو گـەل‌و نەتـەوە لەناوبراوانـە موشـریك بـوون. زومەخـشەری دەفەرموێ: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە هەر شیرك‌و هاوەڵدانان بۆ خودا نابێتـە هـۆی لەناوچـوونی گـەل‌و نەتـەوە بـەڵکوو تـاوانی پـچوکتریش دەبێتـە هـۆی لـەناوبردن‌و تێداچون. بۆیە پێویستە ئادەمیزاد خۆی لەهەموو تاوانێك بپارێزێ.

ئـەمجار دوای رونکردنـەوەی دیـاردەی شـیرك‌و بڵاوکردنـەوەی فەسـادو ئاشـوب‌و کاردانـەوەیان لەسـەر ژیـانی ئـادەمیزادو دوارۆژیـان، هـەروا دوای جڵـەوگیری کـردن

لـەكافرەكان بـۆ ئـەوەی واز لەهەڵوێـستی ناسروشـتی خۆیـان بێـنن، فـەرمان بەپێغەمبـەرو شوێنكەوتوانی دەكا: كە پابەنـدی ئایینی حـەق بـنو بـەردەوام بـن لەسەر ئەنجامدانی ئەركە ئایینیەكانو دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لا مَرَدَّ لَهُ مِنْ اللَّهِ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر خۆتو شوێنكەوتوانت پابەندی ئایینی ئیسلام بنو بەردەوام بن لەسەر طاعەتو خوداپەرستی، بەدڵسۆزی ئەركەكانی ئایین جێ بەجێ بكەنو بەتەواوی روبكەنە ئـایینی خوداپەسند، پـێش ئەوەی رۆژی قیامەت بێو رەنج بەخەسار بن؛ ئـەو رۆژەی گومـان لـەهاتنی‌دا نیـەو هەر دەبێ بێ، چونكە خودا بڕیاری هاتنی داوە، هەر شتێكیش خودا بڕیاری هـاتنی دابێ گەڕانەوەی نیـە. ئـەو رۆژەی كێشەكانی ئـادەمیزادی تێـدا یـەكالا دەكرێنـەوەو هەموو ئادەمیزادەكان بەگوێرەی كردەوەكانیان پۆلێن دەكـرێنو دەكرێنـە دو تـاقم؛ تاقمێكیان بۆ بەهەشت، پێرێكیان بـۆ دۆزەخ. هـەر كەسـە پـاداشو سـزای كـردەوەی خۆی وەردەگرێتەوە دەفـەرموێ: ﴿مَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَمَنْ عَمِـلَ صَـالِحاً فَلأَنفُـسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ كەسێك بڕوای بەخودا نەبێ، پێغەمبەران بـەدرۆ بخاتـەوە، پەیامەكـەیان رەت بكاتەوە، هـاتنی قیامـەت بـەدرۆ بزانـێ، ئـەوە تۆڵـەی تـاوانی خـۆی لەئەسـتۆی خۆیـەتیو بـۆ خـۆی خەسـارەتمەندە، كەسـێكیش ئیمـانی بـەخودا بـێو نامـە ئاسمانییـەكانو پێغەمبـەران بەراسـت بزانـێو پابەنـدی فـەرمانو جڵەوگیریـەكانی خودا بێ كە لەسەر زمانی پێغەمبەران پـێی گەیـشتووە، بـەهیوای پاداشـی قیامـەت بێو وێـڕای ئـەو ئیمانـە پـتەوەی كـردەوەی باشـیش ئـەنجام بـدا ئـەوا ئـەو كەسـانە جێگای خۆیان خـۆش دەكـەنو پێخـەفو راخـەری نـەرمو نـۆڵ خـانووی بـەردەوامو جوانو قەشـەنگو رازاوە بۆخۆیـان دابـین دەكـەن، ﴿لِيَجْـزِيَ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ ئەو ئیمانەی موسوڵمانەكان هەیانەو ئەو كردەوە باشانەی ئەنجامی دەدەن ئاكامەكەی ئەوەیە: تـا خـودا پاداشـی ئـەو كەسـانە بداتەوە كە ئیمانیان هێناوەو كرداری باشیان ئەنجام داوە بەفەضڵو گەورەیی خـۆی

پاداشی زیاتریان لەكردەوەكانی خۆیان بداتەوە، پاداشی خودا پاداشی فەضلو ئیحسانە، وا دەبێ یەك بەدە پاداش دەداتەوە تا دەگاتە یەك بەحەوتصەدو زیاتریش. بەراستی خودای میهرەبان: كە ئەهلی ئیمانی خۆش دەوێنو بەئیحسانی خۆی پاداشی باشیان دەداتەوە پێری كافرانی خۆش ناوێو سزایان دەدا، بەلام سزایەكی عادلانەو دوور لەستەم.

كە دەفەرموێ: (من فضله) ئاماژەیە بەوە: كە هیچ كەسێك تەنانەت پێغەمبەرانیش بەهۆی كردەوەكانی ناچێتە ناو بەهەشتەوە، چونكە چەندێك كردەوەی چاك بكا هێشتا پاساوی نیعمەتێكی دونیای بۆ نادرێتەوە. شێخی سەعدی دەفەرموێ: هەر هەناسەیەكی: كە ئادەمیزاد هەڵیدەمژێ دو نیعمەتی تێدانو داخوازی دوو شوكرو سوپاسە چونكە: كە هەناسە هەڵدەمژی درێژە پێدانی ژیانە: كە هەناسەكەش دەدەیەوە جەستەو گیانت ئیسراحەت دەكەن.

## بەڵگە هێنانەوە بەباوو باران لەسەر بەدەسەلاتی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاكی

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ

كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەوەی کرد: کە فەسادو بەڵاو کارەسات لەبەرپرو دەریادا بڵاوبۆتەوە بەهۆی شیرك و تاوانی خەڵکەوە، ئەمجار لێرەدا سەرنجیان رادەکێشێ بۆ رانواندنی بەڵگەو نیشانە لەسەر تاك و تەنهایی خودا، بەو شتانەی کە رۆژانەو وەرزانە دەیان بینن و هەستیان پێ دەکەن. وەکوو ناردنی باو بارانـدنی باران. هەروا بەڵگە هێنانـەوە لەسـەر بەتواناییو فەضڵو ئیحسانی پەروەردگار بەزیندو کردنەوەی زەویو رۆیاندنی کەشتی بەناو دەریادا. هەڵکردنی باوو بارینی باران و زیندوکردنـەوەی زەویو سـەوزبوونەوەی گـژوگیاو درەخـت سـەرلەنوێ نیشانەی دەسەڵاتو توانـای خودایە بەسـەر هەموو شتێکدا. لەناوانی ئەم بەڵگە هێنانەوەدا، دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ تێهەڵکێش دەکاو تەسەللای دەداتەوە: بەوە کە زۆر لەپێغەمبـەران لـەوەپێش هاتوونـە سـەر گـەڵ و نەتـەوەکانیان و مـوعجیزەی ئاشکراو نمایانیان بۆ هێنـاون بـەڵام گەلـەکانیان بـەدرۆیان خـستونەوە، ئیتر خـودا تۆڵـەی لێ سـتاندون و ریشەکێشی کـردون، کـەوابێ تـۆیش ئـەی موحەممـەد! غـەمو

پەژارە لەدڵی خۆت دەربکەو دڵنیابە سەرکەوتن هەر بۆ موسوڵمانانە. دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: هەندێك لەبەڵگەو نیشانەی تاكو تەنهایی خودا، هەندێ بەڵگە لەسەر بەتوانایی خوداو زۆریی نیعمەتەكانی ئەو ئایەتە كەونیانەن: كە گەواهی ئەوە دەدەن: كە خودا بەسەر هەموو شتێكی بوونەوەردا باڵادەستە، ئەوەتا با هەڵدەكا، دەبێتە مزگێنی هاتنی خێرو فەڕو بارینی باران، زەوی وشكو سوتەمەڕو بەو بارانە زیندو دەبێتەوە گیاوگژ سەرلەنوێ دەڕوێنەوەو دەشتو دەر سەوز هەڵدەگەڕێو درەختەكان سەوز دەبنەوەو دانەوێڵەو بەروبومو میوە دەردەكەوێو پێ دەگا. بۆ ئەوەی ئێوەی ئادەمیزاد لەبەروبوومی ئەو بارانە بخۆن، بەو بارانە گیانلەبەرانو وڵات زیندو دەبنەوەو بژێویان بۆ زۆر دەبێ، سەر لەنوێ سروشت خۆی ئارایشت دەداتەوەو بەو باوو بارانە ژیان تازە دەبێتەوە نەشو نما دەكەوێتەوە ناو شتە خاوەن گیانو خاوەن نماكانەوە! هەروەها بۆ ئەوەی (با)یەكە كەشتی پاڵ پێوەبنێ، یان بۆ ئەوەی باران بارینەكە چۆمەكان والێ بكا ئامادەباشی ئەوەیان تێدابێ كەشتییان بەناودا بڕواو بتوانن كاروباری بازرگانی خۆتان ئەنجام بدەنو شوكرو سوپاسی خودا بكەن لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە ئاشكراو نهێنییانەی پێتان بەخشراوە: كە ناتوانن ژمارەیان بكەن وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا﴾ (ابراهيم: ٣٤)

ئەمجار دڵدانەوەیەكی پێغەمبەر دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ رُسُلاً إِلَى قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنْ الَّذِينَ أَجْرَمُوا وَكَانَ حَقّاً عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ دەبینی زۆر لەقەومەكەت بەدرۆت دەخەنەوەو بڕوات پێ ناكەن، پێی دڵگران مەبە، چونكە تۆ یەكەم پێغەمبەر نیت: كە بەدرۆ خرابیتەوە، لەپێش تۆوە زۆر پێغەمبەری ترمان ڕەوانە كردوە بۆ سەر

گەلەکانیان، هەرچەندە بەڵگەو موعجیزەی جۆراو جۆریان نیشان دان لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی خۆیان و هەوڵیان دا نەتەوەکانیان لەگومڕایی و کوفرو ئیلحاد رزگار بکەن و بیانخەنە ڕێبازی خوداپەرستی، بەڵام گەلەکانیان بەدرۆیان خستنەوەو پەیامەکەیانیان رەتکردنەوە وەکوو چۆن قورەیشییەکان تۆ بەدرۆ دەخەنەوە، ئیتر پەروەردگار تۆڵەی لەتاوانباران ستاندو گەلە سەررەق و بەدرۆ خەرەوەکانی بەعەزابی سەخت لەناوبردن، بەفەضڵ و رەحمەتی خۆیشی ئەوانەی رزگار کردن کە بڕوایان هێناو شوێن پەیامی پێغەمبەرەکانیان کەوتن، دەی با ئەوانەی ئیمانت پێ ناهێنن چاوەڕوان بن و بزانن ئەوەی بەسەر گەلەپێشینەکان هاتووە دوور نیە بەسەر ئەوانیش بێ، با موسوڵمانانیش پشت بەخودا ببەستن و دڵنیابن لەوەی پەروەردگار ئەوان فەرامۆش ناکا!

بنەما سەرەکییەکانی ئایین سێ بنەمان: تاك و تەنهایی خودا، زیندوبوونەوە، پێغەمبەرایەتی. جا کە لەوەپێش بنەمای تەوحیدو زیندوبوونەوەی چەسپاند، لەم ئایەتەشدا بنەمای سێیەمی باسکرد، کە پێغەمبەرایەتییە.

ئەمجار مەبەدەئێکی گشتی رادەگەیەنێ: کە ئەویش پشتگیریکردن و یارمەتیدانی موسوڵمانانە. پەروەردگار لەروی فەضڵ و گەورەیی خۆیەوە لەسەر خۆی پێویست کردوە یارمەتی ڕێبوارانی ڕێبازی خۆی بدا، بەسەر دوژمنانیاندا سەریان بخا.

ئیبنو ئەبی حاتەم و طەبەرانی و ئیرمیذی و ئیبنو مەردەوەیهی لەئەبو دەرداوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: (مامن امرئ مسلم يرد عن عرض أخيه الا كان حقاً على الله أ، يرد عنه نار جهنم يوم القيامة) ئەمجار ئەم ئایەتە ﴿وَكَانَ حَقّاً عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ی خوێندەوە.

ئەمجار پەروەردگار چۆنیەتی پێکهێنانی هەورو بارانبارین ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ

﴿وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە (با) هەڵدەکا بەگوێرەی حیکمەتو دانایی خۆی ئاراستەی دەکا، هەورەکان وەجەو جوڵ دەخاو تێکیان دەهاوێ و لەبەرزاییدا زۆریان دەکاو گردیان دەکاتەوە، ئەمجار پارچە پارچەو گەواڵ گەواڵیان دەکا، جاری وا هەیە هەورەکان تەنکن و پەڵە پەڵە بەئاسمانەوە دەردەکەون و دوایی رادەدرێن بۆ هەرێمێکی تر. جاری وایش دەبێ، هەورەکە لەلای دەریاوە دێ و هەڵمێکی تەڕو پڕ لەئاوە بارانی پێیە، لەکوێ خودا مەیلی لێ بێ لەوێ باران دەبارێنێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَاباً ثِقَالاً سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْموْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الأعراف:٥٧).

جا کە پەروەردگار بەقودرەتی خۆی ئەو هەڵمە تەڕەی سەر دەریاو زۆنگەکان چڕو پڕ دەکاتەوەو رایان دەداو دەیانهێنێ بۆ سەر شارو زەوی و زارتان، ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾ ئەتۆ ئەی ئادەمیزاد دەبینی دڵۆپە باران لەو هەورانە دێتە خوار ﴿فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ جا کە خودای باڵادەست بەویستو ئیرادەی خۆی ئەو بارانەی بەسەر هەندێ شارو گوندو زەوی و کێوو کەژدا باراند، پێی دڵخۆش دەبن ترس و بیمی گرانی و وشکە ساڵییان لێ دەڕەوێتەوە، ئەو بارانەیان بەسەردا دەبارێ زەوی و زاریان تێراو دەکا. ﴿وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ﴾ هەرچەندە ئەوان پێش ئەوەی ئەو بارانە بەسەریاندا ببارێ پێش بارینەکەی هیوا بڕاو بوون و بەتەما نەبوون بارانیان بۆ ببارێ، ئیتر: کە لەنکاوێك ئەو بارانەیان بەسەردا دەبارێ زۆر شادمان دەبن و خۆشییان لەدڵ و دەروونیدا پەیدا دەبێ.

بەکورتی ئەوان پێش بارینەکە زۆر بەتاسوخەوە بوون ببارێ، زۆر جار بەهیوا دەبوون ببارێ و نەدەباری، پێویستیان بەباران زیاد دەبێ نابارێ، چاوەڕوانی دەکەن و باران دوا دەکەوێ ئەمجار لەنکاوێك کەبۆیان دەبارێ زۆر پێی دڵخۆش

دەبـن، ئـیتر زەوی مردویـان فـشەڵ دەبـێو گیاوگـژی لێ دەڕوێو سروشـت لـەخۆ دەكـەوێو خـۆی ئارایشت دەداو لەهـەموو جۆرێـك روەك دەڕوێنـێو دیمـەنی زەوی لەهەموو رەنگێك دەنوێنێ.

﴿فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَـةِ اللَّـهِ كَيْـفَ يُحْـيِ الأَرْضَ بَعْـدَ مَوْتِهَـا﴾ ئـەی پێغەمبـەر! هـەروەها ئـەی ئەوانـەی شـوێن پـەیامی پێغەمبـەر كـەوتوون! بڕوانـەو بەچـاوی وردبینی‌یەوە لەو بارانە تێ بفكرە كە دیاردەی رەحمـەتی خودایـە سـەرنجی بـدەرێ چـۆن دەبێتـە هۆكـاری زیندوبوونـەوەی زەوی وشـكو سـوتەمەڕۆ، سـەیربكە چـۆن سـەرلەنوێ بـەو بارانـە گـژوگیا دەڕوێنینـەوە، دارو درەختـەكان رادەسـێنو زینـدو دەبنـەوەو بـەروبومو دانەوێڵـە وەبـەر دەهێنینـەوە، ئەمـەش نیـشانەی رەحمـەتو ئیحسانی بەرفراوانی پەروەردگارە.

﴿إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَـدِيرٌ﴾ بێگومـان ئـەو كەسـەی ئـاوا هەور پێـك دێنـێو بـاران دەبارێنـێو زەوی زینـدوو دەكاتـەوە، دەتوانـێ مـردوانیش زیندوو بكاتەوە، زیندوكردنـەوەی ئێـوە دوای مردنتـان هـەروەكوو زیندوكردنـەوەی زەوی وایـەو بـەلای خـوداوە چ گرانیـەكی تێـدا نیـە، خـودا بەسـەر هـەموو شـتێكدا بەتواناو بالآدەستە، لەزەوی‌و ئاسمانـەكاندا هـیچ شـتێكی لـێ عاسی نابـێ. هەرچـی بیەوێ بیكا دەیكاو هەرچی بیـەوێ ببـێ دەبـێ. چـۆن لەنـەبوەوە دروسـتی كـردون ئاواش جارێكی تر رۆژی قیامەت زیندوتان دەكاتەوە. وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەئەوە دەكاو دەفـەرموێ: ﴿قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ؟ قُلْ يُحْيِيهَا الَّـذِي أَنـشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (یـس:٧٨-٧٩)

بێگومان ئەم دیاردەو ئاثارانەی رەحمەتی خودا: كـە زینـدو كردنـەوەی زەوییـە بەباران، نیـشانەیەكی گـرنگو بەرچاو لەسـەر راسـتی هـاتنی قیامـەتو سـەرلەنوێ زیندوبوونـەوەتان، جـەخت دەكاتـەوە لەسـەر ئـەو ئاكـامو سـەرەنجامەتانو ئـەو حەقیقەتـە دەچەسـپێنێ. ئـەمجار لـەم ئایەتـەی دوایـیدا خراپـی حـاڵی كافرو بـێ

بڕواکـان رون دەکاتــەوە، ســپڵەیی‌و هەســت نــەکردنیان بەنیعمەتــەکانی خــودا رادەگەیەنێ، لەسەر مەنهەج‌و پرۆگرامێك بەردەوام نابن، ئەوەتا بەهەوری باراناوی دڵخۆش دەبن، کەچی کە تووشی ناخۆشی دەبن لەرەحمەتی خودا ناهومێد دەبن دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحاً فَرَأَوْهُ مُصْفَرّاً لَظَلُّوا مِنْ بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ﴾ سوێند بەخودا ئەگەر ئەو بایە بایەکی وابێ کشت‌و کاڵیان زەرد هەڵبگێڕێ، لەم‌و گڵ‌و خۆڵ لەگەڵ خۆی بێنێ، زیان بەکشت‌وکاڵیان بگەیەنێ، یاخود دیاردەی ئەو بایەیان لەزەویدا بەزەرد هاتە پێش چاو بەم جۆرە لەجیاتی باران لەم‌و خۆڵێکی زەردی بەسەر زەویدا رژاند، یان لەبەر بێ بارانی کشت‌و کاڵەکەیان زەرد هەڵگرا، ئیتر دەست دەکەن بەکوفرو قسەی ناڕەوا بەرامبەر بەخودا، رقیان هەڵدەستێ‌و لەرەحمەتی خودا ناهومێد دەبن لەجیاتی ئەوەی گەردنکەچی قەزاو قەدەری خودابن‌و لێی بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی بەڵایان لەسەر لابا، کوفرو بێدینی دەکەنە هەڵوێستی خۆیان. ئەمە حاڵ‌و وەزعی ئەو کەسانەیە ئیمانیان بەقەزاو قەدەری خودا نیە، بڕوایان بەوە نیە: کە دەستی خودا لەپشت هەموو رووداوەکانەوەیەو ئەو دەستەیە: کە بوونەوەر پێکەوە دەگونجێنێ‌و هەموو کاروبارێك بەگوێرەی حیکمەت‌و قانوونێك: کە خۆی دایناوە هەڵدەسوڕێنێ‌و بوونەوەری پێکەوە گونجاندوە.

## تەسەللادانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەناو ئەو ناڕەحەتیانەی تووشی دەبوو لەموشریکەکانەوە: کەرویان لەبانگەوازییەکەی وەردەگێڕا

﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾

دوای ئـەوەی بەڵگـەی تەوحیـدو زیندوبوونـەوەی هێنـاو ئـەرکی پێغەمبـەرانی دیاری کرد وادەی بەهەشتی بەخودا پەرستانداو هەڕەشـەی لەسەرپێـچیکاران کـرد، ئـەمجار دڵدانـەوەی پێغەمبـەر ﷺ دەکـاو تەسـەللای دەداتـەوە لەبەرامبـەر ئـەو سەررەقیو رو وەرگێڕانەی موشریکەکان کەبەرەو روی بانگەوازییەکەی دەیاننوانـد، دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ لا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلا تُسْمِعُ الصُّمَّ الـدُّعَاءَ إِذَا وَلَّـوْا مُـدْبِرِينَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر بەهەڵوێـستی ئـەو موشـریکە نەفامانـە دڵتـەنگ مەبـە، خەفـەت بـەوە مەخۆ: کە هیدایەت وەرناگرنو بانگەوازی نابیسن، چونکە ئەوان دەشوبهێنە مردو، وەکوو کەڕو کوێر دەچن! دەی بێگومـان ئـەتۆ نـاتوانی مـردو تێبگەیـەنی، نـاتوانی بانگەوازی خۆت بخەیە گوێچکەی کـەڕو بـێ گوێـوە. ئـەوان بانگـەوازی تـۆ نابیـسن، وێـڕای نەبیـستنەکەیان پـشتیش هەڵدەکـەنو رو لـەتۆ ناکـەن! ئـەوان هەرچـەندە بەرواڵەت گوێچکەیان هەنو گوێیان لەقسەیە بەڵام چونکە بانگەوازییەکەت کاریـان تێ ناکاو پێی هیدایەت ئامێز نابنو پەنجەرەی هیدایەت وەرگرتنیان داخـراوە دەق دەشوبهێنە مردوی ناو گۆڕو کەڕو بێگوێی مادەرزاد.

ئـەوان وێـڕای بـێ گیـانیو بـێ گـوێیی، کوێریـشن، چـاوی دڵیـان نابینـێ، خـۆ ئاشکراشە ﴿وَمَا أَنْتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَنْ ضَـلالَتِهِمْ﴾ تـۆ نـاتوانی کەسـێك چـاوی حـەق نـەبینێ ئـەتۆ هیدایـەتی بـدەیو لـەگومڕایی بیگێڕیـەوە، بـەڵکوو هیدایـەتو حـەق بیستنو حەق دیتن بەدەست خودایە، هەر خودا دەتوانێ دەنگی زیندوان بەمردوان بگەیەنێ ئەگەر مەیلی لێ بێ، هیدایەتدانو گومڕا کردن بەدەست خۆیەتی. کەسی تر ئەو توانایەی نیە، بۆیە دوا بەدوا ئەوە فەرمووی: ﴿إِنْ تُسْمِعُ إِلاَّ مَنْ يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَـا فَهُمْ مُسْلِمُونَ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ ناتوانی بیستنێك بخەیـە گوێچکەی ئـەو خەڵکەوە سەربکێشێ بۆ سـودو کـەڵکی لـێ وەرگـرن مەگـەر بـۆ کەسـانێك ئیمانیـان هەبێو بڕوا بەقورئان بکەن بەڵگەو دەلیلەکانی تەوحیدو بەتوانایی خودا لەدڵیاندا کاریگـەر بـێ، ئـەم جـۆرە کەسـانە هـەر کاتـێ ئایـاتی خودایـان بـۆ خوێنـدرایـەوە

دەیبیسن و لـێی حاڵی دەبن و روی تێ دەکەن و پابەنـدی فـەرمان و جڵەوگیرییـەکانی دەبـن، ئەوانـە موسـوڵمان و خـاوەن بـاوەڕن، گەردنکـەچ و فەرمانبـەرداری توجیهـاتی حەقن ئەوانەن حەق دەبیسن و شوێنی دەکەون.

**تێبینی:**

وەکوو وتراوە مەبەست بەبیستن لەئایەتی ﴿فَإِنَّكَ لَـا تُـسْمِعُ الْمَـوْتَى﴾ بیـستنی تێگەیشتن و تێفکرین و پەند وەرگرتنە، ئەمەش دژایەتی پەیدا ناکا لەگەڵ ئـەوەی لەفەرموودەی پێغەمبەردا چەسپاوە: کە دەگونجێ مردوو گوێی لەئاخاوتنی زینـدو ببێ!

عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ دوای سـێ رۆژ ئاخاوتنی ئاڕاستەی ئـەو کوژراوە کافرانـە کـرد: کـە فـڕێ درابوونـە بـیری قولـەیبی بەدەرەوە، لۆمەو سەرزەنشتی کردن، هەتا حەزرەتی عومەر: وتی: ئەی پێغەمبـەری خودا! تۆ چۆن قسە لەگەڵ کەسانێك دەکەی مردون و بۆگەنیان کـردوە!؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: (والـذي نفـسي بيـده، مـاأنتم بـأسمع لمـا أقـول مـنهم، ولكـن لايجيبـون) سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوە وەکوو ئەوان گوێتان لەقسەکانم نیە بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

ئـەم مانایـە صـەحیحەو گەلـێ فـەرمودەو ریوایـەتی تـر ئـەم راسـتیـیـە دەچەسپێنن و پشتگیری دەکەن. یـەکێ لـەو مانـاو شـایەتانە ئـەو فەرمودەیەیـە: کـە ئیبنو عەبدولبەر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوە بە(مەرفووعی)، دەفـەرموێ: هەر کەسێ بەلای گۆڕی برایـەکی موسـوڵمانیـدا بـڕواو لـەژیاندا یـەکتریان ناسـیبێ، ئەگـەر سـڵاوی لـێ بکـا، ئـیللا خـودا گیـان بـۆ مردوەکـە دەگێڕێتـەوە تـا وەڵامـی سڵاوەکەی دەداتەوە.

ئـەوەش چەسـپاوە: کـە پێغەمبـەر ﷺ موسـوڵمانەکانی فێـر دەکـرد چۆن سـڵاو لەگۆڕستان بکەن فەرمانی پێ دەکردن چۆن ئاخاوتن لەگەڵ زیندوان دەکەن ئـاواش ئاخاوتن لەگـەڵ مردوەکـان بکـەن پـێی دەفـەرمون: کـە بـەلای گۆڕسـتاندا رۆیـشتن

بڵێن: (السلام علیکم دار قوم مؤمنین) ئەم جۆرە خیطابە بۆ کەسانێکە بیستن و تێگەیشتیان هەبێ، ئیبنو ئەبی دونیا لەعائیشەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عائیشە فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مامن رجل یزور قبر أخیه ویجلس عنده الا استأنس به، ورد علیه حتی یقوم) هەر کەسێك دیدەنی گۆڕی برای موسوڵمانی بکاو لای دانیشێ ئیللا مردووەکە پێی خۆشەو وەڵامی سڵاوی قسەکانی دەداتەوە تا لەلای هەڵدەستێ. ئەبو هورەیرە دەڵێ: هەر کاتێ پیاو بەلای گۆڕی کەسێکی ناسیاویدا تێپەڕی و سڵاوی لێ کرد، مردووەکە وەڵامی سڵاوەکەی دەداتەوە.

سەلەفی صاڵح کۆڕایان هەیە لەسەر ئەمەو بەلایانەوە سەلامکردن لەگۆڕستان مەشروعەو پێیان وایە مردووەکان ئەو کەسانە دەناسن کە سەلامیان لێ دەکەن..

پێغەمبەر ﷺ موسوڵمانانی فێر کردوە کە: هەر کاتێ گۆڕستانیان بینی بەم شێوە سڵاویان لێ بکەن بڵێن: (السلام علیکم أهل الدیار من المؤمنین، وانا ان شاء الله بکم لاحقون، یرحم الله المستقدمین منا ومنکم والمستأخرین، نسأل الله لنا ولکم العافیة) ئەم فەرمودە ئیمامی موسلیم لەبورەیدەوە ڕیوایەتی کردوە.

هەموو ئەم ریوایاتانە ئەوە دەگەیەنن کە: سەلامکردن و قسە لەگەڵ کردن بۆ شتێك دەبێ ببیستێ و خیطابی ئاڕاستە بکرێ و تێ بگاو رەدیش بداتەوە، هەرچەندە سەلامکەر وڵامەکە نەبیسێ![1]

[1] ئەگەر دەتەوێ لەم بارەوە زێدە زانیاریت هەبێ و ریوایتی جۆراو جۆر بزانی سەیری تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٤٠-١٤٤١ (طبعة دار الفکر) بکە.

## قۆناغەكانی ژیانی ئادەمیزاد

﴿ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ ضَعۡفًا وَشَيۡبَةً يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار بەڵگەو نیشانەی خودایەتی خۆی لەبوونەوەردا هێنایەوە، هەڵكردنی باو بارینی بارانی كردە بڕێك لەنیشانەی خودایەتی خۆیو تاكو تەنهایی لەزاتو صیفاتیدا. ئەمجار بەڵگەیەكی تر لەخودی ئادەمیزاد دەهێنێتەوە، ئەویش بریتییە لەدروستكردنی ئەو ئادەمیزادەو تێپەڕبوونی بەچەند قۆناغێكدا، ئەم دروستكردنو گۆڕانكارییە لەئادەمیزاددا هەر بەخودا دەكرێو بەس!

دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفاً وَشَيْبَةً﴾ پەروەردگار خودایەكی وەهایە ئێوەی لەزەبوونیو بێ هێزی دروستكردوە، پاشان دوای ئەو زەعیفیو بێ هێزییە وزەو توانای پێ بەخشیون، ئەمجار دوای ئەوەی هێزو تواناتان هەبوە بێ هێزی كردونەوە پیرو كەنەفت بوون. ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾ پەروەردگار هەرچی بیەوێ دروستی بكا بەئاسانی بۆی دەكرێ، چۆنی بوێ ئاوا گۆڕانكاری لەژیانی بەندەكانیدا ئەنجام دەدا، ئەو بۆ خۆی زاناو ئاگادارە بەسەر حاڵو وەزعی بەندەكانیدا، بەتواناو دەسەڵاتە بۆ هەر شتێ بیەوێ بیكا.

ئایەتەكە بەو چەند وشەو رستانە گەشتێكی دورو درێژی بەناو شریتی تەمەنی ئادەمیزاددا كرد، گەشتێكی ئەنجامدا ئادەمیزاد سەرەتاكانی لەژیانی خۆیاندا دەبینن، كۆتایەكەشی بەچاوی خۆیان دەبینن، گەشتێكی سەرنج راكێشەو

هەر کەسێ هەستو هۆشی هەبێ بەزەقی لەبەر چاویەتی. ﴿خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ...﴾ هەر دەڵێ زەبونیو بێ هێزی ئەو مادە سەرەتاییانەن: کە کیانی ئادەمیزادی لێ پێك هاتووە، ئەو ضیعفو بێ هێزییەی ئایەتەکە ئاماژەی پێ دەکا مانای زۆرنو دیاردەکانی لەپێکهاتەی ئادەمیزاددا فرەو هەمە جۆرن!

بێ وەجیو زەعیفی جەستەی لەسەرەتادا کە لەخانەیەکی زۆر پچوكو وردا رەنگی داوەتەوە ئەویش ئەو خانە پچکۆلەیە کە زارۆڵەی لێ پەیدا دەبێ، ئەمجار لەقۆناغە جیا جیاکانی زارۆڵەدا هەر لەخوێنپارەییو گۆشپارەییو کۆرپەڵەییو ئەمجار لەدایکبونی بەساواییو پاشان گەورە بوونیو پێگەیشتنی.

ئەمجار زەبوونی ئەو مادەیەی: کە سەرەتا ئادەمیزادی لێ دروستکراوە کە گڵێکی بێ نرخو بەهایە، خۆ ئەگەر ئەو پرتەوە گیانییە یەزدانییەی لێ نەکەوتایە هەروا بەبێ نرخی لەشێوە مادییەکەیدا یان شێوە حەیوانییەکەیدا دەمایەوە ئەمەش لەچاو خیلقەتە ئادەمیزادییەکەیدا زۆر بێ وەجو کەم نرخە.

ئەمجار وردە وردە لەقۆناغی منداڵی تێپەڕ دەکاو هێزو توانای جەستەییو نەفسیو عەقڵی پەیدا دەکا، دەستو دوی خۆی دەناسێو لەچاو قۆناغەکانی رابوردویەوە بەخاوەن هێزو توانا حسێب دەکرێ. ئەمجار دەگاتە پاییزی تەمەنیو قۆناغی پیری، سەرلەنوێ زەبوونیو بێ وەجی لەهەموو لایەکەوە روی تێ دەکەنەوە، خانەکانی جەستەی وردە وردە لەنیشات دەکەون ئێسقانی پیرەك دەبنو هێزو توانای کەم دەبێتەوەو لەرزۆكو پەژموردەو زەبوون، وێڕای کەمبوونی توانای نەفسیو عەقڵی!! ئەمانە هەموو قۆناغو ئەطواری ژیانی ئادەمیزادنو هەر کەسی بێتە کوری ژیانەوە قۆناغەکانی سەرەتای ژیان دەبینێ، هەر کەسێکیش تەمەنی درێژ بێ بەقۆناغەکانی کۆتاییشدا تێدەپەڕێ، هەموو ئەم قۆناغانە کە بەسەر ئادەمیزاددا دێن گەواهیدەری ئەوەن: کە خودایەکی نەخشەکێشو کارسازو بەتوانا ئەم بوونەوەرە هەڵدەسوڕێنێو ئەو قۆناغانە بەسەر ئادەمیزاددا دەهێنێ. چونکە

گۆڕانو تەدەروج کاری سروشتو صودفه نیه، هەموو قۆناغێك دەبێ خودای خاوەن دەسەڵاتو زاناو دانا وەدی بێنێ، جگه لەخودای باڵا دەست کەسی تر ئەوەی پێ ناکرێ!!

## چۆنیەتی قیامەتو بەرامبەریکردنی بەچۆنیەتی دونیا

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَكِنَّكُمْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَا يَنْفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار بەڵگەی یەکتاپەرستیو بەتوانایی خۆی لەبواری دروستکردنی ئادەمیزاداو بەڵگەی زیندوبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەتو ژیانی ئەو دونیایەی هێنانەوە، ئەمجار لێرەدا چۆنیەتی قیامەتو بەرامبەریکردنی بەچۆنیەتی دونیاو ئەو وتو وێژو حیسابو لێکۆڵینەوانەی لەوێدا رو دەدەن باس دەکاو رایاندەنوێنێو دەیانکاتە دیمەنێکی سەرنج راکێشی پڕ جمو جۆڵی رۆژی قیامەت، دیمەنەکە پڕە لەموناقەشەو حیوارو وتو وێژی نێوان ئەهلی ئیمانو تاوانباران.

دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾ ئەو رۆژەی قیامەت رادەبێو خودا ئادەمیزادان زیندو دەکاتەوەو لەگۆڕەکانیان راستیان

دەكاتــەوە، توشــی ئــەو هــەموو ناخۆشــیو تــەنگو چــەڵەمانە دەبنــەوەو لەســارای مەحشەردا رادەگیرێن، ئا لەو رۆژەدا كافرو تاوانباران سوێند دەخۆن: كە مانــەوەیان لەدونیادا یان لەگۆڕەكانیاندا لەسەعاتێك زیاتر نەبوە، تەنیا ساتەوەختێك لەژیانی دونیـادا بـوونو بـەو مـاوە كەمـەش نـەیانتوانیوە بـیر لەسـەرەنجامو ئاكامی خۆیـان بكەنەوەو ئیمـان بێـنن، مەبەسـتیان ئەوەیـە ماوەیـەكی وا مۆڵەت نـەدراون بتـوانن بەخۆیاندا بچنەوەو هیدایەت وەربگرن.

ئـا بـەو جـۆرە هـەموو ئـەو مـاوە دورو درێـژەی ژیـانی دونیایـان لـەلا كـەم دەبێتەوەو سوێند دەخۆن كە ماوەی ژیانی دونیایـان تـەنیا سـەعاتێك بـووەو بـەس! ﴿كَذَلِكَ كَـانُوا يُؤْفَكُـونَ﴾ هـەروەكوو چـۆن لـەدیاریكردنی مـاوەی ژیـانی دونیایـان بەهەڵەچونو ناتوانن تەحدیدی ماوە بكەن، لە دونیاش داوایان دەكردو بـەو جـۆرە لەحـەق لایـان دەدا بـۆ لای بـەتاڵو لـەباوەڕی راسـتەوە دەچـوونە سـەر بیروبـاوەڕی پوچو درۆ. ئەوان لەوەدا درۆ دەكەن كە دەڵێن: تەنیا سەعاتێك لـەدونیادا ماوینــەوە ئەوان لەدونیادا بەجوانیو رازاوەییو كاڵاو مـەتاعی هەڵخەڵەتاون. ئەمـە ئاماژەیـە بەوە: كە سووربوونیان لەسەر كوفرو بێـدینی رێگـای بیركردنـەوە لەحـەقو راسـتی لـێ بەستون!!

﴿وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَـذَا يَـوْمُ الْبَعْثِ﴾ ئەوانەی زانیارییان بەكتێبی پەروەردگار هەیە بڕوایان بەخودا هەیە رەدی ئینكاریكـەرەكانی زیندوبوونــەوە دەدەنــەوە، رەدی ئەوانــەی لــەو رۆژەدا ســوێند دەخۆن: كە هەر تەنیا ساتە وەختێك لەژیانی دونیادا بونو هیچی تر، بەرپەرچیان دەدەنـەوەو پێیـان دەڵـێن: بۆچـی سـوێندی بـەدرۆ دەخـۆن، بێگومـان ئێـوە لـەژیانی دونیاتــاندا ماوەیــەكی بــاش ماونــەوە، ئــەمجار لــەژیانی بــەرزەخدا تــا رۆژی زیندوبوونەوەتان بەگوێرەی ئەو زانیارییەی لە لەوحولمەحفوظدا بۆتان بڕیار دراوە ماونەوە، لـەو رۆژەوە: كـە دروسـتكراون تـا رۆژی زیندوبوونـەوەتان یـان لـەورۆژەوە

مردون تا رۆژی زیندوبوونەوەتان ماوەیەکی دورو درێژ ماونـەوە، ﴿فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ ئەمرۆش ئـەو رۆژەیـە: کـە خـودا وادەی پێـدابوونو لـەم رۆژەی ترسـاندبوون، بـەڵام ئێـوە لـەدونیادا ئەمانـەتان نـەدەزانیو باوەڕتـان پـێ نەکردو هاتنی ئەم رۆژەتان بەلاوە ئەفسانە بوو لەهاتنی بێ ئاگابوون!

﴿فَيَوْمَئِذٍ لا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ لـەو رۆژەدا: کـە رۆژی قیامەتـە عـوزر هێنانـەوەو پاسـاو دانـەوە سـوود بەسـتەمکاران نابەخـشێ، داوای تۆبەکردنیشیان لێ ناکرێ، ئەگەر تۆبەش بکەن تۆبەو پەشیمانییان لێ وەرناگیرێ، چـونکە کـاتی تۆبـەکردنو ئەنجامـدانی کـردەوە دونیایـەو بەسەرچـووە قیامـەت دارولجەزایە..

## رۆڵی قورئان لەبواری رونکردنەوەی بەڵگە گەلێ لەبارەی عەقیدەوەو فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ: کە خۆگربێ لەسەر بانگەوازی

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ (٥٨) كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (٥٩) فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ (٦٠) ﴾

دوای ئـەوەی بەڵگـەی یەکتاپەرسـتیو هـاتنی رۆژی قیامــەتو راسـتگۆیی پێغەمبـەری بـەیان کـرد، ئـەمجار کۆتـایی سـورەتەکە بەوەصـفکردنێکی قورئـان

بەکورتی دەهێنێ، ئەوە رون دەکاتەوە کە قورئان نامەی پەند لێ وەرگرتنو کانی حیکمەتە، کەتەلۆکی بونەوەرو هەموو شتێکی پێویست بۆ ژیانی دونیاو قیامەتی تێدا کۆکراوەتەوە، مژدەو ترساندنی تەواوی تێدایە بۆ ئادەمیزاد، عوزرو بیانوی بۆ کەس نەهێشتۆتەوە، پێغەمبەریش بەدڵسۆزی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجامداوەو هیچ کەمتەرخەمییەکی نەکردوە، جا ئەگەر کافرو موشریکەکان داوای شتێکی تر بکەن جگە لەقورئانو داوای پێغەمبەرێکی تر بکەن جگە لەو پێغەمبەرەی قورئانی بۆ نێردراوە، ئەوە پەڵپو بیانووی نەگونجاوەو هەرگیز ئەو پەڵپو بیانوانەیان نایەتەدیو با هەر لەورگی خۆیان بدەن.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِنْ كُلِّ مَثَلٍ﴾ بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا حەقو راستیمان بۆ ئادەمیزاد رون کردۆتەوە، پەندو مەثەلی جۆراو جۆرمان لەسەر تاكو تەنهایی خوداو هاتنی قیامەتو راستی پێغەمبەرو پەیامەکەیمان بۆ هێناونەوە. بۆ ئەوەی حەق بناسنو شوێنی بکەون، پێغەمبەریش لەلایەن خۆیەوە کەمتەرخەمی نەکردوەو بانگەوازی خۆی بەدڵسۆزی گەیاندوە، جا ئەگەر ئەو خەڵکە بەو قورئانە رازی نەبنو پەڵپی پێغەمبەرێکی تر بگرن، ئەوە عەنادو ئینکەبەرییەو لێیان قبووڵ ناکرێ، چونکە کەسانێك جەسارەت بکەن قورئان رەت بکەنەوەو پێغەمبەر بەدرۆ بخەنەوە، بەلایانەوە گرنگ نیە هەر لەروی کوفرو عەنادەوە بەڵگەی ترو پێغەمبەری تر بەدرۆ بخەنەوە. بۆیە دوا بەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ جِئْتَهُمْ بِآيَةٍ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنْتُمْ إِلاّ مُبْطِلُونَ﴾ سوێند بەخودا ئەگەر تۆ هەر نیشانەو موعجیزەیەکی تریان بۆ بێنی، پێشنیارەکانیان بێنیەدیو بیانوویان ببڕی، ئەو کافرانە بڕواناکەنو ئیمان ناهێنن، خۆت بەساحیرو موعجیزەکەت بەسیحرو جادوبازیی لەقەڵەم دەدەن، بەخۆتو شوێنکەوتوانت دەڵێن: ئێوە جگە لەکۆمەڵێکی بەتاڵخواز بەولاوە هیچی تر نین. وەکوو لەئایەتێکی

تردا ئاماژە بەم راستی‌یە دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ جَاءتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُاْ الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾ (يونس:٩٦-٩٧)

هەڵبەتە لەئاكامی ئەم عینادو سەررەقی و لوتبەرزییەیانەوە خودا دڵیان مۆر دەكاو وەندەی تر گومڕا دەبن. وەكوو دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئا بەو شێوە پەروەردگار مۆر دەنێ بەسەر دڵی ئەو نەفام و سەررەقانەدا كە فێری حەق و راستی نابن و لەئایەتەكانی قورئان حاڵی نابن و ناشیانەوێ فێر ببن، چونكە ئامادەباشی فێربون و تێگەییشتنیان نیە، سورن لەسەر لاسایی كردنەوەی پێشینانیان و بڕوایان بەخەرافات و شتی پڕوپوچ هەیە.

جا كە ئەمە حاڵ و وەزعیانەو بەهیچ جۆرێ ئیمان ناهێنن و هەر سوورن لەسەر كوفرو ئیلحاد ﴿فَاصْبِرْ﴾ ئەتۆ ئەی پێغەمبەر! لەسەر ئەزیەت و سەررەقی موشریكەكان بەصەبرو ئارام بە، بەردەوام بە لەسەر راگەیاندنی پەیامەكەت ﴿إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان وادەو بەڵێنی خودا حەقن و دێنەجێ و پاشگەزبوونەوەیان تێدا نیە، ئەو وادەو بەڵێنانەی بەتۆی داون: كە بەسەر دوژمنەكانتدا سەرت دەخاو زەفەریان لێ دەبینی دێنە دی، سەرەنجام و سەرفرازی كۆتایی بۆ خۆت و شوێنكەوتوانتە، كاربكەو چاوەڕوان بە ﴿وَلا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لا يُوقِنُونَ﴾ باهەڵوێستی ناشیرین و قسەی نابەجێی ئەو بێ بڕوایانە تۆ واڵێ نەكا خۆت بەسووك بزانی و پەیامەكەت بەلاوە گرنگ نەمێنێ، وریابە قسەی ئەوان كارت تێ نەكاو لەسەر پەیامی خۆت سووربە گوێیان پێ مەدە، ئەوانە نەتەوەیەكی گومڕان، حیساب بۆ هەڵوێست و قسەیان مەكە. بێگومان هەرچەندە خیطابەكە ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ كراوە وەلێ لەهەمان كاتدا مەبەست شوێنكەوتوانیەتی. فەرمانە بەبانگخوازانی ئیسلام و داعیانی رێبازی خودا پەرستی دەكا: كە چاو لەپێغەمبەر بكەن و سوربن لەسەر پابەندبوون بەپەیامی ئیسلام و گەیاندنی بەگەل و نەتەوەی

تـر، بەهەڵوێـستو قـسەی نابـەجێی نـەفامو گومڕایـان تەنگـەتاو نـەبن، بـەدڵێکی دامەزراوو بڕوا بەخۆو ورەی بەرزەوە بچنە مەیدانو کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

لێرەدا سورەتی (الروم) تەواو بوو
خودا پشتیوان بێ بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر..

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورة لوقمان

## سورەتی لوقمان (مەککییەو سیو چوار ئایەتە)

ئەم سورەتە ناونراوە (لوقمان) چونکە چیرۆكو بەسەرهاتی لوقمـانی حـەکمیی لەخۆگرتووە، ئەو لوقمانەی کاکڵەی حیکمەتی دۆزییەوەو یەکتاپەرسـتو خودانـاس بوو، فەرمانی کرد بەئەخلاقی بـەرزو رەوشـتی جـوان، جڵەوگیری لـەکاری ناشـیرین کردو دژی مونکـەرات بـوو. باسـە گرنگـەکانی ئـەم سـورەتە وەکـوو هـەموو سـورەتە مەککییەکانی تر باسی بنەمای عەقیدەو بیرو باوەڕ بـەخوداو یەکتاپەرسـتیو بـڕوا بەپێغەمبـەرو داننـان بـەهاتنی رۆژی قیامـەتو زیندوبوونـەوە دەکـا. هـۆی نازڵبوونیـشی ئـەوە بـووە: کـە قورەیـشییەکان داوایـان لەپێغەمبـەر ﷺ کـرد: کـە بەسەرهاتی حەزرەتی لوقمانیان بۆ بگێڕنەوە.

سـەرەتا ئـەوە رون دەکاتـەوە: کە قورئـان موعجیزەیـەکی نـەمری پێغەمبـەرەو هیدایەتـە بـۆ ئـادەمیزادو کەتـەلۆکی بونـەوەرە، هەڵوێـستی ئـادەمیزاد بەرامبـەر قورئـان دوو شـێوەیە. بڕێکیـان بـڕوای پـێ دەکـەنو هەرچـی تێیدایـە بەراسـتی دەزانـنو سـەرەنجام بـەمراز دەگـەنو دەچـنە نـاو بەهەشـتی رازاوەوە. بڕێکیـشیان پەیامەکەی رەت دەکەنەوەو شوێنی ناکەونو پشت لەئایەتەکانی هەڵدەکەنو رێگای

راست ناگرنە بەرو سەرەنجام سزای دۆزەخ لەخۆیان دەگرێ‌و دەبنە بەدبەختی دونیاو قیامەت.

دوایی هەندێ بەڵگە لەسەر تاك‌و تەنهایی خوداو بەتوانایی‌و دەسترەنگینی خودا لەدروستکردن‌و بەدیهێنانی بوونەوەردا رادەنوێنێ.. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆکی حەزرەتی لوقمان‌و ئامۆژگاریکردنی بۆ کورەکەی بەمەبەستی فێرکردنی ئادەمیزادو شارەزایی کردنیان بۆ رێبازی حەق‌و پەیرەوکردنی بیروباوەری پەسەند لەپێشەوە وازهێنان لەهاوەڵدانان بۆ خوداو چاکەکردن لەگەڵ باوك‌و دایكداو بڕواکردن بەوە؛ کە خودا ئاگادارو بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکی گەورەو پچوکدا، هەر وا فەرمان بە ئەنجامدانی نوێژەکان‌و فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەو سادەیی لەژیانداو خۆپاراستن لەفیزەون‌و خۆبەزلزانی‌و رۆیشتنی ناڕێك پێك‌و دەنگ بەرز کردنەوە لەقسە کردن‌و. ئەمجار بەشوێن ئەوە لۆمەو سەرزەنشت ئاراستەی موشریکەکان دەکا لەسەر سوربونیان لەسەر شیرك‌و لاسایی کردنەوەیان بۆ باوك‌و باپیرانیان‌و سپڵەییان بەرامبەر نیعمەتەکانی خودا، تێگەیاندنیان: کە ئایینی ئیسلام تاکە رێگای رزگاربوونە، هەبوونی دژایەتی لەنێوان هەڵوێستی ئەو موشریکانە، ئەوان دان دەنێن بەوەدا: کە هەر خودا بەدیهێنەرە کەچی هاوەڵی بۆ دادەنێن، لەکاتی تەنگانەدا خودا ناسن‌و لەفەرەحی‌و خۆشیدا موشریك‌و هاوەڵدانەرن.

ئەمجار بەڵگەیەکی تر لەسەر قودرەت‌و بەتوانایی خودا لەهەڵسوڕاندنی بوونەوەردا دەهێنێتەوە، شەو دەخاتە سەر رۆژو لەرۆژ کەم دەکاتەوەو دەیخاتە سەر شەو مانگ‌و خۆرو ئەستێرەی رام کردون بەرێك‌و پێکی دێن‌و دەچن. کۆتایی سورەتەکەش بەفەرمانکردن بەچاکەو ترسان لەسزای رۆژی قیامەت.

## شتە تایبەتمەندییەکانی قورئانو رەوشتی ئەوانەی بڕوایان پێی هەیە

﴿ الٓمٓ ١ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ٢ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ٣ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ٤ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٥ ﴾

﴿الم﴾ دەبێ ئەم پیتانە بەشێوەی پچڕ پچڕ بخوێندرێنەوە (الف، لام، میم) هێنانی ئەم جۆرە پیتانە لەسەرەتای هەندێ لەسورەتەکانی قورئاندا ئاماژەیە بەسەر ئاسایی قورئانو تەحەددا کردنی عەرەبەکانە بەتایبەتیو ئادەمیزادە بەگشتی، دەسەوەسانکردنیانە لەو بارەوە: کە ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بخەنەڕو، بەڵکوو ناتوانن تەنانەت وێنەی سورەتێکیشی بێنن. تەحەددایان دەکاو دەفەرموێ: ئەگەر بڕواتان وایە ئەم قورئانە کەلامی خودا نیە موعجیزە نیە، دە ئێوە ئازابن لەو پیتانەی قورئانی لێ پێکهاتووە ئێوەش کەلامێکی ئاوا بخەنەڕو! ئەوە عەرزو ئەوەگەز.

﴿تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْحَكِيمِ﴾ ئەو قورئانە سەرئاسایە پێك هاتووە لەو پیتانەی ئێوە وشەیان لێ پێك دێننو نوطقیان پێ دەکەن، ئەو پیتو وشەو رستانەی قورئانی لێ پێك هاتووە هەمان ئەو پیتو وشەو رستانەن، کە ئێوە ئاخاوتنی پێ دەکەن، ئەمە ئایاتی قورئانێکی پڕ لەحیکمەتو هیدایەتە، قورئانێك: کە هیچ غەلو غەشو خواریو خێچی تێدا نیە. ماناو حوکمەکانی راستو دروستن، دژایەتیو نەگونجانیان پێکەوە تێدا نیە. مەبەستی سەرەکی لەنازڵکردنی ئەم قورئانە پیرۆزە رەهنومایی کردنی ئادەمیزادە وەکوو دەفەرموێ: ﴿هُدًى وَرَحْمَةً

﴿لِلْمُحْسِنِينَ﴾ ئایاتی ئەم قورئانە (قورئان بەگشتی) هیدایەتو رەحمەتە بۆ ئادەمیزادە چاكەكارەكان شارەزاییان دەكا بۆ رێبازێك رێبوارانی گومڕا نابن، هەر كەسێ ئەو رێبازە بگرێ سەرفرازو بەمرازگەیشتوە. رەحمەتو فەرە بۆ ئادەمیزاد چونكە ئەم هیدایەتو بیرو باوەڕە دەخاتە ناو دڵانەوە، ئارامیو خۆشیو هێمنی دەرژێنێتە ناو دەرونەكانەوە، موسوڵمانان بەهۆی شوێنكەوتنو هیدایەت وەرگرتنیان بەقورئان لەعەزابو تۆڵەی خودا رزگاریان دەبێ، خێرو بەرەكەتیان بۆ دەستەبەر دەبێ، یەكیەتیو تەبایی لەنێوان دڵەكاندا دادەمەزرێنێ. ئەمجار مانای (محسنین) شی دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ﴾ ئەوانەی خاوەن ئیمانو پابەندی شەریعەتن نوێژەكانیان (بەفەرزو سوننەتەوە) بەرێكو پێكی ئەنجام دەدەن ﴿وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ زەكاتی پێویست لەماڵی خۆیان دەردەكەنو دەیدەن بەئاتاجان ﴿وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ وێڕای ئەو كردەوە باشانەیان یەقینی تەواویان هەیە بەهاتنی رۆژی قیامەتو پاداشو سزای عادڵانەی خودا لەو رۆژەدا بۆ بەندەكانی.

ئەوان كە نوێژو عیبادەت دەكەن، كە زەكاتی ماڵی خۆیان دەردەكەن تەنها لەبەر خودا دەیكەنو بەهیوای پاداشی پەروەردگارنو بەتەمای پاداشو سوپاسی ئادەمیزادەكان نین.

﴿أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی ئەوە بیروباوەڕو كارو كردەوەیانە ئەوانە لەسەر رێبازی هیدایەتو رەهنومایین لەخوداوە، ئەوانە لەسەر ترۆپكی هیدایەتن، بەختەوەری دونیاو قیامەتن، چونكە بەئەنجامدانی نوێژەكانیان بەشێوەی رێكو پێك پەیوەندی نێوان خۆیانو خودا بەهێز دەكەن دڵنیاییان بەخودا بۆ پەیدا دەبێ، شیرینایی ئیمان دەچێژن، بەزەكاتدانو كۆمەكی كردنیان بەهەژاران بەسەر بەخیلیو ماڵ خۆشویستنی

نەفسیاندا سەردەکەون. خۆشەویستی لەنێوان خۆیان و هەژاراندا پەیدا دەکەن، یاسای تەکافولی کۆمەڵایەتی و هەمئاهەنگی لەنێوان دەوڵەمەندو هەژاردا پەیڕەو دەکەن. کۆمەڵگایەکی دوور لەئاژاوەو بەخیلی و دژایەتی دروست دەکەن بەمەش بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەتیان دەستەبەر دەکەن...

## هەڵوێستی نادەمیزاد بەرامبەر قورئان

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ٨ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٩ ﴾

دوای بەیانکردنی ئەوە: کە قورئان نامەیەکی هیدایەت و رەحمەتە پڕە لەحیکمەت و رەهنومایی. ئەوانەی شوێنی دەکەون هیدایەت ئامێز دەبن و بەختەوەری دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر دەبێ، ئەمجار حاڵ و وەزعی ئەوانە رون دەکاتەوە کە بەقورئان هیدایەت وەرناگرن و پشتی لێ هەڵدەکەن و بەشتی پڕوپووچەوە خەریکن و هەوڵ دەدەن کەسانی دیکەش پشت لەقورئان هەڵبکەن بەشوێن ئەوەدا هەڕەشەی عەزابی دۆزەخیان لێ دەکا، لەهەمان کاتدا وادەی

پاداشــی بــاش دەدا بەموســوڵمانان ئەوانــەی خــەریکی خوێنــدنی قورئــانو کــاری چاکەنو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی شەریعەتن.

﴿لَهْـوَ الْحَـدِيثِ﴾ هـەموو قـسەو ئاخاوتنێکە دڵ غـافڵ بکـاو بـەبێ سـود کـات بکوژێ، بـەروبوومی خێـری تێدانـەبێ ئاوەدانکردنـەوەی زەوی تێـدا نـەبێ بـەخێرو عەداڵەت دەقەکە وێنە کێشانی رەوشتو هەڵسو کەوتی کۆمـەڵێك ئـادەمیزادن: کـە لەهەموو کاتو شوێنێکدا هەن، لەهەموو رۆژگارێکدا رۆڵی خۆیان دەگێڕن، هەندێ ریوایـەتیش ئامـاژە بـەوە دەکـەن: کـە دەقەکـە وێنـەی روداوێکـی تایبـەتی کێـشاوە نموونـەی هەڵوێـستی کۆمـەڵێك ئامـاژە پـێ دەکـا: کـە لەسـەردەمی پێغەمبـەردا تێدەکۆشان خەڵکی لەقورئان هەڵبگێڕنەوەو بێ ئاگایان بکەن.

موقاتیـل دەڵـێ: (النـضر) کـوڕی (الحـارث) بازرگانێـك بـوو ئـاڵو وێـری نێـوان مەککەو وڵاتـی فارسـی دەکـرد، ئـەو کتێبانـەی دەکـڕین: کە چیرۆكو بەسـەرهاتی رۆستەمو ئەسفندیارو پاڵەوانانی فارسو شەڕەکانیانی تێدا بـوو، باسی کیـسراکانو بەسەرهاتیانی تێدا بوو، جا شارەزایی لەم جۆرە کتێبانـەدا پەیـدا کردبـوو لەسـەر ڕێگای ئەوانەدا دادەنیشت: کە دەیانەویست بچن گوێ لەقورئان بگـرنو فێـری بـبن. دەچـوە ئـەو کـۆڕو کۆبوونەوانـە کـە پێغەمبـەر ﷺ تێیـدا قورئـانی بـۆ خەڵکەکـە دەخوێندەوەو بانگەوازی دەکردن بۆ ئیمانهێنان.

هەر لەگەڵ پێغەمبـەر ﷺ کۆڕەکـەی جێ دەهێـشت (النـضر) بـەزمانێکی رەوان ئـەو سەرگوزەشـتەو ئەفـسانەی لـەناو کتێبـە فـارسـیـیـەکاندا فێریـان بوبـوو بـۆ خەڵکەکـەی دەخوێنـدەوەو دەیگـوت: خەڵکینـە! موحەممـەد چیرۆكو بەسـەرهاتی گـەلی عـادو ثـەمودتـان بـۆ دەگێڕێتـەوە منـیش حیکایـاتی رۆسـتەمو ئەسـفندیارو سەرگوزەشتەی کیسراکانتان بۆ دەگێڕمەوە، دەبۆ خۆتان بڵێن: هی کامـمان خۆشـترو سەرنج راکێش تـرن؟ ئـەوانیش دەیـانگوت هـی تـۆ ئـیتر وازیـان لەبیـستنی قورئـان دەهێنا! لەم بارەوە زۆر ریوایەت هەن بەپێویستمان نەزانی بیانهێنین.

﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُواً﴾ کۆمەڵێك لەئادەمیزاد هەن لەجیاتی شتی بەسوود شتی زیانبەخش پەیدا دەکا، لەجیاتی گوێگرتن و پەیڕەویکردن قورئانی پیرۆزو شیفابەخش و ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد، دەچێ فێری ئەفسانەو چیرۆکە کۆن و قسەی تورەهات دەبێ و کۆڕو سیمینار دەگرێ و خەڵکی پێ گومڕا دەکاو لەقورئانیان بێ ئاگا دەکا. هەڵیان دەنێ بۆ ئەوەی واز لەگوێگرتن بۆ قورئان بهێنن، یان دەستەو تاقمی گۆرانیبێژو دەهۆڵکوت و زورناژەن و سازو سەمتوور لێدەرو کەمانچەژەن کۆ دەکاتەوە ڕەشبەڵەك هەڵدەسوڕێنێ داوەت گەرم دەکا بەمەش خەڵکی تووشی کاری حەرام دەکاو دڵ و دەروون قەسوەتی گوناهی جۆراو جۆریان تێ دەچێ و گومڕا دەبن، هێندە لەتاواندا نوغرۆ دەبن هەست بەسامناکی کارەکەیان ناکەن و نازانن: چ تاوانێکی گەورە ئەنجام دەدەن، ئەگەر نەفام نەبوونایەو بیانزانیایە تاوانەکەیان چەند گەورەیە هەرگیز شتی وایان نەدەکرد.

ئەوانە نەفام و نەزانن، لەزانیاری و فەهمەوە ئەو کارە دزێوە ئەنجام نادەن، ئیشەکەیان حیکمەتی تێدا نیەو نیەت و مەبەستیان خراپە، بۆ خۆیان گومڕابوون دەیانەوێ بەو (لەهولحەدیثە) خەڵکی تریش گومڕا بکەن، بێ ئەدەب و ڕەوشت نزمن ئایینی خودا دەکەنە گاڵتەچی خۆیان، گاڵتە بەبەرنامەی خودا دەکەن، ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾ ئەوانە سزای ڕیسواکەریان بۆ ئامادەکراوە لەتۆڵەی بێ ئەدەبی و گاڵتەکردنیان بەئایینی خودا عەزابدانەکەیان بۆ ڕیسوا کردنە نەك بۆ پاککردنەوەیان لەگوناه.

(لام)ی (لیضل) ئەگەر حەرفی (مضارع)ەکە مەضموم بێ (لام)ی تەعلیل و بایسە، واتە: ئەو کارە دەکا بۆ ئەوەی کەسانی دیکە گومڕا بکا. ئەگەر حەرفی (مضارع) لە (یضل)دا بەمەفتووحی بخوێنینەوە (لام)ەکە (لام)ی ئاکام و

سەرەنجامە، بەعەرەبی (لام)ی عاقیبەتی پێ دەگوترێ. جا بەهەر جۆرێك رستەكە مانا بكەین گونجاوە.

ئەمجار قورئان بەردەوام دەبێ لەسەر وێنەكێشانی ئەو گومڕابوو گومڕاكەرانەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا وَلَّى مُسْتَكْبِراً كَأَنْ لَمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِي أُذُنَيْهِ وَقْراً﴾ ئەو كەسەی (لەهولحەدیث) دەكڕێ‌و كۆڕو سیمیناری گۆرانی‌و رەشبەڵەك دەبەستێ، خەریكی گومڕاكردنی كەسانی دیكەیە، ئەگەر ئایاتی ئێمەی بەسەردا بخوێندرێتەوە، پشت هەڵدەكاو روی لێ وەردەگێڕێ بەشێوەی تەكەببوركردن‌و خۆبەزلزانی، خۆی لێ كەڕ دەكا، خۆی وا لێ دەكا: كە گوێی لەهیچ نیە، دەڵێی قورسایی لەگوێچكەیدایەو ئەو قورساییە ناهێڵێ هیچ ئایەتی قورئان ببیسێ. ئەگینا هەر كەسێك گوێی لەقورئان بێ چۆن ئاوا روی لێ وەردەگێڕێ؟ چۆن هەڵس‌و كەوتی ئاوا ناشیرین بەرامبەر قورئان دەكا؟

﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەی موحەممەد! مژدە بەو پشت هەڵكردوانە بدە بەعەزابێكی بەئێش‌و ئازار. هەڵبەتە بەكارهێنانی موژدە لەجیاتی ترساندن جۆرە گاڵتە پێ كردنێكی تێدایەو شیاوی ئەو خۆبەزلزان‌و گاڵتەبازانەیە.

ئەمجار قورئان لەسەر داب‌و نەریتی خۆی دوا بەدوای بەیانكردنی حاڵ‌و وەزعی بەدبەخت‌و تاوانباران، سەرەنجامی بەختەوەرانیش دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتُ النَّعِيمِ﴾ ئەوانەی ئیمانیان بەتاك‌و تەنهایی خودا هەیە، پێغەمبەرایەتی بەراست دەزانن، پێیان وایە: كە رۆژی قیامەت دێ‌و ئادەمیزاد زیندو دەكرێنەوە وێڕای هەبوونی ئیمانی تەواوو دامەزراویان، كردەوەی باش‌و بەسود ئەنجام دەدەن، پابەندی فەرمان‌و جڵەوگیرییەكانی شەریعەتن، ئەوانە لەبەهەشتدا باغی پڕ نازو نیعمەتیان هەن، بەئارەزۆی خۆیان تێیاندا رادەبوێرن، چی خۆش بێ بۆیان لەخواردن‌و خواردنەوە، لەپۆشاك‌و شوێنی حەسانەوە، لەئامێری سواری‌و گەلێ شتی تری خۆشی هێنەر كە بەخەیاڵیش نەیان

دەبینی. بۆیان دەستەبەر دەبێ، ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ بۆ هەتا هەتایێ تیایدا دەمێننەوە، لێی دەرناچن و نایانەوێ جێی بلێن. ﴿وَعْدَ اللَّهِ حَقّاً﴾ ئەوە حازرو ئامادەکراوەو شك و گومانی تێدا نیە، وادەی خودایەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە. چونکە خودا سەخی و خاوەن فەضل و کەرەمە، چی بوێ دەیکا. ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خودای گەورەو بالادەست خاوەن تواناو دەسەلاتە، هەموو شتێك گەردنکەچی ئەوە، وادەو هەڕەشەی دێنێتە جێ، داناو حەکیم و کارسازە لەهەموو کاریکیدا، لەهەموو گفتاریکیدا..

**تێبینی:**

ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەبباس و هی تریش فەرموویانە ئەم ئایەتە واتە: ئایەتی ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ...الآية﴾ بەلگەیە لەسەر حەرامی گوێگرتن لەسازو سەمتورو زوڕناو گۆرانی وروژێنەرو ماجین.

زانایان پێیان وایە ئەم ئایەتە یەکێکە لەو سێ ئایەتەی بەلگەن لەسەر ئەوە؛ کە گۆرانی مەکروهەو پێویستە خۆپارێزیی لێ بکرێ، ئایەتی دووەم ئایەتی (٦١)ی سورەتی (النجم)ە: کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنتُمْ سَامِدُونَ﴾ ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ﴿سَامِدُونَ﴾ بەزاراوەی (الحميري) بەمانا گۆرانییە. ئایەتی سێیەم ئایەتی (٦٤)ی سورەتی (الأسراء)ە: کە دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ﴾.

تیرمیذی و هی تریش فەرمودەیەکیان لەئەنەسەوە ریوایەت کردوە؛ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (صوتان ملعونان فاجران أنهى عنهما: صوت مزمار ورنة شيطان عند نغمة ومرح، ورنة عند مصيبة لطم خدودو شق جيوب)[1] دوو دەنگ نەفرینییان لێ کراوە قێزەون و ناپەسەندن: جلەوگیرییان لێ دەکەم و خۆتانی لێ

[1] تیرمیذي لە(الجنائز) (١٠٠٥) باب (٢٥)دا (ماجاء في الرخصة في البكاء على الميت) ریوایەتی کردوە. سەیری تەفسیری قورطوبی ج٧/٣٩٥٢/(٤٠) بکە.

بپارێزن، دەنگی سازو سەمتور جوزەلەو زیڕەو چریکەی شەیتانە لەکاتی گۆرانی گوتنو خۆشیدا، زیڕەی کاتی کۆستو بەڵا، بەخۆکێشانو بەخەدادڕین.

**شەرعزانان لەبارەی گۆرانییەوە چەند رایەکیان هەیە:**

١- گۆرانی حەرام، ئەو گۆرانییەیە نەفس بوروژێنێ، ئادەمیزاد هەڵنێ بۆ سەر هەواو ئارەزۆبازیو وایان لێ بکا روبکەنە مجونو پیاهەڵدانی ئافرەت، ناوی ئافرەتو وەصفی مەحاسینی بکەن، هەروا پیاهەڵدانی مەیو شەرابو رابواردن، چونکە هەموو گۆرانی لەو جۆرە بەکۆڕایی زانایان پەسند نیەو کرێ وەرگرتنیشی لەسەر حەرامە.

٢- گۆرانی موباحو رەوا. ئەو گۆرانیانەیە: کە ئەو دیاردە ناپەسەندانەی خاڵی یەکەمی تێدا نەبن. ئەم جۆرە گۆرانیە ئەگەر بەکەمی بگوترێو زێدە رەوی تێدا نەکرێو لەکاتی خۆشیو فەرەحی وەکوو موناسەبەی ژنخواستنو ژنهێنان، هەروەها بۆ بەرزکردنەوەی وەرەو خولقاندنی حەماسەت لەسەر ئەنجامدانی کاری قورسو گران، وەکوو ئەوەی لەکاتی هەڵکەندنی خەندەق بەدەوری مەدینەدا هەندێ لەهاوەڵان گۆرانی حەماسەت خولقێنیان دەگوتن.

٣- ئەو دابو نەرێتەی: کە هەندێ رێبازی (تصوف) دایان هێناوە دەست دەکەن بەگۆرانی گوتنو لاواندنەوەی شێخەکانیانو ئامێری ژێو کەمانچەو سازو سەمتور لەگەڵ پێدا هەڵگوتنەکەیان بەکار دێنن حەرامەو شەرع رەتی دەکاتەوە. شمشاڵی شوان راجیایی تێدایەو دەف لێدان حەڵاڵە.

٤ تەپڵ لێدان لەکاتی جەنگ لەگەڵ دوژمندا حەڵاڵەو چ خراپیەکی تێدا نیە، چونکە تەپڵ لێدان لەو کاتانەدا وەرەی جەنگاوەران بەرز دەکاتەوەو ترس دەخاتە دڵی دوژمنانەوە، ریوایەت کراوە: کە ئەو رۆژەی پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە ناو مەدینەوە لەپێشیەوە چەند ئافرەتێك تەپڵیان لێ دەدا، ئەبوبەکر ویستی مەنعیان

بکا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دعهن یا أبا بکر حتى تعلم اليهود أن ديننا فسيح)[1] ئەی ئەبو بەکر وازیان لێ بێنە با تەپڵ بکوتن هەتا جولەکە بزانن: کە ئایینەکەمان کراوەیە.. ئەوەبوو تەپڵەکەیان دەکوتا دەیانگوت:

نحن جوارمن بني النجار          ياحبذا محمد من جار

٥- لەئەبو حەنیفەو شافیعیو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە ریوایەت کراوە: کە گۆرانی مەکروهە.

طەبەرانی دەفەرموێ: زانایانی شاران (علماء المدن) کۆکن لەسەر ئەوە: کە گۆرانی مەکروهەو دەبێ مەنع بکرێ.[2]

٦- دەف لێدان لەحەفلەی ژنهێناندا حەڵاڵە، هەروەها بەکارهێنانی ئەو ئامێرانەی کە دەبنە هۆی بڵاو کردنەوەی هەواڵی شوکردنو ژنهێنان، هەروەها گۆرانی گوتن بەشێوەیەکی جوان بەئەدەبانە.

## دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی نیشانەی تاكو تەنهایی خودان

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ

[1] اخرجه أحمد مسنده (٩/٢٤٩٠٩) ط دار الفكر ئەم فەرمودە خاتو عائیشە ریوایەتی کردووە بنەماکەشی لەصەحیحی موسلیمو بوخاریدا هەیە.

[2] تەفسیری قورطوبی (ج٧/٣٩٥٤/٤٣) گبعه دار الفكر.

فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

دوابەدوای ئەوەی فەرمووی: ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ کە ئاماژەیە بەحیکمەتو قودرەتی خودا، ئەمجار بەڵگە لەسەر هەبوونی ئەو قودرەتە رەهایەو ئەو حیکمەتە بەرفراوانەی خودا دەهێنێتەوە برێك لەو بەڵگانە لەسەر دەسەڵاتی بێ سنووری خوداو حیکمەتو دانایی رەهای ئەوەیە: کە توانیویەتی ئەم بوونەوەرە بەرفراوانە بەدی بێنێ کەس لافی دروستکردنی لێ نادا: کەس ناڵێ جگە لەخودا بەدیهێنەرێکی تری هەیە هەموو کەس دان بەوەدا دەنێ: کە هەر خودا بەدیهێنەریەتی، دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ ئاسمانەکانی بەدی هێناون بەبێ کۆڵەکەیەك ئێوە ببینن، یان بەبێ کۆڵەکە، ئێوە دەیبینن: کە بێ کۆڵەکەیە. ئاسمانیش هەرچەندە بەپانو راخراو دێتە بەرچاو بەڵام لەراستیدا ئەویش وەکوو زەوی دائیرییەو مەیلەو خڕە، ئاماژە بەئەوە: کە پەروەردگار لەئایەتێکی تردا دەربارەی مانگو خۆرو ئەستێرەکان دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (الأنبياء:٣٣) وشەی (فلك)یش بەمانا شتی دائیرییە، بەشتێك دەگوترێ: (فلك) کە کەوانەیی بێ.

جا ئاسمانەکان بریتی بن لەو هەموو مانگو خۆرو ئەستێرەو سەدو مانەی: کە لەبۆشاییدا دێنو دەچنو هەڵدەسوڕێنو هەر خودا ژمارەو بەرفراوانییان دەزانێ یان بریتی بێ لەو سەرقاپەشینەی بەچاو دەیبینینو کەس نازانێ چۆنیەتی چۆنە. ئاسمانەکان بریتی بن لەوانە یان لەمانە، بێگومان مەخلوقاتێکی زۆرو گەورەو بێ سەرو بن لەفەضادا بەبێ کۆڵەکە وەستاون، ئادەمیزاد بەشەو بەرۆژ تا چاویان بڕ بکا دەیان بینن، چەندێك بەناو زەویدا گەشتو گوزار بکەنو دوور بکەونەوە لەپێش چاویان هون نابن. تەماشا کردنی ئەم ئاسمانە پانو پۆڕە بەچاوی سەرو

بەبێ ئەوەی حەقیقەتی بەرفراوانی بزانین سەرگێژ دەکاو کیان وەلەرزە دێنێ، ئەمجار لەو گەشتە خێراییەوە: کە بەناو ئەو بوونەوەرە بەرفراوان و سەرسوڕهێنەرەدا کردبێ، سیاقەکە سەرنج و دڵی ئادەمیزاد کێش دەکاتەوە بۆ سەر دایەزەمین و لانکەی ژیانی جیهانی، کێشی دەکاتەوە بۆ سەر ئەو زەوییە پچکۆلەی ئادەمیزاد پێی وایە پان و پۆڕو بەرفراوانە، بەڵام لەڕاستیدا لەئاستی گەوندا گەردیلەیەکەو بەس! هەرچەندە ئەگەر ئادەمیزاد بەدرێژایی تەمەنی ناتوانێ بەرۆیشتنی ئاسایی ئەمسەرەو سەری ببڕێ و قەراغ و بیجاغی بپشکنێ، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر ئەم زەوییە بۆ ئەوەی تێی بفکرێ و بەچاوی وردبینی سەیری بکاو سود لەتێفکرین و تێڕامانەکەی ببینێ!

دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ﴾ گێڕاویەتی لەزەویدا کێوی بەرزو سەرکەش، بەناخی زەویدا رۆییشتونە خوارێ و زەوییان قورس کردوەو تەوازونی لەنگەرەکەیان راگرتووە بۆ ئەوەی لەرەلەر بەدانیشتوانی سەرخۆی نەکاو ئاوی (محیطات) دەریالوشەکان کە زوربەی زۆری زەوی ئاوە داینەپۆشێ، زانایانی زەوی ناس دەڵێن: (رواسي الجبال) بریتین لەوکەندو شیوو دۆڵ و تورکەتورکانەی لەدیوی دەرەوەی زەویدان و لەئاکامی ساردیی ناوەوەی زەوی و بەسەهۆڵبونی گازەکانی ناوی و کەمبوونەوەو تێچونەوەی قەبارەی پەیدا دەبن، بەمجۆرە زەوی تێدەچێ و ئینکیماش دەکاو روبەرەکەی چرو لۆچ و کەندو بەرزی و نزمی تێداکەوێ، ئەمەش لەئاکامی ئەو ئینکیماش و وێکهاتنەوە ناوخۆییەی زەوی لەکاتی ساردبوونەوەی و پچوکبوونەوەی قەبارەکەیدا لێرەو لەوێ.. بەهەرحاڵ ئەم تیۆرە راست بێ یان راست نەبێ، چ لە مەوزوعەکە ناگۆڕێ، چونکە ئەوە قورئانی پیرۆز (کەلامی ئەزەلی یەزدان) ئەوە دەچەسپێنێ: کە هەبوونی ئەو کێوو کەژانە بۆ راگرتنی لەنگەری زەوییە، بۆئەوەی مەیەلان نەکاو لەرەو جەم و جۆڵی نائاسایی لێ پەیدا نەبێ و دانیشتوانی سەرخۆی فڕێ نەدا!

وێدەچێ تیۆرو بۆچونی ئەو زانایانە راست بێ‌و پەیدا بوونی کێوو گردەکان بەم شێوە بۆ راگرتنی هاوکێشەی زەوی بێ لەکاتی ئینکیماش‌و بەپاشەوەچوونی گازەکانی ناو زەوی‌و وێکهاتنەوەی توێکڵەکەی لێرەو لەوێ، ئەو کاتە بەرزبوونەوەی کێوێك لێرەو پەیدا بوونی دۆڵێك لەوێ بۆ راگرتنی لەنگەری زەوییەو مانای ئایەتەکە ئاشکراو نمایانە.

﴿وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ﴾ پەروەردگار لەزەویدا جۆرەها گیانلەبەری بەدیهێناوەو تێیدا بڵاو کردنەوە: کە ئەوەندە زۆرو هەمە جۆرن هەر خودا خۆی ژمارەو جۆرەکانیان دەزانێ!

بەراستی ئەمە یەکێکە لەنهێنییەکانی بوونەوەری بەرفراوان‌و گەورە، هەبوونی زیندەوەر لەسەر ئەم زەوییە نهێنییەکە هەتا ئەمڕۆ کەس نەیتوانیوە دەرکی بکاو شتی بکاتەوە. نەیتوانیوە تەفسیری گیان لەسەرەتا ترین شێوەی‌داو لەتاقە خەلیەکی ئاسایی پچوك‌دا بکاو شی بکاتەوە، چ جایی ئەگەر ئەم نهێنییە گەورەو جۆراو جۆر بووا! وەلحال گیان هێندە جۆراو جۆرو ئەجناس‌و ئەنواع‌و ئەشکالی هەیە، هەر خودا دەزانێ چەندەو چۆنە، کەچی ئادەمیزاد بەسەریدا تێپەڕ دەکەن‌و چاوی خۆیانی لێ دەقوچێنن‌و سەرنجیان راناکێشێ‌و بەلایانەوە شتێکی ئاساییە. لەکاتێکدا کە سەرنجی خۆیان دەدەنە ئامێرێکی دەستکردی ئادەمیزادو بۆ نموونە توێژینەوە لەنهێنی کۆمپیوتەرێك دەکەن سەریان سوڕ دەمێنێ‌و بەلایانەوە عەجایەبە. دەی نهێنی ئەو ئامێرە دەستکردانەی ئادەمیزاد لەچاو نهێنی خانەیەکی زیندوی ناو جەستەی زیندەوەر هەر بەرامبەریی ناکرێن! نهێنی خانە زیندوەکە زۆر سەرسوڕهێنەر ترە، جا کەوابێ دەبێ ئەتۆ چی بڵێی بەرامبەر جەستەی ئادەمیزاد کە بەسەدان کارگەی کیمیاوی تێدان‌و سەدان گەنجینەی جۆراو جۆری تێدان بۆ کاری هونەری‌و دابەشکردن، بەسەدان ئێزگەی لاسلکی‌و تەلەفونی تێدان بۆ ناردن‌و وەرگرتن. ئەو جەستە سەدان کارو تێکەو لێکەی (معقد)ی وا ئەنجام دەدا کە هەر خودا نهێنییەکانیان دەزانێ.

﴿وَأَنزَلْنَا مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ ئێمە لەبەرزاییەوە (لەهەورەوە) بارانمان باراندوە، بەهۆی ئەو بارانەوە لەزەویدا جۆرەها روەکی جوان و نایابمان رواندوە، دیمەنیان جوانەو بەسودن بۆ ژیانی زیندەوەران. باراندنی باران لەئاسمانەوە یەکێکە لەدیاردە سەرسوڕهێنەرەکانی بوونەوەرو ئێمە بەبێ لێ وردبوونەوە بەسەریدا تێدەپەڕین، ئەو ئاوەی لەجۆگاو شەلال و کانیاوو بیرو چۆم و زێیەکان دەڕواو سەرڕێژ دەکاو هەڵدەستێ لەئاوی باران پەیدا دەبێ، دەریاکان بەئاوی ئەو بارانە پڕ دەبن، ئەو بارانە لەئاسمانەوە بەگوێرەی یاسایەکی وردو پەیوەست بەیاسای ئاسمان و زەوییەوە دەبارێ، سروشتی زەوی و ئاسمان و رێژەی دووری و نزیکی خۆرو مانگ و زەوی لەیەکتری و پێکهاتەی قەبارەو چۆنیەتییان رۆڵی تایبەتییان هەیە لەبارینی بارانەکە. ئەمجار رسکان و روانی روەك و سەوزبوونی درەخت لەزەوی دوای بارینی بارانەکە خۆی لەخۆیدا نهێنیی و شتێکی تری سەرسوڕهێنەرە. تەنانەت توێژینەوە لەدابەشبوون و جۆری رەنگەکان لەتاقە گوڵێکدا لەچڵەگیایەدا لەدرەختێکدا دڵی کراوە کێش دەکا بۆ قوڵایی ژیان و قوڵایی بڕوا بەو خودایەی ئەم ژیانەی بەدیهێناوەو ئەو زیندوییەی خستۆتە ناو جەستەوە.

خوێنەری هێژا! سەرنج بدەو تێبفکرە دەقە قورئانییەکە ئەوە دەچەسپێنێ: کە پەروەردگار روەکی وا بەدی هێناوەو دەیڕوێنێ. جوتی، واتە: هەموو روەکێك نێرو مێی تێدایە. هەموو روەکێك خانەی نێرینەو خانەی مێیینەی تێدان، جا ئەم نێری و مێییە وادەبێ لەتاقەگوڵێکدا دەبن وا دەبێ لەدوو گوڵی لقێکدا دێنە دی، یان لەدوو چڵەگیادا یان لەدوو لقی دارێکدا یان لەدوو داری جۆرە درەختێکدا بەرجەستە دەبن، هەڵبەتە هەتا موتوربەو تەلقیح و تێکەڵاوبوونی تۆم لەنێوان نێرو مێیەکاندا نەیەتەدی بەروبوم و دانەوێڵە پەیدا نابێ، وەکوو چۆن لەناو گیانلەبەرانیشدا بەبێ تێکەڵاوبوونی نێرو مێ جوچك و بێچو وەدی نایەن.

ئەمجار لۆمەی موشریك‌و كافرەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ﴾ ئەوەی باسكراو ئاماژەی بۆ كرا بەشێكن لەمەخلووقاتی خودا، ئەوە دروستكراوی پەروەردگارن ئەو مەزندەی كردون‌و هێناونیە وجوود، دە ئێوەش ئەی كافرو بێ بڕوایان نیشانم بدەن خودا درۆزنەكانی ئێوە چییان دروست كردوە، ئەو بت‌و صەنەمانەی ئێوە دەیانپەرستن‌و دەیانكەنە هاوەڵی خودا دەتوانن چی بەدی بێنن؟!

﴿بَلْ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ بەڵكوو ئەو كافرو موشریكانەی ستەم لەخۆیان دەكەن‌و لەجیاتی خودا عیبادەت بۆ بت‌و صەنەم دەكەن لەگومڕایی دان‌و لەرێگای حەق لایان داوە، گومڕایی‌و رێ لێ گومبوونەكەیان ئاشكرایەو گەییشتونە ئەوپەڕی سەرلێ شێواوی‌و بەدبەخت‌و چارەڕەشی دونیاو قیامەت خۆیان.

## چیرۆكی لوقمانی حەكیم‌و ئامۆژگاریكردنی بۆ كوڕەكەی

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَنْ يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (١٢) وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ (١٣) وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ

بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَاۖ وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٖ مِّنْ خَرْدَلٖ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِي ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾

لەوەپێش پەروەردگار فەسادو داوەشاوی بیروباوەڕی موشریکەکانی بەیان کرد، ئەوەی ڕاگەیاند: کە موشریك ستەمکارو گومڕان، ئەمجار لەچوار چێوەی چیرۆکێکی کورتدا گومڕایی‌و ستەمکارییان جەخت دەکاتەوە، ئەوە رادەگەیەنێ؛ کە حیکمەت‌و عیلم ئەگەر بەراستی بەکار بهێندرێن ڕێبازی حەق‌و یەکتاپەرستی دەدۆزنەوە، ئەوەتا لوقمان بۆخۆی بەحیکمەت‌و عیلم یەکتاپەرستی چەسپاندو

ئەخلاقی جوان و رەوشتی بەرزی پەیڕەو کردن، بەمەش ئاماژە دەکا بۆ ئەوەی: کە پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەو شتانەدا: کە بەعەقڵ دەرگیان ناکا پێویستە لەو شتانەشدا، کە بەعەقڵ رێیان پێ دەبا پێویست ترە. دەربارەی کەسایەتی حەزرەت لوقمان ریوایەتی جۆراو جۆر هەن، رای وا هەیە دەڵێ: پێغەمبەر بووە، هەیە دەڵێ عەبدێکی صالح و رستاڵ بووە، پلەی پێغەمبەرێتی نەبوە زۆربەی زۆری زانایانی ئیسلام ئەم رایەیان پەسند کردوە، ئەمجار هەیە دەڵێ کۆیلەیەکی حەبەشی بووە، هەیە دەڵێ: (نوبی) بووەو خەڵکی (أیلة)یە: کە ئێستا پێ دەگوترێ: (العقبة) هەندێك پێیان وایە لەنەوەی ئازەرە هەزار ساڵ ژیاوەو حەزرەتی داود پێی گەییشتووە.[1]

هەرچۆنێك بێ، ئەوەتا قورئان ئەوە دەچەسپێنێ: کە لوقمان بەندەیەکی صالح و خوداپەرست بووە، خودا حیکمەت و دانایی پێ بەخشیوە. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنْ اشْكُرْ لِلَّهِ﴾ سوێند بەخودا ئێمە حیکمەت و داناییمان بەلوقمان بەخشی، تۆفیقمان دا بۆ ئەوەی کارەکانی بەگوێرەی زانیاری و حیکمەت ئەنجام بدا. سوپاسی خودا بکا لەسەر نیعمەت و بەخششەکانی، خێرخوازبێ بۆ ئادەمیزاد، هەموو ئەندامێکی جەستەی لەو شتەدا بەکاربێنێ: کە بۆی دروستکراوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوە لوقمانی حەکیم خودا هیدایەتیدا بۆ زانیاری راست و بەسود بەبێ ئەوە پێغەمبەرێك رەهنومای بووبێ.

﴿وَمَنْ يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ کەسێك سوپاسی خودا بکا لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیوە، پابەندی فەرمان و نەهیەکانی بێ، ئەرکی سەرشانی بەپێی توانا ئەنجام بدا، ئەوە سوودی سوپاسگوزاریەکەی بۆ خۆیەتی، شوکرو سوپاسگوزاریەکەی رەصیدو زەخیرەیە بۆ خۆی، سوپاسگوزار پێی بەهرەمەند دەبێ، لەعەزابی دۆزەخ رزگاری دەبێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَنْ

[1] تەفسیری قورطوبی ج٧/٣٩٥٦ (٤٤) طبعة دار الفکر.

عَمِلَ صَالِحاً فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا﴾ (فصلت:٤٦) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَالِحاً فَلأنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ (الروم:٤٤).

خودا ج ئاتاجیەکی بەسوپاسی بەندەکانی نیە، ﴿وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ کەسێك کوفرانی نیعمەتەکانی خودا بکا، هاوەڵی بۆ دابنێ، سەرپێچی فەرمانەکانی بکا ئەوە خراپە لەگەڵ خودی خۆی دەکاو بۆخۆی زەرەرمەندە، چونکە بێگومان خودا ج پێویستیەکی بەسوپاسی بەندەکانی نیە، سوپاسکردنو طاعەتیان سود بەخودا نابەخشێ، کوفرانی نیعمەتەکانی لەلایەن بەندەکانیەوە سەرپێچیکردنی فەرمانو نەهیەکانی زیان بەخودا ناگەیەنێ، خودا بەزمانی حاڵو بەزمانی مەقال لەسەر زەویو لەئاسمانەکان سوپاسکراوە، باهیچ ئادەمیزادێکیش حەمدو ثەنای نەکا.

کەوابوو ئەحمەقترین ئادەمیزاد کەسێکە بەپێچەوانەی حیکمەت هەڵسوکەوت بکا، رەصیدی لەو جۆرە بۆخۆی پەزمەندە نەکا!

ئەمجار باسی یەکتاپەرستی لەچوارچێوەی ئامۆژگاریکردنی لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی دێنێتە کایەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ ئەی پێغەمبەر! یادی ئەوە بکەوە: کە لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی کردو پێی گوت: ئەی رۆڵەی خۆشەویستم! هاوەڵ بۆ خودا دامەنێ، نەکەی پێت وابێ خودا شەریکی هەیە! بێگومان هاوەڵ دانان بۆ خودا ستەمو تاوانێکی گەورەیە، گەورەترین تاوانە چونکە پەیوەندی بەبناغەی بیرو باوەڕەوە هەیە، یەکسانی خستنە لەنێوان بەدیهێنەرو بەدیهێنراودا. بەراستی ئامۆژگاریکردنی دڵسۆزانەیە، هیچ تۆمەتێکی تێدا نیە، ئامۆژگاریکردنی باوکی میهرەبانە بۆ جگەرگۆشەی خۆی. هەموو کاتێکیش باوك خێرو چاکەی دەوێ بۆ رۆڵەی خۆی، دەی ئەوەتا یەکەم ئامۆژگاری لوقمانی میهرەبان بۆ جگەرگۆشەکەی خۆپاراستنە لەهاوەڵدانان. دەی پێغەمبەریش هەمان حەقیقەتی دوبارە کردۆتەوە،

هەر ئەو ئامۆژگاریەی ئاراستەی نەتەوەکەی کرد، کەچی ئەوان گومانیان لێ پەیدا کردو ترسی ئەوەیان لێ پەیدا بوو: کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ دەسەلات پەیدا کردن بێ‌و خۆسەپاندن بێ بەسەریان! لەکاتێکدا دەبوایە گومانیان لێ پەیدا نەکردایە، چونکە ئەوەتا لوقمانی حەکیم هەمان ئامۆژگاری ئاراستەی جگەرگۆشەی خۆی دەکا. دەی خۆ ئاشکرایە ئامۆژگاری باوك بۆ کوڕی خۆی هیچ گومانێکی خراپی تێدا نیەو هیچ تۆمەتێکی ناخرێتە سەر. کەوابوو ئەو ئامۆژگاریەی پێغەمبەر ئاراستەی ئوممەتەکەی دەکا هەمان ئەو حەقیقەتە مێژوویی‌و دێر زەمانەیە: کە لەسەر زوبانی ئەوانەی خاوەن زانیاری حیکمەت بوون ئاراستەی کەسانی دیکە کراوە، فەرمان بەیەکتاپەرستی حەقیقەتێکە لەکۆندا لەسەر زوبانی پێغەمبەران‌و خاوەن حیکمەت‌و زانایان ئاراستەی گەل‌و نەتەوەکان کراوەو لەهەموو چەرخ‌و سەردەمێکدا لەسەر زوبانی پێغەمبەران دووبارە کراوەتەوە. پێغەمبەری ئیسلامیش هەمان حەقیقەتی جەخت کردۆتەوە.

ئەمجار لەژێر رۆشنایی ئامۆژگاری باوك‌و رۆڵەی خۆی، پەیوەندی نێوان باوك‌و دایك‌و رۆڵەکانیان رادەنوێنێ‌و بەشێوازێکی ناسك‌و سەرنج راکێش نمایشی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ﴾ فەرمانمان بەئادەمیزاد کردوە لەسەرمان پێویست کردوە: کە گوێڕایەڵی فەرمانی باوك‌و دایکی بێ، چاکەیان لەگەڵ بکاو مافی باوکایەتی‌و دایکایەتییان بداتێ ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەریان جێبەجێ بکا. بەتایبەتی چاکە لەگەڵ دایکیدا بکا: کە بەزەحمەت‌و ناڕەحەتی بەپێستی سك نۆ مانگ‌و نۆ رۆژو زیاتر هەڵی گرتووە، ئەمجار بەو هەموو ئێش‌و ئازارە بەوەلەدی هێناوە، پاشان شیر پێدان‌و لەشیربڕینەوەی لەماوەی دوو ساڵداو بەخێوکردنی بەشەوو بەرۆژو شەونخونی بەسەریەوە تا پێی گەیاندوەو دەست‌و دووی خۆی پێ ناسیوە. بەراستی ئەو فیداکاریەی دایك بۆ رۆڵەی خۆی دەیکا هەر بەدایك دەکرێ‌و هەر لەخۆی دێ، ئەو هەموو ئەرك‌و ماندوبوونەی پێوە دەکێشێ‌و سات لەدوای ساتیش پتر ئامادەباشی

تێدایـە بـۆ ئـەو فیـداکاریو شـەونخونییە. بـەدڵی پـڕ سـۆزی بەدەسـتی نـەرمی بەباوەشی گەرمی بەوزەو توانای لەبن نـەهاتووی هەمیـشە خـەریکی بـەخێوکردنو پێگەیاندنیـەتی، سات دوای ساتیش هەست بەبەختـەوەری خـۆی دەکـاو وا دەزانـێ دەستکەوتی دەست کەوتووە بۆیە لەزۆر لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ بەتایبەتی جەخت لەسەر چاکە کردن لەگەڵ دایکدا کراوەتەوە، لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا هـاتووە سـێ جـار فـەرمانی کـرد بەچـاکە کـردن لەگـەڵ دایـکدا، پاشـان لـەجاری چوارەمدا فەرمانی بەچاکە کردن لەگەڵ باوکدا کرد.

زانـای گـەورەو بـەناوبانگ (الحـافظ أبـو بكـر البـزار) لەموسـنەدی خۆیـداو بەئیسنادی خۆی ریوایەتی کردوە لەبورەیدەوە لەباوکییەوە، دەڵێ پیاوێك لەتەوافی کەعبەدا دایکی لەکۆڵ کردبوو طەوافی بەیتی پێ دەکرد، پرسیاری لەپێغەمبـەر ﷺ کـرد: وتـی: ئـەی رەوانـەکراوی خـودا مـافی دایکـم داوەتـەوەو ئـەرکی سەرشـانم بەرامبەری بەجێ هێناوە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا ولا بزفرة واحدة).

بوخـاریو هـی تـریش ریوایـەتیان کـردوە دەفـەرموون: پیاوێـك پرسـیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد وتـی: (من أبرّ: قال أمك، قال ثم من؟ قال أمك قال ثم مـن؟ قـال أمك،قال ثم من؟ قال أبوك).

ئـەمجار عیلـەتو بایـسی فەرمانەکـە دیـاری دەکـاو دەفـەرموێ: فـەرمانمان بەئادەمیزاد کردوەو عەهدو پەیمانمان ئاراستە کردوە بەوە ﴿أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ کە سوپاسی نیعمەتـەکانی مـن بکـە، کـە وجـودم پـێ بەخـشیوەو ئـەو هەموو نیعمەتە جۆراو جۆرانەم پێ بەخشیوی هەروەها سوپاسی باوكو دایکت بکە چونکە هۆکاری رواڵەتین بۆ پەیـدا بوونـت، لـەدوای پـەروەردگار ئـەوان سەرچـاوەی چاکەکردنن لەگـەڵ تـۆ! سـەرەنجام بـۆ لای ئێمـە دەگەڕێیـەوە، لەسەر کردەوەکانـت سزاو پاداشت دەدەمەوە، ئەمە هەڕەشەیە لەوانەی لەگـەڵ بـاوكو دایکیـاندا خراپـە

دەكەن‌و ڕێزیان لێ ناگرن، هەروا موژدەیە بۆ ئەوانەی پابەندی فەرمانی خودان‌و ڕێزی باوك‌و دایكیان دەگرن.

قورطوبی دەفەرموێ: رای پەسند ئەوەیە: كە ئەم ئایەتەی ئێرەو ئایەتی سورەتی (العنكبوت:٨) ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا﴾ دەربارەی سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص‌و دایكی: كە ناوی (حمنة) بوو، كە سەعد موسوڵمان بوو سوێندی خوارد نان نەخوا تا سەعد پەشیمان دەبێتەوە. وتی: سوێند بێ نان‌و ئاو نەخۆم هەتا لەئایینی تازە پەشیمان دەبێتەوە یان لەبرسان‌و تینوان دەمرم‌و ئەو كاتە خەڵك لۆمەت دەكەن‌و پێت دەڵێن: بكوژی دایكی خۆی. شەوو ڕۆژێك دەمی لەهیچ نەدا، سەعد هاتە لای‌و وتی: دایە! ئەگەر سەد گیانت تێدابێ هەموویان یەك بەدوای یەكدا دەربچن من لەئایینی خۆم ژێوان نابمەوە! جا كەیفی خۆتە دەخۆی ناخۆی بەویستی خۆت بكە! جا كە (حمنة) نائومێد بوو ئیتر دەستی كرد بەخواردن‌و خواردنەوە.[1]

بەڵام ئاگاداری ئەوەبە: لەهەموو شتێكدا گوێڕایەڵی باوك‌و دایك مەبە بۆ نموونە ﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا﴾ ئەگەر بەئیلحاحەوە داوایان لێ كردی: كە هاوبەش بۆ من دابنێی‌و شتێك: كە شیاوی خودایەتی نیە تۆ بەخودای بزانی، زۆر داوایان لێ كردی‌و لێیان تابیلا كردییەوە: كە بەنەفامی شوێن بیرو باوەڕی ئەوان بكەوی، بەگوێیان مەكە، لێیان قبوڵ مەكەو ئەو فەرمانەیان ڕەت بكەرەوە، چونكە گوێڕایەڵی بۆ مەخلووق نیە لەشتێكدا كە سەرپێچی فەرمانی خودای تێدابێ. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییان لەگەڵ مەپچڕێنە، دەنگیان لێ دامەبڕە بەڵكوو ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾ بەچاكە لەژیانی دونیادا هەڵس‌و كەوتیان لەگەڵ بكە، ئەگەر پێویستیان بوو بەماڵ‌و سامان كۆمەكییان پێ بكە، پۆشاك‌و بژێویان بۆ دابین بكە، لەكاتی نەخۆشیدا هەوڵ بدە

[1] تەفسیری قورطوبی (ج٧/٢٨٧٩) (٢٤٧) هەروەها في ظلال القرآن (ج٦/٣٩٢).

چارەسەریان بۆ بدۆزەوە، ئازارەکەیان لەسەر سوك بکە، گفتو لفتت لەگەڵیان خۆش بێ، کارێك مەکە دڵیان برەنجێ.. کە مردن کفنو دفنیان بکەو بیانخەرە گۆڕەوە، دوا مردنیش چاکە لەگەڵ دۆستو خۆشەیستانیان بکە.

﴿وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ﴾ ئاگات لەخۆت بێ لەبواری ئایندا مەبدەئیبە، رێبازی موسوڵمانانی راستاڵ بگرەبەرو پەیڕەوی شەریعەت بکە، شوێن کوفرو بێدینی ئەوان نەکەوی! واتە: هەرچەندە تۆ فەرمانت پێ کراوە: کە چاکەیان لەگەڵ بکەیو دڵیان نەرەنجێنی، وەلێ لایەنی خودا لەبەر خاتری رەزامەندی ئەوان بەرمەدە، وا مەکە بۆ رازیکردنی ئەوان خودا لەخۆت برەنجێنی.

﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ پاشان لەقیامەتدا ئەتۆشو ئەوان بۆ لای من دەگەڕێنەوە، پاداشی ئیمانو باوەڕی تۆو سزای کوفرو هاوەڵدانانی ئەوانیش دەدەمینەوە، هەواڵتان دەدەمێ بەوەی کردوتانە لەخێرو لەشەڕو پاداشو سزای لەسەر وەردەگرنەوە.

ئەمجار پەروەردگار باقی ماندەی راسپاردەکانی حەزرەتی لوقمان رادەگەیەنێ، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد پەیڕەوی بکەنو بیکەنە مەنهەجو پرۆگرامی خۆیان. دەفەرموێ:

١- ﴿يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ﴾ ئەی کوڕی خۆشەویستم باش بزانەو لەگوێی بگرە چاکەو خراپە ئەگەر بەئەندازەی کێشی گەردیلەیەك یان دەنکە خەردەلێك بێو لەنهێنی تر شوێندا بێ، دەنکە خەردەلێکی بچوك بێ قەبارەو کێش لەناو بەردێکی رەقدا بێو لەهیچ لایەکەوە دەرنەکەوێ دەستی نەگاتێ، یان لەناو ئاسمانەکاندا بێ، ئەو کەونەهائیلەی کە قەبارەی گەورەو زەبەلاح تێیدا وەکوو خاڵێکی مەلەوان یان گەردیلەیەکی بەرەڵلا وەهان، دەنکە خەردەلێك لەناو ئەو ئاسمانانەدا بێ، یان لەناو گڵو خۆڵی زەویدا لەناو دەریاو دەریالوشەکاندا بێ خودا رۆژی قیامەت ئامادەی

دەكاو دەیخاتە تەرازوی حیسابو لێكۆڵینەوەو سزاو پاداشی لەسەرەو لەژێر تیشكی زانیاری خودا دەرناچێو دەیدۆزێتەوە، لەچنگ دەسەڵاتو قودرەتی خودا قوتاری نابێو دەهێندرێ.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان پەروەردگار لەطیفە، زانیارییەكەی بەجۆرێكە هیچ شتێك ناتوانێ رێگەی ئیدراكی زانینی لێ بگرێ، چەندێك ئەو شتە پچوكو كەم نمود بێ شاراوەو نهێنی بێ لەژێر تیشكی زانیاری خودادا ئاشكراو نمایانە، ئاگادارە بەچۆنیەتی شتەكانو خەبیرە بەهەموو شتێك، مەبەست ئەوەیە زانیاری خودا بەفراوانو رەهایە، نهێنیو ئاشكرا، پچوكو گەورە لای ئەو چون یەكن. نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە: كە دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً﴾ (الأنبياء:٤٧) یان دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ (الزلزلة:٧-٨).

٢- ﴿يَا بُنَيَّ أَقِمْ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنْ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ دوای ئەوەی حەزرەتی لوقمان لەوەسیەتنامەكەدا جڵەوگیریی كرد لەكوڕەكەی لەهاوەڵدانان بۆ خوداو ترساندنی بەوە: كە خودا زانایە بەهەموو شتێكو ئاگای لەهەموو شتێك هەیەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا دەشكێ، فەرمانی پێ دەكا بەكردەوەی چاكو طاعەتو خوداپەرستی: كە پەیوەستن بەیەكتاپەرستییەوە، دەفەرموێ: (ئەی كوڕی خۆشەویستم! روبكەرە خودا بەدڵسۆزیو بەرێكو پێكی نوێژەكانت ئەنجام بدە مەرجو روكنەكانیان بهێنەدی، چونكە نوێژ كۆڵەكەی ئایینە بەڵگەی ئیمانی تەواوو باوەڕی پتەوە، هۆكارە بۆ نزیكبوونەوە لەخوداو دەستەبەركردنی رەزامەندیی، هەر كاتێ نوێژ بەرێكو پێكی ئەنجام درا دەبێتە لەمپەڕ لەبەردەم كاری فەحشاو دزێوداو ناهێڵێ ئادەمیزاد توخنیان بكەوێ.

فەرمان بەچاكە بكەو خۆشت پابەندبە پێیەوە، بانگەوازی بكە بۆ ئەخلاقی جوان‌و رەوشتی بەرزو كرداری باش‌و شارەستانیەت‌و پێشكەوتن خوێندەواری‌و ئازادی‌و عەدالەت. جڵەوگیری بكە لەتاوان‌و سەرپێچی كردن‌و هەموو كارێك: كە ببێتە هۆی قارو غەزەبی خوداو ئادەمیزاد بەرەو دۆزەخ كێش بكا.

بەصەبرو ئارامبە لەسەر طاعەتكردن‌و بەڵاو موصیبەت چونكە شتێكی حەتمی‌یە كەسێك فەرمان بەچاكەو جڵەوگیری لەخراپە بكا تووشی ئەزیەت‌و ناڕەحەتی دەبێ، دەنگی لێ دادەبڕن، دژی دەوەستن، راوەدۆی دەنێن، دەیگرن ئازارو ئەشكەنجەی دەدەن، بۆیە داوای لێ دەكا: كە صەبرو ئارام بگرێ‌و پشو درێژ بێ، چونكە صەبر بناغەی بەردەوامبوونە لەسەر طاعەت‌و خوداپەرستی، هۆی دەستەبەر بوونی رەزامەندی خودایە وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ﴾ (البقرة:٤٥) پەیرەوی ئەم ئامۆژگاریانە بكەو هەوڵ بدە لەژیانی عەمەلی خۆتدا ئەم فاكتەرانە دەستەبەر بكە.

﴿إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾ بێگومان ئەوەی باسكرا، ئەوەی وەسێتم بۆ كردی لەفەرمان‌و جڵەوگیریەكانی پەروەردگار: كە بەشێكیان خۆڕاگری‌و پشوو درێژییە لەسەر توشبوونی ئەزیەت‌و ناڕەحەتی لەكەسانی دیكەوە. لەو هەڵوێست‌و كارە پێویستانەن: كە خودا بڕیونیەوە، بەواجبی گێڕاون، سودبەخشن بۆ ژیانی دونیاو قیامەت.

ئەمجار دوای ئەوەی فەرمانی پێ كرد بەئەنجامدان‌و پابەندبوون بەچەند شتێكەوە جڵەوگیری لێ دەكا لەچەند رەوشتێكی ناپەسەندو دەفەرموێ:

١- ﴿وَلا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ لەكاتی ئاخاوتن‌و قسەكردندا رو لەخەڵكی وەرمەگێڕە، بەتەكەبوورو خۆبەزلزانی رو لەقسە لەگەڵ كراوو قسەكەر وەرمەگێڕە، واتە: وا مەكە بەندەكانی خودا بەبێ نرخ بزانی‌و خۆت پێ گەورەبێ، لەگەڵ خەڵكدا روگرژو مۆن مەبە بەڵكوو سادەو خاوەن تەواضوع بە، رو خۆش‌و كراوەبە،

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکیدا: کە ئیمامی موسلیم لە(أبو ذر الغفاري)یەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (لاتحقرن من المعروف شيئا، ولو أن تلقي أخاك بوجهك إلمبسوط، وإياك واسبال الازار، فإنها من المخيلة، والمخيلة لايحبها الله) هیچ چاکەیەك بەبێ نرخ مەزانە، تەنانەت ئەگەر بەرویەکی کراوەوە رو لەبرای موسوڵمانت بکەی، خۆبپارێزە لەوەی لەروی تەکەببورەوە پۆشاکت لەزەوی بخشێ، چونکە ئەوە جۆرێکە لەتەکەببورو خۆبەزلزانی، تەکەببوریش لای خودا دزێوە.

٢- ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ بەسەر زەویدا بەخۆبادانو فیزەوە مەڕۆ، بەشێوەی تەکەببورو بەخۆنازین هاتوچۆ مەکە، چونکە ئەو جۆرە رۆیشتنو هاتوچۆیە دزێوەو پەسند نیە، بێگومان خودا هەموو لارو لەنجەکەرێکی ناخۆش دەوێ، هەرکەسێك بەخۆی بنازێو شانازی بکا بەسەر کەسانی دیکەدا خودا خۆشی ناوێو قارو غەزەبی لێ دەگرێ. چونکە ئادەمیزاد بۆخۆی هیچ نیەو هیچی لەباردانیە ئەگەر نافەرمانی خودا بکا، دەبێ ئادەمیزاد خۆی چی بێ؟ تا شانازی بەسەر کەسانی دیکەدا بکا، خۆ چەندێك بەهێزو توانابێ ناتوانێ زەوی شەق بکا، چەندێك بەرزو بڵند بێ ناگاتە ئاستی کێوێك لەکێوەکان وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولًا﴾ (الإسراء:٣٧).

ئیمامی ئەحمەدو خاوەنانی شەش کتێبەکان لەئیبنو عومەرەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر فەرمویەتی: ﴿من جرّ ذيلة خيلاء، لاينظر الله اليه يوم القيامة﴾ کەسێك لەبەر تەکەببورو خۆبەزلزانی پۆشاکەکەی بەسەر زەویدا راکێشێ، خودا رۆژی قیامەت بەچاوی رەحمەت سەیری ناکا.

ئیبنو ئەبی دونیا لەئەنەسەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (طوبى للأتقياء الذين إذا حضروا لم يعرفوا، وإذا غابوا لم يفتقدوا، أولئك مصابيح مجردون من كل فتنة غبراء مشتتة) خۆشی بۆ تەقواکارانی دەوڵەمەند ئەوانەی

بەخۆیان نانازن و تەکەببور ناکەن، ئەگەر لەشوێنێك ئامادەبوون ناناسرێن، ئەگەر دیارنەبوون بۆیان ناگەڕێن. ئەوانە چرای ڕۆشنایین و زیانیان بۆخۆیان و کۆمەڵ نیە..

یەحیای کوڕی جابیری (الطائي) لەغوضەیفی کوڕی (الحارث) ڕیوایەت دەکا دەڵێ: لەلای عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی (العاص) دانیشتم گوێم لێ بوو دەیگوت: ئەو کاتەی مردو دەخرێتە گۆڕەوە، گۆڕەکەی پێی دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد! چی وای لەتۆ کرد منت لەبیر بچێ! نەتدەزانی من خانووی تەنهاییتم، نەتدەزانی من خانووی تاریکتم، نەتدەزانی من خانووی حەقی تۆم! ئەی ئادەمیزاد چی وای لەتۆ کرد بەفیزەوە بەسەر مندا خۆت بادەی و خۆت ڕاوەشێنی!!

٣- ﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ﴾ بەرۆیشتنێکی مام ناوندی بەرێگادا برۆ، وا مەڕۆ: کە بەعاستەم بجولێیەوە، وایش مەڕۆ کە مەیلەو ڕاکردن بێ.

حەزرەتی عومەر پیاوێکی بینی بەشێنەیی دەجولایەوە ڕۆیشتنەکەی تەمبەڵانە بوو، پێی فەرموو ئاینەکەمان لێ مەمرێنە خودا بتکوژێ، جارێکی تر کابرایەکی بینی سەری خۆی داخستبوو خۆی کوشمەڵە کردبوو، حەزرەتی عومەر تێیڕا خوڕی و پێی فەرموو: سەرت بەرز بکەرەوە ئێمە موسوڵمانین و ئیسلام نەخۆش نیە.

٤- ﴿وَاغْضُضْ مِنْ صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾ لەشوێنێکدا کە پێویست بەدەنگ بەرز کردنەوەنیە دەنگ بەرز مەکەرەوە، لەئاخاوتن و گفت و گۆدا دەنگ نەوی بکە، چونکە دەنگ بەرزکردنەوەو نەڕە نەڕکردن ئامێری بیستنی خەڵك ئەزیەت دەدا، نیشانەی لەخۆبایی بون و خۆنازین و بەسوکزانین و گرنگی نەدانە بەکەسانی دیکە، لەلایەکی ترەوە ئاخاوتن بەشێوەیەکی هێدیانەو مامناوەندی ڕێز دەدا بەقسەکەرو باشتر لەدڵی بیسەردا جێگیر دەبێ، قورئان عیلەت و باییسی بۆ فەرمانەکە دەهێنێتەوە دەفەرموێ: دەنگ بەرز کردنەوەو نەڕەنەڕ دەشوبهێتە زەڕی گوێدرێژو ناخۆشترین دەنگیش زەڕەی گوێدرێژە.

لەفەرمودەی پێغەمبەریشدا هاتووە کە زەڕەی گوێدرێژ ناخۆشەو زەوق لـێ ی نەبانە. نەسائی لەکاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: قوتەیبەی کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە، ئەویش دەڵێ: (اللیث) لەجەعفەری کوڕی ڕەبیعەوە لە(الأعرج)ەوە لەئەبو هورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: (إذا سمعتم صياح الديكة فاسألوا الله من فضله، وإذا سمعتم نهيق الحمير فتعوذوا بالله من الشيطان فإنها رأت شيطاناً) هەر کاتێ گوێتان لەدەنگی کەڵەشێر بوو داوای ڕەحمەت و بەخششی خودا بکەن، ئەگەر گوێتان لەزەڕینی گوێدرێژ بوو پەنابگرن بەخودا لەخراپەی شەیتان چونکە ئەوە چاوی بەشەیتان کەوتووە.[1]

## سەرزەنشت و لۆمەکردنی موشریکەکان لەسەر هاوەڵدانیان بۆ خودا، هەرچەندە بەڵگەی تەنهایی خودا نمایانە

﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار بەڵگەی تاك و تەنهایی خۆی هێنایەوە بەوە: کە ئاسمانەکانی دروستکردون بەبێ کۆڵەکەو ئەمجار ئەوەی ڕاگەیاند: کە لوقمانی

[1] تەفسیری ئیبنو کەثیر (ج٣/١٤٤٨).

حەکیم بەعەقڵ پەی بەو راستییە بردووەو ئەو حەقیقەتەی زانیوە. ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ لۆمەکردنی موشریکەکان لەسەر ئەوە: کە سورن لەسەر کوفرو بێدینیو هاوەڵدانان بۆ خودا، لەکاتێکدا هەموو شتێکی بونەوەر گەواهی ئەوە دەدەن: کە خودا تاكو تەنهایەو زەویو ئاسمانی بۆ سودی ئادەمیزاد موسەخەر کردوە.

﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ ئایا ئێوەی ئادەمیزاد نازانن ئەو هەموو بەڵگانە نابینن: کە نیشانەی تاكو تەنهایی خودان؟ هەست بەو هەموو نیعمەتە جۆراو جۆرانە ناکەن: کە خودا بەسەر ئێوەدا رشتووەو هەموویان بەزوبانی حاڵ گەواهی لەسەر تاكو تەنهایی خودا دەدەن؟

ئەوە نابینن: کە خودا هەرچی لەئاسمانەکاندا هەیە لەمانگو خۆرو ئەستێرە بۆ ئێوەی موسەخەر کردوە؟ وای رام کردون سودیان لێ وەردەگرن، ئەوەتا بەئاسانی کەڵك لەتیشکی خۆرو روناکایی مانگ وەردەگرن ئەستێرە دەکەنە نیشانەی رێگاو ساتەکانی شەو، گۆڕانی وەرزەکان. سود لەبارانی بارێندراو لەئاسمانەوە وەردەگرن، کەڵك لەهەواو باڵەفڕەی ناو هەوا وەردەگرن. هەروەها هەرچی لەزەویدا هەیە بۆ ئێوەی موسەخەر کردوە تێیدا ئارام دەگرنو ژیان بەسەر دەبەن، میوەو بەرو بوومی درەختو رووەکی دەخۆن، سود لەئاژەڵو گیانلەبەرانی تری دەبینن، گەنجو جەواهیراتی ناوزگی زەویو ناو دەریاکان دەردەهێننو کەڵکیان لێ وەردەگرن.

﴿وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ نیعمەتی ئاشکراو نهێنی خۆی بەسەردا رشتوون، گەڵێ سودو نیعمەتی تر: کە ئێوە پێیان نازاننو هەستیان پێ ناکەن خودا بۆ ئێوەی فەراهەم هێناوەو بەیدەستی کردوە بۆتان.

نیعمەتی: ئاشکرا: بریتییە لەئیسلام. نیعمەتی نهێنی داپۆشینی تاوانەکە خودا پەردەیان بەسەردا دەداوو چاوپۆشییان لێ دەکا. ئیبنو عەبباس دەربارەی ئەم ئایەتە پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا فەرموی: (الظاهرة: الأسلام وماحسن من خلقك، والباطنة: ماستر عليك من سيء عملك).

هەندێك پێیان وایە نیعمەتی ظاهیر ئەوەیە بەچاو دەبیندرێ لەماڵو منداڵو رێزو شۆخو شەنگیو تەوفیق دان بۆ خوداپەرستی. نیعمەتی نهێنی ئەو زانیاریو زانستەیە: کە ئادەمیزاد لەناخی خۆیدا هەستی پێ دەکا لەبیرو باوەڕو ئیمان بەخودا یەقینی تەواو. یان عەقڵو زیرەکیو غیرەتو هەموو ئەو رەوشتانەی: کە دەبنە هۆی بەختەوەری ئادەمیزاد. کەچی وێڕای ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو فەضلو بەخششی زۆریو نیعمەتی هەمە جۆری بەسەر ئادەمیزاددا هەموویان ئیمانی پێ ناهێنن و پەرستشی بۆ ناکەن. بەڵکوو ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلا هُدًى وَلا كِتَابٍ مُنِيرٍ﴾ پێرێك ئادەمیزاد هەن موجادەلەو دەمەدەمێیانە دەربارەی تاكو تەنهایی خوداو صیفاتەکانی، وتی وتییانە دەربارەی ناردنی پێغەمبەران، هەردەمە بیانوێك دەدۆزنەوە، هەر رۆژە پەڵپێك دەگرن، هیچ بەڵگەو زانیارییەکی وایان پێ نیە جێگەی بڕوا بێ، وەثیقەو دێکۆمێنتیان بەدەستەوە نیە، نامەیەکی ئاسمانیو صەحیحیان نیە پشتی پێ ببەستن و حەقیقەتیان بۆ رون بکاتەوە. بەکورتی زنیاری واضیحو بڕواپێکراو. بەڵکوو تاقە بەڵگەیان لاسایی کردنەوەی کوێرانەیەو شوێنکەوتنی رێبازی شەیتانە، سروشتیان تێکچووەو ئامۆژگاری کاریان تێ ناکا، ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ ئەگەر بەو کێشەکارو موجادەلەچییانەی دەربارەی زاتو صیفاتی خودا دەمەدەمییانە بگوترێ: شوێن ئەو شەریعەتو سروشە بکەون: کە خودا ناردویەتی بۆ سەر پێغەمبەری خۆی پشت هەڵدەکەن و بەپیر بانگەوازییەکەوە نایەن، هیچ بەڵگەشیان بەدەستەوە نیە جگە لەلاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی باوكو باپیرانیان، بەئاشکرا دەڵێن: ئێمە بڕوا بەو پەیامو سروشە ناکەین بەڵکوو ئێمە شوێن ئەو دابو نەریتە دەکەوین کە لەباوكو باپیرانمانەوە بۆمان جێ ماوە!! ئەم بەڵگە خوارو بێ جێیەیان بەدەستەوەیە: کە نیشانەی نەفامیو کەودەنییانە، ئیسلام دەیەوێ لەو لاسایی کردنەوەیە رزگاریان

بکا، عەقڵو هۆشیان مشتو ماڵو بکاو لەکۆتو زنجیری لاسایی کردنەوە رزگاریان بکا، وریاییو جمو جوڵو روناکی بخاتە ناو هەستو شعوریانەوە، بەڵام ئەوان سورن لەسەر مانەوەی خۆیان لەناو زنجیری نەفامیدا.

ئیسلام ئازادییە لەدەروونەدا، جمو جووڵە لەشعوردا، چاوەڕوانیو بەتەمابوونی نورو روناکییە، پاسایەکی تازەو تۆکمەیە بۆ ژیان، بۆ ژیانی ئازاد لەزنجیری لاسایی کردنەوە کەچی وێڕای ئەوە کۆمەڵێك ئادەمیزاد هەن هیدایەتی ئەو ئایینە پیرۆزە لەخۆیان دوور دەخەنەوە، بەنەزانیو بێ هیدایەتو بێ پشتگیری نامەی ئاسمانی موجادەلە دەکەن، بۆیە گاڵتەیان پێ دەکاو لەپەناوە ئاماژە دەکا بۆ سەرەنجامی هەڵوێستو کردەوەیانو دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ ؟﴾ ئایا ئەو نەفامانە بەبێ هەبوونی بەڵگەو نیشانەی بەهێز شوێن باوكو باپیرانیان دەکەون؟ تەنانەت ئەگەر بیرو باوەڕەکەیان لەسەر رەهنومایی شەیتانو بیروباوەڕی هەوەسبازانەیان بنچی داکوتابێو کێشیان بکا بۆ گیرۆدەبونیان بەعەزابی دۆزەخ؟! لەکاتێکدا خودا بانگەوازییان دەکا بۆ رێبازی رزگاریی ئەو هەڵوێستەیان بەپیرەوەچوونی بانگەوازی شەیتانە بۆ ئەوەی لەئاکامدا بچنە ناو سزای دۆزەخەوە، دەی جاکە حاڵو واقیع ئەوەیە، ئەوان هەر سورن لەسەر هەڵوێستو باوەڕی نادروستی خۆیان؟!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ ؟﴾ (البقرة: ١٧٠).

## پەسنیو پیرۆزی رێبازی خودا پەرستانو نەگبەتی رێگای کافرەکان

﴿ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن

كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ ﴾

لەوەپێش هەڵوێستو حاڵی کافرەکانی بەیان کرد، سەرەنجامو پاداشی سەررەقی گومڕاو لاسایی کەرەوانی رون کردەوە ئەمجار دڵدانەوەی پێغەمبەرو هەڕەشەی توند لەکافرەکان دەکاو ئاماژە بەهەڵوێستو رێبازی پەسند دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى﴾ کەسێ خۆ بەخودای خاوەن دەسەڵاتو زاناو دانا بسپێرێ، بەدڵسۆزی پەرستشی بۆ بکا، بەتەواوی ملکەچی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بێ، بەبێ چەندو چون پەیڕەوی شەریعەتەکەی بکا، وەلحال بەرێكو پێکی کارەکانی ئەنجام بداو بەوردی پابەندی مەنهەجی پەروەردگار بێ، ئەوە بێگومان دەستی بەپتەوترین حەبلو ئامێرێك گرتووە: کە دەیگەیەنێ بەرەزامەندی خوداو بەختەوەری دونیاو قیامەت، پاداشی کردەوەی باشی خۆی وەردەگرێتەوە، ﴿وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ هەر بۆ لای خودایە سەرەنجامی کارو کردەوەکان، لەرۆژی قیامەتدا پاداشی باشو پەسند دەبەخشێ بەوانەی لەدونیادا پشتیان بەخودا بەستووەو پابەندی شەریعەتەکەی بوون، هەروەکوو سزای خراپەکاران بەئاگری دۆزەخ دەداتەوە. ئەمجار ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دەکا بەوەی: کە گرنگی نەدا بەکوفری کافرەکان، دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ كَفَرَ فَلَا يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەگەر کەسێك کافربێو گوێ بۆ قورئان رانەگرێو پەیامەکەت رەت بکاتەوە، ئەتۆ خەفەتی پێ مەخۆ بۆیان بەپەرۆش مەبە، تۆ راگەیاندنی خۆت لەسەرەو بەس، سەرەنجام گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیەو سزای عادڵانەیان دەدەینەوە، هیچی ئەوان لەئێمە نهێنی نیە، ئاشکراو

نهێنییان لای خودا وەکوو یەك ئاشکرایە ﴿فَنُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ بێگومان خودا زاناو ئاگادارە بەسەر ئەو نهێنیو پەنامەکییانەی ناو دڵیان.

وشەی (من) بۆ تاك و کۆ بۆ نێرو مێ بەکار دەهێندرێ، بۆیە لەوشەی (کفره)دا راناوەکەی تاکە، لەوشەی (مرجعهم)دا کۆیە..

شەئنو حاڵی ئەوان زۆر لەوە کەمترە تۆ خەفەتیان بۆ بخۆی، بابەویستی خۆیان شوێن هەواو هەوەسی خۆیان بکەون، ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً﴾ لێیان دەگەڕێین با کەمێك لەناو نازو نیعمەتی دونیادا راببوێرنو لەززەتی ژیانیان بچێژن، ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ پاشان کێشیان دەکەین بۆ ناو عەزابی دۆزەخ، بۆ ناو سزای توندو سامناك، چەندێك لەدونیادا تەمەنیان درێژبێ بەنیسبەت ژیانی قیامەتەوە کورت و کەمخایەنە.

## تاك و تەنهایی خوداو بەرفراوانی زانیاریو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ

مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾

﴿٢٧﴾

دەربارەی نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٢٧) ئیبنو جەریر لەعیکریمەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: ئەهلی کیتاب دەربارەی (گیان) پرسیاریان لەپێغەمبەر ﷺ کرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (الأسراء:٨٥) نازڵ کرد، ئەمجار جولەکەکان وتیان: ئەی موحەممەد!

ئەتۆ پێت وایە ئێمە کەمێك نەبێ زانیاریمان نەدراوەتێ! وەلحال ئێمە تەوراتمان بۆ نێردراوە تەوراتیش بریتییە لەحیکمەت، کەسێکیش حیکمەتی درابێتێ ئەوە خێرو فەری زۆری دراوەتێ ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ (البقرة:٢٦٩) ئیتر بۆ وەلامی ئەوان ئایەتی ژمارە (٢٧) ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ... الآية﴾ نازڵ بوو!!

ئیبنو ئیسحاق و ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەطای کوڕی یەسارەوە ریوایەت دەکەن دەڵێن: ئایەتی ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ لەمەککە نازڵ بووە، جا کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینە مالەکانی جولەکە چوونە خزمەتی و وتیان: لەتۆوە پێمان گەیشتووە: کە دەڵێی: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ مەبەستت ئێمەیە یان نەتەوەکەی خۆت مەبەستە!؟ پێغەمبەر ﷺ هەموویانم مەبەستە، وتیان: ئەوەتا تۆ دەڵێی ئێمە تەوراتمان دراوەتێ و تەوراتیش هەموو شتێکی تێدا رون کراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مەعلوماتی ئێوەو مەعلوماتی ناو تەوراتیش بەنیسبەت زانیاری خوداوە زۆر کەمە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ...﴾ی نازڵ کرد.

ئەبو شەیخ؛ ئیبنو حەییانی ئەلئەنصاری و ئیبنو جەریر لەقەتادەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: موشریکەکان وتیان قورئان لەوانەیە کۆتایی پێ بێ و ببڕێتەوە ئیتر ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ... الآية﴾ نازڵ بوو. پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە، لەم روەوەیە، کەلەوەپێش بەڵگەی لەسەر تاك و تەنهایی خودا هێنایەوە بەدروستکردن و راگرتنی ئاسمان بەبێ کۆڵەکە، بەبەخشینی رزق و رۆزی و نیعمەتی ئاشکراو نهێنی، هەروەها موشریکەکانیش دان بەهەبوونی خودادا دەنێن ئەوەتا: کە دەکەونە ناو ناخۆشییەوە، پەنا بەخودا دەبەن هاواری لێ دەکەن، کەچی کە دەکەونە خۆشییەوە پاشگەز دەبنەوەو خودایان لەبیر دەچێتەوە، ئەمجار لێرەدا تاك و تەنهایی خودا دوپات دەکاتەوە، بەوە

كە خاوەنی ئاسمانەكانو زەوییە، لەنەبوەوە بەدی هێناون، ئەمجار بەڵگە لەسەر رەهایی عیلمو دەسەڵاتی خودا دێنێتەوە: كە هەندێ لەدیاردەو ئاثاری قودرەتی رەهای دروستكردنی ئادەمیزادو زیندوكردنەوەیانە، گۆڕانی شەوو رۆژو بەشوێن یەكداهاتنو چونیانە، رامكردنی مانگو خۆرو ئەستێرەكانە: كە بەو شێوە رێكو پێكییە لەبۆشاییدا هەڵدەسوڕێنو كاری خۆیان ئەنجام دەدەن.

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ سوێند بەخودا ئەی موحەممەد! ئەگەر ئەتۆ پرسیار لەو موشریكانە بكەیو بڵێی كێ ئاسمانەكانو زەوی لەنەبوەوە بەدیهێناون؟ بێ سێو دۆ یەكسەر دەڵێن: خودا بەدیهێنەریانە، ئەمە شتێكی سروشتییەو هەر كاتێ ئادەمیزاد داوای فتوای لەسەر شتی وای بكرێو بەخۆیدا بچێتەوە ناتوانێ ئەم حەقیقەتە بشارێتەوە، ناتوانێ ئینكاری ئەم راستییە بكا. ئەوەتا ئاسمانەكانو زەوی هەنو بەبەرچاوەوەن، مانگو خۆرو ئەستێرەو قەبارەكانی لەو بۆشاییە بەرفراوانەدا لەهاتوچۆو مەلەكردندان، قەبارەو جەمو جوڵو دیاردەكانیان مەزندە كراوە، هەموو قەبارەو جەمو جوڵ دوریو نزیكیان پێكەوە گونجاوە بۆ خۆیان گەواهی ئەوە دەدەن: كە بێ مەبەستو بێهودە دروست نەكراون، دەی كەس لافی ئەوەی لێ نەداوەو بڵێ من دروستم كردون، كەسیش ناڵێ هاوكاری خودام كردوە لەبەدیهێنانیاندا، ناشگونجێ ئەم بونەوەرە بەورێكو پێكیو پێكەوە گونجانو تەناسوقەوە خۆی خۆی بەدی هێنابێ بەبێ خالق هاتبێتە دی، بیرۆكەی ئەوانەی دەڵێن: ئەم بوونەوەرە بەسودفە پەیدا بووە بیرو باوەڕێكە شیاوی موناقەشە نیەو خۆ پێوە خەریك كردنی كات بەفیڕۆدانە، ئەمە جگە لەوەی: كە سروشتی ئادەمیزاد لەناخەوە رەتی دەكاتەوە، بۆیە هەر كاتێ لێیان بپرسی كێ بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوییە؟ بەناچاری دەڵێن خودا، چونكە شتەكە ئاشكراو نمایانە، جگە لەم دان پێدانانە هیچ چارەی تر نیە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، لەتەك خودادا شتی تر

دەپەرستن!! ئەوانە خۆیان خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە، دەڵێن بەدیهێنەری بونەوەر خودایە کەچی بەکردەوە شتی تر دەپەرستن!!!

﴿قُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بڵێ سوپاس بۆ خودا؛ کە بۆ خۆتان دان بەخودایەتی خودادا دەنێن و بەناچاری بۆڕتان خوارد سوپاس بۆ خودا؛ کە بەڵگەی تاك و تەنهایی زاتی پاشی ئاشکراو نمایانن و کەس ناتوانێ ئینکاری بکا، وەلێ زوربەی زۆری موشریکەکان ئەوە نازانن: کە بەڵگەیان بەدەستەوە نیەو لەموناقەشەدا خۆیان بۆ ناگیرێ و بۆڕ دەخۆن.

ئەمجار هەر بەبۆنەی دانانی فیطرەت و سروشتییان بەوە کە هەروەها خودا بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی هەر خودایەو بەس، خاوەنیەتی حەقیقی و رەهای بوونەوەر بۆ خودا دەچەسپێنێ و دەفەرموێ: ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بەملکایەتی و دروستکردن و بەندایەتی هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردن هی خودایە، کەس رایەی ناکەوێ لافی خاوەنیەتی بەدیهێنانی بوونەوەر لێ بدا، ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ خودا بێ ئاتاجە لەهەموو کەس پێویستی بەهیچ شتێك نیە، هەموو کەس موحتاجی ئەوە، هەموو بەندەی پەروەردگارن، خودا لەسەر هەموو شتێك سوپاسکراوە!

ئەمجار چونکە رستەی ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەوەی لێ فەهم دەکرێ: کە ملکی خودا مەحصورو ئەندازە کراوەو لەچوارچێوەی ئاسمان و زەویدایە، ئەوە رون دەکاتە: کە قودرەت و زانیاری خودا رەهاو بەرفراوانن و سەرو بنیان نیەو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾ دیمەنێکە لەزانیاری ئادەمیزاد داڕندراوە، بۆ ئەوەی مانای ویست و زانیاری و دەسەڵاتی خودا لەذیهنی ئەوان نزیك بکاتەوەو بتوانن تێی بگەن.

ئادەمیزاد زانیاری خۆیان دەنووسن و قسەکانی خۆیان تۆمار دەکەن و فەرمان و مەرسوومی خۆیان مۆر دەکەن، بۆ ئەم مەبەستە قەڵەم و مەرەکەب بەکار دێنن، ئادەمیزادێك چەند بنووسێ و زۆر نووس بێ، ساڵی لەچەند قەڵەمێك و چەند شوشەمەرەکەبێك زیاتر پێویست نیە، ئەمجار لەم روانگەوە نموونەی ئەوە بۆ ئادەمیزاد دەهێنێتەوە؛ کە ئەگەر هەرچی دارو درەخت هەیە لەزەویدا ببێتە پێنووس و هەرچی دەریاکانی ناو زەوی هەن ببنە مەرەکەب و حەوت ئەوەندەی تریش دەریا بێنە پاڵیان و ببنە مەرەکەب و نووسەر دانیشن ئەو وشانەیان پێ بنووسن: کە باسی زانیاری خودا دەکەن تەعبیر لەویست و مەشیئەتی رەهای دەکەن، گەورەیی و صیفاتی خودا بنووسن، قەڵەمەکان دەشکێن و بەکۆتا دێن و ئاوی دەریاکان دەبڕێنەوەو هێشتا کەلیماتی خودا تەواو نابن و کۆتاییان نایە، چونکە قەڵەم و مەرەکەبەکە چەندێك زۆر بن سنووردارن، زانیاری خودا بێ سنوورەو کۆتایی نایە، شتی سنووردار چەندێك زۆر بێ کۆتایی دێ، بێ سنوورەکە وەکوو خۆی دەمێنێتەوەو هیچی کەم نابێتەوە، کەلیماتی خودا نابڕێنەوە، چونکە زانیاریەکەی سنووری نیە، چونکە ویست و ئیرادەی سنووری نیەو رەهایەو لەبن نایە، دارو دەریا دەبڕێنەوە نووسەرو لەسەر نووسراو تەواو دەبن هێشتا زانیاری خودا هیچی لێ کەم نەبۆتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بێگومان خودا خاوەن دەسەڵات و هێزو توانای لەبن نەهاتووە، هیچی لێ عاسێ نابێ، داناو حەکیمە لەکارو کردەوەیدا لەدروستکردن و بەدیهێناندا، هیچ شتێك لەژێر تیشکی زانیاری و حیکمەتی خودا دەرناچێ.

هێنانی ژمارەی حەوت بۆ ژمارەی زۆرو موبالەغەیەو بۆ حەصر نیە، عەرەب هەر کاتێ بیانەوێ ژمارەیەکی زۆر رابگەینن ژمارەی حەوت، حەفتا، حەوتصەد...الخ.

**بەكورتی:**

ئایەتەكە هەواڵ لەگەورەیی خوداو شكۆمەندیی‌و كەلیماتی لەبن نەهاتووی‌و زانیاری رەهاو نهێنی بێ پایانی دەدا، كە لەتوانای كەسدا نیە چۆنیەتیەكەی بزانێ، یان كەلیماتەكانی هەژمار بكا، وەكوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (سبحانك لا أحصى ثناء عليك، أنت كما اثنيت على نفسك) مەعلووماتی خودا ئەمسەرەو ئەو سەری نیە، سنوورو پەرژینێكی نیە، رەهاو بەرفراوان‌و شامیلە..

جا كە بەیانی كەماڵی قودرەت‌و بەرفراوانی زانیاری خودای كردو ئەوەی راگەیاند: كە كەلیماتی لەهەژمارنایەن ئەوە بەیان دەكا: كە زانیاری خودا هەموو مەخلووقاتی لەخۆ گرتووە، چۆن لەسەرەتادا ئێوەی دروست كردوە، ئاواش زیندوتان دەكاتەوە؛ دەفەرموێ: ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إِلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ هیچ كارێك لای خودا قورس نیە، دروستكردنی هەموو ئادەمیزاد زیندوكردنەوەیان لەرۆژی قیامەتدا بەنیسبەت قودرەتی خوداوە وەكوو یەك ئاسانە، هەموو كارێك لای خودا (كن فيكون)ە هەر ئەوەندەیە فەرمانی پێ دەكا ببەو یەكسەر دەبێ وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢) ئەو ئیرادەو تەكوینەی بەتەنها روتێكردنی بۆ خەڵق شت بەدی دینێ، زۆرو كەمی لایەكسانە! بۆ دروستكردنی هەموو فەردێك پێوەخەریكبون‌و سەرفكردنی وزەی ناوی، دوبارەبوونەوەو جوهدی دوچەندانەی پێویست نیە بۆ دروستكردنی شتی زۆر، ئیتر ئەو كاتە یەكسانە لای، تاقە یەكێك دروست بكا یان ملیاران، مردوێك زیندو بكاتەوە یان ملیار ملیارات‌و رۆر تریش. ئەمجار وێڕای ئەو قودرەتە رەهایە زانیاری بەرفراوان‌و ئاگاداری تەواوی هەیە ﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ بێگومان خودا ئاخاوتنی بەندەكانی دەبیسێ، ئاگاداری كردەوەكانیانە، چۆن ئاگادارو زانایە بەسەر كردەوەو گوفتاری تاقە كەسێكدا ئاواش ئاگادارو زانایە بەسەر كارو گوفتاری هەموو كەسدا.

ئـەمجار داوای رونکردنـەوەو راگەیانـدنی ئـەوە: کـە هەرچـی لەئاسمانـەکان‌و زەوی‌دا هەیە هی خودایەو بەویستی خۆی تەصەوری تێدا دەکا، هەنـدێ نموونـەی ئەو تەصەروفە دێنێتەوە، دەفـەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُـولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ ئایا تۆ نابینی ئەی بینەر: کە خودا: کـە خـودای خـاوەن قـودرەت‌و دانا لەکاتەکانی شەو دەخاتە سەر کاتی رۆژو شـەو کـورت دەبـێ‌و رۆژ درێـژ وەکوو لەوەرزی بەهارو هاوین‌دا دەبینرێ، هەروا بەپێچەوانەوە لـەکاتی رۆژ دەخاتـە سـەر شـەو، شـەو درێـژ دەبـن‌و رۆژ کـورت، لـەو دەگرێتـەوەو دەیخاتـە سـەر ئـەم‌و بەپێچەوانەشەوە.

بێگومان دیمەنی چوونە ناو یەکی شەوو رۆژ، رۆژ درێژ بوون‌و شەو کورتبوون، شـەو درێـژ بـوون رۆژ کورتبـوون گـۆڕانی ئەنـدازەیان‌و بەرامبـەر بەیـەکبوونیان بـەگوێرەی گـۆڕانی وەرزەکـانی سـاڵ دیمـەنێکی سەرسـوڕهێنەرە، بـەڵام زۆر دوبارەبوونـەوەیان‌و ئولفـەت پێوەگرتنی ئادەمیزاد پێیانـەوە وای کـردوە سـەرنجی ئـادەمیزاد رانەکێـشێ‌و بەلایانـەوە عەجایـەب نـەبێ، ئـەگینا گـۆڕانی شـەوو رۆژو کورتبون‌و درێژبوونیان گەورەترین موعجیزەو گرنگترین روداون بەسەر سروشـتدا دێ‌و دەبوایە سەرنجی ئادەمیزادی رابکێشایەو بیحەپەساندنایە!

﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُـلٌّ يَجْـرِي إِلَـى أَجَـلٍ مُـسَمًّى﴾ خـۆرو مـانگی ژێربـار کـردون، دروسـتی کـردون بـۆ سـوود گەیانـدن بـۆ ئێـوە، هەریـەکێ لـەخۆرو مـانگ بەئاسماندا دێن‌و دەچـن‌و ئـەرکی خۆیـان ئـەنجام دەدەن بـەو شـێوەیەی خـودا بـۆی دیاری کردون، لەجەمسەرو مەدارەی خۆیاندا تا رۆژی قیامەت بێ وچان لەگـەڕدان، جگە لەخودا کەسی تر توانای ئەوەی نیە ئەم قەبارە زەبەللاحانە بەو شێوە رێـك‌و پێکیە بـێ وچـان هەڵسوڕێنێ‌و پـەکیان نەکـەوێ، هـەر خـودا ئـەو شـتانەی بـەدی هێناون‌و هەر ئەویش دەزانێ تاکەی لەگەڕدا دەبن، وێڕای حەقیقەتی گۆڕانی شەوو رۆژو ژێربـار کردنـی خـۆرو مـانگ: کـە دوو حەقیقـەتی بوونـەوەرن‌و دوو دیـاردەی گرنگن لەسروشـتدا، حەقیقـەتێکی تـر هەیـە لـەوان گـرنگترە ئـەویش ئەوەیـە: کـە

دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ پەروەردگار ئاگادارەو دەزانێ چی دەکەن لەخێرو لەشەڕ، هەر ئەو بەدیهێنەرو زاناو ئاگادارو هەڵسوڕێنەرە.

ئەمجار بەشوێن ئەو سێ حەقیقەتە گرنگانەدا حەقیقەتێکی گەورەو گرنگ رادەگەیێنێ، حەقیقەتێك: کە هەموو حەقیقەتێك پێیەوە پەیوەندەو لەسەر ئەو دامەزراوە بنەماو سەرچاوەی هەموو حەقیقەتەکانە، دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الْبَاطِلُ﴾ ئەو یاسا وردو گرنگو پتەوەی زەوی: کە ئێوە بەشێکی کەمی لێ دەزانن، ئەو یاسا سەرسوڕهێنەرە بەردەوامو لەکاردایە، بەهۆی ئەوەوە: کە خودا حەقو راستە، ئەو شتانەی ئێوە لەجیاتی خودا دەیانپەرستن بەتاڵو پوچن، هیچیان لەباردا نیەو بێ بنەمان، هەموو شتێك پەیوەندی بەو حەقیقەتە گەورەو رەهایەوە هەیە، ئەو حەقیقەتەی هەموو حەقیقەتێك پەیوەستە بەئەوەوە، بوونەوەر جیهانی هەستی هەمووی ئەو بەدی هێناوەو ئەو هەڵیدەسوڕێنێو ئەو رایگرتووە هەبوونی خودا بەحەق، ئەم کەونەی راگیر کردوەو چاودێری دەکاو ناهێڵێ لێك هەڵوەشێ!! هەموو شتێك جگە لەخودا گۆڕانی بەسەردا دێ، زیادو کەمی تێدەکەوێ، بێ هێزی بەتوانایی، گەشو نماو پوچانەوەو هاتو نەهاتی دێتە رێ، هەموو شتێك جگە لەخودا، دوای نەبوون پەیدا بووە، دوای بوونیش نەبوونی بەسەردا دێ. تەنها خودا هەر بوەو هەردەبێو گۆڕانی بەسەردا نایەو نەمان روی تێ ناکا. ئەمەش چونکە ﴿وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ بێگومان پەروەردگار بەرزو شکۆمەندە هیچ کەس سەری ناکەوێ، بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستەو هیچ کەس بەسەر ئەودا باڵادەست نیە، گەورەو شکۆمەندێکە لەهەموو کەس گەورترەو هەموو شتێك گەردنکەچو ژێرباری ئەوە.

ئەمجار دوا بەدوای بەیانکردنی نیشانە ئاسمانییەکانی گەواهیدەر لەسەر هەبوونی خوداو تاكو تەنهاییو دەسەلاتی بەرفراوانی دێتە سەر رانواندنی نیشانەیەکی سەر زەوی: کە دیمەنێکی مەئلووفەو ئادەمیزاد پێی ئاشنان، ئەویش

دیمەنی کەشتیو گەمیکانە لەدەریادا دێنو دەچنو بەفەضلو گەورەیی خودا نقووم نابن. دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَةِ اللَّهِ لِيُرِيَكُمْ مِنْ آيَاتِهِ﴾ ئەتۆ نازانی ئەی موخاطەب، ئەی بیسەر: کە خودا دەریای موسەخەر کردوە بۆ ئەوەی کەشتییەکان پێیدا رەوبکەن، خودا بەفەضلو گەورەیی هۆکارەکانی هاتوچۆی کەشتییەکانی رەخساندون، تایبەتمەندیو یاساو رێسایەکی داناوە بۆ ئاوو هەواو زەویو خودی کەشتییەکان، بەگوێرەی ئەو یاساو رێسایە کەشتییەکان لێ دەخورێن: ئەگەر ئەو تایبەتمەندیو هۆکارانە خەلەلیان تێ بکەوێ، کەثافەی ئاو یان کەثافەی کەشتییەکە، یان رێژەی پاڵەپەستۆی هەوا لەسەر روبەری دەریا گۆڕانی بەسەردا بێ، یان شەپۆلەکانی دەریا یان هەوا هاریکارنەبن بۆ رویانەوەی کەشتییەکان، یان رێژەی گەرما یان سەرما بگاتە ئاستێك سروشتی ئاوەکە بگۆڕێو لەحاڵەتی ئاسایی خۆیدا نەمێنێ بێگومان کەشتی ڕانی ئەنجام نادرێ.

خودا ئەم هۆکارانەی رەخساندون بۆ کەشتیرانیو دەریاوانی، بۆ ئەوە خودا بناسنو هەندێ لەنیشانەکانی قودرەتو دەسەڵاتی هەست پێ بکەن، بزانن هەر خودا چاودێرو پارێزەری گەمێکانە لەناو دەریادا، لەناو شەپۆلی بێ ئامانو ترسناکدا، ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ بێگومان لەو شتانەی باسکران، لەنیشانە ئاسمانییەکانو نیشانەکانی ناو دەریاو غەیری دەریا بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر هەن بۆ کەسانێك صەبری زۆریان هەبێ لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا، خاوەن شوکرو سوپاسگوزار بن لەکاتی خۆشیو نازو نیعمەتدا.

ئەمجار ڕاڕایی حاڵی موشریکەکان بەیان دەکا: کە هەردەمەو هەڵوێستێکیان هەیە، لەکاتی تەنگانەدا هانا بۆ خودا دەبەنو لەکاتی خۆشیدا خودایان لەبیر دەچێتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾ هەر کاتێ لەناو دەریادا بەکەشتییەکانیانەوە بکەونە ناو شەپۆلی سامناکی دەریاوە، شەپۆلی بەرزو گەورەی وەها کە دەشوبهێنە کێوی گەورەو بەرزو هەوری پڕورەشو

تاریك! ئا لەو کاتەدا: کە خەتەری مەرگ لێیان نزیك دەبێتەوە، دەگەڕێنەوە سەر سروشتی خۆیان و فیطرەتیان وە ئاگادێتەوە، لەناخی دڵیانەوە لەخودا دەپاڕێنەوە دڵسۆزانە بەندایەتی خۆیان رادەگەیەنن، تەنیا هاوار لەخودا دەکەن و کەس ناکەن بەهاوەڵی، هانای بۆ دەبەن، لێی دەپاڕێنەوە، دەلاڵێنەوە، ﴿فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ﴾ کەچی: کە خودا رەحمی پێ کردن و لەناو ئەو شەپۆلە سامناکانەدا پارێزگاری کردن بەسەلامەتی گەیاندنیە وشکانی، هەیانە لەسەر ئیمان دەمێنێتەوە و روناکاتەوە کوفرو هاوەڵدانان بۆ خودا، هەرچەندە ئیمانەکەی وەکوو ئیمانی کاتی تەنگانەکەی بەهێز نیە، هەر ئەوەندەیە ناگەڕێتەوە بۆ سەر کوفرو رو دەکاتە یەکتاپەرستی، هەشیانە ستەمکارو پەیمان هەڵوەشێنەوەیە، هەر لەگەڵ کەوتە خۆشی و لەتەنگانە رزگاری بوو خودای لەبیر دەچێتەوە سووردەبێ لەسەر کوفرو بێدینی خۆی سپڵەو پێنەزان و بێ وادەو پەیمانە. ئینکاری ئایەتەکانی خودا دەکا! ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ﴾ وەلحال ئینکاری ئایەتەکەونی و قورئانییەکانی ئێمە ناکا بەرامبەر بەنیعمەتەکانی ئێمە سپڵە نابێ مەگەر هەموو ئەوانەی: کە زۆر ستەمکارو دڵڕەق و سپڵەن، زێدە رەویان کردوە لەکوفرو بێدینیدا، ئەگینا دەبوایە دوای بینینی ئەو هەموو ئایەتە کەونییانە، دوای بەخشینی ئەو هەموو نیعمەتانە پێیان: کە بڕێکیان رزگارکردنیان لەناو خەتەری شەپۆلی دەریادا لەخوداپەرستی و خوداناسی ژێوان نەبوونایەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ

ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾

ئەمجار هەر بەبۆنەی ترس و بیمی ناو دەریاوە ئەو ترس و بیمەی چ نرخێکی بۆ هێز و توانای ئادەمیزاد نەهێشتەوە بەخۆنازین و هێز و توانای خۆیانی لەبیربردنەوەو وای لێ کردن، بۆیان مەعلووم ببێ: کە خودا درۆزنەکان بەتاڵ و هیچیان پێ ناکرێ، فیطرەتیان وەئاگا بێتەوەو پەردەو چڵکی گومڕایی لەسەر لاچێ و هانا بۆ خودابەرن! بەم بۆنەوە بەڵایەکی گەورەترو تەنگ و چەڵەمەیەکی سامناکتریان وەبیر دێنێتەوە، کە تەنگ و چەڵەمەی ناو دەریاو ترسی شەپۆلی بێ ئامان لەچاویرا بەهیچ بژمێردرێ، ئەویش تەنگانەی ڕۆژی قیامەتە، ئەو ڕۆژەی کە دایک و باوک وەسەر ڕۆڵەی خۆیان ناپرژێ و ڕۆژی نەفسی نەفسییە. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْماً لا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئاً﴾ ئەی ئادەمیزادینە! هەموتان لەخودای خۆتان بترسن، ئەو خودایەی هەر ئەو خودایەو هەر ئەو دروستی کردون و ڕزق و ڕۆژیی ئێوەی داوەو دەیدا، ئەم بونەوەرەی بۆ ئێوە وا گونجاندوە سودی لێ وەربگرن و تێیدا بژین. لەسزاو تۆڵەی خودای خۆتان بترسن، ترسی ڕۆژێکتان هەبێ تا خەیاڵ بڕ بکا ترسناک و پڕ کارەساتە، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی قیامەتە، ئەو ڕۆژەیە باوک وەسەر کوڕی خۆی ناپرژێ، ئەگەر لەفەرزی محاڵدا بیەوێ خۆی بەقوربانی بکا، عەزابی ڕۆڵەکەی بخاتە سەرخۆی لێی قبووڵ ناکرێ و پێشنیارەکەی ڕەت دەکرێتەوە، هەروەها هیچ کوڕو کچێك هیچ سودو قازانج و یارمەتیەکی بۆ باوک و دایکی نابێ، ئەگەر بیەوێ خۆ بکا بەقوربانی باوک و دایکی و تاوانی ئەوان هەڵبگرێ لێی قبووڵ ناکرێ، چونکە کەس

ناتوانێ شەفاعەت بۆ کەس بکا مەگەر خودا ئیزن بدا، خوداش جگە لەکردەوەی باش هیچ شتێکی تر قبووڵ ناکا!

لەو رۆژەدا پەیوەندی خزمایەتیو دۆستایەتی نامێنێ باوكو دایك لەرۆڵەی خۆیان بێ ئاگانو ئەویش لێیان دابڕاوەو ئەوانی لەبیر نیە، هەموو کەس لەسارای مەحشەردا رادەگیرێو هیچ کەس یارمەتیدەری نیەو هیچ پشتو پەنایەك نیە، خەڵك خۆبخاتە پەنایەوە، هەموو کەس لێك نامۆنو هیچ پەیوەندییەك نامێنێو کەس وەسەر کەسی ناپڕژێ، تەنگانەی ئەو رۆژە مندالی ساوا پیر دەکاو هەموو کەسێك دەتاسێنێ، ئەو رۆژە هەر دێو شك لەهاتنیدا نیە چونکە ئەوە وادەی خودایەو ﴿إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ بێگومان وادەی خودا حەقەو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە، قیامەت رادەبێو هەموو کەس پاداشو سزای خۆی وەردەگرێتەوە، کەوابێ خۆتان بۆ ئەو رۆژە ئامادە بکەن. ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ با جوانیو رازاوەیی ژیانی دونیا ئێوە هەڵنەخەڵەتێنێو دڵو دەروونتان پێیەوە پەیوەست بێو باوەشی پێدابکەنو قیامەتتان لەبیر بچێتەوەو خۆی بۆ ئامادە نەکەن، ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ با شەیتان ئێوە هەڵنەخەڵەتێنێو نەچێتە بن کڵێشەتانەوە، بەم رەنگە هەڵتان نێ بۆ تاوانکردنو بەوە لەخشتەتان بەرێ کە خودا لێخۆشبوو بەحیلمو رەحمو شەفەقەنە. تاوانتان لەپێش چاو جوان بکاو قیامەتتان لەبیر بەرێتەوە.

هەڵبەتە هۆکاری لەخشتەبردن زۆرن، ماڵو سامان ئیشو کار، خزمو ماڵو منداڵ، زانیاریو پلەو پایە، لەشساغیو تەمەندرێژی ئەمانە هەموویان هۆکاری لەخشتەبردنن، ئەگەر ئادەمیزاد ئاگاداری خۆی نەبێو بەوریاییو دڵ بێدارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ نەکا، شەیتان فرسەتی لێ دێنێو لەخشتەی دەباو قیامەتی لەبیردەباتەوە.

ئەمجار لەژێر تارمایی ئەو ترسو بیمەی خستیە ناو دڵی ئادەمیزادەکانەوەو لەکۆتایی سورەتەکەدا باسی بەرفراوانی زانیاری پەروەردگار دەکا: کە هەموو

شتێکی لەخۆ گرتووەو هیچ نیە لەبونەوەردا ئیللا زانیاری خودا کۆنترۆڵی کردوە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ زانیاری کاتی رابوونی قیامەت هەر لای خودایەو بەس، تەنیا پەروەردگار دەزانێ قیامەت کەی رادەبێ، تەنانەت فریشتەکانی نزیك بارەگای ئەقدەس و پێغەمبەرانیش لەم بارەوە چ زانیاریەکیان نیە، کاتی هاتنی قیامەت نهێنییەکە جگە لەخودا کەسی تر نایزانێ، بۆ ئەوەی بەردەوام ئادەمیزاد ترسیان هەبێ و چاوەڕوانی بن و هەوڵ بدەن تێشووی بۆ بخەن و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن!

١- ﴿وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ﴾ هەر خودا دەتوانێ باران ببارێنێ و هۆکارەکانی بڕەخسێنێ و ئەندازەکەی دیاری بکا، (زانینی کاتی باران بەتەحدیدی و ئەندازەی بارانەکەو چۆنیەتی بارینەکە هەر خودا دەزانێ و بەس).

لەوانەیە ئادەمیزاد بەهۆی زانیاری و تەجروبەو ئامێری کەش و هەواناسیەوە کاتی بارینی باران بزانن بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن هۆکارەکانی بارینی باران بڕەخسێنن، هەموو دونیا کۆببێتەوە ناتوانن هەوری باراناوی دروست بکەن و بەویستی خۆیان لەو شوێنانەی مەبەستیانە باران ببارێنن دەقەکەش ئەوە دەگەیەنێ و دەچەسپێنێ: کە هەر خودا دەتوانێ باران ببارێنێ، چونکە هەر خودا دەتوانێ ئەسبابە کەونییەکان بڕەخسێنێ بۆ بارینی باران!!

مانای ئەوە نیە هەر خودا دەزانێ کەی باران دەبارێ، ئەوانەی ئایەتەکە وا مانا دەکەن: زانینی کاتی باران بارین تایبەتە بەخوداوەو هەر خودا دەزانێ کەی باران دەبارێ لەراستە مانای دەقە قورئانییەکە لایان داوە، هەرچەندە لەهەموو شتێکدا زانیاری تەواوو یەکانگیرو بێ هەڵە هەر زانیاری خودایەو هەر زانیاری خودایە زیادو کەمی تێدا پەیدا نابێ، بەڵام پێویست ناکا ئێمە لەظاهیری مانای دەقەکە لابدەین.

٢- ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ﴾ هەر خودا دەزانێ ئەوەی لەمنداڵدانی ئافرەتدایە چیە نێرە یان مێیەیەکە یان زیاترە، ڕەوشتەکانی شێوەو ڕوخساری چۆنن و چۆن نین. هەر خودا بەیەقینی و بەتەواوی دەزانێ چی لەمنداڵداندا هەیە، هەر لەسەرەتای پەیدابوونی ئەو منداڵە لەمنداڵداندا تا ڕۆژی هاتنە دونیای لەهەموو کات و طەورێکیدا! هەر خودا دەزانێ شێوەو ڕوخسارو ڕەوشتی، تایبەتمەندیو ئامادەباشی چۆنەو چییەو تا چ ئاستێکە جا ئەگەر ئێستا زانیاری پزیشکیو زیندەوەرزانیو بەهۆی تەحلیلی کیمیائیو ئامێری پێشکەوتووەوە گەییشتۆتە ئاستێك بتوانێ لەقۆناغی کامڵبونی کۆرپەلەو تەواو بوونی دروستبوونی ئەندامەکانی جەستەی لەدەوروبەری چوار مانگیدا جۆری کۆرپەلەکە دیاری بکا نێرە یان مێیە، ئەمە بەغەیب حسێب ناکرێ، بەڵکوو ئەوە زانینە بەهۆی تاقیکردنەوە هەموو کاتێ ڕاست دەرناچێ، سەرباری ئەوەش زۆر حاڵات و ڕەوشتی تر هەن کە زانیاری ئادەمیزاد پەی پێ ناباو لەبەرامبەریدا کۆڵەوارە! کەوابوو هەر خودا بەتەواوی دەزانێ چی لەمنداڵدانی مێینەدا هەیە نێرە، یان مێیە، سوورە ڕەشە سپییە، زیرەکە کەودەنە، ئازایە ترسنووکە...هتد.

﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً﴾ هیچ کەسێك نازانێ سبەینێ چی دەکاو چی بەسەر دێ، نازانێ ئەوەی بەیانی دەیکا خێرە شەڕە باشە خراپە، نازانێ بەیانی تووشی نەخۆشی دەبێ یان بەلەشساغی دەمێنێتەوە...هتد.

﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ هیچ ئادەمیزادێك نازانێ لەکوێ دەمرێ، نازانێ ئایا لەولاتی خۆی دەمرێ یان لەوڵاتێکی تر سەردەنێتەوە.

بێگومان ئادەمیزاد لەبەرامبەر ئەم پەردە غەیبییانەدا دەسەوەستان و کۆڵەوارە، ئەگەر ورد بێتەوە دەزانێ: کە زانیارییەکەی لەچاو زانیاری خودادا بەهیچ دەژمێردرێ، ڕوی نایە لافی عیلم و مەعریفەت لێ بدا، دەزانێ: کە لەبەرامبەر پەردەی غەیبدا ئادەمیزاد چ زانیارێکیان نیەو ئەو زانیارییەی پێی دەنازن و

خۆیانی پێوە بادەدەن کەمێکی زۆر کەمە، لەهەمان کاتدا لەپشت پەردەی غەیبەوە زانیاری زۆر هەیە ئادەمیزاد هیچی لێ نازانن.

ریوایەتکراوە دەڵێن: فریشتەی گیانکێشان بەلای حەزرەتی سولەیماندا تێپەڕی، لەمەجلیسی سولەیماندا سەیری کابرایەکی کردو زۆر دیقەتی لێ دا، کابرا لەحەزرەتی سولەیمانی پرسی ئەمە کێیە؟! حەزرەتی سولەیمان وتی ئەمە فریشتەی گیانکێشانە، کابرا وتی: وا دیارە منی گەرەکە، ئیتر کابرا کێچی کەوتە کەوڵەوەو هەراسانی لێ هەلگیرا، داوای لەحەزرەتی سولەیمان کرد کە فەرمان بە(با) بکا بیفرێنێ بۆ وڵاتی هیندوستان، داخوازی کابرا جێ بەجێ کراو گەیەنرایە وڵاتی هیند. فریشتەی گیانکێشان بەحەزرەتی سولەیمانی وت: ئەمن سەرم لەو کابرایە سوڕمابوو کە لێرە بوو، چونکە من فەرمانم پێ کرابوو لەوڵاتی هیند گیانی بکێشم‌و ئەو لای تۆ دانیشتبوو.

لەفەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (إذا أراد الله قبض عبد بأرض جعل له إليها حاجة) هەر کاتێ خودا ویستی گیانی ئادەمیزادێك لەشوێنێك بکێشێ، پێویستی ئەو ئادەمیزادە دەخاتە ئەو شوێنەو بۆی دەچێ.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ (الأنعام: ٥٩).

ئیمامی بوخاری‌و موسلیم لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مفتاح الغيب خمس لايعلمهن إلا الله) ﴿إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[1]

[1] رواه البخاري في تفسير (٤٦٢٧) باب (١) ﴿وعنده مفاتيح الغيب...﴾.

ئەمجار کۆتایی ئایەتەکەو سورەتەکەش بەوە دێنێ، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خودا زاناو ئاگادارە نەك هەر بەم پێنج شتانە بەڵکوو زانیارییەکەی هەموو شتێکی کۆنترۆڵ کردوەو ئاشکراو نهێنی هەموو شتێك بەئەوپەڕی زانینەوە دەزانێ و هیچ وردو درشتێکی لێ پەنهان نیە.

**بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (لوقمان) تەواو بوو...**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (السجدة)

ئەم سورەتە ناونراوە سورەتی (السجدة) چونکە وەصفی موسوڵمانان دەکا بەوە کە سوجدە بۆ خودا دەبەن و هەر کاتێ ئایاتی قورئان ببیسن تەسبیح و تەقدیسی پەروەردگار دەکەن وەکوو لەئایەتی ژمارە (١٥)دا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّداً وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾.

بوخاری لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی هەموو رۆژێکی جومعەدا سورەتی ﴿الم، تَنزِيلُ الْكِتَابِ...﴾ (السجدة) سورەتی ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ﴾ی دەخوێند.[1]

ئەبو موحەممەد (الدارمي) لەموسنەدەکەیدا لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: هیچ شەوێك پێغەمبەر ﷺ نەدەنوست هەتا ﴿الم، تَنزِيلُ..﴾ی سەجدەو سورەتی ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾ی نەخوێندایە.[2]

[1] أخرجه البخاري في الجمعة (٨٩١) باب (١٠) ما يقرأ في صلاة الفجر يوم الجمعة. هەمان حەدیثی لەئیبنو عەباسیشەوە ریوایەت کردوە.

ئەم سورەتەش مەككییەو نموونەیەكی ترە لەسورەتە مەككییەكان: كە گرنگی دەدا بەلایەنی عەقیدەو بیرو باوەڕو جەخت دەكاتەوە لەسەر یەكتاپەرستی‌و زیندوبوونەوەو پێغەمبەرایەتی. جەمسەری باسی ئەم سورەتە بەلگە هێنانەوە لەسەر رۆژی قیامەت‌و زیندوبوونەوەی ئادەمیزادە: كە موشریكەكانی بڕوایان پێ نەدەكردو دەیانگوت: ئێمە دوای رزین‌و پۆلكان‌و بوونەوەمان بەخۆڵ چۆن زیندو دەكرێینەوە؟! ئەم بەلگەیان بەدەستەوە گرتبوو پێغەمبەریان بەدرۆ دەخستەوە.

بۆیە سورەتە مەككییەكان تێكڕا چارەسەری ئەم سێ بنەما سەرەكییانەی بیرو باوەڕ دەكەن، هەر یەكەیان بەئوسلوب‌و شێوازێكی تایبەتی هەوڵ دەدەن راستی ئەو حەقیقەتانە لەدڵی ئادەمیزاددا بڕوێنن‌و بچەسپێنن خیطابی هەموو سورەتەكان ئاڕاستەی دڵی ئادەمیزاد دەكرێ‌و بۆ قەڵاچۆكردن‌و پاككردنەوەی دەروونیانە لەنەخۆشی كوفرو ئیلحاد، بەلگەو دەلیل دەهێنێتەوە لەروبەری بوونەوەر، لەپەیدابوونی ئادەمیزاد خۆی‌و قۆناغەكانی ژیانی، لەبەسەرهات‌و لەناوچوونی گەلەستەمكارو سەرپێچیكارەكانی رابردو، لەدیمەنە سامناكەكانی رۆژی قیامەت، وێنەی دڵ‌و دەروونی پڕ لەئیمان‌و دڵ‌و دەروونی كوێرەوەبوو بێ باوەڕ رادەنوێنێ‌و پاداش‌و سزای ئەوانیش‌و ئەمان دیاری دەكا بەجۆرێك هەر دەڵێی لەبەرچاوە، هەموو ئەم نمایشگاو دیمەنانە رادەنوێنێ‌و ئاڕاستەی دڵی ئادەمیزادی دەكا بۆ ئەوەی هەڵیان نێ بۆ بیركردنەوەو بەخۆدا چوونەوەو ئیمان هێنان جارێك دەیانترسێنێ‌و دەمێك تەماعیان بەردەنێ چەڵێك چاوەڕوانی‌و هیوایان تێدا دەخولقێنێ، وەختێكیش هەڕەشەیان لێ دەكاو وەلەرزیان دێنێ، هەوڵ دەدا بەتەماع بەرنان‌و ئیقناعكردن، لەئاكامدا لێیان دەگەڕێ بۆ خۆیان بەبەرچاورونی‌و لەسەر هیدایەو نوور بڕیار بدەن‌و رێگای گونجاو بگرنەبەر.

---

(٢) أخرجه الدارمي في فضائل القرآن (٣٤١١) باب (١٩) في فضل سورة تنزيل السجدة وتبارك.

## چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٣﴾﴾

﴿الم﴾ پیتەکانی ئەم وشەیە بەپچڕ پچڕی بخوێنەوە، واتە: دەبێ بەم شێوە بیخوێنینەوە (ألف، لام، میم) سورەتەکەی بەم پیتانە دەستی پێ کردوە وەکوو باقی سورەتە مەککیەکانی تر؛ بۆ ئەوەی ئاماژە بکا بۆ ئیعجازو سەرناسایی قورئان‌و تەحەدا کردنی موشریکەکان: کە دەیانگوت: موحەممەد ئەم قورئانەی لەخوداوە بۆ نەهاتووە، هەردەمە بۆختانێکیان پێ دەکرد ڕۆژێك دەیانگوت: کۆیلەیەکی عەجەمی فێری دەکا، ڕۆژێك دەیانگوت: چیرۆکە کۆنی پێشینانە...هتد.

﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ لا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ ئەم قورئانە گەورەو پیرۆزە هیچ شك‌و گومان لەوەدا نیە لەخوداوە بۆ سەر دڵی موحەممەد نازڵ بووە، نەسیحرەو نەشیعرەو نەسەجع‌و جەنجولوتی کوڵەوەنانییە. بەڵکوو کەلامی خودای بوونەوەرە، کەلامی خودای ئادەمیزادو جندۆکەیە بەگشتی.

پەروەردگار بەم ئایەتە ڕەدی ئەوانەی داوەتەوە: کە دەیانگوت ئەم قورئانە چیرۆکە کۆنی پێشینانە بۆی دەنووسنەوەو ئێوارەو بەیانی بەسەریدا دەخوێننەوەو ئەویش دێ بۆ ئێمەی دەخوێنێتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا پەروەردگار ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ (الفرقان:٥).

هەموو ئایەتو سورەتێکی ئەم قورئانـە بەئاشـکرا هـاوار دەکـەن: کـە لـەخوداوە هاتوونو کەلامی ئـادەمیزاد نـین، هـەتا زیـاتر دڵـی بـۆ بکرێتـەوەو هەسـتو شـعوور مـشتو مـاڵ بکـرێن پـتر کیـانی ئـادەمیزاد لەبەرامبـەریدا دەکەوێتـە لـەرزەو موچورکەی پێدا دێنو هەستی بەپیرەوەچونو وەرگـرتن زیـاتر بەرجەسـتە دەبـێ تێیدا. هەتا باری رۆشنبیریو زانیـاری ئـادەمیزاد زۆرتـرو بـەرفراوان تـر بـێ زیـاتر بـۆی دەردەکـەوێ: کـە قورئـان موعجیزەیـەو لـەخوداوە نێـردراوەو لـەتوانای ئادەمیزاددا نیە کەلامی ئاوا بخاتە ڕو.

﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ بـەڵکوو ئـەو موشـریکانە راسـت ناکـەنو درۆو بوختـان هەڵدەبەستن لەوەدا: کە دەڵێن: موحەممەد بـۆ خـۆی ئـەم قورئانـەی هەڵبەسـتووە ئەمجار خودا رەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ﴾ بـەڵکوو ئـەو قورئانە حەقو چەسپاوە لەلایەن خـودای خۆتـەوە بـەنیگا بـۆت نێـردراوە، ﴿لِتُنذِرَ قَوْماً مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ بـۆ ئـەوەی گـەلو نەتەوەیـەك: کـە قوڕەیشە بیان ترسێنێ لەعەزابی خوداو تۆڵەی سەختی، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو بێـدینی، ئـەو گـەلو نەتەوەیـە لـەپێش تـۆوە ترسـێنەریان بۆسـەر رەوانـە نەکراوە، ئەتۆمان کردوە بەپێغەمبەر بۆ ئـەوەی رێگـای راسـتیان بـۆ رون بکەیـەوە، بەهومێـدی ئـەوەی بەترسـاندنو ئامۆژگـاری تـۆ هیدایـەت ئـامێز بـنو رو لـەکوفرو شیرك وەرگێڕنو موسوڵمان بنو بەختەوەریی دونیاو قیامەت بۆخۆیـان دەسـتەبەر بکەن.

## بەڵگە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو بەتوانایی زاتی پاکی

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا

شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾

ئەو عەرەبانەی حەزرەت موحەممەدیان بۆ سەر رەوانە كراوە لەوەپێش پێغەمبەریان بۆ نەنێردراوە، مێژوو لەنێوان حەزرەتی ئیسماعیل (كە باپیرە گەورەی عەرەبە)و نێوان حەزرەتی موحەممەد: كە دوا پێغەمبەرە، ج پێغەمبەرێكی تۆمار نەكردوە نێردراوبێ بۆ سەر ئەو نەتەوە عەرەبە.

ئەمجار ئەو نەتەوە عەرەبە خودا پێغەمبەری بۆ ناردون، قورئانی بۆ ناردون بۆ ئەوەی روبكەنە خوداپەرستی واز لەبتپەرستی بهێنن، شوێن پەیامی پێغەمبەر بكەونو یاساو شەریعەتی خودا بكەنە پەیڕەوو پرۆگرامی خۆیان.

ئەمجار لێرەدا دەست دەكا بەبەیانكردنو رون كردنەوەی ئەو صیفەتانەی شیاوی خودایەتینو كەسێك ئەو صیفەتانەی تێدا نەبن بەكەڵكی خودایەتی نایە.

دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ خودا بەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە، ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی تێیاندایە لەنەبووەوە دروستی کردون لەماوەی شەش کاتدا، ئاشکرایە مەبەست بەئەو رۆژانە رۆژی ئاسایی ئێمە نیە، چونکە ئەم شەوو رۆژەی: کە ئێستا بەسەر ئێمەدا دێنو تێپەڕ دەبن ئەندازەو پێوەرێکن لەهەڵخولانی زەوی بەدەوری خۆیداو لەبەرامبەر خۆردا پەیدا دەبن، دەی ئەو کاتەی پەروەردگار بونەوەری بەدی هێناوە ئەم شەوو رۆژە ئاساییەی ئێستا نەبوە. حەقیقەتی ئەو شەش رۆژانەی خودا بونەوەری تێدا بەدی هێناون لەئێمە نادیارەو هەر خودا دەزانێ چۆنن!

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئەگەر خودا بیویستایە لەچاو تروکاندنێکدا بوونەوەری بەدی دەهێنا، وەلێ: کە وای کردوەو بەشەش کات خوڵقاندونی ویستوویەتی بەندەکانی فێری ئەوە بکا: کە بەکاڵەو خۆبن لەئەنجامدانی کارەکانیانداو هەڵەشەو بەپەلە نەبن!

﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ پەروەردگار کۆنترۆڵی عەرشی کردوەو، یان بەو شێوەیەی: کە شیاوی خودایەتی خۆیەتی ئیستیوای لەسەر عەرش کردوە عەرش: گەورەترین مەخلووقی بوونەوەرە، بەزمانو بەمەکان ناپێورێو ئەندازەدار ناکرێ.

وشەی (ثم) لەئایەتەکە بۆ تەراخیو تەرتیب نیە، چونکە پەروەردگار حاڵەتو وەزعی جیاجیای بەسەردا نایە، نابێ ئێستا لەحاڵێکدا بێو پاشان لەوەزعێکی تردا بێ. بەڵکوو (ثم) تەرتیبی مەعنەوی دەگەیەنێ، (استعلا)ش پلەیەکە لەژوور پلەی خوڵقاندنەو بەو جۆرە تەعبیری لێ دەدرێتەوە!

﴿مَا لَكُمْ مِنْ دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! جگە لەخودا کەس نیە پشتیوانو یارمەتیدەرتان بێ هەر ئەو دەتوانێ نەفعتان پێ بگەیەنێو زیانتان لێ دوور بخاتەوە، بەبێ ئیزنو رەزامەندیی خودا کەس نیە بتوانێ تکاو شەفاعەتتان بۆ بکا، بەڵکوو خودا خاوەنی هەموو شتێکە بەموطلەقی، هەرچی

بەرزەوەنـدی ئێـوەی تێـدابێ فەراهـەمی هێنـاوە، خـاوەن توانـای رەهایـە، بالادەسـتە بەسەر عەرش‌و ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەرچی تیاندایە. ئیتر کێ هەیە جگـە لـەخودا یارمەتیدەربێ؟ کێ هەیە بەبێ ئیزنی ئەو بتوانێ شەفاعەت بکا؟

﴿أَفَلا تَتَذَكَّرُونَ ؟﴾ ئەوە بۆچی بیر ناکەنـەوەو ئامۆژگاری وەرنـاگرن‌و لـەئاکاما بـڕوا بـەخودا بکـەن‌و ببنـە یەکتاپەرسـت! بیرکردنـەوە لەبوونـەوەرو تێفکـرین لەمەخلووقاتی خودا دڵ‌و دەروون وا لـێ دەکا دان بەهەبوونی خودا دابنێ‌و هاوەڵی بۆ بڕیارنەداو بەتەنها روبکاتە ئەوو هەر ئەو بپەرستێ!

﴿يُدَبِّرُ الأَمْرَ مِنْ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾ ئیش‌وکاری بوونەوەر بەدەست خۆیەتی، راگرتنی بونـەوەرو بـەڕێوەبردنی بەعالەمی بالاو پایینیەوە بەو شێوە تۆکمـەو رێـك‌و پێکە تایبەتـە بـەخوداوە هـەر ئـەو هەڵیدەسـوڕێنێ، هـەموو کـارو بـارێکی بوونـەوەر کەلەئاسمانـەکان‌و زەوی‌و ناویاندا هەیە، رۆژی قیامەت ئاکامەکەی بۆ لای خـوا بـەرز دەبێتـەوە، سـەرەنجامی هەموو شتێك بۆ لای ئەوەو ئەو بڕیاری یەکالاکەرەوە دەربارەیان دەردەکا.

ئەندازەی ماوەی رۆژی قیامـەت هـەزار سـاڵی تـەواوە لـەو رۆژو مانگانـەی ئێمـە لەژیانی دونیادا حیسابیان پێ دەکەین.

مەبەست بەهـەزار سـاڵ لەئایەتەکـەدا مـاوەی دورو درێـژە، لـەزمانی عـەرەبی‌دا ئەو ژمارە زۆرترین‌و درێژترین ژمایەکی بەکارهاتووبووە.

لەشوێنێکی تردا پەروەردگار وەصفی ئـەو رۆژەی کـردوە بەپـەنجا هـەزار سـاڵ: دەفـەرموێ: ﴿فِـي يَـوْمٍ كَـانَ مِقْـدَارُهُ خَمْـسِينَ أَلْـفَ سَـنَةٍ﴾ (المعـارج: ٤) قـورطوبـی دەفەرموێ: ئەمە مانای وایە رۆژەکە هێنـدە سامناك‌و تەنگانەیـە لەسـەر کافرەکان بەئەندازەی پەنجا هەزار ساڵ دەبێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: عەرەب رۆژی تـەنگانە بەدرێژی وەصف دەکـاو رۆژی شادیی بەکورت‌و کەمخایەن.

هەنـدێکی تـر پێیـان وایـە قیامـەت ڕۆژی وای تێدایـە بەئەنـدازەی هـەزار سـاڵ درێژە، هی وایشی تێدایە بەئەندازەی پەنجا هەزار ساڵە.[1]

تەعبیرەکە: کە دەفـەرموێ: ﴿يُـدَبِّرُ الأَمْـرَ مِـنْ الـسَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ﴾ دیمەنەکـە لەذیهنی ئـادەمیزاد نزیـك دەکاتـەوە، ئـەگینا مـەودای تـەدبیرو بـەڕێوەبردنی خـودا لەمەودای ئاسمانەکانو زەوی بەرفراوانترە، وەلـێ هەسـتی ئـادەمیزاد بەسـیەتی کـە لەبەرامبـەر ئـەو مەجالـە فراوانـەدا بوەسـتێو سـەرنج بداتـە بەشـێك لـەدیاردەی بەڕێوەچوونی ئاسمانەکانو زەوی.

﴿ذَلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالـشَّهَادَةِ الْعَزِيـزُ الـرَّحِيمُ﴾ هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبـەری ئـەم هەموو شتانەی ناو بوونەوەر بەئاشکراو بەنهێنییەوە، هەرچی لەبەرچاوەو لەبـەر چاو نیە، ئەوەی بەدڵدا رادەبـوورێو ئـادەمیزاد تەصـەوری دەکـا، یـان بەخـەیاڵیش پـەی پـێ نابـا، لەوانـەش نهێنـی تـرو بـەرفراوانتر لـەلای خـودا عـەیانو نمایانـەو بەوپـەڕی زانیـاریو ئاگادارییـەوە کـۆنترۆڵی کـردونو کاتێـك نـەبوە نـەیانزانێ، باڵادەستو خاوەن دەسەڵاتە، هەموو شتێك گەردنکەچیەتی، بەویستی ئەو دەگەڕێ، خـاوەن هێـزو توانایـە بەتونـدی تۆڵـەی لـەکافرو هاوەڵدانـەران دەسـتێنێ، سـزای بەئێشو سامناکە بـۆ ئەوانـەی پـەیامی پێغەمبـەرەکانی رەت دەکەنـەوە، بـەرەحمو خاوەن بـەزەییـە بـۆ بەنـدە راسـتاڵە موسوڵمانە تۆبـەکارەکانی ئەوانـەی ئیمانیـان هێناوەو کردەوەی باشیش ئەنجام دەدەن، رەحمیـان پـێ دەکـا رێگـای راسـت دەگرنـە بەر بۆ بەڕێوەبردنی کاری دونیاو بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەتیان.

ئەمجار دوای بەیانکردنو چەسپاندنی تاكو تەنهایی خوداو رانواندنی بەڵگـەی جـۆراو جـۆر لەبوونـەوەر بەئاسمانـەکانو زەوییـەوە. بەڵگـەی لـەخودی ئـادەمیزاد دێنێتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿الَّـذِي أَحْـسَنَ كُـلَّ شَـيْءٍ خَلَقَـهُ﴾ ئـەو بەڕێوەبـەرو هەڵسوڕێنەرە زاناو بەتوانایە ئەو خودایەیە: کە هـەموو شـتێکی بـەجوانی دروست

[1] تەفسیری قورطوبی (ج٧/٣٩٧٩).

کـردوه، لەهـەر شـتێك بڕوانـێ هـەر لـەذرەوە تـا مەجـەرە، دەبینـێ بـەرێكو پێكـی بەدیهێناون، دەست ڕەنگینییان پێوە دیارە.

﴿وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ﴾ پەروەردگار سەرەتا بـاوكی ئـادەمیزاد كە ئادەمـە لـەقوڕ دروسـتی كـردوە، قـوڕیش بریتییـە لـەئاوو گـڵ، هـەر بۆیەشـە ئـادەمیزاد لەپێكهاتەو بەردەوام بـوونی ژیـانیدا پـشت بـەئاوو گڵ دەبەسـتێ، چـونكە (مـەنی) لەخواردەمەنی پەیدا دەبێ، خواردەمەنیش یان لـەئاژەڵو پەلـەوەرەوە لەدانەوێڵەو بەروبومی درەختە، هەموو ئەوانەش بەشێكی زۆری سەرچاوەیان گڵ ئاوە.

﴿ثُـمَّ جَعَـلَ نَـسْلَهُ مِـنْ سُـلالَةٍ مِـنْ مَـاءٍ مَهِـينٍ﴾ پاشـان خـودا وای دانـاوەو وای ڕەخساندوە: كە ذرۆێتی ئادەمیزاد بەهۆی تێكـەڵبوونی ئـاوی پیـاو (مـەنی) بـەئاوی ئافرەت كە هێلكۆكەی تێدایەو پێكەوە متوربـە دەبـنو زاوو زێ دەكـەن، بـەم شـێوە گـەرای ئـادەمیزاد درێـژە بـەژیانی دەداو ژمارەیـان زۆر دەبـێو بـەجیهاندا بـڵاو دەبنـەوە ﴿ثُمَّ سَوَّاهُ﴾ پـاش ئـەوەی بابـە گـەورەی ئـادەمیزادی لـەگڵ دروسـت كـردو جەستەی ڕێك خست، ئەندامەكانی جەستەی ڕێك خـستن ﴿وَنَفَخَ فِيـهِ مِـنْ رُوحِـهِ﴾ گیانی بە بەرەدا كردو ئەو گیانەی تایبەتـە بـەخودا خۆیـەوەو جگـە لـەخودا كـەس حەقیقەتی نازانێ، ئیتر لەئاكامی ئەو گیان بەبەرداكردنەدا جـمو جۆڵی پێكـەوتو نەش‌ونمای تێكەوتو هەستو شعووری تێدا پەیدا بوو، دەرگای زانیاری لێ كرایـەوە، ئـەو ئـادەمیزادە سەرسـوڕهێنـەرەی لـێ كەوتـەوە. ﴿وَجَعَـلَ لَكُـمْ الـسَّمْعَ وَالأَبْـصَارَ وَالأَفْئِدَةَ﴾ ئەوەتا خودا گوێچكەی پێداون بۆ بیستنو چاوی پێ بەخشیون بۆ دیـتن، عـەقڵو بـیرو هۆشـی پێـدان بـۆ جیـا كردنـەوەی چـاكو خـراپو حـەقو بـەتاڵ لەیەكتری!

﴿قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾ وەلـێ ئێوەی ئادەمیزاد سپڵەو پێ نەزانن، لەبەرامبەر ئەو هـەموو نیعمەتانـەی پێتـان بەخـشراوە بەكـەمی نـەبێ سوپاسـی خـودا ناكـەن،

ئەندامەکانی جەستەتان لەو شتانەدا بەکار ناهێنن کە پێویستە تێیاندا بەکار بهێندرێن.

## چەسپاندنی هاتنی قیامەتو زیندوبوونەوەو حاڵو وەزعی کافرەکان لەو ڕۆژەدا

﴿ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ١٠ ۞قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ١١ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ١٢ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ١٣ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمۡۖ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٤ ﴾

وەکوو ئاشکراو نمایانە بنەما سەرەکییەکانی عەقیدە سێ شتن: ئیمان بەخودا ئیمان بە پێغەمبەرایەتی، ئیمان بەزیندوبوونەوە. قورئانی پیرۆزیش بەزۆری

جەخت لەسەر ئەم سێ بنەمایانە دەکاتەوە، جا کە لەوەپێش باسی یەکتاپەرستی کردو بەڵگەی لەسەر تاكو تەنهایی خودا هێنایەوە فەرموی: ﴿اللَّـهُ الَّـذِي خَلَـقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ ئامـاژەی بـۆ پێغەمبەرایـەتی حـەزرەتی موحەممـەد کـردو فـەرمووی: ﴿لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّـن قَبْلِـكَ﴾ ئـەمجار لێرەدا باسـی قیامـەت دەکاو بەڵگە لەسەر رابوونی دێنێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَئِذَا ضَلَلْنَا فِي الْأَرْضِ أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيـدٍ﴾ ئایەتەکە دیـدو بۆچونی موشریکەکان رادەنوێنێو لێیانـەوە دەگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: موشـریکەکان دەیانگوت: ئایا ئەگەر ئێمە مردینو جەستەمان رزیو بوینـەوە بـەگڵو خـۆڵ تـازە جارێکی تر زیندو دەبینەوە، رێی تێدەچێو دەگونجێ پاش ئەو رزینو پۆڵکانە سەر لەنوێ جارێکی دی ئێمە زیندو بکرێینەوە؟؟

بێگومـان ئـەوان زینـدوبوونـەوەیان بـەدوور دەزانـیو ئـەم بـەدوور زانینەشـیان لەوەوە سەری هەڵدابوو: کە قیاسی قـودرەتی خودایـان بەدەسـەڵاتو توانـای خۆیـان مەزنـدە دەکـرد، وایانـدەزانی چـونکە ئـەو شـتە بـەخۆیان نـاکرێ خـوداش ناتوانـێ ئەنجامی بدا!! بێ ئاگابوون لەوەی کە ئەو خودایـەی ئـەوانو بوونـەوەری لەنـەبوەوە هێناوەتـە وجـوود دەتوانـێ بـەبێ مانـدوبوون جـارێکی تـر پـاش مـردنو رزیـنو بوونەوەیان بەگڵو خۆڵ سەرلەنوێ زیندوویان بکاتەوە. چونکە خودا هـەر کـارێکی ویست بیکا هەر ئەوەندەیە پێی دەفەرموێ: ببە ئیتر دەبێ.

﴿بَلْ هُمْ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ كَافِرُونَ﴾ واتە: ئەو موشریکانە هەر بەوەندەوە نەوەستاون: کە ئینکاری قودرەتی خودا بکەن لەسـەر بـەجێهێنانی ویستەکانیو بـەس، بـەڵکوو ئەوانـە ئینکـاری زیندوبوونـەوەو گەڕانـەوەیان بـۆ لای خـودا بـۆ حیـسابو کیتـابو وەرگرتنەوەی پاداشو سزا دەکەن!!

ئەوانـە لەبـەر نـەفامی خۆیـان بـەدووری دەزانـن: کـە دوای مـردنو رزیـنو تێکـەڵاوبوونی جەسـتەیان بـەخاکی زەوی جـارێکی تـر زیندوبکرێنـەوە، دەی ئـەوە

کەی بەنیسبەت قودرەتی خوداوە جێگای سەرسوڕمانە! خۆ زیندوکردنەوە زۆر لەدروستکردنی سەرەتاو لەنەبوەوە ئاسانترە، هەر چەندە بۆ خودا هەموو کارێك چون یەکە. پەروەردگار ئەوانی لەخاك دروست کردوە، لەو خاکەی ئەوان بەلایانەوە دوورە ئەگەر جەستەی رزیویان تێکەڵی بوو جارێکی تر زیندو بکرێنەوە، دەبوایە هەرگیز ئەوان ئەم سەرسوڕمانە رویان تێ نەکا، خۆ دروستکردنەوەو زیندوکردنەوەی رۆژی قیامەت دەق دەشوبهێتە دروستکردنو گیان بەبەرداکردنی جاری یەکەم، ئەمەش هیچ غەرابەتێکی تێدا نیە. وەلێ ئەوان بڕوایان بەگەیشتنەوە بەخودا نیە، ئەم کوفرو بێ بڕواییانە: کە وای لێ کردون ئینکاری ئەو حەقیقەتە بکەنو بڕوایان وابێ کارێك: کە جارێك ئەنجام درا جارێکی تر ئەنجام نادرێتەوە؟!

﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکە نەفامانە بڵێ: فریشتەی گیان کێشان بەفەرمانی خودا لەکاتی تەواوبوونی تەمەنی دیاریکراوتان گیانتان دەکێشێ! ئەمجار ئەم فریشتە چۆنەو چۆن گیانەکان دەکێشێ؟ لەراستیدا ئەوە نهێنییەکە لەنهێنییەکانی خوداو لەم سەرچاوە راستەوە وەری دەگرینو بەچاوی خۆشمان ئاسارەکەی دەبینین، ئیتر بڕوایان پێیەتیو لەوەزیاتر چێ لێ نالێین.

﴿ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ پاشان ئێوە دوای مردنو دونیا وێرانبوون زیندودەکرێنەوەو بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە. حیسابو لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکاو سزاو پاداشتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەداتەوە.

ئەمە وێڕای هەڕەشە لەبێ باوەڕان بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر هاتنی قیامەتو بەیانکردنی ئەو حەقیقەتەیە: کە سێك بتوانێ یەکەمجار ئادەمیزاد لەنەبووەوە دروست بکا دەتوانێ دوای مردنو رزینی جەستەیان سەرلەنوێ دروستیان بکاتەوە.

ئـەمجار بەبۆنـەی باسـی ئـەو قیامەتـەی گومانیـان لـەهاتنیـدا هەیـە، دیمـەنێك لەدیمەنـەكانی قیامـەت نمـایش دەكـاو حـاڵو وەزعـی كـافرو موشـریكەكانی تێـدا رادەنوێنێ، دیمەنێكە پـڕە لـەجمو جۆڵو حیـوارو ئاخـاوتن، هـەر دەڵـێی واقیعـەو دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا رُءُوسِهِمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ رَبَّنَـا أَبْـصَرْنَا وَسَـمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحاً إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ ئەگەر تۆ ببینـی ئـەی پێغەمبـەر! لـەو كاتـەدا، كـە كافرەكان لەبەردەم خـودای خۆیـاندا رادەوەستێنـدرێن، سـەری خۆیـان شـۆڕ كـردوە ملكەچو ریسوا بـوو، لەشـەرمانو لەعەیبـەتان نـازانن چ بكـەنو چ بڵێن، ئەگـەر تـۆ حاڵو وەزعی ئەوانە ببینـی دیمـەنێكی سامناكو گـەورەو سـەرنج راكێش دەبینـی، دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێنو دەڵێن: خودایـە زیندوبوونـەوەو حەشـرمان بەچـاوی خۆمان دیتن، تەصدیقو پشتگیریكردنی تۆمان بۆ پێغەمبـەرانت بیست، ئـەوەی: كـە شـكو گومانمـان لـێی هـەبوو پێغەمبـەرانمان تێیـدا بەدرۆخـستەوە لێمـان بـووو بەیەقینو شكو گومانمان دەربارەی نەما. داوات لـێ دەكەین بمانگێڕیەوە بۆ دونیـا، بمانبەرەوە بۆ دونیا ئیتر كردەوەی چاك ئەنجام دەدەین، بیرو باوەڕی راسـتو حـەق پـەیڕەو دەكـەینو وا دەكـەین تۆمـان لـێ رازی بـی، ئێمـە ئێـستا دڵنیـاین لـەتاكو تەنهایی زاتی پاكت، دەزانـین: كە هـەر تـۆ شـیاوی عیبـادەت بـۆ كردنـی، كەسـی تـر شـیاوی خودایـەتی نیـە، دڵنیـابووین كـەوادەی تـۆ بەزیندوبوونـەوەو حیـسابو لێكۆڵینـەوە راسـتەو خیلافـی تێدا نیـە. مرانـدنو زیندوبوونـەوەی گیانلەبـەرانت بەلاوە ئاسانەو هیچ شتێكت لێ عاسی نابێ!

بەڵام پـەروەردگار بـۆ خـۆی دەزانـێ ئەگـەر لەفـەرزێكدا بیـشیان گێڕێتـەوە بـۆ ژیـانی دونیـا، هـەمان هەڵوێـستو بـیرو بـاوەڕی پێـشوویان دەبـێ، پـەیامی خـودا رەتدەكەنەوەو پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنەوە: وەكوو لەشوێنێكی تـردا ئامـاژە بـەوە دەكاو دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى النَّارِ فَقَالُواْ يَا لَيْتَنَا نُـرَدُّ وَلاَ نُكَـذِّبَ بِآيَـاتِ

رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ (الأنعام:٢٧-٢٨).

ئەمجار لێرەدا پێش ئەوەی وەڵامی جەرگبڕو ریسواکەریان بدرێتەوە حەقیقەتێك دەچەسپێنێ: کە ئەو حەقیقەتە هەموو کاتێ رۆڵێکی گرنگی هەیە لەژیانی ئادەمیزاداندا. دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا﴾ ئەگەر بمانویستایە هەموو کەسێك تۆفیق بدەین‌و هیدایەت وەربگرێ کردەوەی چاك ئەنجام بدا، دەمانتوانی بیکەین‌و چ ئەرکێکی تێدا نەبوو، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً﴾ (یونس:٩٩). ئەگەر خودای تۆ بیویستایە هەموو ئادەمیزادی دەخستنە سەر یەك رێگا ئەویش رێگای هیدایەتە، وەکوو چۆن رێگای ژیانی هەموو گیانلەبەرانی بەسروشت کردۆتە یەك رێگاو هەموویان بەسروشت دەزانن چۆن پێداویستی ژیانی خۆیان ئەنجام بدەن. ﴿وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ بەلام حیکمەتی خودا وا هاتووەو داخوازی ئەوە بووە: کە ئەم مەخلووقاتە: کە ئادەمیزادە بیداتە دەست ئیختیاری خۆی، بۆ خۆی بەویستی خۆی رێگای هیدایەت یان رێگای گومرایی بگرێتەبەر. ئەمجار بەهۆی ئەو حیکمەتە خوداییەو ئەو بڕیارە ئەزەلییە خوداییەوە کە داویەتی: کە دەبێ دۆزەخ پڕ بکا لەئادەمیزادو جندۆکە لەوانەی شیاوی دۆزەخن‌و بەویستی خۆیان رێگای گومرایی دەگرن. هەر کەسە بەگوێرەی ئامادەباشی بۆ ئیمانهێنان یان مانەوە لەسەر کوفر، سزاو پاداشی دووارۆژیان وەربگرنەوە.

هەڵبەتە خودا لەهەوەڵەوەو پێش دروستکردنیان زانیویەتی کۆمەڵێك ئادەمیزادو جندۆکە بەویستی خۆیان رێگای دۆزەخ پەیرەو دەکەن‌و سەرەنجامیان چوونە ناو دۆزەخە. جا ئەو کۆمەڵە ستەمکارە: کە بەسەر شۆڕی‌و ریسوایی لای پەروەردگار رانوێندرێن‌و دۆزەخیان بۆ بڕیار دراوە بۆ زێدە لۆمەکردن پێیان

دەگوترێ: ﴿فَذُوقُوا بِمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا﴾ ئەم عەزابە بەئێشە بچێژن بەهۆی ئەوەوە کە لەدونیادا ئەم رۆژەتان لەبیر چوبووەوە، یان لەبیرخۆتان بردبووەوە. خۆتان بۆ ئامادە نەکرد، هەرەشەو تەهدیدی ئایینتان پاشگوێ خست. زیندوبوونەوەو هاتنی ئەم رۆژەتان بەلاوە درۆ بوو، بۆیە ﴿إِنَّا نَسِينَاكُمْ﴾ ئێمەیش لەبیر خۆمانتان دەبەینەوە، پاشگوێتان دەخەین، واتە: واتان مامەڵە لەگەڵ دەکەین وەکوو ئەوە لەبیرمان چوبنەوە، چونکە خودا هیچی لێ گوم نابێ و هیچ شتێکی لەبیر ناچێتەوە.. ئەوە دۆزەخەو تێیدا بمێننەوە، ﴿وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بچێژن عەزابی ئاگر بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە لەتۆڵەی کوفرو بەدرۆ خستنەوەتان بۆ پێغەمبەران و کردەوەی خراپتان. لەئایەتێکی تردا جۆری عەزابەکەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْداً وَلَا شَرَاباً، إِلَّا حَمِيماً وَغَسَّاقاً، جَزَاء وِفَاقاً، إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَاباً، وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّاباً، وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَاباً، فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَاباً﴾ (النبأ: ٢٤-٣٠).

ئیتر سیاقەکە پەردە بەسەر ئەم دیمەنەدا دەداتەوەو کوردی وتەنی (قسەی تەواو یان لەمستێ نراوە) ئەو کەسەی ئەم ئایەتانە دەخوێنێتەوەو تێیان دەفکرێ وا هەست دەکا بەواقیعیو لەبەر چاو لەو شوێنە سامناکەدا ئەو تاوانبارانەی جێ هێشتوون.

## رەوشتی موسوڵمانان لەدونیاداو پاداشیان لای خودا لەقیامەتدا

﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا

رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (١٦) بەزاز لەبیلالەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: ئێمە لەمزگەوتدا دادەنیشتین کۆمەڵێکیش لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەدوای مەغریب نوێژیان دەکرد هەتا نوێژی خەوتنان (عیشا) ئیتر ئایەتی ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ... الآية﴾ نازڵ بوو.

ئیمام (الواحدي النيسابوري) لەمالیکی کوڕی دینارەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پرسیارم لەئەنەسی کوڕی مالیك کرد دەربارەی ئەم ئایەتە ئاخۆ دەربارەی کێ نازڵ بووە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: کۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەشێوانەوە نوێژیان دەکردن تا دواکاتی نوێژی خەوتنان، ئیتر پەروەردگار دەربارەی ئەوان ئەم ئایەتەی نازڵ کردوە، ئەم قسەیە لەقەتادەو عەکرەمەشەوە ریوایەت کراوە!

مەعاذی کوڕی جەبەل ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئایەتی ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ...﴾ فەرمووی: مەبەست بەوە شەونوێژی بەندەکانی خودایە لەسەرتای شەودا.

حەسەنی بەصریو موجاهیدو مالیكو ئەوزاعی فەرموویانە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو تێکۆشەرانە نازڵ بووە: کە شەو رادەبن بۆ نوێژ کردن.

بەڵگە لەسەر راستی ئەم سەبەب نزولە ئەو فەرمودەیە: کە ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو ماجە هەریەکەیان لەسوننەنەکەیدا هەروەها ئیبنو جەریرو ئیبنو مەردەویهی لەمەعاذی کوڕی جەبەلەوە، دەڵێ: رۆژێك لەرۆژانی غەزای تەبوكدا وا رێکەوت لەپێغەمبەر ﷺ نزیك کەوتمەوە، لەتەنیشتیەوە دەرۆیشتم، عەرزیم کرد ئەی رەوانەکراوی خودا شتێکم پێ بڵێ: بچمە بەهەشتەوەو لەئاگر دورم خاتەوە؟ فەرموی: بەراستی پرسیاری شتێکی گەورەت

لێ کردم، هەرچەندە بۆ کەسێك خودا یارمەتی بدا ئاسانەو دەتوانێ ئەنجامی بدا: (تعبد الله ولاتشرك به شيئا، وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت) بەندایەتی بۆ خودا بکەو هاوەڵی بۆ دامەنێ، نوێژەکانت بەرێك و پێکی ئەنجام بدە، زەکاتی ماڵ و سامانت دەربکە، مانگی رەمەزان بەرۆژوبە، حەجی ماڵی خودا بکە، پاشان فەرموی: (ألا أدلك على أبواب الخير؟ الصوم جنة، والصدقة تطفئ الخطيئة وصلاة الرجل في جوف الليل) ئەرێ شارەزای دەرگاکانی خێرو فەرت نەکەم؟ رۆژو مەتاڵەو لەئاگری دۆزەخ دەتپارێزێ، خێرو خێرات تاوان دەکوژێنێتەوە، نوێژ کردن لەناو قەدی شەودا. ئەمجار ئایەتی ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ تا گەییشتە ﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾. پاشان فەرمووی: (ألا أخبرك برأس الأمر وعموده وذروة سنامه؟) ئەرێ خەبەرت نەدەمێ بەجەمسەری کارەکان و تۆپەڵاکی هەموو شتێك؟ منیش وتم: بەڵێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێم بڵێ: فەرموی: (رأس الأمر الأسلام، وعموده الصلاة وذروة سنامة الجهاد في سبيل الله، ثم قال ألا أخبر بملاك ذلك كله؟) سەری شتەکە ئیسلامە، بڕبڕەی پشتی نوێژە، قەڵاقوچکەی پشتیشی جیهاد کردنە لەرێگەی خودادا، ئەمجار فەرمووی: ئایا جەمسەرو تەوەرەی هەموو شتەکانت پێ نەڵێم؟ وتم بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیتر پێغەمبەر ﷺ سەری زمانی خۆی گرت و پاشان فەرموی: (كف عليك هذا) ئاگات لەئەمە بێ وتم: ئەی پێغەمبەری خودا بۆچی ئێمە لەسەر قسە کردنی خۆمان لێ پرسینەوەمان لەسەرە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ثكلتك أمك يامعاذ، وهل يكب الناس في النار على وجوههم الا حصائد ألسنتهم) ئەی مەعاذ دایکت رۆڵەرۆت بۆ بکا، بۆ نازانی ئادەمیزاد کە بەرەودەم دەخرێنە دۆزەخەوە لەئاکامی زمانیان ئەو دەردمیان بەسەر دێ و تووشی ئەو عەزابە دەبن.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەئایەتەکانی پێشەوە لەم رووەیە: لەوەپێش حاڵو وەزعی کافرەکانی بەیان کرد، سەرشۆڕیو دیمەنی ریسواییان لەدەشتی مەحشەردا رانواندو ئەوەی راگەیاند کە ئەو کافرانە بۆ هەتا هەتایە لەدۆزەخدا دەمێننەوە.

ئەمجار لێرەدا حاڵو وەزعی خاوەن باوەڕان لەدونیاو قیامەتدا دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّداً وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ نەوەکوو ئیمان دەهێنێ بەئایاتی ئێمە، بەقورئانو نیشانە کەونییەکان، بەپێغەمبەرانو فریشتەکان، ئیللا ئەوانە ئیمان دەهێنن: کە هەر کاتێ بەو ئایەتانە ئامۆژگاری بکرێنو قورئانیان بۆ بخوێندرێتەوەو گوێ رادەگرنو دڵی خۆیانی بۆ دەکەنەوە، ئیتر بەرەو رو دەکەونە سوژدەو زەلیلیو گەردنکەچی خۆیان بۆ خودا رادەگەیەنن. لەسوژدەکەیاندا خودا بەپاكو بەرز دەگرن لەوەی کە خێزانو منداڵو هاوەڵی هەبێ، حەمدو سوپاسی خودا دەکەن لەسەر نیعمەتە جۆراو جۆرەکانی، تەسبیحو تەحمید دەخەنە پاڵ یەك، واتە: دەڵێن: ﴿سبحان الله وبحمده، سبحان ربي الأعلى﴾ چونکە ئەوان دڵیان بەئیمان بەخوداو بەپێغەمبەرانیو بەهاتنی رۆژی قیامەت ئاوەدانە تەکەببور ناکەن لەبەندایەتیکردن بۆ خوداو شوێنکەوتنی شەریعەتو پابەندبون بەفەرمانو نەهیەکانی. بەپێچەوانەی ئەو موشریکە نەفامانەی: کە پشت هەڵدەکەن لەطاعەتکردن بۆ خودا، ئەوانە خودا سزای بەئێشیان دەدا وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر: ٦٠)

ئەو خاوەن باوەڕانە: کە بەقورئان ئامۆژگاری دەکرێن، ئایاتی قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە هێندە کاریان تێ دەکاو پێی (متأثر) دەبن خێرا رەپەورو دەکەونە سوژدە، لەبەر بەتەعظیم گرتنی ئەو خودایەی بەئایەتەکانی ئامۆژگاری دەکرێن، لەبەر هەستکردن بەشکۆمەندی ئەو خودایەی کە هەر بەسوژدە بۆ بردنو ناوچەوان خستنە سەرزەوی پاساوی دەدرێتەوە، لەبەرامبەر

جەلال‌و شکۆمەندی‌دا جگە لەناوچاوان تۆزاوی کردن‌و سەرخستنە سەر خاك بۆی هیچ ڕێگاچارەیەکی تریان نیە.

ئەوەیە ڕەوشتی موسوڵمانان‌و خوداپەرستان، خوداپەرستی، تەقدیس‌و حەمد کردنی، گەردنکەچی‌و خۆتەسلیم کردنی، بەو شێوە فەرمانبەردارو دڵ پڕ لەخۆف‌و ڕەجان! وێڕای ئەو ڕەوشتانەیان ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفاً وَطَمَعاً﴾ لا تەنیشتیان واتە: جەستەیان بەرز دەبێتەوە لەجێگەی گەرم‌و نەرمی نووستنیان، هەرچەندە جێگاکەیان جاذیبیەت‌و هێزی کێشندەی هەبێ‌و حەزیان لەحەسانەوەو نووستن بێ ئۆقرە ناگرن‌و هەڵدەستن بۆ شەو نوێژو خوداپەرستی بۆ لالانەوەو سکالا کردن لەقاپی پەروەردگاریان، قورسایی‌و خۆشی خەوو ڕاحەت، هەبوونی جێگەی گەرم‌و نەرم‌و ئارام چەندێك بەهێزبن ناتوانن لەهەڵسان بۆ شەونوێژی مەنع بکەن، چونکە ئەو کارێکی تری هەیەو دڵی بۆ شتێکی تر لێ دەدا، حەزو هیوایەکی تری تێدا بەرجەستە بووە، دەیەوێ لەخزمەت خودادا ڕاوەستێ، ڕوبکاتە قاپی پەروەردگاری‌و بەترس‌و هیواوە لێی بپاڕێتەوە، ترسی عەزاب‌و هیوای ڕەحمەتی، ترسی قارو غەزەبی هیوای ڕەزامەندیی‌و لێخۆشبونی خودا، لەناخیا کێبڕکێیانە، بۆیە لەو کاتانەدا کە خەڵك لەشیرین خەودان ئەوان ڕادەبن‌و جەستەیان لەجێگای گەرم‌و نەرم جیا دەبێتەوە بۆ ڕوتێکردن‌و ڕاوەستان لەخزمەت پەروەردگاریاندا، دڵیان لەوەی: کە قازانج‌و زیانیان لەدونیاو قیامەتدا بەرزیی‌و نزمییان، خۆشی‌و ناخۆشییان، پایەو مایەیان لەهەردو جیهاندا بەدەست خودایەو بەس! لەترسی عەزابی سەختی دڵیان دەلەرزێ، بەهیوای نازو نیعمەتی خەریکن باڵ بگرن، ئەمجار وێڕای ئەم هەستە ناسك‌و دڵە پڕ هیواو ترسەیان، سەرباری پاڕانەوەو لالانەوەیان، لەتەك نوێژو سوژدەو خودا پەرستیاندا، ئەرکی سەرشانی خۆیان بەرامبەر کۆمەڵ ئەنجام دەدەن بەم جۆرە ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەو ڕزق‌و ڕۆزییەی پێمان داون دەبەخشن، زەکاتی ماڵ‌و سامانی خۆیان

دەردەکەن، ئادەمیزادانی تر فێری زانینو زانیاری دەکەن، ڕێگای خێرو خۆشی ژیان بۆ خەڵکی ڕون دەکەنەوە.

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود لەئیبنو مەسعودەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: پەروەردگارمان لەدوو کەس عەجباتی دێ: پیاوێك لەناو نوێنو شوێن خەوتنیدا هەڵستێ، ژنو ماڵی خۆی واز لێ بێنێ بۆ شەو نوێژ بەهیوای پاداشی منو لەترسی عەزابی من خەوو دەستەملان واز لێ بێنێ. پیاوێکیش لەرێگەی خودادا غەزا بکا خۆیو تاقمەکەی بشکێنو هەڵێن. دوایی بەخۆیدا بچێتەوەو بزانێ هەڵاتن چەند تاوانەو گەڕانەوە بۆ سەر دوژمن چەند خێرو چاکە، ئیتر بگەڕێتەوە بۆ سەر دوژمنو شەڕ بکا تا خوێنی دەڕژێ لەپیناو ڕەزامەندی مندا ترسان لەسەرپێچیکردنی فەرمانی من!! پەروەردگار بەفریشتەکان دەفەرموێ: سەیری بەندەی من بکەن لەبەر خاتری من بەهیوای پاداشو لەترسی سزای من گەڕایەوە شەڕی کرد تا خوێنی ڕژا!!

ثەعلەبی (بەمەرفوعی) فەرمودەیەکی لەئەسمای کچی یەزیدەوە ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێك: کە خودا لەرۆژی قیامەتدا هەموو ئادەمیزادان کۆ دەکاتەوە، بانگکەرێك دێ بانگ دەکا بەدەنگێك هەموو مەخلووقات دەیبیسنو خەڵکەکە دەزانن کێ شیاوی ڕێز لێگرتنە، پاشان جارێکی تر بانگ هەڵدەداتەوەو دەڵێ: با ئەوانەی هەڵساون بۆ شەو نوێژو جەستەیان لەجێگای گەرمو نەرم جیا دەبوەوە، با ئێستا هەڵسنو خۆیان جیا بکەنەوە، هەڵدەستنو کەمن: ئەمجار جارێکی تر بانگ هەڵدەداتەوەو دەڵێ: با ئەوانەی حەمدو ثەنای خودایان کردوە لەخۆشیو ناخۆشیدا با جیاببنەوەو هەستنە سەرپێ، هەڵدەستنو کەمن، ئەمانە بەرەو بەهەشت بەرێ دەکرێنو ئەمجار باقی ئادەمیزادان حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.

ئەمجار پەروەردگار پاداشی ئەو موسوڵمانانە بەیان دەکا: کە لەوەپێش وەصفی کردن، دەفەرموێ: ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾

هیچ کەس لەفریشتەو پێغەمبەرانو ئادەمیزادانی تریش نازانێ چ پاداشو نازو نیعمەتێکیان بۆ دانراوە، ئەوەی بۆ ئەوان بڕیاردراوە هێندە گەورەو نایابو بەنرخە کەس نەیدیوەو نازانێ چیەو چۆنە، ئەمەش پاداشی ئەو کردەوە باشانەیانە: کە لەدونیادا ئەنجامیان داون بەنهێنیو بێ ریابازیی بۆیە خودا ئەو نازو نیعمەتە کەس نەدیتوەی بۆ بڕیار داون. پاداشێکیان دەداتەوە چاویان پێی فێنك بێتەوە، پاداشێك جگە لەخودا کەس نازانێ چیەو کەس نەیدیوە! نیعمەتێکە خودا لای خۆی پەنهانی کردوە تا ئەو رۆژەی بەخزمەت پەروەردگاریان دەگەنەوە کەس نایبینێ، ئالەو رۆژەدا پێشکەشیان دەکرێو پێی بەهرەمەند دەبن!

ئەی خودایە! کە خودایەکی خاوەن فەضلو کەرەمی چەند خاوەن بەخششی بەسەر بەندەکانتدا؛ چۆن بەفەضلو نیعمەتی خۆت دایاندەپۆشی، دەبێ ئەو بەندانە کێ بنو چی بن زاتی پاکت ئەو پاداشەیان بۆ پەزەمەندە دەکەی؟

بوخاریو موسلیمو تیرمیذی لەئەبو هوریرەوە فەرمودەیەکی قودسی ریوایەت دەکەن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قال الله تعالى: أعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت، ولا خطر على قلب بشر) خودا فەرمویەتی پاداشێکم بۆ بەندە صاڵحەکانم ئامادە کردوە هیچ چاوێك نەی بینیوە، هیچ گوێیەك نەی بیستووە، بەخەیاڵیش بەسەر دڵی ئادەمیزاددا تێنەپەڕیوە. ئەبو هورەیرە (کە راوی حەدیثەکەیە) دەفەرموێ: ئەگەر حەزتان لێیە ئایەتی ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ﴾ بخوێننەوە!

## پاداشی موسوڵمانانو سزای بێدینەکان

﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ

ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

لەبەردەم دیمەنی شپرێوی تاوانبارەكانو دیمەنی موسوڵمانە خوداپێداوە خاوەن پاداشەكان، تەعقیبێكی كورت دەربارەی یاسای پاداشو سزای دادپەروەرانە دەهێنێو دەفەرموێ: ﴿أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِناً كَمَنْ كَانَ فَاسِقاً لا يَسْتَوُونَ﴾ ئایا كەسێك بڕوای بەخوداو بەپێغەمبەری خودا بێ، پابەندی فەرمانو حەڵەوگیریەكانی پەروەردگاری بێ، یەكسانە لەگەڵ كەسێك بێ بڕوابێو سەرپێچی فەرمانی خودا بكاو پێغەمبەر بەدرۆ بخاتەوە؟ بێگومان یەكسان نینو ڕۆژی قیامەت حیسابو لێكۆڵینەوەیان جودایە، پاداشو سزایان وەكوو یەك نیە!

نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێكی تره وەكوو ئەوە: كە دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ (الحشر: ٢٠) یان دەفەرموێ: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ (ص:٢٨).

موسوڵمانان و بێ بڕوایان یەکسان نین لەهەست و شعوردا، لەهەڵس وکەوتدا، لەبیروباوەڕو کردەوەو گوفتاردا، ئەدی لەپاداش و سزادا ڕۆژی قیامەت یەکسان دەبن؟ نەخەیر یەکسان نابن و ناگونجێ یەکسان بن.

**ئەمجار پەروەردگار پاداش و سزای هەردوو تاقم دیاری دەکاو دەفەرموێ:**

١- ﴿أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلاً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانەی ئیمانیان بەخوداو بەپێغەمبەری خوداو بەزیندوبوونەوە هەبوە، وێڕای ئیمانی ڕاست و پتەویان کردەوەی باشیان ئەنجام داوە ئەوە بۆ ئەوان باخ و باخاتی جوان ڕازاوەی بەهەشت هەیە. قەصرو باڵەخانەی بەرزو خۆشیان تێدان، شوێنی حەوانەوەو ژیان تێدا بەسەربردنن، ئەمەش پاداش و ڕێز لێنانە بۆیان لەسەر کردەوەی جوان و هەڵوێستی جوانمێرانەیان لەژیانی دونیادا، ئەو شوێنە خۆش و خانو باڵەخانانەیان بەملکیەت دەدرێتێ!

٢- ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ بەڵام ئەوانەی فاسق و کافربوون بەخوداو لەخودا یاخی بوون، وێڕای کوفرو بێدینیان کردەوەی ناشیرینییان ئەنجام داون، ئەو شوێنی حەوانەوەیان لەقیامەتدا شوێنی حەوانەیان ئاگری دۆزەخەو تێیدا نیشتەجێ دەبن و بۆ هەتا هەتایە لەوێدا دەمێننەوە. ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا﴾ هەر کاتێ ئازاری سەخت و بەئێش وایان لێ بکا پەلەی هاتنە دەرەوەو دەرچوون لەناو دۆزەخ بکەن، فڕێ دەدرێنەوە بۆ ناو ئاگرو هەوڵەکەیان بێهودە دەبێ، نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا﴾ (الحج:٢٢).

فەضیلی کوڕی عییان دەڵێ: بەخودا ئەوانە دەستیان کەلەبچە کراوەو قاچیان لەپێوەندایە، بڵێسەی ئاگر بەرزیان دەکاتەوەو فریشتە بەچەکوچی ئاگرین دەیانخەنەوە ناوی!

ئەمجار بۆ زێدە تەعذیبو لۆمەو هەڕەشە ﴿وَقِيلَ لَهُمْ﴾ پێیان گوترا، واتە: پێیان دەگوترێ: ﴿ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ بچێژن عەزابی ئەو ئاگرەی لەدونیادا بڕواتان پێی نەبوو، دەتانگوت زیندوبوونەوە نیەو حیسابو لێکۆڵینەوە درۆیەو پاداشو سزا نابن!

ئەوەیە ئاکامو سەرەنجامی موشریکەکان لەرۆژی قیامەتدا، لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ ئەوان تا رۆژی قیامەت وازیان لێ بهێندرێ بەڵکوو ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بێگومان پێش ئەو عەزابە گەورەو سامناکە، عەزابی کەمو نزیك: کە عەزابی دونیایە پێیان دەچێژین، توشی دەردو بەڵاو قاتو قڕیو کارەساتیان دەکەین نەخۆشیو کوشتنو بڕینیان بەسەردا دەهێنین، بومەلەرزەو لافاوو زریانو هەورە تریشقەیان لێ دەدەین، بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو لەگومڕایی خۆیان پاشگەز ببنەوە، تۆبە بکەنو ئیمان بهێنو شوێن پەیامی پێغەمبەری ئیسلام بکەون!

بێگومان سێبەری رەحمەتی خودا لەپشت ئەم عەزابە نزیکە کەمەوەیە، خودا بۆیە ئەو عەزابەیان دەدا تا توشی عەزابی سەختو دژواری دۆزەخ نەبن، هەرگیز خودا نایەوێ بەندەکانی بەو ئاگرە بێ ئامانە سزا بدا، ئەگەر بۆخۆیان بەویستی خۆیان خۆیان وا لێ نەکەن شیاوی بن، ئەوەتا هەڕەشەیان لێ دەکا بەعەزابی دونیا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوەو ئیمان بهێنن. هەڕەشەیان لێ دەکاو عەزابی دونیایاندەدا بۆ ئەوەی سروشتیان بەئاگا بێتەوەو ئازاری عەزاب لەگومڕایی بیانگێڕێتەوە.

ئەمجار پەروەردگار هۆکارێکی گشتی باس دەکا کە دەبێتە هۆی سزادانیان، دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنْتَقِمُونَ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە؟ واتە کەس لەو کەسە ستەمکارتر نیە، کە خودا بەئایاتی قورئانو موعجیزەی پێغەمبەرەکەی هۆشیاری کردۆتەوە پەندو ئامۆژگاری بۆ ناردوە رێگای حەقو بەتاڵی بۆ دیاری کردوە، کەچی روی لێ

وەرگێڕاوەو ئینکاری کردوە، پاشگوێی خستووەو لەبیرخۆی بردۆتەوە، بێگومان ئێمە توندترین سزا لەتاوانباران دەسێنین، تۆڵە لەو کافرە تاوانبارانە دەسێنینەوەو ناهێڵین بەسەریانەوە بچێ.

## پەیوەندی نێوان پەیامی پێغەمبەری ئیسلامو حەزرەتی موسا

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾

لەوەپێش لەسەرەتای سورەتەکەدا سێ بنەماسەرەکییەکەی ئیسلامی چەسپاندن کە بریتی بوون: لە(تەوحیدو زیندوبوونەوەو پێغەمبەرایەتی) جارێکی تر گەڕایەوە بۆ سەر بنەمای سێیەم کە پێغەمبەرایەتی حەزرەت موحەممەدە ﷺ ئەمجار ئاماژە بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موسا دەکا، هەردوو پێغەمبەرایەتیەکان لێك دەبەستێ ئەوە رادەگەیەنێ کە پەروەردگار نامەی ئاسمانی ناردوەو کردویەتی بەهۆی هیدایەت بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، وەکوو چۆن قورئانی کردوە بەهیدایەت بۆ نەتەوەی موسوڵمان.

ئەمجار ئەوە دەچەسپێنێ: کە پێغەمبەری ئیسلامو پێغەمبەری نەتەوەی ئیسرائیل لەبنەمای عەقیدەو ئاییندا یەك دەگرنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا

مُوسَى الْكِتَابَ فَلا تَكُنْ فِي مِرْيَةٍ مِنْ لِقَائِهِ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ بێگومان تەوراتمان داوە بەموسا، ئەتۆش ئەی موحەممەد هیچ دوو دڵ مەبە لەو قورئانەی بۆت دەنێرین، چۆن کیتابمان بۆ تۆ رەوانە کردوە، ئاوایش کیتابمان بۆ موسا ناردوە، ئەتۆ شتێکی تازەقەڵاو نامۆنی لەناو پێغەمبەراندا، زۆر ئادەمیزادی تر پێش تۆ کردومانن بەپێغەمبەرو کیتابو شەریعەتو زانیاریمان پێ بەخشیون. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِّنْ الرُّسُلِ﴾ (الأحقاف:٩) پەیوەندی نێوان پێغەمبەرایەتی ئەتۆو موسا بەهێزە، ئەرکی سەرشانت یەکە، تەورات: کە نامەی ئاسمانییەو بۆ موسامان ناردوە. هیدایەتو رێنمویی بوو بۆ نەتەوەی ئیسرائیل، وەکوو چۆن تۆ قورئانت بۆ دێ‌و هیدایەتە بۆ نەتەوەکەت. قورئان داوای یەکتاپەرستی دەکاو تەوراتیش هەمان پەیامی هەبوو، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَآتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ أَلاَّ تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلاً﴾ (الإسراء:٢).

مەبەستی ئایەتەکە هەڵنانی یەهودە بۆ ئەوەی ئیمان بەپێغەمبەری ئیسلام بهێنن، هەروەها هەڵنانی موشریکەکانو خەڵکی تریشی تێدایە بۆ ئیمانهێنان، چونکە لێك چونی پەیامەکانو ناوەرۆکیان ئاشکراو نمایانەو کەوابوو پێویستە چی زووە ئیمانی پێ بێنن!

لەهەمان کاتدا دڵدانەوەی پێغەمبەری تێدایە، بۆ ئەوەی خەفەت نەخوا: کە قورەیشییەکان بەدرۆی دەخەنەوەو پشت لەپەیامەکەی هەڵدەکەن، چونکە ئەوەتا موسا ﷺ وێرای ئەوەی: کە پەیامی هیدایەتی بۆ گەلەکەی هێنابوو جۆرەها پەڵپو بیانوویان پێ گرت؛ دەمێك وتیان: ﴿أَرِنَا اللّهِ جَهْرَةً﴾ (النساء:١٥٣) چاخێك پێیان گوت: ﴿فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ﴾ (المائدة:٢٤) هەروەها جۆرەها پەڵپو بیانووی تر...

﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾ ئێمە لەنەتەوەی ئیسرائیل پێشەواو سەرکردەمان رەخساندن بەپشتیوانیو ئیزنی ئێمە بانگەوازیی نەتەوەکەیان کرد بۆ ئیمانهێنانو کردەوەی باشو رەوشتی بەرز، ئەمەش بەهۆی بەردەوامبوونیان لەسەر خوداپەرستیو پشتگیریکردنی پێغەمبەرەکانیان، صەبرو ئارامییان لەسەر ئەو هەموو ئەیەتو نارەحەتیەی لەدونیادا تووشیان بوو بەدەست فیرعەونو داروودەستەکەیەوە. ئەوانە بڕوای تەواویان بەو ئایاتو نیشانە هەبوو کە بەڵگەی تاكو تەنهایی ئێمە بوو.

ئەمەش رەهنومایی موسوڵمانان بوو لەو کاتەدا: کە لەمەککەبوونو کەمینەبوون، رەهنوماییان دەکا بۆ خۆگرىو پشوو درێژی لەبەردەم ئەو ئەزیەتو نارەحەتیەی لەموشریکەکانەوە تووشیان دەهات. هانیان دەدا بۆ ئەوەی ئەوانیش وەکوو خوداپەرستە هەڵبژاردەکانی نەتەوەی ئیسرائیل بیرو باوەڕی خۆیان بەخودا بەهێز بکەن، تا لەئاکامدا پێشەواو سەرکردەیان لێ هەڵبکەون. لەهەمان کاتدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە رێبازی پێشەوایەتیو سەرکردایەتی بەصەبرو یەقین دەستەبەر دەبێ.

﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان خودای تۆ ئەی موحەممەد! رۆژی قیامەت حوکمو بڕیاری راستو دروست لەنێوان بەندەکانی دەردەکا، کێشەو نیزاعیان یەکالا دەکاتەوە، حیسابو کیتابیان لەگەڵ دەکا، پاداشو سزای هەموو کەسێك بەگوێرەیکردەوەکانیان دەداتەوە، پاداشی خوداپەرستان بەهەشتی جوانو رازاوەو سزای یاخی بوان ئاگری دۆزەخە.

ئایەتەکە هەڵنانی ئادەمیزادی تێدایە بۆ پەیڕەوکردنی بیرو باوەڕی راستو کردەوەی چاك، لەهەمان کاتدا هەڕەشەیە لەوانەی رو لەئایینی خودا وەردەگێڕنو پەیامی قورئان رەت دەکەنەوە!!

## تاكو تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی لەسەر زیندوكردنەوە

﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لَا يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَانتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

ئەم كۆمەڵە ئایەتە تەئكید كردنەوەی چەسپاندنی تەوحیدو زیندوبوونەوەیە كە دوو بنەمان لەبنەما سەرەكییەكانی عەقیدەیەو جەختكردنەوەی تاكو تەنهایی پەروەردگارە، بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ئەو بنەما سەرەكییەو چەسپاندنی دەسەڵاتو قودرەتی خودایە لەسەر هەموو شتێك، ئەمجار دووبارەكردنەوەی باسی حەشرو زیندوبوونەوەیە، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ أَفَلا يَسْمَعُونَ﴾ ئایا بۆ ئەو موشریكو سەررەقە بەدرۆ خەرەوانە دەرنەكەوتوەو ئاشكرا نەبوە ئێمە چەند گەلو نەتەوەمان لەچاخە پێشینەكاندا لەناو بردون؟ نازانن ئێمە چەندان گەلو نەتەوەمان بەهۆی سەرپێچی فەرمانی خوداو رەتكردنەوەیان بۆ پەیامی

پێغەمبەرانیان قەڵاچۆ کردوە؟ ئێستا ئەوانەی تۆ بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامەکەت رەت دەکەنەوە لەسەفەرو هاتوچۆیاندا بەسەر شوێنەوارو کەلاوەی ئەو نەتەوە لەناوچوانەدا دێنو دەڕۆن، بەچاوی خۆیان دیمەنی شارو گوندی وێرانبووی گەلی عادو ثەمودو قەومی لوط دەبینن.

لەناوچوونی نەتەوە پێشینەکانی چاخەکانی رابوردو بەزمانی حاڵ سوننەتی خودا دەربارەی موشریكو ئەوانەی پەیامی پێغەمبەرانیان رەت کردۆتەوە، شەرح دەکا ئەوە دەچەسپێنێ: کە دابو نەرێتی خودا بەردەوامەو هیچ شتێك نیە بتوانێ رایگرێو گۆڕانکاری تێدا بکا.

ئەم ئادەمیزادە لەپەیدابوونو فەوتانیدا، لەبەهێزیو بێ هێزیدا گەردنکەچی یاساو رێسایەکی ثابیتو نەگۆڕە، قورئانی پیرۆز ئاماژە بەو یاسایانە دەکاو بەردەوامیو نەگۆڕی ئەو یاسایانە دەچەسپێنێ، لەفەوتانو شوێنەوارو کەلاوە کۆنی گەلە پێشینەکان، لەپاشماوەو دیاردەی کەس تێدا نەماویانەوە نمایشگای عیبرەتو پەند لێ وەرگرتن نمایش دەکا، بۆ ئەوەی دڵەکان بەئاگا بێتەوە، هەستەکان بوروژێنو ترسی پەروەردگاریان لەدەروونەدا پەیدا ببێو بترسن لەو بەطشەتو هەڵمەتە سامناکانەی خودا کە ملهوڕو سەرڕەقەکانی رابوردوی پێ لەناو بردوە! پێیان رادەگەیەنێو پێیان دەگەیەنێ کە ئەوە یاساو رێسای پەروەردگارە لەبونەوەردا هەر گەلو نەتەوەیەك ئاوا بکا ئاوای لێ دەکا، بەمەش هەستی ئادەمیزادو پێوەرەکان بەرز دەکاتەوە، ئەوەیان بۆ دەچەسپێنێ: کە هیچ گەلو نەتەوەیەك لەم یاساو رێسایانە بەدەر نیە.

بێگومان شوێنەواری کەس تێدانەماو، وڵاتی وێرانبووی گەلو نەتەوە قەڵاچۆکراوی غەزەب لێگیراو کاریگەریەکی قووڵی هەیە لەسەر هەستی دڵیان، لەسەر هەستی بینا، ناخی ئادەمیزاد دەهەژێنێو دڵ وەلەرزە دێنێو تەزو بەجەستەدا دێنێو خوێن دەوروژێنێ، ئەو عەرەبە موشریکانەی سەرەتا ئەم خیطابەیان ئاراستە کراوە لەسەفەرو کاروانو گەشتو گوزاریان بەسەر شوێنەوارو

کەلاوە کۆنی کەس تێدا نەماوی گەلی عادو ثەموودو قەومی لوطدا بەیانیو ئێوارە هاتوچۆیان دەکرد، ئیتر قورئانی پیرۆز نارەزایی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر ئەو عەرەبانە: کە دەیانبینی ئەوە شوێنەوارو پاشماوەی ئەو گەلە ستەمکارو ملهوڕانەیە: کە سەرپێچی فەرمانی خودایان کردوە، بەو دیمەنە سامناکانە پەند ئامێز نەبوون، ئەو شوێنەوارو کەلاوە کۆنو تێك روخاوو کەس تێدا نەماوانە راینەچڵەکاندونو ترسو خۆفی خودای خاوەن دەسەڵاتو بەهێزو توانای لەدڵو دەروندا نەرسکاندون!! دەبوایە ئەو دیمەنە سامناکانە کاری تێبکردنایە وایان لێ بهاتایە خۆیان لەو ئاکامو سەرەنجامە بپاراستایە.!!

قورئانی پیرۆز لەچەند ئایەتێکدا وێنەی شارو گوندی وێرانبووی گەلی عادو ثەمودو قەومی لوط دەکێشێ: دەفەرموێ: ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزاً﴾ (مريم:٩٨) یان دەفەرموێ: ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا﴾ (هود:٦٨) یان دەفەرموێ: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا﴾ (النمل:٥٢) یان دەفەرموێ: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ﴾ (الحج:٤٥).

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ بێگومان لەفەوتانی ئەو گەلو نەتەوانەدا، لەوێرانکردنی شارو گوندو خانووبەرەیاندا بەهۆی سەرپێچیکردنو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرانو رزگارکردنی خاوەن باوەڕانو شوێنکەوتوانی پێغەمبەران، بەڵگەو نیشانە هەن لەسەر قودرەتو دەسەڵاتی ئێمە، پەندو ئامۆژگاری هەن بۆ کەسێك پەند ئامێز ببێ.

دەی بۆچی پەندو ئامۆژگاری ئێمە نابیسن؟ بۆچی چیرۆکی ئەو گەلە لەناوبراوانە نابیسن؟ بیستنێك سوودی لێ وەربگرنو پەندئامێز بن!

ئەمجار دوا بەدوای رانواندنی دەسەڵاتی پەروەردگار لەسەر فەوتاندنو مراندنو وێرانکردن، باسی دەسەڵاتی دەکا لەسەر زیندو کردنەوە، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ

وَأَنفُسُهُمْ أَفَلا يُبْصِرُونَ ؟﴾ ئایا ئەو عەرەبە موشریكانەو هەموو ئەوانەی بڕوایان بەزیندوبوونەوە نیە نابینن ئێمە چەند بەتواناین لەسەر زیندوكردنەوەی مردو، ئەوەتا: ئێمە ئاو كێش دەكەین لەئاسمانەوە یان لەچۆمو جۆگاكانەوە بۆسەر زەوی وشك‌و برینگ‌و سوتەمەرۆ زەوییەكە ئاو دەدەین‌و زیندوی دەكەینەوە كشت‌و كاڵی سەوز لەو زەوییە مردوە دەردێنین‌و دەیكەینە لەوەڕگا، ئاژەڵەكانیان لێی دەڵەوەڕێن، دانەوێڵەو بەروبومو میوەجاتی لێ دەردێنین‌و دەیكەینە خۆراك‌و بژێوی ئادەمیزاد، ئایا بەچاوی خۆیان ئەم دیاردەو حاڵەتە ساڵانەو وەرزانە نابینن، هەتا بزانن: كە ئێمە بەتواناین لەسەر زیندو كردنەوە، چۆن ئەو زەوییە مردوە بەهۆی بارانەوە زیندو دەكەینەوە، هەر بەو جۆرەش دوای مردن‌و دونیا وێرانبوون لەرۆژی قیامەتدا ئادەمیزادەكان زیندو دەكەینەوە.

ئەمجار باسی پرسیاری موشریكەكان دەكا: كە بەشێوەی لاقرتێ‌و گاڵتەكردن بەرۆژی قیامەت‌و پەلە كردن لەهاتنی عەزاب‌و شك‌و گومانیان دەربارەی قیامەت پرسیار ئاڕاستەی پێغەمبەر دەكەن ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْفَتْحُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەو موشریكە نەفامانە بەشێوەی پرسیاری گاڵتەوە دەڵێن: ئەی موحەممەد! كەی ئەو هەڕەشانەی لێمان دەكەی دێنە جێ‌و كەی خودا تۆڵەی تۆمان لێ دەسێنێ؟؟ ئەگەر ئێوە (خۆت‌و هاوەڵانت) ڕاست دەكەن لەهاتنی ئەو هەڕەشانەی لێمان دەكەن لەسەر مانەوەمان لەسەر بیرو باوەڕی بتپەرستی!!

ئیتر پەروەردگار وەڵامێكی جەرگبڕیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لا يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ وَلا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو كافرو بەدرۆخەرەوانە بڵێ: ڕۆژی دەدگایی كردن‌و یەكالاكردنەوەو بڕیاردان لەنێوان ئادەمیزاددا ڕۆژی قیامەتە، ئەو ڕۆژەی: كە ئیمانهێنانی كافرو تۆبەكردنی هیچ سودێكیان نابێ‌و ناشگێڕدرێنەوە بۆ ژیانی دونیا بۆ ئەوەی تۆبە بكەن‌و ئیمان بێنن‌و كردەوەی چاك بكەن. چونكە ئیمانی وەرگیراو پەسندو تۆبەو گەڕانەوە بۆ

لای خـودا لـەژیانی دونیـادا سـودی هەیـە لەقیامـەتدا کـەڵکی نابـێ. کـەوابێ پـەلـە لەهاتنی مەکەن هەردێ‌و ئەو ڕۆژە دەبینن...

﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَانتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ﴾ ئـەی پێغەمبـەر! رویـان لـێ وەرگێـڕەو گـوێ بەهەڵوێـستی ناشـیرین‌و بـەدرۆ خـستنەوەیان مـەدە، بـەردەوامبـە لەسـەر گەیانـدنی پـەیامی خـۆت‌و چاوەڕوانی ئـەو یارمـەتی‌و سـەرکەوتنە بکـە: کـە خـودا وادەی پێ داوی، بێگومان خودا وادەی خۆی دێنێتە جێ‌و بەسەر ناحەزانتدا سەرت دەخا!

ئەتۆ چاوەڕێی یارمەتی خودابە، ئەوانیش چاوەڕوانی سەرکەوتنن بەسەر تۆدا، یـان چـاوەڕوانی مردنـت دەکـەن وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەوە دەکـاو دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ (الطور: ٣٠).

ئـەتۆ چـاوەڕوانبەو بـا ئـەوانیش چـاوەڕوان بـن، لەوەبـەولاوە دەبینـی چـییان بەسـەردێ، بێگومـان ئەمـە هەڕەشـەیەکی پەنامەکییـەو داوا دەکـا پێغەمبـەر ﷺ دەستیان لـێ بشواو چاوەڕوانی سەرەنجامی بڕیار بۆ دراویان بێ.

**بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (السجدة) تەواو بوو...**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی (الأحزاب)

ئـەم سـورەتە نـانراوە سـورەتی (الأحـزاب) چـونکە باسـی شـەڕی خەنـدەق یـان شـەڕی ئـەحزابی تێدایـە، ئـەو تـاقم‌و گرۆهـە کافرانـەی لـەدەوری شـاری مەدینـە کۆبونــەوە بۆلێـدانی موســوڵمانان لــەماڵی خۆیــاندا، موشــریکەکانی قــوڕەیش‌و غەطەفان بەهەمەکاری دووڕووەکان‌و جولەکەکانی بەنوقورەیظە پیلانیـان دارشـت‌و ڕێك کەوتن بۆ شەڕ لەگـەڵ موسـوڵمانەکان‌و قەلاچۆکردنیان، ئـەم سـورەتە نـاوێکی تریـشی لـێ نـراوە، پـێی دەگـوترێ (الفاضـحة) چـونکە دووڕووەکـانی دەرخـست‌و

فەضحی کردن، پەردەی لەسەر لادانو نەخشەو پیلانەکانیانی خستنە رو، هەروا ئەوەش رون دەکاتەوە: کە ئەو مونافیقانە چەندیان پێغەمبەر ﷺ ئەزیەت دا، چەند پیلانیان لەدژ دارشتن چەند کۆسپو تەگەرەیان لەبەردەم بانگەوازییەکەیدا دروستکردن؟!

پەیوەندی سورەتەکە بەسورەتی پێشەوەی لێکچونی کۆتایی ئەو بەسەرەتای ئەمەوەیە. ئەوەتا سورەتی (السجدة) بەوە کۆتایی هاتووە: کە فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کە رو لەکافرەکان وەرگێرێو چاوەروانی هاتنی عەزاب بێ بۆیان. سەرەتای ئەم سورەتەیشی بەوە دەست پێ کردوە کە فەرمان بەپێغەمبەر دەکا، بەتەقواو خواپەرستیو بەگوێ نەکردنی موشریكو مونافیقەکانو شوێنکەوتنی ئەو پەیامو سروشەی لەخوداوە بۆی دێو پشت بەستن بەخودا لەهەموو کارو بارێکیدا.

سورەتەکە مەدەنییەو (٧٣) ئایەتە، گرنگییەکی زۆر بەلایەنی تەشریعی دەدا بۆ گەلو نەتەوەی موسوڵمان، بەتایبەتی رێکخستنی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، هەندێ دابو نەریتی سەردەمی نەزانی پوچ دەکاتەوە یاسای (التبني) بەکور کردنو (ظیهار)و عیدە لەسەر ئافرەتی تەلاقدراو پێش ئەوەی لەگەڵ مێردەکەی بچێتە پەردەی زاوایییەوە. واجب بوونی حیجاب لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەرو ئافرەتانی موسوڵمانی تر. ئەمانەو گەلێ شتی تری کۆمەلایەتی رون کردەوە.

ئەم سورەتە هەندێ ئادابی کۆمەلایەتیو ئەحکامی تەشریعیو هەواڵو سەرگورشتەی غەزای ئەحزابو بەنوقورەیظەو مونافیقەکانی لەخۆ گرتووە.

ئەو ئادابە کۆمەلاتیانەی سورەتەکە لەخۆی گرتوون هەرە گرنگەکانیان دابو نەریتی بانگکردن بۆ نانخواردنو یاسای حیجابو خۆ دەرنەخستنی ئافرەتانە بۆ پیاوی نامەحرەم، رێزگرتن لەپێغەمبەرە لەماڵی خۆیداو لەدەرەوەی ماڵیشدا.

ئەو حوکمە شەرعییانەی لەخۆی گرتوون زوروزەبەندن، لەوانە فەرمان بەتەقوای خودا، بەگوێ نەکردنی کافرو دوورەوەکان، شوێنکەوتنی نیگاو سروش،

حوكمی ظیهار، پوچەڵكردنەوەی یاسای (التبني) منداڵی خەڵك وەپاڵ خۆدان، یاسای میراتگردن بەسوێندو پەیمان، بڕیاردانی خزمایەتی رەحم بەهۆكاری میراتگرتن، دیاریكردنی مەحاریم‌و ژمارەی خێزانەكانی پێغەمبەر، صەلاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەپێویستدانانی حیجاب‌و پاككردنەوەی كۆمەڵ لەدیاردەی روتی ئافرەت‌و خۆدەرخستنی بۆ پیاوی نامەحرەم‌و بەشێوەی سەردەمی نەزانی. پێویست نەبوونی عیددە بۆ ژنی تەلاقدراو ئەگەر پێش چوونە ناو پەردەی زاوایەتی بێ. هەروەها سەرپشككردنی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان مانەوە لەژێر نیكاحی پێغەمبەردا یان جیابوونەوە لێی. تایبەتمەندكردنی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ بەزێدەپاداش ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەر بن، بەدوو چەندانەی سزا ئەگەر سەرپێچی بكەن، یاساغبوونی ئەزیەتدانی خوداو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان، گرنگی تەكلیف، سزادانی خراپەكارو پاداشدانەوەی چاكەكار.

هەواڵی روداوی سیرەی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش لایەنێكە سورەتەكە گرنگی پێداوە، زۆر بەباشی غەزای (الأحزاب) یان بڵێن غەزایی خەندەق‌و غەزای بەنوقوریظەو پاشگەزبوونەوەی جولەكەكان لەوادەو پەیمانی خۆیان: كە لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوویان، پەردە هەڵدانەوە لەسەر مونافیقەكان‌و ئاگادار كردنەوەی موسوڵمانان لەپیلان‌و فرت‌و فێڵیان، یاد خستنەوەی موسوڵمانان بەنیعمەتەكانی خودا بەسەریاندا لەغەزای خەندەقدا، شكاندنی سوپای دوژمن بەشێوەیەكی موعجیزە ئامێز، رونكردنەوەی چیرۆكی زەیدی كوڕی حاریثەو زەینەبی كچی جەحش. كەبوو بەخێزانی پێغەمبەر.

ئەمە بوو ئەو شتانەی كە سورەتەكە لەخۆی گرتوون، بەشێوەیەكی كورت ئاماژەمان پێ كرد، ئێستاش دێینە سەر شیكردنەوەو تەفسیر كردنی سورەتەكە.

## فەرمان بەتەقوای خوداو شوێنکەوتنی سروش و پشت بەستن بەخودا

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَاتَّبِعْ مَا يُوحَىٰ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾﴾

ئیمامی واحیدیی دەفەرموێ: ئەم ئایەتانە دەربارەی ئەبو سەفیان و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و (أبو الأعور السلمی) نازڵ بووە: کە دوای شەڕی ئوحود هاتن بۆ مەدینەو بوونە میوانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی مونافیقەکان. پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێ دابوون: کە ئاخاوتنی لەگەڵ بکەن، ئیتر عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو سەرح و طوعمەی کوڕی ئوبەیریق لەگەڵیاندا چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتتابی لابوو، بەپێغەمبەریان گوت: باسی خوداکانی ئێمە (اللات، العزی، مناة) مەکە، بڵێ شەفاعەتیان سودی هەیە بۆ کەسێك عیبادەتیان بۆ بکا، ئێمەیش چیمان بەسەر خۆت و خوداکەتەوە نیە. پێغەمبەر ﷺ ئەم قسەیەی زۆر پێ ناخۆش بوو عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم بدە با بیانکوژم! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخەیر ئەمانە لەئەمانی مندان و ئەمانم پێداون، عومەر وتی: دەبا لەمەدینە بڕۆنە دەرێ نەفرینی خودایان لێ بێ.

ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد: کە لەمەدینە وەدەریان بنێن، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد. کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەردەوام بە لەسەر تەقوای خوداو لەسزاو

عیقابی بترسە، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بە، گوێ بۆ کافرو مونافیقەکان رامەگرە، لەهیچ شتێکدا راوێژیان پێ مەکە حەزەریان لێ بکە، نەچی پێشنیارەکانیان قبوول بکەی، نەچی لەبەر خاتری رەزامەندی ئەوان کۆڕو مەجلیسیان بۆ بگریو لەگەڵیان کۆببیەوە موسوڵمانە هەژارو جل شڕەکان لەخۆت دوور بخەیەوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً﴾ بێگومان پەروەردگار زانایە بەسەرەنجامی کارەکان، دانایە لەگوفتارو کردەوەیدا، هەر خودا شیاوی ئەوەیە پابەندی فەرمانو نەهیەکانی بی، ئەو کافرو دووڕووانە دوژمنو ناحەزی تۆن، ئاواتە خوازی فەوتانو لەناوچوونتن.

رستەی ﴿وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ تەئکیدە بۆ رستەی ﴿اتَّقِ اللَّهَ﴾ واتە: تەقوای خودا بکە تەقوا کردنێك: کە نەهێڵێ فەرمانبەردارو گەردنکەچی کافرو دووڕووەکان بیێ.

ریوایەت کراوە: کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە مەدینە کۆمەڵێك لەجولەکەکان بەدووڕوویی و بەڕواڵەت شوێنی کەوتبوون، پێغەمبەر ﷺ نەرمو نیانی لەگەڵ دەنواندن ئەوانیش هەندێ جار بۆ برێ کارو باری دونیایی رێنموییان دەکرد، ئیتر پەروەردگار پێغەمبەری لەوە ئاگادار کردەوە: کە گوێڕایەڵی نەصیحەتی ئەوانە نەبێ.

ئەمجار فەرمانەکەی پێشەوە تەئکید دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ﴾ شوێن ئەو سروشو نیگایە بکەوە: کە لەخوداوە بۆت دەنێردرێ، بەگوێرەی قورئان هەڵسو کەوت بکە، ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً﴾ چونکە بێگومان پەروەردگار هیچی لێ گوم نابێ، بەوپەڕی زانیاریو ئاگادارییەوە نهێنیو ئاشکرای هەموو شتێك دەزانێ، پاشان بەگوێرەی کردەوەکانتان پاداشو سزاتان دەداتەوە.

هەر لەخودا بترسەو هەر شوێن سروشی ئەو بکەوە!

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّـهِ﴾ لەهەموو کارو بارێکتدا پشت بەخودا ببەستە، هەموو شتێکت بەخودا بسپێرە، ﴿وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ خودات بەسە بۆ پشت پێ بەستن، هەر کەسێ پشت بەخودا ببەستێو بۆ لای خودا بگەڕێتەوە خودای بەسە، هەر خودا سود دەبەخشێو زیان دوور دەخاتەوە.

ئەم سێ عونصوورە: (تەقوای خودا، شوێنکەوتنی نیگا، پشت بەستن بەخودا) وێڕای موخالەفەکردنی کافرو دووڕووەکان، لەو عونصورە گرنگانەن: کە پێویستە بانگخوازانی ئیسلامی بیانکاتە رەصیدو پەزمەندەی خۆیو لەسەر ئەو بنەمایانە پەرە بەبانگەوازی خۆی بدا.

## هیچ کەس دوو دڵی نین، حوکمی ظیهارو بەکوڕ کردن

﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّـٰٓـِٔى تُظَـٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِـَٔابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ

﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾﴾

تیرمیذی لەئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەکاو فەرمودەکەشی بەجوان داناوە. دەڵێ: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەنوێژدا خەیاڵێکی بەدڵدا هاتو هەڵوێستەیەکی کرد. ئەو دووڕووانەی لەخزمەتیدا نوێژیان دەکرد، وتیان: دەبێ موحەممەد دوو دڵی هەبن دڵێکی لەگەڵ ئێوەدا بێو دڵێکی لەگەڵ خۆیدا بێ، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوەو لەموجاهیدو عیکریمەوە ریوایەتی کردوە دەڵێن: پیاوێك هەبوو پێیان دەگوت: (ذا القلبين) هەندێك دەڵێن: ئەو پیاوە ناوی (أبو معمر) بوو، هەندێك دەڵێن: ئەو پیاوە ناوی جەمیلی کوڕی سەدی (الفهري) بوو.

لەو رۆژگارەدا ئەگەر ئافرەت ظیهاری لەگەڵ بکرایە، وەکوو دایك حیسابی بۆ دەکرا، پیاوەکەیان بەکوڕی ئافرەتەکە دادەنا.

ئیبنو جەریر لەحەسەنی بەصرییەوە هەمان ریوایەتی ئیبنو ئەبی حاتەمی ریوایەت کردوە ئەم زێدەیەشی پێوەناوە، کە دەیگوت: (ئەمن نەفسێکم هەیە فەرمانم پێ دەکاو نەفسێکم هەیە جڵەوگیریم لێ دەکا).

موجاهید دەفەرموێ: ئەو ئایەتە دەربارەی پیاوێك نازڵ بووە، لەهۆزی بەنی فیهر بووە دەیگوت: لەناو کلۆرایی مندا دوو دڵ هەن، بەهەر دڵێکم لەموحەممەد زیاتر حاڵی دەبم.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە(السدي)یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ دەربارەی پیاوێکی قورەیشی نازڵ بوو، لەهۆزی (بەنو جومەح) بوو، ناوی جەمیلی کوڕی مەعمەری (الفهري) بوو، پیاوێکی قسەخۆشو زیرەكو خاوەن حافیظەی بەقووەت بوو،

هەرچی ببیستایە لەبەری دەکرد، قورەیشییەکان وتیان: دیارە دوو دڵی هەن بۆیە ئەم هەموو شتەی بۆ لەبەر دەکرێ!! بۆخۆشی دەیگوت: ئەمن دوو دڵم هەن، بەهەر دڵێکم هێندەی موحەممەدو زیاتریش حاڵی دەبم، جا کەشەڕی بەدر کراو موشریکەکان شکان ئەو ڕۆژە لەناویاندا (جمیل)یشیان تێدا بوو، ئەبو یوسف چاوی پێکەوت نەعلێکی بەدەستەوە بوو نەعلێکیشی لەپێدابوو، ئەبو یوسف پێی گوت: ئەی ئەبو مەعمەر حاڵو وەزعی قورەیشییەکان چۆنە؟ وتی: شکان. ئەمجار پێی گوت ئەی تۆ بۆ نەعلێکت لەپێدایەو ئەوی ترت بەدەستەوە گرتووە؟ وتی: دەنا هەستم پێ نەکرد وامزانی هەردو نەعلەکە لەقاچم دان. ئیتر ئەو ڕۆژە زانییان ئەگەر دوو دڵی هەبونایە نەعلەکەی ئاوا لەبیر نەدەچوو لەدەستیدا.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ﴾ ئایەتی ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ﴾ ریوایەتکراوە: کە دەربارەی زەیدی کوڕی حاریثە نازڵ بووە، زەید بەمنداڵی لای پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی نیگای بۆ بێ، ئازادی کردو کردی بەکوڕی خۆی، جا: کە پێغەمبەر زەینەبی مارە کرد (کە لەوەپێش خێزانی زەید بوو) موناfیقو جولەکەکان وتیان: موحەممەد ژنی کوڕی خۆی مارە کردوە، جڵەوگیری لەکەسانی دیکە دەکا کە ژنی کوڕەکانیان مارە بکەن، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو نەسائی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: ئێمە تا ئایەتی ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ...﴾ نازڵبوو زەیدی کوڕی حاریثەمان بەزەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرد، کە ئایەتەکە نازڵ بوو، پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەتۆ زەیدی کوڕی حاریثەی کوڕی شەراحیلی.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە لەوەپێش پەروەردگار فەرمانی کرد بەتەقواو فەرمانبەرداری بۆ زاتی پاکیو ترسان لەعەزابی سەختی، هەروەها نەهی لێ کرد کە طاعەتی کافرو موناfیقەکان بکا، ئەمجار ئەو

بیروبۆچونەی رەتکردەوە کە ئادەمیزاد دڵی هەبن، یاساو دابو نەریتی ظیهارو بەکوڕکردنی پوچەڵ کردەوە: جا کە لەدڵی ئادەمیزاددا ترس لەخوداو ترس لەغیری خودا کۆنەبێتەوە، بێگومان هیچ ئادەمیزادێك دوو دڵی لەناو سینگدا نیە هەتا بەدڵێکی طاعەتی خودا بکاو بەدڵێکی تاوان ئەنجام بدا، هەروەها ناگونجێ ئافرەتێك ژنی کابرایەك بێو لەهەمان کاتدا دایکیشی بێ. هەروەها نابێ ئادەمیزادێك کوڕی حەقیقی کابرایەك بێو لەهەمان کاتیشدا کوڕی جەعلیشی بێ...

دەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ﴾ کەسایەتی ئادەمیزادییەتو پێکهاتەی جەستەیی هەموو ئادەمیزادێك وەکوو یەك وایە، پەروەردگار لەهیچ ئادەمیزادێکدا دوو دڵی دروست نەکردون، بەڵکوو هەموو ئادەمیزادێك یەك دڵی هەیە، چونکە دڵ شوێنی ئاراستە کردنو ئیرادەو بڕیاردانە، هەموو ئادەمیزادێك یەك دڵی هەیە، دەبێ یەك مەنهەجو پرۆگرامیشی هەبێ، دەبێ تەصەوری کوللیشی بۆ ژیانو وجوود یەك بێ، دەبێ ئەو پێوەرەی شتەکانی پێ دەپێوێ یەك پێوەربێ، ناگونجێو نابێ ئادەمیزاد ئادابو رەوشتی لەسەرچاوەیەکەوە وەربگرێ، یاساو شەریعەتی لەسەرچاوەیەکی تر وەربگرێ، دابو نەریتی کۆمەڵایەتیو یاسای ئابوری لەسەرچاوەیەکی ترەوە بهێنێ، وەسائیلی تەرفیهیو فەنو تەصەووراتی لەسەرچاوەیەکی ترەوە هەڵنجێ، ئەگەر ئینسان ئیمانی بەخوداو بەپێغەمبەر هەبوو ئەو ئیمانە لەدڵدا جێگیر بوو، ئیتر کوفرو نیفاق لەو دڵەدا جێگای نابێتەوە، واتە: ناگونجێو نابێ لەدڵێکدا دوو باوەڕ دوو ئیتیجاهو رێباز دژ بەیەك هەبن. خاوەنی عەقیدەو باوەڕ ئەگەر عەقیدەکەی حەقو راست بوو ناتوانێ دەستبەرداری داخوازی عەقیدەکەی بێ، شتێك ناکا پێچەوانەی بیرو باوەڕەکەی بێ، هەرچی دەیکا بەگوێرەی بیرو باوەڕی ئەنجامی دەدا، چونکە ئەو یەك بیروباوەڕی هەیە، یەك مەنهەجی هەیە، یەك رێبازو یەك شەریعەتی هەیە، یەك مەنهەجی هەیە، یەك قیبلەی هەیە، دەی دڵێك بۆی ناکرێ دوو خودا بپەرستێ،

فەرمانبەرداری دوو گەورەبێ، دوو ڕێگا بگرێتە بەر! دوو شەریعەتو قانون تەنفیذ بکا.

﴿وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللاَّئِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ ئەو ژنانەتان: کە ظیهاریان لەگەڵ دەکەن، بەو ظیهارە نابنە دایکتان، ظیهار ئەوەیە مێرد بەژنی خۆی بڵێ: تۆ وەکوو پشتی دایکم لێم حەرامی، بەم قسەیە ژنەکە حەرام نابێ، ئەمە تاوانێکە ئەنجامی دەدەنو پێویستە تۆڵەی ئەو تاوانەیان لێ بکرێتەوە.

لەسەردەمی نەفامی‌دا یاسای ظیهار وابوو هەر کەسێ ئەو قسەیەی بەخێزانی خۆی بگوتایە بۆ هەتا هەتایە لێی حەرام دەبوو. ئایینی ئیسلام هات ئەو حەرامبوونەی تایبەت کرد بەماوەیەکی کورتەوە، هەرئەوەندە لێی حەرام دەبێ تا کەفارەتەکەی دەدا، واتە: تەحریمی ئەبەدی کرد بەتەحریمی مووەقەت: ئەگەر کەسێك بەژنەکەی بڵێ: ئەتۆ وەکوو دایکم وای، وەکوو پشتی دایکم لێم حەرام بی، لێی حەرام دەبێ، بەڵام هەر ئەوەندەی لێ حەرام دەبێ تا کەفارەت دەدا، کەفارەتەکەشی ئازاد کردنی کۆیلەیە، ئەگەر کۆیلە نەبوو (وەکوو ئێستا) یان نەیتوانی پەیدای بکا، دەبێ دوو مانگ بەرۆژو بێ، ئەگەر نەیتوانی بەرۆژو بێ، دەبێ خواردەمەنی شەصت هەژار بدا ئەمجار بۆی دروستە ژیانی ژنو مێردیی لەگەڵدا ئەنجام بدا.

﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ﴾ ئەو کوڕانەی ئێوە بەقسە دەیانکەن بەکوڕی خۆتان لەراستی‌دا ئەوانە کوڕی ئێوە نین، خودا نەیکردون بەکوڕی ئێوە ﴿ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ﴾ ئەم قسەیە: کە دەڵێن: ئەوانە کوڕی ئێمەن قسەیەکەو لەدەم دەردەچێو حەقیقەتو واقیعی نیە. ئەوانە لەواقیع‌دا کوڕی باوکی حەقیقی خۆیانن، بەم جۆرە ئایەتەکە (تبني) حەرام کرد واتە: بەکوڕکردنی کوڕی خەڵکی بەکوڕی خۆت.

دابو نەریتی عەرەب لەپێش ئیسلامداو دوای هاتنی ئیسلامیش تا نازڵبوونی ئەم ئایەتە وەهابوو کابرا هەر کاتێ بیویستایە کوڕی یەکێکی تری دەکردە کوڕی خۆی، بەم بەکوڕکردنەش ئەو منداڵە وەکوو کوڕی حەقیقی حیسابی بۆ دەکرد، حوکمی کوڕی حەقیقی دەدرایە. پێغەمبەریش ﷺ بەم یاسایە زەیدی کوڕی حاریثەی دوای ئەوەی ئازادی کرد بەیاسای (تبني) کردیە کوڕی خۆی. تەنانەت: کە بانگیان دەکرد دەیانگوت زەیدی کوڕی موحەممەد.

زانایانی تەفسیر کۆڕایان هەیە: کە ئەم ئایەتە دەربارەی زەیدی کوڕی حاریثە نازڵ بووە، پەروەردگار بەم ئایەتە یاسای (تبني) بەتاڵ کردەوە، هەروا بەئایەتی ژمارە (٤٠)یش ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ...﴾.

بەسەرهاتی زەید وەکوو لەئەنەسی کوڕی مالیكو غەیری ئەویش ریوایەتکراوە ئەوەیە دەڵێن: زەید بەمنداڵی لەشام رفێندراوە لەلایەن کۆمەڵە سوارێکی تیهامەییەوە، دوایی هێندراوەتە بازاڕەو فرۆشراوە، حەکیمی کوڕی حیزامی کوڕی خووەیلید کڕیویەتی، دوایی بەدیاریی داویەتی بەپووره خەدیجەی: کە خێزانی پێغەمبەر بووە ئەویش بەخشیویەتی بەپێغەمبەر ﷺ ماوەیێك لای پێغەمبەر بووە مامو باوکی هەواڵیان زانیو بەسۆراغییەوە هاتن، ویستیان فیدیەی بۆ بدەنو لەکۆیلایەتی رزگاری بکەن، (ئەمە پێش ئەوە بووە پێغەمبەر ﷺ نیگای بۆ بێ) جا پێغەمبەر ﷺ بەباوكو مامی زەیدی فەرموو: خۆتان زەید سەرپشك بکەن، ئەگەر لای ئێوەی هەڵبژارد ئەوە بەبێ فیدیە بیبەنەوە، کەسەرپشکیان کرد، مانەوەی بەکۆیلەیی لای پێغەمبەر هەڵبژارد لەگەڵ باوکیو مامی نەچووەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوە فەرمووی: (یامعشر قریش اشهدوا أنه ابني یرثني وأرثه) ئیتر باوکیو مامی ئەمەیان زۆر پێ خۆش بوو، گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.[1]

[1] تەفسیری قورطوبی (ج٦/٤٠٠١) (٨٩).

﴿وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ﴾ خودا خۆی راستیو حەق دەچەسپێنیو عەداڵەت بەرقەرار دەکاو حەق دەفەرمویٚ، بەندەکانی شارەزا دەکا بۆ رێبازی راستو صەحیح، کەوابیٚ ئێوە واز لەقسەی بیٚ بناغەی خۆتان بهێننو پەیڕەوی شەریعەتی خودا بکەن، ئەمجار پەروەردگار ئەو حەقەی لەوەپێش ئاماژەی پێکرد شی دەکاتەوەو دەفەرمویٚ: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ﴾ ئەو کوڕانەی بەقسەکردوتانن بەکوڕی خۆتانو بەیاسی (تبني) پاڵ خۆتان داون، پاڵ باوکی خۆیان بدەن، ئەوە پەسەندەو عەداڵەتکارییە لای خوداو گونجاو لەگەڵ واقیعو پەیڕەویکردنی شەریعەتی خودایە. ﴿فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ﴾ ئەگەر نەتاندەزانی باوکی حەقیقی ئەوانە کێیە، ئەوە ئەگەر ئیمانیان هێنابیٚ برای ئایینیتاننو ئەگەر ئازادیشتان کردن مەولاو یارمەتیدەرتانن، بەبراگیان یان هاوکارو یارمەتیدەر بانگیان بکەن، بۆیە دوا بەدوای نازڵبوونی ئەم ئایەتە بە(سالم) دەگوترا مەولای حوذەیفە.

ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو بوخاری لەئەبوذەڕەوە فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرمویٚ: (ليس من رجل ادعى لغير أبيه، وهو يعلمه إلا كفر) هەر کەسێك بەناوی غەیری باوکی خۆیەوە بانگ بکریٚ بۆخۆشی دەیزانیٚ وایەو رازی بوو یەکسەر پیٚی کافر دەبیٚ.

هەر کەسیٚ بەدرۆ خۆی بکا بەکوڕی کەسێكو بزانیٚ کوڕی یەکێکی ترە، یان هەر پیاوێك منداڵی نەسەب نەناسراو یان نەسەب ناسراو بەخۆڕایی یان بەپارە لەخۆ بگریٚو بیکاتە منداڵی خۆی ئەوا تاوانبارەو خودا پیٚی ناڕازییە، چونکە بەم کارەی بێگانە دەکا بەمیراتگرو میراتگری خۆی لەمیرات بیٚ بەش دەکا یان لەمیراتەکەی کەم دەکا، نامەحرەم دەخاتە ناو خێزانی خۆیەوەو خەڵوەی حەرام ئەنجام دەدریٚ.

﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ تاوانتان لەسەر نیە ئەگەر بەهەڵە هەندێ کەس پاڵ غەیری باوکی حەقیقی خۆیان بدرێن.

واتە: ئەگەر بەهەڵە یەکێتان پاڵ یەکێك دا ئەوا تاوانتان لەسەر نیە، بەڵکوو تاوان ئەوەیە، بەئەنقەست کچ یان کوڕ پاڵ غەیری باوکی حەقیقی خۆی بدەن، ئەوە تاوانەو شیاوی تۆڵەو سزان لەسەری!

ئیبنو جەریرو ئیبنولمونذیر لەقەتادەوە ریوایەت دەکەن: فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێکت بەناوی غەیری باوکی خۆیەوە بانگ کردو پێت وابوو ئەوە باوکیەتی ئەوە گوناهت ناگاتێ چونکە بەئەنقەست ئەوەت نەکردوە.

ئیمام ئەحمەد لەعومەری کوڕی خەتتابەوە ریوایەت دەکا، کە فەرمویەتی: پەروەردگار حەزرەتی موحەممەدی بەحەق رەوانەکرد، نامەی (قورئانی) لەگەڵ نارد، لەو قورئانەدا ئایەتی بەردەبارانکردنی تێدایە، پێغەمبەر ﷺ بەپێی ئەو ئایەتە ئەوانە شیاوی بەردەبارانکردنن بەردەبارانی کردن، ئێمەیش دوا ئەوەی ئەو تەشریفی کۆچی دوایی کرد. پەیڕەوی حوکمی بەردەبارانمان کرد. ئەمجار وتی: (قد کنا نقرأ): ﴿ولا ترغبوا عن آبائكم فانه كفر بكم أن ترغبوا عن آبائكم﴾.

بێگومان ئەمەیە یاسای ئیسلامو ئەمەیە ئەو یاسایەی گرنگی بەخێزان دەدا، هەموو ئەندامێکی خێزان بەگوێرەی پلەو پایەی خۆی لەخێزاندا بەرپرسیارە، هاوکێشەیی خۆی هەیە، خێزان دادەمەزرێنێ لەسەر بنەمایەکی چەسپاوو گونجاو لەگەڵ واقیعو سروشت، هەر بەو جۆرەش هەوڵ دەدا لەو خێزانانە کۆمەڵگا پێکەوەنێ. هەر یاساو نیظامێکیش رۆڵی خێزان پاشگوێ بخا یاساو نیظامێکی فاشیلەو ناتوانێ بژی. خکومەتی روسیای شیوعی زۆری هەوڵ دا خێزان بڕوخێنێو نەهێڵی رۆڵی خۆی لەکۆمەڵگادا بگێڕێ بەڵام بۆی سەرنەچوو چونکە بەرەنگاری سروشتی کردو تێ شکاو نەیتوانی قەڵاچۆی یاسای خێزان بکا.

﴿وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ پەروەردگار هەمیشە لێخۆشبووە بۆ ئەوانەی بەهەڵە تاوان دەکەن یان بەئەنقەست دەیکاو دوایی تۆبە دەکا، خاوەن رەحمو بەزەییەو عیقابیان نادا، هەندێك لەرەحمو بەزەیی پەروەردگار بۆ بەندەکانی ئەوەیە بەتاوانی بەهەڵە نایانگرێو قبووڵی تۆبە لەتاوانی بەئەنقەست دەکا.

## پلەو پایەی پێغەمبەرو ئەرکی سەرشانی یاسای میراتگرتن بەخزمایەتی

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٦﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿٧﴾ لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿٨﴾ ﴾

لەوەپێش یاسای (تبني) پوچەڵ کردەوە، ئەوەی راگەیاند: کە موحەممەد ﷺ باوکی حەقیقی زەیدی کوڕی حاریثە نیە. ئەمجار لێرەدا ئەوە رادەگەیەنێ: کە موحەممەد ﷺ باوکی گشتییە بۆ ئوممەتەکەی و خێزانەکانی بەنیسبەت پیاوانی ئوممەتەکەیەوە وەکوو دایك وەهان لەوەدا پێویستە رێزیان لێ بگیرێ و چاکەیان لەگەڵ بکرێ، دروست نیە پیاوانی موسوڵمان مارەیان بکەنەوە. دەفەرموێ: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ﴾ بێگومان پێغەمبەر ﷺ بەکۆمەڵی موسوڵمانان لەخۆیان بەسۆزترە، رەحم و بەزەیی زیاترە، چونکە ئەو بانگەوازییان دەکا بۆ رزگاربون لەئاگری دۆزەخ، بەڵام بۆخۆیان بانگەوازی خۆیان دەکەن بۆ هیلاك. وەکوو پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە دەفەرموێ: (أنا آخذ بحجزكم عن النار وأنتم تقتحمون فيها تقحم الفراش)[1] واتە: من دەست لەپزوی دەرپێکانتان توند دەکەم بۆ ئەوەی نەکەونە ناو ئاگرەکەوە، کەچی ئێوە خۆتانی تێ فڕێ دەدەن.

ئەگەر یەکێك بترسێ لەوەی کابرایەکی تر لەبەرزییەکەوە بکەوێتە خوار بیەوێ نەهێڵێ بکەوێ دەست بۆ شرواڵەکەی دەبا بیگرێ. ئەمە نموونەیە بۆ دڵسۆزی و هەوڵدانی پێغەمبەر بۆ رزگارکردنی ئوممەتەکەی. ئەو لەخۆمان بۆ ئێمە دڵسۆزترە، ئێمە لەبەر نەزانی و باڵادەستی شەهوەت و ئارەزۆکانمان بەسەرماندا بۆ خۆمان خۆمان دەخەینە ناو ئاگرەوەو پێغەمبەر ﷺ ناهێڵێ و مەنعمان دەکات. ئەو وەکوو باوکێکی دڵسۆز وایە بۆمان، نەفسمان فەرمانمان پێ دەکا بەخراپەکاری و پەیڕەوکردنی رێبازی هیلاکەت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ جگە لەفەرمان بەخێر فەرمان بەهیچی تر ناکا، هەرچی دەیڵێ: لەنیگاو سروشەوەیە.

---

[1] رواه مسلم في الفضائل (٢٢٨٤) باب (٦) شفقته على أمته. دەقی فەرمودەکە بەتەواوی بەم جۆرەیە: (انما مثلي ومثل أمتي كمثل رجل استوقد ناراً فجعلت الدواب والفراش يقعن فيه وأنا آخذ بحجزكم وأنتم تقحمون فيه).

جا ئەگەر زەید شانازی دەکا بەوەی: کە بەکوڕی موحەممەد ﷺ بانگ بکرێ، چونکە ڕێزو قەدری دونیاو قیامەتی دەست دەکەوێ، ئەوە با بزانێ: کە موسوڵمانان هەموویان شانازی دەکەن بەوەی: کە بەگشتی بەکوڕی موحەممەد بناسرێن، ئایەتەکە وێڕای هەڵوەشاندنەوەی یاسای (تبني) دڵدانەوەی زەیدیشی تێدایە، ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لەباوکایەتی تایبەتییەوە بۆ زەید، بوو بەباوکی گشتی زەیدو هەموو موسوڵمانانی تر، وەکوو باوکی حەقیقی دڵسۆزە بۆیان‌و هیدایەتیان دەداو گرنگیان پێ دەداو دڵخۆشە بەبەختەوەری دونیاو قیامەتیان.

جا: کە پێغەمبەر ﷺ لەنەفسی خۆیان بۆیان لەپێشتر بێ دیارە لەهەموو کەس بۆیان لەپێشترەو حوکم‌و بڕیاری پێش حوکم‌و بڕیاری هەموو کەسە، دەبێ لەخودی خۆشیان خۆشتریان بوێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً﴾ (النساء:٦٥).

لەصەحیحی بوخاریدا هاتووە دەفەرموێ: (والذي نفسي بيده لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من نفسه وماله وولده والناس أجمعين) هەر ئیمامی بوخاری فەرمودەیەکی تری ڕیوایەت کردوە، فەرمودەکە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما من مؤمن الا وأنا أولى الناس به في الدنيا والآخرة) دە ئەگەر حەزتان لێیە ئایەتی ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ بخوێننەوە. ئەمجار فەرموی: هەر موسوڵمانێك مردو ماڵ‌و سامانی جێ هێشت با بۆ میراتگرەکانی بێ، هەر کەسێك هەبن، کەسێکیش بەقەرزداری مرد، یان ماڵ‌و منداڵی سەلکەو پێچکەی جێ هێشت ئەوە من سەرپەرستیاریانم.

﴿وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکوو دایك وەهان بۆ موسوڵمانان لەبارەی ڕێزو قەدرەوە هەروەها لەبارەی ئەوەوە: کە مارەکردنەوەیان بۆ موسوڵمانان حەرامە وەکوو چۆن حەرامە پیاو دایکی خۆی مارە بکا.

بـەڵام لـەروی شـتی تـرەوە وەکـوو ئـافرەتی تـر وەهـان، کـچەکانیان بەخوشـك دانانرێن‌و دروستە بۆ موسوڵمانان مارەیان بکەن، حەرامە خەلوەیان لەگەڵدا بکرێ، سەیرکردنیان حەرامە.

﴿وَأُوْلُو الآرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَـابِ اللَّـهِ مِـنْ الْمُـؤْمِنِينَ وَالْمُهَـاجِرِينَ﴾ خزمەکان چ خاوەن بەشی دیاریکراو (أصحاب الفروض) بن یـان عەصەبات بـن یـان ذەویلئەرحام بن هەندێکیان لەهەنـدێکیان شـیاوترن لـەبڕیاری کتێبـی خـودادا: کـە (لوح المحفوظ)ە یان قورئانی پیرۆزە: کە سود لەیەکتری وەربگـرن بـەمیراتگرتن یـان بەشتی تر، لەباقی موسوڵمانانی تر بەکۆچکارو یارمەتیدەرانەوە.

وشەی (من) لەرستەی ﴿مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالآنصَارِ﴾دا یان (بیانیـة)یـە بـۆ ﴿أُوْلُـو الآرْحَامِ﴾ واتە: خزم لەموسوڵمانان‌و کۆچکاران هەندێکیان بۆ هەندێکیان لەپێشترن لەبێگانە: کە میرات لەیەکتر وەربگرن.

یان (من) بـۆ (ابتـداء الغایـة)یـە ئـەو کاتـە مانـای ئایەتەکـە بـەم جـۆرە دکـرێ. خزمەکان بەمافی خزماتییان لەپێشترن لەموسـوڵمانان بـەمافی ویلایـەتی ئـایینی‌و لەکۆچکارانیش لەپێشترن بەمافی کۆچکردن.[1]

جـا بـەپێی مانـای دووەم ئایەتەکـە دەبێتـە ناسـیخ‌و هەڵوەشـێنەرەوەی ئـەم حـوکم‌و یاسـایانەی لەسـەرتای ئیـسلام پـەیڕەو دەکـرا دەربـارەی میراتگـرتن بەهاوپەیمانی‌و سوێند خۆری بەستنی پەیمانی برایەتی لەنێوان موسـوڵماناندا. کـە بەگوێرەی ئەم یاسـایە واتـە: یاسـای (مؤاخـاة) کۆچـکار میراتـی لەئەنـصاری دەگـرت بەڵام خزمەکانی لێیان نەدەگرت. چونکە پێغەمبەر ﷺ کە تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینەو تەشکیلی دەوڵەتی ئیسلامی کرد چەند یاساو داب‌و نەرێتێکی کۆمەڵایەتی دانا، یەکێك لەو یاسایانە یاسای (مؤخاة) بوو، ئەوە بوو برایەتی خستە نێوان ئـەبو بـەکرو خاریجـەی کـوڕی زەیـدەوە، عومـەرو کابرایـەکی تـری کردنـە بـرای یـەکتری

[1] تەفسیری کەششاف ج٢/٥٣١ تەفسیری فتح القدیر ج٤.

عوسمان و پیاوێکی بەنو زورەیقی کردنە برا، زوبەیدی کردە برای کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاری.(٢)

ئەوەی: کە پشتگیری ئەم مانایەی دووەم دەکا ئەو فەرموودەیە: کە هەردو پیری فەرموودە (موسلیم و بوخاری) لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (لاهجرة بعد الفتح ولكن جهاد ونية) واتە: حوکمی هیجرەت تەواو بوو ئەو حوکمانەی لەئاکامی هیجرەتەوە پەیدا دەبوون، لەوانە میراتگرتن لەیەکتری لەسەر بنەمای هیجرەت هەڵوەشایەوە.

﴿إِلاَّ أَنْ تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُمْ مَعْرُوفاً﴾ مەگەر بتانەوێ لەروانگەی (وصية)و چاکەو ئیحسانەوە شتێك بدەن بەخۆشەویستەکانتان، واتە: کابرا دەتوانێ تا سێیەکی ماڵی خۆی بەوەصیەت بدا بەو کەسانەیان ئەو جیهەت و لایانانەی دەیەوێ بیانداتێ ئاشکراشە وەصییەت و قەرز جێ بەجێ دەکرێن ئەمجار میرات دابەش دەکرێ. واتە: ئەگەر وەصێتتان کرد بۆ غەیری میراتگر ئەوە وەصییەت بۆکراو پێش میراتگر دەکەوێ، ئەگەر وەصێتتان نەکرد ئەوە میراتەکەتان بۆ میراتگرەکانە.

﴿كَانَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُوراً﴾ ئەو حوکمە، واتە: ئەوە: کە ئولولئەرحام هەندێکیان لەپێشترن بۆ میراتگرتن، هەتا خزم هەبێ بێگانە میرات ناگرێ، هەتا خزمی نزیك هەبێ خزمی دوور میرات نابا، یان کەمتر دەبا.

ئەو حوکمە بڕیاردراوەو لەکتێبی لەوحولەحفوظدا چەسپاوەو گۆڕانی بەسەردا نەهاتووەو نایە، هەرچەندە پەروەردگار بۆ ماوەیەك و لەبەر حیکمەتێك: کە خۆی دەیزانێ، حوکمێکی جیا لەئەو حوکمەی راگەیاندبوو، دەشیزانی: کە دوا ماوەیەك حوکمەکە دەباتەوە سەر حوکمە ئەصلی و ئەزەلییەکە!

ئەمجار دوای دەست نیشانکردنی پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ لەناو موسوڵماناندا، ئەمجار پەروەردگار گرنگی ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر دەربارەی راگەیاندن و مژدە

---

(٢) تەفسیری قورطوبی ج٧/٤٠٠٥ (٩٣) تەفسیری ئیبنو کەثیر ج٣/١٤٦٨ طبعة دار الفكر.

دان و ترساندن رون دەكاتەوە، تێكۆشانی لەپێناو بانگەوازی بۆ رێبازی خوداو بلاوكردنەوەی پەیامی ئیسلامی!

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقاً غَلِيظاً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست یادی ئەوە بكەرەوەو ئەوە بۆ گەلەكەت بگێرەوە ئێمە پەیمانمان لەهەموو پێغەمبەران بەتایبەتی ئولولعەزمەكانتان وەرگرت، پەیمانی جەخت لەسەر كراومان لەتۆو لەنوح و ئیبراهیم و موساو عیسای كوری مەریەم وەرگرت، كە پەیامی خودا بگەیەنن بەگەل و نەتەوەكانیان و كەمتەرخەمی نەكەن، یارمەتی یەكتربدەن، پشتگیری پەیامی یەكتری بكەن وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّيْنَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (آل عمران: ٨١) بەكورتی وادەمان لێ وەرگرتن: كە ئیعلانی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد بكەن و ئەوەش رابگەیەنن: كە دوا پێغەمبەری ئیسلام هیچ پێغەمبەری تر نایەن.

جا بەبۆنەی ئەو حوكم و بڕیارو زانیارییەی لەلەوحولمەحفوظدا چەسپاوەو خودا ویستویەتی ببێتە یاسای نەگۆڕاوو بەردەوام بۆ ئادەمیزادو پەیڕەوی بكەن، بەم بۆنەوە ئاماژەی كرد بۆ پەیماننامەی خودا لەگەڵ پێغەمبەراندا بەگشتی و پێغەمبەری ئیسلام و ئولولعەزمەكان بەتایبەتی لەم رووەوە: كە پەیمانی لێ وەرگرتوون ئەو مەنهەجە وەربگرن و پەیڕەوی بكەن و بەردەوام بن لەسەری و بەخەڵكی رابگەیەنن، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان بەرپرسیار بن لەهیدایەت و گومڕایی خۆیاندا، لەئیمان و كوفریاندا، بیانوویان بڕێن و ئیقامەی حوجەیان لەسەر بكەن.

پەروەردگار لەئایەتەکەدا بەتایبەتی ناوی پێنج پێغەمبەرە ئولولعەزمەکانی هێنان، هەرچەندە وشەی (النبيين) دەیانگرێتەوە ئەمەش بۆ زێدە ڕێزلێنانو گرنگی ئەرکی سەرشانیان (عەطفی خاصە بۆ سەر عام)و بۆ زێدە ڕێزلێنانە لە(معطوف).

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ (الشورى:١٣).

عەهدو پەیمانێکە پەروەردگار لەپێغەمبەرانی وەرگرتووە، هەر لەحەزرەتی نوحەوە تا دوا پێغەمبەرو سەرداری پێغەمبەران حەزرەتی (محمد المصطفیﷺ).

یەك پەیمانو یەك مەنهەجو یەك ئەمانەتە، یەك لەدوایەك وەریان گرتووە.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە پرسیار لەپێغەمبەران دەکا دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیانو وەڵامدانەوەی گەلەکانیان، پرسیار لەموسوڵمانەکانیش دەکرێ دەربارەی چۆنیەتی بەپیرەوە چونیان بۆ بانگەوازی پێغەمبەرەکانیان، هەروا پرسیار لەبەردۆخەرەوەکانیش دەکا چۆن پەیامی پێغەمبەرەکانیان ڕەت کردۆتەوە. دەفەرموێ: ﴿لِيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَنْ صِدْقِهِمْ وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَاباً أَلِيماً﴾ (لام)ی (ليسأل) (لام)ی عاقیبەتە، واتە: خودا پەیمانی لەپێغەمبەران وەرگرتووە تا لەئاکامدا سەر بکێشێ بۆ پرسیار لەوەی ئەنجامیامن داوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾ (الأعراف:٦).

ئەبوحەیان دەفەرموێ: (لام)ەکە (لام)ی تەعلیلو بایيسە: واتە: پێغەمبەرانمان ڕەوانەکردون، عەهدو پەیمانمان لێ وەرگرتوون دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیان بۆ ئەوەی خودا مەخلووقات بکا بەدوو تاقم، پرسیار لەتاقمێکیان دەکا دەربارەی ڕاستگۆییان ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە، کە ڕاستگۆبوون لەگەڵ خودادا لەئیمانو کردەوەیاندا، خوداش پاداشی باشیان دەداتەوە، تاقمێکیشیان

کافرو بێ بڕوابن و ئەو عەزابەی خودا بۆی بڕیارداون بیچێژن. بەم مانایە ڕاستگۆ پرسیار لێکراوەکان موسوڵمانانن. ڕاناو لەوشەی (صدقهم) پێغەمبەران بن، ئەو کاتە ماناکە بەم جۆرە دەبێ (بۆ ئەوەی پەروەردگار پرسیار لەپێغەمبەرەکان بکا، یان پرسیاریان لێ بکا دەربارەی پابەندبوونیان بەو عەهدو پەیمانەی لێی وەرگرتوون. دەربارەی ڕاگەیاندنی پەیامەکەیان بەگەلەکانیان، جا ئەگەر پێغەمبەران پرسیاریان لێ بکرێ ئەی دەبێ غەیری ئەوان حاڵیان چۆن بێ؟).

دەشگونجێ مەبەست بە(الصادقین) پێراگەیەندراوەکان بن ئەوانەی پێغەمبەرەکان پەیامەکەیان پێڕاگەیاندون.

بەگوێرەی ئەم تەئویل و مەزندەکردنە ماناکە بەم جۆرە دەبێ: پەیمانمان لەپێغەمبەران وەرگرت دەربارەی بانگەوازیکردنی گەلەکانیان بۆ لای ئاینی خودا، ئەمەش بۆ ئەوەی پرسیار لەپێغەمبەرەکان بکەین دەربارەی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان و وەڵامدانەوەیان لەلایەن گەلەکانیانەوە، بۆ ئەوەی پاداشی باش بدەینەوە بەخاوەن باوەڕەکان و لەسەر ئیمان و ڕاستگۆییان و سزای کافرو ستەمکارەکان بدەین ئەوانەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستۆتەوەو شیاوی سزای سەختی پەروەردگار بوون ئەویش ئاگری دۆزەخەوە.

## غەزای ئەحزاب (خەندەق)و غەزای بەنو قورەیظە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ

وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ

وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ
لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً
عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ
كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم
بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ
أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ
يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى
ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا
قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ
حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا
﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ
وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا

﴿٢٢﴾ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴿٢٣﴾ لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمۡ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا ﴿٢٦﴾ وَأَوۡرَثَكُمۡ أَرۡضَهُمۡ وَدِيَٰرَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُمۡ وَأَرۡضٗا لَّمۡ تَطَـُٔوهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ﴿٢٧﴾

**وەكوو لەسیرەی ئیبنو ئیسحاقدا هاتووە، كۆمەڵێك لەجوولەكە، لەوانە سەلامی كوڕی ئەبولحەقیقی (النضری)و (حي) كوڕی ئەخطەبی (النضری) كەنانەی كوڕی ئەبولحەقیقی (النضری)و هەوزەی كوڕی قەیسی (الوائلي)و ئەبو عەمماری (الوائلي) لەگەڵ چەن پیاوێكی بەنو نەضیرو چەند كەسێكی تری وائیلی یەكیان**

گرتو پیلانیان دارشت بۆ کۆکردنەوەی پارتو گرۆهە جیاجیاکان دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی، رۆیشتن بۆ مەککەو پەیوەندییان بەقورەیشییەکانەوە کردو بانگەوازییان کردن بۆ جەنگان دژی پێغەمبەرو هەڵیان نان وتیان: ئێوە وەرن بۆ سەر موحەممەدو هاوەڵانی ئێمەش یارمەتیتان دەدەین، وازیان لێ ناهێنین تالەبێخیان دەردێنین و ریشەکێشیان دەکەین!

قورەیشیەکان وتیان: ئەی کۆمەڵی جولەکە ئێوە خاوەنی تەوراتو زانیارین دەزانن ئێمە لەگەڵ موحەممەددا لەسەرچی کێشەمان هەیە، بۆمان رون بکەنەوە ئایا ئایینی ئێمە باشترە یان ئایینی تازەبابەتی موحەممەد؟ جولەکەکان وتیان: ئایینی ئێوە لەئاینی ئەو باشترە، حەق لەگەڵ ئێوەدایە. ئایەتی ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً﴾ تا دەگاتە ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكاً عَظِيماً، فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ وَكَفَى بِجَهَنَّمَ سَعِيراً﴾.

جا کە جولەکەکان ئەوەیان بەقورەیشییەکان گوت زۆری پێ خۆشحاڵ بوون، زیاتر ئامادەباشییان تێدا پەیدا بوو بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەرو خۆیان بۆ ئامادەو تەیار کرد.

ئەمجا ئەو کۆمەڵە جولەکەیە قورەیشییەکانیان جێ هێشت هاتنە لای هۆزی غەطەفان بانگەوازی ئەوانیشیان کرد بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵمانەکاندا، وادەیان پێدان: کە ئەوانیش یارمەتییان دەدەن و قورەیشییەکانیش ئامادەن، بەم پێیە هێزی شەڕ یەکیان گرتو بڕیاری کۆتاییان دا.

قورەیشییەکان بەسەرۆکایەتی ئەبو سەفیانی کوڕی حەربو هۆزی غەطەفان بەسەرۆکایەتی عویەینەی کوڕی حیصن لەخێڵی فەزارەو حاریثی کوڕی عەوف لەخێڵی موڕڕەو موسعیری کوڕی رەیخیلە لەگەڵ ئەوانەی شوێنی کەوتن لەخزمو

کەس و کاری. ئەمانە هەموو بەرێ کەوتن بۆ سەر مەدینەو قەڵاچۆکردنی موسوڵمانان لەماڵی خۆیاندا. جا: کە پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵانەی پێ گەیشت و بەگەلە کۆمەکی کۆمەڵانە کوفرو ئیلحادی زانی لەمەبەستیان گەیشت، بڕیاری دا خەندەق بەدەوری مەدینەدا لێ بداو دیفاع بکەن و لەمەدینە دەرنەچن.

دەست کرا بەهەڵکەندنی خەندەق، پێغەمبەر ﷺ خۆی ئیشی تێدا دەکردو موسوڵمانانیش بەحەماسەتەوە ئیشیان تێدا دەکرد، کۆمەڵێك لەدووڕووەکان تەمبەڵییان تێدا دەکردو زۆر کات خۆیان لەئیش کردن دەدزیەوەو بەبێ ئەوەی بەپێغەمبەر بڵێن و روخصەتی لێ وەرگرن دەچوونەوە ناو ماڵ و منداڵیان.

بەڵام موسوڵمانەکان ئەگەر ئیشێکی زۆر زەرورو پێویستیان ببوایە ئیزنیان لەپێغەمبەر وەردەگرت و دەچون بۆ ئەنجامدانی، هەر لەگەڵ ئیشەکەیان تەواو دەبوو خێرا دەگەڕانەوە بۆ سەرکارەکەیان و هاوبەشیکردنی هەڵکەندنی خەندەق. بەمەبەستی بەدەستهێنانی رەزامەندی خوداو پاداش دەسکەوتن..

پەروەردگار دەربارەی ئەو موسوڵمانە دڵسۆزانە ئایەتی ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾.

دەربارەی ئەو دوو ڕوانەش: کەخۆیان دەدزیەوە لەهاوبەشی کردنی خەندەق دەفەرموێ: ﴿لَا تَجْعَلُوا دُعَاء الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاء بَعْضِكُم بَعْضاً قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذاً فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾.

جا کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا لەماوەی شەش رۆژی تەواودا هەر لەم ماوەیەدا دیواری ماڵەکانی روبەری دوژمن قایم کران، ماڵەکانی دیوی دەرەوەی خەندەق چۆڵ کران و ئافرەت و منداڵ و پەککەوتەکان خرانە ناو قەڵاو خانوە

مەحکەم کراوەکان، بەردی گەورەیان لەسەر قەراخی خەندەقەکە لەبەری خۆیانەوە دامەزراندن بۆ ئەوەی بیانکەنە سەنگەری تیرهاویشتن. وەختێ موسوڵمانەکان لەم کارقیامییە بوونەوە قورەیشییەکان بەسوپایەکی زۆرەوە هاتن، خەندەقیان بینی سەریان سوڕما، چونکە لەوەپێش ئەم جۆرە نەخشەو پیلانە لەناو عەرەبدا باو نەبوو، ئەوان بەتەمابوون لەرێگادا وەکوو جارەکانی دیکە لەرێگادا روبەروی موسوڵمانەکان ببنەوە بەڵام وا لوتیان بووە لەمپەرێکی قایمو پتەوو بڕستیان لێ برا. رێگای پێشڕەوییان لێ بڕاوە. بەناچاری لەشوێنی کۆبونەوەی لافاوەکان (مجمع الأسیال)دا لەلای رۆمەوە لەشکربەزییان کردو هەڵیاندا.

غەطەفانو تیرەکانی نەجد لەلای ئوحودەوە هەڵیاندا، پێغەمبەرو موسوڵمانەکانیش ژمارەیان سێ هەزار کەس بوون لەلای خۆرهەڵاتەوە لەشکربەزییان کردو هەڵیانداو پشتیان کردە کەژی (سلع) کە بەسەر مەدینەدا دەیڕوانی، ئاڵای کۆچکاران درایە دەست سەعدی کوڕی حاریثە، ئاڵای یاریدەدەران درایە دەست سەعدی کوڕی عوبادەو خەندەق کەوتبووە نێوان موسوڵمانو کافرەکانەوە، درێژی خەندەق پێنج هەزار ذیراع بوو، قوڵایی حەوت تا دە ذیراع بوو پانیەکەشی لەنۆ ذیراع زیاتر بوو.

ماوەیەك هەردوو سوپا لەمبەرەوبەری خەندەق بەرامبەر بەیەك مانەوە، بێ ئەوەی سوپای کافرەکان بتوانن چ زیانێك بەمەدینە بگەیەنن، ئیتر لەشکری قورەیشییەکان لەناوخۆیاندا مقۆمقۆیان تێکەوت، رەشبینیو نائومێدی سواری سەرو دڵیان بوو، لەلایەکەوە خەندەق لەبەردەمیانەو ناوێرن لێوەی وەپەڕن، لەو بەرەوە موسوڵمانان سەنگەریان لێ گرتوون دەستیان لەسەر بەلەپیتکەی تیروکەوانە. لەلای ترەوە زستانێکی ساردو سەرمایەکی زۆرو رەشەبایەکی بەهێز چی بکەن؟ خۆ موسوڵمانەکان وان لەناو ماڵی خۆیانداو ساردو سەرما لەبن چنگیان نادا، چەندێکیش ئەمان بمێننەوە رێگای پەڕینەوەیان نیە!

(غطفان)یش لەدڵی خۆیاندا بیر دەكەنەوەو ورد دەبنەوە سەركەوتنیان بۆ دەستەبەر نابێ. لەسەرێكی ترەوە. ئەگەر ئەمان گەڕانەوە بۆ شوێن و مەڵبەندی خۆیان. دەبێ جولەكەكانی خەیبەرو بەرەی (بنو النضیر) چی بكەن؟ قوڕی كوێ بەسەرخۆیاندا بكەن؟ خۆ تازە هەلێكی تری ئاوایان بۆ هەڵناكەوێتەوەو لەشكری بەو جۆرەیان بۆ كۆناكرێتەوە!! كێ ناڵێ دوایی موسوڵمانەكان بەسەریاندا نادەن و لەماڵی خۆیاندا لەناویان نابەن؟

بۆیە ویستیان پەیوەندی بە(بنو قریظة)وە بكەن و وایان لێ بكەن پەیمانی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەر هەڵوەشێننەوەو ببنە لایەنگیرو یارمەتیدەری لەشكری قوڕەیشییەكان. بەمەش پشتیوانی بۆ موسوڵمانانەكان نامێنێ و ڕێگای لەشكرەكەشییان دەكرێتەوە بۆ چوونە ناو شار، بۆ ئەم مەبەستە (حودەیبە)ی كوڕی ئەختەبیان ناردو پەیوەندی پێوە كردن و لەگەڵیان دوا، لێیان نەگەڕا تا وای لێ كردن پەیماننامەكەی خۆیان (كە لەگەڵ پێغەمبەر مۆریان كردبوو) هێنایان لەت و پەتیان كردو حودەیبە پەیمانی دانێ: كە ئەگەر ئەم سوپایە نەیتوانی سەركەوتن بەدەست بێنێ و موسوڵمانەكان لەناوبەرێ و گەڕانەوە، ئەو بچێتە ناویانەوەو هاوبەشیان بێ لەهەموو خۆشی و ناخۆشییەكیاندا.

كاتێ ئەم هەواڵە بەپێغەمبەر ﷺ گەیشت خێرا ناردی بەشوێن سەعدی مەعازدا (سەرۆكی ئەوس)و سەعدی كوڕی عوبادە (سەرۆكی خەزرەج)و عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحەو خەوواتی كوڕی جوبەیردا تابچن بزانن ئەم دەنگ و باسە چیە؟ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بوو كە هاتنەوە ئاشكرای مەكەن با موسوڵمانان ورەیان نەڕوخێ! كاتێ ئەم پیاوانە چوونە لایان سەیریان كرد خراپترین شێوەو دەمو زمانیان هەیە، چەندێكی هەوڵیان لەگەڵ دان لەهەڵوێستی خیانەتكاری خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، بەم جۆرە جولەكەی بێ قەول و قەرارو پەیمانشكێن كەوتنە پەلاماردان و هێرش بردنە سەر موسوڵمانەكان، وتیان: پێغەمبەری چی و پەیمانی چی؟ ئێمە هەرگیز لەگەڵ پێغەمبەردا پەیمانمان نیە!

موسـولّمانەكان بـەم هەلّوێـستەی جولەكـەكان ترسـيان لـێ نيـشتو تەنگـەتاو بوون، لەوە دەترسان بەنوقورەيظە دەرگای شار بكەنـەوەو ئـەو سـوپا زۆرە بڕژێتـە ناو شارەوەو لەماڵو حاڵی خۆیاندا قەلاچۆیان بكەن!

لەملاشەوە سوپای دوژمن بەگەڕانەوەی حودەيبە خۆشحاڵ بوونو كەوتنـە خـۆ ئامادەكردن بۆ جەنگو هێرش بردن تەنانەت لەسێ لاوە هێرشـيش دەسـت پێكـراو ترسو بيم كەوتە ناو موسوڵمانەكانەوەو ئێستا نا ئێـستا شـارەكە كۆنتـڕۆڵ دەكـرێ. دووڕووەكانيش كەوتنـە خۆدزينـەوەو پڕوپاگانـدەكردنو چـاوو راوو هـاشو هـوشو تانـەدان. بـەلاقرتێوە دەيـانگوت: موحەممـەد وادەی پێـداين گەنجينـەی كيـسراو قەيصەرمان بكەوێتە ژێر دەست، كەچی ئێـستا وا ناتوانێـت بەراشكاویو بـێ تـرس بچينە سەرپێشاویش، بەلام پێغەمبـەرو زۆر لـەهاوەلانی بـەبڕوای پتـەوەوە لەوبـەر خەندەقـەوە ديفاعيـان كـردو نەيانهێـشت كـەس لەپـەلاماردەران ئەوبـەر بكـەون، بـەرگری درێـژەی كێـشاو بيـست رۆژ بەسـەر پـەلامارۆ هێرشـی دوژمـندا تێپـەڕی، هەنــدێ لەپالّــەوانانی دوژمــن هــەولّياندا بەئەســپەكانيان بازبــدەنو بكەونــە ئەوبــەرەوە، عــەمری كــوڕی وددی (العــامري)و عەكرەمــەی كــوڕی ئــەبو جــەهلو ضيراری كوڕی خەططاب ئەسپەكانيان هەلينگ دانو بازيـان دايـە ئەوبـەرەوە، ئـيتر عەلی كوڕی ئـەبو طـاليب بـەرەنگاری عـەمر بـووەوە، كەوتنـە شـەڕو يـەكتر هێنـانو بردن، لەناكاما عەلی كوڕی ئەبو طاليب تـوانی عـەمر بكوژێ، لەگـەڵ، عـەمر كوژرا عەكرەمـەو ضـيراريـش هـەلاتن، پـەلاماردان بـەردەوام بـوو، تەنانـەت رۆژێكيـان كافرەكـان شـەبەيخونيان كـردە سـەر موسـولّمانەكانو زۆر بەتونـدی پـەلاماريان دا، پێغەمبـەرو هـاوەلانی بەرگرييـەكی نەبەردانـەيان كـرد، ئـەو رۆژە تـا ئێـوارە شـەڕ بـەردەوام بـوو، نەپێغەمبـەرو نـەهاوەلانی نـەيانتوانی نوێـژی نێـوەڕۆو عەصـرو شێوانو خەوتنان بكەن!

ئابلّوقە درێـژەی كێشاو كافرەكـان چـەندێك هێرشـەكانيان تونـد كـرد هيـچيان دەستكەوت نەبوو، بەلام رۆژ بەرۆژ موسولّمانەكان ترسيان لـێ غالّـب دەبـوو، ئالـەم

کاتە ناسكو تەنگو چەڵەمەیەدا نوعەیمی کوڕی مەسعوودی غەطەفانی هاتە خزمەت پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من موسوڵمان بووم هۆزەکەم نەیانزانیوە، سەرم لەرێتایەو چ فەرمانێکم پێ دەکەی تا ئەنجامی بدەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ یەکێکیت لەئێمەو لێرەدا هیچت پێ ناکرێ. شەڕیش فرتو فێڵی هەیە، موسوڵمانبوونەکەت دەرمەخەو بڕۆ بۆ ناو کافرەکان پیلانو فرتو فێڵی خۆت بخەکارو چۆنت بۆ دەکرێ هەوڵ بدە بیانخەڵەتێنە.

نوعەیم خێرا رۆیشت بۆ ناو جولەکەی بەنوقورەیظە، ئەوانیش بەپیریەوە هاتنو رێزیان لێ گرت، کەوتە قسەو گوفتو گۆ لەگەڵیان، ئامۆژگاری کردن: کە هاوکاری قورەیشییەکان نەکەن، هەتا لەوە دڵنیا دەبن: کە قورەیشو غەطەفان دوایی جێیان ناهێڵنو بەگورگان خواردوویان نادەن، مەچنە ناو جەنگەوە هەتا حەفتا پیاوی خانەدانتان نەدەنێ بەبارمتە، هەموویان قسەو تەگبیرەکەی نوعەیمیان پەسند کرد!

ئەمجار هاتە ناو قورەیشییەکانو وتو وێژی لەگەڵ پیاوماقوڵانیان کردو پێیانی گوت: قسەیەکتان پێ دەڵێمو نهێنی بێ لاتان لای کەس مەیدرکێنن، وتیان: بفەرموو ئێمە بەدڵسۆزی خۆمانت دەزانین. ئەمجار نوعەیم وتی: وەکوو من بزانم بەنوقورەیظە پەشیمان بونەوەو ترسی ئەوەیان هەیە: کە ئێوە گەڕانەوە موحەممەد بەسەریاندا بدا، ئێستا زێر بەزێری لەگەڵ موسوڵمانەکاندا رێك کەوتوون کە کۆمەڵێك لەپیاو ماقوڵانی ئێوەیان بەفێڵ بۆ دەسگیر بکەنو تەسلیمیان بکەن، موحەممەدیش رێگا بدا جولەکەکانی بەنونەضیر بگەڕێنەوە سەر جێگای خۆیان، ئاگاتان لەخۆتان بێ جولەکە نەتانخەڵەتێنن، پاشان چووە ناو سوپای غەطەفانییەکانو دڵی ئەوانیشی لێ پڕ کردن. پاش ماوەیەك ئەبو سەفیان لەشەوێکی شەممەدا ناردییە لای جولەکەکانی بەنوقورەیظەو داوای لێ کردن دەس بەکاربنو دەس بکەن بەجەنگان دژی موسوڵمانەکان، لەوەڵامدا وتیان ئێمە

پێمانەوە نایە لەشەممەدا بجەنگین، لەلایەکی ترەوە دەمانەوێ پێتان رابگەیەنین: کە ئێمە ناتوانین شەڕ دژی موحەممەد بەرپابکەین هەتا ئێوە حەفتا پیاوی ئەشراف و خانەدانتان نەنێرنە لامان وەکوو بارمتە. چونکە ئەگەر ئێوە کشانەوە ئێمە لێرەدا بەتەنیا چی بکەین؟ کە ئەم هەواڵە بەقورەیشییەکان گەیشتەوە، ئیتر قورەیشییەکان و غەطەفان وتیان: ئەوا قسەکەی نوعەیم راست دەرچوو، ئیتر وەڵامیان ناردەوە بۆ بەنوقورەیظە: کە ئامادەنین منداڵێکیان بەبارمتە بدەنێ. کە ئەم هەواڵە بە بەنو قورەیظە گەیشتەوە وتیان: وا دەرکەوت قسەکەی نوعەییم راستەو ئەمانە دەیانەوێ دەستی بوەشێنن، جا ئەگەر سەرکەوتن ئەوە باشە، ئەگەر سەرکەوتنیان بۆ دەستەبەر نەبوو بگەڕێنەوە بۆ مەڵبەندی خۆیان.

بەڵێ پیلانەکەی نوعەییم سەری گرت و پشێوی و تەفرەقە کەوتە ناو لەشکری دوژمنەوەو باوەڕو بتمانەیان بەیەکتر نەما.

لەلایەکی ترەوە بەفەرمانی خودای مەزن شەو دایکردە بارانبارین و هەڵکردنی زریان و گەردەلول و رەشەبایەکی ساردو تۆفان گێژەڵۆکەیەکی ترسناك. چادری بەسەر پێوە نەهێشت و ئاگرەکانی هەموو کوژاندنەوە. دایکردە باران و هەورەبریسکەو چەخماخەیەکی وەها خەریك بوو هەموویان زراویان بتۆقێ. ئیتر ترس و لەرز کەوتە دڵی دوژمنەوەو دەترسان موسوڵمانەکان ئەم کەش و هەوا سەخت و دژوارە بەهەل بزانن و لەخەندەق بپەڕنەوەو هەڵکوتنە سەریان و شەپرزەیان بکەن، لەترسان چاویان رەشکەوبێشکەی دەکرد. طولەیحەی کوڕی خووەیلید نەڕاندی و هاواری لێ هەڵسا کوڕینە وا موحەممەد هات بۆتان، خۆتان رزگار بکەن! ئەبو سەفیان بانگی راهێشت وتی: کوڕە نەکەن هەڵبێن حەیامان دەچێ!حوذەیفە دەڵێ: کەمێك لەشەو رۆیشتبوو پێغەمبەر ﷺ روی تێکردین و فەرمووی: کێ دەتوانێ بچێ بۆ ناو دوژمن و بزانێ دەنگ و باسیان چیەو چۆنە، لەبەر ترس و سەرما کەس هەڵنەستا، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم و چوومە خزمەتی: فەرمووی بچۆ بزانە چی ئەکەن و وەزعیان چۆنە؟ بەڵام هیچ نەکەیت تا

دەگەڕێیتەوە لام، منیش لەهەموو هاوەڵان زیاتر ترسم هەبوو سەرمام بوو وەلێ پێغەمبەر دوعای بۆ کردم هچیانم نەمان‌و رۆیشتم خۆم کرد بەناو لەشکری دوژمندا تروسکایی ئاگرێکم بینی، خۆمم لێ نزیك کردەوە دیتم پیاوێك رەشی زلە دەستی پیادەدا دوایی ئەژنۆو قول‌و قاچی خۆی پێ گەرم دەکاتەوە، رەشەباو گەردەلول‌و زریان‌و باران‌و سەرما کارێکی پێ کردن باس ناکرێ، چادریان بەپێوە نەماوە، ئاگریان کوژاونەوە دیزەو مەنجەڵیان بەسەر ئاگرەوە نەماوە، لەم کاتانەدا: کە من ئەم دیمەنانەم دیتن لەپڕێکا گوێم لێ بوو ئەبو سەفیان قیڕاندی‌و وتی: ئەی جەماوەری قوڕەیش! بەخوا ناتوانین چی تر خۆمان رابگرین، تەواو شبرژەبووین چی حوشترو وڵاخمان هەیە هەمووی تێدا چوو، بەنو قورەیظە درۆیان لەگەڵ کردین، داواتان لێ دەکەم هەرچی زووە خێرا باربکەن‌و باخۆمان رزگار بکەین، ئەم قسانەی کردن‌و خۆی هەڵدایە سەر وڵاخەکەی پێی پێوەناو قوڕەیشییەکان دایان بەیەکاو هەی لەوەی زوو خۆی رزگار بکا، ئیتر تیرەکانی تریش کە ئەمەیان دی هەر خێرا دەستیان بەهەڵاتن کرد کەس نەمایەوە!

حوزەیفە دەڵێ: کە هاتمەوە ئەم هەواڵەم بەپێغەمبەردا فەرمووی: (لا إله إلا الله وحده، صدق وعده ونصر عبده، وأعز جنده، وهزم الأحزاب وحده، ولا شيء بعده) کە رۆژ بوەوەو دونیا روناك بوو روانییان کەس لەسوپای دوژمن نەماوە، ئیتر هێمنی‌و ئارامی گەڕایەوە بۆ ناو دڵی موسوڵمانەکان.

بەم جۆرە جەنگی نێوان کافرەکان‌و موسوڵمانان تەواو بوو. حەوت لەهاوەڵان شەهید بوون‌و چوار کەس لەکافرەکان کوژرا بوون.

ئەمجار دوای ئەم بەرکوڵ‌و تیشك خستنە سەر چۆنیەتی روداوی غەزای خەندەق، دێینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان، سەرەتا قورئان دیمەنی غەزاکە رادەنوێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنُوداً لَمْ تَرَوْهَا﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە بەخوداو برواتان بەپەیامی پێغەمبەری خودا کردوە بەشوکرو سوپاسگوزارییەوە یادی

نیعمەتی خودا بکەنەوە بەسەرتانەوە: کاتێك پەلاماردران و دوژمن دەورەی دان و کەوتنە ئابلۆقەی بێ ڕەحمانەی دوژمەکانتانەوە، قوڕەیش و غەطەفان و جولەکەکان یەکیان گرتبوو لەشکرکێشییان کردبوو بۆ سەرتان، بۆ قەلاچۆکردن و ڕیشەکێشکردنتان، بۆ سوکایەتی پێکردن و شکاندنی شکۆمەندیتان، ئێمەیش ڕەشەبایەکی ساردو بەهێزمان لەسەر هەڵکردن، فریشتەمان ناردنە سەرو ئێوە نەتانبینین، ترس و لەرزیان خستنە دڵ و دەروونەوە ورەیان ڕوخا، ئاگری ژێر مەنجەڵ و ناو ئاگردانیان کوژایەوە خێوەت و ڕەشماڵیان لەبێخ هەڵکەندرا، دیزەو مەنجەڵیان سەرەونخون بوونەوە، ئەوەندەیان تین بۆ هات و شپرزە بوون سەرۆکی هەموو خێڵ و هۆزێك هاواری دەکردە هۆزەکەی خۆی و دەیگوت: ئەی هۆزی فلان! کوڕینە خۆتان ڕزگار بکەن، کوڕە چی زووە سەری خۆتان دەربکەن، طولەیحەی کوڕی خووەیلید، دەیگوت: موحەممەد سیحری لێ کردوین، کوڕینە خۆتان دەرباز بکەن، ئەبو سەفیان دەینەڕاندو دەیگوت: ئەی هۆزی قوڕەیش! سوێندم وابێ ئێرە بەکەڵکی تێدامانەوە نەماوە، ئەسپ و حوشترمان هەمووی فەوتا، بەنوقورەیظە خیانەتیان لەگەڵ کردین، لەوانەوە هەواڵی ناخۆشمان پێ گەیشتووە، ئەم ڕەشەباو زریان و گەردەلوولەش بەتەواوی شپرزەی کردوین، مەنجەڵمان بەسەر ئاگرەوە ناوەستێ ئاگرمان ناهایسێ خێوەتمان بەپێوە ناوەستێ، کوڕینە هەڵێن و باربکەن وا من ڕۆیشتم، ئیتر ڕۆیشت بۆ لای حوشترەکەی و سواری بوو هەڵات!!

﴿وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً﴾ بێگومان پەروەردگار ئاگاداری هەموو کاروکردەوەیەکتان بوو، ئاگاداری هەڵکەندنی خەندەق و ڕووبەڕووبوونەوەی بەڵاو کارەسات و تەنگ و چەڵەمەو ترس و لەرزتان بوو، ئاگاداری خۆئامادەکردن و سەنگەرنشینیتان بوو، پڕاو پڕ پاداشتان دەداتەوە!

ئەمجار دیمەنی ئابلۆقەو پەلاماردانی دوژمن بۆ سەر موسوڵمانەکان دەکێشێ و دەفەرموێ: ﴿إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ﴾ ئەی موسوڵمانینە یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە دوژمن هێرشی بۆ هێنان لەلای سەروتانەوە لەخۆرهەڵاتەوە،

لەخوارتانــەوە لــەخۆرئاواوە، خــێڵ و هۆزەکــانی قــورەیش و ئەحباشــەکانیان بــەنو کەنانەو توهامییەکان و بەنوقورەیظە هێرشیان بۆ هێنان و لەئابلۆقەیان دان.

﴿وَإِذْ زَاغَتْ الآبْـصَارُ وَبَلَغَـتْ الْقُلُـوبُ الْحَنَـاجِرَ وَتَظُنُّـونَ بِاللَّـهِ الظُّنُـونَ﴾ کاتێـك چاوتان لەتەماشاکردنی عـادەتی وەسـتا، چـاوتان بـەرایی نـەدا سـەیری دوژمـن بکـا، هێنـدە زۆرو بـێ شـومار بـوو نەتانـدەوێرا سـەیری سوپای دوژمـن بکـەن. لەترسـان دڵەکان گەیشتبوە بینەقاقاتان، جۆرەها گومانتـان دەربارەی خودا لەلا پەیـدا بوبـوو؛ هـەتانبوو ئیمـانی دامـەزراو بـوو بـەهیچ شـتێك لەهەڵوێـستی خـۆی دانەدەبـەزی، بتمانــەی بەیارمــەتی خــودا هــەبوو، چـاوەڕوانی هـاتنی کۆمــەگی پــەروەردگار بــوو هەشــتانبوو دوڕوو دڵنــەخۆش بــوو، گومــانی وا بــوو: کــە موحەممــەدو هــاوەڵانی قەلاچـۆدەکرێن و کافرەکـان سـەرکەوتن بەدەسـت دێـنن و شـاری مەدینـە کـۆنترۆڵ دەکەن.

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: مونافیقەکان پێیان وابـوو موسـوڵمانەکان لـەبێخ دەردەهێندرێن، موسوڵمانەکانیش پێیان وابوو سەرکەوتن بۆخۆیان دەبێ.

﴿هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئالـەو کـات و شـوێنەدا موسـوڵمانەکان بەتاقیکرانـەوە، لەبۆتەدران، موسوڵمانی ساغ و مونافیق لێك هـەڵهاوێران ﴿وَزُلْزِلُـوا زِلْـزَالاً شَـدِيداً﴾ بەباشی راتڵەقێنـدران، هەژێنـدران، کەوتنـە نـاو تـەنگ و چـەڵەمەو سـەخڵەتییەوە، تـرس و هەڕەشـەی دوژمـن بەتـەواوی لەکـەوو بێـژنگی دان، هـەیانبوو خـۆگر بـوو ئەوانە موسوڵمانی رستاڵ بوون، هەیانبوو قەلەق و دڵەخورپێی پێکەوت و لێوەلەرەو ئەژنۆ لەرزینی پێوە دیار بوو ئەوانە دووڕووەکان بوون.

هەڵبەتـە تاقیکردنـەوەی خـودا بـۆ ئـەوە نیـە شـتێکی لانادیاربـێ بیـەوێ بـۆی دەربکـەوێ، بـەڵکوو لەبـەر حیکمـەتێکی تـرە، بـۆ ئەوەیـە: ئـەو نهێنـییـە بـۆ پێغەمبەران فریشتەو کەسانی دیکە دەربکەوێ. بـۆ ئەوەیـە ئـەو حاڵەتـە نادیـارەی خودا پـێی دەزانـێ و لەخەڵکی دی شاراوەیە بۆیان دەربخا!

ئـەمجار دوای رانوانـدنی دیمـەنی غەزایەکـەو چـۆنیەتی مـەوقیفی روداوەکـە. هەڵوێستی مونافیقو پشتگیریکاران بەیان دەکا. دەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ يَقُـولُ الْمُنَـافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلاّ غُـرُوراً﴾ یـادی ئـەو کاتـە بکەنـەوە: کە مونافیقەکان؛ ئەوانەی بەڕواڵەت ئیمانیان هێنابوو بـەڵام بـەدڵ هـەر کـافربوون هـەروەها ئەوانـەی کـە تـازە موسـوڵمانو بـیرو باوەڕیـان لاواز بـوو بـەهۆی تـازە ئاشنابوونیان بەئیسلام، ئەمانە وتیان: ئەو وادەو بەڵێنەی خوداو پێغەمبەری خودا پێیان داین هەڵخەڵەتاندن بوو، چ حەقیقەتێکی نیەو نابێ، سەرکەوتنی چی!!

بێـژەری ئـەم قسانە کۆمـەڵێك جولەکـەو دووڕوو بـوون نزیکـەی حـەفتا پیـاو بوون، لەوانـە (مُعتب)ی کـوڕی قوشـەیرو طوعمـەی کوڕی ئوبـەیریق.موعەتتـەب کاتێ لەشکری ئـەحزابی بینـی وتـی: هەیهـەی موحەممـەد وادەی ئـەوەمان پـێ دەدا وڵاتـی فـارسو رۆم داگـیر بکـەین، کەچـی ئێـستا وا ئێمـە بەراشـکاویو بـێ تـرس نـاتوانین سـەرئاوێك بکـەین! بەراسـتی ئەمـە وادەی بـێ بناغـەو هەڵخەڵەتانـدنی ئاشکرایە. تازە موسوڵمانبوەکانیش چونکە ئیمانەکەیان لاواز بـوو تـرسو خـۆفێکی زۆر دەوری دابـوون ئـەوانیش لاسـای مونـافیقو جولەکـەکانیان دەکـردەوە هـەڵسو کەوتی ئەوانیان پەیڕەو دەکرد.

﴿وَإِذْ قَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا﴾ یـادی ئـەوە بکەنـەوە، ئەو هەڵوێستو بارودۆخە بخەنە وەبەرچاوی خۆتـان: کـە کۆمـەڵێك لـەدووڕووەکان: (ئەوسی کوڕی قەیظیو هەواخواهانی) یـان (عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەیو هـاوەڵانی) وتیـان: ئـەی دانیـشتوانی مەدینـە! هـیچ هۆیـەك نیـە بـۆ مانـەوەتان لەگـەڵ موحەممـەدو لەشـکرەکەیدا، بـەم شـێوەیە بەباشـی نـازانین لەگـەڵیدا بـنو خۆتـان مـاڵوێران بکـەن، بۆچـی خۆتـان بـەفڕ دەدەن، بەراسـتی ئـەم شـەڕە هـی ئێـوە نیـەو بەخۆڕایی خۆتانی تێوەردەدەن، کوڕە ماڵوێرانینە بگەڕێنەوە بۆ ناو خـاوو خێزانـی خۆتان بۆ ئەوەی لەکوشتنو گرتن رزگارتان ببێ!

هەر لەم روانگەوە مونافیقەكان نائومێدیو ترسو لەرز سواری دڵو دەروونیان بوو، ﴿وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ كۆمەڵێكیان بڕیاری گەڕانەوەیاندا بۆ ناو ماڵو منداڵی خۆیانو داوای روخصەتیان لەپێغەمبەر كرد بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیانو گۆڕەپانی شەڕ جێ بێڵن، وتیان: خانووەكانمان قایمو پتەونین، دەرگاو پەنجەكانیان هیچیان لێ ناگەڕێتەوە، ماڵو منداڵمان لەخەتەردایەو ترسی ئەوەمان هەیە دوژمنو دز خۆیانی پیا بكەن ماڵمان تالآن بكەن ژنو منداڵمان بڕفێنن، هەر هیچكە نەبێ بیانترسێنن. پەروەردگار بەدرۆیان دەخاتەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ﴾ ئەوانە درۆ دەكەن خانوو ماڵەكانیان شڕو هەڵوەشاونین، بەڵكوو قایمو پتەون، دیوارو دەرگاو دوودەرییان توكمەو قایمن. بەڵكوو ئەوە دەكەنە بیانوو بۆ هەلآتنو خۆدزینەوە لەمەیدانی شەڕو روبەرو بوونەوەی سوپای كافران.

ئەمجار پەروەردگار ئیمانیان بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِمْ مِنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا﴾ ئەگەر دوژمن لەهەمو لایەكەوەو لەهەر چوار لای مەدینەوە پەلاماریان بدا، داوای پاشگەزبوونەوە لەئایینیان لێ بكرێو پێیان بگوترێ: شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان بكەن، خێرا بێ سێو دوو فەرمانبەردار دەبوونو یەكسەر پاڵیان دەدایە سوپای كوفرو هیچ منجە منجێكیان نەدەكردو ساتەوەختێك رانەدەوەستان لەبەپیرچوونی بانگەوازی لەشكری كوفر، هەر ئەوەندە داوایان لێ بكرایە خێرا ئامادەباشی خۆیان نیشان دەدا.

یان دوای كافر بوونەوەیان ماوەیەكی كەم نەبێ لەمەدینەدا نەدەمانەوەو خێرا بەهیلاك دەچوون!

ئەمە نیشانەی بیرو باوەڕی لەرزۆكیانە، ئەوانە ئیمانیان لەدڵدا نەچەسپاوە بیرو باوەڕەكەیان سەرزارەكیو رواڵەتییە. كەوابێ هیچ جێگای سەرسوڕمان نیە، كە

بەکەمترین ترس و بانگەوازییەکی هاکەزایی پاشگەز ببنەوە، ئەمە داب و نەریت و رەوشتی ترسنۆکانە، هەر لەگەڵ تینێکیان بۆ هات خێرا رێگای هەڵاتن دەگرنەبەرو دەقاچێنن.

ئایەتەکە ئاماژە دەکا بۆ خێڵی بەنو حاریثە ئەوان بوون هاتنە لای پێغەمبەرو داوای ئەوەیان کرد رێگەیان پێ بدرێ بگەڕێنەوە ناو ماڵ و خێزانیان بڕوبیانووی نامەعقوول و بێ بناخەیان هێنانەوە.

﴿وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِنْ قَبْلُ لا يُوَلُّونَ الأَدْبَارَ﴾ بێگومان ئەو بڕوا لاوازو مونافیقانە (خێڵی بەنو حاریثە) لەوەپێش پەیمانیاندا بەخوداو بەپێغەمبەری خودا لەرۆژی ئوحوددا: کە ئیتر بەبڕای بڕای جارێکی تر لەجەنگدا پشت هەڵنەکەن و لەکاتی تەنگانەو روبەڕوبوونەوەی دوژمندا هەڵنەیەن و مەیدانی جەنگ بەجێ نەهێڵن. پاشان تۆبەیان کردو بەڵێنیاندا بەخودا: کە جارێکی تر ئەو کارە ناشیرینە نەکەن و نەگەڕێنەوە بۆ ئەو رەوشتە ناشیرینە! ﴿وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولاً﴾ بێگومان عەهدو پەیمانی خودا لێ پرسینەوەی هەیەو هەروا بەئاسانی بۆیان بەسەر ناچێ، بەڵکوو رۆژی قیامەت خودا پرسیاریان لێ دەکاو سزاو تۆڵەی پەیمانشکێنی و پاشگەزبونەوەیان لێ دەستێنێ!!

ئەمجار پەروەردگار بێهودەیی هەڵاتنەکەیان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَنْ يَنْفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِنْ فَرَرْتُمْ مِنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذاً لا تُمَتَّعُونَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەر! هەواڵ بدەرە ئەو دووڕووانەو پێیان بڵێ: هەڵاتن دەردی ئێوە دەرمان ناکا، تەمەنتان درێژ ناکا، هیچ سودێکتان پێ ناگەیەنێ و مردن و کوشتنتان لێ دوور ناخاتەوە، چونکە ئەوەی لەزانیاری خودادا بڕیار دراوە گۆڕانی بەسەردا نایە، بەڵکوو لەوانەیە هەڵاتن مردنتان لێ نزیك بکاتەوە، خۆ ئەگەر بەرواڵەت هەڵاتن بۆ ماوەیەك مردنی لێ دوور خستنەوە، (وەکوو بۆخۆیان دەڵێن: لەمردن رزگاریان بوو) ئەوە بابزانن لەززەت بینیان لەو ژیانە کورتەی دوا هەڵاتنەکەیان لەززەتێکی

کورت و کەمخایەنەو بەهیچ حیساب دەکرێ. چونکە ژیانی دونیا چەندێك درێژ بێ لەئاست ژیانی قیامەتدا بەکەم دەژمێردرێ و وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدَّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى﴾ (النساء:٧٧).

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر قودرەت و دەسەلاتی خۆی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُمْ مِنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءاً أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً﴾ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: کێ ئێوە لەعەزابی خودا دەپارێزێ؟ واتە: کەس ناتوانێ ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم ویست و ئیرادەی خودادا دەربارەی ئێوە، چی بۆ بڕیار دابن هەر دەبێ بێتەجێ، ئەگەر خودا زیانێکی بۆ بڕیار دابن کەس ناتوانێ رەتی بکاتەوە، ئەگەر بیەوێ نیعمەتێکتان بەسەردا بڕێژێ هەمدیسان کەس نیە بتوانێ ببێتە، لەمپەڕو نەهێڵێ ئەو ویستەی خودا بێتە جێ.

﴿وَلا يَجِدُونَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيّاً وَلا نَصِيراً﴾ ئەو دووڕوو بەدبەختانە، خۆیان و هەوا خواهانیان کەسیان دەس ناکەوێ جگە لەخودا یارمەتیدەرو پشتگیریان بێ، تەنانەت بەبێ ئیزن و رەزامەندی خودا کەس ناتوانێ شەفاعەتیشیان بۆ بکا.

﴿قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنْكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا﴾ هەرچەندە بەگوێرەی یاسای نەحوو بەلاغە وشەی (قد) لەسەر فیعلی (مضارع) بۆ تەقلیلە. بەلام لێرەدا بۆ تەحقیق و چەسپاندنە واتە: بەتەئکید پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەهەموو ئەوانەی هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشێن بۆ دڵ سارد کردنەوەی موسوڵمانان لەئامادەبوونی جەنگ و زێوان کردنەوەیان لەبەشداری کردن، ئاگاداری ئەوانەیە: کە بەناسیاوو برادەرو خزم و کەس و کاری خۆیان لەمەدینەییەکان دەڵێن: وەرن ئێوەش وەکوو ئێمە پاڵی لێ بدەنەوەو بۆخۆتان لەژێر سێبەرو لەناو ماڵ و حاڵی خۆتاندا لەزەت وەربگرن. وەرن خۆتان لەئێمە نزیك بکەنەوەو هەڵوێستی ئێمە وەربگرن. ئەو بێژەرانەی کە رستەی ﴿وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ﴾ ئاماژەی پێ دەکا،

وێدەچێ دووڕووەکان بووبن بەموسوڵمانەکانیان گوتبێ؛ وەرن پاڵ لەئێمە بدەن موحەممەدو هاوەڵانی تاقمێکی کەمن و لەناو دەچن، چی زووە دەستیان لێ بەردەن.

دەشگونجێ بێژەرەکان جولەکەکانی بەنوقوڕەیظە بووبن بەبرا دووڕووەکانی خۆیان گوتبێ وەرن پاڵ لەئێمە بدەن دەست لەموحەممەد بەربدەن، چونکە موحەممەدو هاوەڵانی دەفەوتێنۆ بەکەڵکی ئەوە نایەن ئێوە پشتیان پێ ببەستن، ئەگەر ئەبو سەفیان بەسەرتاندا زاڵ ببێ ئیتر کەستان لێ ناهێڵێتەوەو قارەبڕتان دەکا!

﴿وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ئەو دووڕووانە ئامادەی جەنگ نابن مەگەر ماوەیەکی کەم، ئەویش لەبەر ناچاریی و بۆ زیان دوور خستنەوە لەخۆیان و لەترسی مردن، ئەوانە لای خودا ئاشکراو نمایانن، لەژێر تیشکی زانیاری خودا هیچ شتێکیان بۆ ناشێردرێتەوە. فرت و فێڵ و بیانوویان بوچ و بێ بناغەن!

﴿أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ﴾ ڕژدو بەخیلن بەخۆیان و بەماڵ و حاڵیان، لەکاتی شەڕو جەنگدا هیچ یارمەتێکیان لێ چاوەنوار ناکرێ، خۆیان ماندو ناکەن، یارمەتی جەستەیی و ماڵی و مەعنەوییان لێ هەڵناوەرێ، هەروەها لەکاتی دابەشکردنی فەیئو غەنیمەتدا چاو چنۆك و بەرچاو تەنگن. هەر شتێك سودی موسوڵمانانی تێدا بێ ئەوان ئەنجامی نادەن، ﴿فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ﴾ ئەگەر ترس پەیدا بوو بەهۆی دەست پێکردنی شەڕو جەنگەوە. دەبینی چاویان لێ هەڵدەگەڕێتەوە چاویان بەملۆق دەوەستێ و دەڵێی لەکاتی سەرەمەرگدان، دڵەتەپەیان پێ دەکەوێ و خەریکە زەندەقیان بچێ!

کەچی ﴿فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ هەر کە ترس و خۆف ڕەوییەوەو کەوتنەوە بارودۆخی ئارامی و ئاسایییەوە زمانیان درێژ دەکەن و شێرەخورەو پاڵەوانی وەکوو خۆیان دەست ناکەوێ!! دەست دەکەن بەخۆ

هەڵکێشان و فشه کردنێك هەر مەپرسە! خۆیان هەڵدەنێنەوە، رەوشتی ئازایی پاڵەوانیەتی پاڵ خۆیان دەدەن.

﴿أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ﴾ لەسەر خێر رژدو چروکن تۆزقاڵێك خێریان بەناوچاوانەوە نیە. ئەوان ترسنوکی و درۆزنی و بێخێرییان تێدا کۆبۆتەوە، لەکاتی شەڕدا ترسنۆك و هیچ لەبارانەبوو، لەکاتی دابەشکردنی دەستکەوت و غەنیمەتدا فشەکەرو زمان درێژو نوزە درێژو داواکار، چەندێکیان بدرێتێ داوای زیاتر دەکەن هەڵپەی هی تریانە، هۆکاری هەموو ئەو رەوشتە ناشیرینانەیان ئەوەیە ﴿أُولَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا﴾ ئەوانە روناکی ئیمان لەدڵی نەداون، ناو دڵ و دەروونیان بەنووری ئیمان رۆشن نەبۆتەوە، بڕوایان بەخودای تاك و تەنها نیە، بڕوایان بەپێغەمبەر نیە، لەناخەوە موسوڵمان نەبوون هەرچەندە بەرواڵەت لافی ئیمانداری لێ دەدەن، ﴿فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ﴾ خودا کردەوەکانیانی پوچ کردنەوە، ئەو کردەوە نابەدڵانەی لەگەڵ موسوڵماناندا ئەنجامی دەدەن خودا پوچی کردونەوەو هیچ بایەخیان نیە بۆیان ﴿وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً﴾ پوچەڵکردنەوەی کردەوەکانیان لای خودا سەهل و ئاسانە، چۆنی بوێ بەگوێرەی حیکمەت و دانایی خۆی ئەنجامی دەدا.

﴿يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا﴾ لەبەر ترس و پەشۆکاوی خۆیان هەرچەندە ئەحزاب شکان و هەڵهاتون و تازە ناگەڕێنەوە، پێیان وایە قورەیش و غەطەفان و بەنو قورەیظە هەر خەریکی ئابڵوقەدانی مەدینەن و هەڵنەهاتوون، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکیش پاشەکشەیان کردبێ سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە بۆ سەر حاڵی پێشوویان و ئابڵوقەیان دەدەنەوە.

﴿وَإِنْ يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُمْ بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنْبَائِكُمْ﴾ ئەگەر لەفەرزێکدا حیزبەکان بێنەوە بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئێوەدا، ئاواتەخوازی ئەوە دەبن کە لەناو مەدینەدا نەبن و لەریزی جەنگاوەراندا نەبن. بەڵکوو پێیان خۆشە لەدەرەوەی مەدینەدا بن و لەناو گوندو دەوار نشینەکاندا بن و لەوێوە

پرسیار لەئێوە بکەن و هەواڵی ئێوە بزانن، ئەواتە خوازی ئەوەن لەناو عەرەبە دەشتەکییەکاندا بوو نایەو دوور بەدوور هەواڵی ئێوەیان پێ بگەیشتایە، بەتێشکانیشتان کەیفخۆش بوونایە. دوور بەدووریش ئاگاداری شەڕ نەبوونایە.

﴿وَلَوْ كَانُوا فِيكُمْ مَا قَاتَلُوا إِلاّ قَلِيلاً﴾ خۆ ئەگەر ئەو دووڕووانە لەگۆڕەپانی جەنگیشدا لەگەڵتاندا بوونایە هەتا سەر خۆیان نەدەگرت و بەردەوام نەدەبوون لەگەڵتاندا بەڵکوو ماوەیەکی کەم و شەڕێکی کەمیان دەکرد، چونکە ترس و دڵەلەرزە بڕستی لێ دەبڕین و پەنایان دەبردە بەرخۆ دزینەوەو هەڵاتن.

ئەمجار سەرنجی ئادەمیزادان رادەکێشێ بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بکەنە نموونەو رابەری خۆیان و چاو لەوئەو بکەن دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً﴾ ئەمە هەواڵە لەشێوەی فەرماندا، پەروەردگار فەرمان بەموسوڵمانان دەکا: کە چاو لەپێغەمبەر بکەن و ئەو بکەنە پێشەواو رابەری خۆیان لەرۆژی ئەحزاب و رۆژانی تردا لەکاتی تەنگ و چەڵەمەو کاتی ئاسایی‌دا، لەکردارو گوفتارو هەڵس و کەوتدا، لەخۆڕاگری و ورە بەرزی و تێکۆشاندا، لەچاوەڕوانی یارمەتی خوداو سەرکەوتنی حەق بەسەر ناحەقدا، دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانینە بێگومان بۆ ئێوە هەیە رابەرایەتی و قودوەیەکی صاڵح و نموونەیی: کە شیاوی ئەوەیە شوێنی بکەون و بیکەنە مامۆستای خۆتان، ئەو یش پێغەمبەری خودایە دە چاو لەئەو بکەن و ئیقتیدا بەئەو بکەن، بیکەنە رابەری خۆتان، بێگومان پێغەمبەر نموونەی هەرە بەرزی ئازایەتی و خۆڕاگرییە، رەمزی پیاوەتی و مرۆڤایەتییە بۆ کەسێك بەتەما پاداشی خودا بێ و رۆژی قیامەتی لەبیر بێ و لەحیساب و لێکۆڵینەوەی ئەو رۆژە سەختە بترسێ. شەوو رۆژ خەریکی یادو پەرستشی خودا بن. دەی ئەگەر ئێوەی موسوڵمان بەتەما پاداشی خودان و ترسی رۆژی قیامەتتان هەیەو هەمیشە یادی خوداتان لەدڵ دایەو شوێن

پێغەمبەر بکەونو چاو لەئەو بکەن لەهەموو کردارو گوفتارێکتاندا. لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەکاتی شەڕو لەکاتی ئاشتیدا!

ئەمجار دوای رانواندنی مەوقیفی دووڕووەکان هەڵوێستی موسوڵمانەکان باس دەکا، خۆگریو ورەبەرزییان لەکاتی روبەڕوبوونەوەیان لەگەڵ دوژمندا رادەنوێنیو دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الآحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ کاتێك موسوڵمانە راستەقینەکان، ئەوانەی لەکردارو گوفتاریاندا دڵسۆزو حەققانی بوون، کاتێك سوپای ئەحزابیان بینی ئابڵوقەی مەدینەیان دابوو، بەورەبەرزییەوە وتیان: ئەمە ئەو تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانەیە: کە خوداو پێغەمبەری خودا هەواڵیان پێ دابووین. بەرەنگاری دوژمن دەبینەوەو سەرەنجام سەرکەوتن.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی فەرموو: (ان الأحزاب سائرون إليكم تسعاً أو عشراً) ئەحزاب گەلەکۆمەکێیان کردوەو دێنە سەرتان دوای نۆ شەوی تر یان دە شەوی تر، هەروەها فەرمووی: (سيشتد الأمر باجتماع الأحزاب عليكم والعاقبة لكم عليهم) تەنگو چەڵەمەتان زیاد دەکاو دەکەونە تەنگانەیەکی گەورەوە بەو گەلە کۆمەکییەی ئەحزاب بۆ سەرتان، بەڵام سەرەنجام سەرکەوتنو پیرۆزی بۆ ئێوەیە.

بۆیە: کە ئەو هێرشو گەلە کۆمەکییەیان بینی وتیان: ئەمە ئیختیباری ئێمەیەو خودا بەتاقیمان دەکاتەوە، سەرکەوتن بۆ ئێمە دەبێ. ﴿وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ خوداو پێغەمبەری هەواڵ راست دەفەرمونو وادەو بەڵێنیان پاشگەز بوونەوەی تێدا نیەو سەکەوتن هەر بۆ ئێمە دەبێ. ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيمَاناً وَتَسْلِيماً﴾ بینینی ئەو لەشکرە زۆرو هەمە جۆرە، ئەو گەلەکۆمەکیو ئابڵوقەدانو پەلاماردانەی دوژمن بۆیان بیرو باوەڕی پتەوتر کردنو ئیمانیان زیاد بوو، زیاتر پشتیان بەخودا بەستو خۆیان تەسلیمی قەزاو قەدەری خودا کردو زیاتر ملکەچی فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەری خودا بوون، لێیان یەقین بوو: کە سەرکەوتن

بەدەست خودایەو ئەمان هەر ئەوەندەیان لەسەرە هۆكارە مادییەكان دەستەبەر بكەن و ئامادەباشی تەواویان هەبێ و بەفیعلی بجەنگن و هێزو توانای خۆیان بخەنە كارو خەرجی بكەن ئیتر پیرۆزیی سەرەنجام بەدەست خودایەو بەمەرجێ ئەمان كەمتەرخەمی نەكەن لەدابینكردنی پێداویستی روبەروبوونەوە خودا زاڵیان دەكا.

هەڵبەتە شتێكی چەسپاوە: كە جیهاد كردن و تێكۆشان لەپێناو ئایینەدا تەكلیفێكی یەزدانییەو جێبەجێ كردنی فەرزی كیفایەو جاری واش هەیە دەبێتە فەرزی عەین، پابەند نەبوون بەم فەرمانە خوداییەو پەكخستنی و خەڵك لێ سارد كردنەوەی تاوانێكی گەورەیە، جیهاد هەموو كاتێ بەگوێرەی بارودۆخ ئەركێكی سەرەكی و پیرۆزی سەرشانی موسوڵمانانەو دەبێ خۆیانی بۆ ئامادە بكەن و ئەنجامی بدەن. وێڕای هەوڵ و تێكۆشانی خۆیان و چاوەڕوانی یارمەتی و كۆمەكی پەروەردگار بن. بەڵام تەنها پشت بەستن بەخوداو چاوەڕوانی هاتنی یارمەتی خودا بەبێ هەوڵ و تێكۆشانی موسوڵمانان، واتە: موسوڵمانان خۆیان پاڵی لێ بدەنەوەو بەتەما ئەوە بن خودا بۆیان دەستەبەر بكا ئەوە تێنەگەیشتنە لەئایەتەكانی قورئان و پاشگوێ خستنی فەرمانی پەروەردگارە خۆ هەڵخەڵەتاندن و خەیاڵ و ئاواتی شەیتانییە. لەقورئاندا چەند جار هەڕەشە كردن لەم جۆرە تێگەیشتنە هەڵانە دووبارە بۆتەوە وەكوو دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ﴾ (البقرة:٢١٤) یان دەفەرموێ: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ؟﴾ (العنكبوت:٢).

ئایەتەكە بەڵگەیەكی ئاشكراو رونە لەسەر ئەوە دەبێ موسوڵمانان بتمانەی تەواویان بەوادەو بەڵێنی خوداو پێغەمبەر هەبێ. هەر كاتێ یارمەتیدانی خودا نەهات یان دواكەوت ئەوە با بزانن: خەلەلێك لەخودی موسوڵمانەكان خۆیاندا هەیە، بۆ خۆیان وەكوو پێویست ئەركی سەرشانی خۆیان جێ بەجێ نەكردوە.

جەماوەری زانایان ئەم ئایەتەیان کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە: کە ئیمان زیادو کەم دەکا.

ئەمجار وەصفو ثەنای ئەو موسوڵمانانە بەیان دەکا: کەپابەندی وادەو بەڵێنی خۆیان بونو بەدڵسۆزیو ئیخلاصەوە لەپێناو ئایینی خودادا تێکۆشانو تێدەکۆشن، تا دوا هەناسەو دوا تنۆکی خوێنیان لەپێغەمبەر جیانەبوونەوە، دەفەرموێ: ﴿مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾ واتە: کۆمەڵێکی موسوڵمانی راستاڵو دڵسۆز هەن لەگەڵ پەیمانو وادەو خۆیاندا راستگۆ بوون پەیمانی خۆیان لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودا بەراستی بردە سەرو دڵسۆزانە تێکۆشان، ئەو وادەو پەیمانەی دابوویان: کە لەکاتی تەنگانەو روبەروبوونەوەی دوژمندا خۆڕاگرو بەئارام بن بەباشی پابەندی بوون.

جا ﴿فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ﴾ هەیانبوو تەمەنی کۆتایی هاتو لەپێناو ئایندا خۆی بەخت کرد وەکوو ئەو هاوەڵانەی لەغەزای بەدرو ئوحوددا گیانی پاکی خۆیان کردە قوربانی، ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً﴾ هەیشییانە چاوەڕوانی شەهید بوونە لەمەیداندا دەجەنگیو خۆی فیدایی کردوەو بەتەما پیرۆزی سەرکەوتن یان شەهید بوونە. تۆزقاڵێك لەوادەو بەڵێنی خۆیان پاشگەزنەبوونەوەو نابنەوە. بەپێچەوانەی دووڕووەکانەوە: کە وادەیان دا: خۆ راگربنو لەبەرامبەر دوژمندا هەڵنەیەن، کەچی هەر: کە تین هات خێرا لەقسەو وادەی خۆیان پەشیمان بوونەوەو پشتیان هەڵکرد.

ئیمامی بوخاری لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەنەسی کوڕی (النضر) کەبۆی نەکرا ئامادەی جەنگی بەدر بێ، زۆری پێ ناخۆش بوو، وتی: یەکەم جەنگ: کە پێغەمبەر ﷺ ئامادەی بوو من لێی دواکەوتم، شەرت بێ ئەگەر نەمرم جەنگێکی تر بێتە پێشەوە دەبێ لەخزمەت پێغەمبەردا بەو شان بەشانی ئەو بەو لێی دوا نەکەوم دەبێ نیشانیشی بدەم چۆن

خۆم فیدایی دەكەم!! ئەنەس دەڵێ: ترسا لەوە كە زیاتر بڵێ: دەفەرموێ: ڕۆژی غەزای ئوحود مامم لەتەك پێغەمبەردا ﷺ ئامادەی غەزابوو، تووشی سەعدی كوڕی مەعاز بوو ئەنەس پێی فەرموو: ئەی ئەبو عەمر بۆ كوێ دەچی؟ ئای لەبۆنی بەهەشت كە خۆشە، وەڵلاهی من بۆنی بەهەشتم لەلای ئوحودەوە بۆ دێ؟ ئیتر لەدژی دوژمن جەنگا تا شەهید بوو، دوایی سەیریان كرد هەشتاو ئەوەندە برینی پێوە بوون ئیتر ئایەتی ﴿مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾ نازڵ بوو.

زومەخشەری دەفەرموێ: كۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر لەسەر خۆیان نەزر كرد: كە ئەگەر جارێكی تر لەتەك پێغەمبەردا ﷺ ڕوبەڕوی دوژمن بوونەوە خۆیان ڕادەگرن و بەورەیەكی بەرزەوە دژی دوژمن دەجەنگێن تا شەهید دەبن، ئەم كۆمەڵە هاوەڵە عوسمانی كوڕی عەففان و طەلحەی كوڕی عوبەیدلاو سەعیدی كوڕی زەیدو عەمری كوڕی نوفەیل و حەمزەو موصعەبی كوڕی عومەیرو هی تریش بوون. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هۆكارو حیكمەتی بەتاقیكردنەوەكە بەیان دەكاو دەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِنْ شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: خودا بەندەكانی بەتاقی دەكاتەوە بەترس و برسیەتی و بەروبەروبوونەوە لەگەڵ دوژمندا، بۆ ئەوەی چاك و خراپ لێك جیا ببنەوە، دەربكەوێ كێ ئازاو نەبەردە، كێ ترسنۆك و خوێڕییە، بەواقیعی چۆنیەتی و حەقیقەتی هەموو كەس ئاشكرا بێ، ئەمجار خودا پاداشی باش بداتەوە بەوانەی ڕاستگۆن لەوادەو پەیمانیاندا، خاوەنی صەبرو ورەی بەرزن لەبەرامبەر دوژمندا، فیداكارو پێشمەرگەن لەپێناو ئایینی خودادا، هەروەها بۆ ئەوەی تۆڵە لەدوڕوو پەیمانشكێنان بستێنێتەوە ئەگەر مەیلی لێ بوو، یان تۆبەیان لێ وەربگرێ ئەگەر تۆبەی ڕستالانەو ڕاستیان كرد. واتە: هەموو كارێك بەدەست خودا خۆیەتی، هەر كارێك دەكاو هەر بڕیارێك دەردەكا، بێ حیكمەت نیە، بێهودەو بەهەوانتە نیە، هەمووی بەگوێرەی حیكمەت و نەخشەو پلانی ئەزەلی پەروەردگارەو بۆ مەبەستێكی پیرۆزو بەرزە، سەرەنجامیشی بۆ ئەو ئاكامەیە: كە خودا دەیەوێ.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ بێگومـان خـودا لێخۆشـبوو بـەرەحمو بـەزەیـیـە، رەحمـەتو لێخۆشـبوونی خـودا زۆر لـەقارو غـەزەبی نـزیكترو زۆرتـرە، خـاوەنی لێخۆشبوونە بۆ بەندەكانی، تاوانەكانیان دادەپۆشیٚو رەحمی پـێ كـردون بـەوە: كـە تۆفیقی داون بۆ تۆبەكردنو ئیمانهێنان، لەسەر تاوانی پێش موسوڵمان بـونو تۆبـە كردنیان سزایان نـادا، نموونـەی ئـەم ئایەتـە چـەند ئایـەتێكی تـرە: كـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾ (محمـد: ٣١) یـان دەفـەرموێ: ﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ (آل‌عمران: ١٧٩).

ئـەمجار كۆتـایی روداوەكـە نمـایش دەكـا بـەكۆتایـیـەك: كـە تەصـدیقو بـڕوای موسـوڵمانان بـەخودای خۆیـان زیـاد دەكـاو دەیـچەسپێنیٚ، گـومڕایی مونافیقـەكان دەردەخـاو گـەواهی بـیرو بۆچـونی هەڵەیانـە، دەفـەرموێ: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْراً﴾ پـەروەردگار بـەقودرەتی خـۆی ئـەحزابی لـەدەوری مەدینـە بەسەر پاشوانیاندا گێڕانەوە، بـێ ئـەوەی هـیچ ئامانجێكیـان دەسـت بكـەوێ بـەرقو كینـەی خۆیانـەوە گەڕانـەوە، نـەیانتوانی هـەدەفێك بپـێكن، هـیچ سـەركەوتنێك بەدەست بێنن، هیچ خێرو بێرێكیان دەست نەكەوت لەغەنیمـەتو بـەدیل گـرتنو دەست وەشاندن، خودا رەشـەبای تونـدو سـاردو سـەرماو گـەردەلولو زریـانی لەسـەر هەڵكردن، سەریان لـێ تێك چوو ورەیان روخا، كۆمەڵیان پەرتەوازە بـونو بەسـەری شكاوو پاشەڵی دڕاوەوە قاچاندیان هەی لەوەی سەری خۆی دەركا، هیچ زەفـەرێكیان بەموسوڵمانان نەبرد هیچیان دەست نەكەوت، هیچ ئاواتێكیان نەهاتە دی، ﴿وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ﴾ پـەروەردگار بـارودۆخێكی وای رەخسـاند پێویـست بـەوە نـەكا موسـوڵمانان دەسـتەویەخەی داگیركـەرو پـەلاماردەران ببنـەوە بـەڵكوو بـەقودرەتی خۆی رەشـەباو زریـانو تۆفـانی لـێ وەكار خـستن فریـشتەی ناردنـە سـەریانو بـەو دەردەی بردن: كە بردنی. پەروەردگار بۆ خـۆی بەشـەڕەكە هەڵساو خـۆی لـەجیاتی

موسوڵمانان بەرەنگاری سوپای كوفر بووەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وەكوو بوخاری ریوایەتی كردوە دەفەرموێ: (لا إله إلا الله وحده، صدق وعده، ونصر عبده، وأعز جنده، وهزم الأحزاب وحده، فلا شيء بعده) لەصەحیحەیندا هاتووە لەعەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفاوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دوعای لەسوپای ئەحزاب دەكرد دەیفەرموو: (اللهم منزل الكتاب، سريع الحساب، اهزم الأحزاب، اللهم اهزمهم وزلزلهم).

بەڵێ بەو شێوە شەڕی ئەحزاب دەستی پێكردو بەو جۆرە روداوەكانی هاتنە دیو بەئاكام گەیشت، لەهەموو حاڵەكاندا جڵەوی روداوەكان بەدەست خودا خۆیەوە بوو چۆنی ویست ئاوا بەئاكامی گەیاند.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: كە ئەحزابەكان پاشەوپاش كشانەوە لەرۆژی خەندەقدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لن تغزوكم قريش بعد عامكم هذا ولكنكم تغزونهم) لەئێستا بەولاوە ئیتر قورەیش نایەنە سەرتانو جارێكی تر ناتوانن ئابڵوقەتان بدەن، بەڵكوو ئێوە دەچنە سەریانو هەروایش دەرچوو لەوەبەولاوە قورەیشییەكان هێرشیان نەكردەوە سەر موسوڵمانان بەڵكوو هەر موسوڵمانان هێرشیان دەكردە سەر ئەوان، هەتا شاری مەككە رزگار كراو موسوڵمانان بەتەواوی پیرۆزییان بەدەست هێنا.

﴿وَكَانَ اللَّهُ قَوِيّاً عَزِيزاً﴾ پەروەردگار خاوەن هێزو دەسەڵاتە پێویست بەوە ناكا شەڕیان لەگەڵ بكا، بەڵكوو هەر كە ویستی دەتوانێ بیانفەوتێنێ، ژێردەستەیان بكا، بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێكیان بێتە دیو بەهیچ ئامانجێك بگەن بیانگێڕێتەوەو خەسارەتمەندو ریسوای دونیاو قیامەتیان بكا.

كار هەر بەوەندە نەوەستا، قورەیشییەكانو هۆزی غەطەفان بشكێنو بەنائومێدی بگەڕێنەوە، بەڵكوو زەبری بەهێزی پێغەمبەرو موسوڵمانان بەر هۆزی بەنو قورەیظەش كەوت، چونكە سوێندخۆرو هاوپەیمانی قورەیشییەكان بوون،

دەفەرموێ: ﴿وَأَنْزَلَ الَّذِينَ ظَاهَرُوهُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ صَيَاصِيهِمْ﴾ پەروەردگار جولەکەی بەنوقورەیظەشی لەقەڵاو شوراکانی خۆیان داگرت، ئەوانەی یارمەتی ئەحزابەکانیان دابوو، لەکاتێکدا ئەحزابەکان ئابلۆقەی مەدینەیان دابوو پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندبووەوە. ئەو پەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەردا بەستبوویان لێی پاشگەزبوونەوە، بێگومان جولەکەکانی مەدینە ماوەیەکی کەم نەبێ لەگەڵ موسوڵماناندا هودنەیان نەبوو، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ: کە تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینە پەیمانێکی لەگەڵدا مۆر کردن، بەگوێرەی ئەو پەیمانە نەدەبوو جولەکەکان فرتو فێڵ لەموسوڵمانان بکەن، نەدەبوو جاسووسییان بەسەرەوە بکەن، یارمەتی دوژمنی پێغەمبەرو موسوڵمانان بدەن، هەروەها بۆخۆشیان دەستدرێژیی نەکەنە سەریان!

وەلێ ئەوەندەی نەبرد جولەکە هەستیان کرد بەخەتەری ئیسلام لەسەر مەکانەتو بەرژەوەندییان وەکوو جولەکەو خاوەنی تەورات. بێگومان لەوەپێش جوولەکەکان لەناو دانیشتوانی مەدینەدا ڕێزو نرخێکی تایبەتییان هەبوو، بەخاوەنی کتێبی ئاسمانی ناسرابوون، بۆ گەڵێ شت پرسو رایان پێ دەکرا، هەروەها هەستیان بەخەتەری بانگەوازی ئیسلامیو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵگای موسوڵمان کرد، هەستیان کرد ئەو تەنظیمو ئیدارە تازەیەی دەوڵەتی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی پێغەمبەر ﷺ دژی بەرژەوەندی جولەکایەتی ئەوانە. ئەوان لەوەپێش دوژمنایەتی نێوان هۆزی ئەوسو هۆزی خەزرەجیان قزتبووەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان سودیان لێ دەبینیو خۆیان لێ کردبوونە براگەورەو ڕیش سپی، کە پێغەمبەر ﷺ چووە مەدینەو ئەوسو خەزرەجی ئاشت کردنەوەو کردنی بەیەك گەلو لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا لەژێر سەرکردایەتی پێغەمبەردا بوونە خاوەنی یەك بیرو باوەڕو یەك ڕێبازو یەك مەبەست، ئیتر جولەکەکان ئاوی قوڕاویان دەست نەکەوت ماسی تێدابگرنو هەلی (فرق تسد)یان لەکیس چوو. مالی هەرە گەورەو زانای هەرە

بەناوبانگیان عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بوو ئەویش بەخۆیو خاوو خێزانیەوە موسوڵمان بوون، بەمەش زەبرێکی گورچکبڕیان لێدرا!

پێش ئەومیش موسوڵمانبوونی خۆی رابگەیەنێ ترسا لەوەی جولەکەکان پروپاگەندەی بۆ هەڵبەستنو ناوو ناتۆرەی ناشیرینی دوابخەن، بۆیە داوای لەپێغەمبەر ﷺ کرد کە کۆبوونەوە لەگەڵ ریش سپیو پیاو ماقوڵانی جولەکەدا بکاو دەربارەی عەبدوڵڵا پرسیاریان ئاراستە بکا پێش ئەوەی بزانن موسوڵمان بووە، دەربارەی ئەو رای خۆیان دەربڕن، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە دواندنی وتیان: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام گەورەو پیاو چاكو زانامانە کوڕی پیاوی هەرە گەورەو زانامانە، باوکیشی گەورەو تاکە زانامان بووە، چ جایی خۆی. ئیتر عەبدوڵڵا کە لەپەنا پاسارێکەوە خۆی حەشاردابوو هاتە ناو کۆڕەکەیانەوە ئیعلانی ئیسلامەتی خۆی کردو داوای لێ کردن موسوڵمان بن، ئیتر ئەمجار گێڕەکەیان گۆڕیو زۆر قسەی ناشیرینیان دەربارە گوتن، بەناو خێڵەکانی جولەکەدا گەڕانو ترساندیانن لەوەی چاو لەعەبدوڵڵا بکەنو شوێنی بکەون، ئیتر بەتەواوی هەستیان بەخەتەری ئیسلام لەسەر کیانی ئایینیو سیاسی خۆیان کرد، بڕیاریاندا دژی پێغەمبەر ﷺ چییان بۆ بکرێ بیکەن، هەموو رێبازێك بگرنەبەر بۆ دژایەتی موسوڵمانان. ئیتر لەو رۆژەوە جەنگ لەنێوان موسوڵمانو جولەکەدا پەیدابوو هەتا ئەمڕۆش بەردەوامەو تا دونیا دونیایە بەردەوام دەبێ.

لەسەرەتادا شەڕەکە شەڕی دیعایەو جەنگی سارد بوو، شەڕی پروپاگەندە دژی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەرپابوو هەرچی فرتو فێڵێکی بۆیان کراو تێیدا کاراما بوون بەکاریان هێناو خۆیان تێدا تاقی کردەوە، گومانیان دەخستە سەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدو شوبهەو گومانیان ئاراستەی بیروباوەڕی تازە دەکرد، فیتنەییو دووبەرەکییان دەخستە نێوان موسوڵمانانەوە، هەوڵیان دەدا دوژمنایەتی کۆنی نێوان هۆزی ئەوسو هۆزی خەزرەج زیندوبکەنەوە، دژایەتی بخەنە نێوان کۆچکارانو یاریدەدەرانەوە جاسووسییان بەسەر موسوڵمانانەوە دەکرد بۆ

بەرژەوەنـدی دوژمنـانی ئیـسلام، کۆمـەڵێکیان دوورِوو لـەناو کۆمـەڵی موسـوڵمانانـدا دروسـت کردبـوو، ئـەو مونافیقانـە بەرواڵـەت موسـوڵمانو بـەدڵ کـافر بـوون، جولەکەکانی مەدینە ئەم مونافیقانەیان بەکار دەهێنان بۆ فیتنە بەرپا کردن لەناو کۆمەڵی موسوڵماناندا. تا لەسەرەنجامدا پەردەیان لەسەر روی رەشی خۆیـان لابـردو پەیمانی خۆیان شکاندو پاڵیان دایە لای دوژمنو بەتەمابوون لەپشتەوەرا خەنجەری خیانەتی خۆیان ئاراستەی دەوڵەتی تازە دامەزراوی موسوڵمانان بکەن.

جـا: کـە پـەروەردگار بەفـەضـڵو گـەورەیی خـۆی سـەرکەوتنو پـیرۆزی بەپێغەمبـەرو موسـوڵمانان بەخشیو ئـەحزاب بـەو جـۆرە تێـشکانو بەنائومێـدی گەرِانەوەو هیچ دەستکەوتێکیان نەبوو موسوڵمانان کەوتنەوە حاڵەتی ئاسایییـەوەو گەرِانەوە بۆ ناو ماڵو منداڵی خۆیانو پێغەمبەر ﷺ چووە مـاڵی ئوممومسـەلەمە بـۆ خۆشتنو لابردنی چڵكو تـەپو تـۆزی چەند رۆژی سـەختڵەتیو تەنگانـەی رابـردو، حەزرەتی جوبرائیل هاتە لایو وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خودا! ئایـا چـەکت دانـاوە؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: بـەڵێ. حـەزرەتی جوبرائیـل فـەرمووی: بـەڵام فریـشتە چەکیان دانەناوە، ئەوە من ئێـستا لـەراونانی کافرەکـان دێمـەوە، ئـەمجار فـەرمووی: پەروەردگار فەرمانت پێ دەکـا: کـە هـەر ئێـستا بـێ چـەندو چـون پـەلاماری هـۆزی بەنو قورِەیظە بدەیو لەناویان بـەری، بـەنو قـورِەیظـە چـوند میلێـك لەمەدینـەوە دوور بوون، ئەو کاتەی حەزرەت جوبرائیل فەرمانی پەروەردگاری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا نیوەرِۆ بوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ یەکسەر راست بووەوەو فـەرمانی بەموسـوڵمانان کرد بەراجمین بۆ سەر بـەنو قـورِەیظـە، وەکـوو لەصـەحیحی بوخـاریو صـەحیحی موسلیمدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ بەموسوڵمانانی فەرموو: (لایصلین أحد منکم العصر إلا في بـني قريظـة) تـا نەگەینـە نـاو بـەنوقورِەیظـە کـەس نوێـژ نـەکا، بـەم شـێوە موسوڵمانان بەپەلە بەرەو بـەنو قـورِەیظە کەوتنـە رێ، لـەرێگا وەختـی نوێـژ هـات هەندێکیان لەرێگا نوێژیان کرد، وتیان: پێغەمبـەر: کـە ئـەو فەرمانـەی پـێ کـردین

مەبەستی ئەوە بوو بەخێرایی بکەوینە رێ، هەندێکی تریان وتیان: نەخەیر! تا نەچینە ناو بەنو قورەیظەوە نوێژ ناکەین. چونکە پێغەمبەر ﷺ وەهای فەرمانی پێ کردین، ئیتر بەو جۆرە موسوڵمانەکان بەرەو هۆزی بەنو قورەیظە راجمین‌و پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی مەکتوومی کردە جێنشینی خۆی‌و شوێنیان کەوت، ئاڵای لەشکرەکەشی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبو طالیب، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئابڵوقەی دان‌و ئابڵوقەدانەکە (٢٥) رۆژی خایاندو لەهەموو رۆییکەوە تینیان بۆ هات، دوایی لەسەر حوکمی سەعدی کوڕی مەعاذ: کە هاوپەیمانیان بوو لەسەردەمی نەفامی‌دا.

جا: کە سەعد هات بۆ ناو موسوڵمانەکان، پێغەمبەر ﷺ بۆ زێدە رێز پێدان‌و شکۆمەندی فەرمانی بەموسوڵمانەکان کرد: کە لەبەری هەڵسن، پێی فەرموون: (قوموا إلى سيدكم) بۆ ئەوەی حوکم‌و بڕیارەکانی کاریگە تر بن، جا کە سەعد دانیشت پێغەمبەر ﷺ بەسەعدی فەرموو ئاماژەی بۆ جولەکەکانی کرد، فەرمووی: ئەوانەی لەسەر حوکمی تۆ لەقەڵاکانیان هاتوونە دەرێ، چۆنت بەلاوە باشە بڕیاریان بۆ دەربکە، سەعد فەرمووی: حوکمی من تێیان دایە رەوایە؟ چ حوکمێك بدەم لەسەریان جێ بەجێ دەکرێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: وتی: بەسەر هەر کەسێکدا بڕیار دەرکەم جێ بەجێ دەکرێ؟ ئاماژەشی بۆ ئەو لایە کرد: کە پێغەمبەری لێ بوو لەبەر رێزو ئیحتیرام روی لەپێغەمبەر ﷺ لادابوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ چ حەکمێك دەربکەی جێ بەجێ دەکرێ، ئەمجار سەعد فەرمووی: ئەمن حوکمی ئەوە دەدەم شەڕکەرەکانیان بکوژرێن ماڵ‌و منداڵیان بکرێنە تاڵانی‌و داگیر بکرێن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان بەحوکمی خودای ژوور حەوت ئاسمانەکان حوکمت کرد، یان بەگوێرەی حوکمی خوداو حوکمی پێغەمبەری خودا حوکمت کرد.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد چاڵی درێژ هەڵکەنن، خەندەکیان بۆ هەڵکەندن‌و بەپەل بەستراوی هێنایان‌و لەملیان دان ژمارەیان حەوت سەد هەشت

سەد کەس بوون هەر نێرینەیەکیشیان موی لێ نەهاتبوو لەگەڵ ئافرەتەکانیاندا کرانە کویلەو ماڵو سامانیشیان کرا بەغەنیمەت..

﴿وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمْ الرُّعْبَ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمْ الرُّعْبَ﴾ پەروەردگار ترسو بیمێکی زۆری خستە دڵو دەرونیانەوە، چونکە پاڵیان دابوە موشریکەکان بەمەبەستی جەنگان دژی پێغەمبەرو هاوەڵانیو ترساندنی کۆمەڵگای ئیسلامی بەنیازبوونیان بۆ کوشتنی موسوڵمانان. بۆیە رووداوەکان بەپێچەوانەی نیازی ئەوان هاتنە دیو ﴿فَرِيقاً تَقْتُلُونَ﴾ ئەو جولەکانە خۆیان تەسلیم کرد بۆ کوشتنو ﴿وَتَأْسِرُونَ فَرِيقاً﴾ منداڵو ئافرەتیان بۆ بەکۆیلە بوون. ئەو کۆمەڵەی کوژران شەرکەرەکانیان بوون، ئەوانەیش کران بەکۆیلە ئافرەتو منداڵەکانیان بوون ﴿وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضاً لَمْ تَطَئُوهَا﴾ پەروەردگار زەویو زارو ئەرزو ئاوی ئەوانی بەئێوە بەخشی. خانوو باڵە خانەو ماڵو سامانیان کەوتە دەست ئێوە هەروەها پەروەردگار بەمیرات دەدا بەئێوە چەند وڵاتو ناوچەی تر کە ئێوە تا ئێستا قاچتان نەخستۆتە سەر ئەویش زەوی زاری ئەو وڵاتانەیە لەداهاتوودا کۆنترۆڵیان دەکەن دوای زەوی زاری بەنوقورەیظە وەکوو وڵاتی خەیبەرو مەککەو وڵاتی فارسو رۆم ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيراً﴾ پەروەردگار خاوەن تواناو دەسەڵاتی رەهایە بەسەر هەموو شتێکدا، زاتی پاکی چۆن توانی زەویو زاری بەنوقورەیظەی خستە ژێر دەستی ئێوەوە دەتوانێ زەویو زاری شوێنی تریشتان بخاتە ژێر دەستو بەسەر گەلو نەتەوەی تردا سەرتان بخا.

**تێبینی:**

**ئایەتەکان زۆر حوکمو یاسایان لێ وەردەگیرێن. لەو حوکمو ئادابانە:**

١- پێویستە سەرۆك راوێژ لەگەڵ هاوەڵانو پیاو ماقوڵانی وڵاتەکەیدا بکا، بەتایبەتی لەکاروباری گرنگی وەکوو شەڕدا. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ کە هەواڵی هاتنی

ئەحزابی بیست بۆ سەر مەدینە راوێژی بەهاوەڵانی کردو سەلمانی فارسی تەگبیری خەندەك لێدانی بۆ کرد، پێغەمبەریش پەسندی کردو ئەنجام درا.

٢- خۆپارێزیو بەرگریکردنو بەرامبەریکردنی دوژمن پێویستەو دەبێ موسوڵمانان ئەوپەڕی توانای خۆیان بخەنە گەڕ بۆ پاراستنی خوێنو ماڵو ناموسو وڵاتیان.

٣- فێڵ کردنو پیلان نانەوە لەشەڕدا کارێکی رەوایە.

٤- ئیجتیهاد کردنو لێکۆڵینەوە دروستەو (هەندێ جار واجبە) ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ کە چوو بۆ سەر بەنوقوڕەیظە بەموسوڵمانانەکانی فەرموو (لایصلین العصر إلا في بني قريظة)لەرێگا نوێژی عەصریان لێ درەنگ بوو، هەندێ لەهاوەڵان لەرێگا نوێژەکەیان کرد وتیان: با نوێژەکەمان نەچێ، وتیشیان پێغەمبەر ﷺ کە ئەو فەرمانەی پێ کردین مەبەستی ئەوە بوو زوو بەپیر فەرمانەکەیەوە بچینو تەئخیر نەبین. هەندێکیشیان وتیان: نوێژی عەصر ناکەین مەگەر لەو شوێنە فەرمانی پێ کردین، تەنانەت ئەگەر کاتەکەشی بەسەر بچێ تا نەچینە ئەو شوێنە نوێژی عەصر ناکەین، دەی پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی هیچ کامێ لەو کۆمەڵەی نەکردو نوێژ کردنی هەردولای تەقریر کرد.

٤- ترسانو هەڵاتن قەزاو قەدەر ناگێڕێتەوە، هەر کەسێ ئەجەلی هات دەبێ بمرێ.

٥- جاسووسی کردن بەسەر دوژمنەوە کارێکی دروستەو شەرعییە.

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە (حوذیفە)ی کوڕی (الیمان) کرد: کە بچێ هەواڵی ئەحزابی بۆ بهێنێتەوە، پێی فەرمووو: (انطلق حتى تدخل في القوم فتسمع كلامهم، وتأتين بخبرهم، اللهم احفظه من بين يديه ومن خلفه وعن يمينه وعن شماله حتى ترده إلي، انطلق ولا تحدث شيئا حتى تأتيني).

دوعاو پاڕانەوە لەخودا کارێکی پێویستەو چەکێکی کاریگەرە لەهەموو بارو دۆخێکدا بۆ هەر کارێك بێ.

## سەرپشککردنی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان دونیاو قیامەتدا

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتانە ئیمام ئەحمەدو موسلیم و نەسائی لەجابیرەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ: ئەبو بەکر هات بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ داوای چوونە ژورەوەی کرد رێگای پێ نەدرا، دوایی عومەر هات داوای چوونە ژورەوەی کرد رێگای پێ نەدرا، پاشان رێگا درا هەردوکیان چوونە ژوورەوە، سەیریان کرد وا پێغەمبەر ﷺ دانیشتووەو خێزانەکانی دەوریان داوە، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگەو قسە ناکا، حەزرەت عومەر وتی: دەبێ قسە لەگەڵ پێغەمبەر بکەم و بیهێنمە پێکەنین، ئەمجار عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر کچی زەید (مەبەستی خێزانی خۆیەتی) داوای نەفەقەم لێ بکا بەچەقو لەملی دەدەم، پێغەمبەر ﷺ پێکەنینی هات بەجۆرێك ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەتا خێزانەکانم داوای بژێوم لێ دەکەن، حەزرەت ئەبو بەکر هەستا پەلاماری عائیشە بدا، عومەر هەستا لەحەفصە بدا، وتیان: ئەوە داوای شتێك لەپێغەمبەر

دەکەن: کەنیەتی بۆتان دابین بکا؟ ئیتر خودا ئەم سەرپشك کردنەی نازڵ کرد، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەعائیشەوە دەستی پێ کردو پێی فەرموو: ئەمن شتێکت پێ دەڵێم: پێم خۆشە پەلەی تێدا نەکەی تا پرس بەدایكو باوکت دەکەی‌و رای ئەوانیش وەردەگری! عائیشە فەرمووی: چیە بفەرموو: ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ...﴾ بەسەردا خوێندەوە. عائیشە وتی: دەربارەی مانەوەم لەلای تۆ پرس بەدایكو باوکم بکەم؟ ئەوە شتێك نیە جێگای پرس‌و را بێ، بەڵکوو من خوداو پێغەمبەری خودا هەڵدەبژێرم، ئەوە شتێك نیە من تێیدا دوو دڵ بم، بەڵام داوام ئەوەیە ئەم هەڵبژاردنەی من بۆ خێزانەکانی ترت نەگێڕیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن الله لم يبعثني معنتا ولا متعنتا ولكن بعثني معلما ميسرا، لاتسألني إمراة منهن عما اخترت إلا أخبرتها) بێگومان پەروەردگار منی رەوانە نەکردوە بەتوندو تیژو خۆسەپێنەر، بەڵکوو منی رەوانە کردوە بەمامۆستاو ئاسانکار، ئافرەتێك لەو خێزانانەم پرسیارم بکا تۆ چیت هەڵبژاردوە بێ سێ‌و دوو پێی دەڵێم!

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: کە لەپێشەوە وەکوو زانیمان پەروەردگار پێغەمبەری بەسەر ئەحزابەکاندا زاڵ کرد، لەشکری ئەحزاب پەرت‌و بڵاو بوو، خودا یارمەتی دا توانی بەنو قورەیظە بەو شێوە قەڵاچۆ بکا، ئیتر خێزانەکانی وایان زانی زێڕو زیوو گەنج‌و خەزێنەی ئەو جولەکانە کەوتۆتە ژێر دەستی، بۆیە هەموویان هاتن دەوریان داو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! کچەکانی کیسراو قەیصەر لەزێڕو زیودان، سەرتاپایان خشڵ‌و جەواهیراتە، خاوەنی کارەکەرو خزمەتچین، ئێمەیش ئەوە بەرگ‌و پۆشاکمانە، ئەوە خواردن‌و خۆراکمانە، ئەوە جێگاو خانوو باڵەخانەمانە: کە چاوت لێیەو دەیزانی، بەم جۆرە قسانەو ئەم داوایانە دڵی پێغەمبەریان ئازارداو وایان لێ کرد روفاهیەت بخاتە ژیانی خێزانەکانیەوە، وەکوو ژنە پاشاو خێزانی مەلیك مامەڵەیان لەگەڵ بکاو حیسابیان بۆ بکا، ئیتر پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ کرد: کە ئەو

ئایەتانـەیان بەسـەردا بخوێنێتـەوەو سەرپـشکیان بکـا لـەنێوان هەڵبـژاردنی ژیـانی روفاهییەتئامێزی دونیایی یان بەختەوەری قیامەت.

خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لـەو کاتـەدا (نـۆ) ئـافرەت بـوون پێنجیـان قورەیـشی بـوون: (عائیـشە، حفـصة، ئوممـو حەبیبـە، سـەودە، ئوممـو سـەلەمە) چواریـشیان قورەیشی نەبوون، (مەیموونەی کچی ئـەلحاریثـی هیلالی، زەینـەبی کچی جەحـشی ئەسـەدی، جویریـەی کـچی ئـەلحاریثـی المـصطلقیة، صـەفییەی کـچی حویـەیی ئەخطەبی خەیبەری).

جا: کە پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کردن هەموویان بەیەك دەنگ‌و تێکڕا مانـەوە لای پێغەمبەریان هەڵبژارد.

بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ بـۆ خـۆی‌و خێزانـەکانی ژیـانی قەناعـەت ئـامێزو کولەمەرگی هەڵبژاردبوو، نەك لەبـەر ئـەوەی نـەیتوانیبێ ژیـانی خـۆش دابـین بکـا، بەتەئکید ئەگەر بیویستایە ژیانی پاشایانەی بۆ دەستەبەر دەبوو، تەشـریفی ژیـانی درێژەی کێشا هەتا فەتحی لەوڵات‌و ناوچەکانی دەوروبەری کرا، دەستکەوتی جەنـگ زۆر بـوو، خەزێنـەی بـەتیولمال زێـڕو زیـوی زۆری تێـدا کۆبـوەوە، زۆر کەسـی وا دەوڵەمەنـدبوون: کـە لـەوەپێش هیـچیان نـەبوو، لەگـەڵ ئـەوەدا: کـە پێغەمبـەر دەیتـوانی ژیـانی پاشـایانە رابـوێرێ، وارێ کـەوتووە بـەمانگ لـەماڵیدا ئـاگر نەکراوەتەوە، لەهـەمان کاتـدا خێـرو صـەدەقەی زۆر کـردوە، دیـاری یادگـاری زۆری داوە بەخەڵك نەیهێشتووە پارەو پوول لەماڵی ئەودا شـەو بـەرۆژ بکاتـەوە، ئەمـەش هەمووی بەویست‌و ئیختیاری خۆی‌و بۆ ئەوەی پیشانی بدا: کە ژیـانی دونیـا بـەلای ئەوەوە گرنـگ نیەو ئەوەی گرنگە بەلای ئەوەوە قیامەت‌و رەزامەندی خودایە.

هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ لەلایەن عەقیدەو شەریعەتەوە موکەلەف نەبوە: کە بەم جۆرە ژیانە قنیات بکا، خواردنی خۆش‌و پۆشاکی باش‌و شت‌و مەکی باشی لێ یاساغ نەبوە، بۆ خۆشی لەخۆی یاساغ نەکردون، ئەگەر بـۆی رێکـەوتبێ خـواردنی خۆشـی خواردوەو پۆشـاکی باشیـشی پۆشـیوە، بـەڵام هەڵپـەی بـۆ وەدەسـتهێنانی ئـەم جـۆرە

لەززەتە دونیایی‌یە نەکردوە، گرنگی پێ نەداون‌و خۆی پێوە هەڵەوگیر نەکردون، لەهەمان کاتدا داوای لەشوێنکەوتوانی نەکردوە: کە ئەو جۆرە ژیانە پەیڕەو بکەن، مەگەر کەسێك بۆ خۆی بەویستی خۆی ژیانی ئاوا هەڵبژێرێ‌و خۆی لەوە بەبەرزتر بزانێ ببێتە کۆیلەی لەززەت‌و خۆشی جیهانی‌و ملکەچی هەواو هەوەس ببێ.

وەلێ ئافرەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئافرەت بوون‌و ئادەمیزاد بوون، هەست‌و نەستیان ئادەمیزادیی بوو، وێڕای رێزو گەورەیی‌و نزیکییان لەپێغەمبەرو سەرچاوەی پێغەمبەرایەتی، حەزو ئارەزۆی سروشتی ئادەمیزادی‌و ئافرەتییان لەلەززەتی دونیایی لەدڵ‌و دەروونیاندا دانەمرکابوو زیندو بوو، جا کە بینیان هەرزانی روی لەمەدینە کردوە، دەستکەوتی جەنگ رژێندرایە بەیتولمالەوە، دەربارەی بژێوی کولەمەرگی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەردا دوان‌و داوای گەشە پێدانی باری ژیانی ئابوری خۆیان کرد، بەڵام پێشنیارەکەیان لەلایەن پێغەمبەرەوە پەسند نەکراو رەتکرایەوە، بەڵکوو پێشنیارەکەیانی لەسەر دڵ زۆر گران بوو پێی ناڕەحەت بوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی بەویستی خۆی حەزی لەو ژیانە زبرە بوو، نەیدەویست خۆ هەڵەوگیری لەززەتەکانی ژیانی دونیا بکاو نەیدەویست تۆزقاڵێکیش مەیلی بۆلا بکا. دەیەویست ژیانی خۆی‌و ئەوەی پەیوەندییان بەئەوەوە هەیە لەو ژیانە کولەمەرگییە لابدەن، نەیدەویست تارمایی دونیاویستی‌و ژیانی نەرم‌و نۆڵ لەسەر خۆی‌و خێزانی دیار بێ، نەك لەبەرئەوە حەڵاڵە یان حەرامە، حەرام‌و حەڵاڵ رون کراوەتەوەو ئاشکران، بەڵکوو لەروی ئازادی‌و خۆ رزگار کردن لەکۆت‌و زنجیری داخوازییەکانی دونیاو ژیانی نازپەروەردەیی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بەدوا کاری خێزانەکانی دڵتەنگ بوو هێندەی لەسەر شانی گران بوو ماوەیەك لەماڵ دەرنەچوو لەهاوەڵانی کەنارگیر بوو، خۆ دەرنەکەوتنی پێغەمبەرو نەهاتنی بۆ ناو هاوەڵانی ئەوپەڕی کارەسات‌و ناخۆشی بوو، هەرچەندی کردیان کرواندیان خۆیان بۆ رانەگیراو ویستیان بچنە خزمەتی بۆ ماڵەوەو رێگایان

پێ نەدرا، دوایی رێگادرا حەزرەت ئەبو بەکرو حەزرەتی عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) چوونە ژورەوە وەکوو لەوەپێش لەریوایەتەکەدا بەدورو درێژی باسمان کرد.

جا: کە ئەم دوو ئایەتە نازڵ بوون‌و خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ سەرپشك کران لەنێوان ئەوەدا بەو ژیانە زبرە رازی بن‌و لەگەڵ پێغەمبەردا بمێننەوە، یان ژیانی نازپەروەردەیی دونیا هەڵبژێرن‌و لەپێغەمبەر جوداببنەوە، هەموو خێزانەکانی تێکڕا وتیان: نەبەخوا ئیتر ئێمە شتێك داوا لەپێغەمبەر ناکەین: کە نەیبێ. خوداو پێغەمبەری خودا هەڵدەبژێرین‌و ژیانی نازپەروەردەیی جیهانمان ناوێ. ئەوان بەکوللی‌و بێ چەندو چون لایەنی خوداو پێغەمبەری خوداو بەختەوەری قیامەتیان هەڵبژارد، ریوایەتکراوە: کە پێغەمبەر ﷺ بەم هەڵوێستەی خێزانەکانی زۆر کەیف خۆش بوو.

ئێستا پاش ئەم بەرکۆڵە: کە پێویستی بەڵێ دوانی زیاتر هەیەو رونکردنەوەی زیاتر هەڵدەگرێ، دێینە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان:

دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾ ئەی پێغەمبەر بەخێزانەکانت بڵێ: ئێوە خۆتان سەرپشك بن بۆ خۆتان یەکێ لەم دوو رێگایە هەڵبژێرن: ئەگەر حەزتان لەژیانی دونیاو خۆش رابواردنە، ئەوە لێم جیا ببنەوەو تەڵاقتان دەدەم‌و هەریەکەتان موتعەو دیاری خۆتان دەدەمێ، بێ عاجزبون‌و زیان پێگەیاندن تەڵاقتان دەدەم، یان بەم ژیانە زبرەی من قنیات بکەن‌و لەگەڵ مندا هەڵ بکەن.

﴿وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ﴾ ئەگەر رەزامەندی خوداو پێغەمبەری خوداو ژیانی بەختەوەری قیامەتتان گەرەکە، ئەوە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ بێگومان خودا بۆ ئافرەتە باشەکانی ئێوە پاداشی باشی ئامادە کردوە: کە بەهەشتی رازاوەیە، هەموو نازو نیعمەتی دونیا لەئاستیدا هیچ نموودی نیە.

جا کە پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کردن لەبەینی دونیاو قیامەت هەموویان بەختەوەری قیامەتیان هەڵبژارد، پێغەمبەر ﷺ زۆری پێ خۆش بوو، سوپاسی کردنو خودا ڕێزی لێ گرتن، بەوە: کە دەفەرموێ: ﴿لَا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ﴾ (الأحزاب:٥٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً﴾ (الأحزاب:٥٣).

پێغەمبەر ﷺ (١٢) ژنی هێناوە، تەنیا عائیشەی بەکچی مارە کردوە، ژنەکانی تری هەموویان بیوەژن بوون: کە مارەی کردوون، زوربەی زۆریان: کە مارەی کردون بۆ دڵدانەوەو کەلێن پڕکردنەو بووە بۆیانو بەرژەوەندییەکی ئایینی تێدا هەبوە. ئەو خێزانە بەڕێزانەش ئەمانە بوون:

١- خەدیجەی کچی خوەیلید یەکەم هاوسەری پێغەمبەر بووە لەمەککە پێش ئەوەی نیگای پێغەمبەری بۆبێ بووە هاوسەریو دوای پێغەمبەرایەتیش حەوت ساڵ لەگەڵیدا ژیاوە، تا خەدیجە خێزانی بوو ئافرەتی تری مارە نەکردوە، خەدیجە یەکەم ئافرەت بووە ئیمانی بەپێغەمبەر هێناوە، منداڵەکانی پێغەمبەر جگە لەئیبراهیم هەموویان لەخاتو خەدیجە بوون لەتەمەنی (٥٤) ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە.

٢- سەودەی کچی زەمعە، لەمەککە کردی بەهاوسەری خۆیو لەمەدینە کۆچی دوایی کرد.

٣- عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیق لەمەدینە مارەی کردو بوو بەهاوسەری، ئەو کاتە عائیشە تەمەنی نۆ ساڵ بووە، کە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد تەمەنی هەژدە ساڵ بووە.

٤- حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططاب، پێغەمبەر ﷺ مارەی کردو دوایی تەڵاقیدا، حەزرەتی جوبرائیل پێی فەرموو خودا فەرمانت پێ دەکا: کە ڕیجعەی

بکەیــەوە، چــونکە زۆر رۆژو دەگــرێو شــەو نوێــژیش زۆر دەکــا، ئــیتر پێغەمبــەر ریجعەی کردەوە.

٥- ئومموسەلەمە، ناوی هیندبووە کچی ئەبو ئوممەیەی مەحزومی بووە.

٦- ئوممو حەبیبە: رەملەی کچی ئەبو سوفیان، ساڵی حەوتـەمی کۆچی مـارەی کردوە.

٧- زەینـەبی کـچی جـەحش، خێزانـی زیـد بـوو تـەڵاقی دا بەفـەرمانی خـودا پێغەمبەر مارەی کرد بۆ پوچەڵکردنەوەی یاسای (التـبني) لەسـەرەتادا نـاوی (بـرة) بوو پێغەمبەر ناوی گۆڕی بەزەینەب.

٨- زەینەبی کچی خوزەیمەی کوڕی ئـەلحاریـث، پێغەمبـەر ﷺ مـارەی کـرد دوای هەشت مانگ کۆچی دوایی کرد.

٩- صفیەی کچی حویەی کوڕی ئەخطەبی هارونی، پێغەمبـەر ﷺ ئـازادی کـردو مارەی کرد، لەسەبایای خەیبەر بوو.

١٠- ریحانەی کچی زەید، مێردەکەی لەغەزادا کوژرا بـوو سـاڵی شەشـەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ مارەی کرد، بۆ پـڕ کردنـەوەی کـەلێنی بـێ مێـردیو بـۆیو رێزگـرتن لەمێردە کوژراوەکەیو منـداڵەکانی.

١١- جووەیرییەی کچی ئەلحاریث، لەسەبایای خێڵی (المصطلق) بـوو نـاوی (بـرة) بوو پێغەمبەر ناوی نا(جویرية) ساڵی شەشەمی کۆچی مارەی کرد.

١٢- مەیموونەی کچی ئـەلحاریـث هـیلالی دوا ئافرەتـە: کـە پێغەمبـەر ﷺ مـارەی کردوە.

ئەمانە ئەو ئافرەتانە بوون: کە پێغەمبەر گواستنیەوەو بووتە هاوسەریان.

ژنی تری هەبوون مارەی کردون بەڵام نەچۆتە لایـان، لەوانـە: (الکلابیـة) نـاوی فاطمە یان عەمرة بووە، ئەسمائی کچی (النعمان)ی کـوڕی (الجون) قوتەیلـەی کـچی قەیس، ئەمانەش ژمارەیان (١٠)بوون.

هەندێکیش هەبوون خوازبێنی کردون و مارەی نەکردون و نەیگواستونەوە یان خۆیان بەپێغەمبەر بەخشیوە ئەمانەش ژمارەیان (٩) نۆ ئافرەت بوون.

﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ مَنْ يَأْتِ مِنْكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً﴾ دوای ئەوەی: کە پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی سەرپشك کردن و ئەوانیش خوداو پێغەمبەری خوداو بەختەوەری ژیانی قیامەتیان هەڵبژارد، ئەمجار پەروەردگار ئامۆژگارییان دەکاو لەسەرپێچیکردن دەیانترسێنێ و دەفەرموێ: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ئەی دایکانی موسوڵمانان! هەر یەکێ لەئێوە تاوانێکی گەورە ئەنجام بدا، لەمێردەکەی ناشیزە بێ، ئەزیەتی بدا، بێ رەوشتی بکا ئەوە دوچەندانە تۆڵەی لێ دەسەندرێتەوە، چونکە ئێوە پلەو پایەتان بەرزەو خێزانی پێغەمبەرن و لەخانەوادەی پێغەمبەرایەتی دان، لەبەر ئەوە سەرپێچیکردنی ئێوە لەهی ژنانی تر تاوانترەو عەزابیشتان دوو چەندانە دەبێ. سزادانیشتان بەدوو قات لای خودا ئاسانەو بۆ خودا چ ئەرکێکی تێدا نیە.

**بەیارمەتی خودای گەورەو میهرەبان رۆژی (٨/٣/٢٠٠١) سێیەم رۆژی چەژنی قوربانی پیرۆز لەماڵی خۆمان لەسلیمانی گەرەکی مامۆستایان لەپاکنووسی ئەم جزمە بوومەوە واتە: جزمی (٢١) خودایە تۆفیقم بدەی بۆ تەواو کردنی جزمەکانی تریش...**

**مەلا محمود أحمد**